# مختصر صحيح مسلم

للإمام زكي الدين عبدالعظيم عبدالقوي المنذري
المتوفى ٦٥٦هـ

به كوردی كردن و ڕونكردنه‌وه‌ی
نوری فارس حمه‌خان

سه‌رپه‌رشتی چاپ
مه‌لا مه‌حموودی گه‌لاڵه‌یی

دار المعرفة
بيروت - لبنان

# مُختصر

# صحيح مسلم

للإمام زكي الدين عبد العظيم بن عبد القوي المنذري

المتوفى ٦٥٦ هـ

به كوردی كردن و ڕونكردنه‌وه‌ی

**نوری فارس حمه‌خان**

سه‌رپه‌رشتی چاپ

مه‌لا مه‌حموودی گه‌لاڵه‌یی

( به‌رگی یه‌كه‌م )

بسم الله الرحمن الرحيم



ناوی کتێب ﴿ **مختصر صحيح مسلم** ﴾

وەرگێڕانی: نوری فارس حەمەخان.

تیراژ: (٣٠٠٠) دانــە.

ژمارەی سپاردن: ژمارە (١٦٢٧)ی ساڵی (٢٠١١)ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە.

ساڵی چاپ: ٢٠١١ز - ١٤٣٢ ك.

تایپ: (نیان حسین)

لەسـەر ئـەرکی کتێبخانــەی ئـارام لــە چـاپ دراوەو مـافی چـاپکردنەوەی پارێزراوە بۆ کتێبخانەی ناوبراو.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

**پێشەکی:**

**الحمدُ للهِ رَبِّ العَالَمِين، أَحْمُدُه كَثِيراً طَيِّباً مُبَارَكاً فِيه، وَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، وَ أَشْهَدُ أَنَّ محمداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، صَلَوَاتُ اللهِ وَسَـلامُهُ عَلَيْـهِ وَعَلَـى سَائِرِ الأَنْبِيَاءِ وَالْمُرْسَلِينَ، وَآلِ كُلٍّ، وَسَائِرِ عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، وَمَنْ تَبِعَهُمْ بِإِحْسَانٍ إِلَى يَوْمِ الدِّينِ.**

لەپاش سوپاس‌و ستایش‌و حەمدی خودای گەورەو ناردنی دوورودو سلاّوی بێ پایان، بۆ سەرگیانی پیرۆزی پێغەمەری زێدە خۆشەویست‌و، بۆ سەرگیانی هاوڕێ‌و هاوەڵە نازدارەکانی، عەرزم ئەمەیە:

١- لە رۆژی ٢١-ڕەمەزانی-١٤٢٧ك = ١٢-١٠-٢٠٠٦ز دەستم کردوووە بە وەرگێڕانی ئەم کتێبە پیرۆزە، لەشاری سلێمانی خۆشەویست، لەماڵی خۆمان، وەرمگێڕاوەتە سەر زمانی شیرینی کوردی.

٢- لە ڕۆژی ١-١-٢٠١١ز = ٢٦-موحەررەمی ساڵی ١٤٣٢ی کۆچی، لەماڵی خۆمان، لەگەڕەکی مامۆستایان، لەشاری سلێمانی، لە کوردستانی عێراق، لە وەرگێڕان‌و بەکوردی کردن‌و روونکردنەوەی ئەم (**مختصر صحيح مسلم – للحافِظِ الْمُنْذِرِيّ**)یە، لە سایەی خودای گەورەوە لێبوومەوە.

٣- ئەم نوسخەیەی کە من تەرجەمەم کردووە، نوسخەیەکی زۆرپاک‌و پوخت‌و بێ هەڵەیە کە بریتییە لە:

**(مختصر صحيح مسلم لِلإِمامِ أَبِي الحُسَيْنِ مُسْلِمِ بْنِ الحَجَّاجِ القُشَيْرِيِّ النَّيْسَابُورِيِّ للحافِظ زَكِيِّ الدِّين عَبْدِ العَظِيمِ بْن عَبْدِ القَوِيِّ بْنِ سَلاَمَةَ المنذِرِيِّ الدِّمَشْقِيِّ/تحقيق الشيخ محمد ناصر الدين الأَلْبَانِيِّ/الطبعة الثانية/١٣٩٧هـ ١٩٧٧م/المكتب الإسلامِيّ. دمشق).**

٤- ماموّستای مونزیری دانەری ئـەم پوختەیـە، دەفـەرموێ: (وَقَـدْ تَضَـمَّنَ مَـعَ صِـغَرِ حَجْمِهِ جُلَّ مَقْصُودِ الأَصْلِ). واتە: گەرچی ئـەم پوختەیـە، بەقـەبارە بچووکە، بـەلاّم زوربەی مەبەستەکانی ئەصلّەکەی، کە صەحیحی موسلیمە، گرتوّتە خوّ.

٥- ئـەم وەرگـەڕاوە هـەتا بلّێـی، وەك ئەصـلّەکەی، لەهـەموو روویەکـەوە، جێگـەی متمانەو دلّنیاییە بە زمانێکی پاراو، راڤەی فەرموودەکان کراوە، پوختەی مەبەست لێیان روونکراوەتەوە.

٦- لـەم وەرگەڕانـەدا بـەهرە لـەم سەرچـاوە پیرۆزانـە وەرگـیراوە: شـەرحی نـەوەوی لەسـەر صـەحیحی موسـلیم، فـەتحولولهیم شـەرحی صـەحیحی موسـلیم‌و لەهـەموو سەرچاوەکانی وەرگێڕانی تاجول ئوصـول‌و ریـاض الصَّالحين‌و تەجریـدی بوخـاری‌و فیقهـی ئاسـان‌و إصـابە‌و إسـتيعاب‌و البدايـة والنهايـة وتهـذيب التهـذيب و عەونولـەعبودی شـەرحی سـونەنی ئـەبو داودو البحـر المحـيط الثجّـاج شـەرحی صەحیحی موسلیم‌و سەرچاوەی تریش.

٧- هەموو فەرموودەیەك سێ ژمارەم داناوە بۆی، ژمارەی یەکەم، لەسەرەتای مـەتنی فەرموودەکەوە دانراوە، ژمارەی سەراسەری ئەصلّەکەیە، کە ماموّسـتای مـەزن شـێخ محمد ناصر الألباني دایناوە، لەژمارەی (١)وە دەست پێدەکا، بـە ژمـارە (٢١٧٩) تـەواو دەبێ‌و پەڕاوەکە دەگاتە کۆتا، لە کۆتایی دەقی هـەموو فەرموودەیەکـەوە دوو ژمـارە هەیە ئاوا (الحديث ١١٦ = ١٢٧ فـم = ژمـارە/١١٦ = رقـم الحـديث لصـحيح الإمـام مسـلم بشرح الإمام النووي، تحقيق وتخريج وترقيم الشيخ خليل مـأمون شـيحا، ژمـارە/١٢٧ = حسب ترقيم فتح اللهم بشرح صحيح مسلم تأليف الشيـخ شـبير أحمـد العثمـاني). گەلێ جار بە هێمای (شـیحا) ئامـاژە دەکـەم بـۆ تـەرقیمی شـێخ خـەلیل مـەحموود شیحا، وە بە (ف.م) یا بە (فم) ئاماژە دەکەم بۆ تەرقیمی فتح اللهم.

٨- ئێستا دەسـتم کـردووە بـە تەرجەمـەی کتێبـی (بلـوغ المـرام مِـنْ أدِلَّـةِ الأَحْكـام) دانـراوی ئیمـامی عەسـقەلانی، لـەخودای گـەورە داوا دەکـەم یارمـەتیم بـدا لەسـەر تەواوکردنی، لەسایەی خوداوە، لەڕەحمەتی بەزیاد بێ، لەگەڵ سوننەتی حەزرەت دا

وەك ماسیی‌و ئاوم لـێ هاتووە، ڕۆژێ بۆن‌و بەرامـەی فـەرموودەی پێغەمـەر نەیـەت بەسەرما، دڵم تەنگ دەبێ، چاوم کز دەبێ.

٩- ژیـان نامەیـەکی ڕێکوپێکم بـۆ هـەموو صـەحابەیێ نووسـیوە، لـەو شـوێنەدا، کـە بۆیەکەمجار ناوی ئەو هاوەڵە لەم پوختەی صـەحیحی موسـلیمە دا دێ. گەلـێ جـار ژیاننامەو کەراماتو خەواریقی پیاوانی ڕشتە (سند)ەکانم نووسیوە، کە دڵنیام لەوە کە ریجالی صەحیحی بوخـاری‌و صـەحیحی موسـلیم، هـەموویان ئـەولیای خوابـوون، هەروا کورتەیەکی پوختم بـۆ ژیـانی ئیمـامی موسـلیم‌و ئیمـامی نـەوەوی نووسـیوە. گەلـێ جـار لـە بۆنـەکانا چیرۆك‌و باسـی مـەلاکانی کوردەواریشـم نووسـیوە لەگـەڵ هەندێ سەرنجی تردا.

١٠- هەمیشـە مـن دووعـای خێـر دەکـەم بـۆ ئـەو بەڕێزانـەی کـە ئـەرکی پـەخش‌و چـاپکردن‌و خزمــەتی ئــەم کتێبــە پیرۆزانــەیان گرتۆتــە ئەســتۆ، کــەمنی هــەژار وەرمگێڕاونەتە سـەر زمـانی شـیرینی کـوردی، بەپشـتی خـودای گـەورە ئـەو ئـەرك‌و خزمەتە بۆیان دەبێ بەمایەی پیت‌و فەڕو بەرەکـەت‌و سـەربەرزی هـەردوو جیهـان، خــوا یاربــێ بــۆ ئەوکەســانەیش کــە زەحمــەت دەکێشــن بــە چــاپکردنیان‌و بــۆ چاپخانەکەیش دەبن بەمایەی ڕەحمەت‌و بەرەکەت.

١١- لەخودای گەورە داوا دەکـەم کەدەسـت بگـرێ بـە تەمـەنی بـرای ئـازیزو بـەڕێزم، جەنابی مامۆستا (محمود أحمد محمد)، خودا بە لوتفی خۆی سـەربەرزو سـەرفرازی دیـن‌و دنیـای بفـەرموێ، بەڕاسـتی جـەنابی مامۆسـتا مـەحموود، ئـەم بەرهەمـە قەڵەمییانەی منی هەژاری ڕزگارکرد لەوە کەلەپەنای کـەنوانا، مشـك‌و مـار بیـانخوا، پاداشی باشی مامۆستا مەحموود هەر بەخودا دەدرێتەوە.

١٢- بەڕاسـتی هەرکەسـێ ئـەم پوختـەی صـەحیحی مَوسـلیمەی لـەماڵا بـێ، وە ڕێـزو هەقی خۆیی بداتێ، وادابنێ کە هەمیشە وا لەمەجلیسی پێغەمبەرداو، بەگوێچـکەی خۆی ئەم فەرموودە پیرۆزە صەحیحانە لەدەمی پێغەمـەر خـۆی دەبیسـتێ، چـونکە سەرجەمیان صەحیحن، یەك فـەرموودەی ضـەعیفیـان تیـادا نییـە، چـونکە زاناکـان

دەفەرموون: (دروستترین کتێب، لەپاش قورئانی پیرۆز، صەحیحی بوخاری یە، ئەوجا صەحیحی موسلیم).

خودایە! چاوی خێرت لێمان بێ، ڕەنجەڕۆمان نەکەی، بەڕەحمەتی خۆت تاوانەکانمان بپۆشی، ئاواتی دینو دنیامان بهێنە دی، خوایە! لەمردوو و زیندوومان خۆش بە، بەڕەحمەتی خۆت کاری دینو دنیامان بۆئاسان بفەرموو، لەدایكو باوکمان خۆش بە، خوایە! چاوی ڕەحمەتت لەخۆمانو ماڵو منداڵو براو خوشكو کەسو کارو دۆستو برادەرمان بێ (**يَا حِيُّ يَا قَيُّومُ بِرَحْمَتِكَ أَسْتَغِيثُ**) خودایە بەرەکەت بخەرە تەمەنو قەڵەممان، بۆ خزمەتی شەریعەتی ئیسلام، هەتا دوا هەناسە. خودایە! لەگەڵ ئەوانەدا حەشرمان بفەرموو، کە هەمیشە هاودەمو هۆگری صەحیحی بوخاریو صەحیحی موسلیمو تاجول ئوصولو ریاضی صالحینن.

**ئامین یا ربَّ العَالمين.**

بەڕاستی ئەم کتێبانە زانا زاناتر دەکەن، چرای دڵو دەرونن، باشترین زەخیرەن بۆ رۆژی قیامەت.

**غَفَرَ اللهُ لِي وَلِوَالِدَيَّ وِلِسَائِرِ المُسْلِمِينَ، وَصَلَّى اللهُ تَعالى عَلَى سَيِّدِنَا محمدٍ وَ آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ. وَآخِرُ دَعْوانَا أَنِ الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين.**

**وەرگێڕ**
**نوری فارس حەمە خان**
**خادم المشايخ والعُلَمَاءِ الفقراء**
**کوردستان/سلێمانی/مامۆستایان/گەڕەکی قازی**
**موحەممەد/ماڵی خۆمان**



# ١-١/١- نامەی باوەڕ (كِتَابُ الإِيمَان)

(تاج/١٧/١، زنجیرە:١ تا زنجیرە:٧، لاپەڕە:٤٦ + تەجریدی بوخاری/١، لاپەڕە:٣٠، ٧٧)

## ١) باسی: سەرەتای باوەڕ وتنی (لَا إِلَه إِلاَّ اللَّه) یە
## باب أَوَّلُ: الْإِيمَانِ قَوْلُ لا إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ. (٨/٦)(*).

(١١٥- ١٢٠) واتە لە ژمارە: ١١٥ هەتا ژمارە: ١٢٠ لەسەرجەمی فەرموودەکانی صەحیحی موسلیم وا لەم باسەدا وەهەروا.

٨/٦ – باب الأمر بالإيمان بالله تعالى وَرسوله (صلى الله تعالى عليه وسلم) وَشَرائِع الدّينِ والدُّعَاءِ إليه... وحفظه وتبليغه...

١- عَنْ أَبِى جَمْرَةَ، قَالَ: كُنْتُ أُتَرْجِمُ بَيْنَ يَدَيِ عَبْدِاللّهِ بْنِ عَبَّاسٍ وَبَيْنَ النَّاسِ، فَأَتَتْهُ امْرَأَةٌ تَسْأَلُهُ عَنْ نَبِيذِ الْجَرِّ، فَقَالَ: إِنَّ وَفْدَ عَبْدِ الْقَيْسِ أَتَوْا رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « مَنِ الْوَفْدُ؟ أَوْ مَنِ الْقَوْمُ؟ ». قَالُوا: رَبِيعَةُ. قَالَ: « مَرْحَبًا بِالْقَوْمِ أَوْ بِالْوَفْدِ غَيْرَ خَزَايَا وَلاَ النَّدَامَى ». قَالَ: فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللّهِ! إِنَّا نَأْتِيكَ مِنْ شُقَّةٍ بَعِيدَةٍ، وَإِنَّ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ هَذَا الْحَيَّ مِنْ كُفَّارِ مُضَرَ، وَإِنَّا لاَ نَسْتَطِيعُ أَنْ نَأْتِيَكَ إِلاَّ فِى شَهْرِ الْحَرَامِ، فَمُرْنَا بِأَمْرٍ فَصْلٍ نُخْبِرْ بِهِ مَنْ وَرَائَنَا، نَدْخُلُ بِهِ الْجَنَّةَ. قَالَ: فَأَمَرَهُمْ بِأَرْبَعٍ، وَنَهَاهُمْ عَنْ أَرْبَعٍ، قَالَ: أَمَرَهُمْ بِالإِيمَانِ بِاللَّهِ وَحْدَهُ. وَقَالَ: « هَلْ تَدْرُونَ مَا الإِيمَانُ بِاللَّهِ وَحْدَهُ؟». قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: « شَهَادَةُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامُ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ، وَصَوْمُ رَمَضَانَ، وَأَنْ تُؤَدُّوا خُمُسًا مِنَ الْمَغْنَمِ ». وَنَهَاهُمْ عَنِ الدُّبَّاءِ، وَالْحَنْتَمِ، وَالْمُزَفَّتِ. قَالَ شُعْبَةُ: وَرُبَّمَا قَالَ: النَّقِيرِ. وَرُبَّمَا قَالَ الْمُقَيَّرِ. وَقَالَ: « احْفَظُوهُ وَأَخْبِرُوا بِهِ مِنْ وَرَائِكُمْ ». وَزَادَ ابْنُ مُعَاذٍ فِي حَدِيثِهِ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: وَقَالَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِلأَشَجِّ، أَشَجِّ عَبْدِ الْقَيْسِ: « إِنَّ فِيكَ لَخَصْلَتَيْنِ

---

(*) ژمارەی یەکەم ژمارەی ئەم بابەیە لەم طەبعەی شەرحی موسلیم، ژمارەی دووەم ژمارەی ئەم باسەیە لە تحفة الأشراف دا. – وەرگێڕ–

يُحِبُّهُمَا اللّٰهُ: الحِلْمُ وَالأَنَاةُ». (الحديث رَقم ١١٦ والحديث رقم ١١٧ صحيح مسلم بِشرح الإمام النووى، تحقيق الشيخ خليل مأمون شيخا – دار المعرفة. بيروت – لبنان. الطبعة الثانية عشر ١٤٢٧هـ ٢٠٠٦م طرفه في: ١١٥، الإيمان رقم/١٢٧ حسب ترقيم فتح المُلْهِم بِشَرْح صحيح مسلم تأليف الشيخ شبير أحمد العثماني. أخرجه البخاري في: ٥٣، ٨٧، ٥٢٣، ١٣٩٨، ٣٠٩٥، ٣٥١٠، ٤٣٦٨، ٤٣٩٦، ٦١٧٦، ٧٢٦٦، ٧٥٥٦ مختصر صحيح البخاري المسمَّى بالتجريد الصّرِيح. رقم: ٤٩. أخرجه أبو داود في: ٣٦٩٢، ٤٦٧٧، أخرجه الترمذي في: ١٥٩٩، ٢٦١١. واخرجه النسائي في: ٥٠٤٦، ٧٥٠٨. تحفة الأشراف (٦٥٢٤). {م١/٣٥ – ٣٦ = صحيح مسلم ج/١ ص٣٥ – ٣٦. چاپی استنبول}.

ئەبو جەمرە (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لە خزمەتی ئیبنو عەباس دا بووم، (رەزای خودای لێ بێ)، تەرجومانیم لە نێوانی ئەوو خەڵکەکەدا دەکرد، ئەگەر بە باشی لە زاراوی یەکتری تێ نەگەیشتنایە، من لە یەکتریم حاڵی دەکردن، لەکاتی قسەو گفتوگۆو وەڵامو پرسیاردا، لەسەر داوای ئیبنو عەباس خۆی دوو مانگ لە خزمەتیدا مامەوە، تەرجومانیم بۆ دەکرد. جارێ ئافرەتێ هاتە خزمەتی، لەبارەی خۆشاوی بەستووەوە پرسیاری لێ کرد، نەیی لێ کرد لەوە، (بەستوو واتە: کووپە).

ئەبوجەمرە فەرمووی: منیش عەرزیم کرد: خۆ من کووپەڵەیەکی سەوزم هەیە، خۆشاوی تیا دەکەمو لێی دەخۆمەوە، فەرمووی شتی وا مەکە، چونکە کاتێ کە نوێنەرەکانی هۆزی عەبدولقەیسین هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)، فەرمووی: (ئەم نوێنەرانە کێن؟ یا فەرمووی: ئەم خزمانە کێن؟) گوتیان: لە خێڵی عەبدولقەیسن، کە دەچێتەوە سەر هۆزی رەبیعە. پێغەمبەریش پێی فەرموون: (خزمینە! بەخێر بێن، ئێوە لە ئیسلام بوون دوا نەکەوتوون، هەتا بەهۆی ئەوەوە تەریقیو شەرمەزاریتان بەسەر بێ، وەکارێکی واشتان لە دژی ئیسلام نەکردووە، کە پەشیمانی لەدوا بێ). عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە لە رێگەیەکی دووری پڕ زەحمەتەوە هاتووین، سەرەڕای ئەوەیش ئێمە کە دێین بۆ خزمەتی تۆ، بۆ مەدینە، بەسەر ئاواییەکا دێین، کە لە کافرەکانی هۆزی موضەرن، لەبەرئەوە ناتوانین بێین بۆ خزمەتت، مەگەر لە مانگە حەرامەکانا، کە

هـەراو شـەڕو شـۆڕیان تیـادا قەدەغەیـە، کـە ئـەم چـوار مانگـەن: نێـو جـەژنان (ذوالقعدة)و قوربان‌و موحەڕەم‌و ڕەجەب. ئادەی بفـەرموو، ئامۆژگارییـەکی روون‌و ئاشـکرامان پـێ بفـەرموو، کـە گەڕاینـەوە بـۆ ولاتـی خۆمـان، بـە خەڵـکەکەی لای خۆمانی رابگەیەنین‌و، هەموو پابەندی ببین‌و کارو رەفتی پێ بکەین، هـەتا بـەهۆی جێبەجێ کردنی ئەو فەرمانەی تۆوە بچینە بەهەشت. فەرمووی: وە لـەبارەی ئـەو دەفرانەوە کە خواردنەوەیان تێ دەکرێ پرسیاریان لێـکرد، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ کردن بە چوار شت‌و، نەیی لێ کردن لە چوار شت:

**یەکەم:** فەرمانی پـێ کـردن بـە باوەڕهێنـان بـە خـودای تـاك‌و تـەنیا. فـەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئایا دەزانن بڕواهێنان بـە خـودای تـاك‌و تـەنها چییەو چۆنە؟) گوتیان: خواو پێغەمبەری خوا باشی دەزانن. فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (برێتییـە لە شایەتمان لەسەر ئەم شـێوەیە: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلـه إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَشَرِيكَ لَـهُ وَأَشْـهَدُ أَنَّ محمداً رَسُولُ اللهِ: بە زمان شایەتی دەدەم‌و بە دڵ باوەڕ دەکەم، کە بێجگە لە یـەزدانی پاك هیچ خودایەکی تر نییە، خوایەکی تاك‌و تەنهایـە، بـێ هاوەڵـە، هـیچ هاوبەشـی نییە، بەهەمان شێوە، بەدەم‌و بەدڵ، شایەتی دەدەم‌و باوەڕم هەیە کە موحەممـەدی کوڕی عەبدوڵلا فروستادەو پێغەمبەری خوایە).

**دووەم:** فەرمانی پێـکردن بە کردنی نوێژ بە ڕێـك‌و پێـکی.

**سێیەم:** فەرمانی پێکردن بە دانی زەکات.

**چوارەم:** فەرمانی پێـکردن بە گرتنی رۆژووی مانگی رەمەزان.

وە فەرمانیشـی پێیـان کـرد: کـە لـە دەسـتکەوتی تـالانی جـەنگیش پێـنج یـەك بدەن). وە پێشگیریشی لێـکردن لـەم چـوار شـتە، کـە بـەکاریان نـەهێنن بـۆ دروسـت کردنی خۆشاوو سرکەو دۆشاو، چونکە شتی ناویان زۆر زوو دەترشێ‌و تونـد دەبـێ‌و دەبێ بە ئـارەق‌و مـەی‌و بـادە، نـەیی لێـکردن لـە بـەکارهێنانی کوولەکـەو کوپەڵـەو بەستووی زفت دراوو کۆتکە دار، کە بۆکردنی خۆشاوو شتی وا بەکاریان بهێنن).

فەرمووشی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەم فەرمایشتانەیش کـە لـەم ماوەیـەدا لـەمنتان بیستووە، باش لەبەریان بکەن‌و رایان بگەیەنن بە خەڵکی ولاتی خۆیشتان).

**ئیمامی موسلیم** (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: عەبدوڵڵای کوڕی موعاز، لە گێڕانەوەی خۆیدا، بۆ ئەم فەرموودەیە، کە لە موعازی باوکیەوە دەیگێڕێتەوە، ئەمەی پترە:**

**پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **بە سەرۆکی شاندەکەی فەرموو، کە ناسراو بوو بە ئەشەججی سەرۆکی هۆزی عەبدولقەیس: (دوو ڕەفتاری پەسەندو جوان لە تۆدا هەن، خودا خۆشی دەوێن‌و ڕەزای لەسەریانە، کە بریتین لە هێمنی‌و لە سەلاری‌و لەسەر خۆیی). (ریاض الصالحین/ ٢ ژمارە: ٦٣٢، لاپەڕە: ١٧٠ وەرگەڕاوە کوردیەکەی، التـاج الجـامع للأصـول في أحاديـث الرسـول/٤ لاپـەڕە: ٨٥ ژمـارە: ٣، ٤، ٥، ٦ = ژمـارە/٢٧٣٨، ٢٧٣٩، ٢٧٤٠، ٢٧٤١، چ/٤. وەرگـەڕاوە کوردیەکـەی. موسـلیم لـە ئـەبو سەعدی خودرییەوە، ژمارە: ١١٨و ١١٩و ١٢٠).**

**ڕوونکردنەوە:**

١. **بڕیاری ئەم فەرموودەیە، لەم فەرموودەی تری پێغەمبەردا، ڕوون کراوەتەوە کە دەفەرموێ: (من بە ئێوەم گوتبوو کە لەهەندێ دەفرو حاجەتدا شت مەخۆنەوە، یا شتی تیا دروست مەکەن، بەڵام حاجەت خۆی لەخۆیا شت حەڵاڵ، یا حەرام ناکا، ئەوەندە هەیە کە هەموو سەر خۆشکەرێ حەرامە). (موسلیم ٥١٧٥، ٥١٧٦، ٥١٧٧) کەواتە ئێستا دروستە لەم دەفرانەدا سرکەو خۆشاوو دۆشاو بکرێ.**
٢. **بۆ ژیاننامەی ئیبنو عەباس بڕوانە: (تەجریدی صەریح/١، لاپەڕە/١٩، ژمارە/٥).**
٣. **ئەبو جەمرە ناوی نەمری کوڕی عیمرانە، فەرموودەی لە ئیبنو عەباس‌و ئیبنو عومەرو سەحابەی ترو تابیعینەوە گێڕاوەتەوە، بە کۆی دەنگ جێگەی متمانەی فەرمووده زانەکان بووە، لە پیاوانی صەحیحەینە، باوکی قازی بەصرە بووە، لە شاری سەرخەس، لە ساڵی ١٢٨ کۆچیدا مردووە، (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ).**
٤. **ئەشەجج ناوی مونزیری کوڕی عائیز بوو، پێغەمبەر ناوی نا ئەشەجج، بە کوردی واتە: کونج، چونکە دەموچاوی کونج بوو، (کچێکی ژنی مونقیزی کوڕی حیان بوو، مونقیز لەسەردەمی نەزانیدا، بۆ بازرگانی دەچوو بۆ مەدینە، جارێ**

لەپاش کۆچ کردن، لێفەو خورمای برد بۆ فرۆشتن بۆ مەدینە، لەوێ بە خزمەت پێغەمبەر دەگاو موسوڵمان دەبێو سوورەتی فاتیحەو عەلەق فێردەبێو دەگەڕێتەوە بۆ هەجەر، پێغەمبەر نامەیەکی پیادا دەنێرێ بۆ هۆزی عەبدولقەیس، کە موسوڵمان ببن، بەڵام چەند رۆژێ نامەکە دەرناخات، ژنەکەی سەرنج دەدا مێردەکەی گۆڕاوەو نوێژ دەکا، بە باوکی خۆی دەڵێ: مونقیز ئەوەتی لە مەدینە گەڕاوەتەوە گۆڕاوە لەبەر چاوم، دەستو پای دەشوا روو دەکاتە ئەم لایە، واتە: قیبلەو پشتی دەچەمێنێتەوەو تەوێڵی لەسەر زەوی دائەنێ، ئەوەتی لە یەثریب گەڕاوەتەوە ئەمە کاریەتی، جا مونقیزو ئەشەجج کۆدەبنەوەو لەم بارەیەوە گوفتوگۆ دەکەنو ئەشەجج موسوڵمان دەبێو نامەکەی پێغەمبەر دەگەیەنێ بە هۆزەکەیو موسوڵمان دەبنو بڕیار دەدەن کە شاندێ بە نوێنەری ئەوان بچێت بۆ خزمەتی حەزرەت ... تاد).

٢- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) يَوْماً بَارِزاً لِلنَّاسِ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! مَا الإِيمَانُ؟ قَالَ: « أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّـهِ، وَمَلاَئِكَتِهِ، وَكِتَابِهِ، وَلِقَائِهِ، وَرُسُلِهِ، وَتُؤْمِنَ بِالْبَعْثِ الآخِرِ ». قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّـهِ! مَا الإِسْلاَمُ؟ قَالَ: « الإِسْلاَمُ أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ ولاَ تُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً، وَتُقِيمَ الصَّلاَةَ الْمَكْتُوبَةَ، وَتُؤْتِىَ الزَّكَاةَ الْمَفْرُوضَةَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ ». قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّـهِ! مَا الإِحْسَانُ؟ قَالَ: « أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنَّكَ إِنْ لاَ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ ». قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! مَتَى السَّاعَةُ؟ قَالَ: « مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ وَلَـكِنْ سَأُحَدِّثُكَ عَنْ أَشْرَاطِهَا: إِذَا وَلَدَتِ الأَمَةُ رَبَّهَا فَذَاكَ مِنْ أَشْرَاطِهَا، وَإِذَا كَانَتِ الْعُرَاةُ الْحُفَاةُ الْجُفَاةُ رُءُوسَ النَّاسِ، فَذَاكَ مِنْ أَشْرَاطِهَا، وَإِذَا تَطَاوَلَ رُعَاةُ الْبَهْمِ فِى الْبُنْيَانِ فَذَلِكَ مِنْ أَشْرَاطِهَا، فِى خَمْسٍ لاَ يَعْلَمُهُنَّ إِلاَّ اللَّـهُ ». ثُمَّ تَلاَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): {إِنَّ اللَّـهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى الأَرْحَامِ (وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَداً وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ) إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ}. {لقمان: ٣٤} قَالَ: ثُمَّ أَدْبَرَ الرَّجُلُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « رُدُّوا عَلَىَّ الرَّجُلَ ». فَأَخَذُوا لِيَرُدُّوهُ فَلَمْ يَرَوْا شَيْئاً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « هَذَا: جِبْرِيلُ، جَاءَ لِيُعَلِّمَ النَّاسَ دِينَهُمْ ». (الحديث ٩٧ أطرافه في: ٩٨،

٩٩، ٩٣ – الإيمان. بخاري: ٥٠: ٤٧٧٧ – الإيمان. ابن ماجه: ٦٤ – إيمان، ٤٠٤٤ – أشراط السناعة. تحفة الأشْرَاف: ١٤٩٢٩ – تجريد البخاري: ٤٧ – تاجى كوردى/ ١، ل-١٨، ژماره: ٢).

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبەری خوا (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هات لە شوێنێکی بەرچاودا لەناومانا دانیشت، لەوکاتەدا پیاوێ هات بۆ خزمەتی، گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئیمانو باوەڕم بۆ روون بکەرەوە، باوەڕ چییە؟ فەرمووی: (ئەوەتا کە باوەڕ بکەی بەخوداو، بە فریشتەکانیو، بە نامەو نووسراوەکانیو، بە گەیشتن بە دیداری لە قیامەتداو، بە فروستادەو پێغەمبەرەکانیو، بەرۆژی زیندو بوونەوەو، هەستانەوە لەگۆڕ). پیاوەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی ئیسلامەتی چییە؟ فەرمووی: (ئیسلامەتی ئەوەتانێ کە خودا بپەرستیتو هاوبەشی بۆ بڕیار نەدەیتو نوێژە فەرزەکان بە جوانی بکەیتو زەکاتی فەرزکراو بدەیتو رۆژووی رەمەزان بگریتو حەجی ماڵی خودا بکەیت). وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی چاکە چییە؟ فەرمووی: (چاکە ئەوەیە کە بە چەشنێ وا خودا بە جوانی بپەرستیت کە وەك چاوت لە خودا بێ وابێ، خۆ ئەگەر تۆیش ئەو نەبینیت، بێگومان کە ئەو تۆ لەهەموو حاڵێکا دەبینێ، کە مادەم وابێ شایانی ئەوەیە هەمیشە شەرمو شکۆی لێ بکرێ).

ئینجا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! قیامەت کەیەو رۆژی قیامەت کەی دێت؟ فەرمووی: (منیش لە تۆی باشتر لێ نازانم، بەڵام وا باسی نیشانەکانی قیامەتت بۆ دەکەم: ئەوەتە کە مناڵ بە چاوی کارەکەرو نۆکەر تەماشای دایكو باوکی خۆیان بکەن، ئەوە یەکێکە لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی قیامەت، وە ئەوەتا کە بەچاوی خۆت ببینی: رەشو رووتو پێ پەتیو پێخاوسەکان ببن بە سەرۆكو کاربەدەستانی سەر خەڵکان، ئەمەیش یەکێکە لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی قیامەت، وە ئەوەتە کە بەچاوی خۆت ببینی: کە شوانو گاوانو وشترەوانو سارا نشینەکان ببن بە خاوەن موڵكو ماڵو سامانو، خانو بەرەو کۆشكو تەلاری لێ رابکێشنو فیزو دەعیەی پێوە بکەن، ئەمەیش یەکێکی ترە لە نیشانەکانی

نزيكبوونەوەی هەڵسانی قیامەت. زانینی کاتی هاتنی قیامەت بە تەواوی کەس نایزانێ چونکە یەکێکە لەو پێنج شتە غەیبیو نهێنیانە کە خوا نەبێ کەس نایان زانێ، کە برێتین لەم پێنج شتانە کەوان لەم ئایەتەدا، کە دەفەرموێ:

{إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ-سورة لقمان/ ٣١-٣٤}.

مەبەست لەم ئایەتە پیرۆزە ئەمەیە: زانینی ئەم پێنج شتە لە عیلمی غەیبە، لەو جۆرە زانستە نهێنییەیە کە هەر خوا خۆی دەیزانێو بەس: قیامەت کەی دەبێ، باران کەی دەبارێ، چی وا لەناو منداڵدانەکانا، کەس نازانێ سبەینێ چی دەکاو چی بەسەر دێ، کەس نازانێ کە لەکوێ دەمرێ، لە راستیدا هەر خودا خۆی زاناو ئاگادارە).

فەرمووی: جا لەپاشدا کە پیاوەکە رۆیشت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئادەی ئەو پیاوە بگێڕنەوە بۆلام، ئەوانیش کە چوون بیهێننەوە بۆلای کەسیان نەدی، پیاوەکە غەیب بوو بوو، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ویستی لە کارەکە حاڵیان بکا، فەرمووی: ئەوە جوبرائیل بوو، هاتبوو کە خەڵکەکە فێری یاسا سەرەکییەکانی ئاینی ئیسلام بکا). (ریاض الصالحین/١، لاپەڕە: ٧٤، ژمارە: ٦٠).

**روونکردنەوە:**

١- لەم فەرموودەدا چەند بەهرەیەکی گەورە هەیە: پێناسەی باوەڕو ئیسلامو چاکەی وا تیادا، ئەمەیش بەڵگەی ئەوەیە کە پێناسە سوننەتە. هەروا لە فەرموودەی کەدا دەردەکەوێ کە جوبرائیلو پێغەمبەر (درودی خودایان لەسەر بێ) جۆرە نواندنێکی شانۆگەرییان نیشان داوەو، رۆڵێکی گرنگیان داناوە بۆ هونەری نواندنو بۆ هۆکاری روونکردنەوە. کەواتە: ئەم جۆرە هونەرانە لە زاتی خۆیاندا، کارێکی رەواو بەجێن، بە مەرجێ بۆ کاری نابەجێ بەکار نەهێنرێن! (بڕوانە: فەرموودەی داستانی ئوم زەرع، تەجریدی بوخاری بە کوردی، بەرگی پێنجەم لاپەڕە: ٤٢) + (ژمارە:١٦٦٩ لەم کتێبە کەلەدواوە دێ).

٢ -ئـەبو هـورەیره (ڕەزای خـودای گـەورەی لێ بـێ) دەم سپی کۆمەڵەی هـەژارەکانی صوففه بوو، له ساڵی ئـازادکردنی قـەڵای خەیبـەردا موسوڵمان بـوو، لـه خزمـەت پێغەمبـەردا ئامـادەی ئـەم غەزایـه بـوو کـه سـاڵی حـەوتی کۆچـی بـوو، خـۆی دەفەرموێ: (به هەتیوی پەروەرده بووم، که کۆچم کرد بۆ مەدینـه هـەژار بـووم، بووم به ڕەنجبەرو خزمەتکاری بوسرەی کچی غـەزوان، خـوا کارێـکی وایکـرد کـه بـووم بـەمێردی). دوو گێڕانـەوه هەیـه بـه ناونـانی بـه ئـەبو هـورەیره، خـۆی دەفەرموێ: (... شوانی ڕانی ماڵی خۆمـان بـووم، پشـیلۆکەیەکی بچـکۆلەم هـەبوو، بەشەو لەناو درەختێـکا دامدەناو به ڕۆژ هەڵم دەگـرتو یـاریم پـێ دەکـرد، ئـیتر بەم هۆیەوه ناویان نام ئەبو هورەیره، به کوردی واته: پشـیلەوان، یـاخود: بـاوکی پشیلۆکه). هەنـدێ دەڵێن: پێغەمبەر ئەم ناوەی لێ ناوه.

لەپاش ئیسلام بوونی هۆگری پێغەمبەر بوو، هەمیشه له خزمەتیـدا بـوو، هـەم خزمـەتو بەردەسـتی دەکـردو هـەم فێـری فـەرموودەو زانسـتو ئـایین دەبـوو، لـه خزمەت حەزرەتدا، سکاڵای کرد که مەترسی ئەوەی هەیه که فـەرموودەکانی ئـەوی لـەبیر بچـێ، فـەرمووی: بەرماڵەکـەت ڕاخـه منـیش وامکـرد، بەمشـت زانسـتو فـەرموودەی تێـکرد، ئـەوجا فـەرمووی: ئـادەی کۆیکـەرەوە، منـیش بەرماڵەکـەم پێچایەوەو نووسانم به سینگمەوه، ئیتر لەپاش ئەوه هیچم لەبیر نەچووەتەوه.

ئەبو هورەیره، یادکارێـکی گەوره بوو، هەمیشـه سـەرگەرمی تەسـبیحاتو یـادی خودا بوو، لەگەڵ ژنەکەیو نۆکەرەکەیدا شەویان دەکرد بـه سـێ بەشـەوه، بـه نـۆره هەرکەسەیان سێ یەکی شەو شەو نوێژی دەکرد. له خزمەت پێغەمبەردا دەچوو بـۆ غـەزا، بـۆ حـەج، بـۆ سـەفەر، لـەناو هاوڕێـکانی پێغەمبـەردا کـەس بەقـەد ئـەو فـەرموودەی نەگێڕاوەتـەوه، (٥٣٧٤) پێـنج هـەزارو سـێ سـەدو حـەفتاو چـوار فـەرموودەی گێڕاوەتـەوه، لەسـەر فەرمایشـتی عەللامـەی عـەینی لـەم شـوێنەدا، وه هـەروا عـەینی دەفـەرموێ: لـه بوخـاری شـەریفدا (٤١٨) فـەرموودەی هەیـه، لـه موسلیمدا (٥١٥) فـەرموودەی هەیـه (٣٢٥) سێ سـەدو بیسـتو پێنجیـان پەسـەندی هـەردوو پیرن، واتـه: متفـق علـیهین، لەبـەینی بوخـاریو موسـلیمدا، کەواتـه: (٤١٨-

٩٣٣٢٥) نەوەدو سێ فەرموودەی لە بوخاری دا هەیە، کە لە موسلیم دا نین، وە (٥١٥-٣٢٥=١٩٠) سەدو نەوەد فەرموودەی لە موسلیمدا هەیە کە لە بوخاریدا نین. لەم شوێنەدا شێخی عەسقەلانی لە فەتحولباریدا دەفەرموێ: (کۆی فەرموودە دەرهێنراوەکانی ئەبو هورەیرە، لەدەقە سەربەخۆکان، لە صەحیحی بوخاریدا (٤٤٦) چوار سەدو چل‌و شەش فەرموودەیە).

ئەبو هورەیرە لە خێڵی ئەزدە کە دەچێتەوە سەر هۆزی دەوس، یەمەنییە، لەپاشا مەدینەیی، لە ذولحولەیفە، لە نزیك مەدینەوە نیشتەجێ بوو، لەوێ خانویەکی هەبوو، دوایی بەخێر دای بە ئازادکراوەکانی خۆی، دەیفەرموو: (پڕ دوو دەفرم لە پێغەمبەرەوە شت لەبەرکردووە یەکێکیان ئەم فەرمایشت‌و فەرموودانەیە کە بەناو موسوڵماناندا پەخشی دەکەمەوە، ئەگەر ئەوی تریان بڵاو بکەمەوە، لەسەری ئەدەن لە گەردنم).

پێشەوا بوخاری دەڵێ: (زیاتر لە هەشت سەد کەس، لە صەحابی‌و لە تابیعی، فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە!). وەك: ئیبنو عەبباس‌و ئیبنو عومەرو جابیرو ئەنەس‌و واثیلەی کوڕی ئەسقەع، لە هاوڕێیانی پێغەمبەر. وەك: سەعیدی کوڕی مسیّب‌و عوروەی کوڕی زوبەیرو ئەعرەج‌و مقبری‌و محرری کوڕی خۆی‌و کەسانی تر، لە پەیڕەوان (تابعین). خۆشی فەرموودەی لەم زاتانەوە گێڕاوەتەوە: لە ئەبوبەکرو عومەرو فەزلی کوڕی عەباس‌و ئوبەییەی کوڕی کەعب‌و ئوسامەی کوڕی زەیدو عائیشەو کەسانی تریش. لە تەمەنی حەفتاو هەشتساڵیدا، لە ساڵی پەنجاو هەشتی کۆچیدا لە مەدینە کۆچی دوایی کردووە لە گۆڕستانی بەقیع بە خاك سپێردراوە. بۆ زێدە سوودو بەهرە لەم بارەیەوە بڕوانە ئەم شوێنانە: تەجریدی بوخاری بە کوردی ژمارە: ٨٤، ٩٧، ٩٨، ٩٩، ١٢٢، ١٩٥، ٤١٧، ٤١٩، ٥٨٣ لەبەرگی/ ١، لە بەرگی دووش بڕوانە: ٧٧٩، ١٠٦٦، ١٠٨٧، ١٢٠٦، ١٧٤٥، ١٨٠٠، ١٨٠٩، ١٨١٠، ٢٠٠٨ هەروا بڕوانە تاج/ ٥، لاپەڕە: ٢١٧ زنجیرە: (٦٢) = تاج/٣ ژ/٣٥٢١ هەتا ٣٥٢٦ ج/٤ تا کۆتایی.

٣- عَنِ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: لَمَّا حَضَرَتْ أَبَا طَالِبٍ الْوَفَاةُ، جَاءَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَوَجَدَ عِنْدَهُ أَبَا جَهْلٍ، وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أُمَيَّةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ،

فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « يَا عَمِّ! قُلْ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، كَلِمَةً أَشْهَدُ لَكَ بِهَا عِنْدَ اللَّهِ ». فَقَالَ أَبُو جَهْلٍ وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِى أُمَيَّةَ: يَا أَبَا طَالِبٍ! أَتَرْغَبُ عَنْ مِلَّةِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ؟ فَلَمْ يَزَلْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَعْرِضُهَا عَلَيْهِ، وَيُعِيدُ لَهُ تِلْكَ الْمَقَالَةَ، حَتَّى قَالَ أَبُو طَالِبٍ آخِرَ مَا كَلَّمَهُمْ: هُوَ عَلَى مِلَّةِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وَأَبَى أَنْ يَقُولَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « أَمَا وَاللَّهِ لأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ مَا لَمْ أُنْهَ عَنْكَ ». فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِى قُرْبَى مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ). وَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى فِى أَبِى طَالِبٍ، فَقَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): {إِنَّكَ لاَ تَهْدِى مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِى مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ – القصص/٥٦}. (الحديث١٣١ – أطرافه في: ١٣٢، ١٣٣، ١٣٤، بخاری/١٣٦٠، ٣٨٨٤، ٤٦٧٥، ٤٧٧٢، ٦٦٨١). نسائی/ ٢٠٣٤ جنائز. تحفة الأشراف(١١٢٨١) ترمذي/ ٣١٨٨ تحفة الأشراف (١٣٤٤٢). تجريد: ٦٤٥}:

سەعیدی کوڕی موسەییب (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لە باوکیەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ نیشانەی مردن لە ئەبو تالیب دیاری داو هاتە سەر مردن، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوو بۆلای، لەوکاتەدا ئەبو جەهل‌و عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئومەییەی کوڕی موغیرەی لەلابوون، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بە ئەبو تالیبی فەرموو: (ئەی مامە! بڵێ: لاَ إله إلاَّ اللهُ، دەیکەم بە بەڵگەی باوەڕو شایەتیت بۆ دەدەم لەلای خودا لەسەر ئەوە کە تۆ ئەم وشە پیرۆزەیەت قەبووڵ کردووە!

بەڵام ئەبو جەهل‌و عەبدوڵڵای کوڕی ئومەییە (کە لەوکاتەدا لەوێ بوون) چوونە بن کلێشەی‌و پێیان گوت: ئەی ئەبو تالیب! دەتەوێ لە ئایینی عەبدولموتەلیب‌و باوو باپیری خۆت لابدەیت‌و حاشای لێ بکەیت!

ئیتر ئەمانە گەلێ قسەیان لەم بارەیەوە لەگەڵدا کردو دڵیان سارد دەکردەوە، هەموو جارێ کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەیدا بە گوێی مامەیدا کە شایەتمان بهێنێ، ئەوانیش وەك شمڵی شەڕ بەرپەرچیان دەدایەوەو دووبارە دەیانگوتەوە: ئای حاشا دەکەی لە میللەت‌و ئایینی باوو باپیری خۆت. هەتاکوو دوا قسەی ئەوە بوو گوتی پێیان: کە ئەو لەسەر ئایینی عەبدولموتەلیبی باوکێتی، وەقایل نەبوو کە

بلێ: لاَ إِله إِلاَّ اللهُ. ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەدیی بە خودا هەر بۆت دەپاڕێمەوەو داوای لێخۆش بوونت لەخودا بۆ دەکەم، بە مەرجێ کە خودا ئەوەم لێ قەدەغە نەکات).

جا خودای گەورەو مەزن، بەم بۆنەیەوە، ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە، کە دەفەرموێ: {مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُواْ أُوْلِي قُرْبَى مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ – سورة التوبة/ ١١٣}.

واتە: ڕەوا نەبووەو نییە بۆ پێغەمبەرو بۆ ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوەو ئیسلامیان قەبووڵ کردووە، ئەمە کە داوای لێخۆشبوون بکەن لە خودای گەورە بۆ بێبڕواو هاوبەش پەیداکەرەکان، گەرچی ئەو بێبڕوایانە خزمو کەسوکاریشیان بن، مادەم دەرکەوت بۆیان کە ئەو کافرانە دۆزەخین}.

سەبارەت بە ئەبو تالیبیش خودای گەورە ئەم ئایەتەی نارد: {إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَـكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاء وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ – سورة القصص/ ٥٦}:

واتە: (ئەی خۆشەویست! ئەی موحەممەد! هیدایەتو خستنە سەر ڕێگەی حەق بە دەست تۆ نییە، بەڵکوو بە دەستی خوایە، لەبەرئەوە تۆ بەبێ خواستی خوا لەسەر شتێ ناتوانی خۆشەویستانی خۆت بخەیتە سەر ڕێگەی هەق). {تاجول ئوصوول بە کوردی بەرگی/٦ لاپەڕە: ٢١٢، ژمارە: ٢٠، ٢١، ٢٢، ٢٣، ١٩ = بەرگی/٤ ز/١٠ ژ/٣٩١١، ٣٩١٢، ٣٩١٣، ٣٩٠٦ + تەجرید/٢، لاپەڕە: ٦٥، ژمارە: ٦٤٥}.

**ڕوونکردنەوە:**

١-ئەبو تالیب ناوی عەبدولمەنافی کوڕی عەبدولموتەلیبە، مامەی هەقی پێغەمبەرە، واتە: برای دایكو باوکی عەبدوڵلای باوکیەتی، باوکی ئیمامی عەلییە. (بڕوانە: تەجرید ژمارە: ٥، ٧٨٨، ١١١٦، ١٢١٨، ١٤٦٢، ١٤٦٩، ١١٣، ١٥٠٠، ١٥١٠، ١٥٤٧، ١٥٧٩، ١٥٤، ١٥٩١، ٣، ٧٥، ٩٤، بەرگی/ ٤ لاپەڕە: ٢٣٩، ٢٤٨، ٧٢٨، ١٥١٧).

٢-ئەبو جەهل بە کافری کوژراوە لە غەزای بەدردا (بڕوانە: تەجریدی بوخاری ژمارە: ١٥٢٦، ب/٤، لاپەڕە: ٢٥١ + تاج/ ٨/ ٢٠٨ زنجیرە: ٨٦ ژمارە: ١ = تاج/٤ ز/٨٦ ژ/٤٥٨٦ - کوشتنی ئەبو جەهل لە غەزای بەدردا). ئەم مەلعوونە ناوی عەمری

کوڕی هیشامی کوڕی موغیرەی مەخزومییە، کەمێ خێڵ بوو، مەئبوون بوو، واتە: بەدناو بوو، ناسراوە بە فیرعەونی ئەم نەتەوەی ئیسلامە، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەواڵی کوشتنی بیست، خۆی چوو بۆ سەر لاشەکەی هەتا بزانێ کە راستە تۆپاوە، کە بینی کوژراوە راوەستا لەسەری‌و سێ جار فەرمووی: (سوپاس بۆ خودا کە بەهۆی کوشتنی ئەم ستەمکارەوە، ئیسلام‌و موسوڵمانانی سەر بەرزو شادمان کرد).

ئەبو جەهل زۆر ئازاری پێغەمبەرو موسوڵمانانی دەدا. (بڕوانە: بەرگی یەکەم لە مختصری صحیحی بوخاری کە ناسراوە بە تەجریدی بوخاری، فەرموودەی ژمارە: ١٧٢ کە دەکەوێتە لاپەڕە/ ١٩٠وە) هەروا بەرگی/ ٤ لاپەڕە: ١٢٥ ژمارە: ١٤٤٣}. ئەم مەلعوونە یەکەم کەس بوو، کە لەسەردەمی ئیسلامدا سەری بڕێ، کاتێ پێغەمبەر بە کوژراوی چووە سەر لاشەکەی فەرمووی: (ئەی دوژمنی خودا! سوپاس بۆ ئەو خودایەی کەتۆی بەم دەردە بردو ئاوا ریسوای کردی، ئەمە فیرعەونی ئەم ئومەتەی من بوو، سەرۆکی پێشەوایانی بێبڕواکانە). ئەوجا پێغەمبەر کوڕنووشێکی سوپاسی برد بۆ خودا. لاشەکەی بە فەرمانی پێغەمبەر توڕدرایە بیرەکەی بەدرەوە (بڕوانە: ژمارە: ٤/١٥٢٧، لاپەڕە: ٢٥٢).

٣ -عەبدوڵڵای کوڕی ئومەییە (رەزای خودای لێ بێ) گەرچی لە پێشدا زۆر ئازاری موسوڵمانانی داوەو، دوژمنایەتی‌یەکی سەر سەختانەی بەرابەر بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەنجام داوە، بەڵام لەپێش ئازادکردنی شاری مەکەدا ئیسلام بووەو، موسوڵمانێکی جوانی لێ دەرچوو، پورزای پێغەمبەر بوو، دایکی ناوی عاتیکەی کچی عەبدولموتەلیبە، برای باوکی حەزرەتی ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەرە، لە خزمەت پێغەمبەردا ئامادەی ئازادکردنی مەککەو غەزای حونەین‌و غەزای تائیف بووە، لە غەزای تائیفدا تیرێ بەری دەکەوێ، بەو تیرە شەهید دەبێ (بڕوانە: تەجرید/ ٤/ ٣٣٦ ژمارە: ١٥٩١ + تاج/٣، لاپەڕە: ١٤٠ ژمارە: ٦، زنجیرە: ٥٦ = تاج/٢ ژ/٢١٩٦ چ/٤ - باسی بەتەنیا کۆبوونەوە....)

٤-سەعیدی کوڕی موسەییەبی کوڕی حەزن، سەعید تابیعییە، باوکی‌و باپیرەی سەحابی (هاوڕێ)ی پێغەمبەر بوون، لە مەککەوە کۆچیان کرد بۆ مەدینە، موسەییەب بازرگان بوو، لەو کۆمەڵەیە، کە لە ژێر درەختەکەی شەجەرەتول ریزواندا، پەیمانی بەست لەگەڵ پێغەمبەردا، حەوت فەرموودەی گێڕاوەتەوە، سیانیان لە بوخاری پیرۆزدا هەیە، فەرموودەی لە موسلیمیشدا هەیە، وەك ئەم فەرموودەیە، حەزن رۆژی ئازادکردنی مەککە ئیسلام بوو، یەکێك بوو لە پیاو ماقوڵانی قورەیش، ئامادەی شەڕی یەمامە بوو، حەزن دەفەرموێ: چوومە خزمەت حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ناوت چییە؟) گوتم: ناوم حەزنە (واتە: هەردەو هەڵەت‌و رەقەن!) حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نا، ناوت سەهلە) {واتە: نەرمانی‌و دەشت‌و خۆش‌و ئاسان} . منیش بە گوێم نەکردو عەرزیم کرد: ناوێ ناگۆڕم کە باوکم لە منی ناوە! ئیبنولموسەییب دەیفەرموو: (ئیتر لەوساکەوە کە باپیرەم ئەم قسە رەقەی لە رووی پێغەمبەردا کردووەو بە گوێی نەکردووە کە خۆی ناو بنێ سەهل، سەر رەقی‌و توندو تیژیمان هەتا ئێستاش لەناودا ماوەو لێمان نابڕێ — تاج/ ١٠، لاپەڕە: ١٦١، ژمارە: ١، زنجیرە: ٦٥ = تاج/٥ ژ/٥٤٠٧ چ/٤ - گۆڕینی ناوی ناشیرین).

حەزن دوو فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە: کاتێ لەپێش هاتنی ئیسلامدا بناغەی کابەیان دانایەوە، حەزن بەردێکی لە کابە برد، بەردەکە لە دەستی خۆی راپسکان‌و رۆیشتەوە جێگەکەی خۆی لە دیواری کابەتوڵلا. حەزن دەستی شیعری هەبوو. لەکاتی جێنشینی ئەبوبەکردا لە رۆژەکەی شەڕی یەمامەدا شەهید کرا، (رەزاو رەحمەتی خودا لە خۆی‌و لە موسەییەبی کوڕی‌و لە سەعیدی کوڕەزای).

سەعید لە پەیڕەوانە (لە تابعینە) یەکێکە لە رجالی صەحیحەین، یەکێکە لە مەلا گەورەو ناودارەکانی مەدینە، کە ناسراون بە (فقهاء المدینة: شەرع زانەکانی مەدینە) لە نزیکەی چل هاوڕێی پێغەمبەرەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە، دادەنرێ بە سەروەری تابیعین، لە ساڵی سێیەمی جێنشینی عومەری کوڕی خەتابدا لە دایك بووە، لە ساڵی (٩٤) نەوەدو چواری کۆچیدا، لە سەردەمی جێنشینی وەلیدی کوڕی

عەبدولەلیکدا، فەرمانی هەقی بەجێ هێناوەو مردووە، (ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لەم کوڕو باوكو باپیرەیە بێت). ئامین. (بڕوانە: تاج/ ٥، لاپەڕە: ٣٣١ + تاج/ ١٠، لاپەڕە: ١٦١، ژمارە: ١ — عمدة القارئ/٨ ص١٨٠، العمدة/ ٢٢ ص٢٠٧ + ئیصابەو ئیستیعاب لە ناوی (حزن ومُسَیَّب)دا}.

٥-ئەم فەرموودەیە: أ- موتتەفەقوعەلەیە، واتە: پەسەندی هەردوو پیرە، كە شێخی بوخاریو شێخی موسلمین، ئەم دوو فەرموودە زانە گەورانە، لەیەك كەسەوە كە (مسیَّبة)، ئەم فەرموودەیەیان دەرهێناوە.

ب- دادەنرێ بە مورسەلی صەحابی، چونكە لەكاتی ڕوودانی ئەم داستانەدا كە ئەم گفتوگۆیە لە نێوانی پێغەمبەرو ئەبو تالیبو ئەواندا ڕووی داوە، نە موسەییەبو نە حەزنی باوكی موسولمان نەبوونو، موسەییەبیش ڕوونی نەكردۆتەوە كە ئەم فەرموودەیەی لەكێ بیستووە، بەلام مورسەلی صەحابی بڕیاری مەرفووعی هەیە، چونكە صەحابەی پێغەمبەر هەموویان عودوولن، واتە: ڕاستو ڕاستگۆو دادپەروەرن، شتێ هەقو ڕاست نەبێ قەت نایلێن، كەواتە: موسەییەب یا خۆی بەدیار ئەم گفتوگۆیەوە بووەو باسی ئەوەی نەكردووە، یا ئەم داستانەی لە كەسێكی باوەڕپێكراوو متمانەدار بیستووەو ناوی نەهێناوە. بەهەر حاڵ لەكاتی مردنی ئەبو تالیب، مُسَیَّب وحَزْن موسوڵمان نەبوون.

ج- ئەم فەرموودەیە كە بوخاریو موسلیم دەریان هێناوە، دادەنرێ بەیەكێ لە فەرموودە ئەفرادەكانی صەحیحەین، چونكە ئەم فەرموودەیە كە موسەییەب دەیگێڕێتەوە، موسەییەب یەك ڕاوی هەیە، كە سەعیدی كوڕیەتی، بەلایەنی كەمەوە، بۆئەوەی كە ڕەفعی جەهالە ببێ لە ڕاوی، دەبێ دوو ڕاوی ببێ، بەلام چونكە صەحابە هەموویان دادپەروەرن، تاقە یەك ڕاویشی هەبێ بەسە.

د- هۆی ئەوەی كە پێغەمبەر زۆر مەبەستی بوو، ئەبو تالیبی مامەی ئیمان بهێنێ، ئەوەبوو كە ئەبو تالیب لە ژیانیدا زۆر باش بوو بۆ پێغەمبەر.

**٢) باسی: فەرمایشتی پێغەمبەر: فەرمانم پێکراوە کە بجەنگم لەگەڵ ئەو خەڵکەدا، هەتا دەڵێن: (لا إله إلاَّ الله)}. (١٢٤ - ١٣٠).**

**باب: أمِرْتُ أنْ أقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لا إله إلاَّ الله (٩/٨)**

٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ)، قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَاسْتُخْلِفَ أَبُو بَكْرٍ بَعْدَهُ، وَكَفَرَ مَنْ كَفَرَ مِنَ الْعَرَبِ، قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ لأَبِي بَكْرٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ): كَيْفَ تُقَاتِلُ النَّاسَ وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، فَمَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، فَقَدْ عَصَمَ مِنِّي مَالَهُ وَنَفْسَهُ إِلاَّ بِحَقِّهِ، وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ!». فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَاللَّهِ! لأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الصَّلاَةِ وَالزَّكَاةِ، فَإِنَّ الزَّكَاةَ حَقُّ الْمَالِ، وَاللَّهِ! لَوْ مَنَعُونِي عِقَالاً كَانُوا يُؤَدُّونَهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهِ. فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: فَوَاللَّهِ! مَا هُوَ إِلاَّ أَنْ رَأَيْتُ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ شَرَحَ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ لِلْقِتَالِ، فَعَرَفْتُ أَنَّهُ الْحَقُّ.

(الحديث ١٢٤ —١٣٠— الإيمان. بوخاری: ١٣٩٩، ١٤٥٧، ٢٩٤٦، ٦٩٢٤، ٧٢٨٢، ١٤٠٠، ١٤٥٦، ٦٩٢٥، ٧٢٨٥. ئەبو داود: ١٥٥٦، ١٥٥٧. ترمذي: ٢٦٠٧. نسائي: ٢٤٤٢، ٣٠٩١، ٣٠٩٢، ٣٠٩٣، ٣٩٨٠، ٣٩٨١، ٣٩٨٣، ٣٩٨٥. تحفة الأشراف (١٠٦٦٦). تجریدی بوخاری — کوردی، بەرگی/٢، ل- ٩٤، ژمارە: ٦٦٩).

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆچی دوایی کرد، وە لەپاش ئەو ئەبوبەکر کرا بە جێنشین (واتە: بە خەلیفە) وە ئەو عەرەبانەی کە لەپاش مەرگی پێغەمبەر، لە ئایین هەڵگەڕانەوە پەیدا بوون، وە ئەبوبەکر ویستی بچێ بەگژیانا، بەم بۆنەیەوە، عومەری کوڕی خەتاب پێی فەرموو: تۆ چۆن جەنگ دەکەی لەگەڵ ئەم خەڵکەداو، بەڵگەت چییە لەم بارەیەوە؟ ئەی چی دەکەی لەوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (فەرمانم پێکراوە، لەلایەنی خواوە، کە شەڕ لەگەڵ ئەو خەڵکەدا بکەم، کە هاوەڵ بۆ خودا پەیدا دەکەن، تا شایەتمان دەهێنن‌و بەزمان دەڵێن: لا إله إلا الله: هەر خودا خودایەو بەس) ئیتر ئەو کەسەی کە ئەمە بڵێ، ئەوا سەرو ماڵی خۆی لەمن قەدەغە دەکاو، خوێن‌و ناموس‌و سەرو سامانی لەمن حەرام دەبێ، مەگەر لەسەر مافێکی رەوا، کە لەسەری بێ بەپێی یاسا نامەی خودا، وەك ئەوە کەسێکی بە

ناڕەوا کوشتبێ، ئەوە دەکوژرێتەوە لە جیاتی ئەوە. وە ئیتر حیسابو لێپرسینەوەی لەسەر نیازی دڵی، لەودنیا، لەسەر خودا خۆیەتی)؟ جا بۆم روون بکەرەوە: کە ئایا ئەم بڕیارو هەڵوێستەی تۆ چۆن لەگەڵ بڕیاری ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەردا یەك دەگرنەوە؟!

ئەبوبەکریش (رەزای خودای لێ بێ) بۆ وەڵامی ئەم رەخنەیەی عومەر، فەرمووی: ئەمەی تۆ دەیڵێی راستە، بەڵام مەسەلەکە گەلێ لەم رواڵەتکارییە قووڵترە، بەخودا زۆر باش دەچم بەگژ ئەوانەدا کە فەرقی نوێژو زەکات دەکەنو دەڵێن: نوێژ فەرزەو دەیکەینو، زەکات فەرز نییەو نایدەین، چونکە ئەمە بڕوبیانووە، چونکە هەروەك نوێژ فەرزە، زەکاتیش فەرزە، ئەو مافەیە کە خوا پێویستی کردووە لە سامانا، ئەوەی حاشای لێ بکاو پێی لێ نەنێ، حاشا لە ئەصڵێ لە ئوصوڵی ئایین دەکا، جا لەبەرئەوە دەچم بە گژیدا، سوێندم بەخودا ئەگەر لەم لایەنەوە جیاوازی لەنێوانی منو پێغەمبەردا بکەن، لێیان قەبووڵ ناکەم، کەواتە ئەگەر لەمەوبەر پەتە زەکاتێ، یا گێسکە زەکاتێکیان دابێ بە پێغەمبەرو ئێستا بە بڕو بیانوی بێ سەروبەر، نەیدەن بەمن، کە جێنشینی پێغەمبەرمو فەرمانڕەوای گشتی موسوڵمانانم، لەسەر نەدانی ئەو پەتە، یا ئەو گێسکەیە دەچم بەگژیاناو جەنگیان لەگەڵ دەکەم هەتا دەیدەن پێم، کە سەرفی بکەم بۆ بەرژەوەندی گەلی ئیسلام!

عومەر دەیفەرموو: بەخودا دیاربوو کە کردنی ئەو جەنگە، شتێ بوو لە خوداوەو خودا خۆی نابوویە ناو دڵی ئەبوبەکرەوە، وە بەرەبەرە منیش بۆم دەرکەوت کە بەڵگەو فەرایشتەکەی ئەبوبەکر راستو هەق بوو (بڕوانە: تاج/ ٢، لاپەڕە: ١٢، ژمارە: ٤، ش/د/ت/ن = شەیخانو ئەبو داوودو تەرمەزیو نەسائی ژ/٢ ژ/١١٨٥ چ/٤ + تاج/ ٣، لاپەڕە: ٢٢٩، ژمارە: ١، زنجیرە/ ٨٨ — ژ/٢٣٣٥ چ/٤ حوکمی وەرگەڕاو لە دینو ... تاد). بڕوانە: فەرموودەکەی کە یەکسەر وا لەدوا ئەم فەرموودەیەوە.

٥- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ،

وَيُقِيمُوا الصَّلاَةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ عَصَمُوا مِنِّى دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إِلاَّ بِحَقِّهَا، وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ » . (الحديث ١٢٨ — الإيمان. بوخاري: ٢٥. تحفة الأشراف (٧٤٢٢) (بڕوانە: تەجریدی بوخاری/١/٤٤، ژ: ٢٤ + ژ: ٨ تجرید — ١/٣١).

**عەبدوڵڵای کوڕی عومەر** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: (فەرمانم پێکراوە لە لایەنی خواوە، کە شەڕ بکەم لەگەڵ ئەم خەڵکەدا، هەتا شایەتمان دەهێنن و بەزمان دەڵێن: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَه إِلاَّ الله وَأَنَّ محمداً رَسُولُ الله: شایەتی دەدەم کە هەر خودا خودایەو، لەلایەن ئەوەوە کراوە بە فروستادەو، ڕەوانەکراوە بۆ سەر ئەو خەڵکە، وەتا پێنج فەرزەی نوێژ، ڕۆژانە، بەجوانی جێبەجێ دەکەن و، زەکاتی فەرز دەدەن، کاتێ ئەوەیان کرد، ئیتر سەروماڵ و خوێن و نامووسیان لەمن قەدەغە دەبێ، مەگەر لەسەر حەقی شەرعی، جا لەدوا ئەوە لێپرسینەوەیان لەبارەی نیازی دڵیانەوە لەو جیهانا لەسەر خوایە).**
**(بڕوانە: ژمارە: ٤ + ریاضي صالحين/ ١، لاپەڕە: ٣٧٢ چاپی یەکەم = بەرگی/ ١، لاپەڕە: ٣٠٤، چاپی/٢، ژمارە: ٣٩٠ — ش + تاج/٢/ ١٢، ژمارە:٤، زنجیرە:٢ ژ/١١٨٥ ج/٤).**

**ڕوونکردنەوە:**

**ئیبنو عومەر ناوی عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتابە، ساڵی سێی پێغەمبەرایەتی لەدایك بووە، لەگەڵ باوکیدا لە تەمەنی دە ساڵیدا کۆچی کردووە بۆ مەدینە، یەکێکە لەو شەش هاوڕێیانەی پێغەمبەر، کە فەرموودەی زۆریان گێڕاوەتەوە، یەکێکە لەو چوار کەسە کەناویان عەبدوڵڵایەو ناسراون بە عەبادیلەی ئەربەعە، واتە: چوار عەبدوڵڵاکە، کە دووەمیان ئیبنو عەبباسە، سێیەمیان عەبدوڵڵای کوڕی عەمرە، چوارەمیان عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرە، دوو هەزارو شەش سەدو سیی فەرموودەی گێڕاوەتەوە، لە بوخاری پیرۆزدا (٢٥١) فەرموودەی هەیە، لە صەحیحی موسلیمدا (٢٠١) فەرموودەی هەیە، سەدو حەفتایان پەسەندی هەر دوو لایانەو موتتەفەقوعەلەیهییە لە نێوانیانا، لەناو هاوەڵانی پێغەمبەردا، بێجگە لە ئەبو هورەیرە، کەسی تر بەقەد ئەو فەرموودەی نەگێڕاوەتەوە، ئیبنو عومەر**

خوێنەوار بوو، ڕۆژانە قورئانی بەدەستەوە بوو قورئانی دەخوێندەوە، پیاوێکی قەویلەی سەوزە بوو، پێغەمبەر مەدحی زۆری کردووە، هەتا مرد لەسەر ئەو شێوە ژیانو جۆرە خوا پەرستیانە بوو، کە لەسەر دەمی پێغەمبەردا، بە ئاگاداری پێغەمبەر لەسەریان بوو، زۆر بە وەرعو تەقوا بوو، شەو نوێژێکی زۆری دەکرد، گەلێ شەو چوار جار یا پێنج جار سەرخەوی دەشکانو هەڵ دەسایەوەو دەسنوێژی دەگرتو دەستی دەکرد بە شەو نوێژ، خێری زۆری دەکرد زۆر سەخی بوو، لە سەفەرا ڕۆژووی نەدەگرت، بەڵام لەماڵەوە مەگەر چۆنها، دەنا هەمیشە بەڕۆژوو بوو، هەموو ساڵێ حەجی دەکرد، لەپاش مەرگی پێغەمبەر، شەست ساڵ مەجلیسی گەرم بوو، خەڵك پۆل پۆل دەهاتن بۆ خزمەتی، بۆ فەتواو فێربوونی سوننەتو شەریعەت، ئاگاداری تەواوی هەبوو لە سوننەتی پێغەمبەرو، لەڕاو بۆچوونی هاوەڵانی، موسوڵمانان لە دوورو نزیکەوە، دەستە دەستە دەهاتنە خزمەتی بۆ فەتواو شەرعکردنو فێربوونی زانستو فەرمووده. دەڵێن: شت نیە لە کاروباری پێغەمبەرو هاوەڵانی کە ئیبنو عومەر نەیزانێ.

جارێ شتێ لە ئیبنو عومەر دەپرسن، دەفەرموێ: نازانم، لەپاشا دەفەرموێ: (بۆ ئێوە دەتانەوێ کە پشتی ئێمە بکەن بە پردی سەر دۆزەخ، خۆتان رزگار بکەنو ئێمە پێوە بکەن، شتی هەڵە بکەنو بڵێن: ئیبنو عومەر فەتوای ئەمەی بۆ داوین!).
ئیبنو عومەر زۆر بە باشی هەرچی لە پێغەمبەر دەبیست لەبەری دەکردو کاری پێ دەکرد، ئەگەر لە مەجلیسێکا خۆی لە خزمەتیدا نەبوایە، لە ئامادەبوانی خزمەتی دەپرسی کە پێغەمبەر چی کردووەو چی فەرمووە، بە وردی پەیڕەوی ئەو کارانەی دەکرد، کە پێغەمبەر کردبوونی، زۆر حەزی لە تەتەببوعی ئاساری پێغەمبەر بوو، دێنی ئەو شوێنانەی دەکرد کە پێغەمبەر چوو بوو بۆیان، لەو مزگەوتانەدا نوێژی دەکرد کە پێغەمبەر نوێژی لێ کردبوون، هەموو جارێ کە یادی پێغەمبەری دەکرد دەگریا، خۆی پیرۆز دەکرد بە شوێنەوارو ئاسەواری پێغەمبەر، گوتەی بەهێزتر ئەوەیە کە لەتەمەنی هەشتاو حەوت ساڵیدا، لە ئەنجامی پیلانێکی حەجاجدا، پشتی پێی بەنێزەیەکی زەهراوی زامار دەبێو چەند ڕۆژێ نەخۆش دەکەوێو

دەمرێ، حەجاج نوێژ لەسەر تەرمەکەی دەکات، ساڵی حەفتاو سێی کۆچی دەبێ، لەفەخ دەمرێ کەوا لە نزیك مەککەوە. (بڕوانە: تەجرید/ ١/ ٣١، ژمارە: ٨ + تاج/ ٥، لاپەڕە: ١٣٠ = تاج/٣ ز/٢٧ + تجريد/ ١/ ٣٠١، ژمارە: ٢٩٥، ژمارە: ٢٩٤ + تەجرید/ ٥/ ١٢٦، ژمارە: ١٨٣٣).

**٣) حەرامبوونی کوشتنی کەسێ، لەپاش گوتنی وشەی پیرۆزی (لاَ إِله إِلاَّ اللّهُ). (٢٧٠ – ٢٧٥). {باب: مَنْ قَتَلَ رَجُلاً مِنَ الكُفَّارِ بَعْدَ أَنْ قَالَ: لاَ إِله إِلاَّ اللّهُ.}**

واتە: ئەم باسە لە صەحیحی موسلیمدا، لە فەرموودەی ژمارە/ ٢٧٠ وە هەتا فەرموودەی ژمارە/ ٢٧٥ی واتیادا.

٤١/٤٠ – باب: تحريم قَتْلِ الكَافِرِ بَعْدَ أَنْ قَالَ: لاَ إِله إِلاَّ اللهُ. ج/١ ص٢٨٢ = اسم هذا الباب في صحيح مسلم بشرح الإمام النووي. تحقيف الشيخ خليل مأمون شيحا.

٦- عَنِ الْمِقْدَادِ بْنِ الأَسْوَدِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ: أَرَأَيْتَ إِنْ لَقِيتُ رَجُلاً مِنَ الْكُفَّارِ، فَاقْتَتَلْنَا، فَضَرَبَ إِحْدَى يَدَيَّ بِالسَّيْفِ فَقَطَعَهَا، ثُمَّ لاَذَ مِنِّى بِشَجَرَةٍ، فَقَالَ: أَسْلَمْتُ لِلَّهِ، أَفَأَقْتُلُهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ بَعْدَ أَنْ قَالَهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « لاَ تَقْتُلْهُ » . قَالَ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنَّهُ قَطَعَ يَدَيَّ، ثُمَّ قَالَ ذَلِكَ بَعْدَ مَا قَطَعَهَا، أَفَأَقْتُلُهُ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لاَ تَقْتُلْهُ، فَإِنْ قَتَلْتَهُ فَإِنَّهُ بِمَنْزِلَتِكَ قَبْلَ أَنْ تَقْتُلَهُ، وَإِنَّكَ بِمَنْزِلَتِهِ قَبْلَ أَنْ يَقُولَ كَلِمَتَهُ الَّتِى قَالَ». (الحديث: ٢٧٠ - ٢٧٥) – الإيمانَ.

أَمَّا الأَوْزَاعِيُّ وَابْنُ جُرَيْجٍ فَفِى حَدِيثِهِمَا: (قَالَ: أَسْلَمْتُ لِلَّهِ). وَأَمَّا مَعْمَرٌ فَفِى حَدِيثِهِ: فَلَمَّا أَهْوَيْتُ لأَقْتُلَهُ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. (الحديث ٢٧١). بوخاری: ٤٠١٩، ٦٨٦٥ عن المقداد، المغازي/ الديات/ ٤٢٦٩، ٦٨٧٢ عن أسامة بن زيد/ المغازي/ الديات. تەجریدی بوخاری/ ١٥٣٥ بەرگی/٤، ل – ٢٦٩. أبو داوَد: ٢٦٤٤/ الجهاد. تحفة الأشراف (١١٥٤٧) عن المقداد – ٢٦٤٣ عن أسامة بن زيد (تحفة الأشراف: ٨٨).

میقدادی کوڕی عەمری ئەل کیندی (ڕەزای خودای لێ بێ) کە سوێند خوار (حليف)ی هۆزی بەنی زوهرە بوو، وە لە خزمەت پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) ئامادەی

جەنگی بەدر بوو بوو، فەرمووی: عەرزی خۆشەویستم کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! پێم بفەرموو: ئەگەر تووشی کابرایەکی بێ بڕوا (کافر) بووم‌و چووین بەگژ یەکا، بە شمشێر دای لە دەستێکم، وە دەستی پەڕاندم‌و، ئەنجا خۆی لێم دایە پاڵ قەدی درەختێك، یا شتێ واو، کەزانی وامن زۆرم بۆی هێناوە، گوتی: ئەوا موسوڵمان بووم‌و باوەڕم هێنا بە خودا، جا ئایا لەپاش گوتنی ئەم وشەیە، لە هەل‌و مەرجێکی واواییدا، بیکوژم یانا؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (مەیکوژە). گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو پاش ئەوەی کە دەستێکی منی پەڕاندووە ئەوسا وادەڵێ؟

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (مەیکوژە، خۆ ئەگەر بیکوژیت، ئەوە ئەو دەچێتە پایەی تۆ بەرلەوەی کە ئەو بکوژیت‌و وەك ئەوکاتەی تۆ، رشتنی خوێنی حەرام‌و ناڕەوا دەبێ، وە تۆیش دەچیتە پایەی ئەو، بەرلەوەی کە موسوڵمان ببێ‌و، وەك ئەوکاتەی ئەو رشتنی خوێنت حەلاڵ دەبێ، بەلام لەبەر شلۆقی هەلۆێست بەهانەت هەیەو تۆڵەت لێ ناسێنرێ). (بڕوانە: ژمارە: ١٥٨١ تەجرید + ریاض الصَّالحین بەکوردی، بەرگی یەکەم، لاپەڕە/ ٣٠٥ — ٣٠٧ ژمارە: ٣٩٢، ٣٩٣، ٣٩٤. تاج/٨، ل — ١١٥، ژمارە: ٤، زنجیرە: ٤٣ — = ژ/٤٤٥٥، ٤٤٥٦ تاج/٤ ج/٤ - خەبات‌و غەزا لە بنەڕەتدا دەبێ لەبەر رەزای خودا بێ).

**روونکردنەوەو هێنانەوەی تەرم لە دوورە ولاتەوە:**

١ - لە پلەی یەکەمدا مەبەستی سەرەکی لەم فەرموودەیە ئەوەیە: (کوشتنی موسوڵمان بەناڕەوا، تاوانێکی گەلێ گەورەیە، لە موسوڵمان ناوەشێتەوە، تەنانەت ئەگەر کەسێ وشەی شایەتمان بڵێ‌و بە رواڵەت موسوڵمان ببێ، دروست نییە ئیتر بکوژرێ، بگرە کەسێ تاوانی وا گەورە ئەنجام بدا خۆی لە کوفرو بێبڕوایی نزیك دەکاتەوە).

٢ -میقدادی کوڕی عەمری کیندی، کە میقدادی کوڕی ئەسوەدیشی پێ دەگوترێ، یەکێکە لەناوداره فره باشەکانی یارانی پێغەمبەر، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)

دایناوه بەیەکێ لە وەزیرە بەڕێزەکانی خۆی، میقداد ئامادەی ئازادکردنی وڵاتی میصر بووە، وە لەوێش مردووە، بەڵام لەوێوە موسوڵمانان تەرمەکەیان هێنایەوە بۆ مەدینە، لە مەدینە ناشتیان، حەزرەتی عوسمان نوێژی مردووی لەسەری کرد، ئەمە لە ساڵی سیی‌و سێی کۆچیدا بوو، میقداد دوو کۆچی کردووە، کۆچێ بۆ حەبەشەو کۆچێ بۆ مەدینە، ئامادەی غەزای بەدرو شەڕگاکانی تری دوای بەدر بووە، بۆ نموونەیێ لەسەر بەرزی‌و دڵسۆزییەکانی میقداد، بفەرموو بڕوانە: فەرموودەی ژمارە: (١٥٢٤ تەجرید = ٣٩٥٢ فەتحولباری).

میقداد خۆی دەفەرموێ: کە هاتین بۆ مەدینە، پێغەمبەر دەکەس، دەکەس دابەشی کردین بەسەر ماڵەکانا، من لەو دەکەسە بووم کە لەگەڵ پێغەمبەردا بووین، تەنیا یەك سەر مەڕمان هەبوو، شیرەکەیمان دەدۆشی‌و لەناو خۆمانا وەك یەك دابەشمان دەکردو دەمانخواردەوە، بەوە دەژیایین!

میقداد یەك فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە، کە ئەم فەرموودەیە، کە پێشەوا بوخاری (رەحمەت لە گۆڕی نازداری) لەم دوو شوێنەدا دەریهێناوە لە (المغازي)و لە (الدِّيَات)دا. پێشەوا موسلیم لەم شوێنەدا بە سێ گێڕانەوەی کەمێ جیا دەری هێناوە. میقداد خوڵامێکی رۆمی هەبوو، دەستی پزیشکی هەبوو، میقدادیش ورگن بوو، ورگی زۆر گەورە بوو، خوڵامەکەی پێی گوت: ئەگەر حەزدەکەی سکت هەڵ دەدڕم‌و ئەم بەزو چەورییەی لێ دەردەهێنم‌و سووکی دەکەم بۆت، جا وایکردو شوێنەکەی دوورییەوە، بەڵام سکی هەوی کردو میقداد مرد، خوڵامەکەش هەڵهات‌و رای کرد، لە راستیدا ئەنجامدانی کاری واو هێنانەوەی تەرمی میقداد لە میصرەوە بۆ مەدینە، لەسەردەمی جێنشینی عوسماندا، بەبێ دەربڕینی رەخنەو پێشگیری‌و ناڕەزایی لەم کارانە، لەلایەنی هاوەڵانی پێغەمبەرو پەیڕەوانی ئەوانەوە، کە ناسراون بە سەحابەو تابیعین، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە کاری وا دروستە، کەواتە: دروستە تەرمی کوردە ئاوارەکانی خۆشمان لەم سەردەمەدا، لە هەندەرانی دوورەوە بهێنرێتەوە بۆ کوردستانی خۆمان، وەکاری وا بێ شەرعی نییە، گەرچی خاڵیش

نییە لەگێرەو کێشەو سەراسێ. وە لەهەمان کاتدا ئەمە باشترین بەڵگەیە لەسەر دروستبوونی کرداری نەشتەرگەری، لەکاتی ناچاریو پێویستدا، با مەترسیداریش بێ. میقداد پیاوێکی بالاّ بەرزی رەنگ سەوزەی مواوی برۆ پەیوەستی چاو قەوی بوو، ریشی خۆی بەبۆیەی زەرد، زەرد دەکرد، پێغەمبەر ئامۆزایەکی خۆی لێ مارەکرد، کە ضباعەی کچی زوبەیری کوڕی عبدالمطلیب بوو میقداد حەفتا ساڵێ ژیاوە، میقداد یەکێ بوو لەو حەوت کەسەی کە بۆ هەوەڵجار ئیسلام بوونی خۆیان ئاشکرا کرد.

٧- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي سَرِيَّةٍ فَصَبَّحْنَا الْحُرَقَاتِ مِنْ جُهَيْنَةَ، فَأَدْرَكْتُ رَجُلاً فَقَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، فَطَعَنْتُهُ. فَوَقَعَ فِي نَفْسِي مِنْ ذَلِكَ، فَذَكَرْتُهُ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « أَقَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَقَتَلْتَهُ؟!». قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّمَا قَالَهَا خَوْفًا مِنَ السِّلاَحِ! قَالَ: « أَفَلاَ شَقَقْتَ عَنْ قَلْبِهِ حَتَّى تَعْلَمَ أَقَالَهَا أَمْ لاَ؟! ». فَمَازَالَ يُكَرِّرُهَا عَلَيَّ حَتَّى تَمَنَّيْتُ أَنِّي أَسْلَمْتُ يَوْمَئِذٍ. قَالَ: فَقَالَ سَعْدٌ: وَأَنَا وَاللَّهِ لاَ أَقْتُلُ مُسْلِمًا حَتَّى يَقْتُلَهُ ذُو الْبُطَيْنِ، يَعْنِي أُسَامَةَ، قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: أَلَمْ يَقُلِ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ – الأنفال/ ٣٩). فَقَالَ سَعْدٌ: قَدْ قَاتَلْنَا حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ، وَأَنْتَ وَأَصْحَابُكَ تُرِيدُونَ أَنْ تُقَاتِلُوا حَتَّى تَكُونَ فِتْنَةٌ. {الحديث ٢٧٣ - ٢٧٥}. الإيمان. سبق تخريجه في رقم:٦.

ئوسامەی کوڕی زەید (رەزای خودا لە خۆیو باوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ لقێ پێشمەرگەدا، ناردینی بۆ غەزای خێڵی حورەقە، کە لە هۆزی جوهەینەن، وە لەگەڵ دەمە دەمی بەیانا دامان بەسەریانا، خۆیان بۆ رانەگیراو شکان، منو پیاوێکی ئەنصاری نیشتینە سەر پیاوێ لەوان، هەتا بەرە بەرە تەنگمان پێ هەڵچنی، ئەوجا گوتی: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّه، ئیتر ئەنصارییەکە، وازی لێ هێنا، بەلاّم من بە رمەکەم دامگرت تا کوشتم، ئەمە بوو بە گرێ لەدڵما، ئەمەم باس کرد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: ئەی ئوسامە لەپاش ئەوەی کە گوتی: لاَ

إِلَهَ إِلاَّ اللّه، چۆن دەستت تێی چوو کە بیکوژیت؟!). منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! من وا دەزانم مەبەستی ئەوە بوو کە خۆی لە کوشتن قوتار بکا، لە ترسی تیغ وای گوت. فەرمووی: (ئەدی! بۆ دڵت هەڵنەدڕی تا بزانی لەبەرئەوە وای گوتووە یانا؟). ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەندە ئەم گوتەیەی دووبارە کردەوە، تەنانەت خۆزگەم خواست کە هەتا ئەو ڕۆژە موسوڵمان نەبوومایە، هەتا تووشی ئەم تاوانە گەورەیە نەبوومایە، لەکاتی ئیسلام بوونمداو لەوەدوا ئیسلام بوومایە.

فەرمووی: سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصیش فەرمووی: دەی سوێندم بەخودا منیش وەك ئەم ورگنە، واتە: وەك ئوسامەی کوڕی زەید، کە پیاوێکی ورگ زل بوو، شەڕی موسوڵمان کوژی ناکەم. فەرمووی: پیاوێکیش ڕەخنەی لە سەعد گرت لەسەر ئەم هەڵوێستە، کە ئەویش لەبەر ئەم فەرموودەیە، چاو لە ئوسامەی کوڕی زەید دەکاو، بەشداری لە جەنگی نێوانی عەلیو موعاوییەدا ناکات، پێی گوت: ئەی ئەوە نییە کە خودای گەورەو مەزن، بۆ ئەم بابەتە ڕێگەی جەنگی داوەو دەفەرموێ: {وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلّهِ} واتە: ئەی گەلی ئیسلام! بجەنگێن لەگەڵ ناموسوڵمانانا، هەتا بەر لە کفرو فرە خودایی بگیرێ، وەدینی حەق هەر بۆ خودا بێ، وە ئاژاوە نەقەومێ). سەعیدیش فەرمووی: بەڵێ ئێمە بەسەرینی پێغەمبەر، دەجەنگاین هەتا ئاژاوە دروست نەبێ، بەڵام تۆو تاقمەکەت دەتانەوێ کە جەنگ بکەن هەتا ئاژاوە بەرپاببێت). (بڕوانە: فتح الباري/ ١٢/ ١٩٦ رقم: ٦٨٧٢ — قول سعد: لا أقاتِلُ مسلماً حتى يقاتِلَهُ أسامَةُ + فتح الباري/ ١٣/ ٦٧. قول أسامة: ما خلَفَ صَاحِبَكَ. مع اسماء المعتزلين عن القتال أثناء الفتنة).

**ڕوونکردنەوە:**

ئوسامەی کوڕی زەید (ڕەزای خودای لێ بێ) خۆیو باوکی هاوڕێو خۆشەویستی پێغەمبەر بوون، نازناوی (الحبّ بن الحبّ = خۆشەویستی کوڕی خۆشەویست) بوو، نەخشی نقێمی ئەنگوستیلەکەی (حِبُّ رسول الله)ی بوو، کوڕی ئوممو ئەیمەنە، کە دایەو لەلەو دایکی شیریی پێغەمبەر بووەو بە منالی پەروەردەی کردووە، ئوسامە

ئەوەندە هۆشیارو لێهاتوو بوو، لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا، حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) کردی بە سەرکردەی لەشکر، کە پێغەمبەر مرد، تەمەنی بیست ساڵ بوو، سەدو بیستو هەشت فەرموودەی هەیە، پازدەیان پەسەندی هەردوو پیری بوخاریو موسلیمن، دوو فەرموودەیشی لە بوخاریدا هەیە، کە لە موسلیمدا نین، بەم جۆرە فەرموودەیێ، لە زاراوی فەرموودەدا دەگوترێ: لە ئەفرادی بوخارییە، دوو فەرموودەیشی لە صەحیحی موسلیمدا هەیە، کە لە بوخاریدا نین، بەم جۆرە فەرموودەیەیش دەگوترێ: لە ئەفرادی موسلمین. کەواتە: کۆی فەرموودەکانی لە صەحیحی بوخاریدا، دەکاتە: ١٥ + ٢ = ١٧. هەروا لە موسلیمدا دەکاتە: ١٥ + ٢ = ١٧. لە صەحیحیندا، کە صەحیحی بوخاریو صەحیحی موسلیمن دەکاتە: ١٥ + ٢ + ٢ = نۆزدە فەرموودە. لە وادیلقورا، لە ساڵی پەنجاو چواری کۆچیدا، لە تەمەنی پەنجاو پێنج ساڵیدا، گیانی پاکی سپاردووە (رەزاو رەحمەتی خوای لێ بێ)، ئەم فەرموودەیەی پەسەندی هەردوو پیرە (متفق علیه).

ئوسامە هەتا مرد بەشداری لە ئاژاوەکانا نەکردو لە شەڕی موعاوییەو عەلیداو، لە جەنگی صفینو جەمەلیش دا بەشداری نەکرد، لەپاش شەهید بوونی ئیمامی عوسمان ئوسامە بەرکەنار بوو لە ئاژاوە گەلەکان، هەتا لە سەردەمی جێنشینی موعاوییەدا مرد، زۆر لە هاوەڵانو لە پەیڕەوان فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، وەك ئەبو هورەیرەو ئیبنو عەباس. (بڕوانە: تەجریدی صەریحی بوخاری/ بەرگی/١، لاپەڕە: ١٣٨ + بەرگی/١٧/٥، ژمارە: ١٧٥٥ + کۆتایی ژمارە: ٦ کەوا لەپێش ئەم ژمارە حەوتەوە + رفع الخفا شرح ذات الشفا لابن الحاج الكردي ج/ ١ ص١١١ + تاج/ کوردی بەرگی/٥، لاپەڕە/ ١٢٥ — باسی چاکیی ئوسامە ز/٢٤ ژ/٣٣٩١، ٣٣٩٢، ٣٣٩٣، ٣٣٨٦ — ٣٣٩٠، ٣٤٤٥، ٣٤٤٦ + لاپەڕە: ١٢٣ زنجیرە: ٢٣، ژمارە: ١، ٢، ٣، ٤، ٥ + لاپەڕە: ١٦٣، زنجیرە: ٤٢، ژمارە: ١، ٢) بڕ: ژمارە ٨٧٣ لەدواوە).

٨- عَنْ صَفْوَانَ بْنِ مُحْرِزٍ: أَنَّ جُنْدَبَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ الْبَجَلِيَّ بَعَثَ إِلَى عَسْعَسِ بْنِ سَلَامَةَ، زَمَنَ فِتْنَةِ ابْنِ الزُّبَيْرِ، فَقَالَ: اجْمَعْ لِي نَفَرًا مِنْ إِخْوَانِكَ حَتَّى أُحَدِّثَهُمْ، فَبَعَثَ رَسُولاً، إِلَيْهِمْ

فَلَمَّا اجْتَمَعُوا جَاءَ جُنْدَبٌ وَعَلَيْهِ بُرْنُسٌ أَصْفَرُ، فَقَالَ: تَحَدَّثُوا بِمَا كُنْتُمْ تَحَدَّثُونَ بِهِ، حَتَّى دَارَ الْحَدِيثُ، فَلَمَّا دَارَ الْحَدِيثُ إِلَيْهِ حَسَرَ الْبُرْنُسَ عَنْ رَأْسِهِ. فَقَالَ: إِنِّى أَتَيْتُكُمْ وَلاَ أُرِيدُ أَنْ أُخْبِرَكُمْ إِلاَّ عَنْ نَبِيِّكُمْ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعَثَ بَعْثًا مِنَ الْمُسْلِمِينَ إِلَى قَوْمٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، وَإِنَّهُمُ الْتَقَوْا فَكَانَ رَجُلٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ إِذَا شَاءَ أَنْ يَقْصِدَ إِلَى رَجُلٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ قَصَدَ لَهُ فَقَتَلَهُ، وَإِنَّ رَجُلاً مِنَ الْمُسْلِمِينَ قَصَدَ غَفْلَتَهُ. قَالَ: وَكُنَّا نُحَدَّثُ أَنَّهُ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، فَلَمَّا رَفَعَ عَلَيْهِ السَّيْفَ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، فَقَتَلَهُ. فَجَاءَ الْبَشِيرُ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَأَلَهُ وَأَخْبَرَهُ، حَتَّى أَخْبَرَهُ خَبَرَ الرَّجُلِ كَيْفَ صَنَعَ فَدَعَاهُ، فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: « لِمَ قَتَلْتَهُ؟». قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَوْجَعَ فِى الْمُسْلِمِينَ، وَقَتَلَ فُلاَنًا وَفُلاَنًا، وَسَمَّى لَهُ نَفَرًا، وَإِنِّى حَمَلْتُ عَلَيْهِ، فَلَمَّا رَأَى السَّيْفَ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « أَقَتَلْتَهُ؟ ». قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: « فَكَيْفَ تَصْنَعُ بِلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ إِذَا جَاءَتْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ ». قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! اسْتَغْفِرْ لِى، قَالَ: « فَكَيْفَ تَصْنَعُ بِلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ إِذَا جَاءَتْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ ». قَالَ: فَجَعَلَ لاَ يَزِيدُهُ عَلَى أَنْ يَقُولَ: «فَكَيْفَ تَصْنَعُ بِلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ إِذَا جَاءَتْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ ». {الحديث ٢٧٥ – إِنْفَرَدَ بِهِ مُسْلِمٌ، تُحْفَةُ الأَشْراف - ٣٢٥٨} . (تاج الأصول/٤ ص٣٦٤. حاشية رقم (٨). م ١/ ٦٨ - ٦٩).

صەفوانی کوڕی موحریز (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: جوندوبی کوڕی عەبدوڵڵای ئەل – بەجەلی (ڕەزای خودای لێ بێ)، لە سەردەمی ئاژاوەکەی ئیبنو زوبەیردا، هەواڵی نارد بۆ عەسعەسی کوڕی سەلامەو فەرمووی: کۆمەڵێ لە برادەرانتم بۆ کۆبکەرەوە، هەتا لەبارەی ئەم ئاژاوەوە قسەیان بۆ بکەمو ئامۆژگاری خێریان بکەم، ئەویش نوێنەرێکی نارد بە شوێنیانا، کاتێ کۆبوونەوە، جوندوب هات جبەیەکی زەردی کڵاوداری لەبەردا بوو، بە خەڵکەکەی فەرموو: باسی چیتان دەکرد، قسەکانتان تەواوبکەن، کاتێ سەرەی قسە هاتە سەر جوندوب، کڵاو بۆرگەکەی لەسەری لاداو فەرمووی: من کە هاتووم بۆلاتان، دەمەوێ بەس فەرموودەو هەواڵی پێغەمبەرتان بۆ باس بکەم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەشکرێکی لە موسوڵمانان نارد بۆ سەر هۆزێ لە بت پەرستان، لە شوێنێکا بەرەنگاری یەکتری بوون، پیاوێ لە بت پەرستەکان پەلاماری هەرپیاوێ لە موسوڵمانانی دەدا، بوارەی نەدەدا هەتا

دەیکوشت، هەتا پیاوێ لە موسوڵمانان فرسەتی لێ هێناو، ئاگای لە خۆی نەبوو پەلاماری داو، هەڵمەتی بردە سەری بە شمشێری روتەوە، ئێمە لەناو خۆمانا قسەیان بۆ کردووین، کە ئەو پیاوە ئوسامەی کوڕی زەید بووە، جا کە شمشێرەکەی لێ راست دەکاتەوە، کابرا گوتی: لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللّـه. ئەویش کوشتی، کاتێ موژدەبەر مژدەی دا بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسیاری رووداوەکەی لێکرد، ئەویش خۆی چۆن بوو ئاوا بۆی گێڕایەوە، وە سەر گوزشتەکەی کابراکەیشی بۆ گێڕایەوە، کە چی کردبوو، وە چۆن کوژرا، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) ئوسامەی بانگ کردو لێی پرسی‌و پێی فەرمووو: (بۆچی کوشتت، نەدەبوو بیکوژی). ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێشی گەیاندبوو بە موسوڵمانان، فیسارە کەس‌و ئەو فیسارە کەسی کوشت – وە ناوی چەند شەهیدێکی بۆ پێغەمبەر هێنا، کە ئەو کابرایە، لەو نەبەردەدا بەدەستی خۆی کوشتبوونی – ئیتر منیش هەڵمەتم بۆ بردو تەنگم پێ هەڵچنی، بەڵام کە چاوی بە شمشێری رووت کەوت بەسەر سەریەوە بوو، زانی وا سوور دەکوژرێ، ویستی بە فێڵە جەنگانە خۆی رزگار بکا، بۆیە گوتی: لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللّـه، بە ئومێدی ئەوەی کە بەو فێڵە دەستی من سارد ببێتەوەو نەیکوژم. فەرمووی: (جا کوشتت؟) گوتی: ئا، کوشتم! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جا چی لە لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللّـه دەکەیت، ئەگەر لە رۆژی قیامەتدا بێت لەلای خودا شکاتت لێ بکا؟).

گوتی: قوربان! داوای لێخۆشبوونم لە خودا بۆ بکە، کە لەم تاوانە لێم خۆش بێ، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەموو جارێ، کە ئوسامە تکاکەیی دووبارە دەکردەوە لێی، لەمە زیاتری نەدەفەرموو: (جاچی لە لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّه دەکەیت، ئەگەر لە رۆژی قیامەتا بێت‌و لەسەرت ببێ بە داواکارو لەلای خودا شکاتت لێ بکاو، لەسەر گوتەرەکەی بکاتەوە!). (بڕوانە: ریاض/١/٣٠٧، ژ: ٣٩٤، ز: ٤٩).

**روونکردنەوە:**

١-ئازاوەکەی سەردەمی ئیبنو زوبەیر ئاوا بوو: عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیری کوڕی عەوام، خوشکەزای حەزرەتی عائیشە بوو، دایکی ئەسمای کچی ئەبوبەکرە، کاتێ کۆچی کرد بۆ مەدینە سکی پڕ بوو بە عەبدوڵڵا، ساڵی سێی کۆچی لە دایك بووە، یەکەم شت کە چووەتە دیوی دەروونی تفی پیرۆزی پێغەمبەر بوو، کە بە تفی خۆی گۆشی کرد، لەگەڵ باوکیداو لەگەڵ عائیشەی پووریدا، ئامادەی جەنگی ئەل-جەمەل بووە. (بڕوانە: ریاض/١/١٨٦، ژمارە: ٢٠٢).

زۆر مەردو دلێرو ئازاو بلیمەتو رەوانبێژو قسەزان بوو، کۆستە بوو، ریشو دەموچاوی مووی پێوە نەبوو، شەو نوێژێکی زۆری دەکرد، زۆر بەرۆژوو دەبوو، لە ساڵی شەستو چواری کۆچیدا، لەپاش مردنی موعاوییەی کوڕی یەزیدی کوڕی موعاوییە، پەیمانی جێنشینی پێ درا، خەڵکانی حیجازو یەمەنو عێراقو خۆراسان، گوێڕایەڵی بوون، هەشت ساڵ خۆی میر حەج بوو، حەجی بە موسوڵمانان دەکرد، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مەرگ بوو بەمیوانی، عەبدوڵڵا نۆ ساڵان بوو، لەگەڵ ئەوەشدا فەرموودەی زۆری لە پێغەمبەرەوە لەبەرکردووە، دەفەرموودەی لە صەحیحی بوخاریدا هەیە، یەکێکە لە چوار عەبدوڵڵاکان، ئامادەی شەرگای یەرمووك بووە لە خزمەت باوکیدا، ئامادەی ئازادکردنی ئەفریقیاش بووە.

لەپاش شەڕو شۆڕو بگرەو بەردەو کێشمە کێشمێکی زۆر، عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان حەجاجی بە لەشکرێکی گەورەوە، نارد بۆ سەر عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر، عەبدوڵڵا پاش شەڕو ئابلۆقەیەکی قورس، خۆی دایە پاڵ بەیت، بەڵام حەجاج گوێی بەشتی وانەدا، سەرەنجام لە ساڵی حەفتاو سێی کۆچیدا، لە تەمەنی حەفتاو دوو ساڵیدا، عەبدوڵڵا کوژراو، لە مەککە لە هەورازێ، کە دەکەوێتە سەر رێگەی مەککە — مەدینە کرا بەقەد دارخورمایەکا، دوایی دایان گرتو لاشەکەیان لەناو گۆڕستانی جوولەکەکاندا تووڕدا!! (بڕوانە: تاجی کوردی/١٠/٢٥٤ ز-٩٧ ژ-١ + تاج-٥-٧٩ ز-١٠ — مەزناهی زوبەیری کوڕی عەوام + ریاض-١-١٨٦، ژمارە: ٢٠٢، زنجیرە: ٢٥،

چاپی دووەم تاج-٥ ز-٩٧ ژ-٥٥٣٩ چ-٤ + تاج-٣ ز-١٠ ژ-٣٣١٢ هەتا ٣٣١٩ چ-٤ + تەجریدی بوخاری بە کوردی/٣٣٦/٣، ژمارە: ١٢١٣ – راڤەو شیکردنەوە).

٢ -جوندوبی کوڕی سوفیان ناوی تەواوی: جوندوبی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی سوفیانی بەجەلیە، بە دوو شێوە گێڕانەوەی لێوە دەکرێ: جوندوبی کوڕی عەبدوڵلا بەناوی باوکیەوە، جوندوبی کوڕی سوفیان بەناوی باپیریەوە، لە کۆفە دادەنیشت لەپاشا لە بەصرە، ناودار بوو بە جوندوبی خێر، لە بوخاریدا هەشت فەرموودەی هەیە، لە موسلیما دیسان فەرموودەی هەیە، لە هاوەڵە پاشینەکانی پێغەمبەرە، خۆی دەفەرموێ: بەسەرینیی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مـن جەهێڵێکی تەواو بووم، هەوەڵی دەمم بوو). (بڕوانە: تەجرید. ژمارە: ١١٥٤ = بەرگی/٣/٢٨٥).

**٤) باسی: هەرکەسێ بە باوەڕی تەواوی بێگومانەوە بچێتەوە دیداری خودا، دەچێتە بەهەشت.**

**{باب: مَنْ لَقَي اللّهَ تَعَالى بالإيمانِ غيْرَ شاكٍّ فيهِ دَخَلَ الجَنّةَ.** (١١/١٠).

(١٣٥ – ١٤٩ = مجموع أحاديث هذا الباب في صحيح مسلم من ١٣٥ الى ١٤٩).

١٠/١١ – باب: {الدليلُ عَلَى أَنَّ مَنْ مَاتَ عَلَى التَّوْحِيدِ دَخَلَ الجَنَّةَ قَطْعاً}.

ج/١/١٦٥ = المجلد الأول/ الصفحة/ ١٦٥ = اسم هذا الباب في صحيح مسلم بشرح الإمام النَّوَوِيّ.

٩- عَنْ عُثْمَانَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ مَاتَ وَهُوَ يَعْلَمُ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ». {الحديث ١٣٥ – إنفرد به مسلم، تحفة الأشراف (٩٧٩٨) مجموع ما في الباب من الأحاديث/ ١٣٥ - ١٤٩}. الإيمان.

عوسمانی کوڕی عەففان، (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ لەسەر باوەڕو ئیمان بە خودا بمرێو، لە ژیانیدا ئەوەی زانیبێت کە بێجگە لە (الله) خودای تر نییە، زوو یا درەنگ دەچێتە بەهەشتو لە بەهەشت نائومێد نابێ!).

**روونكردنەوە:**

ئەو بەهرانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١-مُوَحِّد لە بەهەشت نا ئومێد نابێ، مُوَحِّد كەسێكە بەس یەزدانی پاك بناسێ‌و بڕوای بە خودای تر نەبێ.

٢-یەكتا پەرست ئەگەر گوناهو تاوان‌و شتی وای هەبوو، ئەوە یا لەسەری حیساب دەكرێ‌و تۆڵەی ئەوەی لێ دەسێنرێ، یا عەفو دەكرێ لێی بە مەرجێ كوفرو بێباوەڕی نەبێ. بەهەر حاڵ گوناهباری باوەڕدار لە بەهەشت نائومێد نابێ.

٣-ئەم دو خاڵە پوختەی مەبەستە لەم جۆرە فەرموودانە بەتێكڕایی.

٤-عوسمانی كوڕی عەففان، دایكی ناوی (أروى)یە، دایكی ئەروا ناوی بەیضای كچی عەبدولوتەلیبە، كە لە باوكەوە پووری پێغەمبەرە، عوسمان بە شەش ساڵ لە پێغەمبەر منداڵترە، لە موسوڵمانە دێرینەكانە، لەسەر دەستی حەزرەتی ئەبوبەكردا موسوڵمان بوە، ناودارە بە: (ذونورین) واتە: دوو نوور، چونكە دوو كچی پێغەمبەری هێناوە، لەپێشا روقیەی هێناوە، كە روقیە دەمرێ، ئوممو كەلثووم دەهێنێ، روقیەو ئوممو كەلثووم كچی پێغەمبەر بوون (دروودی خودا لە پێغەمبەرو رەزای خودا لەوان بێ)، سەدو چل‌و شەش فەرموودەی لە كتێبە ناودارەكانی سوننەتدا هەیە، پێشەوا بوخاری یازدەیانی گێڕاوەتەوە.

لەپاش شەهید بوونی ئیمامی عومەر، لە یەكەم رۆژی موحەررەمی ساڵی بیست‌و چواری كۆچیدا، كرا بە جێنشینی سێیەم، دەوڵەتی ئیسلام لەسەر دەستی ئەودا تەواو دامەزراو رووبەری فراوان بوو، سامان ئەوقی دایەوە، ماڵ زۆر زۆر بوو، وای لێهاتبوو خەڵك كەنیزەكیان دەكڕی سەر بەسەر بە پارە، یەكێكە لە عەشەرەی موبەشەرە، یەكەم كەس بوو كە لەگەڵ روقیەی هاوسەریدا، كۆچیان كرد بۆ حەبەشە، عوسمان زۆر دڵنەرم بوو، خێرەو مەندێكی گەورە بوو، زۆر هێمن‌و لەسەرەخۆ بوو، ئیبنو سیرین دەفەرموێ: كاتێ گەمارۆی عوسمان درا، ژنەكەی فەرمووی: (ئەیكوژن یا نایكوژنن خۆتان لەوە سەرپشكن، بەڵام خوا هەقە ئەو شەوانە لەیەك ركات شەو نوێژا هەموو قورئانی دەخوێند!).

شەونوێژی زۆری دەکرد، هەمیشە بەرۆژوو بوو، قورئانی زۆری دەخوێند، خۆی خوێنەوارێکی باش بوو، گرنگترین و ناودار ترین کاری ئیمامی عوسمان جەمعی قورئان بوو، حەوت دانەی لە قورئان گرتەوە، سەرو دانەی نارد بۆ مەککەو کووفەو بەصرەو شامو یەمەنو بەحرەین، وە دانەیەکیشی لەلای خۆی هێشتەوە، بۆ خۆی قورئانی تیادا دەخوێند، لە تەمەنی هەشتاو دوو ساڵیدا، لە فەرتەنەیەکی کوێرانەدا، لە رۆژی هەینی دا، رێکەوتی هەژدەی مانگی قوربانی ساڵی (٣٥)ی کۆچی، لەکاتی دەورکردنەوەی قورئاندا، ئەسوەدی تەجیبی شەهیدی کرد، قورئانەکە لە باوەشیدا بوو، خوێنەکەی پرژا بەسەر ئەم ئایەتەدا: {فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللّٰهُ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ – سورة البقرة/ ١٣٧}:

واتە: خوا لەجیاتی تۆ سەرەوکاری ئەو دوو بەرەکیو ناکۆکییەی ئەوان دەکات.

هەزار رەحمەت لە ئیمامی جەزەری کە لە (ذات الشفا)دا دەفەرموێ:

فَـدَبَحُوهُ تَـالِيَ القُـرْآنِ
بَـيْنَ يَدَيْـهِ الْمُصْـحَفُ العُثْمَـانِي!

واتە:

وەک بەرخ سەربڕی، سەربڕا عوسمان
کاتی شەهید بوون قورئان لەسەر ڕان!

ئیتر ئەو رۆژە تەرمەکەی لەوناوەدا فڕە درابوو، هەتا شەو لەو پارچە زەوییەدا، کە خۆی کڕیو خستیە سەر گۆڕستانی بەقیع، گۆڕی ئامادە هەبوو لەو گۆڕەدا ناشتیان، جوبەیری کوڕی موطعیم نوێژی تەرمی لەسەر کرد، زۆر لە شاعیرانی صەحابە شیعری لاواندنەوەیان بەسەریا هەڵداوە. منیش دەڵێم:

مانگی قوربان بوو، کرا بە قوربان
نووری چاوی من، حەزرەتی عوسمان

(بڕوانە: تەجریدی بوخاری = موختەصەری صەحیحی بوخاری. بەرگی/١، لاپەڕە: ١٥٠ فەرموودەی ژمارە: ١٢٦ تجريد = ١٥٩ فتح الباری + تاج/٤٥/٥/ زنجیرەی ٨ باسی گەورەیی عوسمان + لاپەڕە: ٣٣١، زنجیرە: ٩٤ باسی کۆکردنەوەی قورئان تاج-٣ ز-٣ ژ-٣٢٧٢-٣٢٨٧ ج-٤ + تاج-٤ ز-٩٤ ژ-٣٦٨٤).

١٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْـهُ)، أَوْ عَـنْ أَبِـي سَـعِيدٍ (رَضِـي اللهُ عَنْـهُ) - شَـكَّ الأَعْمَشُ – قَالَ: لَمَّا كَانَ غَزْوَةُ تَبُوكَ، أَصَابَ النَّاسَ مَجَاعَةٌ، فَقَـالُوا: يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ! لَـوْ أَذِنْتَ لَنَا فَنَحَرْنَا نَوَاضِحَنَا، فَأَكَلْنَا وَادَّهَنَّا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ): « افْعَلُوا ». قَالَ: فَجَاءَ عُمَرُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنْ فَعَلْتَ قَلَّ الظَّهْرُ، وَلَـكِنِ ادْعُهُمْ بِفَضْـلِ أَزْوَادِهِمْ، ثُمَّ ادْعُ اللَّهَ لَهُمْ عَلَيْهَا بِالْبَرَكَةِ، لَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَ فِـي ذَلِـكَ. فَقَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « نَعَمْ ». قَالَ: فَدَعَا بِنِطَعٍ فَبَسَطَهُ، ثُمَّ دَعَا بِفَضْلِ أَزْوَادِهِمْ. قَـالَ: فَجَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِكَفِّ ذُرَةٍ. قَالَ: وَيَجِيءُ الآخَرُ بِكَفِّ تَمْرٍ. قَـالَ: وَيَجِـيءُ الآخَـرُ بِكِسْـرَةٍ، حَتَّى اجْتَمَعَ عَلَى النِّطَعِ مِنْ ذَلِكَ شَيْءٌ يَسِيرٌ. قَـالَ: فَـدَعَا رَسُـولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) عَلَيْهِ بِالْبَرَكَةِ، ثُمَّ قَالَ لَهُمْ: « خُذُوا فِي أَوْعِيَتِكُمْ ». قَالَ: فَأَخَذُوا فِي أَوْعِيَتِهِمْ حَتَّى مَا تَرَكُوا فِي الْعَسْكَرِ وِعَاءً إِلاَّ مَلأُوهُ. قَالَ: فَـأَكَلُوا حَتَّـى شَـبِعُوا، وَفَضِـلَتْ فَضْـلَةٌ، فَقَـالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنِّي رَسُـولُ اللَّـهِ، لاَ يَلْقَـى اللَّهَ بِهِمَا عَبْدٌ غَيْرَ شَاكٍّ فَيُحْجَبَ عَـنِ الْجَنَّـةِ ». {الحديث ١٣٨، إنفـردَ بِـهِ مُسْـلِمٌ، تحفـة الأشْرافِ (٤٠١٠) و (١٢٥٣٥). الإيمان}.

ئەبو هورەیرە -یا ئەبو سەعیدی خودری- (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە غەزای تەبووکا، موسوڵمانان تووشی برسێتییەکی سەخت بوون، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر بفەرمووی رێگەمان بدەی بازێ لە وشترەکانمان سەر دەبڕین، هەم گۆشتەکەیان دەخۆین‌و لەم برسێتییە رزگارمان دەبێ، هەم بەزەکەیان دەکەین بە پیوو رۆن. فەرمووی: (باشە وابکەن). بەڵام ئیمامی عومەر هات فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر ئەمە بکەی‌و رێگەی شتی وایان بدەی وشتری سواری کەم دەبێتەوەو چارەسەری کێشە بە کێشە ناکرێ، بەڵام بانگەوازیان لێ بکە ئەو بنبۆڵ‌و پاشەرۆکەی کە لەبنی نانە بەرەکانیاندا ماوە بیهێنن‌و تۆ خۆت نزا بخوێنە بەسەریا کە خودا پیت‌و فەڕی تێ بخات. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەڵێ باشە وادەکەم). ئەوسا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستووری دا، لەسەر فەرمانی ئەو کەوڵێکیان هێنا بۆی‌و رایخست‌و دەستووری دا کە پێشنیارەکەی عومەر جێبەجێ بکرێ، جا ئەو بنبۆڵ‌و پاشەرۆکەی لەناو توێشە بەرەکانیانا

مابوو هێنایان، پیاوی وا هەبوو پڕ لەپێ گەنمەشامی دەهێنا، هی وا هەبوو لوێچێ خورمای دەهێنا، یەکێ تر کەرتە نانە رەقێکی دەهێنا، هەتا لەم هەمە جۆرو هەڕەمەیە، هەنێ شت کۆکرایەوەو دانرا لەسەر کەوڵەکە. گوتی: ئەنجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نزای پیتو بەرەکەتی بەسەریدا خوێندو لەپاش کەمێ فەرمووی پێیان: (دەی هەڵگرن‌و بیکەنە دەفرەکانتانەوە!).

گوتی: ئەوانیش دەستیان کرد بە لێبردنی‌و لێیان دەکردە جەواڵەکانیانەوە، هەتا لەو لەشکرەدا دەفرو جەواڵیان نەما کە پڕی نەکەن لەو توێشەیەو نانەبەرەو دەفرو جەواڵەکانیان هەموو پڕکرد لەو خۆراکە، گوتی: ئەنجا دەستیان کرد بە لێخواردنی‌و لێیان خوارد هەتا هەموو تێر بوون، کەچی هێشتا پاشخوان هەر مابوو، پیتو فەڕو بەرەکەتێکی ئاشکرای وای تێ کەوتبوو. ئەوجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) بە بۆنەی روودانی ئەم موعجیزە گەورەیەوە فەرمووی: (شایەتی دەدەم کە هەر یەزدانی پاك خودایە، هیچ خودایەکی تر نییە بێجگە لەو، وە منیش رەوانەکراوی خودام، هەر بەندەیەکی خودا، بەم دوو وشەیەوە بچێتەوە دیداریی خوداو، باوەڕی بەیەکتایی خوداو بە پێغەمەرایەتی من هەبێ‌و لەم بارەیەوە گومانی نەبێ، ئەوە ئەو بەندەیە لە بەهەشت نا ئومێد نابێ‌و سەرەنجام ئەگەر لەپاش لێپرسینەوەو تۆڵە لێ سەندنیش بێ هەر دەچێتە ناو بەهەشتو زوو یا درەنگ دەبێ بە بەهەشتی!). (بڕوانە: تاج/٤/٣٤٢، زنجیرە: ١٠٦، ژمارە: ٣ — تاج-٣ ز-١٠٦ ژ-٢١٧٨ چ-٤ = چاپی چوارەم = باسی: یەکێ تر لە موعجیزەکانی پێغەمبەر زۆر کردنی نان‌و چێشتە + ریاض/٢، لاپەڕە: ٤، زنجیرە: ٥١، ژمارە: ٤١٦).

**روونکردنەوە:**

١-بۆیە لەسەرەتای فەرموودەکەوە دەفەرموێ: (ئەبو هورەیرە یا ئەبو سەعید...) چونکە ئەعمەش گومانی بۆ پەیدا بوو بوو، کە ئەبو صالحی مامۆستای فەرموودەکەی لە ئەبو هورزەیرەوە گێڕاوەتەوە یا لە ئەبو سەعیدەوە.

٢-ئەبو سەعیدی خودری ناوی سەعدی کوڕی مالیکی کوڕی سینانە، خەزرەجییە، ئەنصارییە، لە ڕۆژی غەزای ئوحوددا لەبەر منداڵی ڕێگەی پێ نەدرا کە بەشداری لەم غەزایەدا بکا، بەڵام لەوەدوا لە خزمەت پێغەمبەردا ئامادەی دوازدە غەزا بووە، باوکی لە غەزای ئوحوددا شەهید بووە، فەرموودەی زۆری گێڕاوەتەوە، شەرع زانێکی گەورە بوو، لە هاوەڵە لاوەکان دەژمێردرێ، گەلێ جار دەیفەرموو: (گفتوگۆ بکەن‌و قسەو باس بگێڕنەوە، چونکە قسە قسە دەهێنێ!). هەزارو سەدو حەفتا فەرموودەی هەیە، لە بوخاریدا شەستو دووی هەیە، لە موسلیمدا نەوەدو هەشتی هەیە، چل‌و شەشیان پەسەندی هەر دوو پیرن، کۆی فەرموودەکانی لە صەحیحەیندا (٤٦ پەسەندی هەردوولا + ١٦ لە ئەفرادی بوخاری + ٥٢ لە ئەفرادی موسلیم = ٤٦ + ١٦ + ٥٢ = ١١٤ سەدو چواردە فەرموودە لە صەحیحەیندا). خۆی فەرموودە دەگێڕێتەوە لە گەورە پیاوانی هاوەڵانەوە، وەك: ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان‌و عەلی‌و زەیدی کوڕی ثابیتو کەسانی تر، لە پێغەمبەریشەوە ڕاستەوخۆ فەرموودە دەگێڕێتەوە، هاوەڵان‌و پەیڕەوانیش گێڕانەوە لەوەوە ئەنجام دەدەن، یەکێکە لە خانە دانان‌و زانایان‌و بەرێزانی یاریدەدەران (ئەنصار) لەساڵی حەفتاو چواری کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

١١- عَنِ الصُّنَابِحِيِّ، عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَيْهِ وَهُوَ فِي الْمَوْتِ، فَبَكَيْتُ، فَقَالَ: مَهْلاً، لِمَ تَبْكِي؟ فَوَاللَّهِ! لَئِنِ اسْتُشْهِدْتُ لأَشْهَدَنَّ لَك، وَلَئِنْ شُفِّعْتُ لأَشْفَعَنَّ لَك، وَلَئِنِ اسْتَطَعْتُ لأَنْفَعَنَّك، ثُمَّ قَالَ: وَاللَّهِ! مَا مِنْ حَدِيثٍ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَكُمْ فِيهِ خَيْرٌ إِلاَّ حَدَّثْتُكُمُوهُ، إِلاَّ حَدِيثًا وَاحِدًا، وَسَوْفَ أُحَدِّثُكُمُوهُ الْيَوْمَ، وَقَدْ أُحِيطَ بِنَفْسِي، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: « مَنْ شَهِدَ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ النَّارَ».
(م١/٤٣) {الحديث ١٤١ — الإيمان. ترمذي. الإيمان: ٢٦٣٨. تحفة الأشراف (٥٠٩٩)}.

سونابیحی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: عوبادەی کوڕی صامیت (ڕەزای خودای لێ بێ) لە نەخۆشینی سەرەمەرگا بوو، چووم بۆ سەردانی، غوربەتم هەڵساو دەستم کرد بەگریان، عوبادە فەرمووی: هێواشبە، مۆڵەتم بدە، بۆ چی دەگری؟ سوێندم بە

یەزدانی پاك، ئەگەر لە قیامەتا داوای شایەتیم لێ بکرێ، شایەتی باشیت بۆ دەدەم، هەروا ئەگەر خودا لە قیامەتا تکاو شەفاعەتم لێ قەبووڵ بکا، تکای باشت بۆ دەکەم، وە ئەوەی لە توانامـا بـێ لـە رۆژی دوا رۆژدا، سوودو قـازانجم دەبـێ بـۆت، کەواتـە: هۆکارێ نییە بۆ ئەم گریانەی تۆ.

ئەوجا عوبادە فەرمووی: سوێندم بە خودا، هەر فەرموودەیەکم لە پێغەمبـەری خودا بیستبێو خێری ئێوەی گەلی ئیسلامی تیادا بـێ، گێڕاومەتـەوە بۆتـان، تـەنیا یەك فەرموودەی نەبێ، کە ئێستا ئەمڕۆ ئەویشتان بۆ دەگێڕمەوە، لـەم بـارو دۆخـە ناسـکەدا، کـە مـەرگ وا لـە پارێزمـاو، لـە هـەموو لایەکـەوە گـەمارۆی داومو تـازە ئومێدی ژیـانم نـەماوە، لەبەرئـەوە گومـانی ئـەوەم لێ نـاکرێ، کـە خـوا نەخواسـتە قسەی ناڕاست بدەمە پاڵ پێغەمبەر: بـە گوێی خـۆم لـە زاری پیرۆزی پێغەمبـەری خۆشەویسـتم بیسـت دەیفـەرموو: (هەرکەسـێ شـایەتی بـدات کـە بێجگـە لـە خـوای پاكو پـیرۆز خـوای تـر نییـە، وە شـایەتیش بـدا کـە موحەممـەدی کوڕی عەبـدوڵڵا پێغەمبەرو فروستادەی خودایە، خودا حەرامی دەکا لە ئاگری دۆزەخ).

**روونکردنەوە:**

هەندێ ناسککاری کەوا لە ڕشتە (سەنەد)ی ئەم فەرموودەیە دا:

١-ئیبنو عەجلان، پیاوێـکی دانـای زانـا بـوو، لـە پـەیڕەوان بـوو، کـە پێیـان دەگـوترێ: (تابعین) شەرع زانێـکی گەورە بوو، لـە مزگەوتەکـەی پێغەمبـەردا ئەڵقـەی زانستو فەتوای هەبوو، دەگێڕنەوە کە زیاتر لە سێ ساڵ، لە سکی دایکیدا ماوەتەوە.

٢-سونابحی تابعیەکی شکۆدارە، سەفەری کرد بۆ خزمەتی پێغەمبـەر، ئـەم گەیشـتە جوحفە، پێغەمبـەر لـە مەدینـە مـرد، فریـای نەکـەوت، پێـنج شـەش قۆناغێـکی مابوو بۆ مەدینـە، فـەرموودەی لـە گـەورە پیـاوانی هاوەڵانـەوە گێڕاوەتـەوە، وەك ئەبوبەکر.

٣-ئەم فەرموودەیە، بەهۆی هەنـدێ هـۆی هونەرییـەوە، کـە پەیوەنـدی بـە پیـاوانی ڕشتەکەیەوە هەیە، لە متابعات دەژمێررێ، نەوەك لە ئوصوول.

فەرموودەی ئەصڵ ئەوەیە پیاوانی رشتەکەی بێگەرد بن‌و جێگەی متمانە بن‌و فەرموودەکە لە هەموو روویەکەوە مەرجەکانی فەرموودەی دروستی تیادا بێت‌و لەم رووەوە بکرێ بە بنچینەو سەرچاوە، لەپاشا بە رشتەیەکی تر، کە بۆنی لاوازی‌و بێهێزی لێ بێت، بۆ پتەوکردن‌و بەهێز کردنی رشتەی پێشوو، فەرموودە پێشووەکە خۆی، یا بەهەندێ گۆڕانەوە، بە رشتەی دووەم دووبارە بکرێتەوە، بەمە دەگوترێ: موتابەعات‌و شەواهید، گەلێ جار موتابەعەو شاهید زەوائیدو فەوائیدیان واتیادا.

٤ -وەك لە پێشەوە ئاماژەکرا، مەبەست لەم جۆرە فەرموودەیە رووکاری واتاکەی نییە، چونکە زانایان دەفەرموون: (خاوەن گوناهان چارەنووسیان وا لە دەستی خواستی خوادا، حەزکا لێیان دەبووری‌و دەیانباتە بەهەشت، حەزکا سزایان دەداو تۆڵەی تاوانیان لێ دەسێنی‌و ئەوجا دەیانباتە بەهەشت، بە مەرجێ لە ئەهلی بێباوەڕی‌و فرە خودایی نەبن، وەکی تریش خاوەن باوەڕانیش لە رەحمەتی خودا نا ئومێد نابن‌و سەرەنجام رزگاریان دەبی‌و بە بەهەشت شاد دەبن!).

١٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا قُعُودًا حَوْلَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَعَنَا أَبو بَكْرٍ وَعُمَرُ (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا)، فِي نَفَرٍ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ بَيْنِ أَظْهُرِنَا، فَأَبْطَأَ عَلَيْنَا، وَخَشِينَا أَنْ يُقْتَطَعَ دُونَنَا، وَفَزِعْنَا فَقُمْنَا، فَكُنْتُ أَوَّلَ مَنْ فَزِعَ" فَخَرَجْتُ أَبْتَغِي رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، حَتَّى أَتَيْتُ حَائِطًا لِلأَنْصَارِ لِبَنِي النَّجَّارِ، فَدُرْتُ بِهِ هَلْ أَجِدُ لَهُ بَابًا، فَلَمْ أَجِدْ. فَإِذَا رَبِيعٌ يَدْخُلُ فِي جَوْفِ حَائِطٍ مِنْ بِئْرٍ خَارِجَةٍ – وَالرَّبِيعُ: الْجَدْوَلُ - فَاحْتَفَزْتُ كَمَا يَحْتَفِزُ الثَّعْلَبُ، فَدَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَ: « أَبُو هُرَيْرَةَ؟ ». فَقُلْتُ: نَعَمْ، يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: « مَا شَأْنُكَ؟ ». قُلْتُ: كُنْتَ بَيْنَ أَظْهُرِنَا، فَقُمْتَ فَأَبْطَأْتَ عَلَيْنَا، فَخَشِينَا أَنْ تُقْتَطَعَ دُونَنَا، فَفَزِعْنَا، فَكُنْتُ أَوَّلَ مَنْ فَزِعَ، فَأَتَيْتُ هَذَا الْحَائِطَ، فَاحْتَفَزْتُ كَمَا يَحْتَفِزُ الثَّعْلَبُ، وَهَؤُلاَءِ النَّاسُ وَرَائِي. فَقَالَ: « يَا أَبَا هُرَيْرَةَ! ». - وَأَعْطَانِي نَعْلَيْهِ – وَقَالَ: « اذْهَبْ بِنَعْلَيَّ هَاتَيْنِ، فَمَنْ لَقِيتَ مِنْ وَرَاءِ هَذَا الْحَائِطِ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، مُسْتَيْقِنًا بِهَا قَلْبُهُ، فَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ ». فَكَانَ أَوَّلَ مَنْ لَقِيتُ عُمَرُ. فَقَالَ: مَا هَاتَانِ النَّعْلاَنِ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ! فَقُلْتُ: هَاتَانِ نَعْلاَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، بَعَثَنِي بِهِمَا مَنْ لَقِيتُ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ

مُسْتَيْقِنًا بِهَا قَلْبُهُ، بَشِّرْتُهُ بِالْجَنَّةِ، قَالَ: فَضَرَبَ عُمَرُ بِيَدِهِ بَيْنَ ثَدْيَيَّ، فَخَرَرْتُ لاِسْتِي. فَقَالَ: ارْجِعْ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، فَرَجَعْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَأَجْهَشْتُ بُكَاءً، وَرَكِبَنِي عُمَرُ، فَإِذَا هُوَ عَلَى أَثَرِي، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « مَا لَكَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ؟ ». قُلْتُ: لَقِيتُ عُمَرَ فَأَخْبَرْتُهُ بِالَّذِي بَعَثْتَنِي بِهِ، فَضَرَبَ بَيْنَ ثَدْيَيَّ ضَرْبَةً، خَرَرْتُ لإِسْتِي، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « يَا عُمَرُ! مَا حَمَلَكَ عَلَى مَا فَعَلْتَ؟ ». قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي، أَبَعَثْتَ أَبَا هُرَيْرَةَ بِنَعْلَيْكَ، مَنْ لَقِيَ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ مُسْتَيْقِنًا بِهَا قَلْبُهُ، بَشَّرَهُ بِالْجَنَّةِ؟ قَالَ: « نَعَمْ ». قَالَ: فَلاَ تَفْعَلْ، فَإِنِّي أَخْشَى أَنْ يَتَّكِلَ النَّاسُ عَلَيْهَا، فَخَلِّهِمْ يَعْمَلُونَ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «فَخَلِّهِمْ ». (م١/ ٤٤ - ٤٥). {الحديث ١٤٦ – الإيمان. إنفَرَدَ بِهِ مُسْلِمٌ، تحفة الأشراف (١٤٨٤٣)}.

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە دەوری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دانیشتبووین، ئەبوبەکرو عومەرو چەند کەسێکی تریشمان لەگەڵدا بوون، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناومان دەرچوو، درەنگی پێ چوو هەرنەهاتەوە بۆ ناومان، جا مەترسی ئەوەمان لێ نیشت کە لێمان بڕبکرێ‌و خوانەخواستە شتێکی بەسەر بێ، ئیتر تەواو شپرزە بووین‌و بەشەڵەژاوی راپەڕین، وەمن یەکەم کەس بووم کە راپەڕیم، جا دەرچووم‌و دەستم کرد بە گەڕان بە شوێن پێغەمبەردا، هەتا گەیشتمە لای باخێکی پیاوێکی ئەنصاری، لەبەرەی بەنی نەجار، وە خولامەوە بە دەوری شوورەکەیدا، بەشکم دەرگایەك بدۆزمەوە، بەڵام دەرگام نەدۆزیەوە، روانیم وا جۆگەلەیەك لە کارێزێکەوە هەڵگیراوەو دێ، تا لەژێر بناخەی حەسارەکەوە، لە کەلەبەرێکەوە دەڕواتە ناو باخەکە، ئیتر خۆم لوول داو لەوکەلێنەوە وەکوو رێوی خۆم کرد بە ژووردا، کە چوومە ژوورەوە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوێ بوو، فەرمووی: (ئەبو هورەیرەیت؟). گوتم: بەڵێ ئەوم ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (ئەوە چیتە بۆوا شڵەژاوی؟). عەرزیم کرد: تۆ لەناومانا بوویت‌و تەشریفت هەڵساو رۆیشتیت‌و، درەنگت بەسەرهات هەر نەهاتیتەوە، ترسی ئەوەمان لێ نیشت کە خوانەخواست بەتەنها، ناحەزان فرسەتت لێ بهێنن، لەبەرئەوە

شەڵەژاین، وەمن یەکەم کەس بووم کە راپەڕیمو هاتووم بۆ سۆراخی تۆ، وە وەکوو ڕێوی خۆم لوول داو لەم کونەوە خۆم کرد بەم بێستانەدا، وە خەڵکەکەی تریش لەدوای منەوە دێن، ئەوانیش وەك من پەرۆشی ئەم کاروبارەن. فەرمووی: (ئەی ئەبو هورەیرە!). ئەوجا هەردوو سۆڵەکانی خۆیی دا بەمن، هەتا ببن بە نیشانە لەسەر ئەوە کە ئەم موژدەیە لە پێغەمبەر خۆیەوەیەو فەرمووی: (ئەی ئەبو هورەیرە! ئەم دوو سۆڵەی من بەرە، بۆ دڵنیاییو نیشانە، وە هەرکەسێکت لەودیو ئەم باخەوە پێ گەیشت موژدەی بەهەشتی بدەرێ، بەمەرجێ بە یەقینو باوەڕی تەواوی دڵ، شایەتی بداو بڵێ: لاَ إِلـه إِلاَّ اللهُ: هەر خودا خودایەو بەس، هیچ خودایەکی تر نییە جگە لەو). منیش فەرمانەکەی ئەوم بەجێ هێنا، یەکەم کەس کەپێی گەیشتم عومەر بوو، فەرمووی: ئەو سۆڵانە چین پێت ئەی ئەبو هورەیرە! ئەم سۆڵانەی پێغەمبەر چی دەکەن لەلای تۆ؟ وتم: ئەمانە سۆڵەکانی پێغەمبەرن، بە نیشانە داونی پێم، بۆئەوەی خەڵك بڕوام پێ بکەن، وەپێی فەرمووم: کە گەیشتم بەهەر کەسێ کە شایەتی بدات کە بێجگە لە خودا خودای تر نییە، بە زمان بڵێ: لاَ إِلـه إِلاَّ اللهُ: وە بەدڵ باوەڕی تەواوی بە واتاو مەبەستی ئەم وشە پیرۆزە هەبێ، هەرکەسێ ئەمە بە زمان بڵێو بە دڵ باوەڕی تەواوی پێی هەبێ موژدەی بەهەشتی بدەمێ!!

فەرمووی: جا عومەر بۆ ناڕەزایی مشتێکی بە دەستی کێشا بەسەر سینگمدا، خرپ کەوتم بە قنگدا، ئەوجا فەرمووی: ئەی ئەبو هورەیرە بگەڕێرەوە بۆلای پێغەمبەرو ئەم موژدەیە پەخش مەکەرەوە. منیش گەڕامەوە بۆلای پێغەمبەر، قورگم پڕبوو لە گریانو خەریك بووم بدەمە پڕمەی گریان، عومەریش لەدوا منەوە یەکسەر هات، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوە چیتە بۆچی وا شێواوی؟). گوتم: گەیشتم بە عومەر، موژدەکەی تۆ فەرمووت پێم دا، کەچی یەك مشتە کۆڵەی ماڵی بەسەر سینگما خستمی بە پشتا، وە گوتیشی کە بگەڕێمەوە بۆلای تۆ، ئەوەتانێ منیش هاتمەوە. پێغەمبەر پێی فەرموو: (ئەی عومەر! لەبەر

چی ئەمەت کرد، چی ئەمەی پێ کردیت؟). فەرمووی: (ئەی پێغەمبەری خودا! باوكو دایکم بە قوربانت بن، ئایا تۆ ئەبو هورەیرەت ناردووەو سۆڵەکانی خۆشت بۆ نیشانەو دڵنیایی داوە پێی، کە بەهەر کەسێ گەیشت، بەمەرجێ بەدەم بڵێ: لاَ إِلـه إِلاَّ الله و بە دڵ باوەڕی تەواوی پێی هەبێ، موژدەی بەهەشتی پێ بدات؟ فەرمووی: (بەڵێ ئەوە وایە). عومەر فەرمووی: قوربان! شتی وامەکە، چونکە من مەترسی ئەوەم هەیە کە ئەو خەڵکە پشتیان سارد ببێتەوە لە کردەوەی باشو بەم جۆرە موژدەیە پشت ببەستن، وازیان لێ بهێنە با سەرگەرمی کاری چاکە کردن بن. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەی باشە وەك تۆ دەڵێی با وابێ، چونکە راوێژەکەت بەجێیە!). (بڕوانە: ریاض/١٣/٢، زنجیرە: ٥١ — باسی هیواو ئومێد بە میهرەبانی خودای گەورە، فەرموودەی ژمارە: ٤٢٤).

١٣- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ (رَضِي اللهُ عَنْـهُ) قَـالَ: كُنْتُ رِدْفَ النَّبِـيِّ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) لَيْسَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ إِلاَّ مُؤْخِرَةُ الرَّحْلِ، فَقَـالَ: « يَـا مُعَـاذَ بْـنَ جَبَـلٍ! ». قُلْـتُ: لَبَّيْـكَ رَسُولَ اللَّهِ وَسَعْدَيْكَ. ثُمَّ سَارَ سَاعَةً، ثُمَّ قَالَ: « يَا مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ! ». قُلْتُ: لَبَّيْـكَ يَارَسُـولَ اللَّهِ وَسَعْدَيْكَ. ثُمَّ سَارَ سَاعَةَ، ثُمَّ قَالَ: « يَـا مُعَـاذَ بْـنَ جَبَـلٍ! ». قُلْـتُ: لَبَّيْـكَ رَسُـولَ اللَّـهِ وَسَعْدَيْكَ. قَالَ: « هَلْ تَدْرِي مَا حَقُّ اللَّهِ عَلَى الْعِبَادِ؟ ». قُلْتُ اللَّهُ وَرَسُـولُهُ أَعْلَـمُ. قَـالَ: « فَإِنَّ حَقَّ اللَّهِ عَلَى الْعِبَادِ أَنْ يَعْبُدُوهُ وَلاَ يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا ». ثُمَّ سَارَ سَاعَةً، ثُـمَّ قَـالَ: « يَـا مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ! ». قُلْتُ: لَبَّيْكَ رَسُولَ اللَّهِ وَسَعْدَيْكَ. قَالَ: « هَلْ تَدْرِي مَا حَقُّ الْعِبَـادِ عَلَـى اللَّهِ إِذَا فَعَلُوا ذَلِـكَ ». قُلْـتُ: اللَّـهُ وَرَسُـولُهُ أَعْلَـمُ. قَـالَ: « أَنْ لاَ يُعَـذِّبَهُمْ ». (م ١/٤٣).

{الحديث ١٤٢ — الإيمان. بوخاری: ٢٨٥٦، ٥٩٦٧، ٦٢٦٧، ٦٥٠٠، ٧٣٧٣ — تەجریدی بوخاری بە کوردی: ١٠٤ بەرگی/١/١٣١، بەرگی/٣/٣٠٧، ژمارە: ١١٧٩ — تحفة الأشراف: ١١٣٠٨} + (تاج کوردی/١/٣٠، ژمارە: ٣، ٤ = ژ-٢٥، ٣٦ چ-٤).

موعازی کوڕی جەبەل (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لە پاشکۆی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) سواری گوێ درێژێ بووم، ناوی عوفەیر بوو، کۆپارەی دواوەی کورتانەکە لە نێوانمانا بوو، فەرمووی: (ئەی موعازی کوڕی جەبەل!). عەرزیم کرد:

بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! وام لە خزمەتتا سەرم لە ڕێتایە، جا ناوبەناو سێ جار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وا بانگی کردم، منیش هەر سێ جارەکە وا وەڵامم دەدایەوە، جا خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی موعاز! ئایا دەزانی کە مافی خودا لەسەر بەندەکانی خۆی چییە؟). عەرزیم کرد: خوداو پێغەمبەری خودا خۆیان باشتری لێ دەزانن. فەرمووی: (مافی خوا لەسەر بەندەکانی ئەوەیە کە بەجوانی بیپەرستن، وەهیچ هاوەڵو هاوبەشی بۆ پەیدا نەکەن). ئەوسا تاوێ بە ڕێوە ڕۆیشتین، ئەوجا فەرمووی: (ئەی موعازی کوڕی جەبەل!). عەرزیم کرد: بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! وام لە خزمەتتا، سەرم لەڕێتایە. فەرمووی: (ئایا دەزانی کە مافی بەندەکانی خودایش لەسەر خودای خۆیان چییە؟). عەرزیم کرد: خوداو پێغەمبەری خودا خۆیان باشتری لێ دەزانن. فەرمووی: (هەرکاتێ بەندەکان مافی خۆیان بەجێ هێنا، مافە لەسەر خودایش کە سزایان نەدا).

**ڕوونکردنەوە:**

موعازی کوڕی جەبەل خەزرەجییە، لە یاریدەدەرانە، واتە: لە ئەنصارەو ئەنصارییە، یەکێکە لەو حەفتا ئەنصارییەی کە ئامادەی پەیمانی عەقەبە بوون، موعاز زانایەکی گەورە بوو، پێشەوایەکی گەورەیە لە زانستی حەڵاڵو حەرامدا، کۆمەڵێ فەرموودەی زۆری لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، گەورە پیاوانی هاوەڵانو پەیڕەوان (سەحابەو تابعین) فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، ئیبنو عەباسو ئیبنو عومەرو جابیرو ئەنەسو کەسانی تریش فەرموودەکانی پێغەمبەریان لە دەمی ئەوەوە گێڕاوەتەوە.

ئامادەی هەرای بەدرو هەموو شەڕگاو شەهید گاکانی تری پێغەمبەری خۆشەویستو ئازیز بووە، مناڵی قەت نەبووە، ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ)، دەفەرموێ: (موعاز یەکێکە لەو چەند کەسە کەمانەی کە بە سەرینیی پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) هەموو قورئانیان لەبەر بووە). پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (قورئان لەم چوار کەسەوە فێربن) کە یەکێکیان موعازی کوڕی

جەبەل بوو، کە ئامادەی غەزای بەدر بوو تەمەنی بیستو یەك ساڵ بوو، وە پێغەمبەر کردی بە فەرمانڕەوا لە یەمەن.

لە باشترینو جوانترینی لاوانی یاریدەدەران بوو، یاریدەدەران واتە: ئەنصار، لاوێکی جوانی قۆزی سپیو سووری چاو قەوی چاو ڕێژراوی چاو ڕەشی سوورمەیی باڵا بەرز بوو، دوعاو نزای زۆر گیرا بوو، هەرچی لە خوا داوا دەکرد پێی دەبەخشی، کاتی پەیمانی (برایەتی بەستن: معاهدة المؤاخاة) لەناو هاوڕێیانا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کردی بە برای ئیبنو مەسعوود، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (لەرۆژی قیامەتدا پێشەنگی زاناکانە!).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مونعازی کرد بە قازی (الجَنَد) لە یەمەن، خەڵکەکەی فێری قورئانو سوننەتو شەریعەتی ئیسلام دەکردو، دادگایشی لەناوا دەکردن، موعاز لە دەوری تەمەنی (٣٣) ساڵیدا، لە شام، بە تاعوونەکەی عامووس، لە ساڵی هەژدەی کۆچیدا، کۆچی دوایی کردووە، عامووس گوندێکە وا لەنێوانی ڕەملەو بەیتولەقدیسدا، ئەلجەنەدیش کوورەو ڕەستاقێکە لە کوورەو ڕەستاقەکانی یەمەن. (بڕوانە: ١١٧٩ تەجرید + تاج کوردی/١٧٨/٥، زنجیرە: ٤٨ تاج-٣ ژ-٣٤٧٣-٣٤٧٦ — فەزڵی موعاز + ریاض/٢/٣٥٠، ژمارە: ٩١٧).

١٤- عَنْ مَحْمُودُ بْنُ الرَّبِيعِ عَنْ عِتْبَانَ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ فَلَقِيتُ عِتْبَانَ. فَقُلْتُ: حَدِيثٌ بَلَغَنِي عَنْكَ. قَالَ: أَصَابَنِي فِي بَصَرِي بَعْضُ الشَّيْءِ. فَبَعَثْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنِّي أُحِبُّ أَنْ تَأْتِيَنِي تُصَلِّيَ فِي مَنْزِلِي. فَأَتَّخِذَهُ مُصَلًّى. قَالَ: فَأَتَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَنْ شَاءَ اللَّهُ مِنْ أَصْحَابِهِ. فَدَخَلَ وَهُوَ يُصَلِّي فِي مَنْزِلِي، وَأَصْحَابُهُ يَتَحَدَّثُونَ بَيْنَهُمْ، ثُمَّ أَسْنَدُوا عُظْمَ ذَلِكَ وَكِبْرَهُ إِلَى مَالِكِ بْنِ دُخْشُمٍ. قَالَ: وَدُّوا أَنَّهُ دَعَا عَلَيْهِ فَهَلَكَ. وَوَدُّوا أَنَّهُ أَصَابَهُ شَرٌّ. فَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الصَّلاَةَ، وَقَالَ: « أَلَيْسَ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ؟ ». قَالُوا: إِنَّهُ يَقُولُ ذَلِكَ، وَمَا هُوَ فِي قَلْبِهِ. قَالَ: « لاَ يَشْهَدُ أَحَدٌ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ فَيَدْخُلَ النَّارَ أَوْ تَطْعَمَهُ ». قَالَ أَنَسٌ: فَأَعْجَبَنِي هَذَا الْحَدِيثُ. فَقُلْتُ لاِبْنِي: اكْتُبْهُ فَكَتَبَهُ. (م ١/٤٥ -

٤٦). {الحديث ١٤٨ – الإيمان. بوخاري: ٤٢٤، ٤٢٥، ٦٦٧، ٦٨٦، ٨٣٨، ٨٤٠، ١١٨٦، ٤٠٠٩، ٤٠١٠، ٥٤٠١، ٦٤٢٣، ٦٩٣٨. مسلم: ١٤٩٤، ١٤٩٥، ١٤٩٦، نسـائی: ٧٨٧، ١٣٢٦، ابن ماجة: ٧٥٤. تحفة الأشراف (٩٧٥٠)}.

**مەحموودی کوڕی ڕەبیع** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: عیتبانی کوڕی مالیك** (ڕەزای خودای لێ بێ) **کە لە هاوڕێو هاوەڵانی پێغەمبەر بوو، کە یەکێك بوو لەو ئەنصارانەی کە ئامادەی جەنگی بەدر بوو بوون، بەر نوێژی بۆ هۆزەکەی خۆی دەکرد، ڕۆژێ چووم بۆ مەدینە، تووشی عیتبان بووم، گوتم: فەرموودەیەکم لەبارەی تۆوە ژنەوتووە بۆم بگێڕەوە. گوتی: ڕۆژێ چوومە خزمەتی حەزرەت** (دروودی خودای لەسەر بێ) **عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! گەلێ جار ڕێ دەکەوێ دەبێ بە تاریکستانو باران، منیش پیاوێکی کوێرمو ناتوانم بەو بارانو تاریکە شەوە بڕۆم بۆ مزگەوت بەرنوێژیان بۆبکەم، بە تایبەتی کە باران بباری، شێوەکەی وا لە نێوانی منو ئەواندا ڕێگەم نادا، جا لەبەرئەوە ئەی پێغەمبەری خودا! حەزدەکەم تەشریف بهێنی بۆلام، لە شوێنێکی ماڵەکەما بۆ پیرۆزیو موبارەکی نوێژێ بکە، تا ئەو شوێن نوێژەی تۆیە بکەم بە نوێژگای خۆم، فەرمووی: پێغەمبەریش** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (خوا یاربێ وادەکەم).**

**عیتبان دەیفەرموو: جا بۆ سبەینێ کە خۆر بەرزەوە بوو، پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **لەگەڵ دەستەیێ لە یارانی، کە ئەبوبەکریان تیادا بوو، تەشریفیان هات، جا حەزرەت** (دروودی خودای لەسەر بێ) **ڕێخوازی کرد، منیش فەرمووم لێ کردن، کە هاتە ژوورەوە، تەشریفی دانەنیشت، تا فەرمووی: (لە کوێی ماڵەکەتدا حەزدەکەی نوێژی لێ بکەم؟). منیش گۆشەیەکم لەناو ماڵەکەدا پێنیشاندا.**

**ئەوجا پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **لەوێدا بەرەو قیبلە ڕاوەستاو، ئەڵڵاهو ئەکبەری نوێژ دابەستنی کردو، ئێمەیش لە پشتیەوە ڕیزبووینو، پێغەمبەر خۆی ڕیزی کردین، وە نوێژمان بە کۆمەڵ لە پشتیەوە دابەست، ئەوجا دوو ڕکات نوێژی سوننەتی بۆمان کردو، سڵاوی دایەوە، لەوەدوا ئەو شوێنەم کرد بە جێگەی نوێژی خۆم.**

فەرمووی: ئەوجا پێغەمبەرو میوانەکانی ترمان گل دایەوەو، ئاردەوای قیمەمان بۆ دروست کردن، جا کە خەڵکی گەڕەك بەرە بەرە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆبوونەوەو هاتن بۆ خزمەتی، گوتیارێ لەوان گوتی: ئەوە بۆ مالیکی کوڕی دوخەیشین دیارنییە، دەبێ لەکوێ بێ، وا نەهاتووە بۆ خزمەتی پێغەمبەرو ئامادەی ئەم کۆڕە پیرۆزە نەبووە؟ پیاوێکیان وەڵامی دایەوەو گوتی: کوڕە! ئەوە ناپاکە، دوو رووە، هەر بەدەم موسوڵمانە، لە دڵەوە رقی لەخواو لە پێغەمبەری خودایە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نا، وامەڵێ، ئەوەتا بە بەرچاوەوە ئاشکرا دەڵێ: (لاَ إِلـه إِلاَّ اللهُ) مەبەستی لە گوتنی ئەم وشە پیرۆزەیە رەزای خودایە!) فەرمووی: خوداو پێغەمبەری خودا باشتری دەزانن. فەرمووی: بەڵام ئێمە وا هەست دەکەین کە بە دڵ لەگەڵ ناپاکانەو، بە دەمیش پاسی ئەوان دەکا. سەروەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەسا مالیك شایەتمانی ساخ لەبەر رەزای خودا هێناوەو، هەر کەسێکیش ساخ لەبەر رەزای خودا بڵێ: لاَ إِلـه إِلاَّ اللهُ: جگە لە پەروەردگاری پاك خودای تر نییە. خودا لە قیامەتا لەسەر ئاگری دۆزەخ حەرامی دەکا). {تەجریدی/١/٢٧١، ژمارە: ٢٦١ + تاج/١/٣٧٨ = ز-١٢٤ ژ-٧٥٣ چ-٤}.

**روونکردنەوە:**

١-ئەمەی نووسیمان دەقی گێڕانەوەی بوخارییە، وەك ئاماژەمان بۆی کرد، وە جوانترین راڤەو شیکردنەوەیە، بۆئەم گێڕانەوەی ئێرەی موسلیم، هەروەك دەقی تەرەفی ژمارە/ ١٤٩٦ی ئەم فەرموودەیە، لە صەحیحی موسلیمدا (موجەللەدی – ٥/ ... ص١٦٢). لە گێڕانەوەی ئێرەدا ئەم دوو پترییەی هەیە: خەڵکەکە حەزیان دەکرد کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نزای خراپ لە مالیکی کوڕی دوخشوم بکاو تووشی شەڕ ببێ.

٢-ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیەم زۆر بەدڵ بوو، بە کوڕەکەمم گوت: بۆمی بنووسەرەوە، ئەویش نووسییەوە بۆم.

٣ -ئەم مالیکی کوڕی دوخشوومە، لە ئامادەبوانی غەزای بەدر بوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) شایەتی باوەڕی ساخی بۆداوە، موسوڵمانێکی جوان بووە، بە فەرمانی پێغەمبەر لەگەڵ مەعنی کوڕی عەدیدا، مسجد الضراریان سووتاند.

٤ -ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن: بەرنوێژی کوێر دروستە، دواکەوتن لە نوێژی کۆمەڵ لەبەر مەهانەی رەوا، دیاریکردنی نوێژگا لەناو ماڵدا، پیرۆزیی وەرگرتن لە جێگەی نوێژو خواپەرستی پێغەمبەرانو پیاو چاکانو ئاسەواریان، ئینشا ئەڵلا کردن، چوون بۆ خزمەتی پیاو چاکان کاتێ دێنیی شوێنێ بکەن، نوێژی سوننەت بە رۆژ بە جەماعەت دروستە، واباشیشە دوو رکات بکرێ، دروستە بگوترێ مزگەوتی فیسارە کەس.

٥ -مەحموودی کوڕی رەبیع، خەزرەجییە، ئەنصارییە، لە هاوەڵە بچکۆلەکانە، خۆی دەفەرموێ: لە بیرم دێ پێغەمبەر پرگوپێ ئاوی پرژان لە دەموچاوم، ئەو کاتە تەمەنم پێنج ساڵان بوو، لە تەمەنی نەوەدو سێ ساڵیدا، لەنەوەدو نۆی کۆچیدا وەفاتی کردووە، کە پێغەمبەر وەفاتی کردووە تەمەنی پێنج ساڵ بووە (بڕوانە: تەجرید/١/٩١، ژمارە: ٦٨، فتح/٧٧).

٦ -عیتبانی کوڕی مالیك ئەنصارییە، خەزرەجییە، فەرموودەی لە صەحیحیندا هەیە، پێش نوێژی هۆزەکەی بوو، کوێر بوو، بەدری بوو، پێغەمبەر پەیمانی برایی لەنێوانی ئەوو عومەری کوڕی خەتابدا بەست، لەسەردەمی جێنشینی موعاوییەدا، لەپاش تەمەنێکی درێژ فەوتی کرد. (بڕوانە: تەجرید/١/٤٢٩، ژمارە: ٤٥١).

**٥) باوەڕ چییە؟ روونکردنەوەی نیشانەکانی** (١١٥ - ١٢٠)

**باب: الايمان ماهُوَ؟ وَبَيَانُ خِصَالِه.** (ج/١ ص١٣١ (٨/٦))

٨/٦ — باب: الأمر بالإيمان بالله تعالى وَرَسُولِهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَشَرَائِعِ الدِّينِ، والدُّعَاءِ إِلَيْهِ، والسُّؤَالِ عَنْهُ، وحفظه وتبليغه مَنْ لَمْ يَبْلُغْهُ.

١٥- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ): أَنَّ أُنَاسًا مِنْ عَبْدِ الْقَيْسِ قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالُوا: يَا نَبِىَّ اللَّهِ! إِنَّا حَىٌّ مِنْ رَبِيعَةَ، وَبَيْنَنَا وَبَيْنَكَ كُفَّارُ مُضَرَ، وَلاَ نَقْدِرُ عَلَيْكَ إِلاَّ فِى أَشْهُرِ الْحُرُمِ، فَمُرْنَا بِأَمْرٍ نَأْمُرُ بِهِ مَنْ وَرَاءَنَا، وَنَدْخُلُ الْجَنَّةَ، إِذَا نَحْنُ أَخَذْنَا بِهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « آمُرُكُمْ بِأَرْبَعٍ، وَأَنْهَاكُمْ عَنْ أَرْبَعٍ، اعْبُدُوا اللَّهَ وَلاَ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، وَأَقِيمُوا الصَّلاَةَ، وَآتُوا الزَّكَاةَ، وَصُومُوا رَمَضَانَ، وَأَعْطُوا الْخُمُسَ مِنَ الْغَنَائِمِ، وَأَنْهَاكُمْ عَنْ أَرْبَعٍ: عَنِ الدُّبَّاءِ، وَالْحَنْتَمِ، وَالْمُزَفَّتِ، وَالنَّقِيرِ ». قَالُوا: يَا نَبِىَّ اللَّهِ! مَا عِلْمُكَ بِالنَّقِيرِ؟ قَالَ: « بَلَى جِذْعٌ تَنْقُرُونَهُ، فَتَقْذِفُونَ فِيهِ مِنَ الْقُطَيْعَاءِ - قَالَ سَعِيدٌ: أَوْ قَالَ: « مِنَ التَّمْرِ - ثُمَّ تَصُبُّونَ فِيهِ مِنَ الْمَاءِ حَتَّى إِذَا سَكَنَ غَلَيَانُهُ شَرِبْتُمُوهُ، حَتَّى إِنَّ أَحَدَكُمْ – أَوْ: إِنَّ أَحَدَهُمْ - لَيَضْرِبُ ابْنَ عَمِّهِ بِالسَّيْفِ ». قَالَ: وَفِى الْقَوْمِ رَجُلٌ أَصَابَتْهُ جِرَاحَةٌ ذَلِكَ. قَالَ: وَكُنْتُ أَخْبَأُهَا حَيَاءً مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). فَقُلْتُ: فَفِيمَ نَشْرَبُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: « فِى أَسْقِيَةِ الأَدَمِ، الَّتِى يُلاَثُ عَلَى أَفْوَاهِهَا ». فَقَالُوا: يَا نَبِيَّ اللَّهِ! إِنَّ أَرْضَنَا كَثِيرَةُ الْجِرْذَانِ، وَلاَ تَبْقَى بِهَا أَسْقِيَةُ الأَدَمِ. فَقَالَ نَبِىُّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « وَإِنْ أَكَلَتْهَا الْجِرْذَانُ، وَإِنْ أَكَلَتْهَا الْجِرْذَانُ، وَإِنْ أَكَلَتْهَا الْجِرْذَانُ ». قَالَ: وَقَالَ نَبِىُّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لأَشَجِّ عَبْدِ الْقَيْسِ: « إِنَّ فِيكَ لَخَصْلَتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللَّهُ: الْحِلْمُ وَالأَنَاةُ ». (م/١/٣٦ - ٣٧). {الحديث ١١٨ – انفردَ بِهِ مسلم. أطَرافه من (١١٥) إلى (١٢٠). تحفة الأشرافِ (٤٣٧٥)}.

تەرجەمەی ئەم فەرموودە پیرۆزەیە، بەتەواوی لە سەرەتای پەڕاوەکەوە لە ژمارە (١)دا رابورد، لە کۆتاوە ئەم پترییەی هەیە:

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! چۆن دەزانی کە کۆتکە دار چییە؟ فەرمووی: (بەڵێ: دەزانم، بنکی دارو قەدی درەخت دەهێنن، هەڵی دەکۆڵن و دەیکەن بە کاسەو کووپەو شتی وا، ئەوجا خورما وردیلەی تێ دەکەن کە بە عەرەبی پێی دەگوترێ (قوطەیعاء)، هەروەك پێی دەگوترێ: (شهریز). سەعیدی کوڕی ئەبو عوروبە، کە یەکێکە لە راوییانی ئەم فەرموودەیە، فەرمووی: یا پێغەمبەر فەرمووی: (خورمای تێ دەکەن، ئەوجا ئاوی تێ دەکەن، هەتا بەرە بەرە دەترشێ و دەگەیێ و کفەکاو دوایی دائەمرکێ، ئەوسا دەیخۆنەوە، پاش ئەوەی کە بوو بە مەیی و بادە،

واسەرخۆشتان دەکا، چاكو خراپی خۆتان نازانن، وا دەبێ کابرای سەرخۆش ئامۆزای خۆی بە شمشێر دائەپاچێ!!).

فەرمووی: لە کۆمەڵەی شاندەکەدا پیاوێکی تیادا بوو، بەو شێوەیە زامار کرابوو، پیاوەکە خۆی دەیگوت: برینەکەمم دەشاردەوە، ئەم دەهێشت کە پێغەمبەر پێی بزانێ، چونکە شەرمم لێ دەکرد.

فەرمووی: عەرزیم کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی لەچیدا سرکەو خۆشاوو دۆشاوو شتی وا بکەینو بیخۆینەوە، کە تۆ ئەم جۆرە دەفرو حاجەتانەت لێ قەدەغە کردووین؟!

فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (لە کوندەو جەوەنەی چەرمیندا، دروستیان بکەنو بیانخۆنەوە، کە دەمو هەنگڵەکانیان هەڵ دەپێچرێنو بە دەمبێن دەبەسترێن). فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خودا! وڵاتی ئێمە مشكو رزقو جرجی زۆرە، دەفری خواردنەوەی چەرم لەوێ بەرگە ناگرێو نامێنێ، مشكو جرج دەیکرمێنێ!؟

پێغەمبەری خودا سێ جار لەسەر یەك فەرمووی: (با جرجو مشکیش بیانخوات، هەر لەوانا دروستیان بکەنو لەوچوار جۆرە دەفرەی تردا، ئەم جۆرە خواردنەوانە دروست مەکەن).

پێغەمبەری خۆشەویستی خودا لە مەدحی ئەشەججا فەرمووی: (بەڕاستی تۆ دوو رەفتاری جوانت واتیادا، کە خودا خۆشی دەوێن: کە هێمنیو هێواشین!). (ریاضی کوردی/٢، لاپەڕە: ١٧٠، زنجیرە: ٧٤ — باسی سەلاریو لەسەر خۆیی... ژمارە: ٦٣٢).

## ٦) باسی: ئیمانو باوەڕ بە خودا گەورەترین کارو کردەوەیە (٢٤٤ - ٢٥٢)
## باب: الإيمانِ بِاللهِ أفضَلُ الأعْمَالِ. (٣٥/٣٦).

٣٦/٣٥ — باب: {بَيَانِ كَوْنِ الإِيمَانِ بِاللّهِ تَعَالَى أَفْضَلُ الأَعْمَالِ} ج/١ ص٢٥٩.

١٦- عَنْ أَبِى ذَرٍّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَىُّ الأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: « الإِيمَانُ بِاللَّهِ، وَالْجِهَادُ فِى سَبِيلِهِ ». قَالَ: قُلْتُ: أَىُّ الرِّقَابِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: « أَنْفَسُهَا عِنْدَ

أَهْلِهَا، وَأَكْثَرُهَا ثَمَنًا ». قَالَ: قُلْتُ: فَإِنْ لَمْ أَفْعَلْ؟ قَالَ: « تُعِينُ صَانِعًا أَوْ تَصْنَعُ لأَخْرَقَ ». قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَرَأَيْتَ إِنْ ضَعُفْتُ عَنْ بَعْضِ الْعَمَلِ؟ قَالَ: « تَكُفُّ شَرَّكَ عَنِ النَّاسِ، فَإِنَّهَا صَدَقَةٌ مِنْكَ عَلَى نَفْسِكَ ». (م – ١/٦٢). {الحديث ٢٤٦ – أطرافه في ٢٤٤ – ٢٥٢ – الإيمان. بوخاری: ٢٥١٨. نسائی: ٣١٢٩. ابن ماجه: ٢٥٢٣، تحفة الأشراف (١٢٠٠٤)}.

**ئەبو زەڕ** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! باشترین کار چییە؟ فەرمووی: (ئیمانو باوەڕ بە خوداو خەباتو تێکۆشانو غەزاکردن لە پێناوی خوادا) فەرمووی: گوتم: ئەی کام جۆرە بەندەو کۆیلەیێ ئازاد بکرێ، پاداشتو خێری باشترە؟ فەرمووی: (ئەوەی کە بە بەها گرانەو لەلای خاوەنەکەی گەلێ چاكو بەنرخترە). عەرزیم کرد: ئەگەر ئەوەم بۆ نەکرا؟ فەرمووی: (یاریدەی پێشەسازێ بدە، یا دەستی ناشیو کۆڵییەك بگرەو فێری کارێ، ئیشێ، پیشەیەکی بکە). عەرزیم کرد: ئەی ئەگەر ئەوەیشم بۆ نەکرا چۆن؟ فەرمووی: (شەڕی خۆت لەمەردووم لادەو شەڕ بە خەڵك مەفرۆشە، ئەویش هەر خێرە بۆ خۆتی دەکەیت!). (تەجرید/٣/١٧٦، ژمارە: ١٠٨٤ + تاج/٣/٣٥، ژمارە: ٣ تاج-٣ ز-١٦ ژ-٢٠١١ چ-٤ + ریاض/٣/٢٤٣، ژمارە: ١٣٥٩ + ریاض/٢/١٣٣، ژمارە: ١٤١).**

**ڕوونکردنەوە:**

**١-ئیمامی نەوەوی** (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: مەبەست لەم جۆرە دەربڕینە: کە ئەو شتە گەورەترین شتە، یا لە هەموو شتێکی تر خێری زۆر ترە، بەڕەهایی نییە، بەڵکوو مەبەست بەپێی کاتو شوێنو کەسو بارو دۆخ دەگۆڕێ، وەك ئیبنو عەباس دەفەرموێ: (حەجێ بۆ کەسێ حەجی نەکردبێ، لە چل غەزا خێرترە، غەزایێ بۆ کەسێ حەجی کردبێ لە چل حەج خێرترە). کەواتە: بەپێی حاڵی کەسەکە جاری وا هەیە حەج باشترە بۆی، جاری وا هەیە غەزا باشترە بۆی وەهەروەها. (بڕوانە: تەجرید/١/٤٥٥، ژمارە: ٢٥/٢٦).**

٢-ئـەبو زەڕی غـەفاری یەکێـکە لـەناودارانی هاوڕێیـانی پێغەمبـەر، لـە خـۆی دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: من چوارەمین کەس بووم کە ئیسلام بووم، لەبەر زوهدو بێ هەوایی، لە حەدیثدا دەی شوبهێنن بە حەزرەتی عیسا (دروودی خودای لەسەر بێ) لـە دوا جـەنگی خەنـدەق لـە مەدینـە لـە خزمـەت حەزرەتـدا مایـەوە، هـەتا حەزرەت وەفاتی کرد، بەپێی ڕێبازو بۆچوونی ئەبو زەڕ: (ناڕەوایە بۆ مـرۆڤ پـتر لـە پێداویستی خـۆی مـاڵو سـامان پاشـەکەوت بکـاو کەڵەکـەی بکـا). بۆیـە لـەم سەردەمەدا پێی دەڵێن: (أبو الإشتراكيةِ في الإسْلَامِ).

لە ئیسلامدا ماڵ بەهرەیەکە لە بەهرە گەورەکانی خودا، مـاڵی ڕەحمـەت هـەتا زۆربێ کەمـەو دەسمایـەی دیـنو دونیایـە، هـەتا هـەوڵی زیـاتری بـۆ بـدەی جێـگەی خۆیەتی، بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا، دەوڵەتی ئیسلام مافی هەیە سیستەمی ماڵداریی‌و بواری ئابووری چاودێری بکا، لەکاتی پێویستدا جڵەوی چڵێسی سەرمایەداری بگرێ. ئـەبو زەڕ دوو سـەدو هەشـتاو یـەك فـەرموودەی هەیـە، وە لـە بوخاریـدا چـوارده فەرموودەی هەیە، لە موسلیمدا بیستو نۆ فەرموودەی هەیە، دوازدەیـان پەسـەندی هەردوو پیری بوخاریو موسلیمە، لە ڕەبەزە لە سـاڵی (٣٢)ی کۆچـی ئـەمری هـەقی بـەجێ هێنـا، ئیبنـو مەسـعوود نوێـژی تـەرمی لەسـەر کـرد. (بڕوانـە: تـاج/٥/٢٠٤، زنجـیرە: ٥٩، ژمـارە: ١ = ژ-٣٥٠٧ تـاج-٣+ تەجریـد/٤/٩٢، ژمـارە: ١٤٠٣ — داسـتانی موسوڵمان بـوونی ئـەبو زەڕ + مسـلم/ ١٥ — ١٦ ص-٢٤٥، رقـم/٦٣٠٩، ط/١٢ — ٢٠٠٦ — دار المعرفة. بيروت-لبنان).

## ٧) باسی فەرمانکردن بە ئیمانو باوەڕو پەناگرتن بە خودا لە وەسوەسەی شەیتان (٣٣٨-٣٥٠).

{**باب: فِي الأَمْرِ بِالإِيمَانِ وَالاِسْتِعَاذَةِ بِاللَّهِ عِنْدَ وَسْوَسَةِ الشَّيْطَانِ.** (ج/١ ص٣٣٣).}

١٧ أ– عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « لاَ يَزَالُ النَّاسُ يَسْأَلُونَكُمْ عَنِ الْعِلْمِ، حَتَّى يَقُولُوا: هَذَا اللَّهُ، خَلَقَنَا فَمَنْ خَلَقَ اللَّهَ؟ ». قَالَ: فَبَيْنَا أَنَا فِى الْمَسْجِدِ إِذْ جَاءَنِى نَاسٌ مِنَ الأَعْرَابِ، فَقَالُوا: يَا

أَبَا هُرَيْرَةَ هَذَا اللَّهُ خَلَقَنَا فَمَنْ خَلَقَ اللَّهُ؟ قَالَ: فَأَخَذَ حَصًى بِكَفِّهِ فَرَمَاهُمْ بِهِ، ثُمَّ قَالَ: قُومُوا قُومُوا، صَدَقَ خَلِيلِي (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). (م –١/٨٤ – ٨٥). {الحديث٣٤٧ –٣٣٨–٣٥٠. إِنْفَرَدَ بِهِ مُسْلِمٌ، تُحْفَةُ الأَشْرَافِ (١٥٤٠٣)}.

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەردەوام خەڵك پرسیارتان لێ دەكەن، لەبارەی زانستەوە، تەنانەت كاردەگاتە ئەوە، شەیتان دەچێ بەلای كەسێكتانەوە، تا تەفرەی بدا، دەچێتە بن كلێشەیەوە، ختەختەی دەداو دەڵێ: باشە ئەوا خودا ئەمەو ئەوەی دروست كردووە، ئەی كێ خودای دروست كردووە؟).

فەرمووی: جارێ لە مزگەوت بووم، لەودەمەدا، چەند عارەبێكی سارانشین هاتن بۆلام، گوتیان: ئەی ئەبو هورەیرە! باشە ئەوا خودا ئێمەو ئەم بوونەوەرەی دروست كردووە، ئەی كێ خودای دروست كردووە؟!

راوی دەفەرموێ: ئەبو هورەیرەیش مشتێ چەوی هەڵگرتو تێی گرتن، ئەوجا فەرمووی: هەڵسن هەڵسن، دەورم چۆڵكەن، ئێوە لەوانەن كە پێغەمبەر فەرموی پێمان: شەیتان دەچێتە بن كلێشەیان ... تاد. ئەوجا ئەبو هورەیرە فەرمووی: (دۆستی ئازیزی خۆشەویستم، پێغەمبەری خودا (سلاَوو دروودی خودای لەسەر بێ)، راستی فەرموو كە فەرمووی ئەم جۆرە پرسیارەتان لێ دەكەن، ئەوا لێیان كردین).

**روونكردنەوە:**

پوختەی تەرجەمەو گێڕانەوەكە، لە هەموو ئەتراف‌و گێڕانەوەكانی موسلیم‌و بوخاری وەرگێڕاوە، لەبەرئەوە جێگەی بتمانەیە، مەبەستی سەرەكی بەندە تێگەیاندنی خوێنەری كوردە لە مەبەست‌و كورۆك‌و ناوەڕۆكی فەرموودەكان (بڕوانە: فتح الباری/٦/٣٣٦، رقم/ ٣٢٧٦. بدء الخلق = تەجرید/٣/٤٥٠، ژمارە: ١٣٢٢ + تەجرید/٥/٣٧٦، ژمارە: ٢١١٩).

١٧ ب- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِىِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « لاَ يَزَالُ النَّاسُ يَسْأَلُونَكُمْ عَنِ الْعِلْمِ، حَتَّى يَقُولُوا: هَذَا اللَّهُ خَلَقَنَا فَمَنْ خَلَقَ اللَّهَ؟ ». قَالَ: وَهُوَ آخِذٌ بِيَدِ رَجُلٍ، فَقَالَ: « صَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ، قَدْ سَأَلَنِى وَاحِدٌ، وَهَذَا الثَّانِى ». (م/ ١-٨٤) {الحديث ٣٤٥. انفردَ بِهِ مسلم. تحفة الأشراف (١٤٤٤٢) الإيمان}.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو خەڵکە هەر پرسیارتان لێ دەکەن سەبارەت بە زانست هەتا بەرە بەرە دەڵێن: دەی باشە ئەوا خودا ئێمەی دروست کردووە، ئەی کێ خودای دروست کردووە). گوتی: لەم کاتەدا دەستی پیاوێکی گرتبوو دەیفەرموو: خواو پێغەمبەر راستیان فەرموو، ئەوەتا هەتا ئێستا یەك کەس ئەم پرسیارەی لێ کردووم، ئەوا بەمەوە بوون بە دوان!.

## ٧ م) باسی باوەڕ بەخوداو ئیستیقامەتو بەردەوام بوون لەسەری (١٨٥).

## باب: في الإيمان بالله والاستقامة

١٣/١٤- باب: جامع أوصافِ الإسْلاَم. (ج/١/١٩٩).

١٨- عَنْ سُفْيَانَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الثَّقَفِىِّ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! قُلْ لِى فِى الإِسْلاَمِ قَوْلاً، لاَ أَسْأَلُ عَنْهُ أَحَدًا بَعْدَكَ - وَفِى حَدِيثِ أَبِى أُسَامَةَ: غَيْرَكَ – قَالَ: « قُلْ آمَنْتُ بِاللَّهِ ثُمَّ اسْتَقِمْ ». (م – ١/٤٧). {الحديث ١٥٨. الإيمان. ترمذي ٢٤١٠ زهد. ابن ماجه: ٣٩٧٢. فتن. تحفة الأشراف: ٤٤٧٨}.

سوفیانی کوڕی عەبدوڵڵای سەقەفی فەرمووی: عەرزی خۆشەویستم کرد: ئەی ڕەوانەکراوی خودا! سەبارەت بە موسوڵمانەتی، فەرمایشتێکی وام پێ بفەرموو کە بێجگە لەتۆ هەوەجێم بەکەسی تر نەبێ کە لەوبارەیەوە پرسیاری لێ بکەم؟ فەرمووی: (بڵێ باوەڕی تەواوم هەیە بە خودای تاكو تەنیا، ئەوجا ملی ڕێگەی راست بگرەو بەسەر راستیو بە راستاڵی، سەرومڕ بەردەوامبە لەسەری). (ریاض/١/٩٧، ژمارە: ٨٥).

**روونكردنەوە:**

سوفیانی كوڕی عەبدوڵڵای سەقەفی (ڕەزای خودای لێ بێ) لە هاوەڵانی پێغەمبەرە، موسلیمو نەسائیو تەرمەزیی فەرموودەكانی ئەویان دەرهێناوە، لە بوخاریدا فەرموودەی نییە، لە موسلیمیشدا تەنها ئەم فەرموودەیەی ئێرەی هەیە، پێشەوا عومەر كردی بەسەر كاری سەر زەكاتی طائیف.

**٨) باسی نیشانەو بەڵگەكانی پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەرو باوەڕهێنان پێی.**
**(٣٨٣ - ٣٨٦ = كۆی فەرموودەكانی ئەم باسە) (٣٨٦ - ٣٨٣ = ٣ فەرموودە).**
**باب: في آيَاتِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) والإيمان بِهِ.** (٦٩/٧٠).

٦٩/٧٠ - باب: وجوب الإيمانِ بِرِسَالَةِ نبِيّنَا محمد (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إلى جَمِيعِ النَّاسِ وَنَسْخِ المِلَلِ بِمِلَّتِهِ (باب: آيات النبيّ والإيمانِ بِهَا - نسخة).

١٩- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « مَا مِنَ الأَنْبِيَاءِ مِنْ نَبِىٍّ إِلاَّ قَدْ أُعْطِىَ مِنَ الآيَاتِ مَا مِثْلُهُ آمَنَ عَلَيْهِ الْبَشَرُ، وَإِنَّمَا كَانَ الَّذِى أُوتِيتُ وَحْيًا أَوْحَى اللَّهُ إِلَىَّ، فَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَكْثَرَهُمْ تَابِعًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ » . (م - ٩٢/١ - ٩٣). {الحديث ٣٨٣. الإيمان. بوخارى: ٤٩٨١، ٧٢٧٤. تحفة الأشراف: ١٤٣١٣ - تجريد: ١٧٢٢ بەرگی/٤/٥٢٣ + تاج/٧/١٣٤تاج-٤ ز-٢٥ ژ-٤٠٨٦ چ-٤}.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەموو پێغەمبەرێ، لەكاتی خۆیدا، نیشانەی گەورە گەورەو موعجیزەیەكی وەهای پێ دراوە، كە ئادەمیزادەكانی سەردەمی خۆی بەهۆی ئەو نیشانە گەورانەو موعجیزانەوە، ئیمانو باوەڕیان پێی هێناوە، بەڵام ئەو موعجیزەیەی كە خەڵاتكراوە بەمن ئەم قورئانە پیرۆزەیە، كە خودا بەوەحیو سروش بۆی ناردووم، كە لایەنی ئیعجازەكەی نەبڕاوەیەو هەمیشە بەردەوامە، وەك موعجیزەكانی پێغەمبەرەكانی تر نییە، كە تایبەت بن بە خەڵكی سەردەمی خۆیانەوەو پاش خۆیان كاریگەری یان نەمێنێ، بۆیە ئومێدم گەورەیە كە لە ڕۆژی قیامەتدا، من لە هەموو پێغەمبەرەكانی تر ئوممەتم زیاتر بێ).

٢٠- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ)، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، أَنَّهُ قَالَ: « وَالَّذِى نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لاَ يَسْمَعُ بِى أَحَدٌ مِنْ هَذِهِ الأُمَّةِ يَهُودِىٌّ، وَلاَ نَصْرَانِىٌّ، ثُمَّ يَمُوتُ وَلَمْ يُؤْمِنْ بِالَّذِى أُرْسِلْتُ بِهِ إِلاَّ كَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ ». (م – ١/٩٣). {الحديث ٣٨٤. انفرد به مسلم تحفة الأشراف: ١٥٤٧٤}.

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خۆشەویست (دروودو سڵاوی خودای گەورەی لێ بێ) فەرمووی: (سوێندم بەو کەسە گیانی موحەممەدی بەدەسە، کە دیارە خودای گەورەو سەروەرە، هەر کەسێ لە نەتەوەی سەر زەوی، هەر لە ئێستاوە هەتا رۆژی قیامەت، چ جوولەکە بێ، چ گاور بێ، چ نەتەوەیەکی تر بێ، ناوی من ببیستێو پێغەمبەرایەتی منی پێ رابگەیەنرێ، وە پێش ئەوەی کە بمرێ، باوەڕ بەم پەیامە پیرۆزەی من نەکا، ئەوە مسۆگەر دەبێ بەهاوملی ئاگری دۆزەخ!).

**ڕوونکردنەوە:**

ئیمامی نەوەوی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (ئەم فەرموودەیە، بە دەلالەتی مەفهوومەکەی، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە هەرکەسێ بانگەوازی ئیسلامی پێ رانەگەیەنرێو، بانگهێشتی ئایینی پیرۆزی پێ نەگەیشتبێ، عوزری قەبووڵ دەکرێ، مەرج نییە کە دۆزەخی بێ).

٢١- عَنْ صَالِحِ بْنِ صَالِحٍ الْهَمْدَانِىِّ، عَنِ الشَّعْبِىِّ، قَالَ: رَأَيْتُ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ خُرَاسَانَ سَأَلَ الشَّعْبِىَّ فَقَالَ: يَا أَبَا عَمْرٍو! إِنَّ مَنْ قِبَلَنَا مِنْ أَهْلِ خُرَاسَانَ يَقُولُونَ فِى الرَّجُلِ، إِذَا أَعْتَقَ أَمَتَهُ ثُمَّ تَزَوَّجَهَا فَهُوَ كَالرَّاكِبِ بَدَنَتَهُ. فَقَالَ الشَّعْبِىُّ: حَدَّثَنِى أَبُو بُرْدَةَ بْنُ أَبِى مُوسَى، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « ثَلاَثَةٌ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُمْ مَرَّتَيْنِ: رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ آمَنَ بِنَبِيِّهِ وَأَدْرَكَ النَّبِىَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَآمَنَ بِهِ وَاتَّبَعَهُ وَصَدَّقَهُ، فَلَهُ أَجْرَانِ، وَعَبْدٌ مَمْلُوكٌ أَدَّى حَقَّ اللَّهِ تَعَالَى وَحَقَّ سَيِّدِهِ، فَلَهُ أَجْرَانِ، وَرَجُلٌ كَانَتْ لَهُ أَمَةٌ فَغَذَاهَا فَأَحْسَنَ غِذَاءَهَا، ثُمَّ أَدَّبَهَا فَأَحْسَنَ أَدَبَهَا، ثُمَّ أَعْتَقَهَا وَتَزَوَّجَهَا، فَلَهُ أَجْرَانِ ». ثُمَّ قَالَ الشَّعْبِىُّ لِلْخُرَاسَانِىِّ: خُذْ هَذَا الْحَدِيثَ بِغَيْرِ شَىْءٍ، فَقَدْ كَانَ الرَّجُلُ

يَرْحَلُ فِيمَا دُونَ هَذَا إِلَى الْمَدِينَةِ. (م – ١/٩٣) {٣٨٥. الإيمان. بوخاري: ٩٧، ٢٥٤٤، ٢٥٤٧، ٢٥٥١، ٣٠١١، ٣٤٦٤، ٥٠٨٣. ترمذي: ١١١٦. إبن ماجة: ١٩٥٦ تحفة الأشراف: ٩١٠٧ – تجريد/١/١٠٤. ژمارە: ٨٢}.

صاڵحی کوڕی صاڵحی هەمەدانی فەرمووی: پیاوێکی خۆراسانیم بینی، لە شەعبی پرسی، گوتی: ئەی باوکی عەمر! خەڵکی خۆراسانی لای ئێمە، بازێکیان دەڵێن: ئەو پیاوەی کەنیزەکەکەی خۆی ئازاد بکاو پاشان بۆخۆی مارەی بکا، ئەوە کارێکی باش ناکا، چونکە لەکەسێ دەچێ کە وشترێ بکا بە دیاری بەیتو دوایی لێی پەشیمان ببێتەوە، یا شتێ بکا بەخێرو دوایی بە بەهایەکی کەم بیکڕێتەوە لە هەژارەکە؟

شەعبیش فەرمووی: وانییە، چونکە من ئەبو بوردەی کوڕی ئەبو مووسای ئەشعەری، لە ئەبو مووسای باوکیەوە گێڕایەوە بۆم: کە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەم سێ کەسە دوو پاداشتی باشیان بۆ هەیەو، لە دوولاوە خێرێکی گەورەیان دەگات: یەکەم پیاوێ، یا ژنێ، کە لەسەر ئایینی جوولەکە یا گاور بێو، پاشان موسوڵمان ببێو شوێن پێغەمبەر بکەوێو باوەڕ بە پەیامەکەی بکات، ئەمە دوو پاداشتی باشی بۆ هەیە، دووەم: کۆیلەیێ کە هەم مافی خوداو هەم مافی ئاغاکانی بەجوانی بەجێ بهێنێ، ئەمیش دوو پاداشتی باشی بۆ هەیە، سێیەم: پیاوێ کەنیزەکێکی وای هەبێ، کە موڵکی یەمینی بێو بۆی حەڵاڵ بێ، بەجوانی بەخێوی بکاو، بەجوانی تەمێو پەروەردەی بکاو، فێری خوێندەواریو زانستی بکا، ئەوجا ئازادی بکاو مارەی بکا بۆ خۆی، وە مەبەستی لەم کارەیش ساخ ڕەزامەندی خودا بێ، ئەمیش دوو پاداشتی بۆ هەیە!).

ئەوجا شەعبی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) بە پیاوە خۆراسانیەکەی فەرموو: ئەم فەرموودەیە بە هاسانیو بەبێ هیچ ئەرکێ، وەربگرە بۆ خۆتو لەبەری بکە، جاران زاناکان وا وێڵ بوون بەدوای فەرموودەدا، بۆ وەرگرتنی فەرموودەیێ، کە پلەو پایەی نەدەگەیشتە پلەو پایەی ئەم فەرموودەیەش لێرەوە بە سواری وڵاخ دەچوون بۆ مەدینەی نازدار بۆ فێر بوونی). (تاج/٣/٨٣ = تاج-٢ ز-٣٤ ژ-٢١٠١ چ-٤ = چاپی چوارەم).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەبو مووسای ئەشعەری، ناوی عەبدوڵڵای کوڕی قەیسە، لە هاوەڵە مەزنەکانی پێغەمبەرە، سێ سەدو شەست فەرموودەی لە کتێبە ناودارەکانی فەرموودەدا هەیە، لە بوخاریدا (٥٤) فەرموودەی هەیە، لە موسلیما (٦٥) فەرموودەی هەیە، پەنجایان پەسەندی هەردوولایانە، کەواتە چوار فەرموودەی لە ئەفرادی بوخارییە، پازدە فەرموودەی لە ئەفرادی موسلیمە، کۆی فەرموودەکانی لە صەحیحەیندا یەکسانە بە: (٥٠ + ٤ + ١٥ = ٦٩) فەرموودە.

زانایەکی گەورە بوو، کۆچی کردووە بۆ حەبەشە، لەپاشا بۆ مەدینە، پێغەمبەر کردی بەسەرکاری سەر بەشێ لە یەمەن، والی عومەر بوو لەسەر بەسرە، ئەهوازو ئەسپەهان لەسەر دەستی ئەودا ئازادکران، یەکێ بوو لە دوو ناوبژیوانەکەی جەنگی صەفین، نوێنەری ئیمامی عەلی بوو، دەنگی زۆر خۆش بوو، بە دەنگێکی خۆشو زۆر بەسۆز قورئانی دەخوێند، پێغەمبەر پێی فەرموو: (خودا دەنگو ئاوازێکی خۆشی پێداویت....). هەموو جارێ عومەر پێی دەفەرموو: (ئەی ئەبو مووسا! خودامان یادبخەرەوە بە خوێندنی عەشەرەیێ. ئەویش بۆی دەخوێندن). لە تەمەنی (٦٣)ساڵیدا، لە مەککە یا لە کووفە مردووە (بڕوانە: تەجرید/١/٣٣، ژمارە: ١١ + بەرگی/٤/٢٩٤، ژمارە: ١٥٥٥ + لاپەڕە: ٣٢٠، ژمارە: ١٥٧٨ + لاپەڕە: ٥٤٢، ژمارە: ١٧٣٨ + لاپەڕە: ١٤١، ژمارە: ١٤٥٤) + (تاج/٥/٢٢٤ زنجیرە/٦٣ = تاج-٣ ژ-٣٥٢٧ هەتا ٣٥٣٢ چ-٤).

**٩) باسی سێ شت هەن لەهەر کەسێکا هەبن شیرینی باوەڕ دەچێژێ.**

**باب: ثلاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلَاوَةَ الإيمان.** (١٥/١٦).

١٥/١٦- باب: بيان خِصَالِ مَنِ اتَّصَفَ بِهِنَّ وَجَدَ حَلَاوَةَ الإيمان ج/١/٢٠٣.

٢٢- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ بِهِنَّ حَلَاوَةَ الإِيمَانِ، مَنْ كَانَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَأَنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لاَ يُحِبُّهُ إِلاَّ لِلَّهِ، وَأَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِ بَعْدَ أَنْ أَنْقَذَهُ اللَّهُ مِنْهُ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ ». (م – ١/٤٨) {الحديث ١٦٣ – ١٦٥. الإيمان. بوخاری: ١٦، ٢١، ٦٠٤١، ٦٩٤١}.

له ئەنەسەوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ ئەم سێ شتەی تیادا بێ، تامی شیرینی باوەڕ بەخودا دەچێژێ، یەکەم: خوداو پێغەمبەری خودای له هەموو شتێکی تر لەلا خۆشەویستتربێ، دووەم: هەرکەسی خۆش بوێ ساخ لەبەر رەزای خودای گەورە خۆشی بوێ، وەك ئەوە لەبەرئەوە خۆشی بوێ، کە پیاو باشە، یا زانایەکی خاوەن تەقوایە، نەوەك لەبەر جاهو مەبەستی دونیایی، سێیەم: چۆنیش پێی ناخۆشە کە فڕێ بدرێتە ناو ئاگری سوورەوە، ئاوەهایش پێی ناخۆش بێ، کە جارێکی تر بچێتەوە سەر کوفرو بێباوەڕی دوائەوە کە خودا رزگاری کردووە لێی). (بڕوانە: تەجرید/١/٣٦ — ١٦/١٦ + تاج/١/٢١ ز-٢ ژ-٥ چ-٤).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەنەسی کوڕی مالیك نۆکەری پێغەمبەر بووە، دەساڵ خزمەتی حەزرەتی کردووە، بە هەتیوی گەورە بووە، لەناو یاراندا کەس بەقەد ئەو منداڵی نەبووە، دەوڵەمەند بووە، تەمەنی درێژ بووەو، پێغەمبەری خوا لەسەر داخوازی دایکی ئەنەس ئەم نزایەی بۆ کردووە: خودایە! پیتو فەڕ بخەرە ماڵو مناڵیو تەمەنی درێژکەو لە گوناهی خۆش بە). (تەجرید/٢/٢٩٤، ژمارە: ٩١٣).

ئەنەس دەفەرموێ: (سەد مناڵ (دوو کەمم) بە خاك سپاردووە، کە هەموویان لە پشتی خۆم بوون!). رەزێکی هەبوو هەموو ساڵێ دووجار بەری دەگرت، ریحانێکی تیادا بوو بۆنی میسکی لێوە دەهات، دەڵێن: زیاتر لەسەد ساڵ ژیاوە، دوا هاوەڵی پێغەمبەر بووە کە لە (٩٣)ی کۆچیدا، لەسەردەمی حوکمڕانی حەجاجدا لە بەصرە مردووە. (٢٢٨٦) فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە (٢٥١) فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە (٢٥٩) فەرموودەی لە موسلیما هەیە (١٦٨)یان پەسەندی هەردوولایانن، لەسەر ئەم بنیاتە ئەفرادی بوخاری (٨٣) فەرموودەن، ئەفرادی موسلیم (٩١) فەرموودەن، لە مقدمەی فتح الباریدا دەفەرموێ: (لە بوخاریدا (٢٦٨) فەرموودەی هەیە). ئەم جیاوازییە لەم جۆرە شوێنەدا دەگەڕێتەوە بۆ هەندێ هۆی

هونەری، سەبارەت بەو فەرموودانەی کە بێژەو دەقەکانیان زۆر لەیەکەوە نزیکن. (تاج/١٨٤/٥، زنجیرە: ٥٤ تاج-٣ ژ-٣٤٨٥-٣٤٩١) {بڕوانە: ژمارە/ ١٥٤ لەم بەرگە}.

٢٣- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ): قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ » . (م – ١/٤٩). {الحديث ١٦٧ – طرفه في: ١٦٦. الإيمان. بوخاري: ١٥ + ١٤. نسائي: ٥٠٢٨. ابن ماجة: ٦٧. تحفة الأشراف: ١٢٤٩}.

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سوێندم بەوکەسە کە گیانی منی بەدەستە، کە خودای گەورەو سەروەرە، کەستان بەتەواوی باوەڕو ئیمان ناهێنێ‌و بە ئیمانداری تەواو حسێب ناکرێ، هەتا منی خۆشتر نەوێ لە باوك‌و لە دایك‌و لە منالی خۆی‌و لە گشت خەڵکی تریش سەرجەم). (تەجرید/٣٥/١، ژمارە: ١٤، ١٥) + (تاج/٢٠/١، ژمارە: ١).

٢٤- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لاَ يُؤْمِنُ عَبْدٌ حَتَّى يُحِبَّ لِجَارِهِ - أَوْ قَالَ: لأَخِيهِ - مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ ». (م – ١/٤٩). {الحديث ١٦٨ – طرفه في: ١٦٩. الإيمان. بوخاري: ٣/١٣، ترمذي: ٢٥١٥. نسائي: ٥٠٣١، ٥٠٥٤. ابن ماجة: ٦٦. تحفة الأشراف: ١٢٣٩}.

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەوکەسە گیانی منی بەدەسە، کەستان بەتەواوی ئیمان‌و باوەڕ ناهێنێ، هەتا هەرچی بۆ خۆی پێی خۆشە، بۆ دراوسێکەی‌و بۆ برای موسوڵمانیشی پێی خۆش نەبێ!). (بڕوانە: بەرگی/٣٤/١، ژمارە: ١٣ – تەجریدی بوخاری = مختصر صحيح البخاري).

## ١٠) چێژو تامی باوەڕ دەچێژێ، هەرکەسێ بەخوایەتی خوا رازی بێ
## باب: ذَاقَ طَعْمَ الإيمَانِ مَنْ رَضِيَ بِاللّهِ رَبّاً. (١٢/١١).

١١/١٢- باب: الدليل على أنَّ مَنْ رَضِيَ بِاللّهِ رَبّاً وَبالإسْلاَمِ دِيناً وَبِمُحَمَّدٍ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَسولاً، فَهُوَ مُؤْمِنُ، وَإِنِ ارْتَكَبَ المَعَاصِيَ الكَبَائِرَ.

٢٥- عَنِ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: « ذَاقَ طَعْمَ الإِيمَانِ مَنْ رَضِىَ بِاللَّهِ رَبًّا ، وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا ، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً ». {الحديث ١٥٠. الإيمان. ترمذي: ٢٦٢٣. تحفة الأشراف: ٥١٢٧}.

عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم گوێم لە پێغەمبەری خۆشەویست بوو، دەیفەرموو: (تامو بۆنو بەرامەی باوەڕی بەخودا چەشتووە، هەرکەسێ یەزدانی پاك بە خودای خۆی بزانێو، ئایینی پیرۆزی ئیسلام بە ئایینی خۆی بزانێو، موحەممەد بە پێغەمبەری خۆی قەبووڵ بکات). (تاجی کوردی/١/٢٣، ژمارە: ١٠ ز-٢ ژ-١٢).

**ڕوونکردنەوە:**

عەباسی کوڕی عەبدولموتتەلیب مامەی هەقی پێغەمبەرە، نازناوی ئەبو لفەضلە، دوو ساڵ لە پێغەمبەر گەورەتر بوو، بە منالی بزر دەبێ، دایکی ئاه (نەزر) دەکا، ئەگەر دۆزییەوە بەرگی ئاوریشم بۆ کەعبە بکا، وە ئەیدۆزێتەوە، جا نەزرەکەی جێبەجێ دەکا، ئەو یەکەم کەس بووە کە بەرگی بۆ کەعبە کردووە، لە غەزای بەدردا دیل دەکرێ، بەسەرانە موسوڵمانەکان ئازادی دەکەن، بەڵام لەو ماوەیەدا ئیسلام دەبێ، وە لەپێش ئازادکردنی مەککەدا، کۆچ دەکا بۆ مەدینە، لە غەزای فەتحی مەککەدا بەشداری دەکا، لە ڕۆژی حونەیندا، یەکێ بوو لەو موسوڵمانانەی کە هەڵ نەهاتنو دەوری پێغەمبەریان چۆڵ نەکردو پێغەمبەر دەیفەرموو: (عەباس پارچەیەکە لە منو من پارچەیەکم لە عەباس).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (هەرکەسێ ئازاری عەباس بدا، ئەوە ئازاری من دەدا، چونکە مامی مرۆڤ لە جێگەی باوکێتی).

عەباس کۆمەڵێ فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، لە صەحیحەینا فەرموودەی هەیە، لە بوخاریدا پێنج فەرموودەی هەیە، عەباس زۆر سەخی بوو، زۆر خزم دۆست بو، لەپاش ئەبو تالیب، لەناو مامەکانی پێغەمبەردا، کە یازدە مامەی بووە، عەباس لەوانی تریان زیاتر یاریدەی پێغەمبەری ئەدا، پێغەمبەر زۆر ڕێزی عەباسی دەگرت، دەیفەرموو: (عەباس مامەمە، هاوخەڵفی باوکمە). عەباس

هۆشمەند بوو، نزای گیرا بوو، لە ساڵی حەڤدەی کۆچیدا، بێ بارانی بوو، عومەر لەخوا داوای کرد کە لەبەر خاتری عەباسی مامەی پێغەمبەر بارانیان بۆ ببارێنێ، وە خودا بارانی بۆ بارانن (ژمارە: ٥٢٠، بەرگی/١/٤٩٥).

عەباس پیاوێکی بالا بەرزی سپیکەلەی جوان بوو، لە تەمەنی (٨٧) ساڵیدا، لە مانگی رەجەب، یا رەمەزاندا لە مەدینە، مەرگی خودایی، بوو بەمیوانی، لە ئیستیعابا دەفەرموێ: (عەباس پیاوێکی جوانی سپیو سووری لەش ناسکی بالا ناوەنجی بوو، دوو پەلکەی هەبوو ... لە مەدینە، لە رۆژی هەینیدا، لە شەوی دوازدەی رەجەبدا، لەپێش شەهید بوونی ئیمامی عوسماندا بە دوو ساڵ، بە مردنی خوا مردووە). هەندێ دەڵێن: لە رەمەزانی ساڵی سیی‌و دووی کۆچی، لە تەمەنی (٨٨) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، لە بەقیع نێژراوە، ئیمامی عوسمان نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی کردووە، سیی‌و دوو ساڵ لەسەردەمی ئیسلامدا ژیاوە، لەسەردەمی نەزانیشدا پەنجاو شەش ساڵ ژیاوە، کە دەکاتە: (٥٦ + ٣٢ = ٨٨) ساڵ، عەبدوڵلای کوڕی دایهێڵایە ناو گۆڕەکەیەوە. (بڕوانە: بەرگی/٣/٣٤٤، ژمارە: ١٢١٨ + بەرگی/٤/٢٠٠، ژمارە: ١٥١٠ تەجرید + تاج/٥، زنجیرە: ١٧، لاپەڕە: ١٠٣ + تاج/٥، زنجیرە: ٢١، لاپەڕە: ١٢١ + تەجرید — ژمارە: ٧٢١، ٧٦١، ٧٨٨).

## ١١) باسی چوار خوو هەن هەرکەسێ خوویان پێوە بگرێ ناپاکی تەواوە
## باب: أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقاً خَالِصاً. (٢٤/٢٥).

٢٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقًا خَالِصًا، وَمَنْ كَانَ فِيهِ خَلَّةٌ مِنْهُنَّ كَانَ فِيهِ خَلَّةٌ مِنْ نِفَاقٍ، حَتَّى يَدَعَهَا: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ ». غَيْرَ أَنَّ فِي حَدِيثِ سُفْيَانَ « وَإِنْ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنْهُنَّ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنَ النِّفَاقِ ». (م — ١/٥٦). {الحديث ٢٠٧ — ٢١١. الإيمان. بوخاري: ٣٤، ٢٤٥٩، ٣١٧٨.. أبو داود: ٤٦٨٨. ترمذي: ٢٦٣٢. تحفة الأشراف: ٨٩٣١}.

عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص (رەزای خودا لە خۆی‌و لە باوکی) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ خوو بگرێ بەم چوار

شتەوە، ئەوە مونافیقو ناپاکی تەواوە، وە هەرکەسێ خوو بگرێ بە یەکێ لەم چوار شتەوە ئەوە رەگێکی ناپاکیو نیفاقی واتیادا، هەتا وازی لێ دێنێ: یەکەم: کاتێ قسەو گفتوگۆ دەکا، بە قەستی درۆی تیا دەکا، دووەم: کاتێ پەیمانی دا بەکەسێ بیشکێنێو بێ پەیمان دەربچێ، سێیەم: کاتێ بەڵێنیدا بە کەسێ نەیباتە سەر، چوارەم: کاتێ داوایەکی هەبوو لەسەر کەسێ، ناهەقی لێ بکاو، بە هەق رازی نەبێو، بەهەقو ناهەق بیەوێ قسەی خۆی سەربکەوێ). (بڕوانە/ تەجرید/١/٥٣، ژمارە: ٣٤/٣٢ + ریاضی کوردی/٢/٢٠٧، ژمارە: ٦٩٠ = ش = شەیخان = بوخاریو موسلیم).

**روونکردنەوە:**

بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم جۆرە فەرموودەیە کە بۆنی ئەوەی لێ دێ، موسوڵمان بەهەندێ تاوان لە جەغزی باوەڕ دەردەچێو دەچێتە خانەی ناپاكو مونافقو بێباوەڕەوە، بفەرموو بڕوانە روونکردنەوەی زانایان کە لە ریاضی کوردی/٢ لە لاپەڕە/ ٢٠٨دا تۆمار کراوە، کە مەبەست پێی ئەمەیە: (موسوڵمان بە تاوان لە خانەی ئیمان دەرناچێ، مەبەست لەم جۆرە فەرموودانە زۆر شتە، وەك هەڕەشەو سڵ کردنو کۆکردن لە گوناهو تاوانو دوورکەوتنەوە لەم جۆرە شتانەو خۆ نزیك کردنەوە لە دژە کانیانو دڵو هەست لاواندنو هەژاندنو راهێنانیان لەسەر خووی جوانو تەکاندنەوەیان لە خووی بەدو بەرە بەرە مرۆڤ خۆی لە کۆڕی پیاو چاکان نزیك بکاتەوە!).

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص یەکێکە لە هاوڕێ ناودارەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لە هەموو هاوڕێ نازدارەکانی) دوازدە ساڵ لە باوکی خۆی منالتر بووە، زانایەکی پایە بەرز بووە، زۆر زاناو بلیمەت بووە، زۆر بەدین بووە، حەوت سەد فەرموودەی هەیە، کە لە کتێبە بایەخدارەکانی فەرموودەدا تۆمار کراون، لە بوخاریدا (٢٥) فەرموودەی هەیە، لە موسلیمدا (٣٧) فەرموودەی هەیە، حەڤدەیان پەسەندی هەردوو لایە، واتە: (متفَقٌ علیە)ین، کۆی فەرموودەکانی لە صەحیحەیندا، واتە: لە بوخاریو موسلیمدا

یەکسانە بە {١٧ + ٨+ ٢٠ = ٤٥ = ١٧ پەسەندی هەردوولا (٨) لە ئەفرادی بوخاری (٢٠) لە ئەفرادی موسلیم، دەکاتە (٤٥) فەرموودە لە صەحیحەیندا}.

عەبدوڵلا رۆژنا رۆژێ بەرۆژوو بوو، وە شەو نوێژێکی زۆری دەکرد هەتا مرد، (بڕوانە: تەجرید: ژمارە: ٥٦٤ + بەرگی/٢، لاپەڕە: ٢٩٣، ژمارە: ٩١٢).

لە مانگی قوربانی ساڵی شەستو پێنجی کۆچیدا، لە مەککە، یا لە تائیف، یا لە میسر، لە تەمەنی حەفتاو دوو ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە: (تاج/١/٢٢، زنجیرە: ٢، ژمارە: ٦ + تاج/٥/١٤٠، زنجیرە: ٣١ = تاج-٣ ژ-٣٤١٦-٣٤١٩ ج-٤).

٢٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلاَثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ » . (م — ١/٥٦). {الحديث ٢٠٨. إيمان. بوخاري: ٣٣، ٢٦٨٢، ٢٧٤٩، ٦٠٩٥. ترمذي: ٢٦٣١. إيمان. نسائي: ٥٠٣٦. إيمان. تحفة الأشراف: ١٤٣٤}.

لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) لە خۆشەویستەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نیشانەی مرۆڤی ناپاك (منافق) سێ شتە: کە قسەی کرد بە قەستی درۆ بکا، کە بەڵێنێکی دابەکەسێ بەڵێنەکەی بەجێ نەهێنێ، ئەگەر سپاردەیەکیان پێ سپارد، گزی تیا بکاو ناپاکی لە سپاردە بکا) (تەجرید/١/٥٣، ژمارە: ٣١/٣٣).

### ١٢) موسوڵمان وەك قەرسیلی سەوز وایە، ناپاكو بێباوەڕیش وەك دارکاژ وایە.(٧٠٢٣ - ٧٠٢٨).

### باب: مَثَلُ الْمُؤْمِنَ كَالزَّرْعِ، وَمَثَلُ الـمُنَافِقِ وَالكافِرِ كَالأَرْزَةِ.(١٤/٢٨).

٢٨- عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « مَثَلُ الْمُؤْمِنِ كَمَثَلِ الْخَامَةِ مِنَ الزَّرْعِ، تُفِيئُهَا الرِّيحُ، وَتَصْرَعُهَا مَرَّةً وَتَعْدِلُهَا أُخْرَى، حَتَّى تَهِيجَ، وَمَثَلُ الْكَافِرِ كَمَثَلِ الأَرْزَةِ الْمُجْذِيَةِ عَلَى أَصْلِهَا لاَ يُفِيئُهَا شَيْءٌ حَتَّى يَكُونَ انْجِعَافُهَا مَرَّةً وَاحِدَةً ». {الحديث ٧٠٢٥. صفات المنافقين. بوخاري: ٥٦٤٤، ٧٤٦٦. تحفة الأشراف: ١١١٣٣}. وَفِي رِوَايَةٍ: « وَتَعْدِلُهَا مَرَّةً حَتَّى يَأْتِيَهُ أَجَلُهُ. وَمَثَلُ الْمُنَافِق مَثَلُ الأَرْزَةِ الْمُجْذِيَةِ، الَتِي لاَيُصِيبُهَا شيءٌ ». { الحديث ٧٠٢٦. إنفردَ بِهِ مُسْلِمٌ، تحفة الأشراف: ١١١٥٠}. (م — ٨/١٣٦).

کەعبی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر فەرمووی: (موسوڵمان وەك قەرسیلی سەوزی نەرمو نۆڵ وایە، هەروەك چۆن قەرسیلو سەوزەگیا بەدەم باوە هەزارە دەکا، بەلاّم بایەکە قەرسیلەکەی بۆ هەڵناکەنرێ، هەر کەباکەی خست قەرسیلەکە قیتو قنجو ڕەپو ڕاست ڕادەوەستێت، موسوڵمانیش ئاوا دەردو بەلاّ، لە هەموو جۆرێ، لەهەر چوار لاوە، دەیهێنێو دەیبات. بەلاّم موسوڵمانەکە خۆگرە، هەرکە ڕزگاری بوو دەست دەکا بە ژیانێکی ئاساییو سوپاسگوزاری خوا دەکاو هەمیشە سەرکەوتوو دەبێ، هەتا بە مەرگی خوا دەمرێو ئەنجامی خێر دەبێ، هەروەك چۆن قەرسیلو گیا، لە کۆتایی ژیانیدا زەرد دەبێو دەگەیێو وشك دەبێ ئاوا. بەلاّم بێباوەڕو کافر، وەك شێخەڵی دارکاژ وایە، قەویو پتەوەو ڕەپو ڕێك ڕادەوەستێت لەسەر بنکەکەی، کەمتر تووشی دەردو بەلاّ دەبێ، هەتا لە ناکاوێکا، بای ئاکام لە ڕەگو ڕیشە هەڵی دەکەنێو خوا لەکاتو ساتی خۆی دا پشتی دەشکێنێ). (تەجرید/١٥٣/٥، ژمارە: ٥٦٤١/١٨٥٧ + تاج/٤، زنجیرە: ٥٢، ژمارە: ١، لاپەڕە: ١٧١ = تاج-٣ ژ-٢٩٣٥).

**ڕوونکردنەوە:**

کەعبی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) تاقانەی باوکی بووە، ناودارە بە کەعبی شاعیر، یەکێکە لە شاعیرە ناودارەکانی موسوڵمانان لەسەردەمی پێغەمبەردا، یەکێکە لەو سێ کەسەی کە ئەم ئایەتە لەبارەیانەوە هاتووە: {وَعَلَى الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّواْ أَن لاَّ مَلْجَأَ مِنَ اللّهِ إِلاَّ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُواْ إِنَّ اللّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ-سورة التوبة/ ١١٨}.

هەشتا فەرموودەی گێڕاوەتەوە، چوار فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە، لەکۆتایی تەمەنیدا کوێربوو بوو، عەبدوڵلای کوڕی چاوساغی بوو. لەسەر فەرمایشتی عەینی، لە ساڵی پەنجای کۆچیدا، لە مەدینە، مردووە). لە ئیستعابا دەفەرموێ: (حەفتاو حەوت ساڵ ژیاوە). (بڕوانە: ریاضی کوردی/٣٤/١، ژمارە: ٣١).

٢٩- عَنْ عُبَيْدِ اللّهِ بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما)، قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللّـهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ) فَقَالَ: « أَخْبِرُونى بشَجَرَةٍ تُشْبِهُ، أَوْ كَالرَّجُلِ الْمُسْلم، لاَ يَتَحَاتُّ وَرَقُهَا،

تُؤْتِي أُكْلَهَا كُلَّ حِينٍ » . قَالَ ابْنُ عُمَرَ: فَوَقَعَ فِي نَفْسِي أَنَّهَا النَّخْلَةُ، وَرَأَيْتُ أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ لاَ يَتَكَلَّمَانِ، فَكَرِهْتُ أَنْ أَتَكَلَّمَ، أَوْ أَقُولَ شَيْئًا، فَقَالَ عُمَرُ: لأَنْ تَكُونَ قُلْتَهَا أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ كَذَا وَكَذَا. {الحديث ٧٠٢٩ – ٧٠٣٣ – صِفَاتُ الْمُنَافِقِين. بوخاري: ٦١، ٦٢، ٧٢، ١٣١، ٢٢٠٩، ٤٦٩٨، ٥٤٤٤، ٥٤٤٨، ٦١٢٢، ٦١٤٤. تحفة الأشراف: ٧٨٢٧}. (م – ١٣٨/٨).

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ لە خزمەتی حەزرەتدا بووین، فەرمووی: (درەختێ هەیە، گەڵاکەی هەڵناوەرێ، هەمیشە سەوزە، نمونەی موسوڵمانە، وەك ئەو بەپیتو فەڕە، ئادەی کێ دەزانێ کە ئەو درەختە چییە؟). خەڵکەکەیش پەلاماری دارو درەختی ئەو دەشتو دەرەیاندا، ناوی چەندین دارو درەختیان گوت، بەڵام هەڵیان نەهێنا، منیش هات بە دڵما، کە ئەوە دارخورمایە، ویستم بڵێم: ئەوە دارخورمایە، بەڵام کە سەرنجم دا، بە منەوە دە کەس بووین، لەناویانا ئەبوبەکرو عومەرم دی، ئەوان قسەیان نەکرد، لەم بارەیەوە، وە من لە هەموویان منداڵتر بووم، لەبەرئەوە شەرمم کردو قسەم نەکرد، جا خەڵکەکە عەرزیان کرد: قوربان! پێمان بفەرموو چییە؟ فەرمووی: (ئەوە دارخورمایە). لەپاشا کە ئەمەم عەرزی باوکم کرد، فەرمووی: خۆزگە دەتگوت، ئەگەر بتگوتبایە، لە ڕانە وشتری سوور مزی، باشترین سامانی عەرەبانم پێ باشتر بوو!. (تەجرید/١/٨٠، ژمارە: ٦١/٥٥ + تاج/٤/٧٤، ژمارە: ٧، زنجیرە: ٢١).

**١٣) شەرمو شکۆ بەشێکە لە باوەڕ** (١٥١ - ١٥٧).

**{باب: الحَيَاءُ مِنَ الإِيمَانِ.** (١٣/١٢).}

٣٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « الإِيمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ، أَوْ بِضْعٌ وَسِتُّونَ شُعْبَةً، فَأَفْضَلُهَا قَوْلُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الإِيمَانِ ». {الحديث ١٥٢ (١٥١ - ١٥٧). الإيمان. بخاري: ٩. تجريد/٩/٩. ابو داود: السنة – ٤٦٧٦. ترمذي: ٢٦١٤. نسائي/ ايمان: ٥٠١٩، ٥٠٢٠، ٥٠٢١. ابن ماجة: ايمان: ٥٧. تحفة الأشراف: ١٢٨١٦}. (٩ – ١/٤٦).

ئـــەبو هـــورەیرە (رەزای خـــودای لێ بـــێ) فـــەرمووی: خۆشەویســـت (دروودی خـــودای لەســـەر بـــێ) فەرمووی: (ئیمانو باوەڕ حەفتاو ئەوەندە، یا شەستو ئەوەندە لقە. گەورەترینیان وشەی پیرۆزی (لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ)یـە، وەهـەرە خواروەکـە یـان لابردنـی ئـازاری سـەر رێـگەو بانـە، وە شـەرمو شـکۆ بەشێـکە لـە بەشـەکانی بـاوەڕ). (بڕوانـە: ریـاض/ ٢ لاپەڕە: ٢٠١، ژمارە: ٦٨٤ + ژمارە: ١٢٥).

٣١- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ فِي رَهْطٍ، وَفِينَا بُشَيْرُ بْنُ كَعْبٍ، فَحَدَّثَنَا عِمْرَانُ يَوْمَئِذٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ): « الْحَيَاءُ خَيْرٌ كُلُّهُ ». أَوْ قَالَ « الْحَيَاءُ كُلُّهُ خَيْرٌ ». فَقَالَ بُشَيْرُ بْنُ كَعْبٍ: إِنَّا لَنَجِدُ فِـي بَعْضِ الْكُتُبِ -أَوِ الْحِكْمَةِ- أَنَّ مِنْهُ سَكِينَةً وَوَقَارًا لِلَّهِ تعالى. وَمِنْهُ ضَعْفٌ. فَغَضِبَ عِمْرَانُ حَتَّـى احْمَرَّتَا عَيْنَاهُ، وَقَالَ: أَلاَ أُرَانِي أُحَدِّثُكَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) وَتُعَـارِضُ فِيهِ؟! قَالَ: فَأَعَادَ عِمْرَانُ الْحَدِيثَ، قَالَ: فَأَعَادَ بُشَيْرٌ، فَغَضِبَ عِمْرَانُ، فَمَا زِلْنَا نَقُـولُ: إِنَّـهُ مِنَّا أَبَا نُجَيْدٍ، إِنَّهُ لاَ بَأْسَ بِهِ (م — ١/٤٧).

{الحـديث ١٥٦. الإيمـان. بخـاري: ٦١١٧ تەجريـد: ١٩٥١/٦١١٧. تحفـة الأشـراف ١٠٨٧٧، ١٠٨٧٨. ابو داود/أدب: ٤٧٩٦}:

ئەبو قەتادە (رەحمەتی خودای لێ بێ) فـەرمووی: دەوری دەپیـاوێ دەبووین لـە خزمـەتی عیمڕانـی کـوڕی حوصـەیندا بـووین، بەشـەیری کـوڕی کـەعبمان لـەناوا بـوو، کـە تابیعییـەکی شـکۆمەندە، ئـەو رۆژە عیمـران فـەرموودەی دەگێڕایـەوە بۆمـان، فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (شەرمو حەیاو شکۆ خێرو بێـرە هەمووی) یا فەرمووی: (شەرمو شکۆ هەمووی خێرو بێرە).

بوشـەیری کـوڕی کـەعبیش گـوتی: ئێمـە لـە پـەڕاوی حیکمەتـدا دیومانـە کـە نووسـراوە: حـەیاو شـەرم سەرچاوەی سـەلاریو مایـەی ئارامییـە! هەشـیەتی هـۆی شکۆمەندیی پەروەردگارە، هەشیەتی مایـەی زەبوونیو لاوازییـە بـۆ مـرۆڤ، چونکە گەلێ جار لەبەر شەرم، لە ئاستی بێ شەرعی بێ دەنگ دەبێ).

عیمرانیش تووڕە بوو، تەنانەت وا تووڕە بوو، هەردوو چاوی سوور هەڵـگەڕان، وەپێی گوت: من پێت دەڵێم کە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) وا دەفـەرموێ، کەچـی

تـۆ رەخنـەی لێ دەگـری‌و قسـەی دەفتـەرە شـڕەکەی خـۆتم بـۆ دەکـەی. فـەرمووی: عیمـران فەرموودەکـەی پێغەمبـەری دووبـارە کـردەوە، بوشـەیریش قسـەکەی خـۆی دووبارە کردەوە، جا عیمران زۆر توڕە بوو، ئێمەیش ویستمان کە هێـدی بکەینـەوە، خۆش خۆش عـەرزیمان دەکـرد: قوربـان ئـەی بـاوکی نوجەیـد! بوشـەیر لەخۆمانـە، موسوڵمانێـکی پاکی ڕێك‌و پێـکە، لـە تانـەی ناپـاکی‌و زەندیقی‌یـەوە بـەدوورە، ئـەم قسەیەی کە دەیکا لەرووی بێ دینییەوە نییە. {تەجرید/٥/٢٢١، ژمـارە: ٦١١٧/١٩٥١ + تاج/٩/٩٤، زنجیرە: ٢٨، ژمارە: ١} + {ریاض/٢/٢٠٠، ژمارە: ٦٨٢}.

**ڕوونکردنەوە:**

عیمرانی کوڕی حوصەین خۆی‌و باوکی هاوڕێی پێغەمبەر بوون، عیمران سـاڵی ئـازادکردنی خەیبـەر ئیسـلام بـووە، لـە پێغەمبـەرەوە سـەدو هەشـتا فـەرموودەی گێڕاوەتەوە، لە بوخاری نازداردا دوازدە فـەرموودەی هەیـە، لـە موسـلیمدا چـەندین فەرموودەی هەیە، لە هاوەڵە شەرع زانە مەزنەکان بـوو، عومـەر نـاردی بـۆ بەصـرە هەتا شارەزای ئاینییان بکا، بووبە قـازی بەصـرە، گشـت جـارێ فریشـتە دەهـاتن بـۆ دیدەنی‌و سلاویان لێ دەکردو بە گوێی خۆی سـلاوەکەیانی دەبیست، کـەنارە گیربـوو لە شـەڕو هـەرای ئاژاوەکـانی سـەردەمی عـەلی‌و عائیشـەو معاویـە، لـە پـەنجاو دووی کۆچیدا، لە سەردەمی جێنشینی موعاوییەدا لە بەصرە کۆچی دوایی کردووە، خۆی لە بەصرە نیشتەجێ بوو، (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ).

**١٤) هاوسێ دۆستی‌و ڕێزگرتنی میوان لە باوەڕە.** (١٧١ - ١٧٤).

**باب: مِنَ الإيمانِ حُسْنُ الجِوارِ وَإِكْرامُ الضَّيْفِ.** (٢٠/١٩).

٣٢- عَنْ أَبِى شُرَيْحٍ الْخُزَاعِىِّ أَنَّ النَّبِىَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) قَـالَ: « مَـنْ كَـانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُحْسِنْ إِلَى جَارِهِ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّـهِ وَالْيَـوْمِ الآخِـرِ فَلْيُكْـرِمْ ضَيْفَهُ، وَمَنْ كَانَ يُـؤْمِنُ بِاللَّـهِ وَالْيَـوْمِ الآخِـرِ فَلْيَقُـلْ خَيْـرًا أَوْ لِيَسْـكُتْ». {الحديث/١٧٤ (١٧١ - ١٧٤) أطرافـه في: ٤٤٨٨، ٤٤٨٩، ٤٤٩٠. بخـاري: ٥١٨٥، ٦٠١٨، ٦٣٣٦،

٦١٣٨، ٦٤٧٥. أبو داوود: أطعمه: ٣٧٤٨. ترمذي: بروصله: ١٩٦٧، ١٩٦٨. ابن ماجه. أدب: ٣٦٧٢، ٣٦٧٥ تحفة الأشراف: ١٢٠٥٦}. (م-١/٥٠).

ئـەبو شـورەيحى خـوزاعى فـەرمووى: حـەزرەت (دروودى خوداى لەسەر بێ) فـەرمووى: (هەركەسێ باوەڕى ساغى بە خوداو بـە ڕۆژى دوايـى هەيـە، با لەگەڵ هاوسێى خۆى زۆر باش بێ، كەسێ باوەڕى بە خوداو ڕۆژى دوايى هەيە بارێزى ميوانى خۆى بگرێ، كەسێ باوەڕى بە خوداو ڕۆژى دوايى هەيە، با قسەى چاك بكا، يا بۆخۆى بێ دەنگ بێ). (رياض/١/٢٥٤، ژمارە: ٣٠٩، ٣٠٨ + تجريد/٥/٣٦، ژمارە: ٥١٨٥/١٧٧٢، ٦٠١٧/١٩٢٩).

**ڕوونكردنەوە:**

ئـەبو شـورەيحى خـوزاعى نـاوى خويلـدى كـوڕى عـەمرە، لـەپێش ئـازادكردنى مەككـەدا ئيسلام بـووە، لـە ڕۆژى ئـازادكردنى شـارى مەككـەدا، يـەكێ لـە ئالاكـانى لەشـكرى كـەعبى كـوڕى خوزاعـەى هەڵـگرتبوو، بيسـت فـەرموودەى لـە پـەڕاوە ناسراوەكانى سوننەتى پێغەمبەرى ئازيزدا هەيە، دوانيان پەسـەندى هـەردوو پـيرى بوخـارىو موسـليمن، فەرموودەيەكيشـيان فـەردى بوخارييـە، لـە موسـليمدا نييـە، يەكێ بووە لە هۆشمەندەكانى شارى مەدينە، گـەلێ جار دەيفـەرموو: هەركەسـێ لـە ماڵى منا شيرو ماستو دۆو ڕۆنو گۆشـتى بەچكە ئاسكى بينـى حـەڵاڵى بـێ، بـەبێ پرسو ڕا بۆخۆى بيخوا، يا بيخواتەوە).

كۆمەڵـەى فـەرموودە زانـەكان كـە ناسـراون بـە (الجماعـە) فـەرموودەى ئـەويان گێڕاوەتەوە. لەساڵى شەسـتو هەشـتى كۆچيدا، لـە مەدينـە كۆچـى دوايـى كـردووە (بڕوانە: تەجريد/١/١١١، ژمارە: ١٠٤/٨٨).

**١٥) هەركەسێ هاوسێى لە زيانو وەزەنى دڵنيا نەبێ ناچێتە بەهەشت** (١٧٠).

**بَابٌ: لَايَدْخُلُ الجَنَّةَ مَنْ لا يَأْمَنُ جَارُهُ بَوَائِقَهُ.** (١٩/١٨).

٣٣- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ لاَ يَأْمَنُ جَارُهُ بَوَائِقَهُ». {الحديث/١٧٠-إنْفَرَدَ بِهِ مُسْلِمٌ. تحفَةُ الأشْرَافِ: ١٣٩٨٩}.(م-١/٤٩).

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) سێ جار لەسەر یەك فەرمووی: (بەخودا باوەڕو ئیمانی نییە). عەرزیان کرد: کێ؟ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (کەسێ کە هاوسێ لە زیان و وەزەنی بترسێ و لە شەڕی دڵنیا نەبێ). (ریاض/١/٢٥٣، ژمارە: ٣٠٥ – متفق علیه).

**١٦) گۆڕینی ناڕەواو ناشایستە بە دەستو بە زمانو بە دڵ بەشێکە لە باوەڕ (١٧٥- ١٧٨). بابُ: مِنَ الإيمانِ تغيير المنكَرِ باليدِ وَاللِسانِ وَالقَلْبِ. (٢١/٢٠).**

٣٤- عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَوَّلُ مَنْ بَدَأَ بِالْخُطْبَةِ يَوْمَ الْعِيدِ قَبْلَ الصَّلاَةِ مَرْوَانُ، فَقَامَ إِلَيْهِ رَجُلٌ، فَقَالَ: الصَّلاَةُ قَبْلَ الْخُطْبَةِ، فَقَالَ: قَدْ تُرِكَ مَا هُنَالِكَ، فَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ: أَمَّا هَذَا فَقَدْ قَضَى مَا عَلَيْهِ. سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: « مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ وَذَلِكَ أَضْعَفُ الإِيمَانِ». {الحديث/١٧٥}.

طاریقی کوڕی شیهاب (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: یەکەم کەس کە لەپێش نوێژی جەژندا خوتبەی دا مەڕوان بو، پیاوێ بۆی هەڵساو گوتی: نوێژی جەژن لەپێش خوتبەدایە. مەڕوان گوتی: ئەوەی تۆ دەیڵێی تەرك کراوە! جا ئەبو سەعیدی خودری فەرمووی: ئەم پیاوە ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێ هێنا، بەگوێی خۆم لەدەمی حەزرەتم ژنەوت دەیفەرموو: هەرکەسێ لە ئێوە شتێکی ناڕەوای دی، با بەزەبری دەستو بەهێزی بازوو لەناوی ببا، جا ئەگەر بەدەست نەیتوانی، با بەزمانو بە قسەو ئامۆژگاری بیگۆڕێ، ئەگەر بە زمانیش نەیتوانی با بەدڵ پێی ناخۆش بێ، ئەو کەسەیش کە بەس بە دڵ پێی ناخۆشە ئەوە ئیمانو باوەڕی کزو لاوازە، ئەگینا بە دەستو بە زمانیش بەرهەڵستی دەکردو دەربەست نەدەبوو لە پێناوی هەقا هەرچی بەسەر بهاتبایە پێی قایل بوو). (ریاض/١/١٧٢، ژمارە: ١٨٤).

{الحديث ١٧٥. إيمان. ابو داود. الصلاة: ١١٤٠، ٤٣٤٠. ترمذی: فتن ٢١٧٢. نسائی. إيمان: ٥٠٢٣، ٥٠٢٤. ابن ماجه. صلاة: ١٢٧٥، ٤٠١٣ تحفة الأشراف: ٤٠٨٥، ٤٠٣٢}. (م – ١/٥٠). (تاج/١/٢٤، زنجيره: ٣، ژماره: /١٧).

٣٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « مَا مِنْ نَبِيّ بَعَثَهُ اللَّهُ فِي أُمَّةٍ قَبْلِي، إِلاَّ كَانَ لَهُ مِنْ أُمَّتِهِ حَوَارِيُّونَ وَأَصْحَابٌ، يَأْخُذُونَ بِسُنَّتِهِ وَيَقْتَدُونَ بِأَمْرِهِ، ثُمَّ إِنَّهَا تَخْلُفُ مِنْ بَعْدِهِمْ خُلُوفٌ يَقُولُونَ مَا لاَ يَفْعَلُونَ، وَيَفْعَلُونَ مَا لاَ يُؤْمَرُونَ، فَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِيَدِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِلِسَانِهِ، فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِقَلْبِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَيْس وَرَاءَ ذَلِكَ مِنَ الإِيمَانِ حَبَّةُ خَرْدَلٍ». قَالَ أَبُو رَافِعٍ: فَحَدَّثْتُهُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ فَأَنْكَرَهُ عَلَيَّ، فَقَدِمَ ابْنُ مَسْعُودٍ فَنَزَلَ بِقَنَاةَ فَاسْتَتْبَعَنِي إِلَيْهِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) يَعُودُهُ، فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ، فَلَمَّا جَلَسْنَا سَأَلْتُ ابْنَ مَسْعُودٍ عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ فَحَدَّثَنِيهِ كَمَا حَدَّثْتُهُ ابْنَ عُمَرَ. {الحديث/١٧٧ – إنْفَرَدَ بِهِ مُسْلِمٌ، تحفةُ الأشْرَاف: ٩٦٠٢}. (م – ١/ ٥٠ - ٥١).

ئیبنو مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەموو پێغەمبەرێ، کە خودا ناردوویەتی بۆ ناو میناللەتێ، لەپێش مندا، ئەو پێغەمبەرە لە گەلەکەی خۆی چەن هاوەڵو برادەرێکی گیانی بەگیانیو چەن هاورێیەکی فرە باشی بووە، کە ئەو پێغەمبەرەیان کردووە بەسەر مەشقی خۆیانو رەوشتی ئەویان گرتووەو رەفتاریان بە رەفتاری ئەو کردووە، لەپاشا بەرە بەرە لە پاش ئەوان چەن وەچەو بەرەو چینی نابار بوون بە جێگەداری ئەوانو حاڵیان وابووە کە قسەو رەفتارو کرداریان لە یەکتر جیا بووەو بەبێ فەرمانی خودا لە خۆیانەوە شت دا دەتاشنو دەیکەن، جا ئەوەی کە بەکردەوە بەرپەرچیان بداتەوەو بچێ بەگژیانا ئەوە موسوڵمانی چاکە، هەروەها ئەوەی کە بەزمان لە دژیان بێ، ئاخر شت ئەوەیە کە بەدڵ حەزیان لێ نەکاو لە دڵەوە پڕ بەدڵ رقی لێیان بێ، ئیتر لەمە بترازێ بەقەی دانەی خەرتەلەیێ چییە پێی نالێن موسوڵمانەتی).

ئەبو رافیع فەرمووی: ئەم فەرموودەیەم گێڕایەوە بۆ ئیبنو عومەر، بەدڵی نەبوو، وە بێ ئاگایی خۆی لە بارەیەوە راگەیاند، جا ئیبنو مەسعوود تەشریفی هات بۆ مەدینە، لە شیوێ لە شیوەکانی مەدینە بەناوی شیوی قەنات دابەزی، لە خزمەت ئیبنو عومەردا، لەسەر داوای ئەو، چووین بۆ خزمەت ئیبنو مەسعوود بۆ

سەردانی، سەبارەت بە باری تەندروستی، لەپاش هەواڵپرسیو دانیشتن لە خزمەتیدا سەبارەت بە پلەی دروستیو نادروستیی ئەم فەرموودەیە، لە ئیبنو مەسعوودم پرسی، ئەویش گێڕایەوە بۆم دەق وەك من گێڕامەوە بۆ ئیبنو عومەرو رەزای لەسەری بوو، وە لەبارەیەوە هیچ رەخنەیەكی نەبوو} . (ریاض/١ – لاپەڕە: ١٧٢، ژمارە: ١٨٥).

**روونكردنەوە:**

١-وەك لە فەرمایشتەكەی ئەبو رافیعەوە دەردەكەوێ، هەر لەسەردەمی یارانی پێغەمبەرەوە، رەخنەگرتن لە فەرموودەو لە كەسانێ كە فەرموودەی پێغەمبەر تاوتوو دەكەن هەبووە، بەڵام لەپاش لێكۆڵینەوەی شایانو شایەتی هاوەڵانو گەورە پیاوانی فەرموودە شوناسی لەسەر دروستی فەرموودە، ئیتر ئەو فەرموودەیە دەبێ بە جێگەی متمانەی هەموو لایەكو كەس رەخنەو قسەی نامێنێ.

٢-عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) ناسراوە بە ئیبنو مەسعوود، یەكێكە لە گەورە هاوەڵانی پێغەمبەری ئازیزو خۆشەویست، لە موسوڵمانە هەرە پێشینەكانە، دوو كۆچی كردووە، كۆچێ بۆ حەبەشەو كۆچێ بۆ مەدینەی نازدار، ئامادەی غەزای بەدرو شەڕگاكانی تری پاشی بووە، هەمیشە لە خزمەت پێغەمبەردا بوو، مەگەر چۆنها خزمەتی ئەوی چۆڵ بكردایە، خزمەتی پێڵاوەكانی پێغەمبەری دەكرد، لەكاتی هەستانا پێڵاوەكانی بۆی دادەنا، وەك ترسۆلەكانی دەكردە قۆڵی خۆی، هەشت سەدو چلو هەشت فەرموودەی پێغەمبەری گێڕاوەتەوە، چلو چواریان پەسەندی هەردوو پیرن، واتە: شێخی بوخاریو شێخی موسلیم، كە لە زانستی فەرموودەدا ناسراون بە شەیخەین، ئەو چلو چوارەیان گێڕاوەتەوە، بیستو یەك فەرموودەی تری بێجگە لەو چلو چوارە لە بوخاریدا هەیە، لە موسلیمدا نین، سیو پێنج فەرموودەی تریشی بێجگە لەو چلو چوارە لە صەحیحی موسلیما هەیە، كەواتە: ٤٤ + ٢١ = ٦٥ كۆی

فەرموودەکانی ئیبنو مەسعوود لە بوخاریدا، ٤٤ + ٣٥ = ٧٩ کۆی فەرموودەکانی ئیبنو مەسعوود لە صەحیحی موسلیمدا، ٦٥ + ٧٩ = ١٤٤ کۆی فەرموودەکانی ئیبنو مەسعوود لە صەحیحەینا، ٤٤ + ٢١ + ٣٥ = ١٠٠ لە صەحیحەینا بەبێ دووبارە.

دەفەرموێ: لە زاری پیرۆزی پێغەمبەری ئازیزو خۆشەویست خۆی، (دروودو سلاوی خودای لەسەر بێ)، حەفتا سوورەتی قورئانم لەبەرکردووە، ئیبنو مەسعوود یەکەم کەس بوو کە لە مەککە بە ئاشکرا قورئانی دەخوێند، ئەوەندە بەردەوام لەگەڵ ماڵی پێغەمبەردا تێکەڵ بوو، لە خەڵکی وابوو کە یەکێکە لە خێزانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناودار بوو بە صاحیبی سیواکی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) موژدەی بەهەشتی پێ داوە، بکوژی ئەبو جەهل بوو (بڕوانە: بەرگی/٤ تجرید/٢٥١، ژمارە: ٣٩٦٢/١٥٢٦) رووەو قیبلە تەین نوێژی کردووە، مامۆستایەکی قورئان زانو فەرموودەزان بوو، قوتابیو فەقێی زۆری هەیە لەم دوو بوارەدا، پێغەمبەر دەیفەرموو: (دوو لاقە لەڕەکانی ئیبنو مەسعوود لە قیامەتا، لە تەرازووی کێشانی خێرو شەڕدا، لە کێوی ئوحود قورسترن) لە ساڵی سیو دووی کۆچی لە شاری مەدینە، لە تەمەنی شەستو هەند دا، بە مردنی خودا مردووەو کۆچی دوایی کردووە، ئیمامی عوسمان نوێژی تەرمی لەسەر کرد، لە گۆڕستانی بەقیع، بەخاك سپێرراوە. بۆ زیاتر شارەزابوون لە ژینامەی ئەم هاوڕێ مەزنەی پێغەمبەر، بڕوانە: تاج/ ٥، لاپەڕە: ١٢٣، زنجیرە: ٢٨ = تاج-٣ ژ-٣٤٠١ هەتا ٣٤١٠ ج-٤ باسی گەورەیی عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود.

**١٧) موسوڵمان ئیمامی عەلی خۆش دەوێو ناپاك رقی لە عەلی یە** (٢٣٢ - ٢٣٧).

**باب: لاَ يُحِبُّ عَلِياً إِلاَّ مُؤمِنٌ وَلاَ يُبْغِضُهُ إِلاَّ مُنَافِقٌ.** (٣٢/٣٣).

٣٦- عَنْ زِرِّ بْنِ حُبَيْشٍ قَالَ: قَالَ عَلِيٌّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ): وَالَّذِى فَلَقَ الْحَبَّةَ وَبَرَأَ النَّسَمَةَ إِنَّهُ لَعَهْدُ النَّبِيِّ الأُمِّيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَيَّ أَنْ لاَ يُحِبَّنِى إِلاَّ مُؤْمِنٌ وَلاَ يُبْغِضَنِى إِلاَّ مُنَافِقٌ. {الحديث/٢٣٧. الإيمان. ترمذي: المَنَاقِب/٣٧٣٦. نسائي: ايمان: ٥٠٣٣، ٥٠٣٧. ابن ماجه. فضائل: ١١٤ تحفَةُ الأشْرَاف: ١٠٠٩٢}. (م/ ١ - ٦١).

زیـڕی كـوڕی حوبــەیش فــەرمووی: عــەلی كــوڕی ئــەبو تالیــب (رەزای خـودای لێ بـێ) فــەرمووی: سـوێندم بـەو تاقـە خوایـە كـە تۆمـە دەتـەقێنێ‌و گیـان دەكـا بـە بـەری گیانـدارا، ئەمـە راسـپێری پێغەمبـەری خودایـە، كـە بـۆمنی كـردووە، كـە یـەكێ لـە موعجیزە گەورەكانی ئەو پێغەمبەرە نازدارە ئەوە بوو كە بێ سـەوادو نەخوێنـەوار بوو، پـەیمان‌و راسـپێرییەكەی ئـەوەبوو فـەرمووی پـێم: (ئـەوەی منـی خـۆش دەوێ موسوڵمانی تەواوە، ئەوەی كە رقی لەمنـە دووڕوو ناپـاك‌و مونافیقـە). {تـاج/٥/٧٠، ژمارە: ١٢ تاج-٣ ز-٩ ژ-٣٢٨٨-٣٣١١ چ-٤}=(تاج/١/٢١، ژمارە: ٥ ز-٢ ژ-٧ چ-٤).

**روونكردنەوە:**

ئـەمیرولمو‌ئمینین ئیمـامی عـەلی، هـەق ئـامۆزای پێغەمبـەرە، زاوای پێغەمبـەرە، مێردی فاتیمەی كچیەتی، بـاوكی حەسـەن‌و حوسـەینە، خەلیفـەی چوارەمە، ریـزی خولـەفای ئەربەعـە ئاوایـە: ئەبوبـەكر، عومـەر، عوسمـان، عـەلی، بـەپێی پـەیمانی برایەتی بەستن (المواخاة) عەلی بوو بەبرای پێغەمبەر، پێغەمبەر پێی فەرموو: (تۆ لـە دونیـاو قیامـەتا بـرای منـی!) یەكێــكە لـەو دە كەسـە كـە پێغەمبـەر مـوژدەی بەهەشتی پێیان داوە، كەناودارن بە عەشەرەی موبەششەرە، پیاوێكی زاهیدی دنیا نەویسـتی خـوا پەرسـت بـوو، هـەتا بڵێیـت زانـاو دانـاو هـەقانی‌و رەوانبێـژ بـوو، نەهجولبەلاغەكەی بەڵگەی ئـەم قسەیەیە، لـە هـەموو جـەنگ‌و نەبـەردو شـەڕگەو غەزاكاندا لە خزمەت پێغەمبـەردا بـوو، جگـە لـە غـەزای تـەبووك، زۆر بـە منـداڵی موسـوڵمان بـووە، لـە مـاڵی پێغەمبـەردا پـەروەردە بـووە، لـە پێغەمبـەرەوە (٥٨٦) فەرموودەی گێڕاوەتەوە، لە پـەڕاوە ناسـراوەكانی فـەرموودەدا، چەسـپاون، بیسـتیان پەسەندی شەیخەینن واتـە: موتتەفـەقو عەلـەیهین، بوخـاریش بـەبێ موسلیم نـۆی تریـانی لـە صـەحیحی بوخاریـدا گێڕاوەتــەوە، موسـلیمیش بـەبێ بوخـاری پـازدەی تریانی گێڕاوەتەوە، كەواتە: (٢٠ + ٩ = ٢٩) فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە، وە (٢٠ + ١٥ = ٣٥) فـەرموودەی لـە موسـلیمدا هەیـە، كـۆی فـەرموودەكانی لـە صـەحیحەینا دەكاتە (٢٠ + ٩ + ١٥ = ٤٤) فەرموودە. پێنج ساڵ جێنشینی (خەلافەتی) كردووە، بـە

شەهیدی مردووە، تەمەنی شەستو سێ ساڵ بووە لەبەرە بەیانی شەوی هەینی، رێکەوتی ساڵ رۆژی بەدر، حەڤدەی رەمەزانی ساڵی چلی کۆچی، لە ماڵ دەرچوو بۆ نوێژی بەیانی، لە ئەنجامی پیلانێکی چەن لایەنیدا، عەبدورەحمانی کوڕی ملجم، بە شمشێرێکی زەهراوی، برینێکی کاریگەری لەسەری کرد، گەیشتە مۆخی، لە شەوی یەك شەممە، لە نۆزدەی مانگ، لەپاش دوو شەو، لەشاری کووفە وەفاتی کرد. پیاوێکی گەنم رەنگ بوو، سەرو ریشی پاك سپی بوو بوون، چوار شانەیەکی تێکسمڕاو بوو، ریشێکی پڕی درێژی هەبوو، زۆر جار ریشی رەنگ دەکرد، سەری رووتاوە بوو، مووی پێوە نەبوو، لە پشتە سەریەوە نەبێ، رووی زۆر جوانو شەوقدار بوو، دەتگوت مانگی چواردەیە، تەنیا خۆی لەناو یارانی پێغەمبەردا ناوی عەلی کوڕی ئەبو تالیبە، بەڵام لەناو فەرموودە گێڕەوەکاندا هەشت کەسی تر بەم ناوە هەیە (بڕوانە: تاج/٥٩/٥ = تاج-٣ ز-٩ ژ-٢٢٨٨-٣٣١١ ج-٤ -باسی مناقبی عەلی....).

**١٨) خۆشەویستیی ئەنصار نیشانەی باوەڕە، رق لێبوونیشیان نیشانەی دوو روویيە** {٢٣٢ - ٢٣٧}. **باب: آيَةُ الإِيمَانِ حُبُّ الأَنْصَارِ وَبُغْضُهُمْ آيَةُ النِّفَاقِ** (٣٢/٣٣).

٣٧- عَنْ عَدِيُّ بْنُ ثَابِتٍ، سَمِعْتُ الْبَرَاءَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ قَالَ فِي الأَنْصَارِ: «لاَ يُحِبُّهُمْ إِلاَّ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يُبْغِضُهُمْ إِلاَّ مُنَافِقٌ، مَنْ أَحَبَّهُمْ أَحَبَّهُ اللَّهُ، وَمَنْ أَبْغَضَهُمْ أَبْغَضَهُ اللَّهُ». {الحديث/٢٣٤. إيمان: بخاري: ٣٧٨٣، تجريد/١٤٨٣، ترمذي: مناقب: ٣٩٠٠. ابن ماجة: فضائل: ١٦٣ تحفة الأشراف: ١٧٩٢}. (م/ ١ - ٦٠).

عەدی کوڕی ثابیت (رەزای خودای لێ بێت) فەرمووی: بە گوێی خۆم لە زاری خۆشەویستم بیست، سەبارەت بە یاریدەدەران (انصار) دەیفەرموو: (موسوڵمان یاریدەدەران (ئەنصار)ی خۆش دەوێ، ناپاك (دوو روو = منافق)یش رقی لێیانە، ئیتر ئەوەی ئەنصاری خۆش دەوێ، خودایش ئەوی خۆش دەوێ، وە ئەوەی رقی لەوانە خودایش رقی لەوە!). (تاج/١٦٧/٥، زنجیرە: ٤٤، ژمارە: ١ = تاج-٣ ژ-٣٤٤٩-٣٤٦٥ - ش ت).

**ڕوونكردنەوە:**

١-ژمارەی تەجریدی بوخاری، لە ئەصڵە عەرەبییەكەو وەرگەڕاوە كوردییەكە یەك شتە، هەروا ژمارەی فەتحولباریش.

٢-كۆمەڵگای ئیسلام لە سەرەتاوە لە شاری مەدینە، كە لە پێشا ناوی یەثریب بوو، بە شێوەی سەرەكی برێتی بوو، لە دوو كۆمەڵەی گەورە:

یەكەم: كۆمەڵەی كۆچكاران، كە ناسراون بە موهاجرین، كە ئەو موسوڵمانانە بوون لە مەككەوە، لەتاو دەستدرێژیی نا موسوڵمانەكان لێیان، كۆچو باریان كرد بۆ مەدینە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆشی یەكێ بوو لەم كۆچبەرانە.

دووەم: كۆمەڵەی یاریدەدەران، كە برێتی بوون لەوانەی كە خەڵكی مەدینە بوونو موسوڵمان بوو بوون، كۆمەڵەی یەكەم، وەك گوتمان، ناسراون بە مهاجرین، واتە: كۆچكاران، كۆمەڵەی دووەم ناسراون بە ئەنصار، واتە: یاریدەدەران.

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ڕوونكردنەوەی بەرزیی پلەو پایەی ئەنصار ئەم فەرموودەیەی فەرموو، لەگەڵ چەند فەرموودەیەكی تری لەم بابەتە. (بڕوانە: تەجرید: ژمارە: ١٤٨٢، ١٤٨٣، ١٤٨٤، ١٤٨٥، ١٤٨٦، ١٤٨٧ هەتا ١٤٩٤ فەتح: ٣٧٧٩ هەتا ٣٧١٠) + (تاج/١٦٥/٥، زنجیرە: ٤٤ — تاج-٣ ژ-٣٤٤٩-٣٤٦٥ چ-٤ - باسی گەورەیی یاریدەدەران).

## ١٩) ئیسلامەتی بەرەو مەدینە دەكشێتەوە (٣٧٢).

## باب: إنَّ الإيمانَ لَيأرِزُ إلَى الْمَدِينَةِ.

٣٨- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « إِنَّ الإِيمَانَ لَيَأْرِزُ إِلَى الْمَدِينَةِ كَمَا تَأْرِزُ الْحَيَّةُ إِلَى جُحْرِهَا ». {(م/ ١ — ٩٠ - ٩١) الحديث ٣٧٢.إيمان.بخاري: ١٨٧٦. ابن ماجه. مناسك: ٣١١١ تحفَةُ الأشْرَافِ: ١٢٢٦٦}.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) لە خۆشەویستەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (وەكوو چۆن مار كە زۆری بۆهات دەخزێتەوە ناو كونی خۆیو پەپكەی تیا دەخوات، لەبەر بێ دەرەتانی، ئیسلامەتیش ئاوەها —بە تایبەتی لە ئاخر زەمانا— تەنگی پێ هەڵدەچنرێو، ئاوەها دەكشێتەوە بۆ ناو مەدینەو، گرمۆڵەی تیا

دەخـواتو پـەنای بـۆ دەبـات). (تەجریـد/٨٦١/١٨٧٦، بـەرگی/٢/٢٥٦ + تـاج/٢/٢٧٧، زنجیرە: ١٣٨، ژمارە: ١٧٢٩ چ-٤).

**روونکردنەوە:**

مەبەست دوو شتی سەرەکین:

١-مەدینەی نازدار، شارە پاكو پیرۆزەکەی پێغەمبەری خۆشەویستو ئازیز، هەر لەسـەردەمی پێغەمبـەرەوە، هـەتا رۆژی قیامـەت کانگـاو سەرچـاوەی نـوورو رەحمەتو پیتو بەرەکەتو زانستو نووری شەریعەت بووەو دەبێ، ئیتر ئەو پیتو فەڕو بەرەکەتە لە زۆر رووەوەیە، وەك ئەوە هەمیشە زانای گەورەو مەرجیعی دینی گەورەی، لە هەموو ساتو چاخێکا تیا بووە، وەك ئەوە گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەر والەوێ، هەروا (مَشَاهِدِي) پێغەمبەرو ئاسەوارو شوێنەواری ئەو زاتەو هاوەڵە نازدارو ئازیزەکانی وا لەوێ، کە هەمیشە سەرچاوەی پیتو فەڕن بۆ گەلی ئیسلام، بەتایبەتی بۆ زانایانو پیاو چاکانو خوا ناسان، جا بەم هۆیانەوە، هەموو کاتێ لە هەموو لایەکی جیهانی ئیسلامییەوە، جێگەی نیازو مرازو هامو شۆو مەقصەدی زانایانو خوا ناسانو پیاو چاکان بووە!

٢-هەر وەك چۆن مار، بۆ بژێوی خۆی لە کون دەردەچێو بەملاو لادا بڵاودەبێتەوە، بەڵام کاتێ شتێ زۆری بۆ دەهێنێ، بەرەو کونەکەی خۆی دەگەڕێتەوەو لەوێدا پەپکە دەخوات، ئاوەهاش بەرە بەرە، بە تایبەتی لە پێش هاتنی قیامەتدا، ئیسلام وەك هەوەڵجاری غەریب دەبێتەوەو دەبێتەوە بە تاكو تەراو، لە هیچ کوێیەك نامێنێ لە مەدینە نەبێ!

## ٢٠/ یەمەن کانگای باوەڕو ئیمانو حیکمەتو دانایییە (١٧٩ - ١٩١)

**باب: الإيمان يَمانٍ وَالحِكمةُ يَمانيَّةٌ. (٢٢/٢١)**

٣٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: « جَاءَ أَهْلُ الْيَمَنِ، هُمْ أَرَقُّ أَفْئِدَةً وَأَضْعَفُ قُلُوبًا، الإِيمَانُ يَمَانٍ، وَالْحِكْمَةُ

يَمَانِيَةٌ، السَّكِينَةُ فِي أَهْلِ الْغَنَمِ، وَالْفَخْرُ وَالْخُيَلاَءُ فِي الْفَدَّادِينَ أَهْلِ الْوَبَرِ، قِبَلَ مَطْلِعِ الشَّمْسِ». (م - ١/ ٥٢ - ٥٣). {الحديث/١٨٧. إيمان. انفرد به مسلم بوخاري: ٣٣٠١، ٣٤٩٩، ٤٣٨٨، ٤٣٨٩، ٤٣٩٠. تجريد: ١٣٣٠، ١٦١٢}.

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ژنەوتم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (وا خەڵکی یەمەن هاتن بۆ لاتان، زۆر بە ویژدانو دڵنەرمن، یەمەن سەرچاوەی باوەڕو ئیمانە، هەروەك حیکمەتو داناییش سەر بە یەمەنن‌و، یەمەن سەرچاوەیەکی روون‌و رۆشنە بۆ ئیسلامەتی‌و شەریعەت، هێمنی‌و سەلاری پیشەی خاوەن پەزو خاوەن ران‌و مالاتە، بەلام شانازیکردن‌و فیزو دەعیە نواندن پێشەی قیژنە دەنگ دڕاوەکانە کە هەر خەریکی دەنگکردنن لە ولاخ‌و هەر خەریکی خزمەتی رەوگ‌و وشترو گاو کوڵك‌و موون، سەرچاوەی کوفرو بێباوەڕیش لەلای خۆرهەلاتەوەیە).

٤٠- عَنِ جَابِرَ بْنَ عَبْدِاللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عنهما)قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « غِلَظُ الْقُلُوبِ وَالْجَفَاءُ فِي الْمَشْرِقِ، وَالإِيمَانُ فِي أَهْلِ الْحِجَازِ». {الحديث/١٩١}.

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دڵڕەقی‌و دڵڕەشی‌و روو وشکی وا لەناو خەڵکی رۆژهەلاتدا، باوەڕیش وا لەناو خەڵکی حیجازدا).

**روونکردنەوە:**

جابیری کوڕی عەبدوڵلا خۆی‌و عەبدوڵلای باوکی هاوڕێی پێغەمبەر بوون، ئەنصارین، جابیریش وەك عائیشە یەکێکە لەو شەش هاوەلانە، کە فەرموودەی زۆرتریان گێڕاوەتەوە، هەزارو پێنج سەدو چل فەرموودەی گێڕاوەتەوە، دوو سەدو دەیان هی بوخاری‌و موسلیمن، پەنجاو هەشتیان پەسەندی هەردوو لایە، کە شێخی بوخاری‌و شێخی موسلیمن، بیست‌و شەشیان هی بوخارییە، لای موسلیم نییە، سەدو بیست‌و شەشیان بەتەنها هی موسلیمە، لە بوخاریدا نییە، کاتێ جابیر مرد کوێر

بوو بوو، له رۆژی ئوحوددا باوکی شەهید بوو، جابیر دوا هاوەڵی پێغەمبەر بووە، کە لە مەدینە مردووە، لەتەمەنی نەوەدو چوار ساڵیدا مردووە، إبانی کوڕی عوسمان نوێژی تەرمی لەسەر کرد. (بڕوانە: تاج/١٨١/٥، زنجیرە: ٥٠ تاج-٣ ژ-٣٤٧٩ چ-٤ + تەجرید/١٧/١، ژمارە: ٤).

## ٢١/ ئەوەی باوەڕ نەهێنێ کرداری باش سوودی پێ ناگەیەنێ. (٥١٧).

## باب: مَنْ لَمْ يُؤْمِنْ لَمْ يَنْفَعْهُ عَمَلٌ صَالِحٌ

٤١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها) قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! ابْنُ جُدْعَانَ، كَانَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ يَصِلُ الرَّحِمَ، وَيُطْعِمُ الْمِسْكِينَ، فَهَلْ ذَاكَ نَافِعُهُ؟ قَالَ: « لاَ يَنْفَعُهُ، إِنَّهُ لَمْ يَقُلْ يَوْمًا: رَبِّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي يَوْمَ الدِّينِ». (م/١-١٣٦). {الحديث/٥١٧ – الإيمان. انفرد به مسلم. تحفَةُ الأَشْرَافِ: ١٧٦٢٣}.

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی حەزرەتم کرد: قوربان! ئیبنو جەدعان لەسەردەمی نەفامیدا، پیاوێکی بە خزمەت بوو، خزم دۆست بوو، ڕشتەی خزمایەتی پەیوەست دەکرد، پیاوێکی نانبدە بوو، خاوەن دیوەخان بوو، نانو ئاوی زۆری دەدا بە هەژاران، ئایا ئەم چاکانەی سوودی هەیە بۆی؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەوە سوودی پێ ناگەیەنێ، چونکە لەسەر ئیمان نەمردووە، بەبێ باوەڕی مردووە، چونکە رۆژێ لە رۆژان لە ژیانیدا نەیگوتووە: خودایە! لە رۆژی قیامەتدا، کە رۆژی پاداش دانەوەیە، لە تاوانو گوناهم خۆش بە). (بڕوانە: تاج/٧٣/٧، ژمارە: ٢ = تاج-٤ ز-٩ ژ-٤٠١٨ چ-٤).

١- کۆتایی فەرموودەکەی پێغەمبەر، إقتباسە لەم فەرمایشتەی حەزرەتی ئیبراهیم کە خودا لە قورئانا لە سوورەتی شووعەرادا، لە ئایەتی هەشتاو یەکدا، ئاوەها بۆمان دەگێڕێتەوە: {وَالَّذِي أَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لِي خَطِيئَتِي يَوْمَ الدِّينِ } (بڕوانە: تەجرید/٤٣٠/٧٩٤).

٢- عائیشە کچی ئەبوبەکری صدیقە، خێزانی پێغەمبەرە، بەپێی دەقی ئایەتی {وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ وَأُوْلُو الْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ

وَالْمُهَاجِرِينَ إِلَّا أَن تَفْعَلُوا إِلَى أَوْلِيَائِكُم مَّعْرُوفًا كَانَ ذَلِكَ فِي الْكِتَابِ مَسْطُورًا} بە هەموو یەکێ لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر، دەگوترێ: ئوممولمۆئمینین، واتە: دایکی موسوڵمانان، یا دایکی ئیمانداران، عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) یەکێکە لە زانا گەورەکانی ئیسلام، شەریعەت زانێکی چاك بووە، فەرموودەی پێغەمبەری زۆر گێڕاوەتەوە، خوێنەوار بووە، دوو هەزارو دوو سەدو دە حەدیثی ریوایەت کردووە، (٢٢٨) فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە، لە صەحیحی موسلیمدا (٢٣٢) فەرموودەی هەیە، لەم فەرموودانە سەدو حەفتاو چواریان موتەفەقو عەلەیهین، واتە: هەم بوخاریو هەم موسلیم گێڕاویانەتەوە، تەمەنی شەستو پێنج ساڵ بووە، منداڵی نەبووە، بە کچی شووی کردووە بە پێغەمبەر، دەوری نۆ ساڵ لە هاوڕێتیی پێغەمبەردا بووە، دایکی ناوی ئوم رۆمان بوو، زانایەکی شارەزا بوو، لە بابەتی فیقەو شیعرو پزیشکیو فەرائضدا، لە مانگی رەمەزانی ساڵی پەنجاو پێنجی کۆچیدا لە مەدینە زایە دەبێ، ئەبو هورەیرە نوێژی تەرمی لەسەردەکا، لەسەر داوای خۆی، بەشەو لەپاش نوێژی وەتر، لە گۆڕستانی بەقیع، کەوا لەپاڵ مزگەوتەکەی پێغەمبەردا، بەخاك دەسپێردرێ، (رەزای خودای لێ بێو پڕگۆڕەکەی لە نوور بێ). عائیشە (رەزای خودای گەورەی لێ بێ) زۆر سەخی بوو، زۆر خێرکەر بوو، شەو نوێژی زۆری دەکرد، رۆژووی سوننەتی زۆری دەگرت، عائیشە لە ماڵی خۆیدا ئەڵقەی وانە گوتنەوەو پەخشی زانستی هەبوو، زانایان لەگەڵ عوروەی خوشکەزایدا، بۆ وەرگرتنی زانستو فێربوونی شەرعو حەدیثو قورئان دەچوونە خزمەتیو بەهرەیان لێ وەردەگرت (بڕوانە: تەجرید: ژمارە: ٢٥١/١٨٢، ١٠٩٤/٢٥٦٠، ١٢٩٩/٣٢١٧، ١٦٤٣/٧٨٤ = بەرگی/٢، لاپەڕە: ٢٠١) حەزرەتی عائیشەو چەند کەسێکی تر لە دایکانی موسوڵمانان لەسەردەمی خەلافەتی حەزرەتی عومەردا، لەگەڵ کۆمەڵێ ژنی متمانە پێکراودا، یا لەگەڵ کاروانی جێگەی باوەڕدا، دەچوون بۆ حەج، وەك ئەوە لەدوا ژیانی پێغەمبەر، لەگەڵ عوسمانی کوڕی عەفانو عەبدورەحمانی کوڕی عەوفدا دەچوون بۆ سەفەری حەج، حەزرەتی عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) گەلێ جار بۆ

هەنـدێ کاروبـاری کۆمەڵایـەتی، کـاری بـە حیلـە شـەرع دەکـرد، لـە بابـەتی شـیر خواردنـدا، لـە خزمـەت پێغەمبـەرو لـەپاش مـەرگی پێغەمبـەر خـەڵوەی زۆری لـە مزگەوتا دەکرد، خەڵوە واتە إعتكاف. (بڕوانە: تجريد: ژمارە: ٩٢٧، ٩٢٨، ٩٢٦، ١٧٤٨).

**٢٢) باسی: ئێوە ناچنە بەهەشت هەتا باوەڕ نەهێنن** (١٩٢ - ١٩٣).

**باب: لاَتَدْخُلُونَ الجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا**

٤٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لاَ تَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّـى تُؤْمِنُـوا، وَلاَ تُؤْمِنُـوا حَتَّـى تَحَـابُّوا، أَوَلاَ أَدُلُّكُـمْ عَلَـى شَـيْئٍ إِذَا فَعَلْتُمُـوهُ تَحَـابَبْتُمْ؟ أَفْشُـوا السَّـلاَمَ بَيْـنَكُمْ». (م/ ١ - ٥٣). {الحديث/ ١٩٢. لإيمان. رياض/١/٢٩٧، ژمارە: ٣٧٨. ابن ماجه. ايمان: ٦٨. تحفَةُ الأَشْرَافِ: ١٢٤٦٩}.

ئـەبو هـورەيرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەويسـت (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فەرمووی: (بەوكەسە كە گيانی منی وا لەدەستا، هـەتا بـاوەڕو ئيمـان نـەهێنن ئێـوە ناچنە بەهەشتەوە، وە باوەڕی تەواويش ناهێنن، هەتا يەكتريتان لەبەر خودا خۆش نەوێ، جا كەوای لێهات با ئـەو شـتەی كـە كردنەكـەی دەبـێ بـەهۆی خۆشـەويستيی يـەكتری پێتـان بڵێم؟ سڵاو لـەناو خۆتانـا پـەخش‌و بڵاوبكەنـەوە، ئـيتر يـەكتريتان خۆش دەوێ‌و ئەوەيش دەبێ بەهۆی باوەڕی تەواو بۆتان).

**٢٣) داوێن پيس لەكاتی ئەنجامدانی داوێن پيسيدا بەموسوڵمان دانانرێ** (٢٠٠ - ٢٠٦).

**باب: لاَ يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ.**

٤٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « لاَ يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَسْرِقُ السَّارِق حِينَ يَسْرِقُ وَهْوَ مُـؤْمِنٌ، وَلاَ يَشْـرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُهَا وَهْوَ مُؤْمِنٌ). وَكَانَ أَبُـو هُرَيـرَةَ يُلْحِقُ مَعَهُـنَّ: (وَلاَ يَنْتَهِـبُ نُهْبَـةً ذَاتَ شَرَفٍ يَرْفَعُ النَّاسُ إِلَيْهِ فِيهَا أَبْصَارَهُمْ حِينَ يَنْتَهِبُهَا وَهْوَ مُـؤْمِنٌ». {الحديث: ٢٠٠. إيمان. بخاري: ٥٥٧٨، ٢٤٧٥، ٦٧٧٢، ٦٨١٠. تحفة الأشراف: ١٣٣٢٩، ١٥٣٢٠. ابن ماجة. فتن: ٣٩٣٦. تحفة الأشراف: ١٣٢٠٩، ١٤٨٦٢، ١٥٢١٨. تجريد/٥/١٣٩، ژمارە: ١٨٤١}.

وَفِي حَدِيثِ هَمَّامٍ « يَرْفَعُ إِلَيْهِ الْمُؤْمِنُونَ أَعْيُنَهُمْ فِيهَا وَهُوَ حِينَ يَنْتَهِبُهَا مُؤْمِنٌ ». وَزَادَ: « وَلاَ يَغُلُّ أَحَدُكُمْ حِينَ يَغُلُّ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَإِيَّاكُمْ إِيَّاكُمْ». (م-١/ ٥٤ - ٥٥). {الحديث/ ٢٠٤. ايمان. تحفة الأشراف: ١٤٠٥٦}.

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمویّ: (داوێن پیس لەکاتی ئەنجامدانی داوێن پیسیدا بە موسوڵمان دانانرێ، وە هەروەها دز لەکاتی دزیکردنـدا موسوڵمان نییـە، وە هـەروەها ئـارەق خـۆر لـەکاتی ئـارەق خواردنەوەدا). ئەبو هورەیرە ئـەم بڕگـەی تریشـی دەلکان بـە بڕگـەکانی تـری ئـەم فەرموودەیەوە، کە پێغەمبەر فەرمووشی: (وە هەروەها تالآنکەر، لەوکاتـەدا کـە بـە بەرچاوی خەڵکەوە، بە ئاشکرا، بێ پـەروا، تـالآنی بـەهادارو بـەنرخ تـالآن دەکـا، ئـا لەوکاتەدا دانانرێ بە موسوڵمانی تەواو).

لە گێڕانەوەی هەممامدا: (وە هـەروەها تالآنیکـەر، لەوکاتـەدا، کـە بـە بەرچـاوی موسوڵمانانەوە، بە ئاشکرا، بەبێ پەروا، بێ شەرمانە، تالآنی بـەهادارو بـەنرخ تـالآن دەکاو دەیبات بۆ خۆی، ئا لەوکاتەدا ئەگەر باوەڕی تـەواوی بـەخوای خـۆی هەبوایـە شتی وا نارەواو زەقو ناشایستەی نەدەکرد).

وە ئەمەیشی لێ پتر کـردووە: (وە هـەروەها هـەر کەسـێ لـە ئێـوە گـزیو دەسـت پیسی لە تالآنی دەستکەوتی جەنگ بکا، لەوکاتەدا کە ئەو کارە پیسـە دەکـا، بـاوەڕی تـەواوی بـە خـودای گـەورە نییـە، دەنـا ئـەو کـارەو ئـەو گوناهـە گەورەیـەی ئـەنجام نەدەدا). (بڕوانە: تاج/٢/٣٦٦، زنجیرە: ١٧٥، ژمارە: ١ = ژ-١٩٣١ چ-٤ + بەرگی/٣، لاپەڕە: ٢٠٥، زنجیرە: ٨١، ژمارە: ١٠ =تـاج-٣ ژ-٢٢٩٦ چ-٤ + بـەرگی/٨/١٦٧، زنجیرە: ٦٨، ژمـارە: ١ هەتا ٥ — تاج-٤ ژ-٤٥٣٠-٤٥٣٤ چ-٤ = چاپی چوارم). لەکۆتایی ئـەم گێڕانـەوەدا ئەمـەی پترە: (دەی بەدووربن، بەدوور بنو خۆبپارێزن لەم جۆرە تاوانە گەورانە) هـەروەك لە کۆتایی فـەرموودەی ژمـارە (٢٠٥)ی ئـەم بابـەوە ئەمـەی پـترە: (وَالتَّوْبَـةُ مَعْرُوضَـةٌ بَعْدُ) واتـە: (بـەڵام لـەوەدوا، دەرگـای تەوبـەو پەشـیمان بوونـەوە لـەم تاوانانـەو لـە هەموو تاوانێـکی تریش والآیەو لەسەر پشتەو لەکەس داناخرێ هەتا نەگاتـە رادەی گیانەڵا، هەموو کات خوڵك دەکرێ بۆ تەوبەکردن!).

**ڕوونکردنەوە:**

فیقهی ئەم حەدیثەو تێگەیشتنی تەواو لە ناوەڕۆك و کورۆکەکەی، کورت و پوخت بە کوردی پەتی ئەمەیە: (ئەم جۆرە تاوانە گەورەو نا پەسەندانە، لە موسوڵمانی باش ناوەشێنەوە، ئەگەر موسوڵمانێ ئەنجامیان بدا وەك موسوڵمان نەبێ وایە!). (بڕوانە: کۆتایی ژمارە: ٢٦ لەم بەرگەدا).

**٢٤) موسوڵمان دەبێ زرنگ و وریابێ، نابێ لەیەك کونەوە دووجار شت پێوەی بدات.** (٧٤٢٠ - ٧٤٢٥).

**باب: لَايُلْدَغُ المؤمِنُ مِنْ جُحْرٍ مَرَّتَيْنِ.**

٤٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « لاَ يُلْدَغُ الْمُؤْمِنُ مِنْ جُحْرٍ وَاحِدٍ مَرَّتَيْنِ». (م-٨/ ٢٧٧ - ). {الحديث/ ٧٤٢٣. إيمان. بخاري: ٦١٣٣. ابو داوود: أدَبَ: ٤٨٦٢. ابن ماجة: فتن: ٣٩٨٢. تحفة الأَشْرَافِ: ١٣٢٠٥}.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (موسوڵمان دەبێ زرنگ و هۆشیارو وریاو دووربین بێ، ئەگەر دنیا بوو، کەسێ خەڵەتانی، نابێ جارێ تر باوەڕی پێ بکاو دووبارە بیخەڵەتێنێتەوە! چونکە مرۆڤی ژیر دووجار لەسەر یەك، لەیەك کونەوە شت پێوەی نادات!). (ریاض/٤، لاپەڕە: ١٢٢٨، ژمارە: ١٨٢٤/٢٧، زنجیرە: ٢٧) + (تەجرید/٥/٢٢٢، ژمارە: ١٩٥٣).

**٢٥) باسی وەسوەسە لە باوەڕدا** (٣٣٨ - ٣٥٠).

**{باب: فِي الوَسْوَسَةِ مِنَ الإيمانِ}**

٤٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: جَاءَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَأَلُوهُ: إِنَّا نَجِدُ فِي أَنْفُسِنَا مَا يَتَعَاظَمُ أَحَدُنَا أَنْ يَتَكَلَّمَ بِهِ. قَالَ: « وَقَدْ وَجَدْتُمُوهُ؟» قَالُوا: نَعَمْ. قَالَ: «ذَاكَ صَرِيحُ الإِيمَانِ». (م-١/٨٣). {الحديث/ ٣٣٨. إيمان. انفرد به مسلم. تحفة الأَشْرَافِ: ١٢٦٠٠}.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: چەند کەسێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتنە خزمەتی، عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! جاری واهەیە، خایەڵەو وەسوەسەی وا دێت بەدڵمانا، کە ئەستەمە بەدەم بیانڵێین!

فەرمووی: (بەڕاستتانە کە تووشی شتی وا بوون؟). گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: (ئەوە وەسوەسەیە، ئەم جۆرە وەسوەسەیە نرخی نییە، ئەوە نیشانەی باوەڕی پەتییە! کە لە دڵەوە هەست بەشتی وا دەکەن بەڵام ناوێرن بە قسە بیڵێن). (بڕوانە: ژمارە: ١٧ب + ١٧ + تاج/١/٢٩، ژمارە: ٦ ز-٣ ژ-٢٢ چ-٤ = چاپی چوارەم).

## ٢٦) گەورەترین گوناه هاوەڵ بۆ خودا بڕیاردانە. (٢٥٥ - ٢٦٠)
## باب: اكبر الكَبَائِرِ الشِّرْكُ بِاللّه.

٤٦- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِى بَكْرَةَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: « أَلاَ أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ ثَلاَثًا: الإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ، وَشَهَادَةُ الزّورِ، أو قَوْلُ الزُّورِ» وَكَانَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُتّكِئاً فَجَلَسَ، فَمَا زَالَ يُكَرِّرُهَا حَتَّى قُلْنَا: لَيْتَهُ سَكَتَ. (م – ١/٦٤). {الحديث/ ٢٥٥. إيمان. بخاري: ٢٦٥٤، ٥٩٧٦، ٦٢٧٣، ٦٢٧٤، ٩٦١٩. ترمذي. البر: ١٩٠١. شهادة الزور: ٢٢٩٩. تفسير: ٣٠١٩ تحفة الأشْرَافِ: ١١٦٧٩}.

عەبدورەحمانی کوڕی ئەبوبەکرە (ڕەحمەتو ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: باوکم فەرمووی: لە خزمەتی خۆشەویستا بووین، (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەدی، ئاگاداربن، گوێبگرن با پێتان بڵێم کە گەورەترین گوناهی گەورە کامانەیە). سێ جار ئاوای فەرموو: گوتیان: بفەرموو، ئەی پێغەمبەری خودا! گوێمان لێتە. فەرمووی: (هاوەڵ بڕیاردان بۆ خودای تاکو تەنیاو، دڵ ڕەنجاندنی باوکو دایکو، شایەتی درۆ) یا فەرمووی: (قسەی ساختەو شایەتی ناهەق).

فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم کاتەدا شانی دادابوو، جا بۆ گرنگی دان بەمەیان، ڕاست دانیشتو خۆش خۆش هەر دەیفەرموو: (وە شایەتی درۆ، وە شایەتی درۆ) ئیتر ئەم وشەیەی ئەوەندە دووبارە کردەوە هەتا بەزەییمان پیادا هاتەوەو مەترسی ئەوەمان هەبوو کە ئەوەندەی دووبارە بکاتەوە ماندووی بکا، لەبەرئەوە لەبەر خۆمانەوە دەمانگوت خۆزگە بێ دەنگ دەبوو. (بڕوانە: تەجرید/٢٠٨/٣، ژمارە: ١١١٩ + تاج/٣/٣١٠ – ١، زنجیرە: ١١٧ = ژ-٢٤٧٤ ل-١٠٨ چ-٤ - ش/ت).

**روونکردنەوە:**

ئەبوبەکرە لە هاوڕێ هەرە مەزنەکانی پێغەمبەرە، بەردەوام سەر گەرمی خوا پەرستی جوان بوو، هەتا کۆتایی ژیانی. برای دایکی زیادی کوڕی باوکی بوو، سەدو سیی‌و دوو فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، هەشتیان پەسەندی هەردوولایە، پێنج فەرموودەی لە ئەفرادی بوخارییە، یەك فەرموودەی لە ئەفرادی موسلیمە، کۆی فەرموودەکانی لە بوخاریدا (١٣) فەرموودەن، کۆی فەرموودەکانی لە موسلیمدا (٩) فەرموودەن، یەکێ لە فەقێکانی کە فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، حەسەنی بەصری بوو، یەکێ تریان ئەحنەف بوو، کۆمەڵەکە فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، منداڵ‌و وەچەکانی هەموو خانە دان‌و داناو زانا بوون، لە ناودارانی شاری بەصرە بوون، ساڵی پەنجاو دووی کۆچی لە بەصرە، کۆچی دوایی کرد، لەسەر راسپێری خۆی ئەبو بەرزەی ئەسلەمی، نوێژی تەرمی لەسەر کرد. (بڕوانە: تەجرید/٣١٩/٥، ژمارە: ٢٠٦٣). (بڕوانە: ژمارە: ٤٩ مخ = مختصر صحيح مسلم).

٤٧- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ». قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا هُنَّ؟ قَالَ: « الشِّرْكُ بِاللَّهِ، وَالسِّحْرُ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِى حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ، وَأَكْلُ الرِّبَا، وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ، وَالتَّوَلِّى يَوْمَ الزَّحْفِ، وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلاَتِ الْمُؤْمِنَاتِ». (م – ١/٦٤). {الحديث/ ٢٥٨. إيمان. بخاري: ٢٧٦٦، ٥٧٦٤، ٦٨٥٧. أبو داود. وصايا: ٢٨٧٤. نسائي. وصايا: ٣٦٧٣. تحفة الأشراف: ١٢٩١٥}.

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خۆتان بپارێزن لە حەوت تاوانی کوشندە). یارانی عەرزیان کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو حەوتە چی‌و چین؟ فەرمووی: (یەکەم: شیرك‌و هاوبەش پەیداکردن بۆ خودای تاك‌و تەنیا، دووەم: سیحرو جادوو بازی، سێیەم: کوشتنی کەسێ کە خودا رەزای لەسەر نەبێ، چوارەم: سوود خۆری، پێنجەم: خواردنی ماڵی هەتیو، بەبێ فەرمانی شەرع، شەشەم: هەڵهاتن‌و پشت هەڵکردن لە دوژمنی دین، لەرۆژی هێرش هێنانی دوژمنانا، بەبێ مەهانەی رەوا، حەوتەم: بوختانی داوێن پیسی هەڵبەستن بۆ ژنی داوێن پاکی بێئاگای موسوڵمان).

(تـاج/٣/٢٠٤، ژمـاره: ٨ —تـاج-٣ ز-٨١ ژ-٢٢٩٤ چ-٤ - ش/د/ن). (ريـاض/٤/١٧٥، ژمـاره: ١٧٩٣).

### ٢٧) لەدوای مەرگی من نەبنەوە بە بێباوەڕو دەست بکەنەوە بە کوشتو بڕیەکتری (٢٢٠ - ٢٢٣).

### باب: لاَ تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّاراً يَضْرِبُ بَعْضُكم رِقابَ بَعْضٍ

٤٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِىَ اللّهُ عنهما) عَنِ النَّبِىِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ قَالَ فِى حَجَّةِ الْوَدَاعِ: « وَيْحَكُمْ - أَوْ قَالَ وَيْلَكُمْ، لاَ تَرْجِعُوا بَعْدِى كُفَّارًا يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ». (م — ١/٦٤). {الحديث/ ٢٢٠، ٢٢١، ٢٢٢. بخاري. علم: ١٢١، ٤٤٠٥، ٦٨٦٩، ٧٠٨٠. نسائي. تحريم: ٤١٤٢. إبن ماجة: فتن: ٣٩٤٢. تحفة الأشراف: ٣٢٣٦}.

عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەر (ڕەزای خـودا لـە خـۆیو بـاوکی) فـەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) لە حەجی ماڵاواییدا، فەرمووی: (هاوار لە ئێوە) یا فەرمووی: (خانە خراپینە! نەکەن لەپاش خۆم پاشگەز ببنەوەو وەکی کۆمەڵی کافرانو میللەتی خۆخۆر بەر ببنەوە سەرو گوێلاکی یەکترىو لەسەر پڕو پاتاڵی جیهان لەگەردنی یەکتری بدەن!).

### ٢٨) کەسێ حاشا لەبنەچەی خۆی بکا، کفری نیعمەت دەکات (٢١٥ - ٢١٧).

### باب: مَنْ رَغِبَ عَنْ أَبِيهِ فَهُوَ كُفْرٌ

٤٩- عَنْ أَبِى عُثْمَانَ قَالَ: لَمَّا ادُّعِىَ زِيَادٌ لَقِيتُ أَبَا بَكْرَةَ، فَقُلْتُ لَهُ: مَا هَذَا الَّذِى صَنَعْتُمْ؟ إِنِّى سَمِعْتُ سَعْدَ بْنَ أَبِى وَقَّاصٍ يَقُولُ: سَمِعَ أُذُنَاىَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ يَقُولُ: « مَنِ ادَّعَى أَبًا فِى الإِسْلاَمِ غَيْرَ أَبِيهِ يَعْلَمُ أَنَّهُ غَيْرُ أَبِيهِ فَالْجَنَّةُ عَلَيْهِ حَرَامٌ». وَقَالَ أَبُو بَكْرَةَ: أَنَا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). (م — ١/٥٧). {الحديث/ ٢١٦، ٢١٧. إيمان. بخاري: فرائض: ٦٧٦٦، ٤٣٢٦، ٦٧٦٧، ٥١١٣}.

ئەبو عوسمانی نهدی فەرمووی: کاتێ موعاوییە زیادی کوڕی ئەبیهی کرد بە برای خۆیو، هەڵیگێڕایەوە لە عەلی کوڕی ئەبوتالیب، کاتێ بە ئەبوبەکرەی دایک برای گەیشتم، گلەییم لێ کردو پێم گوت: ئەمە چیبوو کردتان؟ من لەم بارەیەوە

بە گوێی خۆم لە سەعدی کوڕی ئەبو وەقاسم بیست دەیفەرموو: بە گوێی خۆم لە زاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیست، دەیفەرموو: (هەر کەسێ لەسەردەمی ئیسلامەتیدا، خۆی بکا بە کوڕی غەیری باوکی خۆی، وە سوور بشزانێ کە کوڕی ئەم باوکە درۆینەیەی نییەو کوڕی کەسێکی ترە، ئەوە بەهەشتی لێ قەدەغەیە). ئەبوبەکرە فەرمووی: (گوناهی منی تێدا نییە، من بەشداریم لەمەدا نەکردووە، منیش ئەم فەرموودەیەم بە گوێی خۆم لە زاری پیرۆزی پێغەمبەر بیستووە). (بڕوانە: تەجرید/ ٩٣٥، ١٣٩٥، ١٥٩٣، ٢٠٦٣).

**ڕوونکردنەوە:**

ڕەحمەت لەوکەسە گوتوویەتی:

**ئەوەی ئینکاری ئەصڵی خۆیی کرد**
**بە زۆڵی ژیاو، بەنامەردی مردا.**

## ٢٩) کەسێ بە برای ئایینی خۆی بڵێ: ئەی بێبڕوا! (٢١٢ - ٢١٤)
## بابٌ: مَنْ قَالَ لِأَبِيهِ كافر

٥٠- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: « لَيْسَ مِنْ رَجُلٍ ادَّعَى لِغَيْرِ أَبِيهِ وَهُوَ يَعْلَمُهُ إِلاَّ كَفَرَ، وَمَنِ ادَّعَى مَا لَيْسَ لَهُ فَلَيْسَ مِنَّا، وَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ، وَمَنْ دَعَا رَجُلاً بِالْكُفْرِ أَوْ قَالَ: عَدُوَّ اللَّهِ، وَلَيْسَ كَذَلِكَ، إِلاَّ حَارَ عَلَيْهِ». (م – ١/٥٧). {الحديث/ ٢١٤. إيمان. بخاري. مناقب: ٣٥٠٨، ٦٠٤٥. تحفة الأشراف: ١١٩٢٩}.

ئەبو زەڕ (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گوێم لێ بوو، خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (هەر پیاوێ خۆی بکا بە کوڕی غەیری باوکی خۆی، وە سوور بزانێ کە ئەوە باوکی ئەو نییە، ئەوە سپڵەو ناسوپاسو پێ نەزانە، دەرحەق بە پەروەردگاریو دەرهەق بە باوکی، وە هەرکەسێ شتێ بە ناڕەوا بکات بەهی خۆی کە هی ئەو نەبێت، ئەوە لە ئێمە نییە، وەبا جێگەی خۆی لەناو ئاگری دۆزەخدا خۆش بکات، وە هەرکەسێ بە موسوڵمانێ بڵێ ئەی ناموسوڵمان، یا پێی بڵێ: ئەی دوژمنی خودا!، وە وەك ئەو دەڵێ وانەبێ، ئەوە جنێوەکە دەگەڕێتەوە بۆ خۆی).

**٣٠) کام گوناه گەورەترین گوناهە (٢٥٣ - ٢٥٤). (باب: أيُّ الذّنْبِ أكْبَرُ)**

٥١- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ الذَّنْبِ أَكْبَرُ عِنْدَ اللَّهِ؟ قَالَ: « أَنْ تَدْعُوَ لِلَّهِ نِدًّا وَهُوَ خَلَقَكَ، قَالَ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: أَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ مَخَافَةَ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ، قَالَ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: أَنْ تُزَانِيَ حَلِيلَةَ جَارِكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ تَصْدِيقَهَا: (وَالَّذِينَ لاَ يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلاَ يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِى حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ وَلاَ يَزْنُونَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا). (م — ١/ ٦٣ - ٦٤). {الحديث/ ٢٥٤. إيمان: بخاري. تفسير: ٤٤٧٧، ٤٧٦١، ٦٠٠١، ٦٨١١، ٦٨٦١، ٧٥٢٠، ٧٥٣٢. ابو داود. طلاق: ٢٣١٠. ترمذي. تفسير: ٣١٨٢. نسائي. تحريم: ٤٠٢٤. تحفة الأشراف: ٩٤٨}.

**عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود** (ڕەزای خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **ئەی پێغەمبەری خودا! چ گوناهێ لەلای خودا زۆر گەورەیەو بە تاوانێکی زۆر گەورە دەژمێردرێت؟ فەرمووی: (ئەوەیە کە مانەند بۆ خودا بڕیاربدەیت، ئەو خودایەی کەتۆی لە نەبوون دروست کردووە، تۆ بڵێی هاوەڵی هەیە!). گوتم: لە ڕاستیدا خۆشی وایەو ئەوە تاوانێکی زۆر گەورەیە، ئەی لە دوای ئەوە چی تاوانێکی تر فرە گەورەیە؟ فەرمووی: (ئەوەیە کە لەترسی ئەوەی منالی خۆت نان‌و ئاوەکەت بخوات بچی بیکوژیت!). گوتم: ئەی دوا ئەو چی تر؟ فەرمووی: (ئەوەیە کە داوێن پیسی بکەیت لەگەڵ حەلاڵ‌و هاوسەری دراوسێکەتدا).**

**جا خودای مەزن‌و خاوەن شکۆ، بۆ پشتیوانی ئەم فەرموودەیەی خۆشەویست، ئەم ئایەتەی لە سوورەتی فورقاندا ناردە خوارەوە: {وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا}. واتە: (وە ڕەوشتێکی جوانی تری بەندە باشەکانی خودا ئەوەیە کە جگە لە خودای تاك‌و تەنیا خودای تر ناپەرستن‌و هاواری لێ ناکەن، وە خوێنی ناهەق نارێژن، وە داوێنپیسی ناکەن‌و خواپەرست‌و دەم‌و دەست‌و دڵ‌و دەروون‌و داوێن پاکن، وەکی تریش هەرکەسێ ئەم جۆرە تاوانانە ئەنجام بدا، ڕووبەڕووی سزاو تۆڵەی سەختی خودا دەبێتەوە). (بڕوانە: تجريد/٤/٤١٠، ژمارە: ١٦٣١). (بڕوانە: مختصری صحيحی مسلم = مص ژمارە: ٤٦).**

## ٣١) كەسێ هاوەڵ بۆ خودا بڕیانەدا دەچێتە بەهەشت (٢٦٤ - ٢٦٩)
## باب: مَنْ مَاتَ لاَيُشْرِكُ بِاللّهِ شيئاً دَخلَ الجَنَّةَ

٥٢- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِالله (رَضِيَ اللّهُ عنهما) قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْمُوجِبَتَانِ؟ قَالَ: « مَنْ مَاتَ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ الْجَنَّةَ، وَمَنْ مَاتَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ النَّارَ ». (م — ١/ ٦٥ — ٦٦). {الحديث/ ٢٦٥، إيمان. بخاري. جنائز: ١٢٣٨، ٤٤٩٧، ٦٦٨٣. تحفة الأشراف: ٩٢٥٥}.

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی خۆشەویست، (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو دوو شتە چیو چین، کە یەکێکیان بەهەشت مسۆگەر دەکاو ئەوی تریان دۆزەخ مسۆگەر دەکا؟ فەرمووی: (هەرکەسێ لەسەر ئیمانو باوەڕ بەخودا بمرێو هیچ هاوبەشو هاوەڵ دانەنێ بۆ خودا، ئەوە دەچێتە بەهەشت، وە هەرکەسێ هاوبەشو هاوەڵ بۆ خودا دابنێو، لەسەر ئەو حاڵە بمرێو تەوبەی لێ نەکا، ئەوە دەچێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە!). (ریاض/٣/٢، ژمارە: ٤١٤).

٥٣- عَنْ أَبِي الأَسْوَدِ الدِّيلِيِّ أَنَّ أَبَا ذَرٍّ حَدَّثَهُ أَنَّهُ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَهُوَ نَائِمٌ، عَلَيْهِ ثَوْبٌ أَبْيَضُ، ثُمَّ أَتَيْتُهُ فَإِذَا هُوَ نَائِمٌ، ثُمَّ أَتَيْتُهُ وَقَدِ اسْتَيْقَظَ، فَجَلَسْتُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: « مَا مِنْ عَبْدٍ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، ثُمَّ مَاتَ عَلَى ذَلِكَ إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ، قُلْتُ: وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ؟ قَالَ: « وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ». قلت: وَإِنْ زنى وإِنْ سَرِقَ؟ ثلاثًا، ثُمَّ قَالَ فِي الرَّابِعَةِ: « عَلَى رَغْمِ أَنْفِ أَبِي ذَرٍّ». قَالَ: فَخَرَجَ أَبُو ذَرٍ وَهُوَ يَقُولُ: (وَإِنْ رَغِمَ أَنْفُ أَبِي ذَرٍّ). (م — ١/٦٦). {الحديث/ ٢٦٩. إيمان. بخاري. جنائز: ١٢٣٧، ١٤٠٨، ٢٣٨٨، ٣٢٢٢، ٥٨٢٧، ٦٢٦٨، ٦٤٤٣، ٦٤٤٤، ٧٤٨٧}.

ئەبو ئەسوەدی دیلی دەفەرموێ: ئەبو زەڕ خۆی ئەم فەرموودەیەی بۆم گێڕایەوە، فەرمووی: چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نووستبوو، جلێکی سپی لەبەردا بوو، لە پاشان دیسانەوە چوومەوە بۆ خزمەتی، هەر خەوتبوو، پاشان کە چوومەوە بۆ خزمەتی لەخەو هەڵسا بوو، لە خزمەتیدا دانیشتم، فەرمووی: (هەرکەسێ بە دڵ باوەڕ بهێنێو بەزمان ئاشکرای بکاو بڵێ: (لاَ

إِلَهَ إِلاَّ اللَّه) وە بەردەوام بێ لەسەر ئەمەو لەسەر ئیمان بمرێ، لەبەهەشت نائومێد نابێو سەرەنجامی بەهەشتە). منیش عەرزیم کرد: قوربان! با حیزیو دزیش بکا؟ فەرمووی: (بەڵێ، باحیزیو دزیش بکا) تا سێجار ئاوا لێیم دووبارە کردەوە، ئەویش هەمان وەڵامی دووبارە کردەوە، پاشان لەسەری جاری چوارەما فەرمووی: (بەکوێرایی چاوی ئەبو زەڕەوە!). دەفەرموێ: ئەبو زەڕ خۆشی کە هاتە دەرەوە، بۆ پشتیوانی فەرمایشتەکەی پێغەمبەر دەیفەرموو: (بەڵێ: بەکوێرایی چاوی ئەبو زەڕەوە، ئەوەی لەسەر ئیمان بمرێ، با گوناهی گەورە گەورەشی کردبێ، لە بەهەشت نائومێد نابێ، من پێم خۆش بێ یا پێم ناخۆش بێ، هیچ لە بڕیاری خودا ناگۆڕێ). (بڕوانە ژمارە: ٩، کە لەم بەرگەدا لە پێشەوە رابورد).

**٣٢) ناچێتە بەهەشت کەسێ بەقەد سەنگی مێرووچەیێ فیزو دەعیە لە دڵیابێ** (٢٦١ - ٢٦٣) **واتە: لە صەحیحی موسلیما ئەم باسە ئەم سێ فەرموودەی واتیادا، کە ژمارەیان:** (٢٦١، ٢٦٢، ٢٦٣).

(**باب: لاَيَدْخُلُ الجنَّةَ مَنْ قَلْبِهِ مثقال ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ**)

٥٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: « لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ، قَالَ رَجُلٌ: إِنَّ الرَّجُلَ يُحِبُّ أَنْ يَكُونَ ثَوْبُهُ حَسَنًا، وَنَعْلُهُ حَسَناً، قَالَ: « إِنَّ اللَّهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الْجَمَالَ، الْكِبْرُ بَطَرُ الْحَقِّ وَغَمْطُ النَّاسِ». (م – ١/٦٥). {الحديث/ ٢١٦. إيمان}.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری ئازیز فەرمووی: (ئەوەی بەقەی تۆسقاڵێ دەعیەو دەمار لە دڵیا بێ، ناچێتە بەهەشت). پیاوێکیش گوتی: قوربان! پیاوی وا هەیە حەزدەکا بەرگی جوان بێ، پێڵاوی کەشخەبێ، ئەی ئەوە حاڵی چۆنە، شتی وا دادەنرێ بە فیزو دەعیە؟ فەرمووی: (ئەوە قەیدی نییەو بەر فیزو دەمار ناکەوێ، ئەوە جوانیی خۆشەویستییە، ئەوەیش قەیدی نییە، ئەگەر بۆ فیزو دەعیە نەبێو بۆ تەحەددوث بە نیعمەتی خودابێ، چونکە خودا بۆخۆی جوانەو حەزیشی لە جوانییە، بەڵام دەمارو دەعیە

هـەق پێشـێلكردنەو خەڵـك بـە سـووك دانـانو مـەردووم بـە سـووك زانینـە!!).
{ریاض/٢/١٦١، زنجیرە: ٧٢، ژمارە: ٦١٢}.

## ٣٣) تانەو تەشەر لە بنەچەو نەژادو شینو شیوەن بۆ مردوو (٢٢٦).

## باب: الطَّعْنُ فِي النَّسَبِ وَالنياحَةُ مِنَ الكُفْرِ

٥٥- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « اثْنَتَانِ فِى النَّاسِ هُمَا بِهِمْ كُفْرٌ: الطَّعْنُ فِى النَّسَبِ، وَالنِّيَاحَةُ عَلَى الْمَيِّتِ». (م — ١/٥٨). {الحديث/ ٢٢٤}.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فـەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (دوو خـووی ناشـیرین لـەناو مەردومـدا هـەن، هاوتـای كـوفرو بێبـاوەڕی دەكەن: توانجو تانەدان بەناڕەوا لە رەچەڵەكو بنەچـەی خەڵـك، هـەروەها شـیوەن گێڕان لەسەر مردوو). (ریاض/٤، لاپەڕە: ٤٣، زنجیرە: ٢٧٥، ژمارە: ١٥٧٨ و ١٦٦٧).

## ٣٤) ئەوەی بڵێ بەهۆی بورجەوە بارانمان بۆ باری كافر دەبێ (٢٢٨ - ٢٣١)

## باب: مَنْ قَالَ مُطِرْنَا بِالأَنْوَاءِ فَهُوَ كَافِرٌ

٥٦- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِىِّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّى لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، صَلاَةَ الصُّبْحِ بِالْحُدَيْبِيَةِ فِي إِثْرِ سَمَاءٍ كَانَتْ مِنَ اللَّيْلِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ، أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ، فَقَالَ: « هَلْ تَدْرُونَ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟». قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: « أَصْبَحَ مِنْ عِبَادِى مُؤْمِنٌ بِى وَكَافِرٌ، فَأَمَّا مَنْ قَالَ مُطِرْنَا بِفَضْلِ اللَّهِ وَرَحْمَتِهِ، فَذَلِكَ مُؤْمِنٌ بِى، كَافِرٌ بِالْكَوْكَبِ، وَأَمَّا مَنْ قَالَ مُطِرْنَا بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا، فَذَلِكَ كَافِرٌ بِى وَمُؤْمِنٌ بِالْكَوْكَبِ». {الحديث/ ٢٢٨. إيمان. بخاري. صلاة: ٨٤٦، ١٠٣٨، ٤١٤٧، ٧٥٠٣}

زەیدی كوڕی خالیدی جوهەنی، (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لـە حودەیبیـە بـووین، شـەو بـاران بـاریبوو، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بـەر نوێـژیی نوێـژی بـەیانی بـۆ كـردین، كـە سلاوی دایـەوە رووی كـردە خەڵـكەكەو فـەرمووی: (ئایـا دەزانـن كـە پـەروەردگارتان، بەبۆنـەی بـارینی ئـەم بارانـەوە چـی دەفـەرموێ؟ گوتیـان: خـوداو

پێغەمبەری خودا خۆیان باش دەزانن، فەرمووی: دەفەرمویٚ: ئەم بەیانیە بەهۆی بارینی ئەم بارانەوە، بەندەکانم بوون بە دوو تاقم، تاقمێکیان باوەڕیان بەمن هەبوو، وە تاقمێکیان باوەڕیان بەمن نەبوو، ئەوەی بلیٚ لە سایەی خوداو رەحمەتی خوداوە، ئەم بارانەمان بۆ باری، ئەوە باوەڕی تەواوی بەمن هەیەو، باوەڕی بە بورجو ئەستێرەو شتی تری وا نییە، بەلاٌم ئەو کەسەی بلیٚ: لە فیسارە بورجا بارانمان بۆ باریوە، ئەوە باوەڕی بەمن نییەو، بەلٌکوو باوەڕی بە کاریگەریی بورجو ئەستێران هەیە، لە بارینیدا). {تەجرید/١، لاپەڕە: ٤٣٢، ژمارە: ٤٥٦. ریاض/٤/١٣٧، زنجیرە: ٣٢٥، ژمارە: ١٧٣١} + {تەجرید/١/٥٠٠، ژمارە: ٥٢٨}.

**روونکردنەوە:**

مەبەستی سەرەکی لەم فەرموودەیەو لە شێوەی ئەم فەرموودەیە ئەوەیە: دروست نییە موسولٌمان باوەڕی وابیٚ کە بورجو ئەستێرەو شتی وا کاریگەرییان هەیە لە بارینی بارانا، بەلاٌم هەورو بورجو ئەمانە ئەگەر دابنرێن بە نیشانەو کاتی بارینی باران ئەوە قەیدی نییە، گەرچی زۆر باشیش نییە).

زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی، لەرجالی صەحیحەینە، لە بوخاریو موسلیمدا فەرموودەی هەیە، هەشتاو یەك فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، لە بوخاریدا پێنج فەرموودەی هەیە، لە رۆژی ئازادکردنی شاری مەککەدا، ئالاٌی لەشکری هۆزەکەی خۆی کە هۆزی جوهەینە بوون بەو بوو، گێڕانەوەی لە پێغەمبەرو لە عوسمانو لە ئەبو تەلحەو لە عائیشەوە ئەنجامداوە، کۆمەلیٚ – کەدوانیان کوڕی خۆی بوون- فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، ئامادەی رۆژەکەی صولٌحی حودەیبیە بووە. را جیاییەکی زۆر، لە سالٌی تەمەنیو مردنیو جێگەی مردنی هەیە، هەندیٚ دەلٌێن: سالٌی حەفتاو هەشتی کۆچی لە تەمەنی هەشتاو پێنج سالٌیدا، لە مەدینە مردووە، هەندیٚ تر دەلٌێن: لە میسر، لە سالٌی پەنجادا، لە تەمەنی حەفتاو هەشت سالٌیدا مردووە، لە کووفە نیشتەجیٚ بوو، دەلٌێن: هەر لەوێش مردووە. لەناو هاوەلاٌنی پێغەمبەردا، هەر ئەم ناوی زەیدی کوڕی خالدە.

ئـەم فەرموودەیـەی زەیـدی کـوڕی خالیـد (مُتفَقٌ عَلَیـهِ)یـە، واتـە: پەسـەندی هـەردوو پـیرە، کـە شـێخی بوخـاری‌و شـێخی موسـلیمن، تەنانـەت دەقـی هـەردوو فەرموودەکە، لە هەردوو کتێبەکەدا، زۆر زۆر لەیەکەوە نزیکن.

**٣٥) هەڵهاتنی کۆیلە لەدەستی ئاغا (خاوەنە)کەی بە کفری نیعمەت دادەنرێ، هاوتای بێباوەڕی‌و سپڵەیی دەکا (٢٢٥-٢٢٧-٣١/٣٠).**

**باب: إِذَا أَبِقَ الْعَبْدُ فَهُوَ كُفْرٌ**

٥٧- عَنِ الشَّعْبِيِّ عَنْ جَرِيرٍ أَنَّهُ سَمِعَهُ يَقُولُ: « أَيُّمَا عَبْدٍ أَبَقَ مِـنْ مَوَالِيـهِ فَقَـدْ كَفَـرَ، حَتَّى يَرْجِعَ إِلَيْهِمْ». فَقَالَ مَنْصُورٌ: قَـدْ وَاللَّـهِ رُوِاهُ عَـنِ النَّبِـيِّ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ)، وَلَـكِنِّي أَكْرَهُ أَنْ يُرْوَى عَنِّي هَا هُنَا بِالْبَصْرَةِ). (م – ١/٥٩). {الحديث/٢٢٥. إيمان}.

شـەعبی لـە جـەریرەوە، فـەرمووی: لـە جـەریری هـاوەڵی پێغەمبـەرم بیست دەیفەرموو: (هەر بەندەیێ لە دەست خـاوەنی، بـەبێ مەهانەیـەکی رەوا، هـەڵ بـێ، ئـەوە سـپڵەو بەدنمـەك دەرچـووەو کفـری نیعمـەتی کـردووە، هـەتا دەگەڕێتـەوە بۆلایان!). {ریاض/٤/١٥٤، زنجیرە: ٢٤٩، ژمارە: ١٧٦٨}.

مەنصوور کە ئەم فەرموودەیەی لـە شـەعبییەوە، لـە جـەریرەوە گێڕایـەوە، بـە مـەوقووفی لەسـەر جـەریر، ئەوسـا فـەرمووی: بـەخودا ئـەم فەرموودەیـەم بـە مەرفووعی هەتا سەر پێغەمبەر، لەم زاتانەوە گێڕاوەتەوە بەڵام حەز ناکەم لێرە لـە بەصـرە، بەشـێوەی مـەرفووعی لـە منـەوە ریوایـەت بکـرێ، چـونکە موعتـەزیلـەو خەواریجەکان، کە ئەو سەردەمە لـە بەصرە بـوون‌و لـەوێ چـالاکی عەقائیـدی، دژی ئـەهلی سـوننەو جەماعـەیان بـوو، چـونکە ئەوانـە ئـەم فەرموودەیـە دەکـەن بـە مەهانەو بیانوو، بۆ پشتگیری مەزهەب‌و بیرو باوەڕە چـەوت‌و چـەوێڵەکەی خۆیـان، کە گوایـە: تاوانبـاران لـە دۆزەخـا هـەتا هـەتایین، بەڵـکوو خەواریجـەکان بـە کـافرو بێباوەڕیشی دادەنێن.

جـەریری کـوڕی عەبـدوڵڵای بوجـەلی هـاوڕێی مـەزنی پێغەمبـەر، لـە ئـاخرو ئۆخری تەمەنی حەزرەتدا ئیسلام بووە، سەد فەرموودەی هەیە، لـە بوخاریـدا نـۆی

هەيە، لە موسلیما چواردە، هەشتیان پەسەندی هەردوكیانن، لە كووفە نیشتەجێ بوو، لەپاشا لەقەرقیسیا، هەر لەوێش لە ساڵی پەنجاویەكی كۆچیدا مردووە، لەبەر جوانی پێیان دەگوت یوسفی ئەم میللەتە. لە ئاژاوەو شەڕو شۆڕەكەی ناو موسوڵمانان كەنارە گیربوو.

٥٨- عَنْ جَرِيرُ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « إِذَا أَبَقَ الْعَبْدُ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلاَةٌ ». (م – ١/٥٩). {الحديث/ ٢٢٧}.

جەریری كوڕی عەبدوڵڵا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر كۆیلە هەڵبێو لەدەست ئاغاكانی رابكا، نوێژی قەبووڵ نابێ).

## ٣٦) پشتو پەنای من بەس خودایەو لەپاش خودایش چاكانی باوەرداران

(٥١٨. إيمان). (باب: إِنَّمَا وَلِيّى اللّهُ وَصَالِحُ الْمُؤْمِنِينَ)

٥٩- عَنْ عَمْرَو بْنَ الْعَاصِ، (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُول اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، جِهَارًا، غَيْرَ سِرٍّ، يَقُولُ: «أَلاَ إِنَّ آلَ أَبِى... (يَعْنِي فُلاَنًا) لَيْسُوا لِي بِأَوْلِيَاءٍ، إِنَّمَا وَلِيِّىَ اللَّهُ وَصَالِحُ الْمُؤْمِنِينَ). (م – ١/١٣٦). {الحديث/ ٥١٨. إيمان. بخاري: ٥٩٩٠}.

عەمری كوڕی عاص (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: بە گوێی خۆم بە ئاشكرا، بە دەنگی بەرز، نەك بە نهێنیو لەژێر لێوەوە، لە زاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (خانەوادەی نەوەی فیسارە كەس، كە رەگەزو نەژادو كەسوكاری منن، پشتیوانو سەروەری من نین، پشتو پەناو سەروەرو پشتیوانی من تەنیا خودایەو بەس، لەدوا خودا كەسو پشتو پەنای من هەموو موسوڵمانێكی خواناسی باشە، كە لەكاتی پێویستدا دەبن بە پارێزەرانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام). {ریاض/١، لاپەڕە: ٢٦٥، زنجیرە: ٤٠، ژمارە: ٣٣٠ – ش. تەجرید: ١٩١٨}.

**روونكردنەوە:**

عەمری كوڕی عاص (رەزای خودای لێ بێ) لەپێش ئازادكردنی مەككەدا موسوڵمان بووە، پیاوێكی بلیمەت بووە، پێغەمبەر رێزی تایبەتی ئەوی دەگرت، چونكە داناو زاناو

ئـازا بـوو، ئـەو قنسـرينـى ئـازادكرد، عومـەر كـردى بـە حوكمـدارى فەلەسـتين. لـە ئاژاوەكـەى نێـوانى عـەلىو موعاوييـەدا، عـەمر لايـەنگيرى موعاوييـە بـوو، لەپاشـا موعاوييە كردى بـە فەرمانـدەى سـوپايەكى گـەورەو ناردى بـۆ ميسـر، هـەتا لـە رۆژى جەژنى رەمەزانا لەوێ مرد، لە تەمەنى نەوەد ساڵيدا، لە (المقطم) نێـژرا، عەبـدوڵڵاى كـوڕى نوێـژى لەسـەركرد، ئـەوجا گەڕايـەوە نوێـژى جـەژنى بـۆ خەڵـكەكە كـرد، وە لەشوێنى باوكى بوو بە حوكمدارى سەر ميسر، عەمر شاعيرێكى جوان بوو.

**٣٧) باوەڕدار لەسەر چاكەكانى لە هەردوو جيهاندا پاداشى باش وەردەگرێ، بەڵام بێباوەڕ لە جيهانا بە زوويى پاداشى چاكەكانى وەردەگرێو بەس.** (٧٠٢٠ - ٧٠٢٢).

**باب: جزاء المؤمن بِحَسَنَاتِهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَتَعْجِيلُ حَسَنَاتِ الكَافِرِ فِي الدُّنْيَا.**

٦٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « إِنَّ اللَّهَ لاَ يَظْلِمُ مُؤْمِنًا حَسَنَةً يُعْطَى بِهَا فِى الدُّنْيَا، وَيُجْزَى بِهَا فِى الآخِرَةِ، وَأَمَّا الْكَافِرُ فَيُطْعَمُ بِحَسَنَاتِ مَا عَمِلَ بِهَا لِلَّهِ فِى الدُّنْيَا حَتَّى إِذَا أَفْضَى إِلَى الآخِرَةِ لَمْ تَكُنْ لَهُ حَسَنَةٌ يُجْزَى بِهَا». (م ٨/١٣٥). {الحديث/ ٧٠٢٠. صِفَاتُ المُنَافِقِينَ}.

ئەنەسـى كـوڕى ماليـك (رەزاى خـوداى لێ بـێ) فـەرمووى: پێغەمبـەر (دروودى خـوداى لەسـەر بـێ) فەرمووى: (خودا زۆرو ستەم لە موسوڵمان ناكا، بـەوە كـە لەپاداشـى باشـى چاكەكانى كەم بكاتـەوە، بەڵـكوو چاكەكەى لـە جيهانـا بـۆى دەبـێ بـە مايـەى خێـرو لـە دوارۆژا پاداشى باشى لەسەر وەردەگرێ. بەڵام بێباوەڕ لە جيهانا ئەو چاكانەى كـە لـە بۆخـودا كردوونـى، رزقو رۆژىو خۆشـى لەسـەر وەردەگـرێ، هـەتا كاتـێ دەمـرێو لـە دوارۆژا دەچێتەوە بەر ديوانى خودا، چاكەى نييە كە پاداشى باشى لەسەر وەربگرێ!).

**٣٨) ئيسلام بريتييە لەچى؟ روونكردنەوەى نيشانەكانى** (١٠٠ - ١٠٢).

**بابٌ: الإِسْلاَمُ مَاهُوَ؟ وَبَيَانُ خِصَالِه**

٦١- عَنْ طَلْحَةَ بْنَ عُبَيْدِ اللَّهِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، مِنْ أَهْلِ نَجْدٍ ثَائِرُ الرَّأْسِ نَسْمَعُ دَوِيُّ صَوْتِهِ، وَلاَ نَفْقَهُ مَا يَقُولُ، حَتَّى دَنَـا

مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَإِذَا هُوَ يَسْأَلُ عَنِ الإِسْلاَمِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « خَمْسُ صَلَوَاتٍ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ، فَقَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهُنَّ؟ قَالَ: لاَ، إِلاَّ أَنْ تَطَوَّعَ، وَصِيَامُ شَهْرِ رَمَضَانَ، فَقَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهُ؟ قَالَ: لاَ، إِلاَّ أَنْ تَطَوَّعَ، وَذَكَرَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الزَّكَاةَ، فَقَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهَا؟ قَالَ: لاَ، إِلاَّ أَنْ تَطَوَّعَ، قَالَ: فَأَدْبَرَ الرَّجُلُ وَهُوَ يَقُولُ: وَاللَّهِ لاَ أَزِيدُ عَلَى هَذَا وَلاَ أَنْقُصُ مِنْهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَفْلَحَ إِنْ صَدَقَ». وَفِي رِوَايَةٍ (١٠١. إيمان): قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « أَفْلَحَ وَأَبِيهِ إِنْ صَدَقَ ». أَوْ: « دَخَلَ الْجَنَّةَ، وَأَبِيهِ، إِنْ صَدَقَ». (م١/٣١-٣٢). {الحديث/١٠٠. إيمان. بخاري. إيمان:٤٦،١٨٩١، ٢٦٧٨، ٦٩٥٩}.

طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی قژ ئاڵۆسکاوی خەڵکی نەجد دەهات بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لە دوورەوە گرمەی دەنگی دەهات، بەڵام نەمان دەزانی کە دەڵێ چی، جا کاتێ هاتە پێشەوە بۆمان دەرکەوت کە لەبارەی شەریعەتی ئیسلامەوە پرسیاری هەیە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (لە هەموو شەوو ڕۆژێکا دەبێ پێنج نوێژ بکەی) پیاوەکە گوتی: باشە نوێژی فەرزی تر لەسەرە یانا؟ فەرمووی: نەء، نوێژی فەرزی ترت لەسەر نییە، مەگەر بەئارەزووی خۆت نوێژی سوننەت بکەی). ئینجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانیش دەبێ بگری). پیاوەکە گوتی: باشە ڕۆژووی ترم لەسەرە یانا؟ فەرمووی: (نەء، مەگەر بەئارەزووی خۆت ڕۆژووی تر بگری). پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باسی زەکاتیشی بۆیکرد، پیاوەکەیش گوتی: باشە لەمە زیاتر زەکاتی ترم لەسەرە؟ فەرمووی: نەء، مەگەر بە ئارەزووی خۆت خێری تر بکەی. لەپاشا پیاوەکە ڕۆیشتو گوتی: بەخودا نە لەمە زیاترو نە لەمە کەمتر دەکەم. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر ڕاست بکا ڕزگاری دەبێ!).

لە گێڕانەوەیەکا، کە ژمارەی (١٠١)ە لە صەحیحی موسلیمدا، بەپێی تەرقیمی (مامۆستا شێخ خلیل مأمون شیحا) کە ئێمە لەم وەرگێڕانەیەدا پیادەی دەکەین و

پابەند دەبین پێی، فەرمووی: (بەسەری بابی، رزگاری بوو ئەگەر راست بکا) یا فەرمووی: (بە سەری بابی دەچێتە بەهەشت ئەگەر راست بکا).

**روونکردنەوە:**

١- شایەتمانو نوێژو رۆژوو زەکاتو حەجو عەمرە کۆڵەکەو بنەما سەرەکییەکانی ئایینی ئیسلامن، لەم فەرموودەیەدا، بەپێی کاتو شوێنو کەسو بوار، پێغەمبەر باسی ئەرکو پێویستییەکانی ئیسلامی کردووە، ئەوەش واتای وا نییە کە یاسا نامەی ئیسلامەتی هەر ئەم چەند شتەیەو بەس، بەڵکوو دەبێ کۆی ئەمانە لە سەرجەمی فەرموودەو فەرمایشتەکانی قورئانو سوننەت دیاری بکرێن، وە ئەمەش لە سایەی خوداوە زۆر بەجوانی کراوە، ئیتر خەڵک بیانووی ئەوەی نەماوە کە بڵێ: منیش وەك ئەم پیاوە هەر ئەم چەند شتە دەکەمو بەس.

٢- طەلحە یەکێکە لە دە مژدە پێدراوەکان، ئەویش وەکوو ئەبوبەکری صەدیق لە باپیرەی حەوتەما، کە ناوی موررەیە، سەرجەلەی دەگاتەوە بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دایکی لە موسوڵمانە کۆچکارەکانە، لە هەموو نەبەردەکانی پێغەمبەردا ئامادە بووە، لە غەزای بەدردا نەبێ، هەتا لەم غەزایەشدا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەشە پشکی خۆیی بۆ داناوە، یەکێکە لەو هەشت کەسە کە زۆر زوو ئیسلام بوون، یەکێکیشە لەو پێنج کەسەی کە لەسەر دەستی ئەبوبەکری صەدیقدا ئیسلام بوون، یەکێکە لەو شەش کەسەیش کە عومەر هەڵی بژاردبوون، کە لەسەر راوێژی موسوڵمانان، لەپاش مەرگی خۆی یەکێکیان بکرێ بە فەرمانڕەوای موسوڵمانان، چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەتا مرد لێیان رازیی بوو، لە رۆژی ئوحوددا پشتی پێغەمبەری چۆڵ نەکرد، شمشێرێکیان داهێنایەوە بۆ روخساری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەو دەستی خۆی دایە بەری، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ناوی نابوو طەلحەی خێرو طەلحەی زۆر بەخشندە، سیو هەشت فەرموودەی گێڕاوەتەوە، دوانیان پەسەندی هەردوو پیرە، لە بوخاریدا دوو فەرموودەی هەیە، لە موسلیمدا سێ فەرموودە، لە رۆژی رووداوی ئەلجەمەلدا، بە تیری وێڵ کوژرا، لە

دەی جومادای یەکەمی ساڵی (٣٦) سیی‌و شەشی کۆچی، لە تەمەنی شەست‌و چوار ساڵیدا، گۆڕی لە بەصرەیە، کچێکی لەپاش (٣٠) سیی ساڵ خەوی پێوە بینی، سکاڵای لە دەست شێداریی گۆڕەکەی دەکرد، جا لەسەر فەرمانی کچەکەی تەرمەکەیان دەرهێنا، کەچی هێشتا جەستەی هەر تەڕو نەرم‌و شل بوو، ئەوسا لە دارولهیجرەتەین لە بەصرە نێژدرایەوە، ئێستا گۆڕەکەی شۆرەتدارو ناسراوە، بەندە چوومەتە سەردانی.

جارێ لە هەولێر، لە ئوتێل، لەگەڵ سەلاحی کوڕمدا، تووشی خێزانێکی کوردی کەرکووك بووین، زۆر شادمان‌و کەیفخۆش بوون، سێ‌و چوار منداڵ‌و سێ‌و چوار ئافرەت‌و یەك دوو کوڕو پیاو بوون، کە هۆی ئەم خۆشی‌و شادیەمان لێ پرسین، گوتیان: (لە شەڕی یەکەمی کووەیتا، کوڕێکمان سەرباز بوو، ڕۆژێ تەرمێکیان هێنایەوە بۆمان، گوتیان: ئەمە تەرمی کوڕەکەتانە شەهید بووە، ئێمەیش لە گۆڕستان ناشتمان‌و پرسەمان بۆدانا، دایکی‌و ژنەکەی زۆر پەرۆش بوون بۆی، هەموو حەفتەیێ، لە ڕۆژی دینی سەرقەبرانا، بە کۆمەڵی، دایك‌و خوشك‌و ژن‌و منداڵەکانی دەچووین بۆ سەردانی گۆڕەکەی، لەوێ تێر تێر دەگریاین بۆی!!).

کەچی زۆری پێ نەچوو خاوەنی گۆڕەکە، شەش حەوت جار هاتە خەومان، بە تایبەتی دەهاتە خەوی دایکی‌و ژنەکەی‌و دەیگوت: من کوڕی ئێوە نیم مەیەن بۆ سەردانم‌و گوناهبارم مەکەن، دایکی‌و ژنەکەی چوون بۆلای مەلایێ‌و لە حاڵەکە حاڵی دەکەن، ئەویش دەفەرموێ: (با هەر دایکەکەیی‌و ژنەکەی بچن بۆ دێنیی گۆڕەکەی‌و کە دەشچن بە بەرگی شەرعییەوە بچن‌و بۆی مەگرین‌و هات‌و هاوار مەکەن‌و قورئان‌و فاتیحای بۆ بخوێنن‌و بەس!!).

ئێمەیش وامان کرد، بەڵام عەسکەرەکە هەر ئەهاتەوە خەومان‌و قسەکانی خۆی دووبارەو سێ بارە دەکردەوەو بێزاری خۆی لە چوونی ئێمە بۆ سەر گۆڕەکەی دەردەبڕی، جا لەپاش دەوری دوو ساڵ، کە ئێمە ئەمە حاڵمان بوو، لە پڕێکا، فاکس‌و تەلەفوونمان لە دەرەوەی وڵات بۆکرا، کە کوڕەکەتان ماوە هەتا ئێستا

زامارێکی سەخت بووە، لای سوپای ئەمریکا. ئیتر ئەمە جاری دووەمە کە دەچین لە زاخۆ دەیبینین‌و دەگەڕێتەوە بۆ شوێنی خۆی!!

دایکەکەیان گوتی: ئێستا قەبری ئەو عەسکەرەم هەڵبەستووەو بەیداخی سەوزم بۆ کردووەو حەفتانە سەردانێکی شەرعی دەکەم.

### ٣٩) ئیسلام لەسەر پێنج ئەستوون بنیات نراوە (١١١ - ١١٤)
### بابٌ: بُنِيَ الإِسْلاَم عَلَى خَمْسٍ.

ئەم باسە لە صەحیحی موسلیما، بەپێی سەر باسەکانی شەرحی ئیمامی نەوەوی چوار فەرموودەی لە خۆی گرتووە، لە ژمارە: ١١١ هەتا ژمارە: ١١٤).

٦٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « بُنِيَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ عَلَى أَنْ يُوَحَّدَ اللَّهُ، وَإِقَامِ الصَّلاَةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ وَصِيَامِ رَمَضَانَ وَالْحَجِّ ». فَقَالَ رَجُلٌ: الْحَجِّ وَصِيَامِ رَمَضَانَ؟ فَقَالَ: لاَ، صِيَامِ رَمَضَانَ وَالْحَجِّ، هَكَذَا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). (م ١/٣٤). {الحديث/ ١١٣. إيمان. بخاري. إيمان: ٨، ٤٥١٤}.

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئیسلامەتی لەسەر ئەم پێنج بنیاتە دامەزراوە: یەکەم: لەسەر ئەوە کە خوای پاك‌و پیرۆز بەیەك بزانرێ‌و هاوەڵی بۆ بڕیار نەدرێ. دووەم: کردنی نوێژ بە ڕێك‌و پێکی، سێیەم: زەکاتدان، چوارەم: ڕۆژوو گرتنی مانگی رەمەزان، پێنجەم: حەجکردن). پیاوێ رەخنەی لە ئیبنو عومەر گرت‌و گوتی: خۆی حەج‌و ڕۆژووی رەمەزانە؟ ئەویش فەرمووی: نەء، وانییە، من چۆنم لە پێغەمبەر بیستووە ئەوەم گوتووە.

### ٤٠) چی لە ئیسلاما زۆر باشە (١٥٩ - ١٦٢). بابٌ: أَيُّ الإِسْلاَمِ خَيْرٌ

٦٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رضى الله عنهما): أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَيُّ الإِسْلاَمِ خَيْرٌ؟ قَالَ: « تُطْعِمُ الطَّعَامَ، وَتَقْرَأُ السَّلاَمَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ». (م ١/٤٧). {الحديث/ ١٥٩. إيمان. بخاري. إيمان: ١٢، ٢٨، ٦٢٣٦}.

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لە پێغەمبەری پرسی: چی شتێ لە ئایینی ئیسلامدا زۆر چاکە؟ فەرمووی: (نانبدەبەو خۆراك ببەخشەو سڵاویش لە هەموو کەسێ بکە، چ بیناسیو چی نەیناسی).

## ٤١) ئیسلامەتی هەرچی گوناهی پێش خۆیەتی دەیڕووخێنێ، هەروا حەجو کۆچکردنیش (٣١٧ - ٣١٨).

## باب: الإِسْلاَمُ يَهْدِمُ مَاقَبْلَهُ، وَالحَجُّ وَالهِجْرَةُ

٦٤- عَنِ ابْنِ شَمَاسَةَ الْمَهْرِيِّ قَالَ: (حَضَرْنَا عَمْرَو بْنَ الْعَاصِ وَهُوَ فِي سِيَاقَةِ الْمَوْتِ، فَبَكَى طَوِيلاً، وَحَوَّلَ وَجْهَهُ إِلَى الْجِدَارِ، فَجَعَلَ ابْنُهُ يَقُولُ: يَا أَبَتَاهُ أَمَا بَشَّرَكَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِكَذَا؟ أَمَا بَشَّرَكَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِكَذَا؟ قَالَ: فَأَقْبَلَ بِوَجْهِهِ، فَقَالَ: إِنَّ أَفْضَلَ مَا نُعِدُّ شَهَادَةُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، إِنِّي قَدْ كُنْتُ عَلَى أَطْبَاقٍ ثَلاَثٍ، لَقَدْ رَأَيْتُنِي وَمَا أَحَدٌ أَشَدَّ بُغْضًا لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنِّي، وَلاَ أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ أَكُونَ قَدِ اسْتَمْكَنْتُ مِنْهُ فَقَتَلْتُهُ، فَلَوْ مُتُّ عَلَى تِلْكَ الْحَالِ لَكُنْتُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَلَمَّا جَعَلَ اللَّهُ الإِسْلاَمَ فِي قَلْبِي، أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقُلْتُ: ابْسُطْ يَمِينَكَ فَلأُبَايِعْكَ، فَبَسَطَ يَمِينَهُ، فَقَبَضْتُ يَدِي، قَالَ: مَا لَكَ يَا عَمْرُو؟ قَالَ: قُلْتُ أَرَدْتُ أَنْ أَشْتَرِطَ. قَالَ: تَشْتَرِطُ بِمَاذَا؟ قُلْتُ: أَنْ يُغْفَرَ لِي. قَالَ: أَمَا عَلِمْتَ يَا عَمْرُو: أَنَّ الإِسْلاَمَ يَهْدِمُ مَا كَانَ قَبْلَهُ، وَأَنَّ الْهِجْرَةَ تَهْدِمُ مَا كَانَ قَبْلَهَا، وَأَنَّ الْحَجَّ يَهْدِمُ مَا كَانَ قَبْلَهُ؟ وَمَا كَانَ أَحَدٌ أَحَبَّ إِلَيَّ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلاَ أَجَلَّ فِي عَيْنِي مِنْهُ، وَمَا كُنْتُ أُطِيقُ أَنْ أَمْلأَ عَيْنَيَّ مِنْهُ إِجْلاَلاً لَهُ، وَلَوْ سُئِلْتُ أَنْ أَصِفَهُ مَا أَطَقْتُ. لأَنِّي لَمْ أَكُنْ أَمْلأُ عَيْنَيَّ مِنْهُ، وَلَوْ مُتُّ عَلَى تِلْكَ الْحَالِ لَرَجَوْتُ أَنْ أَكُونَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، ثُمَّ وَلِينَا أَشْيَاءَ مَا أَدْرِي مَا حَالِي فِيهَا، فَإِذَا أَنَا مُتُّ فَلاَ تَصْحَبْنِي نَائِحَةٌ وَلاَ نَارٌ، فَإِذَا دَفَنْتُمُونِي فَسُنُّوا عَلَيَّ التُّرَابَ سَنًّا، ثُمَّ أَقِيمُوا حَوْلَ قَبْرِي قَدْرَ مَا تُنْحَرُ جَزُورٌ، وَيُقْسَمُ لَحْمُهَا، حَتَّى أَسْتَأْنِسَ بِكُمْ، وَأَنْظُرَ مَاذَا أُرَاجِعُ بِهِ رُسُلَ رَبِّي). (م/١/ ٧٨ - ٧٩). {الحديث/ ٣١٧. إيمان}.

ئیبنو شەماسی مەهری (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەرە مەرگا بە دیاری عەمری کوڕی عاسەوە بووین، زۆر گریاو رووی کردە دیوارەکە، کوڕەکەیشی

هەرپێی دەگوت: بابە! بۆ وادەکەی؟ خۆتۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مـوژدەی ئەمەو ئەوەی پێت داوە؟ گوتی: ئەویش رووی تێ کردین و گوتی: گەورەترین شت کە ئامادەمان کردووەو جێگەی ئومێدمانە، شایەتی دانە بەمە: لاَ إِلَـهَ إلاَّ اللّـه وَأنَّ محمداً رَسُولُ اللّهِ: شایەتی دەدەم کە بەس خودا خودایە، وە موحەممەد پێغەمبەری خودایە. لە راستیدا من بەم سێ حاڵەدا تێ پەڕیوم: لەپێشدا وابووم: کەس وەك من وازۆر رقی لە پێغەمبەر نەبوو، بەخوێنی سەری تینوو بووم، ئاواتم ئەوە بوو دەستم لێی گیربێ و بیکوژم، دیارە ئەگەر خوانە خواستە لەسەر ئەم حاڵە بمردمایە بێگومان کە دۆزەخی بووم، کاتێکیش کە خودا ئیسلامەتی نایە ناو دڵمەوە، بە پێی خۆم چوومە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیم کرد: دەستی راستت بێنە هەتا بەیعەت و پەیمانت بدەمێ. جا کە ئەو دەستی خۆی درێژ کرد، من دەستی خۆمم کێشایەوە. فەرمووی: (ئەی عەمر! ئەوە چیتە بۆ وا دەکەی؟ عەرزیم کرد: دەمەوێ مەرج دابنێم! فەرمووی: مەرجی چی دادەنێیت؟) عەرزیم کرد: کە خودا لێم خۆش بێ. فەرمووی: (ئەدیی بۆ نازانیت کە ئیسلامەتی هەرچی گوناهو خراپەیێ کە لەپێش خۆیەوە بووبن دەیانڕمێنێ و دەیان سڕێتەوە، هەروەها کۆچ (هیجرەت) کردنیش هەرچی گوناهی پێش خۆیەتی دەیسڕێتەوە. ئیتر لەوەدوا کە موسوڵمان بووم کەسی تر وەکوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوا خۆشەویست و نازدار نەبووە لەبەر چاوم، ئەوەندە نازدارو بەقەدرو بەرێزو بەسام و شکۆ بوو، پڕکێشیم نەدەکرد کە پڕ بەدڵ، تێروپڕ سەیری بکەم! تەنانەت ئەگەر کەسێ داوام لێ بکا، کە ناونیشانی هەڵبەدەم و چۆنێتی روخسارو رەنگو رووی باس بکەم ناتوانم و بۆم هەڵنادرێ، چونکە لەبەر خۆشەویستی و سام و شکۆی، زاتم نەدەکرد کە بە وردی سەرنجی بدەم، ئەگەر لەسەر ئەم حاڵە بمردمایە ئەوە هیوام وا بوو کە بە هەشتی بوومایە، بەڵام لەدوای ئەوە بووین بە سەرکارو کاربەدەست لەسەر هەندێ شت، لەماوەی ئەو کاربەدەستییەدا نازانم حاڵم چۆن دەبێ).

جا کاتێ کە مردم نە سەردۆلکە بێژو شیوەنگێڕ، نە ئاگرو بخوردم لەگەڵدا نەیەت بۆسەر گۆڕخانە، وە لەکاتی ناشتنمدا خۆڵ و گڵەکە بە نەرمی بکەن بەسەرما،

لەپاشدا ئەوەنـدە لـە دەوری گۆڕەکـەم رابوەسـتن، کـە وشـترێ سـەر بـبڕێو گۆشـتەکەی دابەش بکرێ، هەتا هۆ بگرم پێتانەوەو بەزاتی ئێوەوە سامم بشکێو بیربکەمـەوە کـە چۆن وەرامی فروستادەکانی پەروەردگارم بدەمەوەو چـی بـە نـەکیرو مونکـەر بڵێم!).
{تـاج/٥، زنجـیرە: ٣١، لاپـەڕە: ١٤١، ژمـارە: ٤ = تـاج-٣ ژ-٣٤١٦ هـەتا ٣٤١٩ چ-٤} + (ریـاض. ژمارە/٧١١).

**٤٢) هەرکەسێ لەپاش موسوڵمان بوون رەفتارو کرداری جوان بێ، لەسەر کارو کردەوەی سەردەمی کافری پێش ئیسلامبوونی سزا نادرێ** (٣١٤ - ٣١٦).

**بابٌ: مَنْ أحْسَنَ فِي الإسْلاَمِ لَمْ يُؤْخَذْ بِمَا عَمِلَ فِي الجاهِلِيَّة.**

٦٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ أُنَاسٌ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنُؤَاخَذُ بِمَا عَمِلْنَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ؟ قَالَ: « أَمَّا مَنْ أَحْسَنَ مِنْكُمْ فِي الإِسْلاَمِ فَلاَ يُؤَاخَذُ بِهَا، وَمَنْ أَسَاءَ أُخِذَ بِعَمَلِهِ فِي الْجَاهِلِيَّةِ وَالإِسْلاَمِ». (م/١ - ٧٠٧). {الحديث/ ٣١٤. إيمان. بخاري. إستتابة المرتدّين: ٦٩٢١ - ٦٩٢٣}.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود، کە ناودارو ناسراوە، بە ئیبنو مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خەڵکانێ لـە پێغەمبـەریان پرسـی: قوربـان! ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئایا لەسـەر ئـەو کـردەوە خراپانـەی کـە لەسـەردەمی نـەفامی پـێش هـاتنی ئـایینی ئیسلاما کردوومانن سزاو ئەشکەنجە دەدرێـین لـە دوارۆژدا؟ فـەرمووی: (هەرکەسێ لەپاش موسوڵمان بوون رەفتارو کرداری جوان بێ، لەسەر کارو کـردەوەی سـەردەمی کـافری‌و بێبـاوەڕی پـێش ئیسـلامبوونی سـزا نـادرێو، ئـەو جـۆرە خراپانـەی پرسـینەوەی نییـە، بـەڵام هەرکەسـێ لەسـەردەمی ئیسـلامەتیدا کـردارو رەفتـاری ناشـیرین بـێو بـەدکردارو بـەد رەفتـار بـێ، تۆڵـەی بـەرودوای لێ دەسـێنرێو لەسـەر هەردوو سەردەمەکە موحاسەبە دەکرێ). (بڕوانە: ژمارە: ٧٠).

**٤٣) شەڕە جنێوکردن لەگەڵ موسوڵماندا، لەڕێگەی هەق دەرچوونەو، شەڕ تێبەستنیشی کوفرە**.(٢١٨- ٢١٩).

**بابٌ: سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ وَقِتَالُهُ كُفْرٌ**. (٢٧/٢٨)

٦٦- عَنِ عَبْدُ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُـهُ كُفْـرٌ ». (م/١/٥٨). {الحديث/ ٢١٨. إيمان. بخاري. إيمان: ٤٨، ٦٠٤٤، ٧٠٧٦}.

**عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: (شەڕە جنێوکردن لەگەڵ موسوڵمانا بە ناهەق لە ڕێگەی هەق دەرچوونەو، شەڕ تێبەستنیشی بەناهەق کفرو بێباوەڕییە).**

**٤٤) هەرکەسێ ڕەفتارو کرداری موسوڵمانانە بێ، هەرچاکەیێ بکا، خودا دەقات بۆی دەنووسێ**. (٣٢٥ - ٣٣٧).

**باب: إِذَا أَحْسَنَ أَحَدُكُمْ إِسْلَامَهُ فَكُلُّ حَسَنَةٍ يَعْمَلُهَا تُكْتَبُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا** (٥٦/٥٧ + ٥٨/٥٧).

٦٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ): « قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: إِذَا تَحَدَّثَ عَبْدِي بِأَنْ يَعْمَلَ حَسَنَةً فَأَنَا أَكْتُبُهَا لَهُ حَسَنَةً مَا لَمْ يَعْمَلْهَا، فَإِذَا عَمِلَهَا فَأَنَا أَكْتُبُهَا بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، وَإِذَا تَحَدَّثَ بِأَنْ يَعْمَلَ سَيِّئَةً فَأَنَا أَغْفِرُهَا لَهُ مَا لَمْ يَعْمَلْهَا، فَإِذَا عَمِلَهَا فَأَنَا أَكْتُبُهَا لَهُ بِمِثْلِهَا». {الحديث ٣٣٢} وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ: رَبِّ ذَاكَ عَبْدُكَ يُرِيدُ أَنْ يَعْمَلَ سَيِّئَةً - وَهُوَ أَبْصَرُ بِهِ - فَقَالَ: ارْقُبُوهُ، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا لَهُ بِمِثْلِهَا، وَإِنْ تَرَكَهَا فَاكْتُبُوهَا لَهُ حَسَنَةً، إِنَّمَا تَرَكَهَا مِنْ جَرَّائِي». {الحديث ٣٣٣} وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « إِذَا أَحْسَنَ أَحَدُكُمْ إِسْلَامَهُ فَكُلُّ حَسَنَةٍ يَعْمَلُهَا تُكْتَبُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ، وَكُلُّ سَيِّئَةٍ يَعْمَلُهَا تُكْتَبُ لَهُ بِمِثْلِهَا حَتَّى يَلْقَى اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ». {الحديث/٣٣٤. إيمان. بخاري. إيمان. ٤٢}.

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: (خودای خاوەن دەسەڵاتو خاوەن شکۆ دەفەرموێ: هەرکاتێ بەندەی من نیازی هەبوو کە چاکەیێ بکا، وە نەیکرد، ئەوە من لەلای خۆم لەسەر ئەو نیازە باشەی یەك چاکەی تەواوی بۆ دەنووسم، وە ئەگەر ویستی چاکەیەك بکاو لەهەمان**

کاتدا کردیشی، ئەوە بە دەقات بۆی دەنووسم، وە هەرکاتێ بەندە نیازی هەبوو خراپەیێ بکا، وە نەیکرد ئەوە من لە ئۆباڵی ئەو نیازە پیسە لێی خۆش دەبم، بەڵام ئەگەر نیازەکەی جێبەجێ کردو خراپەکەی ئەنجامدا، ئەوە وەك خۆی بەیەك خراپە بۆیدەنووسم).

وە هەروەها پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووشی: (فریشتەکان عەرزی خودا دەکەن: خودایە! ئەوە بەندەیەکی تۆیە دەیەوێ خراپەیێ بکا – وە خودا خۆشی ئاگای لە حاڵی ئەو بەندەیەو باشتر حاڵی دەزانێ – بۆیە دەفەرموێ: سەرنجی بدەن، ئەگەر کردی وەك خۆی بۆی بنووسن، ئەگەر وازیشی لێ هێناو نەیکرد، ئەوە لە جیاتی ئەوە یەك چاکەی بۆ بنووسن، چونکە لەبەرخاتری من وازی لەو گوناهە هێناوە).

وە هەروەها پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ بەندەیێ موسوڵمان بوو، لەسەر شێوەیەکی جوان بە موسوڵمانەتی ژیا، ئیتر هەرچی گوناهێ لەوەپێش لەکاتی بێ بڕواییدا کردوویەتی، گەورەو بچووکی، خوا لێی خۆش دەبێ، جا لەوەدوا هەرکارێ بکا، لەسەردەمی ئیسلامەتیدا، بەپێی خۆی تۆڵەی هەیە، لەسەر ئەم شێوەیە: چاکە لە یەك بەدەوە، هەتا یەك بەحەوت سەد، هەتا زیاتریش بۆی دەنووسرێ، خراپەیش یەك بە یەك وەك خۆی بۆی دەنووسرێ، مەگەر خودا چاوپۆشی لێ بکاو لەسەری نەنووسێ). (تەجریدی بوخاری بەرگی/١، لاپەڕە: ٥٩، فەرموودەی ژمارە: ٣٩/٤٢).

٦٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « إِنَّ اللَّهَ تَبارَكَ وَتَعَالى تَجَاوَزَ لأُمَّتِي مَا حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا مَا لَمْ يَتَكَلَّمُوا أَوْ يَعْمَلُوا بِـهِ». (م/١/٨١). {الحديث/ ٣٢٧. إيمان. بخاري. عتق: ٢٥٢٨، ٥٢٦٩، ٦٦٦٤}.

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خودای پاكو پیرۆزو گەورە، لەبەرخاتری من چاوپۆشی دەکا لەو خوتوراتو وەسوەسەی کە دێت بە دڵی نەتەوەی ئیسلامی مندا، بەمەرجێ بە کردەوە پیادەی نەکەن، یا بەزمان نەیلێن).

**٤٥) موسوڵمانی تەواو ئەو موسوڵمانەیە کە موسوڵمانان لە زیانی بەدووربن.**

(١٥٩ - ١٦٢). **باب: المُسلِمُ مَنْ سَلِمَ المسلمون منه** (١٤ - ١٥).

٦٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ العَاصِ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) أَنَّ رَجلاً سَأَلَ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أيُّ المسْلِمِينَ خَيْرٌ؟ قَالَ: « مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ». (م/١/٤٨). {الحديث/١٦٠. إيمان. بخاري. إيمان. ١٠، ٦٤٨٤، ١١}.

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاس (ڕەزای خودا لە خۆیو باوکی) فەرمووی: پیاوێ لە پێغەمبەری پرسی: ئەی پێغەمبەری خودا! کام موسوڵمانە زۆر باشە؟ فەرمووی: (ئەو کەسەی کە موسوڵمانان لە زمانو لە دەستی سەلامەت بن).

**٤٦) کردەوەی چاکەی موسوڵمان، هی سەردەمی بێباوەڕیی بڕیاری چییە.** (٣١٩ - ٣٢٢).

**باب: مَنْ عَمِلَ بِرّاً فِي الجَاهِلِيَّةِ ثُمَّ أسْلَمَ.** (٥٤/٥٥).

٧٠- عَنْ عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ أَنَّ حَكِيمَ بْنَ حِزَامٍ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ قَالَ لِرَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (أَرَأَيْتَ أُمُورًا كُنْتُ أَتَحَنَّثُ بِهَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ مِنْ صَدَقَةٍ أَوْ عَتَاقَةٍ أَوْ صِلَةِ رَحِمٍ، أَفِيهَا أَجْرٌ؟ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « أَسْلَمْتَ عَلَى مَا أَسْلَفْتَ مِنْ خَيْرٍ». (م/١/٧٩). {الحديث/٣١٩. إيمان. بخاري. زكاة: ١٤٣٦، ٢٢٢٠، ٢٥٣٨، ٥٩٩٢}.

عوروەی کوڕی زوبەیر فەرمووی: حەکیمی کوڕی حیزام (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی حەزرەتم کرد: قوربان! ئایا ئەو چاکانەی کە لەمەو پێش، لەسەردەمی نەزانی پێش هاتنی ئیسلامدا کردوومن، بە نیازی نزیکبوونەوە لە خودا، وەك خێرکردنو ماڵ بەخشینو کۆیلە ئازادکردنو بەسەرکردنەوەی خزمو خوێشو چاکە کردن لەگەڵ کەسوکار، ئایا پاداشیان هەیە، وە بەکردەوەی چاکە دەژمێررێن بۆم؟ خۆشەویست فەرمووی پێم: (بەڕاستی لەسەر بناغەو پێشینەیەکی باش موسوڵمان بوویت). (بڕوانە: ژمارە: ٦٥ + تەجرید/٢/١١٠، ژمارە: ٦٨٥).

**ڕوونکردنەوە:**

١- ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە کردەوەی باشی کاتی بێباوەڕی، لەپاشس ئیسلامبوون، سوودی هەیە بۆ خاوەنەکەی، هەروەك کردەوەی باشی پێش ڕەسیدە بوون، سوودی هەیە بۆ خاوەنی لەپاش باڵق بوون.

٢- حەكیم برازای حەزرەتی دایكە خەدیجەی هاوسەری پێغەمبەرە (درودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لە خەدیجەو حەكیم بێ)، یەكێ بوو لە بەگزادەكانی قورەیش، ریفادە لە دەستی ئەودا بوو، ریفادە ئەوە بوو: قورەیش لەناو خۆیاندا، هەركەسێ بەپێی توانای خۆی، برێ بەخششی دەدا، هەتا سامانێكی زۆریان كۆكردەوە، جا لەومالە خواردەمەنیو مێووژو خۆشاویان دەكرِی، وە لە رۆژانی حەجدا دەرخواردی خەڵكو حاجیانیان دەدا، حەكیم دەیفەرموو: (سیازدە ساڵ لەپێش ساڵی فیل (عامول فیل)دا، لەدایك بووم، لەبیرم دێ كە عەبدولموتتەلیبی باپیرەی پێغەمبەر، دەیویست بۆ جێبەجێ كردنی نەزرەكەی، عەبدوڵلای كوڕی سەرببڕێو بیكات بە قوربانی، چونكە عەبدولموتتەلیب نەزری كردبوو ئەگەر دە كوڕی ببێ، یەكێكیان بكات بە قوربانی، وە ویستی عەبدوڵلای كوڕی بكات بە قوربانی، دوایی فیدیەی دا، حەكیم لەناو ژووری كەعبەدا لە دایك بووە، لە جاهیلییەتدا سەد ساڵ ژیاوە، لە ئیسلامیشدا شەست ساڵ ژیاوە، شەست كۆیلەی لەسەردەمی نادانی پێش ئیسلامدا ئازاد كردووە، لەسەردەمی ئیسلامدا حەجی كردووە، لە حەجێكا سەد وشتری دیاری بەیتی پێ بوو، كاتێ لە چیای عەرەفە، لە رۆژی عەرەفەدا راوەستا، سەد كۆیلەی هێنا بوو، لەوێ لەگەڵیا راوەستا بوون، لەگەڵیا حەجیان دەكرد، هەر سەدیان یەكی سەرو تەوقی زیوینیان لە گەردندا بوو، بە نەخش لێیان نووسرابوو: ئەمانە ئازادكراوی خودان، لەبەر رەزای خودا، حەكیمی كوڕی حیزام ئازادی كردوون، هەزار سەرپەزیشی كرد بە دیاری (هەدی)ی بەیت).

حیزامی باوكی لە هەراكەی (فجار)دا كوژرا، حەكیم خۆشی ئامادەی ئەم هەرایە بووە، لەپێش بیعثەتدا دۆستی پێغەمبەر بوو، لەدوای بیعثەتیش هەر پێغەمبەری خۆش دەویست، بەڵام درەنگ ئیسلام بوو، یەكێ بوو لە (مسلمة)ی فەتح، واتە: لەو موسوڵمانانەیە كە لە رۆژی ئازادكردنی مەككەدا، بۆ پاراستنی خوێنی خۆیان موسوڵمان بوون، وە زۆرینەی ئەمانە لەدواییدا موسوڵمانی جوانیان لێ دەرچوو، لە رۆژی ئازادكردنی مەككەدا بۆ رێزنان لە حەكیم، پێغەمبەر (درودی

خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ بڕواتە ماڵی حەکیمی کوڕی حیزام، لەسەرو ماڵی خۆی دڵنیابێ).

حەکیم پیاوێکی ژیری ڕێزداری لەخوا ترسی دەوڵەمەند بوو، زۆر بەخشندەو خێرکەر بوو، سەدو بیست ساڵ ژیاوە، ساڵی پەنجاو چوار، لەسەردەمی جێنشینی موعاوییەدا، لە مەدینە، لە ماڵی خۆیدا زایە بوو!!

## ٤٧) هەڕەشەکردن لە گیرۆدە بوون. (٣٧٥).

## بَابٌ: التحذيرُ مِنَ الإبْتِلاَءِ. (٦٧/٦٦).

٧١- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: «أَحْصُوا لِي كَمْ يَلْفِظُ الإِسْلاَمَ». قَالَ: فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَتَخَافُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ مَا بَيْنَ السِّتِ مَائَةٍ إِلَى السَّبْعِ مِائَةٍ، قَالَ: «إِنَّكُمْ لاَ تَدْرُونَ لَعَلَكُمْ أَنْ تُبْتَلَوْا». قَالَ: فَابْتُلِينَا حَتَّى جَعَلَ الرَّجُلُ مِنَّا لاَ يُصَلِّي إِلاَّ سِرًّا. (م/١/٩١). {الحديث/ ٣٧٥. إيمان. بخاري. ٣٠٦٠. تجريد. جهاد/٣/٣٧٠، ژمارە: ١٢٤٧}.

حوزەیفە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوانەی کە موسوڵمان بوون، سەرژمێریان بکەنو ناویانم بۆ بنووسن، تا بزانین ژمارەی موسوڵمانان چەندە؟). فەرمووی: عەرزمان کرد: قوربان! بۆچی مەترسیت لێمان هەیە، کە دوژمن زاڵ بێت بەسەرمانا، وەلحاڵ ژمارەمان لە نێوانی شەش سەد کەس، هەتا حەوت سەد کەس دەبێت؟ واتە: ئێمە لەم لایەنەوە ترسمان لە دوژمن نەماوە. بەڵام فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئێوە نازانن، کێ دەڵێ کە تووشی فەرتەنەو ئاشووب نابنو تووشی تاقیکردنەوەی خواییو ئەزموونی ڕۆژگار نابن!!). فەرمووی: (جاوا گیرۆدە بووینو وا تووش بووین، تەنانەت هەمان بوو بە دزییەوە نوێژی دەکرد!).

**ڕوونکردنەوە:**

١- ئەم فەرموودەیە سەرچاوەیەکی ڕوونە بۆ سەرژمێری شارستانیو سەرژمێریی سوپاییو هەموو سەرژمێرییەکی تری ڕەوای سوود بەخش.

٢- حوزەیفەی کوڕی یەمانی عەبەسی، خۆیو باوکی ئوحودین، واتە: لە غـەزای ئوحوددا بەشدارییان کردووە، باوکی لە غەزای ئوحوددا بەهەڵە بە دەستی هەنـدێ موسوڵمان شـەهیدکرا، حوزەیفـە یەکێـکە لـە هـاوڕێ هـەرە مەزنـەکانی پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) لە غەزای خەندەقا رۆڵێکی جوانی هـەبوو، پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) ناردی سووسەی هەواڵی سوپای دوژمنی بۆ بکا، موژدەی هێنایەوە کە سوپای دوژمـن بـە نائومێـدی بـەرەودوا کشاونەتەوە. فـەرموودەی زۆری لـە پێغەمبـەرەوە گێڕاوەتــەوە، بیست فـەرموودەی لـە بوخـاری شـەریفا هەیـە، بیسـتو نـۆی لـە صەحیحی موسلیما هەیە، دوازدەیان پەسەندی هەردوو لایانن، کۆی فـەرموودەکانی لە صەحیحەینا: ١٢ + ٨ + ١٧ = ٣٧. ناودارە بە رازگری پێغەمبەر (صـاحب سِرِّ رَسُـولُ اللهِ). کاتێ یەکێ دەمرد ئیمامی عومەر سەرنجی دەدا ئەگەر حوزەیفە ئامادەی سەر تەرمەکەی نەبوایە ئەویش ئامـادەی نـەدەبوو، چـونکە پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) نـاوی گشـت ناپاکـەکانی (منـافق)ەکـانی پـێ گوتبـوو، یـەك بەیـەکیانی دەناسـی، لـە غەزای نەهاوەندا ئامادە بوو، کە سوپا سالاری موسوڵمانان: نوعمانی کوڕی مـوقرین شـەهید بـوو، حوزەیفـە ئاڵاکـەی هەڵـگرتو هەمـەدانو رەییـیو دینـەوەر، لەسـەر دەسـتی ئـەودا ئـازاد کـران، لـە بیسـتو دووی کۆچـیدا، عومـەر کـردی بەسـەرکاری سەرمەدائین، لـە (٣٦)ی کۆچـیدا لـەپاش چـل رۆژ لـە جێنشـینی عـەلی لـە مـەدائین مرد، صەفوانو سەعیدی کوڕی لە یارانی عەلی بوون، لە صەفین شەهید بـووون، لـە حوززەیفە پرسیار کرا: چی ئاژاوەیەك زۆر کوشندەیە؟ فەرمووی: (ئەوەی کە ببێت بەسـەر پشـك لـەنێوانی خێـرو شـەڕدا، وا سـەرت لێ شـێوابێ نـەزانی کامـەیان هەڵبژێری!) دەیشی فـەرموو: (قیامـەت هەڵناسـێ هـەتا گشـت هـۆزێ، ناپاکـەکانیان دەبن بـە ئاغـاو سـەرۆکیان!) وە دەیفـەرمووو: (ئـەوەی بـووەو ئـەوەی دەبـێ، هـەتا قیامەت هەڵدەستێ، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەمووی پێ گووتووم!). حوززەیفە دەیفـەرموو: (پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) خـۆمی کـرد بەسـەر پشـك لـە نێـوانی کۆچـکردنو یاریـدەدانی پێغەمبــەر، یاریـدەدانم هەڵبــژارد، حوزەیفـە ئامـادەی

سەرکەوتنەکانی عێراق بوو، وە گەلێ شوێنەواری ناوداری لەوێ هەیە). (بڕوانە: تەجریدی بوخاری بەرگی/١، لاپەڕە: ١٨٤ + إصابە واستیعاب، ناوی حوزەیفەی کوڕی یەمان + تاج/٥، لاپەڕە: ١٨٨، ژمارە: ١ و ژمارە: ٢ =تاج-٣ ز-٥٥ ژ-٣٤٩٢ هەتا ٣٤٩٣ چ-٤).

**٤٨) ئیسلام لەسەرەتاوە غەریب بوو، هاکا بووەوە بە غەریب سەرەنجام ئیسلام دەکشێتەوە بۆ نێوانی دوو مزگەوتەکە.** (٣٦٧ - ٣٧٢).

**بابٌ: بَدأَ الإسلامُ غريباً وَسَيَعُودُ غريباً كَمَا بَدأَ وَهُوَ يأرِزُ بَيْنَ المَسْجِدَيْنِ.**

٧٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « إِنَّ الإِسْلاَمَ بَدأَ غَرِيبًا وَسَيَعُودُ غَرِيبًا كَمَا بَدأَ، وَهُوَ يَأْرِزُ بَيْنَ الْمَسْجِدَيْنِ، كَمَا تَأْرِزُ الْحَيَّةُ فِي جُحْرِهَا ». (م/١/٩). {الحديث/٣٧١. إيمان. بخاري. فضائل المدينة: ١٨٧٦}.

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئیسلام لە سەرەتاوە غەریب بوو، بە تاك و تەرا دەستی پێکرد، موسوڵمان لەناو کۆمەڵا وەك ئاوارەو نامۆ وابوو، هەتا بەرە بەرە پەرەی سەندو سەرکەوت و بوو بەزۆرینە، بەڵام هاکا غەریب کەوتەوەو بووەوە بەتاك و تەرا لەناو کۆمەڵا، وەك یەکەم جار. ڕۆژێ دێ وەکوو چۆن مار لە کونەکەی بۆ ملوو مووش دەردەچێ، بەڵام کە مەترسییەکی بوو، دەخزێتەوە ناو کونی خۆی و پەپکەی تیا دەخوات، لەبەر بێ دەرەتانی، ئیسلامەتیش (بەتایبەتی لە ئاخر زەمانا) ئاوەها تەنگی پێ هەڵدەچنرێ و، ئاوەها دەکشێتەوە بۆناو مەدینەو بۆ نێوانی دوو مزگەوتەکەی پێغەمبەر لە مەدینەو مزگەوتی حەرام لە مەککەو، لەم نێوانەدا گرمۆڵەی تیا دەخوات!).

**٤٩) لەسەرەتاوە سرووش (وەحی) چۆن دەهات بۆ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ).
(م/١/٩٠) {٤٠١ - ٤٠٨}.

**بابُ: مَابُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنَ الوَحْيِ.** (٧٢/٧٣).

٧٣- عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ أَنَّ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها) زَوْجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ أَوَّلُ مَا بُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنَ الْوَحْيِ الرُّؤْيَا الصَّادِقَةُ فِي النَّوْمِ، فَكَانَ لاَ يَرَى رُؤْيَا إِلاَّ جَاءَتْ مِثْلَ فَلَقِ الصُّبْحِ، ثُمَّ حُبِّبَ

إِلَيْهِ الْخلاَءُ، فَكَانَ يَخْلُو بِغَارِ حِرَاءٍ يَتحَنَّثُ فِيهِ (وَهُوَ التَّعَبُّدُ) اللَّيَالِيَ أُلاَتِ الْعَدَدِ قَبْلَ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى أَهْلِهِ. وَيَتَزَوَّدُ لِذَلِكَ، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى خَدِيجَةَ فَيَتَزَوَّدُ لِمِثْلِهَا. حَتَّى فَجِئَهُ الْحَقُّ وَهُوَ فِي غَارِ حِرَاءٍ، فَجَاءَهُ الْمَلَكُ فَقَالَ: اقْرَأْ، قَالَ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ، قَالَ: فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ: اقْرَأْ، قُلْتُ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ، فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّانِيَةَ، حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي، فَقَالَ: اقْرَأْ، فَقُلْتُ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ، قَالَ: فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّالِثَةَ، حَتَّى بَلَغَ مِنِّي، ثُمَّ أَرْسَلَنِي، فَقَالَ: ( اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ. خَلَقَ الإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ. اقْرَأْ وَرَبُّكَ الأَكْرَمُ. الَّذِي عَلَّمَ بِالقلَمِ. عَلَّمَ الإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ». فَرَجَعَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَرْجُفُ بَوَادِرُهُ، حَتَّى دَخَلَ عَلَى خَدِيجَةَ فَقَالَ « زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي». فَزَمَّلُوهُ حَتَّى ذَهَبَ عَنْهُ الرَّوْعُ، ثُمَّ قَالَ لِخَدِيجَةَ: (أَيْ خَدِيجَةُ مَالِي؟) وَأَخْبَرَهَا الْخَبَرَ، قَالَ: « لَقَدْ خَشِيتُ عَلَى نَفْسِي». فَقَالَتْ لَهُ خَدِيجَةُ: كَلاَّ، أَبْشِرْ فَوَاللَّهِ لاَ يُخْزِيكَ اللَّهُ أَبَدًا، إِنَّكَ لَتَصِلُ الرَّحِمَ، وَتَصْدُقُ الحَدِيثَ، وَتَحْمِلُ الْكَلَّ وَتَكْسِبُ الْمَعْدُومَ، وَتَقْرِي الضَّيْفَ، وَتُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الْحَقِّ، فَانْطَلَقَتْ بِهِ خَدِيجَةُ حَتَّى أَتَتْ بِهِ وَرَقَةَ بْنَ نَوْفَلِ بْنِ أَسَدِ بْنِ عَبْدِ الْعُزَّى وَهُوَ ابْنَ عَمّ خَدِيجَةَ أَخِي أَبِيهَا وَكَانَ امْرَأً تَنَصَّرَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَكَانَ يَكْتُبُ الْكِتَابَ العَرَبِيَّ، وَيَكْتُبُ فِي الإِنْجِيلِ بِالعَرَبِيَّةِ مَا شَاءَ اللَّهُ تَعَالى أَنْ يَكْتُبَ، وَكَانَ شَيْخًا كَبِيرًا قَدْ عَمِيَ، فَقَالَتْ لَهُ خَدِيجَةُ: أَيْ عَمّ. اسْمَعْ مِنَ ابْنِ أَخِيكَ. قَالَ وَرَقَةُ: يَا ابْنَ أَخِي مَاذَا تَرَى؟ فَأَخْبَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَبَرَ مَا رَأَى، فَقَالَ لَهُ: هَذَا النَّامُوسُ الَّذِي نَزَّلَ عَلَى مُوسَى بْنِ عِمْرَانَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَا لَيْتَنِي فِيهَا جَذَعًا، لَيْتَنِي أَكُونُ حَيًّا حِينَ يُخْرِجُكَ قَوْمُكَ. قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَوَمُخْرِجِيَّ هُمْ؟». قَالَ وَرَقَةُ: نَعَمْ، لَمْ يَأْتِ رَجُلٌ قَطُّ بِمَا جِئْتَ بِهِ إِلاَّ عُودِيَ، وَإِنْ يُدْرِكْنِي يَوْمُكَ أَنْصُرْكَ نَصْرًا مُؤَزَّرًا). (م/١/٩٧ - ٩٨).

**عوروەی کوڕی زوبەیر (بڕوانە: تەجریدی بوخاری ب/٢، لاپەڕە: ٢٠٣ = ژمارە: ١٦٤٣/٧٨٤) فەرمووی: عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لە عائیشە بێ) کە پووری من بوو، فەرمووی: لە سەرەتاوە کە سرووش (وەحی = نیگا) دەستی پێکرد بۆ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **خەونی باش بوو، پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **هەر خەونێکی دەدی، بە وێنەی شەبەقی**

بەیان دەهاتە دی، لەپاشا بەرە بەرە حەزی لە تەنهایی‌و گۆشە گیری‌و خەڵوەکێشان بوو، جا دەست دەکا بە خەڵوەکێشان لە ئەشکەوتی حیراءدا، وە لەوێ هەموو جارێ چەند شەوێ بە ژمارە دەمایەوەو لێ دەبڕا بۆ خوا (واتە: خوا پەرستی‌و پەرستشی دەکرد) وە لەو ماوەیەدا تاسەو ئەڵهای کەسوکاری نەدەکردو نەدەچووەوە بۆ لایان، وە بۆ ئەمەیش توێشەی لەگەڵ خۆیا دەبرد، ئەوجا دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە بۆ لای خەدیجەی هاوسەری‌و سەرلەنوێ توێشەی ئەوەندەی تریشی دەکردەوەو دەگەڕایەوە بۆ ئەشکەوتەکە، جا ئاوا هەتا ماوەیێ لەسەر ئەم حاڵە دەوامی کرد، بەتایبەتی لە مانگی رەمەزانا، هەتا لەپڕ، لەناکاو، لە ئەشکەوتی حیراءدا، بەم شێوەیە سرووش (وەحی)ی بۆهات، فریشتەکە هاتە خزمەتی‌و پێی دەفەرموێ: بخوێنە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: گوتم: مـن خوێندەوار نـیم، ئیتر چۆن بخوێنم، جا جوبرائیل گرتمی‌و گوشیمی بە سنگی خۆیەوە، هەتا هێزی لێ بڕیم، ئەوجا بەریدامو فەرمووی: بخوێنە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: گوتم: چی بخوێنم خۆ من خوێندەوار نیم، دیسانەوە گرتمی‌و گوشیمیەوە بە خۆیەوە هەتا وزەم لێ بڕاو تەواو شەکەت بووم، دیسان بەری دامەوەو فەرموویەوە: بخوێنە، گوتمەوە: من خوێنەوار نیم، دیسانەوە بۆ جاری سێیەم گرتمی‌و گوشیمی بە خۆیەوە تا تاقەتم لێ برا، ئەوجا بەری دامەوەو فەرمووی: ({اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ، خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ، اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ} بخوێنە بە یارمەتی‌و پیرۆزی ناوی پەروەردگاری خۆتەوە، کە هەموو شتێ ئەو دروستی کردووە، مرۆڤی دروستکردووە لە تنۆکی خوێن‌و لە پارچەیێ خوێنپارە، کە لە تنۆکێ تۆمەوە پەیدا دەبێ، بخوێنەو بزانە کە خودای تۆ خودایەکی وایە کە لە هەموو کەسێ بەخشندە ترە).

ئەنجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم ئایەتانەوە ددەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوەو سام دای دەگرێ‌و دڵی دەلەرزێ‌و تەپڕیزەی دەلەرزێ‌و دەڕواتەوە بۆلای خەدیجەی کچی خووەیلید، کە یەکەم ژنی بوو، دەفەرموێ: دامپۆشن، دامپۆشن، ئەوانیش دای دەپۆشن، تا ترس‌و سامەکەی دەنیشێتەوە، ئەوجا ئەم باسە دەگێڕێتەوە بۆ

خەدیجەو دەفەرموێ: بەخودا مەترسیم لەخۆم کرد کە بمرم ئەوەندە سامێ گرانم لێ نیشت، خەدیجەیش (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: دووربا شتی وا مەفەرموو، بەڵکو بە پێچەوانەوە موژدەت لێ بێ، بەخودا هەرگیز خودا شتی وا ناکاو تۆ ریسوا ناکا، چونکە بەهرەوەری تۆ بێ وێنەیە، تۆ پیاوێکی خزم دۆستیو، خزمەتی خزمو خوێش دەکەیتو راستگۆو قسە راستیت، پیاوی کۆڵیو دەسەوسان دەگریتە مل خۆتو باری ئازاری خەڵك دەخەیتە سەرشانی خۆتو داڵدەی بێ نەواو هەژارانیتو خاوەن نانو دیوەخانیتو شتی وا چاك دەبەخشیت، بە هەموو کەسێ نابەخشرێو میوانداری بە میوان دەکەییو یاریدەی لێقەوماوان دەدەی، یارمەتی مەردووم دەدەیو بە کورتیو پوختی: پیاوەتیو چاکەو کۆمەکیت کردووە بە پیشەو بە ئەرکی سەر شانی خۆت. ئەوجا خەدیجە لە خزمەتیدا دەچێ بۆلای وەرەقەی کوڕی نەوفەلی کوڕی ئەسەدی کوڕی عەبدول عوززا، کە ئامۆزای خەدیجەی کچی خووەیلیدی کوڕی ئەسەدی کوڕی عەبددولعوززا بوو، چونکە نەوفەلی باوکی وەرەقە برای خووەیلیدی باوکی خەدیجە بوو، وە ئەم وەرەقەیە لەسەردەمی نەزانیدا بوو بوو بە مەسیحی، وە نووسینی عەرەبیو عیبرانی دەزانی، ئەوەندەی ویستی خودای لەسەربێ، ئینجیلی بە عەرەبیو بە عیبری دەنووسی، خۆی پیرە مێردێکی ئیختیار بوو کوێر بوو بوو، جا خەدیجە پێی دەڵێ: ئامۆزا! گوێ لە برازاکەت بگرە بزانە دەڵێ چی، وەرەقەش دەڵێ: ئەی کوڕی برام! ئادەی پێم بڵێ چی دەبینیت؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) چی دیبوو بۆیگێڕایەوە، وەرەقە پێی دەڵێ: ئەمە هەمان فریشتەیە کە ئەمیندارو پیرۆزە، کە لەکاتی خۆیا خوای گەورە ناردبووی بە پەیامی ئاسمانییەوە بۆلای موسای کوڕی عیمران (دروودو سڵاوی خوای لەسەر بێ)، هەروا بۆلای عیسای کوڕی مەریەم (دروودو سڵاوی خودای گەورەی لەسەر بێ) ئەوە جوبرائیلە ئەمینداری سرووشە (أمين الوحی) ناسراوە لەناو خاوەن نامەکانا بە ناموسی ئەکبەر، واتە: رازگری هەرە گەورە، لە بابەتی خێرو چاکەدا، خۆزگەم لەکاتی ئاشکرابوونی پێغەمبەرایەتی تۆدا من جەهێڵ دەبووەمو هەڕەتی لاویم دەبوو، خۆزگەم ئەو سەردەمە من دەمام، بریا

نەدەمردم، تا ئەو ڕۆژگارەی کە گەلەکەت لە مەککە دەتکەنە دەرەوە، هەتا باشترین کۆمەکی‌و یارمەتیم بدایتایە. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: بۆچی خزمانی من شتی وا دەکەن‌و لە مەککەی زێدی خۆم دەمکەنە دەرەوە؟ وەرەقە دەڵێ: بەڵێ، چونکە هەر پیاوێك داوایەکی وەکوو ئەم داوا ڕەوایەی تۆی هێنابێ، مسۆگەر گێچەڵیان پێ کردووەو دوژمنایەتیان تێ بەستووە، ئەگەر من فریای ئەو ڕۆژە پیرۆزەت دەکەوتم، کە بانگەوازەکەت ئاشکرا دەکەی، یارمەتییەکی زۆر باشم دەدای!

ئیتر وەرەقە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) ئەوەندەی نەبرد کە مردو بە ڕەحمەتی خودا بوو، ئیتر لەدوا ئەمجارە هەتا ماوەی سێ ساڵ سرووش (وەحی = نیگا) وەستاو کپ بوو، لەو ماوەیەدا جوبرائیل نەهاتەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)}.
(تاج/٤، لاپەڕە: ٢٩١ = تاج-٣ ل-٤٣٤ ز-٩٨ ژ-٣١٤٧ چ-٤).

**ڕوونکردنەوە:**

خەدیجەی کچی خووەیلید (ڕەزای خودای لێ بێ) یەکەم هاوسەری پێغەمبەر بوو، لە پشتەوە بە چوار پشت دەگاتەوە بە پێغەمبەر، بە پێی نژادو ڕەگەزو خزمایەتی نزیکترین ژنیەتی لێیەوە، لەسەر ڕای جەماوەر، تەمەنی پێغەمبەر، بیست‌و پێنج ساڵ بووە، کە خەدیجەی هێناوە، خەدیجەیش تەمەنی چل ساڵ بووە، خووەیلیدی باوکی لێی مارەکرد، لەپێشدا ژنی ئەبوهالە بوو، لەپاش ئەو شووی کرد بە عەتیقی کوڕی عائیز، پاش ئەو شووی کرد بە پێغەمبەر، وە لەلای پێغەمبەر ما هەتا مرد، بەر لە پازدە ساڵ لە پێغەمبەرایەتی شووی کرد بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ژنێکی دارای دەوڵەمەندی جوانی خانەدان بوو، یەکەم کەس بووە کە ئیسلام بووە، زۆر زۆر دڵنەوایی پێغەمبەری دەکرد، دڵی دەدایەوە، هانی دەدا لەسەر خۆگری‌و تێکۆشان‌و پەخشی داواکەی، هەمیشە پشتیوانێکی جوان بوو بۆ پێغەمبەر، لەم لایەنەوە ئەو سەردەمەی پێغەمبەر لە ئەشکەوتی حیراء، لەپێش سەردەمی

پێغەمبەرایەتی، خەڵوەی دەکێشاو خوا پەرستی لەسەر ئایینی ئیبراهیم دەکرد، خەدیجە نانو ئاوی بۆ دەبرد.

دەڵێن: پازدە ساڵ لە پێغەمبەر گەورەتر بووە، لە تەمەنی چل ساڵیدا، شووی پێکردووە، هەموو منداڵەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەبێ راجیانی لە خەدیجەن، بێجگە لە دوا منالی، کە ئیبراهیمە، کە لە ماریەی قیبطییە بوو، کە کەنیزی پێغەمبەر بوو، کە مقوقس پادشای ئەسکەندەرییە، لە ساڵی حەوتی کۆچیدا بە دیاری ناردی بۆ پێغەمبەر، لەگەڵ خوشکێکیا کە ناوی شیرین بوو، لەگەڵ برایەکیانا کە کۆیلە بوو، ئیختیارێ بوو، ناوی مەئبوور بوو، ماریەو خوشکەکەی هەر لەسەرەتاوە ئیسلام بوون، بەڵام براکەی پاش ماوەیێ لە مەدینە لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیا موسوڵمان بوو، ماریە ما هەتا سەردەمی جێنشینی عومەر، ئەبوبەکرو عومەر ژێوار (نەفەق)یان بۆ بڕیبۆوە، لەمانگی موحەررەمی ساڵی شازدەی کۆچی، ماریە فەرمانی هەقی بەجێهێنا، لە مەدینە مرد، عومەر خۆی خەڵکی کۆدەکردەوە کە ئامادەی سەر تەرمەکەی بن، وە خۆی نوێژی مردووی لەسەر کرد، وە لە گۆڕستانی بەقیع کەوا لە پاڵ مزگەوتەکەی پێغەمبەردا لە مەدینە، بەخاك سپێردرا، ئیبنو مەندە دەڵێ: ماریە بە پێنج ساڵ پاش پێغەمبەر وەفاتی کردووە.

خەدیجە بیستو چوار ساڵ لەگەڵ پێغەمبەردا ژیاوە، بەکۆی دەنگ پێغەمبەر لە خەدیجە چوار کچی بووە، کە هەر چواریان ئیسلام بوونو کۆچیان کردووە لەگەڵیا، لە مەککەوە بۆ مەدینە، کە فاطیمەو زەینەبو روقیەو ئوم کەلثووم بوون، بە کۆی دەنگ کوڕێکیشی لێ بووە ناوی قاسم بووە، لەبەرئەوە بە پێغەمبەریان دەگوت: ئەبولقاسم، واتە: باوکی قاسم.

هەتا خەدیجە لە ژیانا بوو، پێغەمبەر ژنی تری نەهێناوە، لەپێش کۆچدا بە سێ ساڵ کۆچی دوایی کردووە، لە مانگی رەمەزانا، لە مەککە وەفاتی کردووە، لەپێش فەرزبوونی نوێژدا، بەر لەپەیدابوونی کردنی نوێژی مردوو، لەسەر تەرم، تەمەنی شەستو پێنج ساڵ بوو، لە مەککە لە حەجوون نێژراوە، دەڵێن: مەرگی

خەدیجە لەپاش مەرگی ئەبو طالیب بەسێ ڕۆژ بووە، پێغەمبەر خۆی چووە ناو گۆڕەکەیی‌و دایهێڵایە ناو گۆڕەکەیەوە، گۆڕەکەی هەتا ئێستا لە مەککە ماوە، بە خزمەت گۆڕی پیرۆزی گەیشتووم، وا بەقەد لاپاڵێکەوە، گۆڕستانەکە ناوی گۆڕستانی خەدیجەی کوبرایە، گۆڕەکەی تائێستا دەناسرێ.

فەرموودەیەکی زۆر سەبارەت بە فەزل‌و بەهرەمەندیی خاتوو خەدیجە هەیە. (بڕوانە: تەجریدی بوخاری ژمارە: ١٥٠٠، ١٤٩٩، ١٤٩٨، ١٤٦٢، ٦١٦. هەروا بڕوانە: تاج/٥، لاپەڕە: ١٤٩، زنجیرە: ٣٦، ژمارە: ١، ٢، ٣، ٤، ٥ —تاج-٣ ژ-٣٤٢٥ هەتا ٣٤٢٩ + تاج/٤، لاپەڕە: ٢٩١).

٧٤- عَنْ يَحْيَى قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا سَلَمَةَ: أَيُّ الْقُرْآنِ أُنْزِلَ قَبْلُ؟ قَالَ: (يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ) فَقُلْتُ: أَوِ (اقْرَأْ)؟ فَقَالَ: سَأَلْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ: أَيُّ الْقُرْآنِ أُنْزِلَ قَبْلُ؟ قَالَ: (يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ)، فَقُلْتُ: أَوِ (اقْرَأْ). قَالَ: جَابِرٌ: أُحَدِّثُكُمْ مَا حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « جَاوَرْتُ بِحِرَاءٍ شَهْرًا، فَلَمَّا قَضَيْتُ جِوَارِي نَزَلْتُ فَاسْتَبْطَنْتُ بَطْنَ الْوَادِي فَنُودِيتُ، فَنَظَرْتُ أَمَامِي وَخَلْفِي وَعَنْ يَمِينِي وَعَنْ شِمَالِي فَلَمْ أَرَ أَحَدًا، ثُمَّ نُودِيتُ، فَلَمْ أَرَ أَحَدًا، ثُمَّ نُودِيتُ، فَرَفَعْتُ رَأْسِي فَإِذَا هُوَ عَلَى الْعَرْشِ فِي الْهَوَاءِ، يَعْنِي جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَّلَامُ، فَأَخَذَتْنِي مِنْهُ رَجْفَةٌ شَدِيدَةٌ، فَأَتَيْتُ خَدِيجَةَ فَقُلْتُ: دَثِّرُونِي، فَدَثَّرُونِي، فَصَبُّوا عَلَيَّ مَاءً، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ( يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ. قُمْ فَأَنْذِرْ. وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ. وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ. وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ». (م/١/٩٩). {الحديث/ ٤٠٧. إيمان. بخاري. بدء الوحي: ٤ (٣) ٣٢٣٨، ٤٩٢٢، ٤٩٢٣، ٤٩٢٤، ٤٩٢٥، ٤٩٢٦، ٤٩٥٤، ٦٢١٤ (٤٩٥٣)}.

یەحیا فەرمووی: لە ئەبو سەلەمەم پرسی: (کامەی قورئان یەکەمجار دابەزی‌و هاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر؟). فەرمووی: سوورەتی {يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ}. گوتم: ئەی وا مەشهوورە کە سەرەتای سوورەتی عەلەق یەکەمجار هاتۆتە خوارەوە، کەبە (اقْرَأْ) دەست پێ دەکا؟ فەرمووی: من لەم بارەیەوە پرسیارم لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵا کرد: کامەی قورئان یەکەمجار دابەزی‌و هاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر؟ فەرمووی: {يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ} منیش گوتم: ئەی وا بەناوبانگە کە (اقْرَأْ) یەکەم قورئانی دابەزیوە؟

جابیر فەرمووی: مـن ئـەوەتان بـۆ دەڵـێم کـە پێغەمبـەر باسـی کـردووە بـۆ ئێمـە، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ماوەی مانگێ لە ئەشکەوتی حیرادا خەڵوەم دەکێشا بـە تاقی تەنیاو خوا پەرستیم دەکرد، کاتێ خەڵوەکەمم تەواو کرد لە چیاکە دابـەزیم، تا گەیشتمە ناو شیوەکە، ئەوەندەم زانی یەکێ بـانگم دەکـا، منـیش سـەیری ئـەملاو لاو بەردەمو پشتو راستو چەپی خۆمم کـرد کەچـی کەسـم نـەدی، دیسـان یـەکێ بانگی لێ کردمەوە، کە تەماشـام کـردەوە دیسـان کەسـم نـەدی، هەمدیسـانەوە یـەکێ بانگی لێ کردمەوە، ئەمجارە کە سەرم بەرزکردەوە تەماشام کرد وا جوبرائیل لەسەر بارەگاو تەختێکە وا بە حەواوە! ئیتر لەرزێـکی واگـران دایگـرتم نەبێتـەوە، بـەدەم ئەو لەرزەوە چوومەوە بۆلای خەدیجەو گـوتم: دامپۆشـن، ئـەوانیش دایـان پۆشـیمو هەندێ ئاویان پیادا کردم، ئینجا خـودای گـەورەو سـەروەر ئەمـەی نـاردە خـوارەوە: {يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ، قُمْ فَأَنذِرْ، وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ، وَثِيَابَكَ فَطَهِّـرْ}. (تـاج/٤، لاپـەڕە: ٢٩٥، زنجیـرە: ٩٨، ژمارە: ٣ = تاج-٣ ژ-٣١٤٩ ل-٤٣٨ چ-٤).

## ٥٠) هاتنی سرووش بەزۆریو خۆش خۆش هاتنی (٧٤٣٩ - ٧٤٧٩).

## بابٌ: فِي كَثْرَةِ الوَحْيِ وتتابُعِه (١/٠٠٠).

٧٥- عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ تَابَعَ الْـوَحْيَ عَلَـى رَسُـولِهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَبْلَ وَفَاتِهِ حَتَّى تَوَفِّيَ، وَأَكْثَرَ مَا كَانَ الْوَحْيُ يَوْمَ تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). (م/٨/٢٣٨). {الحديث/ ٧٤٤٠. إيمان. بخاري. فضـائِلُ القـرآن: ٤٩٨٢}.

ئەنەسی کوڕی مالیـك (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: خـودای گـەورەو سـەروەر، بـەر لەکۆچکردنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئەو دونیا، پەیتا پەیتاو خۆش خـۆش، سروشی بۆ دەنارد، تەنانەت کاتێ کە گیانی پاکی سپارد، سرووش (وەحی) لـەجاران گەرمتر دەهاتە خوارێ. ئیتر لەپاشان ئەوەندەی نەخایانـد کـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەمری خودای کرد.

## ٥١) باسی شەوڕەوی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئاسمانەکانو باسی فەرزبوونی پێنج نوێژە فەرزەکان (٤٠٩ - ٤٢٩).

**بابٌ: الإِسْرَاءُ بِالنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى السَّموَاتِ وَفَرْضُ الصَّلَوَاتِ (٧٣/٧٤)**

٧٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « أُتِيتُ بِالْبُرَاقِ وَهُوَ دَابَّةٌ أَبْيَضُ طَوِيلٌ فَوْقَ الْحِمَارِ، وَدُونَ الْبَغْلِ. يَضَعُ حَافِرَهُ عِنْدَ مُنْتَهَى طَرْفِهِ، قَالَ: فَرَكِبْتُهُ حَتَّى أَتَيْتُ بَيْتَ الْمَقْدِسِ فَرَبَطْتُهُ بِالْحَلْقَةِ الَّتِى يَرْبِطُ بِهَا الأَنْبِيَاءُ. قَالَ: ثُمَّ دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ، فَصَلَّيْتُ فِيهِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ خَرَجْتُ فَجَاءَنِى جِبْرِيلُ (عَلَيْهِ السَّلاَمُ) بِإِنَاءٍ مِنْ خَمْرٍ، وَإِنَاءٍ مِنْ لَبَنٍ، فَاخْتَرْتُ اللَّبَنَ، فَقَالَ جِبْرِيلُ (عليه السلام): اخْتَرْتَ الْفِطْرَةَ. قَالَ: ثُمَّ عَرَجَ بِنَا إِلَى السَّمَاءِ فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ. فَقِيلَ لَهُ: مَنْ أَنْتَ؟ قَالَ: جِبْرِيلُ، قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ، قِيلَ: وَقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: قَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ، فَفُتِحَ لَنَا فَإِذَا أَنَا بِآدَمَ فَرَحَّبَ بِى وَدَعَا لِى بِخَيْرٍ، ثُمَّ عَرَجَ بِنَا إِلَى السَّمَاءِ الثَّانِيَةِ، فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلاَمُ فَقِيلَ: مَنْ أَنْتَ؟ قَالَ: جِبْرِيلُ. قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ. قِيلَ: وَقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: قَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ، قَالَ: فَفُتِحَ لَنَا. فَإِذَا أَنَا بِابْنَى الْخَالَةِ: عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَيَحْيَى بْنِ زَكَرِيَّا، فَرَحَّبَا بِي وَدَعَوَا لِى بِخَيْرٍ، ثُمَّ عَرَجَ بِنَا إِلَى السَّمَاءِ الثَّالِثَةِ، فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ، فَقِيلَ: مَنْ أَنْتَ؟ قَالَ: جِبْرِيلُ. قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ، قِيلَ: وَقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: قَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ. فَفُتِحَ لَنَا فَإِذَا أَنَا بِيُوسُفَ، فَإِذَا هُوَ قَدْ أُعْطِىَ شَطْرَ الْحُسْنِ، قَالَ: فَرَحَّبَ بِي، وَدَعَا لِى بِخَيْرٍ. ثُمَّ عَرَجَ بِنَا إِلَى السَّمَاءِ الرَّابِعَةِ، فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ، فَقِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ. قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ. قيلَ: وَقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: قَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ، فَفُتِحَ لَنَا، فَإِذَا أَنَا بِإِدْرِيسَ فَرَحَّبَ وَدَعَا لِى بِخَيْرٍ، قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (وَرَفَعْنَاهُ مَكَانًا عَلِيًّا). ثُمَّ عَرَجَ بِنَا إِلَى السَّمَاءِ الْخَامِسَةِ، فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ، قِيلَ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالَ: جِبْرِيلُ، قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ. قِيلَ: وَقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: قَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ، فَفُتِحَ لَنَا، فَإِذَا أَنَا بِهَارُونَ، فَرَحَّبَ وَدَعَا لِى بِخَيْرٍ. ثُمَّ عَرَجَ بِنَا إِلَى السَّمَاءِ السَّادِسَةِ،، فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ، قِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ. قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ، قِيلَ: وَقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: قَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ، فَفُتِحَ لَنَا فَإِذَا أَنَا بِمُوسَى، فَرَحَّبَ بِي، وَدَعَا لِى بِخَيْرٍ. ثُمَّ عَرَجَ بِنَا إِلَى السَّمَاءِ السَّابِعَةِ، فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ، فَقِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ، قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ، قِيلَ: وَقَدْ

بُعِثَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: قَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ، فَفُتِحَ لَنَا، فَإِذَا أَنَا بِإِبْرَاهِيمَ مُسْنِدًا ظَهْرَهُ إِلَى الْبَيْتِ الْمَعْمُورِ، وَإِذَا هُوَ يَدْخُلُهُ كُلَّ يَوْمٍ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ، لاَ يَعُودُونَ إِلَيْهِ، ثُمَّ ذَهَبَ بِي إِلَى السِّدْرَةِ الْمُنْتَهَى، وَإِذَا وَرَقُهَا كَآذَانِ الْفِيَلَةِ، وَإِذَا ثَمَرُهَا كَالْقِلاَلِ، قَالَ: فَلَمَّا غَشِيَهَا مِنْ أَمْرِ اللَّهِ مَا غَشِيَ تَغَيَّرَتْ، فَمَا أَحَدٌ مِنْ خَلْقِ اللَّهِ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَنْعَتَهَا مِنْ حُسْنِهَا، فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَيَّ مَا أَوْحَى، فَفَرَضَ عَلَيَّ خَمْسِينَ صَلاَةً فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، فَنَزَلْتُ إِلَى مُوسَى (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَ: مَا فَرَضَ رَبُّكَ عَلَى أُمَّتِكَ؟ قُلْتُ: خَمْسِينَ صَلاَةً، قَالَ: ارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ فَاسْأَلْهُ التَّخْفِيفَ، فَإِنَّ أُمَّتَكَ لاَ يُطِيقُونَ ذَلِكَ، فَإِنِّي قَدْ بَلَوْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَخَبَرْتُهُمْ، قَالَ: فَرَجَعْتُ إِلَى رَبِّي فَقُلْتُ: يَا رَبِّ خَفِّفْ عَلَى أُمَّتِي، فَحَطَّ عَنِّي خَمْسًا، فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسَى، فَقُلْتُ: حَطَّ عَنِّي خَمْسًا، قَالَ: إِنَّ أُمَّتَكَ لاَ يُطِيقُونَ ذَلِكَ، فَارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ فَاسْأَلْهُ التَّخْفِيفَ، قَالَ: فَلَمْ أَزَلْ أَرْجِعُ بَيْنَ رَبِّي وَبَيْنَ مُوسَى (عَلَيْهِ السَّلاَمُ) حَتَّى قَالَ: يَا مُحَمَّدُ إِنَّهُنَّ خَمْسُ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، لِكُلِّ صَلاَةٍ عَشْرٌ، فَذَلِكَ خَمْسُونَ صَلاَةً، وَمَنْ هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كُتِبَتْ لَهُ حَسَنَةً، فَإِنْ عَمِلَهَا كُتِبَتْ لَهُ عَشْرًا، وَمَنْ هَمَّ بِسَيِّئَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا لَمْ تُكْتَبْ شَيْئًا، فَإِنْ عَمِلَهَا كُتِبَتْ سَيِّئَةً وَاحِدَةً، قَالَ: فَنَزَلْتُ حَتَّى انْتَهَيْتُ إِلَى مُوسَى فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: ارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ فَاسْأَلْهُ التَّخْفِيفَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): فَقُلْتُ قَدْ رَجَعْتُ إِلَى رَبِّي حَتَّى اسْتَحْيَيْتُ مِنْهُ». (م/١/٩٩-١٠٠). {الحديث/ ٤٠٩. إيمان. بخاري. بدْءُ الخَلْقِ: ٣٢٠٧، ٣٣٩٣، ٣٤٣٠، ٣٨٨٧، ٣٤٩٢}.

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای گەورەی لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: شەوی ئیسرا، وڵاخێکی سپییان هێنا بۆم، لە هێستر بچکۆلە ترو لە گوێدرێژ گەورەتر بوو، ناوی بوراق بوو، چونکە دەچریسکایەوەو لەبەر خێرایی دەتگوت بەرقە، واتە: بروسکە، چەندە چاوی بڕی دەکرد دەیکرد بەیەك هەنگاو، جا سواری ئەو وڵاخە بوومو لەگەڵ جوبرائیلدا ڕۆیشتم هەتا گەیشتینە بەیتولەقدیس، واتە: خانەی خاوێنو پاكو پیرۆز. فەرمووی: جا لەوێ بوراقم بەستەوە بەو ئەڵقەیەوە، کە پێغەمبەران (درودی خودایان لێ بێ) لەکاتی سەردانی بەیتولەقدیسدا، وڵاخەکانیان دەبەستنەوە بەو ئەڵقەیەوە. فەرمووی: جا چوومە ناو حەرەمی مزگەوتەکەوەو دوو ڕکات نوێژی سوننەتم تیادا کرد، ئەوجا

هاتمه دەرەوە، جا جوبرائیل (سلاوی خودای لەسەر بێ) قاپێ مەیو قاپێ شیری بۆم هێنا، منیش جامە شیرەکەم لێ وەرگرتو خواردمەوە، جوبرائیل فەرمووی: ئەم شیرە کە تۆ هەڵت بژارد، ئەو سرووشتە پاكو پیرۆزەیە، کە خۆتو ئومەتت وان لەسەری).

ئەوجا بەرزی کردینەوە بۆ ئاسمان، لەگەڵ جوبرائیلدا رۆیشتم هەتا گەیشتینە ئاسمانی یەکەم، لەوێ جوبرائیل داوای کردنەوەی دەرگای کرد، لەناوەوە گوترا: ئەوە کێیە لەدەرگا دەدا؟ فەرمووی: جوبرائیل، گوترا: کێت لەگەڵ دایە؟ فەرمووی: موحەممەد، گوترا: نێردراوە بەشوێنیا کەبێت بۆ ئیسراو میعراج؟ فەرمووی: بەڵێ، بانگ کراوە کەبێت بۆ گەشتی ئاسمانەکان، گوترا: بەخێربێو هاتنەکەی خێری پێوەیە، جا دەرگا کرایەوە بۆمانو رۆیشتینە ژوورەوە، کاتێ گەیشتمە جێ لەئاسمانی یەکەم، دەڕوانم وا ئادەم تەشریفی وا لەوێ، جوبرائیل (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەمە حەزرەتی ئادەمی باوکتە، بفەرموو سلاوو چاكو چۆنی لەگەلا بکە، منیش سلاوو رۆژ باشیم لێکرد، ئەویش وەلامی سلاوەکەی دامەوە، لەپاشا فەرمووی: خۆش هاتی ئەی کوڕی شیرینم! مەرحەبات لێ بێ، ئەی کوڕی باشمو ئەی پێغەمبەری باشو خاس! وە نزای باشی بۆکردم، ئەوجا سەرکەوتین بۆ ئاسمانی دووەم، جوبرائیل لە دەرگای دا، گوتیان: ئەوە کێیە لە دەرگا دەدا؟ جوبرائیل فەرمووی: جوبرائیل. گوترا: کێت لەگەڵە؟ فەرمووی: موحەممەد، گوتیان: نێردراوە بە شوێنیا؟ فەرمووی: بەڵێ. فەرمووی: جا دەرگا کرایەوە بۆمان، روانیم واعیسای کوڕی مەریەمو یەحیای کوڕی زەکەریا، کە دوو پێغەمبەرنو پورزای یەکترین، وان لەوێ، جا ئەوانیش بەخێرهاتنیان لێ کردمو نزای باشیان بۆم کرد.

ئەوجا سەرکەوتین بۆ ئاسمانی سێیەم، جوبرائیل داوای کردنەوەی دەرگای کرد، گوترا: تۆ کێیت؟ فەرمووی: جوبرائیلم، گوتیان: کێت وا لەگەلا؟ فەرمووی: موحەممەد، گوترا: نێردراوە بەشوێنیا؟ فەرمووی: بەڵێ، دەرگایان بۆ کردینەوە، دەڕوانم وا یووسف پێغەمبەر والەوێ، کە نیوەی جوانی دراوە بەو، ئەویش بەخێرهاتنی کردمو نزای باشی بۆم کرد، ئەوجا بەرزەوە بووین بۆ ئاسمانی

چوارەم، جوبرائیل لە دەرگای دا، گوترا: ئەوە کێیە؟ فەرمووی: جوبرائیل، گوترا: کێت وا لەگەڵدا؟ فەرمووی: موحەممەد، گوترا: نێردراوە بەشوێنیا؟ فەرمووی: بەڵێ، دەرگایان بۆ کردینەوە، لەوێش پێغەمبەر ئیدریسم بینی، بەخێرهاتنێکی گەرمی لێکردمو نزای باشی بۆ کردم، خوا لە قورئانا دەفەرموێ، سەبارەت بە بەرزەوە بوونی ئیدریس بۆ ئاسمان دەفەرموێ: {وَرَفَعْنَاهُ مَكَانًا عَلِيًّا} واتە: ئێمە پێغەمبەر ئیدریسمان بەرزەوە کرد بۆ شوێنو پایەیەکی زۆر بەرزو بڵند).

ئەوجا سەرکەوتین بۆ ئاسمانی پێنجەم، جوبرائیل، لە دەرگایدا، گوتیان: کێیە؟ فەرمووی: منم جوبرائیلم، گوترا: کێت وا لەگەڵدا؟ فەرمووی: موحەممەد، گوترا: نێردراوە بەشوێنیا؟ فەرمووی: بەڵێ، دەرگامان بۆ کرایەوە، هاروون پێغەمبەر لەوێ بوو، بەخێرهاتنی کردمو نزای خێری بۆ کردم، ئەوجا بەرزەوە کراین بۆ ئاسمانی شەشەم، جوبرائیل لە دەرگای دا، گوترا: کێیە؟ فەرمووی: جوبرائیل، گوترا: کێت وا لەگەڵدا؟ فەرمووی: موحەممەد، گوترا: نێردراوە بەشوێنیدا؟ فەرمووی: بەڵێ، دەرگامان بۆ کرایەوە، پێغەمبەر مووسا تەشریفی لەوێ بوو، چاكو چۆنیو بەخێرهاتنی لەگەڵما کردو نزای باشی بۆ کردم، ئەوجا بەرەو ژوور بردینی بۆ ئاسمانی حەوتەم، جوبرائیل لە دەرگای دا، گوترا: ئەوە کێیە؟ فەرمووی: جوبرائیل، گوترا: کێت لەگەڵە؟ فەرمووی: موحەممەد، گوترا: نێردراوە بەشوێنیدا؟ فەرمووی: بەڵێ، لەوێ بە خزمەتی ئیبراهیم گەیشتم، پشتی دابوو بە بەیتولەعموور (خانەی ئاوەدان)ەوە، کە لە جوبرائیلم پرسی، فەرمووی: ئەمە بەیتولەعموورە کە لە قورئاندا، لەسەرەتای سوورەتی طوورەوە، خودا سوێندی پێ دەخواو دەفەرموێ: {وَالْبَيْتِ الْمَعْمُورِ} . هەموو رۆژێ حەفتا هەزار فریشتە دەچنە ناوی بۆ خواپەرستیو نوێژی تیا دەکەن، کە چوونە دەرەوە لێی، ئیتر جارێکی تر ناگەڕێنەوە بۆی، سەردانو دێنیی ئەم ماڵی ئاوەدانە، دوائەرکی ئایینی سەر شانیانە.

ئەوجا بردمی بۆ سیدرەتولونتەها، واتە: دار مۆردی هەرە ئەوپەڕ، کە ئەو درەختەیە، زانستی فریشتەکان هەتا ئەوێ بڕدەکاو لەوێ کۆتایی دێ، وە کەس

ئەوپەڕی نەکەوتووەو لێی ڕەت نەبووە، بێجگە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە تەماشایم کرد وا گەڵاکانی وەك گوێچکەی فیل وابوون، وە دەنکە مۆردەکانی واتە: بەرەکەی، بەقەد کوپەڵەی گوندی هەجەر گەورە بوون، کە ئەم جۆرە کوپەیە ناسراو بوون لای گوێگران، فەرمووی: (جا کاتێ درەختەکە ئەو حاڵەتە دایپۆشی، کە خودا لە سووورەتی (والنجم)دا، ئاوا باسی دەکات: {إِذْ يَغْشَى السِّدْرَةَ مَا يَغْشَى} گۆڕانێکی واهات بەسەریدا، کە هیچ کەس لە دروستکراوانی خودا نەتوانێ وەسفی جوانییەکەی بکات، ئەوسا ئەو سرووشەی کە خودا لە سوورەتی (وَالنجمِ)دا ئاوا باسی دەکا: {فَأَوْحَى إِلَى عَبْدِهِ مَا أَوْحَى} ئەو سرووشەی بۆ ناردم. ئەنجا لەلایەنی خوداوە پەنجا نوێژ لەسەر خۆمو یەکە یەکەی گەلی ئیسلام دانرا، لەماوەی هەموو شەوو ڕۆژێکا، جا بەرەودوا گەڕامەوە بۆ خوارەوە هەتا گەیشتمەوە لای مووسا، فەرمووی: چی ئەرکێ لەسەر خۆتو گەلەکەت دانرا؟ گوتم: پەروەردگارم پەنجا نوێژی ڕۆژانە لەسەرمان دانا، فەرمووی: من لەتۆ باشتر شارەزاییم هەیە لە ڕەفتاری ئەو خەڵکە، چونکە من لەپێش تۆدا زۆر بە زەحمەت خەریکی نەوەی ئیسرائیل بوومو بەراووردم کردوون، جا بۆیە دەزانم کە ئۆمەتی تۆ تەوانایی ئەوەیان نییە، کەواتە: بگەڕێرەوە بۆلای خودا، داوای لێ بکە کەئەم نوێژانە لەسەر ئۆمەتت سووك بکا).

منیش گەڕامەوەو داوای ئەوەم لێکردو ئەویش پێنجی لێ داشکانن، جا گەڕامەوە بۆلای مووساو پێم گوت: کە پێنج نوێژی لێ داشکاندن، بەڵام دووبارە وەك جاری پێشووی پێ فەرمووم، فەرمووی: ئیتر هەروا لە نێوانی پەروەردگاری پیرۆزو گەورەماو لەنێوانی مووسادا دەهاتمو دەچووم‌و بەرە بەرە خودای گەورە ژمارەی نوێژەکانی لە پەنجاوە کرد بە پێنج، ئەوجا فەرمووی: ئەی موحەممەد! خۆیان پێنج نوێژن، لە هەموو شەوو ڕۆژێکا، بەڵام هەر نوێژەی خێری دەنوێژی هەیە، جا کەوابوو دەکاتەوە پەنجا نوێژەکە!!). وە هەروەها خوای گەورە فەرمووی پێم: (وەهەر لەم بابەتەیە، کە چاکەیەك بەدەیە، کە هەرکەسێ نیازی هەبوو کە

چاكەیێ بكا، بەڵام نەیكرد، ئەوە لەسەر نیازە پاكەكەی چاكەیەكی بۆ دەنووسرێ، بەڵام ئەگەر كردی ئەوە بە دەقات بۆی دەنووسرێ ئەگەر كەسێكیش ویستی خراپەیێ بكا، وەنەیكرد ئەوە هیچی لەسەر نانووسرێ، بەڵام ئەگەر خراپەكەی كرد، ئەوە وەك خۆی بەیەك خراپە بۆی دەنووسرێ). (بڕوانە: ژمارە: ٦٧).

فەرمووی: ئەوجا دابەزیمەوە بۆلای مووساو هەواڵەكەم پێ گووت، دیسان فەرموویەوە بچۆرەوە بۆلای پەروەردگارتو داوای بار سووكی لێبكە).

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: عەرزیم كرد: (بەڕاستی ئەوەندە دووبارەو سێبارە لەم بارەیەوە چوومەتەوە خزمەتی پەروەردگارمو سەبارەت بەم كارە داوای بارسوكیم لێكردووە، ئیتر شەرم دەكەم كە رووی لێ بنێمو لەرووم نایێو شەرم دەكەم بچمەوە خزمەتی). (بڕوانە: تەجرید/٤، لاپەڕە: ٢٠٣، ژمارە: ١٥١٣).

**٥٢) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) یادی پێغەمبەران دەكات(٤١٩ - ٤٢٣).**

٧٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عنهما) قَالَ: سِرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيْنَ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةِ، فَمَرَرْنَا بِوَادٍ فَقَالَ: أَيُّ وَادٍ هَذَا؟ فَقَالُوا: وَادِي الأَزْرَقِ، فَقَالَ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى مُوسَى (عَلَيْهِ السَّلَامُ)، (فَذَكَرَ مِنْ لَوْنِهِ وَشَعْرِهِ شَيْئًا لَمْ يَحْفَظْهُ دَاوُدُ) وَاضِعًا إِصْبَعَيْهِ فِي أُذُنَيْهِ لَهُ جُؤَارٌ إِلَى اللَّهِ تَعَالى بِالتَّلْبِيَةِ مَارًّا بِهَذَا الْوَادِي، قَالَ: ثُمَّ سِرْنَا حَتَّى أَتَيْنَا عَلَى ثَنِيَّةٍ، فَقَالَ: أَيُّ ثَنِيَّةٍ هَذِهِ؟ قَالُوا: هَرْشَى، أَوْ لِفْتٌ. فَقَالَ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى يُونُسَ عَلَى نَاقَةٍ حَمْرَاءَ عَلَيْهِ جُبَّةُ صُوفٍ، خِطَامُ نَاقَتِهِ لِيفٌ خُلْبَةٌ، مَارًّا بِهَذَا الْوَادِي مُلَبِّيًا». (م/١/٩٩ - ١٠١). {الحديث/٤٢٠. إيمان. بخاري. حج: ١٥٥٥، ٣٣٥٥، ٥٩١٣. مسلم. إيمان: ٤٢١}.

ئیبنو عەبباس (رەزای خودا لەخۆیو بابی) دەفەرموێ: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە مەدینەوە دەڕۆیی بۆ مەككە، من خۆم لە خزمەتیاندا بووم، گەیشتینە شیوێ، فەرمووی: (ئەم شیوە كوێیە؟) گوتیان: ئەمە وادیلئەزرەقە، واتە: شیوە شینە. فەرمووی: دەڵێی ئێستاش وا لەبەرچاوم كە مووسام (دروودی خودای لەسەر بێ) كە لەشەوی ئیسرادا دیم، لە دانەكەوە دادەپەڕیو دوو پەنجەی خۆی دانابوو لە

هەردوو کونە گوێیداو بە هەموو دەنگی هاواری دەکرد لە خوداو دەنگی لەببەیکە کردنی بە بەرزی دەهاتو لەم شیوەوە تێپەڕ بوو. گوتی: ئیتر لە خزمەت خۆشەویستا (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆیشتین، هەتا گەیشتینە ملەیێ، فەرمووی: (ئەم ملەیە کوێیە؟) عەرزیان کرد: ئێرە دانەی هەر شایە، ملەی هەر شایە، هەر شاکێوێکە دەکەوێتە سەر ڕێگەی شام کە بچیت بۆ مەدینە، لە جەحەفەوە نزیکە. یا عەرزیان کرد: ئەمە ملەی لیفتە. فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (دەڵێی ئێستاش وا لەبەرچاوم کە یوونسی کوڕی مەتتا (دروودی خودای لەسەر بێ)، کە لەشەوی ئیسرادا بینیم، بە سواری وشترە مێیەکی سووری قەڵەوی پڕ گۆشت بوو، جبەیەکی خووری لەبەردا بوو، هەوساری وشترەکەی گورزەیێ گوش بوو، سەرگەرمی لەببەیکە کردن بوو، لەم شیوەوە بە لەببەیکە کردن تێپەڕ بوو!). {تاج/٤، لاپەڕە: ٣٨٧، ژمارە: ١، زنجیرە: ١١٨ = تاج-٣ ژ-٣٢١٤ چ-٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

١-بۆ تێگەیشتنی تەواو لە ژیانی پێغەمبەران لە قەبردا، واتە: لەبەرزەخا،

٢-بڕوانە: (تەجریدی بوخاری/١، لاپەڕە: ١٧٢، ژمارە: ١٥٩ + تەجریدی بوخاری/٢، لاپەڕە: ١٤٣ هەتا ١٥١، ژمارە: ٧٢١).

٣-ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ: (پێغەمبەران لە ژیانی بەرزەخدا وەك

٤-شەهیدان زیندوون، لەبەرئەوە لەماوەی مانەوەی جیهانا، هەتا جیهان تەواو دەبێ، دەتوانن حەجو نوێژو خوا پەرستی بکەن، وە فەرموودەی ساخ لەم بارەیەوە هەیە).

٥-بۆ ژیینامەی ئیبنو عەباس بڕوانە ژمارە (١٧٠) کەوا لەم بەرگەدا لەدواوەیە.

٧٨- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « حِينَ أُسْرِىَ بِى لَقِيتُ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ، فَنَعَتَهُ النَّبِىُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، « فَإِذَا رَجُلٌ حَسِبْتُهُ قَالَ: مُضْطَرِبٌ، رَجِلُ الرَّأْسِ، كَأَنَّهُ مِنْ رِجَالِ شَنُوءَةَ، قَالَ: وَلَقِيتُ عِيسَى، فَنَعَتَهُ النَّبِىُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، « فَإِذَا هُوَ رَبْعَةٌ أَحْمَرُ كَأَنَّمَا خَرَجَ مِنْ دِيمَاسٍ»، يَعْنِى حَمَّامًا، قَالَ:

وَرَأَيْتُ إِبْرَاهِيمَ عليهِ السَّلَامُ، وَأَنَا أَشْبَهُ وَلَدِهِ بِهِ، قَالَ: فَأُتِيتُ بِإِنَاءَيْنِ فِي أَحَدِهِمَا لَبَنٌ وَفِي الآخَرِ خَمْرٌ، فَقِيلَ لِي: خُذْ أَيَّهُمَا شِئْتَ، فَأَخَذْتُ اللَّبَنَ فَشَرِبْتُهُ، فَقَالَ: هُدِيتَ الْفِطْرَةَ، أَوْ أَصَبْتَ الْفِطْرَةَ، أَمَا إِنَّكَ لَوْ أَخَذْتَ الْخَمْرَ غَوَتْ أُمَّتُكَ». (م/١/١٠٦ - ١٠٧).
{الحديث/٤٢٣. إيمان. بخاري. أحاديث الأنبياء: ٣٣٩٤، ٣٤٣٧، ٤٧٠٩، ٥٥٧٦، ٥٦٠٣}.

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لە حیجری ئیسماعیل بووم لەپەنا کابەدا، قورەیش هەندێ پرسیاریان لێ کردم، لەبارەی شەورەوی کردنی منەوە، لە مەککەوە بۆ شاری قودس‌و لەوێشەوە بۆ گەشتی ئاسمانەکان، جا بازێ شتیان لێ پرسیم، رەوانم نەبوون، ئیتر زۆر زۆر خەم‌و خەفەت‌و پەژارەیەکی وا دایگرتم، کە هەرگیزاو هەرگیز خەم‌و پەژارەی وا داینەگرتووم، چونکە ئەوان شارەزایی تەواویان هەبوو، لە قودس‌و لە بەیتولەقدیس، بەهۆی سەفەرو هاموشۆوە، جا خودای گەورە بەیتولەقدیسی بۆم دەرخست، بەچاوی خۆم بەبێ پەردە تەماشاییم دەکردو هەر ناونیشان‌و هەر شتێکیان لەبارەیەوە لێ دەپرسیم، زۆر بەجوانی وەك خۆی وەلامم دەدانەوە، وەك باسی دەرگاکانی‌و نیشانەکانی، هەتا بەناچاری تەسلیم بوون‌و گوتیان: ناونیشانەکانی راستە. لەوێ لە بەیتولەقدیس تەماشام کرد واوام لەناو کۆمەڵێ لە پێغەمبەرەکاندا، کە سەرنجمدا، وا مووسا لەوێیە، بە راوەستانەوە نوێژ دەکا، مووسا پیاوێکی داڵ گۆشتی موو تەنکی موو کرژە، دەڵێی لە پیاوانی هۆزی شەنووئەیە، کە ناسراون بە داڵ گۆشتی‌و قەدو باڵا ناوەنجیەوە).

فەرمووی: (گەیشتم بە عیسای کوڕی مەریەمیش، ئەویش لەوێ بوو (درووودی خودای لەسەر بێ)، راوەستابوو نوێژی دەکرد، پیاوێکی دەستەی ناوەندی بوو، نە زۆر کورت‌و نەزۆر درێژ بوو، رەنگی سوورو سپی بوو، وەك لە گەرماو دەرچووبێ وابوو، لەهەموو کەسێ شێوەی زیاتر لە عوروەی کوڕی مەسعوودی ئەل‌ـثەقەفی دەچوو، کە شێوەی عوروە زۆر رێك‌و پێك‌و جوان بوو، وە لەناو گوێگرانا ناسراو بوو، لەسەردەمی پێغەمبەردا بە شەهیدی کوژرا).

هەروا فەرمووی: (حەزرەتی ئیبراهیمیشم دی، ئەویش لەوێ بوو (دروودی خودای لەسەر بێ)، راوەستابوو نوێژی دەکرد، زیاتر لە هەموو کەسێکی تر شێوەی لەمن دەچێ، لەناو نەوەو وەچەکەیدا، کەسیان وەك من لەو ناچێ).

کاتێ کەنوێژ بوو من بەرنوێژیم بۆکردن، جا کە لەنوێژەکە بوومەوە یەکێ گوتی: ئەی موحەممەد! ئەمە مالیکە، کە کلیل بەدەستی دۆزەخە سلاوی لێ بکە، کە ئاوڕم دایەوە، ئەو دەستپێشکەری کردو لەپێش مندا سلاوی لێ کردم.

جوبرائیل (دروودی خودای لەسەر بێ) قاپێ شیرو قاپێ بادەی بۆم هێنا، گوترا پێم: کامیان وەردەگریت کەیفی خۆتە، منیش قاپە شیرەکەم وەرگرتو خواردمەوە. جوبرائیل فەرمووی: ئەم شیرە پاكو خاوێنو حەلاڵو خۆش نۆشە ئەو سرووشتە خوا کردە پاكو پیرۆزەیە، کە خودا خۆتو گەلەکەتی رێنمایی کردووە لەسەری، ئەوە بزانە خوا نەخواست ئەگەر مەیەکەت وەربگرتایە گەلی ئیسلامی تۆ سەر لێ شێواوو گومڕا دەبوون). (تاج/٤، لاپەڕە: ٣٠٦، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ٣ + زنجیرە: ١١٥، لاپەڕە: ٣٧٨، ژمارە: ٤ = تاج-٣ ژ-٣١٥٥-٣١٥٧ چ-٤ + ز-١١٥ ژ-٣٢٠٥).

## ٥٣) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باسی عیسای مەسیحو جەجاڵ دەکا (٤٢٤ - ٤٢٨).

٧٩- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عنهما) قَالَ: ذَكَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمًا بَيْنَ ظَهْرَانَيِ النَّاسِ، الْمَسِيحَ الدَّجَّالَ، فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى لَيْسَ بِأَعْوَرَ، أَلاَ إِنَّ الْمَسِيحَ الدَّجَّالَ، أَعْوَرُ عَيْنِ الْيُمْنَى، كَأَنَّ عَيْنَهُ عِنَبَةٌ طَافِيَةٌ، قَالَ: وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « أَرَانِي اللَّيْلَةَ فِي الْمَنَامِ عِنْدَ الْكَعْبَةِ فَإِذَا رَجُلٌ آدَمُ، كَأَحْسَنِ مَا تَرَى مِنْ أُدْمِ الرِّجَالِ، تَضْرِبُ لِمَّتُهُ بَيْنَ مَنْكِبَيْهِ، رَجِلُ الشَّعَرِ، يَقْطُرُ رَأْسُهُ مَاءً، وَاضِعًا يَدَيْهِ عَلَى مَنْكِبَيْ رَجُلَيْنِ، وَهُوَ بَيْنَهُمَا يَطُوفُ بِالْبَيْتِ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالُوا: الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ، وَرَأَيْتُ وَرَاءَهُ رَجُلاً جَعْدًا قَطَطًا أَعْوَرَ العَيْنِ الْيُمْنَى، كَأَشْبَهِ مَنْ رَأَيْتُ مِنَ النَّاسِ بِابْنِ قَطَنٍ، وَاضِعًا يَدَيْهِ عَلَى مَنْكِبَيْ رَجُلَيْنِ، يَطُوفُ بِالْبَيْتِ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: هَذَا الْمَسِيحُ الدَّجَّالُ». (م/١/١٠٧). {الحديث/٤٢٥ — ٤٢٨. إيمان + ٧٢٨٩. بخاري. أحاديث الأنبياء: ٣٤٤٠، ٣٤٣٩، ٣٤٤١، ٥٩٠٢، ٦٩٩٩، ٧٠٢٦، ٧١٢٨}.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەناو مەردومەکەدا، بە ئاشکرایی دانیشتبوو، باسی جەجاڵی بۆیان کرد، فەرمووی: (جەجاڵ کەداوای خوایەتی دەکا، یەکلە چاوە، چاوی ڕاستی کوێرە، دیارە کە شتی وا عەیبو نەنگەو عەیبو نەنگیش نیشانەی کەمیو ناتەواوییە، شتی وایش لەگەڵ داوای خوایەتیدا ناگونجێ، بێگومان کە خودای گەورە پاكو بێ گەردەو دوورە لەرەوشو سیفەتی ناشیرنی وەکوو کوێریو کەموکووڕی! ئەو چاوەی جەجاڵ کە کوێرە وەك دەنکە ترێی زەقی قۆقزی لەبۆڵ دەرپەڕیو وایە).

فەرمووی: (ئەمشەویش لەخەوما لەلای کەعبەدا بووم، کە تەماشام کرد: وا پیاوێکی سەوزەی گەنم ڕەنگ، لەلاما بوو، تابڵێی سەوزەیەکی زۆر زۆر جوان بوو، لە پیاواندا گەنم ڕەنگی واجوان نەبینراوە، پرچێکی زۆر جوانی هەبوو، دەیدا لەناو شانی، بەجوانی پرچەکەی داهێنابوو، سەری ئاوی لێ دەتکا، وەك لەگەرماو دەرچووبێ، ئاواپاكو خاوێن بوو، هەردوو دەستی لەسەر شانی دوو پیاو دانابوو، تەوافی بەیتی دەکرد، پرسیم: ئەمە کێیە؟ گوتیان: ئەمە عیسای مەسیحی کوڕی مەریەمە.

لەپاشا پیاوێکم دی، سەری لوول بوو، قژی کرژبوو، چاوی ڕاستی کوێربوو، لەهەموو کەسێ زیاتر شێوەی لە ئیبنو قەطەن دەچێ، کە پیاوێکی ناسراو بوو لە هۆزی خوزاعە، جەجاڵ هەردوو دەستی لەسەر هەردوو شانی پیاوێ دانابوو، تەوافی بەیتی دەکرد، گوتم: ئەمە کێیە؟ گوتیان: جەجاڵی هەلاتبازە). {تەجرید/٤، لاپەڕە: ٥٧، ژمارە: ١٣٧٠}.

## ٥٤) پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەشەوی ئیسرادا، بەرنوێژی بۆ کۆمەڵەی پێغەمبەران دەکات، (سڵاوی خودایان لێ بێت).

٨٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « لَقَدْ رَأَيْتُنِي فِي الْحِجْرِ، وَقُرَيْشٌ تَسْأَلُنِي عَنْ مَسْرَايَ، فَسَأَلَتْنِي عَنْ أَشْيَاءَ مِنْ بَيْتِ الْمَقْدِسِ لَمْ أُثْبِتْهَا فَكُرِبْتُ كُرْبَةً مَا كُرِبْتُ مِثْلَهُ قَطُّ، فَرَفَعَهُ اللَّهُ لِي أَنْظُرُ إِلَيْهِ، مَا يَسْأَلُونِي عَنْ شَيْءٍ إِلاَّ أَنْبَأْتُهُمْ بِهِ، وَقَدْ رَأَيْتُنِي فِي جَمَاعَةٍ مِنَ الأَنْبِيَاءِ، فَإِذَا مُوسَى عليه

السَّلاَمُ قَائِمٌ يُصَلِّي، فَإِذَا رَجُلٌ ضَرْبٌ جَعْدٌ كَأَنَّهُ مِنْ رِجَالِ شَنُوءَةَ، وَإِذَا عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ قَائِمٌ يُصَلِّي، أَقْرَبُ النَّاسِ بِهِ شَبَهًا عُرْوَةُ بْنُ مَسْعُودٍ الثَّقَفِيُّ، وَإِذَا إِبْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلاَمُ قَائِمٌ يُصَلِّي، أَشْبَهُ النَّاسِ بِهِ صَاحِبُكُمْ، يَعْنِي نَفْسَهُ، فَحَانَتِ الصَّلاَةُ، فَأَمَمْتُهُمْ، فَلَمَّا فَرَغْتُ مِنَ الصَّلاَةِ قَالَ قَائِلٌ: يَا مُحَمَّدُ هَذَا مَالِكٌ صَاحِبُ النَّارِ، فَسَلِّمْ عَلَيْهِ فَالْتَفَتُّ إِلَيْهِ فَبَدَأَنِي بِالسَّلاَمِ». (م/١ – ١٠٨ - ١٠٩). {الحديث/ ٤٢٩ – إيمان. بخاري. مبعث النبي (تجريد): ١٥١٢/٣٨٨٦، ٤٧١٠. تاج/٤، لاپەڕە: ٣٠٦، زنجيرە: ١٠٠، ژمارە: ٢ = تاج-٣ ژ-٣١٥٥ چ-٤ باسی: ئیسرا}.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ قوڕەیش بۆ مەسەلەی ئیسراء، واتە: شەوڕەوی باوەڕیان پێ نەکردم، لە حیجری ئیساعیلدا ڕاوەستابووم، کە شوێنێکە دەکەوێتە ئاستی پلووسکی ڕەحمەت، لەڕووی شامەوە، لە حەوشەی کەعبەدا، قوڕەیش بۆ تاقیکردنەوەی قسەکانی من، هەندێ پرسیاریان لێکردم لەبارەی شەوڕەوی کردنی منەوە، لە مەککەوە بۆ شاری قودس، جا بازێ شتیان لێ پرسیم، ڕەوانم نەبوو، ئیتر زۆر زۆر خەمو خەفەتو پەژارە دایگرتم، هەرگیزاو هەرگیز خەمو پەژارەی وا داینەگرتوم، جا خودای گەورە بەیتولەقدیس (خانەی پیرۆز)ی بەتەواوی بەبێ پەردە هێنایە بەرچاوم، بەچاوی خۆم بەبێ پەردە تەماشاییم دەکردو ئیتر هەرچی شتێکیان لەو بارەیەوە لێ دەپرسیم، نیشانە بەنیشانەی و شوێن بەشوێنی، وەك بەقەبارە داریو موجەسسەمی لەبەرچاوم بێ ئاوا، بەچاوی خۆم تەماشام دەکردو باسو وەصفیم دەکرد بۆیانو وەلامم دەدانەوە، وەك باسی چەندیو چۆنی دەرگاکانیو نیشانەکانی، هەتا ناچار گوتیان: ناونیشانەکانی ڕاستە، لەوێ لە بەیتولەقدیس، تەماشام کرد واوام لەناو کۆمەلێ لە پێغەمبەرەکاندا، کە سەرنجمدا وا پێغەمبەر مووسا والەوێ، بەڕاوەستانەوە نوێژدەکا، مووسا پیاوێکی موو تەنکی، موو کرژە، دەڵێی لە پیاوانی هۆزی شەنووئەیە، کە شێوەیان لەلای هاوڕێیانی پێغەمبەر ناسراو بوو، عیسنای کوڕی مەریەمم دی، ئەویش لەوێ بوو، (دروودی خودای لەسەر بێ)، ڕاوەستابوو نوێژی دەکرد، زیاتر لەهەموو کەسێ، شێوەی.... تاد. لەکۆتایی ژمارە: (٧٨)دا ڕابورد بەتەواوی.

**٥٥) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەشەوی ئیسرادا، کۆتایی گەشتەکەی دەگاتە سیدرەتولمونتەها (دار مۆردی هەرە ئەوپەڕ).**

**باب: انتهاء النبّي (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إلى سِدْرَةِ المُنْتَهى في الإسْراءِ.**

٨١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ)، قَالَ: لَمَّا أُسْرِيَ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) انْتُهِيَ بِهِ إِلَى سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى، وَهِيَ فِي السَّمَاءِ السَّادِسَةِ، إِلَيْهَا يَنْتَهِي مَا يُعْرَجُ بِهِ مِنَ الأَرْضِ فَيُقْبَضُ مِنْهَا، وَإِلَيْهَا يَنْتَهِي مَا يُهْبَطُ بِهِ مِنْ فَوْقِهَا فَيُقْبَضُ مِنْهَا، قَالَ: (إِذْ يَغْشَى السِّدْرَةَ مَا يَغْشَى) قَالَ: فَرَاشٌ مِنْ ذَهَبٍ، قَالَ: فَأُعْطِيَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثَلاثًا: أُعْطِيَ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ، وَأُعْطِيَ خَوَاتِيمَ سُورَةِ الْبَقَرَةِ، وَغُفِرَ لِمَنْ لَمْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ مِنْ أُمَّتِهِ شَيْئًا الْمُقْحِمَاتُ). (م/١/ ١٠٨ - ١٠٩). {الحديث/ ٤٣٠}.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ پێغەمبەری خودا، (درودی خودای لەسەر بێ)، برا بۆ شەوڕەوی، کە دەگاتە سیدرەتولمونتەها، کەبنی وا لە ئاسمانی شەشەماو باقی مەندەی وا لە ئاسمانی حەوتەما، لەوێ خودا سێ خەڵاتی گەورەی وای پێ دەبەخشێ، کە لەوەو پێش خەڵاتی گەورەی وای بەهیچ پێغەمبەرێکی تر نەداوە. یەکەم: خودا هەموو شەوو رۆژێ پێنج نوێژ لەسەر خۆیو یەك بەیەکی ئۆمەتی دادەنێ. دووەم: ئایەتەکانی کۆتایی سوورەتی بەقەرەی پێ خەڵات دەکا، سێیەم: لەگوناهو تاوانە زلەکانی ئۆمەتی خۆش دەبێ، واتە: ئەو گوناهو تاوانە زلانەی کە خاوەنەکانیان دەکەن بە قوڕداو بەرەو دۆزەخ دەیانبەن، بەڵام بەمەرجێ کە هیچ هاوبەشو شەریك بۆ خودا پەیدا نەکەن، واتە: بەمەرجێ لەسەر ئیمان بمرن.

عەبدوڵڵا گوتی: سیدرەتولمونتەها بۆیە ناونراوە سیدرەتولمونتەها، بە کوردی، واتە: دارمۆردی سەرەنجام، یان: دارمۆردی هەرە ئەوپەڕ، چونکە هەرچی لەزەوییەوە سەردەکەوێو هەرچی لەلای سەرەوە دێتە خوارەوە، سەرەنجام لەوێ وەردەگیرێ. ئیبنو مسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەوەی کە لەم ئایەتەدا باس کراوە: إِذْ يَغْشَى السِّدْرَةَ مَا يَغْشَى: کاتێ دار مۆردەکە دایپۆشی ئەوەی دایپۆشی. فەرمووی: ئەو داپۆشەرە بریتی بوو لە پەپولەی زێڕین). {تاج/٧، لاپەڕە: ١٦٥، زنجیرە: ٣٦، ژمارە: ٨ = تاج-٤ ژ-٤١٣٠ چ-٤ + تەجرید/٤، لاپەڕە: ٢٠٢، ژمارە: ٣٨٨٦/١٥١٢، ٤٧١٠}.

## ٥٦) لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: (فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى).
## بابٌ: فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: (فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى).

٨٢- عَنْ الشَّيْبَانِيُّ قَالَ: سَأَلْتُ زِرَّ بْنَ حُبَيْشٍ عَنْ قَوْلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ: ( فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى)فَقَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ مَسْعُودٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَأَى جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَّلَامُ لَهُ سِتُّمِائَةِ جَنَاحٍ. (م/١/١٠٩). {الحديث/ ٤٣١. بخاري. تفسير: ٤٨٥٦، ٤٨٥٧}.

شەیبانی دەفەرموێ پرسیارم لە زیڕ کرد، لە فەرموودەی خودای گەورە {فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى، فَأَوْحَى إِلَى عَبْدِهِ مَا أَوْحَى، مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَى – ٥٣/٩ – ١١} واتە: وەها لە پێغەمبەر نزیك بوویەوە، كە نێوانیان بەقەد دوو كەوان دەبوو یا كەمتریش، جا لەو شوێنەدا وەحیو سرووشی كرد بۆلای بەندەی خۆشەویستی خودا، كە موحەممەدە، ئەو سرووشو وەحیە، حەقائیقو تەفاصیلو رازو نهێنییەكەی، هەر خوداو پێغەمبەر خۆیان زۆر بەجوانی دەزانن كە چییەو چی نییە، ئەوەی كە موحەممەد بەچاوی سەر بینی بەچاوی دڵیش بینیو هەستو هۆش لەبۆنی رەحمەتو لە رەفعی زەحمەت مەست بوونو چاوو دڵ بۆیەكتری بوون بە شایەتی داوای یەكتری!).

شەیبان فەرمووی: كە بۆ مەبەست لەم ئایەتە لە زیڕەم پرسی، لەوەلاما فەرمووی: لەم بارەیەوە عەبدوڵلای كوڕی مەسعوود هەواڵی بەئێمە داوە: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم جێگەیەدا جوبرائیلی دیوە، (دروودی خودا لەسەر هەردووكیان بێ)، شەش سەد باڵی بووە! (تاج/٧، لاپەڕە: ١٦٣، زنجیرە: ٣٦ تاج-٤ ش/ت).

٨٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِىَ اللّهُ عنهما) قَالَ: (مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَى). (وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى)، قَالَ: رَآهُ بِفُؤَادِهِ مَرَّتَيْنِ). (م/١ - ١٠٩). {الحديث/ ٤٣٦. إيمان}.

ئیبنو عەبباس (رەزای خودا لە خۆیو باوكی) فەرمووی: (لەم دوو ئایەتەدا ئەوەی واتیادا: كە پێغەمبەر بەچاوی دڵ نەوەك بەچاوی سەر دووجار خودای خۆی دیوە).

**ڕوونكردنەوە:**

ئەم بابەتە زۆر گرنگو پێچیدەیە، وە ڕای جیا جیای واتیادا. لە فەتحولباریدا دەفەرموێ: (ئەو زانایانەی کە دەفەرموون پێغەمبەر بەچاوی دڵ پەروەردگاری خۆی دیوە، مەبەستیان ئەوەیە: هەروەك چۆن شت بەچاوی سەر دەبینرێ، بەچاوی دڵیش شت بەهەمان شێوە، بەبێ زیادو کەم دەبینرێ، چونکە خودا دەتوانێ هێزی بینین لە هەموو ئەندامێکا دروست بکات، ئیتر ئەو ئەندامە چاوبێ، دڵ بێ، دەست بێ دەبێ).

**٥٧) باسی بینینی خودای گەورەو مەزن. (في رُؤْية الله جلَّ جلاَلُهُ)**

٨٤- عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: كُنْتُ مُتَّكِئًا عِنْدَ عَائِشَةَ فَقَالَتْ: يَا أَبَا عَائِشَةَ: ثَلاَثٌ مَنْ تَكَلَّمَ بِوَاحِدَةٍ مِنْهُنَّ، فَقَدْ أَعْظَمَ عَلَى اللَّهِ الْفِرْيَةَ، قُلْتُ مَا هُنَّ؟ قَالَتْ: مَنْ زَعَمَ أَنَّ مُحَمَّدًا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَأَى رَبَّهُ فَقَدْ أَعْظَمَ عَلَى اللَّهِ الْفِرْيَةَ، قَالَ: وَقَدْ كُنْتُ مُتَّكِئًا فَجَلَسْتُ، فَقُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ أَنْظِرِينِي وَلاَ تَعْجَلِينِي، أَلَمْ يَقُلِ اللَّهُ تَعَالَى: (وَلَقَدْ رَآهُ بِالأُفُقِ الْمُبِينِ) (وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى)؟ فَقَالَتْ عَائِشَةُ: أَنَا أَوَّلُ هَذِهِ الأُمَّةِ سَأَلَ عَنْ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَ: إِنَّمَا هُوَ جِبْرِيلُ عليه السَّلاَم، لَمْ أَرَهُ عَلَى صُورَتِهِ الَّتِي خُلِقَ عَلَيْهَا غَيْرَ هَاتَيْنِ الْمَرَّتَيْنِ، رَأَيْتُهُ مُنْهَبِطًا مِنَ السَّمَاءِ سَادًّا عِظَمُ خَلْقِهِ مَا بَيْنَ السَّمَاءِ إِلَى الأَرْضِ، فَقَالَتْ: أَوَلَمْ تَسْمَعْ أَنَّ اللَّهَ تَعَالى يَقُولُ: (لاَ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ وَهُوَ اللَطِيفُ الْخَبِيرُ) أَوَلَمْ تَسْمَعْ أَنَّ اللَّهَ يَقُولُ: (وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَنْ يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلاَّ وَحْيًا أَوْ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولاً) إلى قَوْلِه: (عَلِيٌّ حَكِيمٌ)؟ قَالَتْ: وَمَنْ زَعَمَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَتَمَ شَيْئًا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ فَقَدْ أَعْظَمَ الْفِرْيَةَ، وَاللَّهُ يَقُولُ: (يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ وَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ). قَالَتْ: وَمَنْ زَعَمَ أَنَّهُ يُخْبِرُ بِمَا يَكُونُ فِي غَدٍ فَقَدْ أَعْظَمَ الْفِرْيَةَ، وَاللَّهُ يَقُولُ: (قُلْ لاَ يَعْلَمُ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ الْغَيْبَ إِلاَّ اللَّهُ). وَزَادَ دَاوُدُ قَالَتْ: وَلَوْ كَانَ مُحَمَّدٌ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَاتِمًا شَيْئًا مِمَّا أُنْزِلَ عَلَيْهِ لَكَتَمَ هَذِهِ الآيَةَ (وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ

وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ تَخْشَاهُ). (م/ ١ - ١١٠). {الحديث/ ٤٣٨. إيمان. بخاري. تفسير: ٣٢٣٤، ٣٢٣٥، ٤٦١٢، ٤٨٥٥، ٧٣٨٠، ٧٥٣١} + {تجريدى بخارى: ١٦٥٥/٤٦١٢، بەرگى/٤، لاپەڕە: ٤٣٧}.

مەسرووق (رەحمەتى خوداى لىٚ بىٚ) فەرمووى: جارىٚ لەلاى عائيشە دانيشتبووم كە هاوسەرى پێغەمبەرە، شانم دادابوو، فەرمووى پێم: ئەى ئەبو عائيشە! هەركەسىٚ يەكىٚ لەم سىٚ قسەيە بكا، ئەوە بەڕاستى هەلاتێكى گەلىٚ گەورەو زل هەلٚ دەبەستىٚ بەدەم خوداوە، گوتم: ئەوانە چىو چين؟ فەرمووى:

يەكەم: ئەوەى بلىٚ: موحەممەد (سەرو مالٚو منالٚ هەمووى بە قوربانى گەردى سەر گۆڕى پيرۆزى بىٚ) ئەوەى بلىٚ: موحەممەد خوداى خۆى بەچاوى سەر ديوە، ئەوە بە راستى درۆيەكى گەلىٚ زلى هەلٚبەستووە بەدەم خوداوە، مەسرووق فەرمووى: كە عائيشە واى گوت منيش پالٚ كەوتبووم، ڕێك دانيشتمو گوتم: ئەى دايكى موسولٚمانان! مۆلٚەتم بدەو پەلەم لىٚ مەكە، ئەى ئەوە نييە خوداى گەورە دەفەرمویٚ: {وَلَقَدْ رَآهُ بِالْأُفُقِ الْمُبِينِ – ٨١/٢١}. واتە: موحەممەد (دروودى خوداى لەسەر بىٚ) بەچاوى سەر لەكەنارى ئاسماندا بەروونى ئەوى بينىو چاوى پێى كەوت).

ئەى ئەوە نييە لە ئايەتێكى تردا دەفەرمویٚ: {وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى – ٥٣/١٣}. واتە: لەگەلٚ ئەوەدا كە جارێكى تريش، لە داپەڕينێكى ديكەدا، لەلاى درەختى سيدرەتولمونتەهادا، حەزرەت ئەوى بينى، لە ژوورى ئاسمانى حەوتەمەوە.

كەواتە تۆ چۆن وا دەلٚێيتو دەلٚێيت موحەممەد خوداى نەديوە، ئەى چى دەكەيت لەم دوو ئايەتە؟ جا عائيشە فەرمووى: من خۆم يەكەم كەس بووم لەم گەلى ئيسلامە، كە ئەم پرسيارەى تۆم لە حەزرەت كرد، فەرمووى: (ئەوەى كە لەم دوو ئايەتەدا، ئاماژەى بۆ كراوە، كەمن ديومە، ئەوە جوبرائيل بوو، تەنيا ئەم دوو جارە لەسەر شێوەى خۆى ديومە. واتە: لەسەر ئەو صورەتو شێوەيەى كە خودا لەسەرەتاوە لەسەرى دروستى كردووە! بەلاٚم لەسەر شێوەى تر زۆرى ديوە، وەك ئەوەى گەلىٚ جار لەسەر شێوەو شكلٚى ديحيەى ئەل‌كەلبى دەيبينى، كە دەهات بۆلاى

سرووشی بۆ دەهێنا، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: جوبرائیلم بینی لە ئاسمانەوە داپەڕی، قەلافەتی ئەوەندە گەورە بوو، وە لەش‌و لاری ئەوەندە زل بوو، ناوەندی ئاسمان‌و زەوی داگرتبوو!).

عائیشە فەرمووی: ئەدی نابینی کە خودای گەورە دەفەرمویّ: {لاَّ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ - ٦/١٠٣}. واتە: لەبەر ناسکی‌و نازداری‌و ورشە ورشی رووی نازداری چاوی سەر، وە هەروەها چاوی تری دنیایی کە بەس ماددە دەبینیّ، ئەو نابینیّ‌و نایگاتیّ، بەلام خودا خۆی دەرکی چاوان‌و خاوەن چاوان دەکا، چونکە خۆی ناسك‌و نازدارەو بەئاگاو ئاگادارە).

لەلایەکی تریشەوە ئەوەتا دەبینی خودای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرمویّ: {وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَاء حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَاء إِنَّهُ عَلِيٌّ حَكِيمٌ - سورة الشورى/٤٢/٥١}:

نەبووە بۆ ئادەمیزاد کە خودا قسەی لەگەلا بفەرمویّ، مەگەر بەیەکیّ لەم سیّ شێوەیە:

**یەکەم:** لەسەر شێوەی وەحی‌و سرووشی راستەوخۆ لە خوداوە بۆ بەندەی خۆی، بەبیّ ئەوەی کەسیّ لە نێواندا بێت.

**دووەم:** لەسەر شێوەی دوو بەدوو بەبیّ میانگەریی کەسێکی تر بەلام لەپشتی پەردەوە نەوەك روو بەروو.

**سێیەم:** خودا فریشتەییّ، وەك جوبرائیل دەکا بە فرووستادەو دەینێریّ، ئەو فروستادەیە قسەو گوفتوگۆ بە فەرمانی خودا، لەگەلّ کەسی مەبەست دەکاو، لەهەندیّ کاروبار ئاگاداری دەکا، لەسەر شێوەی سرووش‌و نیگای خوایی).

عائیشە فەرمووی: دووەم: هەرکەسیّ بلیّ گوایە پێغەمبەری خودا شتێکی حەشارداوە لەو قورئان‌و سوننەتەی کە بە سرووش بۆی هاتووە، ئەوە بێگومان درۆیەك‌و هەلاتێکی گەورەی هەلبەستووە بەدەم خوداوە، چونکە ئەوەتا خودای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا، فەرمان دەکا بە پێغەمبەر، کە ئەو قورئان‌و وەحیەی کە بۆی هاتووە بەتەواوی رابگەیەنیّ‌و هەرشەی ئەوەی لیّ دەکا، ئەگەر بە ئەرکی

سەرشانی خۆی هەڵ نەستێ لەم لایەنەوە بەرپرسیارە، کە دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ - ٥/٦٧}. واتە: ئەی پێغەمبەری نازدارو خۆشەویست! هەرچی بە سرووش‌و وەحی، من ناردوومە بۆ تۆ، لە قورئان‌و سوننەت، دەبێ رایبگەیەنی بەو خەڵکەو تەبلیغیان بکەی، ئەگینا بزانە کەتۆ پەیامی پیرۆزی خودای خۆتت پێیان رانەگەیاندووە).

عائیشە فەرمووی: سێیەم: هەرکەسێ باوەڕی وابێ کە موحەممەد عیلمی غەیبی بووەو لەخۆیەوە بەبێ سرووش‌و نیگای خودایی دەیزانێ کە سبەینێ چی دەبێ، ئەوە دیارە کە درۆیەکی زلی بەدەم خوداوە هەڵ بەستووە، چونکە خودا دەفەرموێ: {قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ - ٢٧/٦٥}. واتە: ئەی خۆشەویست، ئەی موحەممەد، ئەی پێغەمبەری خۆشەویستی من! بفەرموو: ئەوەی کەلە ئاسمانەکان‌و لە زەویدا عیلمی غەیبی هەبێ بەس خودا خۆیەتی‌و کەسی تر غەیبزان نییە).

ئیمامی موسلیم ئەم فەرموودەیە بە دوو رشتە -واتە: بە دوو سەنەد- لە داوودی کوڕی ئەبوهیندەوە دەردەهێنێ: جاری یەکەم: لە زوهەیری کوڕی حەربەوە، لە ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمەوە، کە ناسراوە بە ئیبنو عولەییە، لەداوودی کوڕی ئەبو هیندەوە، فەرموودەکە لێرەدا کۆتایی دێ، جاری دووهەم دەری دەهێنێ: لە موحەممەدی کوڕی موسەنناوە، لە عەبدولوەهابەوە، لە داوودی کوڕی ئەبو هیندەوە، لەم گێڕانەوەی دووەمدا، داوود ئەمەی لێ پتر کردووە:

عائیشە فەرمووشی: گریمان ئەگەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شتێکی لەو سرووشەی کە بۆی هاتبوو بشاردایەتەوە، ئەم ئایەتەی دەشاردەوە:

{وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاهُ}. (تاج/٦، لاپەڕە: ١٥٨، ژمارە: ٨ = تاج-٤ ژ-٣٨٥٩ ز-٧٤).

**ڕوونکردنەوە:**

١-ئەم باسی بینینی خودایە بەچاوی سەر لەم جیهانەدا، پرسێکە لەناو زانایاندا ڕاجیایی واتیادا، هەردوو ڕایەکەیش زۆر بەهێزن، مرۆڤ باوەڕی بە هەرکام لەو دوو ڕایە هەبێ دروستەو قەیدی نییە.

٢-ئەوەی کە لەتاجدا، لەبەرگی شەشی کوردییەکەدا، لە لاپەڕە/١٥٩دا نووسراوە کە مەسرووق خوشکەزای حەزرەتی عائیشەیە ئەوە هەڵەیە، نە عائیشە پووری مەسرووقەو نە مەسرووق خوشکەزای عائیشەیە لەچاپی چوارەم دا چاك کراوە (تاج-٤ ز-٧ ژ-٣٨٥٩).

٣-مەسرووقی کوڕی ئەجدەع پیاوێکی خوا ناسی گەورە بوو، فەرموودە زانێکی گەورە بوو، نازناوی ئەبو عائیشە بوو، بەخزمەت زۆر لە هاوڕێیانی پێغەمبەر، لە ژنانو لە پیاوان گەیشتووە، وەك ئەبوبەکرو عومەرو عەلیو عائیشەو کەسانی تریش، خەڵکێکی زۆر فەرموودەیان لەو وەرگرتووە، هەمیشە سەرگەرمی وەرگرتنی زانست بوو، لەو زاتانە بوو کە سوننەتیان فێری مەردوم دەکرد، جارێ تەشریفی چوو بۆ حەج هەتا ئەو حەجەی تەواو کرد، ئەوەندە سەرگەرمی پەرستشو شەو نوێژ بوو، هەر لەناو سەجدەدا دەخەوتو بەس هەتا حەجەکەی تەواوکرد، ئەوەندەی شەو نوێژ کردبوو، قاچەکانی پەنەما بوون، جارێ شیعرێکیان لێ پرسی، فەرمووی: (حەزناکەم شیعر لەنامەی کردارما هەبێ). یەکێ بوو لە فەقێکانی عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود، مەردومی فێری قورئان دەکردو فەتوای بۆ دەدان. کەلبی دەفەرموێ: لە شەڕی قادسیەدا دەستێکی مەسرووق گۆد بوو بوو، پێکانێکی هەتا سەرمۆخ لەسەری کرابوو، خۆی دەیفەرموو: (حەزناکەم کە ئەم زامەی سەرم نەبوایە، چونکە بووە بەهۆی دوورکەوتنەوەم لە شەڕی ئاژاوەی نێوان هاوڕێیان، وەك عەلیو موعاویەو عائیشە...). یەکێ بوو لە عابیدو خوا ناسە ناسراوەکانی خەڵکی کووفە، لە تەمەنی شەستو سێساڵیدا، لەساڵی شەستو سێی کۆچیدا، لە (السلسلة) مەرگ بوو بەمیوانی (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ).

٨٥- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ لاَ يَنَامُ، وَلاَ يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَنَامَ، يَخْفِضُ الْقِسْطَ وَيَرْفَعُهُ، يُرْفَعُ إِلَيْهِ عَمَلُ اللَّيْلِ قَبْلَ عَمَلِ النَّهَارِ، وَعَمَلُ النَّهَارِ قَبْلَ عَمَلِ اللَّيْلِ، حِجَابُهُ النُّورُ (وَفِي رِوَايَةِ: النَّارُ) لَوْ كَشَفَهُ لأَحْرَقَتْ سُبُحَاتُ وَجْهِهِ مَا انْتَهَى إِلَيْهِ بَصَرُهُ مِنْ خَلْقِهِ». (م — ١/١١١). {الحديث/ ٤٤٤. إيمان}.

ئەبو مووسا (رەزای خودای لێ بێ) فەرموو: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەستایەوە، وتارێکی دا بۆمان، پێنج وشەی پێمان فەرموو، فەرمووی: (خودای گەورەو مەزن ناخەوێو شایستەی زاتی ئەو نییە کە بخەوێ، ئەو زاتە مەزنە تەرازووی دادو عەدلی وا بەدەستەوە، تاوتووی پێ دەکا، بەرزو نزمی پێ دەکاو سەرەو ژێرو سەرەو ژووری پێ دەکا، بە موو سەرناکا، کردەوەی شەوی بەندەکانی بەرزدەکرێتەوە بۆلای لەپاش نوێژی بەیانی، بەر لەکردەوەی رۆژی دوایی، وە کردەوەی رۆژیی بەندەکانی بەرز دەکرێتەوە بۆلای، لەپاش نوێژی عەصر بەر لە کردەوەی شەوی دوایی. ئەو پەردەیەی کەوا لە نێوانی خوداو بەندەو دروستکراوەکانیا، کەناهێڵێ ئەوان خودا ببینن، ئەو پەردەیە لە نوورە (لە گێڕانەوەیەکا: ئەو پەردەیە لە ئاگرە) جا ئەگەر ئەو پەردەیە لاببات لەنێوانا، یا ئەگەر ئەو نوورە دەربخا، وەك بۆ مووساو کێوی زبیری دەرخست، وەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: { فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَى صَعِقًا - سورة الأعراف/ ٧/١٤٤} ئەوە لەوکاتەدا، ورشە ورشو تریفەو شەوقی روخساری، هەتا چاوی کاردەکا، مەخلووقاتو دروستکراوانی خۆی دەسووتێنێ). واتە: خودا ئەگەر خۆی دەربخا بوونەوەر هیچی نامێنێ. {تاج/٦، لاپەڕە: ٤٧، ژمارە: ٥٥ - تاج-٤ ژ-٣٧٤٤ چ-٤. تەفسیری سوورەتی بەقەرە}.

٨٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ أُنَاساً قَالُوا لِرَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): هَلْ نَرَى رَبَّنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « هَلْ تُمَارُونَ فِي الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ؟ قَالُوا: لاَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «هَلْ تُمَارُونَ فِي الشَّمْسِ لَيْسَ دُونَهَا سَحَابٌ؟ قَالُوا: لاَ، قَالَ: «إِنَّكُمْ تَرَوْنَهُ كَذَلِكَ، يَجْمَعُ اللَّهُ النَّاسَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيَقُولُ: مَنْ

كَانَ يَعْبُدُ شَيْئًا فَلْيَتَّبِعْه، فَيَتَّبِعُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ الشَّمْسَ الشَّمْسَ، وَيَتَّبِعُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ الْقَمَرَ الْقَمَرَ، وَيَتَّبِعُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ الطَّوَاغِيتَ الطَّوَاغِيتَ، وَتَبْقَى هَذِهِ الأُمَّةُ فِيهَا مُنَافِقُوهَا، فَيَأْتِيهِمُ اللَّهُ تَعَالَى فِي صُورَةٍ غَيْرِ صُورَتِهِ الَّتِي يَعْرِفُونَ. فَيَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ. فَيَقُولُونَ: نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ، هَذَا مَكَانُنَا حَتَّى يَأْتِينَا رَبُّنَا فَإِذَا جَاءَ رَبُّنَا عَرَفْنَاهُ. فَيَأْتِيهِمُ اللَّهُ فِي صُورَتِهِ الَّتِي يَعْرِفُونَ، فَيَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ، فَيَقُولُونَ: أَنْتَ رَبُّنَا فَيَتَّبِعُونَهُ، وَيُضْرَبُ الصِّرَاطُ بَيْنَ ظَهْرَى جَهَنَّمَ، فَأَكُونُ أَنَا وَأُمَّتِي أَوَّلَ مَنْ يُجِيزُ، وَلاَ يَتَكَلَّمُ يَوْمَئِذٍ إِلاَّ الرُّسُلُ، وَدَعْوَى الرُّسُلِ يَوْمَئِذٍ: اللَّهُمَّ سَلِّمْ سَلِّمْ، وَفِى جَهَنَّمَ كَلاَلِيبُ مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ، هَلْ رَأَيْتُمُ السَّعْدَانَ؟ قَالُوا: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: فَإِنَّهَا مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ غَيْرَ أَنَّهُ لاَ يَعْلَمُ مَا قَدْرُ عِظَمِهَا إِلاَّ اللَّهُ، تَخْطَفُ النَّاسَ بِأَعْمَالِهِمْ، فَمِنْهُمُ الْمُؤْمِنُ بَقِيَ بِعَمَلِهِ، وَمِنْهُمُ الْمُجَازِي حَتَّى يُنَجَّي. حَتَّى إِذَا فَرَغَ اللَّهُ مِنَ الْقَضَاءِ بَيْنَ الْعِبَادِ، وَ أَرَادَ أَنْ يُخْرِجَ بِرَحْمَتِهِ مَنْ أَرَادَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ أَمَرَ الْمَلاَئِكَةَ أَنْ يُخْرِجُوا مِنَ النَّارِ مَنْ كَانَ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئاً مِمَّنْ أَرَادَ أَنْ يَرْحَمَهُ، مِمَّنْ يَقُولُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ فَيَعْرِفُونَهُمْ فِي النَّارِ، يَعْرِفُونَهُمْ بِأَثَرِ السُّجُودِ، تَأْكُلُ النَّارُ مِنَ ابْنِ آدَمَ إِلاَّ أَثَرَ السُّجُودِ، حَرَّمَ اللَّهُ عَلَى النَّارِ أَنْ تَأْكُلَ أَثَرَ السُّجُودِ، فَيَخْرُجُونَ مِنَ النَّارِ وَقَدِ امْتَحَشُوا فَيُصَبُّ عَلَيْهِمْ مَاءُ الْحَيَاةِ فَيَنْبُتُونَ مِنْهُ كَمَا تَنْبُتُ الْحِبَّةُ فِى حَمِيلِ السَّيْلِ، ثُمَّ يَفْرُغُ اللَّهُ مِنَ الْقَضَاءِ بَيْنَ الْعِبَادِ، وَيَبْقَى رَجُلٌ مُقْبِلٌ بِوَجْهِهِ عَلَى النَّارِ، وَهُوَ آخِرُ أَهْلِ لبجنَّة دُخُولاً الْجَنَّةَ، فَيَقُولُ: أَيْ رَبِّ اصْرِفْ وَجْهِى عَنِ النَّارِ فَإِنَّهُ قَدْ قَشَبَنِى رِيحُهَا وَأَحْرَقَنِى ذَكَاؤُهَا، فَيَدْعُو اللَّهَ مَاشَاءَ اللَّهُ أَنْ يَدْعُوهُ ثُمَّ يَقُولُ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: هَلْ عَسَيْتَ إِنْ فَعَلْتُ ذَلِكَ بِكَ أَنْ تَسْأَلَ غَيْرَهُ؟ فَيَقُولُ: لاَ أَسْأَلُكَ غَيْرَهُ، وَيُعْطِى رَبَّهُ مِنْ عُهُودٍ وَمَوَاثِيقَ مَاشَاءَ اللَّهُ فَيَصْرِفُ اللَّهُ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ، فَإِذَا أَقْبَلَ عَلَى الْجَنَّةِ ورَآهَا، سَكَتَ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَسْكُتَ، ثُمَّ يَقُولُ: أَيْ رَبِّ قَدِّمْنِى إِلَى بَابِ الْجَنَّةِ، فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ: أَلَيْس قَدْ أَعْطَيْتَ عُهُودَكَ وَمَوَاثِيقَكَ لاَ تَسْأَلُنِي غَيْرَ الَّذِى أَعْطَيْتُكَ، وَيْلَكَ يَا ابْنَ آدَمَ مَا أَغْدَرَكَ! فَيَقُولُ: أَيْ رَبِّ! وَيَدْعُو اللهَ، حَتَّى يَقُولَ لَهُ: فَهَلْ عَسَيْتَ إِنْ أُعْطِيْتُكَ ذَلِكَ أَنْ تَسْأَلَ غَيْرَهُ؟ فَيَقُولُ: لاَ وَعِزَّتِكَ، فَيُعْطِى رَبَّهُ مَا شَاءَ اللَّهُ مِنْ عُهُودٍ وَمَوَاثِيقَ فَيُقَدِّمُهُ إِلَى بَابِ الْجَنَّةِ، فَإِذَا قَامَ عَلَى بَابِ الْجَنَّةِ إِنْفَهَقَتْ لَهُ الْجَنَّةُ فَرَأَى مَا فِيهَا مِنَ الْخَيْرِ وَالسُّرُورِ، فَيَسْكُتُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَسْكُتَ، ثُمَّ يَقُولُ: أَيْ رَبِّ أَدْخِلْنِى الْجَنَّةَ، فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ: أَلَسْتَ قَدْ أَعْطَيْتَ عُهُودَكَ وَمَوَاثِيقَكَ أَنْ لاَ تَسْأَلَ غَيْرَ مَا

أُعْطِيتَ؟ وَيْلَـكَ يَا ابْنَ آدَمَ مَا أَغْدَرَكَ! فَيَقُولُ: أَيْ رَبِّ لاَ أَكُونُ أَشْقَى خَلْقِكَ، فَلاَ يَزَالُ يَدْعُو اللَّهَ حَتَّى يَضْحَكَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ مِنْهُ، فَإِذَا ضَحِكَ اللّهُ تَعَالى مِنْهُ، قَالَ: ادْخُلِ الْجَنَّـةَ، فَإِذَا دَخَلَهَا قَالَ اللّهُ لَهُ: تَمَنَّهْ، فَيَسْأَلُ رَبَّهُ وَ يَتَمَنَّى، حَتَّى إِنَّ اللهَ لَيُذَكِّرُهُ مِنْ كَذَا وَكَذَا، حَتَّـى إِذَا إِنْقَطَعَتْ بِهِ الأَمَانِيُّ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ذلِكَ لَـكَ وَمِثْلُهُ مَعَهُ. قَالَ عَطَاءُ ابْنُ يَزِيدَ وَأَبـو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ مَعَ أَبِى هُرَيْرَةَ لاَ يَرُدُّ عَلَيْهِ مِنْ حَدِيثِهِ شَيْئاً، حَتَّى إِذَا حَدَّثَ أَبُو هُرَيْرَةَ أَنَّ اللّهَ عَـزَّ وَجَلَّ قَالَ لِذالِكَ الرَّجُلِ: (وَمِثْلُهُ مَعَهُ) قَالَ أبو سَعِيدٍ: وَعَشَرَةُ أَمْثَالِهِ مَعَهُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ. قَالَ أَبُو هُرَيرَةَ: مَا حَفِظْتُ إِلاَّ قَوْلَهُ: (ذالِكَ لَـكَ). (وَمِثْلُـهُ مَعَـهُ). قَـالَ أَبـو سَـعِيدٍ: أَشْهَدُ أَنّـي حَفِظْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَوْلَهُ: «ذَلِكَ لَـكَ وَعَشَـرَةُ أَمْثَالِـهِ» قَـالَ أَبُـو هُرَيْرَةَ (وَذَلِكَ الرَّجُلُ آخِرُ أَهْلِ الْجَنَّةِ دُخُـولاً الْجَنَّـةَ). (م/١ – ١١٢ - ١١٤). {الحـديث/ ٤٥٠. إيمان. بخاري. أذان: ٨٠٦، ٦٥٧٣، ٧٤٣٧}.

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای گـەورەی لێ بـێ) فـەرمووی: یـاران عـەرزی خۆشەویستیان کرد: قوربان! ئەی پێغەمبـەری خـودا! ئایـا لـە ڕۆژی قیامـەتا، ئێمـە خودای خۆمان بەچاوی سەر دەبینین؟!

خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (شەوی چواردەی مانگ، کە سایەقەی ساماڵ بێو ئاسمان ساف بێو هەورو هەڵای نەبێ، بـۆ دیتنـی مـانگ هـیچ زەحمـەت دەکێشن، وەك لەسـەری مانگا، بـۆ دیتنـی مـانگی یەکشـەوە زەحمـەت دەکێشنو بـە وردی بۆی دەگەڕێن؟!) فەرموویان: نەء، ئـەی پێغەمبـەری خـودا! فـەرمووی: (ئـەی بە ڕۆژی نیوەڕۆ، ئاسمان ساف بێ، بۆ بینینـی خـۆر بـە ئاسمانـەوە هـیچ ئـەرکێ، یـا زەحمەتێ دەبینن؟!). فـەرموویان: نەخـەیر، بـۆ ئەمـە تووشـی هـیچ ئـەرکێ نـابین. فەرمووی: (دەی ئێوە بەوچەشنە، ئاوا بەبێ شەكو گومان بە ئاسانی خودای خۆتان بەچـاوی سـەرتان دەبیـنن. لـەڕۆژی دواڕۆژدا، خـودای گـەورە ئـەو خەڵـکە هـەموو کۆدەکاتەوە، سەرجەم مەردوم حەشر دەکرێن، بە فەرمانی خـودا بانگەواز دەکـرێ: هەرکەسێ لە جیهانا بۆ کێ بەندەیی‌و پەرستشی کردووەو چی پەرستووە، با ئێسـتا شوێنی ئـەوە بکـەوێ، ئـیتر ئـەوەی خـۆری پەرسـتووە شـوێن خـۆر دەکـەوێ، ئـەوەی مانگی پەرستووە شوێن مانگ دەکەوێ، ئەوەی بتی پەرستووە شوێن بت دەکەوێ،

ئەوەی هەرشتێکی پەرستبێ لە دنیادا، بێجگە لە خودا، شوێن ئەو شتە دەکەوێ، ئەوانیش بەرەو ئاگری دۆزەخ دەیان بەن!! دەمێننەوە ئەم گەلی ئیسلامە بە پاكو ناپاکیانەوە، ئەو ناپاکانەی کە بەدەم موسوڵمانن‌و بە دڵ بێباوەڕن ئەوانەشیان لەناودایە، ئەوجەلە خودا لەسەر شێوەیێ دێت بۆلایان، کە ئەوان لەسەر ئەو شێوەیە نایناسنەوە، چونکە لەشەریعەتی پیرۆزدا شتی وایان نەبیستووە، جا خودا پێیان دەفەرموێ: من خودای ئێوەم. دەڵێن: نەء، تۆ خودای ئێمە نیت، پەنا دەگرین بەخودا لەتۆ، کە لەم دوا تاقیکردنەماندا زەفەرمان پێ نەبینیت! ئەمە جێگەمانە هەتا خودای خۆمان دێت بۆلامان، هەرکاتێ خودای خۆمان هات دەیناسین، ئیتر خودای گەورەو بێچوون لەسەر ئەو شێوەیەی کە لە یاسانامەی خودادا بۆیان روونکراوەتەوە دێ بۆلایان‌و دەیناسنەوە، دەفەرموێ: من خودای ئێوەم، دەڵێن: بەڵێ تۆ خودای ئێمەی، ئەوجا شوێنی دەکەون. ئەوجا پردی سیرات -کە لەموو باریکترو لە شمشێر تیژترە- بەسەر پشتی دۆزەخدا رادەکێشرێ، من‌و ئۆمەتم یەکەم کەس دەبین کە بەسەریا دەپەڕینەوە، وەمن یەکەم کەس دەبم لە پێغەمبەران کە ئۆمەتم لەو پردەوە دەپەڕێنمەوە. لەبەر سام‌و ترس‌و بیم، ئەو خەڵکە وەك زمانیان بەسترابێ وایە، زمانیان گۆناکا، بەس پێغەمبەرەکان (درووودو رەحمەت‌و سەلام‌و صەلات‌و بەرەکەتی خودای گەورەو مەزنیان لێ بێ) بەس ئەوان زات دەکەن کە قسە بکەن، داوای ئەو رۆژە سەخت‌و دژوارەی پێغەمبەرانیش هەر ئەوەیە: خۆش خۆش دەفەرموون: خودایە! بەخۆشی، خودایە! بەبێوەی، خودایە! بەسەلامەتی، خودایە! نەگلێن).

لە دۆزەخدا جۆرە قولاپ‌و قەڵەنگێ هەیە، قەڵبەدارن، قەڵبەکانیان وەك دڕکە کەڵەوێ وایە، خۆ بەچاوی خۆتان دڕکە کەڵەوێتان دیوە، فەرموویان: ئا، ئەی پێغەمبەری خودا! دیومانە. فەرمووی: دەڕێك وەك دڕکی کەڵەوێ وان، بەڵام خودا بۆخۆی نەبێ کەسی تر نازانێ کە ئەو قەڵبانە چەندە گەورەو زل‌و قەبەو زۆرن، جا ئەو قەڵبانە خەڵك دەرفێنن بەپێی خراپی کردەوەیان، جا کاتێ خەڵکەکە دەیانەوێ بەسەر پردی سیراتا بپەرنەوەو برۆن بۆ بەهەشت، ئەو قولاپانە لەمبەرو ئەوبەری

پردی سیراتەوە پڕیان پیادەکەن‌و پەلاماریان دەدەن‌و بەهۆی کردەوەی خراپی خۆیانەوە دەیان فڕێنن بۆ ناو دۆزەخ، جا هەیانە بەهۆی کردەوەی نالەباریانەوە بە فەتارەت دەچن، هەیشیانە لەبەر کردەوەی بەدی خۆیان قولاپەکان ئەنجن ئەنجنیان دەکەن، لەپاشا رزگاریان دەبێ، بازێکیش بەچنگە کڕێ‌و پەلە پڕووزە هەرچۆنێ بێ خۆیان دەرباز دەکەن‌و خودا لەو مەینەتە قوتاریان دەکا، هەتا کاتێ خودا دادگایی‌و مەحکەمەی بەندەکان تەواو دەکا، بەهەشتی بۆ جێی خۆیی‌و دۆزەخی بۆ جێی خۆی، وەکاتی ئەوە دێ کە یەزدانی پاك دەیەوێ بە میهرەبانیی خۆی زۆر کەسان، لە بڕواداران، لە دۆزەخ دەربهێنێ، فەرمان بە فریشتە گەل دەدا: کە ئەوانەی هیچ هاوبەشییان بۆ خودا دانەناوەو لەو دەستەیەن کە دەڵێن: (لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ)و خودا بە مەرحەمەتی خۆی ویستی خێری پێیان هەبێت، فەرمان دەدا بە فریشتەکان کە ئەوانە لە ئاگر دەربێنن، فریشتەکان بەشوێنەواری کوڕنووشدا، لەناو ئاگردا، دەیان ناسنەوە، چونکە هەموو ئەندامێکی مرۆڤ ئاگری دۆزەخ دەیخوات بێجگە لەو ئەندامانەی کە لەکاتی سەجدەدا دەکەونە سەر زەوی، ئەو حەوت ئەندامە خودا قەدەغەی کردوون لەسەر ئاگری دۆزەخ، کاتێ لە دۆزەخ دەردەچن بوون بە سووتەمەڕۆ، ئەوجا ئاوی ژیانیان پیادەکرێ، جا بەو ئاوە وەکتۆمەی ناو لیوەی لافاو سەوز دەبنەوە، ئیتر خودا بەتەواوی لەداد پرسیی بەندەکان لێ دەبێتەوە، تەنها پیاوێ دەمێنێتەوە کە دواهەمین بەهەشتییە کە دەچێتە ناو بەهەشت، رووی لە ئاگری دۆزەخە، دەڵێ: خودایە! بە میهرەبانیی خۆت رووم لەم ئاگرە وەرگێڕە، بەڕاستی هەوا بۆگەنەکەی پرووکاندوومی‌و تینەکەی سووتاندوومی‌و شەراو بڵێسەکەی برژاندوومی، ئیتر چەندە خودا حەزدەکا ئەوەندە لەخودا دەپاڕێتەوە. ئەوجا خودای گەورەو پیرۆز دەفەرموێ: خۆ ئەگەر ئەمەت لەگەڵ بکەم بەتەمانیت داوای شتی ترم لێ بکەی؟ دەڵێ: بێجگە لەوە داوای هیچی ترت لێناکەم، ئەوەندەی خودا مەیلی لەسەری بێ، بەڵێن‌و پەیمان بەخودا دەدا، کەلەوە زیاتر داوای شتی تر نەکا، ئەوکاتە خودا رووی لە ئاگرەکە دوور دەخاتەوەو روودەکاتە بەهەشت‌و خۆشی‌و گەشی‌و ناسك‌و نازداری ناو بەهەشت لەدوورەوە دەبینێ، چەندەی کە خودا مەیلی لەسەر بێ

ئەوەندە بێ دەنگ دەبێ، لەپاشدا دەڵێ: خودایە! ئەی پەروەردگارم! توخوا بمبەرە بەردەرگای بەهەشت، خودایش پێی دەفەرموێ: خانەخراپ! ئەی تۆ بەڵێن و پەیمانت بەمن نەدا کە لەوەزیاتر داوای هیچی ترم لێ نەکەی، ئەی ئادەمیزاد! چەندە بێ پەیمانی، دەڵێ: ئەی خودایە! ئەمە واو ئەی خودایە! ئەوە وا، وە زۆر دەپاڕێتەوە، تا خودا دەفەرموێ پێی: خۆ بەتەما نیت کە ئەمەم پێ بەخشیت داوای شتی ترم لێ بکەی؟ دەڵێ: خەیر! بە گەورەیی تۆ، ئەوەندەی خودا ویستی لەسەربێ بەڵێن و پەیمانی تر بەخودا دەدا، کە لەمەزیاتر داوای هیچی تر نەکا. جا خودا دەیباتە بەردەم دەرگای بەهەشت، جا کاتێ لەبەر دەرگای بەهەشت رادەوێستێ، بەتەواوی نازداری و خۆشی و باشی و گەشی بەهەشتی بۆ دەردەکەوێ، دیسان ئەوەندەی خودا مەیلی لێ بێ ئەوەندە بێ دەنگ دەبێ، پاشان دەڵێ: ئەی خودایە! بمبەرە ناو بەهەشت، خودای گەورەو پیرۆزیش پێی دەفەرموێ: ئەرێ تۆ ئەو هەمکە بەڵێن و پەیمانەت بەمن نەدا، کە لەوەزیاتر داوای هیچی تر نەکەی!؟ خانە خراپ! مرۆڤێکی چەندە پەیمان شکێنی!

دەڵێ: ئەی خودای من! ئومێد دەکەم کە نەبم بە بەدبەختترین دروستکراوانی تۆ کە لەدۆزەخ دەرچوون، ئیتر ئەوەندە لە خودا دەپاڕێتەوە هەتا خودای پیرۆزو گەورە پێی پێدەکەنێ و رقەکەی دەنیشێتەوەو بەزەیی پیادا دێتەوەو پێی دەفەرموێ: بچۆرە بەهەشتەوە. کاتێ بەندەکە دەچێتە ناو بەهەشتەوە، خودا پێی دەفەرموێ: حەزت لەچییە، بەبێ قەیدو شەرت داوای بکە، داوایەکی زۆر لەخودا دەکاو دڵی بۆهەرچی بچێ ئاواتی بۆ دەخوازێ، خودا خۆشی رێنمایی دەکاو مامۆستایی دەکاو دەیخاتە سەردەمی کە داوای ئەوەو ئەوەبکە لەو بەهرەو نازو نیعمەتانەی کە بەندەکە خۆی نەیبیستوون، هەتا هیچ تەمەنناو خۆزگەو ئاواتێکی نامێنێ، ئەو حەلە خودای گەورە پێی دەفەرموێ: هەموو ئەوانەی کە داوایانت کردووەو ئەوەندەی تریش بۆ تۆ!!

عەطای کوڕی یەزیدی لەیثی (کە تابیعییە، کە ئەم فەرموودەیە لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕێتەوە) دەفەرموێ: لەم کاتەدا کە ئەبو هورەیرە ئەم

فەرموودەیەی گێڕایەوە، ئەبو سەعیدی خودری لەوێ دانیشتبوو، هەتا ئێرە هیچ رەخنەو قسەیەکی نەبوو، بەڵام لێرەدا فەرمووی: شایەتی دەدەمو خودا دەکەم بەشایەت کەمن ئەم وتەیەی دواوەم لەدەمی پێغەمبەر خۆی ئاوا لەبەرکردووە: (ئەوەو دە ئەوەندەی تریش بۆ تۆ).

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: من هەر ئەوەم لەبەرکردووە، کە ئێستا گوتم، کە حەزرەت دەفەرموێ: (ئەوەی داوات کردووەو ئەوەندەی تریش بۆ تۆ).

ئەبو هورەیرە فەرمووی: (ئەو پیاوە دوا کەسە کەدەچێتە ناو بەهەشت).

{تاج/١٠، لاپەڕە: ٤٢٠، زنجیرە: ١٣٢، ژمارە: ١+٢+٣+٤ - تاج-٥ ژ-٥٧٠٤-٥٧٠٧ چ-٤} + {تەجریدی بوخاری/١، لاپەڕە: ٤١٥، ژمارە: ٨٠٦/٤٣٧، ٦٥٧٣، ٧٤٣٧}.

## ٥٨) باسی: دەرچوونی یەکتا پەرستان لە دۆزەخ (٤٥٦ - ٤٩٧).

## باب: خُرُوجِ المُوَحِّدِينَ مِنَ النَّارِ

٨٧- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الخُدْرِيّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « أَمَّا أَهْلُ النَّارِ الَّذِينَ هُمْ أَهْلُهَا، فَإِنَّهُمْ لاَ يَمُوتُونَ فِيهَا وَلاَ يَحْيَوْنَ، وَلَـكِنْ نَاسٌ مِنْكُمْ أَصَابَتْهُمُ النَّارُ بِذُنُوبِهِمْ أَوْ قَالَ بِخَطَايَاهُمْ، فَأَمَاتَهُمُ اللّهُ إِمَاتَةً، حَتَّى إِذَا كَانُوا فَحْمًا أُذِنَ بِالشَّفَاعَةِ فَجِيءَ بِهِمْ ضَبَائِرَ ضَبَائِرَ، فَبُثُّوا عَلَى أَنْهَارِ الْجَنَّةِ، ثُمَّ قِيلَ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ أَفِيضُوا عَلَيْهِمْ، فَيَنْبُتُونَ نَبَاتَ الْحِبَّةِ تَكُونُ فِى حَمِيلِ السَّيْلِ». فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: كَأَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَدْ كَانَ بِالْبَادِيَةِ. (م – ١/١١٨). {الحديث/ ٤٥٨}.

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درووود سڵاوی خودای گەورەی لەسەر بێ) فەرمووی: ئەو دۆزەخییانەی کە بە ئێجگاری دۆزەخین، ئەوانە هەتایە لەسەر ئەوحاڵە شڕە کە باسکراوە دەمێننەوە، نە ئەوەتە بۆخۆیان بمرنو بەمردن لە ئێشو ئازاری دۆزەخ رزگاریان ببێ، نە ئەوەتە بەخۆشیو ئاسوودەیی بۆخۆیان بژین. بەڵام ئەو دۆزەخییانەی کە خاوەن باوەڕنو بەهۆی تاوانەوە. یا فەرمووی: بەهۆی گوناهەوە، دووچاری ئاگری دۆزەخ بوون، ئەوانە لەپاش ماوەیێ لەسەر فەرمانی خودا، ئاگرەکە بەمراندن دەیانمرێنێ، هەتا

دەبن بەخەڵووز، تا ماوەی ناو دۆزەخیان تەواودەبێ، بۆیە خودا خەویان لێ دەخا هەتا هەست بە ئێش‌و ئازاری زۆرو دوورو درێژ نەکەن، ئەوکاتە ڕێگای تکاو تکاکاری دەدرێ، لاشەکانیان لەناو دۆزەخا، لێرەو لەوێ، وەك پارچە گەمرە سەپاون بەسەریەکاو کۆمەڵ کۆمەڵ بوون بە سرەو پەستراون بەسەریەکا، لەسەر ئەوحاڵە تەختە تەختەو کۆمەڵ دەیانهێنن‌و، لەگوێ جۆگاو قەراخ ڕووبارەکانی بەهەشت وەك شمەك هەڵیان دەڕێژن‌و دەڵێن: ئادەی ئەی بەهەشتییەکان! ئاو بکەن بەسەریاندا، ئیتر بەوئاوە وەك تۆمەی ناو لیوەو ئاوماڵك دەژێنەوەو بەرە بەرە شین دەبنەوەو زیندوو زیت دەبنەوە).

هەندێ لە ئامادەبووانی ناو کۆڕەکە فەرمووی: دەڵێی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆر لە دەشت‌و دەر ژیاوە، بۆیە وا بەم شێوەیە شارەزایی چاکی لە چۆنێتیی حاڵی کەژو کێو هەیە! (تاج/١٠، لاپەڕە: ١٢٧، زنجیرە: ١٣٢، ژمارەی فەرموودە: ٤. چاپی یەکەم = تاج-٥ ژ-٥٧٠٦ چ-٤).

٨٨- عَنْ أَنَسٍ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « آخِرُ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ رَجُلٌ، يَمْشِي مَرَّةً وَيَكْبُو مَرَّةً، وَتَسْفَعُهُ النَّارُ مَرَّةً، فَإِذَا مَا جَاوَزَهَا الْتَفَتَ إِلَيْهَا فَقَالَ: تَبَارَكَ الَّذِي نَجَّانِي مِنْكِ، لَقَدْ أَعْطَانِيَ اللَّهُ شَيْئًا مَا أَعْطَاهُ أَحَدًا مِنَ الأَوَّلِينَ وَالآخِرِينَ، فَتُرْفَعُ لَهُ شَجَرَةٌ فَيَقُولُ: أَيْ رَبِّ أَدْنِنِي مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ لأَسْتَظِلَّ بِظِلِّهَا، وَأَشْرَبَ مِنْ مَائِهَا، فَيَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: يَا ابْنَ آدَمَ لَعَلِّي إِنْ أَعْطَيْتُكَهَا سَأَلْتَنِي غَيْرَهَا؟ فَيَقُولُ: لاَ يَا رَبِّ، وَيُعَاهِدُهُ أَنْ لاَ يَسْأَلَهُ غَيْرَهَا وَرَبُّهُ تَعَالَى يَعْذِرُهُ لأَنَّهُ يَرَى مَا لاَ صَبْرَ لَهُ عَلَيْهِ، فَيُدْنِيهِ مِنْهَا فَيَسْتَظِلُّ بِظِلِّهَا، وَيَشْرَبُ مِنْ مَائِهَا، ثُمَّ تُرْفَعُ لَهُ شَجَرَةٌ أَحْسَنُ مِنَ الأُولَى، فَيَقُولُ: أَيْ رَبِّ أَدْنِنِي مِنْ هَذِهِ لأَشْرَبَ مِنْ مَائِهَا، وَأَسْتَظِلَّ بِظِلِّهَا، لاَ أَسْأَلُكَ غَيْرَهَا، فَيَقُولُ: يَا ابْنَ آدَمَ: أَلَمْ تُعَاهِدْنِي أَنْ لاَ تَسْأَلَنِي غَيْرَهَا؟ قَالَ: فَيُعَاهِدُهُ أَنْ لاَ يَسْأَلَهُ غَيْرَهَا، فَيَقُولُ: لَعَلِّي إِنْ أَدْنَيْتُكَ مِنْهَا تَسْأَلُنِي غَيْرَهَا؟ فَيُعَاهِدُهُ أَنْ لاَ يَسْأَلَهُ غَيْرَهَا، وَرَبُّهُ يَعْذِرُهُ لأَنَّهُ يَرَى مَا لاَ صَبْرَ عَلَيْهِ، فَيُدْنِيهِ مِنْهَا فَيَسْتَظِلُّ بِظِلِّهَا وَيَشْرَبُ مِنْ مَائِهَا، ثُمَّ تُرْفَعُ لَهُ شَجَرَةٌ عِنْدَ بَابِ الْجَنَّةِ، هِيَ أَحْسَنُ مِنَ الأُولَيَيْنِ، فَيَقُولُ: يَا ابْنَ آدَمَ أَلَمْ تُعَاهِدْنِي أَنْ لاَ تَسْأَلَنِي غَيْرَهَا؟ قَالَ: بَلَى يَا رَبِّ هَذِهِ لاَ أَسْأَلُكَ غَيْرَهَا، وَرَبُّهُ تَعَالَى يَعْذِرُهُ

لأَنَّهُ يَرَى مَا لاَ صَبْرَ لَهُ عَلَيْهَا، فَيُدْنِيهِ مِنْهَا، فَإِذَا أَدْنَاهُ مِنْهَا فَيَسْمَعُ أَصْوَاتَ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَيَقُولُ: أَيْ رَبِّ أَدْخِلْنِيهَا، فَيَقُولُ: يَا ابْنَ آدَمَ مَا يَصْرِينِي مِنْكَ، أَيُرْضِيكَ أَنْ أُعْطِيَكَ الدُّنْيَا وَمِثْلَهَا مَعَهَا؟ قَالَ: يَا رَبِّ أَتَسْتَهْزِئُ مِنِّي وَأَنْتَ رَبُّ الْعَالَمِينَ؟ فَضَحِكَ ابْنُ مَسْعُودٍ، فَقَالَ: أَلاَ تَسْأَلُونِّي مِمَّ أَضْحَكُ؟ فَقَالُوا: مِمَّ تَضْحَكُ؟ قَالَ هَكَذَا ضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالُوا: مِمَّ تَضْحَكُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: مِنْ ضِحْكِ رَبِّ الْعَالَمِينَ حِينَ قَالَ: أَتَسْتَهْزِئُ مِنِّي وَأَنْتَ رَبُّ الْعَالَمِينَ؟ فَيَقُولُ: إِنِّي لاَ أَسْتَهْزِئُ مِنْكَ، وَلَكِنِّي عَلَى مَا أَشَاءُ قَادِرٌ». (م – ١١٩ - ١٢٠). {الحديث/ ٤٦٢}.

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دواترین کەس کەدەچێتە بەهەشت، پیاوێکە بە سکە خشکێو چنگە کڕێو گاگۆڵکەو هەڵسوکەوتو پەلە پرووسکێ دەکەوێتە ڕێ هەتا خۆی لە دۆزەخ ڕزگار بکا، بەدەم ڕێگەوە ئاگرەکە شالاو دەبا بۆ دەموچاوی‌و دەموچاوی هەڵ دەکورووزێنێ، ڕووی دەبێ بە سووتەمەڕۆ، کە لەئاگری دۆزەخ ڕزگاری دەبێ خێسەیەکی لێ دەکاو دەڵێ: پیرۆزو بەفەڕە ئەو خودایەی کەمنی لەچنگی تۆ قوتار کرد، ئای لەم بەشە باشەی کە خودا بەمنی داوە، لە پێشینان‌و پاشینان بەکەسی تری نەداوە، ئەوجا دەڕوانێ وا شێخەڵێ لەدوورەوە دیارە، دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! لەو درەختە نزیکم بکەرەوە، هەتا لەبن سێبەرەکەیدا وچانێ بگرم‌و لەئاوی کانیاوەکەی بنی نۆش بکەم! خودای بالاّ دەست‌و شکۆمەندیش دەفەرموێ: ئەی نەوەی ئادەم! ڕەنگە ئەگەر ئەوەت پێ بدەم داوای شتی تریشم لێ بکەی؟ دەڵێ: خەیر، ئەی پەروەردگارم! بەڵێن‌و پەیمانی دەداتێ کە داوای هیچی تری لێ نەکا، خودایش بەزەیی پیادا دێتەوە، چونکە دەیبینێ ئۆقرەی لێ هەڵگیراوە بۆ سێبەرو بەهرەی ئەو شێخەڵە. ئەوجا دەیباتە بنی‌و لە سێبەرەکەیدا دادەنیشێ‌و لەئاوی کانیاوەکەی بنی دەخواتەوە، ئەوجا درەختێکی جوانتر لە درەختی پێشوو دەبینێ، لەپاش هەمان گوفتوگۆو بەڵێن‌و پەیمان، ئەویشی دەداتێ، دیسان درەختێکی جوانتر لە دوو درەختەکەی پێشوو لەبەردەم دەرگای بەهەشتا دەبینێ‌و داوای دەکاو، لەدوا هەمان ڕازو گلەیی‌و

پەیمانی پێشوو ئەویشی دەداتێ، کە دەچێتە ئەوێ گوێی لەدەنگی بەهەشتییەکان دەبێ، دەڵێ: ئەی پەروەردگاری من! توخوا بمبەرە ژوورەوە بۆناو بەهەشت!

خودایش دەفەرموێ: ئەی ئادەمیزاد! چەندە وڕکن‌و پەڵپگرو بێبارو بێ پەیمانیت، بەچی لە کۆڵم دەبیتەوە، ئەرێ بەوە رازی دەبیت‌و بەرۆکم بەردەدەیت‌و کۆتایی بەداواکانت دەهێنی، ئەگەر بەقەد دوو ئەوەندەی جیهانت لەناو بەهەشتا پێ بدەم؟ ئەویش شتی وا بەزۆر دەزانێ، بۆیە دەڵێ: ئەی خودایە! خۆتۆ لای خۆت خوداوەندی هەردوو جیهانی کەچی مەزاق بەهەژارێکی داماوی وەك من دەکەی!!

ئیبنو مەسعوود پێکەنی‌و فەرمووی: بۆچی لێم ناپرسن کە لەبەرچی پێ دەکەنم؟ گوتیان: لەبەرچی پێدەکەنی؟ فەرمووی: پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوا پێکەنی، یارانیش عەرزیان کرد (رەزاو خۆشنوودی خودایان لێ بێ) فەرموویان پێی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! بەچی پێدەکەنی؟ فەرمووی: بەوە پێدەکەنم کە ئەو پیاوە عەرزی خودا دەکا: خۆتۆ لای خۆت خودای هەموانی، خواوەندی هەردوو جیهانی، کەچی مەزاق‌و شۆخی بەداماوێکی وەك من دەکەی، خواوەند سەیری لەم قسە قوتەی دێ‌و لە قسەکەی پێ دەکەنێ! خودایش دەفەرموێ پێی: من شۆخی‌و مەزاق بەتۆ ناکەم‌و مەبەستم راستەقینەیە نەك گاڵتە، بەڵام کەس باڵا دەستی من نییە، ئەوەی ئارەزووی بکەم دەیکەم!). {تاج/١٠، لاپەڕە: ٥١٦، زنجیرە: ١٥٨، ژمارە: ٤ + ریاض صالحین/٤ - تاج٥ ژ-٥٧٩٢ ج٤- ٥/١٨٨٤، زنجیرە/٣٧٢}.

٨٩- عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) يُسْأَلُ عَنِ الْوُرُودِ؟ فَقَالَ: نَجِئُ نَحْنُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَنْ كَذَا وَكَذَا انْظُرْ أَيْ ذَلِكَ فَوْقَ النَّاسِ. قَالَ: فَتُدْعَى الأُمَمُ بِأَوْثَانِهَا وَمَا كَانَتْ تَعْبُدُ، الأَوَّلَ فَالأَوَّلُ، ثُمَّ يَأْتِينَا رَبُّنَا بَعْدَ ذَلِكَ، فَيَقُولُ: مَنْ تَنْتَظِرُونَ؟ فَيَقُولُونَ: نَنْظُرُ رَبَّنَا، فَيَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ، فَيَقُولُونَ: حَتَّى نَنْظُرَ إِلَيْكَ، فَيَتَجَلَّى لَهُمْ يَضْحَكُ، قَالَ: فَيَنْطَلِقُ بِهِمْ وَيَتَّبِعُونَهُ. وَيُعْطَى كُلُّ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ، مُنَافِقٍ، أَوْ مُؤْمِنٌ، نُوراً، ثُمَّ يَتَّبِعُونَهُ. وَعَلَى جِسْرِ جَهَنَّمَ كَلاَلِيبُ وَحَسَكٌ تَأْخُذُ مَنْ شَاءَ اللَّهُ تَعَالى ثُمَّ يُطْفَأُ نُورُ الْمُنَافِقِ، ثُمَّ يَنْجُو الْمُؤْمِنُونَ، فَتَنْجُو أَوَّلُ زُمْرَةٍ وُجُوهُهُمْ كَالْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ. سَبْعُونَ أَلْفاً لاَ

يُحَاسَبُونَ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ كَأَضْوَإِ نَجْمٍ فِي السَّمَاءِ، ثُمَّ كَذَلِكَ ثُمَّ تَحِلُّ الشَّفَاعَةُ، وَيَشْفَعُونَ حَتَّى يَخْرُجَ مِنَ النَّارِ مَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَكَانَ فِي قَلْبِهِ مِنَ الْخَيْرِ مَا يَزِنُ شَعِيرَةً فَيُجْعَلُونَ بِفِنَاءِ الْجَنَّةِ وَيَجْعَلُ أَهْلُ الْجَنَّةِ يَرُشُّونَ عَلَيْهِمُ الْمَاءَ حَتَّى يَنْبُتُونَ نَبَاتَ الشَّيْءِ فِي السَّيْلِ وَيَذْهَبُ حُرَاقُهُ ثُمَّ يَسْأَلُ حَتَّى تُجْعَلَ لَهُ الدُّنْيَا وَعَشَرَةُ أَمْثَالِهَا مَعَهَا). (م — ١/١٢٢). {الحديث/ ٤٦٨}.

ئەبو زوبەیر کە تابیعییە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: بەگوێی خۆم ژنەوتم لە جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودای لێ بێ) پرسیار کرا، سەبارەت بە تێپەڕبوون بەسەر پردی سیراتدا، لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا جابیر فەرمووی: (ئێمە لەڕۆژی قیامەتدا بە کۆمەڵ دێین). فەرمووی: نەتەوەکانی تریش بەناوی بتو خودا درۆینەکانیانەوە، بانگ دەکرێن کە بڕۆن بۆ پەڕینەوە لە پردی سیرات، ئیتر ملەت لەدوا ملەت شوێن خودای پەرستراوی خۆیان دەکەونو بەرەو مەحشەر، یا بەرەو پردی سیرات دەڕۆنو شوێن خودای خۆیان دەکەون. (بڕوانە: فەرموودەی ژمارە: ٨٦).

هەتا سەرە دەگاتە سەر نەتەوەی ئیسلام، ئەوجا پاش ئەوە پەروەردگارمان دێ بۆلامان، دەفەرموێ: (ئەوە بۆ ناڕۆن وەك ئەو خەڵکەی تر، چاوەڕێی کێ دەکەن؟ دەڵێن: چاوەڕێی پەروەردگاری خۆمانین، هەرکاتێ هات شوێنی دەکەوین، دەفەرموێ: دەی من خودای ئێوەم! دەڵێن: دەبا تەماشات بکەینو شوێنت ناکەوین هەتا نەتبینین، جا بەدەم پێکەنینەوە خودا خۆی دەردەخات بۆیانو ئەوانیش دەیناسنەوەو پێشیان دەکەوێو ئەوانیش شوێنی دەکەون. چرایێ دەدرێتە دەستی هەموو کەسێکیان، چ ناپاكو مونافیق بێ، چ بڕواداری چاكو پاك بێ، ئەوجا بەو نوورەوە هەموو شوێن پەروەردگاریان دەکەون بەرەو بەهەشت. لەسەر پردی سیرات قولاپگەلو دڕکە کەڵوێ هەیە، هەرخوا دەزانێ کە چەندە زۆرو گەورەن، لەکاتی تێپەڕبوونی سەرپردی سیراتا، هەرکەسێ خودا خواستی لەسەری بێ پڕی پیادەکەنو دەیفڕێنن بۆناو دۆزەخ. جا بەفەرمانی خودا، لەکاتو شوێنی دیاریکراودا، چرای ناپاکەکان (واتە: منافقەکان) دەکوژێتەوە، لەئەنجاما بڕوادارەکان

رزگاريـان دەبـێ، يەكـەم دەسـتەی رزگاربوويـان، روويـان وەك مـانگی چـواردە دەدرەوشـێتەوە، حـەفتا هـەزار كـەس بـەبێ لێپرسـينەوە دەڕۆنـە نـاو بەهەشـتەوە، دەستەی دوا ئەوان رووبان وەك گەشـترين ئەسـتێرەی ئاسمـان ئەدرەوشـێتەوە، ئـيتر هەروەها چين لەدوا چين‌و كۆمەڵ لەدوا كۆمەڵ نوورەكەيان كەم دەبێتەوە، هەيانـە نوورەكـەيان بەقـەد كێـوێ دەبـێ، هەرەكەمەكـەيان نوورەكـەی وا لەپـەنجە كەڵەيـدا جاروبار هەڵ دەبێ‌و جاروبار دەكوژێتەوە.

هـەتا كـاتی تكاكـاری دێـت، وە دەسـت دەكـرێ بـە شـەفاعەت‌و تكـاكردن، هـەتا هەركەسێ گوتوويەتی (لاَ إله إلاَّ الله) وە سەنگی دەنكە جۆيەكی بچكۆلە خێر لـەناو دڵيـا بووبـێ لـەئاگر دەردەهێنـرێ، لـە حەوشـەی بەهەشـتا دادەنـرێن بـوون بـە قەرەبرووت‌و سووتەمەرۆ، ئەوجا خەڵـكی بەهەشـت ئاوپرژێنيـان دەكـەن بـە ئـاوی ژيان، جا بەوئاوە وەك تۆمەی ناو ليوەی لافـاو سـەوز دەبنـەوە، بـەرە بـەرە لەشـيان گۆشتەو زوون دێنێتەوەو شوێنەواری سووتانەكەيان سارێژ دەبێتـەوە! ئـيتر دەسـت دەكـەن بـەداوای شـت لـەخودا لەبەهەشـتا، بەلايـەنی كەمـەوە بەقـەد دونيـاو دەئەوەندی تريش لەگەڵيا بێ، دەدرێ بەهەر يەكێكيان). {بڕوانە: ئەم شوێنانە بۆ فـامی تـەواوی ئـەم فەرموودەيـە: ١- فـەرموودەی ژمـارە: ٨٦، ٨٧، ٨٨، كـە لەپێشـەوە رابـووردن، ٢- فـەرموودەی ژمـارە:٦ ز/١٣١ بەرگـە/١٠ تـاج-٥ ژ-٥٧٠٣ ل-٤٣٨ چ-٤ + ژ-٤، ز/١٣٠ بـەرگی/١٠، ل-٢٩٠ + ژ-٧، ز-١٣٠ بـەرگی/١٠، ل-٤٠١ تـاج-٥ ژ-٥٦٩٣ + ژ-٤، ز-١٣٢ بەرگی/١٠، ل-٤٢٨ + ٣ تـاج-٥ ژ-٥٧٠٦ — تەفسيری (مَوَاهِبُ الـرَّحْمن) مامۆسـتا مـەلا عبـدالكريمی مـودەرريس، بـەرگی/٧، لاپـەڕە: ٢٦٣ هـەتا ٢٦٨. سـوورەتی حەديـد ئايەتی/١١ هەتا ئايەتی/١٥ + ژمارە/١٨٧٦ تەجريد= ٥٧٠٥ فەتح = بەرگی/٥، ل - ١٦٨}.

٩٠- عَنْ يَزِيدُ الْفَقِيرُ قَـالَ: (كُنْـتُ قَـدْ شَـغَفَنِي رَأْيٌ مِـنْ رَأْيِ الْخَـوَارِجِ فَخَرَجْنَـا فِـي عِصَابَةٍ ذَوِي عَدَدٍ نُرِيدُ أَنْ نَحُجَّ ثُمَّ نَخْرُجَ عَلَى النَّاسِ. قَالَ: فَمَرَرْنَا عَلَى الْمَدِينَةِ فَإِذَا جَـابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ يُحَدِّثُ الْقَوْمَ، جَالِسٌ عَلَى سَارِيَةٍ عَنْ رَسُولِ اللَّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ)، قَالَ: فَإِذَا هُوَ قَدْ ذَكَرَ الْجَهَنَّمِيِّينَ قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: يَا صَاحِبَ رَسُـولِ اللَّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) مَا هَذَا الَّذِي تُحَدِّثُونَ؟ وَاللَّهُ يَقُولُ: (إِنَّكَ مَنْ تُـدْخِلِ النَّـارَ فَقَـدْ أَخْزَيْتَـهُ) وَ (كُلَّمَـا

أَرَادُوا أَنْ يَخْرُجُوا مِنْهَا أُعِيدُوا فِيهَا). فَمَا هَذَا الَّذِى تَقُولُونَ؟ قَالَ: فَقَالَ: أَتَقْرَأُ الْقُرآنَ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: فَهَلْ سَمِعْتَ بِمَقَامِ مُحَمَّدٍ عَلَيْهِ السَّلاَمُ، يَعْنِى الَّذِى يَبْعَثُهُ اللَّهُ فِيهِ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: فَإِنَّهُ مَقَامُ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَحْمُودُ الَّذِى يُخْرِجُ اللَّهُ بِهِ مَنْ يُخْرِجُ، قَالَ: ثُمَّ نَعَتَ وَضْعَ الصِّرَاطِ وَمَرَّ النَّاسِ عَلَيْهِ، قَالَ: وَأَخَافُ أَنْ لاَ أَحْفَظُ ذَاكَ، قَالَ: غَيْرَ أَنَّهُ قَدْ زَعَمَ أَنَّ قَوْمًا يَخْرُجُونَ مِنَ النَّارِ بَعْدَ أَنْ يَكُونُوا فِيهَا، قَالَ: يَعْنِى فَيَخْرُجُونَ كَأَنَّهُمْ عِيدَانُ السَّمَاسِمِ، قَالَ: فَيَدْخُلُونَ نَهَرًا مِنْ أَنْهَارِ الْجَنَّةِ، فَيَغْتَسِلُونَ فِيهِ فَيَخْرُجُونَ كَأَنَّهُمُ الْقَرَاطِيسُ فَرَجَعْنَا، قُلْنَا: وَيْحَكُمْ أَتُرَوْنَ الشَّيْخَ يَكْذِبُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَرَجَعْنَا، فَلاَ وَاللَّهِ مَا خَرَجَ مِنَّا غَيْرُ رَجُلٍ وَاحِدٍ، أَوْ كَمَا قَالَ أَبُو نُعَيْمٍ). (م — ١/١٢٣). {الحديث/ ٤٧٢}.

**یەزیدی ئەل‌فەقیر** (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) **فەرمووی: ڕای کۆمەڵەی خەواریج زۆر بەدڵم بوو، لەناخی دڵما جێگەی خۆی کردبۆوە، کە بەبۆچوونی ئەوان خاوەنی گوناهە گەورەکان لەئاگری دۆزەخا هەتا هەتایین، وە ئەوەی چووە ناو دۆزەخەوە لێی دەرناچێ! جا کۆمەڵێ بووین، ژمارەیەکی زۆر بووین، لە وڵاتی خۆمان بەنیازی حەج دەرچووین، بەنیازی ئەوەیش کە لەپاش حەجەکە دەست بکەین بەبڵاوکردنەوەی مەزهەبی خەواریج و بانگەشەی بۆبکەین.**

**لە مەدینە چووینە لای هاوڕێی پێغەمبەر: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا، لەپاڵ کۆڵەکەیەکا، لەناو مزگەوتەکەی پێغەمبەردا** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دانیشتبوو فەرموودەی پێغەمبەری بۆ مەردوومەکە دەخوێندەوە. فەرمووی: جا لەبارەی دۆزەخییەکانەوە فەرموودەی خوێندەوە، فەرمووی: منیش پێم گوت: ئەی هاوڕێ بەڕێزەکەی پێغەمبەری خودا!** (دروودی خودای لەسەر بێ)، **ئەم فەرموودانە چییە کە ئێوە دەیانخوێننەوە؟ کە بەپێچەوانەی دەقی ئایەتەکانی قورئانەوەن و ئەوەتا قورئان بەدەق دەفەرموێ: {رَبَّنَا إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ النَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ - سورة آل عمران/٣/١٩٣}. واتە: ئەی خودای ئێمە! هەرکەسێ تۆ بیخەیتە ناو ئاگری دۆزەخەوە بەڕاستی ریسوات کردووە).**

لە سوورەتی سەجدەیشدا بەدەق دەفەرموێ: {كُلَّمَا أَرَادُوا أَن يَخْرُجُوا مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا فِيهَا وَذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ-سورة سەجدە/٢٢/٢٠}. واتە: جار لەگەڵ جارا، دۆزەخییەکان کە هەوڵی ئەوە دەدەن کە لەئاگری دۆزەخ دەرچن‌و خۆیان رزگارکەن، بەرلەوە کە بەتەواوی رزگاریان ببێ‌و لێی دەربچن، دووبارە دەخرێنەوە ناو نیرینەی ئاگرەکە). کەواتە ئیتر ئێوە باسی چی دەکەن‌و ئەم قسانە چییە دەیڵێن، کە گوایە هەندێ دۆزەخی لە دۆزەخ دەردەچن‌و رزگاریان دەبێ‌و دەچنە بەهەشت؟

ئیمامی جابیر فەرمووی پێم: ئایا قورئان دەخوێنی؟ گوتم: بەڵێ، فەرمووی: دەی باشە ئایا لە قورئانا باسی (مَقَاماً مَحْمُوداً)نی موحەممەدت بیستووە، (دروودی خودای لەسەر بێ)؟ مەبەستی ئیمامی جابیر ئەو پلەو پایەی پێغەمبەرە کە خودا لەم ئایەتەدا باسی کردووە، کە دەفەرموێ: {وَمِنَ اللَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِ نَافِلَةً لَكَ عَسَى أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُوداً - سورة الإسراء/ ١٧/٧٩}. واتە: بەشەویش لەخەو هەستە، بۆ شەونوێژ، ماوەیێ لەشەو تەرخان بکە بۆ نوێژو قورئانی تیا بخوێنە، ئەم زیادە نوێژو شەو نوێژو قورئان خوێندنە، زیادە ئەرکی سەر شانی تۆیە بەتایبەتی، ئومێدە کە پەروەردگارت تۆ بباتە مەقامی شەفاعەتی گەورە، کە پێشینان‌و پاشینان سوپاس‌و وەسفی جوانی تۆی تیادەکەن).

کاتێ جابیر وایفەرموو، منیش عەرزیمکرد: بەڵێ بیستوومەو ئاگام لەم ئایەتە هەیە، کەباسی ئەم پایە بەرزەی پێغەمبەر دەکا، فەرمووی: دەی مەبەست ئەو (مَقَامًا مَّحْمُوداً)نەیە کە دراوە بە موحەممەد، کە لەوجێگەو مەقامەدا خودا تکای موحەممەد گیرا دەکاو دۆزەخییەکی زۆر لەئاگر دەردەچن بەتکای ئەو. فەرمووی: ئیتر جابیر باسی ئەوەی کرد کەچۆن پردی سیرات دائەنرێ‌و مەردوم بەسەریدا تێدەپەڕن، هەتا بچن بۆ بەهەشت. فەرمووی: دەترسم بەباشی ئەوەم لەبەرنەبێ‌و بەتەواوی رەوانم نەبێ بۆیە هەمووی ناگێڕمەوە. فەرمووی: بەڵام جابیر فەرمووی: (کۆمەڵێ ماوەیێ لە ئاگردا دەمێننەوەو لەپاشا لێی دەردەچن). فەرمووی: واتە: کە لەئاگری دۆزەخ دەردەچن وەك لاسکی دارکونجی، کە لەبەرخۆر دادەنرێ، هەتا وشك

ببیّو دانەکەی لیّ بگیریّ، چۆن ئەو لاسکە باریك دەبیّو ڕەش هەڵدەگەڕیّ، ئەوانیش کە لەدۆزەخ دەردەچن ئاوا باریكو ڕەش دەبن. فەرمووی: (جا دەچنە ناو روباریّ لە روبارەکانی بەهەشت، لەویّ خۆیان پاك دەشۆن کە لیّی دەردەچن دەڵیّی پەڕەی کاغەزن، ئەوەندە پاکبوونەتەوەو واسپی دەنویّنن.

یەزیدی فەقیر فەرمووی: لەکاتی گەڕانەوەدا لەناو خۆماندا گوتمان: کۆستتان کەویّ، بەس نەبوو کە ئەم هەڵەیەمان نەکرد، ئەقڵ نایگریّ کە ئەم پیرە میّردە درۆ بەدەم پیّغەمبەرەوە بکات، ئیتر پەشیمان بووینەوە لە بڕیارەکەمانو گەڕاینەوە بۆ وڵاتی خۆمانو وازمان لە خەواریجیی هیّناو بەخودا کەسمان لیّ نەچووە ناو کۆمەڵەی خەواریجەکان، بیّجگە لە تاقە پیاویّکمان). ئەمەی من گوتم پوختەی باسەکەیە، بەڵام {فەضلی کوڕی دەکەن} کە مامۆستاکەی موسلیمە لە گیّڕانەوەی ئەم فەرموودەیەدا، ئەو زۆر بە ڕیّكو پیّکی ئەم فەرموودەیەی گیّڕایەوە، ئەگەر کەمو کووڕییەك لە گیّڕانەوەی مندا هەبیّ، لەهی ئەودا نییە، کەنازناوی ئەبو نەعیمە.

٩١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ أَرْبَعَةٌ، فَيُعْرَضُونَ عَلَى اللَّهِ تَعَالى، فَيَلْتَفِتُ أَحَدُهُمْ فَيَقُولُ:أَيْ رَبِّ إِذْ أَخْرَجْتَنِي مِنْهَا فَلاَ تُعِدْنِي فِيهَا، فَيُنْجِيهِ اللَّهُ مِنْهَا ». (م/١-١٢٣).{الحديث/٤٧٣} :

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لیّ بیّ) دەفەرمویّ: پیّغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیّ) فەرمووی: (چوار کەس لەئاگر دەردەکریّنو دەبریّن بۆلای خودای پەروەردگار، جا یەکیّکیان ئاوڕ دەداتەوەو دەڵیّ: ئەی پەروەردگارم! مادەم لەئاگر دەرت هیّناوم، مەمخەرەوە ناوی، خوداش رزگاری دەکا لیّی).

**ڕوونکردنەوە:**

١-زۆربەی ئەو زانیاریانەی کەوان لەم فەرموودانەی ئەم باسەدا قسە لەغەیب دەکەن، لەبەرئەوەی کە غەیب بەهۆکاری ئاسایی نازانریّ، ئەوەی لەسەر ئیّمەیە

بروایان پێبکەین، ئەگەر پێویستی کرد لەلایەنی زانا پسپۆڕەکانەوە تەئویل بکرێن، یا فامی تەواویان تەفویض بە عیلمی زاتی حەق بکرێ.

٢-بۆ تێگەیشتنی هەر فەرموودەیێ، کە کێشەیێ لە واتاکەیدا هەبێ، دەبێ تەماشای گێڕانەوەکانی تری ئەو فەرموودەیە بکرێ، وەك زاناکان دەفەرموون: ﴿القرآنُ یُفَسِّرُ بَعْضُهُ بَعْضاً﴾ وەهەروەها دەفەرموون: ﴿الحدیث یُفَسِّرُ بَعْضُهُ بَعْضاً﴾.

٣-موحەممەدی کوڕی موسلیمی کوڕی تدرس، ناسراو بەئەبو زوبەیری مەککی، لە رجالی کوتوبی سیتتەیە، کە بوخاریو موسلیمو ئەبو داوودو تەرمەزیو نەسائیو ئیبنو ماجەن، ئەوەیش نیشانەی متمانە پێبوونیەتی، لە کتێبی (تهذیب التهذیب)ی ئیبنو حەجەری عەسقەلانیدا، لەباسی ژیاننامەکەیدا دەفەرموێ: (ریواتی هەیە لە عەبادیلەی ئەربەعەوەو لە عائیشەو جابیرو کەسانی ترەوە، هەروا زانا گەورەکانی فەرموودەیش گێڕانەوەیان لەوەوە ئەنجامداوە، وەك عەطاو زوهریو ئەعمەشو خەڵکێکی زۆری تریش).

وەرقاء دەفەرموێ: بە شوعبەم گوت: بۆچی وەك جاران، فەرموودە لە ئەبو زوبەیرەوە ناگێڕیتەوە؟ فەرمووی: (چونکە جارێ دیم شتی دەکێشا بۆخۆی سلاوی تەرازووەکەی دەدایەوە!).

ئەبو زوبەیر فەرموودەی دەنووسییەوە، یەحیای کوڕی موعین دەفەرموێ: لەبەینی روکنو مەقاما، شەیبە ئاوا ئەبو زوبەیری سوێنددا: ئایا بەگوێی خۆت ئەم فەرموودانەت لە جابیری کوڕی عەبدوڵلا بیستوە؟ ئەویش فەرمووی: ئا سوێندم بەیەزدانی پاك بیستوومن لە جابیر).

تەرمەزیو کەسانی تریش دەفەرموون: (ساڵی سەدو بیستو شەشی کۆچی وەفاتی کردووە).

٤-یەزیدی ئەل-فەقیر، لە پیاوانی صەحیحەینو ئەبو داوودو نەسائیو ئیبنو ماجەیە، کە پێیان دەگوترێ: شەش کتێبەکە، گێڕانەوەی هەیە لە جابیرو ئەبو سەعیدو ئیبنو عومەرەوە، لەویشەوە مسعوودیو ئەبو حەنیفەو ئەعمەشو

کەسانی تریش گێڕانەوەیان ئەنجامداوە. لەپێشا لە کووفە بوو، دوایی لە مەککە نیشتەجێبوو، فەرموودەی دەنووسییەوە، بۆیە پێی دەگوترێ: (الفقیر) چونکە بڕبڕاگەی پشتی دەئێشا بەهۆی ڕووداوێکەوە، گەڵێ جار ناچاری دەکرد کە پشتی کۆم بکاتەوە.

## ٥٩) باسی تکاکردن (باب: الشَّفَاعَة)

٩٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْماً بِلَحْمٍ، فَرُفِعَ إِلَيْهِ الذِّرَاعُ، وَكَانَتْ تُعْجِبُهُ، فَنَهَسَ مِنْهَا نَهْسَةً فَقَالَ: « أَنَا سَيِّدُ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَهَلْ تَدْرُونَ بِمَّ ذَاكَ؟ يُجْمَعُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ الأَوَّلِينَ وَالآخِرِينَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، يُسْمِعُهُمُ الدَّاعِي، وَيَنْفُذُهُمُ الْبَصَرُ، وَتَدْنُو الشَّمْسُ، فَيَبْلُغُ النَّاسَ مِنَ الْغَمِّ وَالْكَرْبِ مَا لاَ يُطِيقُونَ وَمَا لاَ يَحْتَمِلُونَ فَيَقُولُ بَعْضُ النَّاسِ لِبَعْضٍ: أَلاَ تَرَوْنَ مَا أَنْتُمْ فِيهِ؟ أَلاَ تَرَوْنَ مَا قَدْ بَلَغَكُمْ؟ أَلاَ تَنْظُرُونَ مَنْ يَشْفَعُ لَكُمْ، إِلَى رَبِّكُمْ؟ فَيَقُولُ بَعْضُ النَّاسِ لِبَعْضٍ: إِئْتُوا آدَمَ، فَيَأْتُونَ آدَمَ، فَيَقُولُونَ: يَا آدَمُ أَنْتَ أَبُو الْبَشَرِ، خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ، وَنَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ، وَأَمَرَ الْمَلاَئِكَةَ فَسَجَدُوا لَكَ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلاَ تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ أَلاَ تَرَى إِلَى مَا بَلَغَنَا؟ فَيَقُولُ آدَمُ: إِنَّ رَبِّي غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنَّهُ نَهَانِي عَنِ الشَّجَرَةِ فَعَصَيْتُهُ، نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى نُوحٍ، فَيَأْتُونَ نُوحًا عليه السَّلاَم، فَيَقُولُونَ: يَا نُوحُ أَنْتَ أَوَّلُ الرُّسُلِ إِلَى الأَرْضِ، وَ سَمَّاكَ اللَّهُ (عَبْدًا شَكُورًا) ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلاَ تَرَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ أَلاَ تَرَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟ فَيَقُولُ لهم: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنَّهُ قَدْ كَانَتْ لِي دَعْوَةٌ دَعَوْتُ بِهَا عَلَى قَوْمِي، نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى إِبْرَاهِيمَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ، فَيَأْتُونَ إِبْرَاهِيمَ فَيَقُولُونَ: أَنْتَ نَبِيُّ اللَّهِ تَعَالَى وَخَلِيلُهُ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلاَ تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ أَلاَ تَرَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟ فَيَقُولُ لَهُمْ إِبْرَاهِيمُ: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلاَ يَغْضَبُ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَذَكَرَ كَذِبَاتِهِ، نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى مُوسَى، فَيَأْتُونَ مُوسَى عليه السَّلاَمُ، فَيَقُولُونَ: يَا مُوسَى أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ، فَضَّلَكَ اللَّهُ تَعَالَى بِرِسَالاَتِهِ

وَبِتكَلِيمِهِ عَلَى النَّاسِ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، ألاَ تَرَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ ألاَ تَـرى مَـا قَـدْ بَلَغَنَـا؟ فَيَقُولُ لَهُمْ: إِنَّ رَبِّى قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَـهُ، وَإِنِّى قَدْ قَتَلْتُ نَفْسًا لَمْ أُومَرْ بِقَتْلِهَا، نَفْسِى نَفْسِى نَفْسِـى، اذْهَبُـوا إِلَـى عِيسَـى، فَيَـأْتُونَ عِيسَى عليه السَّلاَم، فَيَقُولُونَ: يَـا عِيسَـى أَنْـتَ رَسُـولُ اللَّـهِ، وَكَلَّمْـتَ النَّـاسَ فِـى الْمَهْـدِ (وَكَلِمَتُهُ مِنْهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ) فَاشْفَعْ لَنَا إِلى رَبّكَ، ألاَ تَرَى مَا نَحْـنُ فِيـهِ؟ ألاَ تَرى مَا قَدْ بَلَغَنا؟ فَيَقُولُ لَهُمْ عِيسَى: إِنَّ رَبِّى قَـدْ غَضِـبَ الْيَـوْمَ غَضَـبًا لَـمْ يَغْضَـبْ قَبْلَـهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ لَهُ ذَنْبًا، نَفْسِى نَفْسِى نَفْسِى، اذْهَبُوا إِلَى غَيْـرِى، اذْهَبُوا إِلَى مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَيَأْتُونَى، فَيَقُولُونَ: يَا مُحَمَّدُ أَنْتَ رَسُولُ اللَّـهِ وَخَاتَمُ الأَنْبِيَاءِ، وَ غَفَرَ اللَّهُ لَـك مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، ألاَ تَـرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ ألاَ ترى مَا قَدْ بَلَغَنا؟ فَأَنْطَلِقُ فَآتِى تَحْتَ الْعَرْشِ، فَأَقَعُ سَاجِدًا لِرَبِّى، ثُمَّ يَفْتَحُ اللَّهُ تَعَالى عَلَيَّ وَيُلْهِمُنِي مِنْ مَحَامِدِهِ وَحُسْنِ الثَّنَـاءِ عَلَيْـهِ شَيْئًا، لَـمْ يَفْتَحْـهُ لأَحَـدٍ قَبْلِى، ثُمَّ قَالَ: يَا مُحَمَّدُ ارْفَعْ رَأْسَكَ، سَلْ تُعْطَهْ، اشْفَعْ تُشَفَّعْ، فَأَرْفَعُ رَأْسِى، فَأَقُولُ: يَـا رَبِّ أُمَّتِى، أُمَّتِى! فَيُقَالُ: يَا مُحَمَّدُ أَدْخِلْ الْجَنـةَ مِـنْ أُمَّتِـكَ مَـنْ لاَ حِسَابَ عَلَيْـهِ مِـنَ الْبَـابِ الأَيْمَنِ مِنْ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ، وَهُمْ شُرَكَاءُ النَّاسِ فِيمَا سِوَى ذَلِـكَ مِـنَ الأَبْـوَابِ، وَالَّـذِى نَفْـسُ محمدٍ بِيَدِهِ إِنَّ مَا بَيْنَ الْمِصْرَاعَيْنِ مِنْ مَصَارِيعِ الْجَنَّةِ لَـكمَا بَيْنَ مَكَّةَ وَهَجَرَ، أَوْ كَمَـا بَـيْنَ مَكَّةَ وَبُصْرَى». (م/١/١٢٧ - ١٢٩). {الحديث/ ٤٧٩. إيمان. بخاري. أحاديـث الأنبيـاء: ٣٣٦١، ٣٣٤٠، ٣٣٦١ تجريد/٤، لاپەڕە: ٤٥٣، ژمارە: ١٦٧٠، تجريد/٤٧١٢ فتح}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: ڕۆژێـك مەرگەی گۆشتیان بـۆ پێغەمبـەر هێنـا، پێغەمبــەر** (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) **حــەزی لەگۆشــتی دەسـت بـوو، لەبەرئــەوە دەستێـكیان بۆدانا، قەپاڵێـكی لێ گرتو فەرمووی: (لـە دواڕۆژدا، لـە قیامەتـدا، خـۆم گەورەو سەروەری بەرەی ئادەمیزادم، ئایا دەزانن ئەوە بۆ؟ لـە ڕۆژی دواڕۆژدا خـودا پێشـینانو پاشـینانی مــەردوم، لەیــەك دەشــتی تــەختی پــانو پــۆڕو بەرینــدا، كۆدەكاتەوە، بانگكەرێ بانگیان بكا، هـەموویان گوێیـان لێیـەتی، دەنگـی یـەك كـەس بـەگوێی هـەموویان دەگـات، كەسێــكیش لـەلای خۆیـەوە تەماشـایان بكـا هـەموویان دەبینێ، وەك چۆن ئێستا بەهۆی رادیۆو تەلەفیزیۆنەوە لەهەموو كونو قوژبنێـكی**

جیهاندا گوێمان لە دەنگ‌و رەنگی وتارخوێن‌و قسەکەرو یاریکەرو کارکەرە ئاوا، خۆریان لێ نزیك دەبێتەوە تەواو تەواو، تینی هەتاوەکە زۆریان بۆ دێنێ (بڕوانە: تاج/١٠، لاپەڕە - ٣٤٦، زنجیرە: ١٢٠، ژمارە: ٣=تاج/٥ ز:١٢٠ ژمارە/٥٦٤٩) + (تاج/٦، لاپەڕە: ٨، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٣= تاج/٤ ز/٣ ژ/٣٦٩٢) مەردوم دەکەونە خەم‌و پەژارەو تەنگانەیەکی واوە، نەوزەیان لەبەردا دەمێنێ، وەنە بەرگەی ئەوە دەگرن، لەناو خۆیانا بەیەکتری دەڵێن: خۆ دەبینن لە چ تەنگانەیەکداین، ئادەی بەڵکوو کەسێك بدۆزینەوە لەلای خودای پەروەردگارمان تکامان بۆ بکات، سا بەڵکوو لەم تەنگانەیە رزگارمان بکات. لەناو خۆیانا بەیەکتری دەڵێن: بابچین بۆ خزمەت باوە ئادەم، دەچنە خزمەتی (سڵاوی خودای لێ بێ)، پێی دەڵێن: ئەی ئادەم! تۆ باوکی هەموو بەرەی ئادەمیزادی، خودا بەدەستی خۆی لە قوڕ دروستی کردووی، لەگیانی خۆیی کردووە بە بەرتا، فەرمانی کردووە بە فریشتەکانی، کوڕنووشیان بۆ بردیت، کەوابوو تۆ لەلای خودا خاترت هەیە، لەبەرئەوە لە خزمەت خودادا تکامان بۆ بکە، ئایا نابینی کەچیمان بەسەر هاتووە، سەیرناکەی کە تووشی چ رۆژێکی رەش بووین؟

ئادەم دەفەرموێ: ئەمڕۆ پەروەردگارم رقێکی وای هەڵساوە، نە لەمەوبەرو نەلەمەودوا، نەرقی وای هەڵساوەو، نەرقی وای هەڵدەستێ، کاتی خۆی لە بەهەشتا، خودا درەختێکی لێ قەدەغە کردوومو، فەرمووی: {وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ وَكُلاَ مِنْهَا رَغَداً حَيْثُ شِئْتُمَا وَلاَ تَقْرَبَا هَـذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الْظَّالِمِينَ} ئاوا فەرمانی پێ کردم کە لەو درەختە نەخۆم، بەڵام من بەگوێم نەکردو بێ فەرمانی ئەوم کردو لە درەختەکەم خوارد، من تەنیا خەمی خۆمەو بەس (نەفسی، نەفسی، نەفسی = خۆم، خۆم، خۆم، هەقم بەسەر کەسی ترەوە نییە). بچنە لای کەسێکی تر، بڕۆنە خزمەتی نووح (بڕوانە: تاج/١، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٣٦، لاپەڕە: ٣٨).

ئەوجا عەشاماتە لێقەوماوەکە دەڕۆنە خزمەتی نووح پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی دەکەن: ئەی نووح! تۆ یەکەم پێغەمبەری رەوانەکراوی خوای، بۆسەر خەڵکی سەر رووی زەوی، خودا لەقورئاندا ناوی ناویت بەندەی سوپاسگوزار، وەك

دەفەرموێ: {ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ إِنَّهُ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا - سورة الإسراء/١٧/٣}. کەواتە: لەبەرئەوە لەخزمەت پەروەردگارتا تکامان بۆبکە، خۆدەبینی حاڵمان چەن پەرێشان و پەشێوەو چیمان بەسەرهاتووە؟ نووحیش پێیان دەفەرموێ: ئەمرۆ پەروەردگارم رقێکی سەختی وای هەڵساوە، نە لەمەوبەرو نە لەمەودوا، نە رقی وای هەڵساوەو، نە رقی وای هەڵدەستێ، وەکی تریش من خودا نزایەکی گیرابووی پێ خەڵات کردم، بەڵام من پەلەم کردوو لە جیهاندا ئەو نزایەمم لەگەڵەکەی خۆم کرد، ئیتر رووی تەکلیفم نەماوە (نەفسی، نەفسی، نەفسی = خۆم، خۆم، خۆم) برۆن بۆلای ئیبراهیم (سڵاوی خودای گەورەی لەسەر بێ).

دەچنە خزمەتی ئەویش دەڵێن: ئەی ئیبراهیم! تۆ هەم پێغەمبەری خودایت و هەم خەلیلوڵڵای. واتە: لە خەڵکی سەر رووی زەوی تەنها هەر تۆی هەڵبژاردووەو کردوویتی بە دۆستی ئازیزی خۆی، لە خزمەت خودای پەروەردگارتا تکامان بۆ بکە، خۆ دەبینیت کەچۆن تووشی ئەم هەمکە خەم و ناخۆشییە بووین، سا بەشکوو بەزەوی بێتەوە پیاماناو لەم تەنگانەیە سەرفرازمان بفەرموێ. دەفەرموێ: ئەمرۆ پەروەردگارم رقی تەواوی هەڵساوە، کە نە لەمەوبەرو نە لەمەودوا رقی وای هەڵنەساوەو هەڵناسێ، وە بۆ پۆزش و عوزرخوایی باسی سێ درۆکەی خۆی دەکات، کە ئەم سێ شتەن: ١- (إِنِّي سَقِيم) بۆئەوەی کە دەوری چۆڵکەن تا بتەکان بشکێنێ، دەڵێ: من پەتادارم، کەدەوری چۆڵ دەکەن و بتەکان دەشکێنێ، ٢- کەدێنەوە دەڵێن: بۆ ئەم بتانەت شکاندووە؟ دەفەرموێ: (بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ) من نەیانم شکاندووە، شەڕیان بووە لەناو خۆیانا، گەورەکەیان شکاندوونی!! ٣- زۆرداری دەیەوێ سارا خاتوون لە حەزرەتی ئیبراهیم بسێنێ، پێی دەڵێ ئەم ژنە چیتە؟ دەڵێ: ئەمە خوشکمە ژنم نییە (بڕوانە: تەجرید، ژمارە: ٢٢١٧/٩٩٣ فەتح = بەرگی/٣، لاپەڕە: ٥٨ + بەرگی/٤، لاپەڕە: ٣٦، ژمارە: ٣٣٥٨/١٣٤٩).

ئەوجا ئیبراهیم دەفەرموێ: نفسی، نفسی، نفسی، خەمی خۆمەو بەس، سێ جار وادەفەرموێ، وە دەفەرموێ: بڕۆن بۆلای کەسێکی تر، بچن بۆ خزمەتی مووسا پێغەمبەر (سڵاوی خودای لەسەر بێ)، دەچن بۆ خزمەتی و دەڵێن: ئەی مووسا! تۆ فروستادەی

نازداری یەزدانی پاکی، خودا بە پەیامو نامەو گفتوگۆ لەگەڵتا باوی تۆی داوە بەسەر هەموو مەرومدا، دەی لە خزمەت خودادا تکامان بۆ بکە، خۆ خۆت چاوت لە حاڵمانە کە تووشی چی گۆبەندێك بووین، پێیان دەفەرموێ: ئەوە راستەو وەك ئێوە دەڵێن وایە، بەڵام ئەمڕۆ تکای وا گەورەو گشتی بەهەموو کەسێ ناکرێ، چونکە ئەمڕۆ خودا رقێکی وەهای هەڵساوە، قەت رقی وای هەڵنەساوە، سەرەڕای ئەوەیش من کاتی خۆی پیاوێکم لەخۆمەوە کوشت، کە خودا فەرمانی پێ نەکردبوم کە بیکوژم، ئاوا پۆزش دەهێنێتەوەو دەفەرموێ: نفسی، نفسی، نفسی: من تەنها مشووری خۆم دەخۆمو بەس. سێجار وادەفەرموێ. ئەوجا دەفەرموێ: بڕۆن بۆلای کەسێکی تر، بڕۆن بۆ خزمەتی عیسا (سلاوی خوای لێ بێ) دەچن عەرزی دەکەن: ئەی عیسا! تۆ هەم پێغەمبەری خودای، هەم بەساوایی لە بێشکەدا قسەو گفتوگۆت لەگەڵ مەردومدا کردووە، هەم ئەو وشە پیرۆزە یەزدانییەی کە خودا بۆخۆی گەیاندی بە مەریەمی دایکی تۆ، هەم گیانێکی پاکی لەلایەنی خوداوە، تۆ لەلای خودا گەلێ بەرێزی، کەوابوو ئادەی بفەرموو لە خزمەت خودای خۆتا تکامان بۆ بکەو لەم سەخڵەتییە رزگارمان بکە، خۆ خۆت چاوت لەبارودۆخمانە، کە چیمان بەسەرهاتووە، دەفەرموێ: ئەمڕۆ پەروەردگارم رقێکی گەورەی وای هەڵساوە، نە لەمەوبەرو نە لەمەودوا رقی وای نەهەڵساوەو نەهەڵئەسێ، نەفسی، نەفسی، نەفسی = خۆم، خۆم، خۆم. بڕۆن بۆلای کەسێکی تر، بڕۆن بۆلای موحەممەد (دروودو سلاوی خودای لەسەر بێ).

عیسا (سلاوی خوای لێ بێ) باسی گوناه ناکا، وەك پێغەمبەرەکانی پێش ئەو، بۆ عوزر خوایی، باسی گوناهەکانی خۆیان دەکرد.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: جا ئەوجا دێن بۆلای من، دەڵێن: ئەی موحەممەد! تۆ خاوەنی کۆمەڵێ بەهرەو شانازیی گەورە گەورەی، وەك ئەوە پێغەمبەری خودای، دواهێنەری پێغەمبەرانیو دوا پێغەمبەریو لەدوا تۆ پێغەمبەری تر نەهاتووە، خودا لە گوناهی بەرودوات خۆش بووە، کەوابوو بفەرموو تکاو شەفاعەتمان بۆبکە لەلای خودای خۆت، خۆ خۆت دەبینیت کەواین لە چ مەینەتێکا، ئیتر منیش دەردەچمو خۆم دەگەیەنمە ژێر تەختو بارەگای خوداو،

لەوێ كڕنوشێكی دوورو درێژی پڕ لەستایشی جوان دەبەم بۆ خودای خۆم، خودا زەینم دەكاتەوە، جۆرە ستایشێكی زۆر نایابو سوپاسێكی جوان جوانی خۆیم فێردەكاتو دەیخاتە ناو دڵمەوە، كەلەوەوبەر فێری كەسی تری نەكردبێ، لەپاشدا خودا دەفەرموێ: ئەی موحەممەد! سەرت هەڵبڕە لە كوڕنووش، داوابكە لەخودا هەرچی داوا دەكەی دەیدەم بەتۆ، تكابكە هەرتكایێ تۆ بیكەیت، گەورەبێ، یا بچووك، گیرای دەكەم. ئیتر منیش سەرم بەرزەوە دەكەمو دەڵێم: ئەی خودایە! بەزەویت بەگەڵی موسوڵمانی مندا بێتەوە، چەند جارێك وا دەڵێم، جا دەگوترێ: ئەی موحەممەد! ئەو حەفتا هەزار كەسانەی كە لێپرسینەوەیان لەسەر نییە، لەگەڵی موسوڵمانی خۆت، ئەوانە لە دەرگاكانی لای راستی بەهەشتەوە ببەرە ناو بەهەشتەوە، ئومەتەكەشت لەهەموو دەرگاكانی تری بەهەشتا، بۆ چوونە ژورەوە بۆناو بەهەشت، هاوبەشی ئەو خەڵكەی تربن. ئەوجا فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): بەوكەسە كە گیانی منی بەدەسە، كە دیارە كە خودای گەورەیە، بەینی دوو لاشیپانەكانی دەرگاكانی بەهەشت، بەقەد بەینی مەككەو حیمیەر دەبێ. یا فەرمووی: بەقەد مابەینی مەككەو بوسرا دەبێ) گێڕانەوەی ئێرە دەفەرموێ: بەقەد نێوانی مەككەو هەجەر دەبێ). (تاج/١٠، زنجیرە: ١٣٠، ژمارە: ٨ = ژمارە/٥٦٩١ بەرگی/٥ ج/٤، لاپەڕە: ٤٠٤) + (ژمارە: ٧١١ تەجرید = ١٤٧٤ فتح الباری = بەرگی/٢، لاپەڕە: ١٣٤).

### ٦٠) باسی فەرموودەكەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) من یەكەم كەس دەبم كە لەبەهەشتا تكاكاری دەكەم، وە لەهەموو پێغەمبەرەكانیش پەیڕەوانم زۆرتر دەبن. (٤٨٢ - ٤٨٤).

**باب: قولِ النبيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أنا أوَّلُ النَّاسِ يَشْفَعُ فِي الجنَّةِ وَأنا اكثر الأنبياءِ تَبَعاً**

٩٣- عَنْ أَنَسَ بْنُ مَالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « أَنَا أَوَّلُ شَفِيعٍ فِي الْجَنَّةِ، لَمْ يُصَدَّقْ نَبِيٌّ مِنَ الأَنْبِيَاءِ مَا صُدِّقْتُ، وَإِنَّ مِنَ الأَنْبِيَاءِ نَبِيًّا مَا يُصَدِّقُهُ مِنْ أُمَّتِهِ إِلاَّ رَجُلٌ وَاحِدٌ ».(م-١/ ١٣٠).{الحديث/٤٨٤.الإيمان}.

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەبەهەشتا من یەکەم تکاکار دەبم، هیچ کەس لە پێغەمبەرەکانی تر، ئەوەندەی من خەڵك ئیمانیان لەسەر شێوەیەکی ڕاستو دروست پێ نەهێناوە، پێغەمبەری وابووە لەپێش منەوە تاقە یەك پیاو لە ئۆمەتەکەی باوەڕی پێ هێناوە). {تاج/١٠، لاپەڕە: ٤٦٨، ژمارە: ٣ + لاپەڕە: ٣٩٠، ژمارە: ٣}.

**٦١) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داوای کردنەوەی دەرگای بەهەشت دەکا (٤٨٢ - ٤٨٥).**

**باب: استفتاح النبي (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بابَ الجنة**

٩٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « آتى بَابَ الْجَنَّةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَأَسْتَفْتِحُ، فَيَقُولُ الْخَازِنُ مَنْ أَنْتَ؟ فَأَقُولُ: مُحَمَّدٌ، فَيَقُولُ بِكَ أُمِرْتُ لاَ أَفْتَحُ لأَحَدٍ قَبْلَكَ». {الحديث/ ٤٨٥. إيمان}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەرۆژی دوارۆژا، دەڕۆمە بەردەرگای بەهەشتو، لەدەرگا دەدەم، دەرکەوانی بەهەشت دەفەرموێ: ئەوە کێیە، تۆ کێیت لەدەرگا دەدەی؟ دەڵێم: منم موحەممەدم، دەفەرموێ: خۆشم فەرمانم پێکراوە، کە لەپێش پێشا دەرگای بەهەشت بۆ تۆ بکەمەوە، وە لەپێش هاتنی تۆدا، دەرگای بەهەشت بۆ کەسی تر نەکەمەوە، کەواتە زۆر باشە بفەرموو وەرە ژوورەوە وابۆت دەکەمەوە). {تاج/١٠/٤٦٩، ژمارە: ٤}.

**٦٢) باسی فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ): (هەموو پێغەمبەرێ پاڕانەوەیەکی تایبەتی گیرابووی هەیە). (٤٥٦ - ٤٩٧).**

**باب: قَوْلِ النبيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (لِكُلِّ نَبِيٍّ دَعْوَةٌ مُسْتَجَابَةٌ).**

٩٥- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « لِكُلِّ نَبِىٍّ دَعْوَةٌ مُسْتَجَابَةٌ، فَتَعَجَّلَ كُلُّ نَبِيٍّ دَعْوَتَهُ، وَإِنِّى اخْتَبَأْتُ دَعْوَتِى شَفَاعَةً لأُمَّتِى يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَهِىَ نَائِلَةٌ إِنْ شَاءَ اللَّهُ مَنْ مَاتَ مِنْ أُمَّتِى لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا». {الحديث/ ٤٩٠. إيمان}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەموو پێغەمبەرێ نزاو پاڕانەوەیەکی تایبەتی هەیە، کە خودا قەبوولی دەکا لێی، هەموو پێغەمبەرەکانی تر، نزاکەی خۆیانیان بەزویی لەدنیادا کردووەو نزاکەیان گیرا بووە، بەلاّم من نزاکەی خۆمم هەلّگرتووە بۆ رۆژی قیامەت، لەوێ تکای پێ دەکەم بۆ ئۆمەتم، ئیتر ئەوەی لە ئۆمەتم لەسەر ئیمان‌و باوەڕی راست بمرێ‌و هیچ هاوبەش بۆ خودا پەیدانەکا، خودا حەزکا ئەوکەسە بەرئەم تکاو شەفاعەتەی منە دەکەوێ). (تاج/٤، لاپەڕە: ٢٧٧، زنجیرە: ٩١ – ش/ت) + (تەجریدی بوخاری/٢٣٩/٥. ژمارە: ١٩٧٥ تەجرید = ٦٣٠٤، ٧٤٧٤ - فتح).

## ٦٣) باسی نزاکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئۆمەتی
## باب: دعاء النبي (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لأمَّتِه.

٩٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِىَ اللّهُ عنهما): (أَنَّ النَّبِىَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَلاَ قَوْلَ اللَّهِ تَعَالَى فِى إِبْرَاهِيمَ عليه السَّلاَمُ ( رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ، فَمَنْ تَبِعَنِى فَإِنَّهُ مِنِّى وَمَنْ عَصَانِي). الآيَةَ، وَقَالَ عِيسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ: ( إِنْ تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِنْ تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ)، فَرَفَعَ يَدَيْهِ وَقَالَ: اللَّهُمَّ أُمَّتِى أُمَّتِى، وَبَكَى، فَقَالَ اللَّهُ: يَا جِبْرِيلُ اذْهَبْ إِلَى مُحَمَّدٍ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ، فَسَلْهُ مَا يُبْكِيكَ؟ فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ، فَسَأَلَهُ فَأَخْبَرَهُ النَّبِى (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمَا قَالَ، وَهُوَ أَعْلَمُ، فَقَالَ تَعَالَى: يَا جِبْرِيلُ اذْهَبْ إِلَى مُحَمَّدٍ فَقُلْ: إِنَّا سَنُرْضِيكَ فِى أُمَّتِكَ وَلاَ نَسُوءُكَ). {الحديث/ ٤٩٨. إيمان.}

عەبدوڵلای کوڕی عەمر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە، کە ئیبراهیم (سلاوی خودای لێ بێ) تیادا دەفەرموێ: {رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُ مِنِّي وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ - سورة إبراهيم/١٤/٣٦} . واتە: خودایە! ئەو بتانەو ئەو خودا درۆینانە، خەلّکێکی گەلێ زۆریان گومڕاو سەرگەردان کردووە، دەی هەرکەسێ کە پەیڕەوی من دەکا، ئەوە لەمنەو دەستەی منە، وە ئەوەی کەلەمن یاخی دەبێ، ئەوە بەرەو رووی خۆتی

دەكەمەوەو تۆیش تاوانبەخش‌و میهرەبانی‌و لێی خۆش دەبیت، یا سزای دەدەیت، ئەوە كەیفی خۆتە). وە فەرموودەكەی عیساشی خوێندەوە، كە لەم ئایەتەدا دەفەرمویٚ: {إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ - سورة المائدة/ ٥/١١٨}. واتە: خودایە! كەس باڵا دەستی تۆ نییە، ئەمانە هەرچەند تاوانبارن، بەڵام بەندەو عەبدو خەلقەندەی خۆتن، ئەگەر سزاو ئازاریان بدەی ئەوە رەوایە بۆ تۆ، ئەگەر بە بەخشش‌و لوتفی خۆت تاوانیان بپۆشی ئەوە لەهەمووان دیارە كەتۆ تەواناو داناو كاردروستیت‌و موڵك موڵكی خۆتەو بەندە بەندەی خۆتە، چی لێدەكەی دەیكەی، كەس مافی رەخنەی نییە، ئەنجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) هەردوو دەستی خۆی بەرز كردەوەو فەرمووی: ئەی خودایە! رەحم بكە بە ئۆمەتم، پەروەردگاری من! بەزەییت بێتەوە بە گەلەكەمدا، ئەنجا دەستی كرد بەگریان، جا خودای گەورەو سەروەر فەرمووی بە جوبرائیل: ئەی جوبرائیل! بچۆ بۆلای موحەممەد (هەرچەندە خودای تۆ خۆشی باشتر دەزانیٚ كە لەبەرچی دەگری) برۆ بۆلای لێی بپرسە: كە لەبەرچی دەگریت. جا كە جوبرائیل هات‌و لێی پرسی. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی گوت، دیارە كە خودا خۆی باشتر لە حاڵەكە دەزانیٚ، ئەوجا خودا فەرمووی: ئەی جوبرائیل! برۆ بۆلای محمد پێی بڵیٚ: كە خودا دەفەرمویٚ: خەمت نەبیٚ‌و خەفەت مەخۆ، ئێمە دەربارەی ئۆمەتت رازیت دەكەین‌و لەبارەی ئۆمەتتەوە قەت دڵت ناشكێنین!). {تاج/٤، لاپەڕە: ٢٧٨، ژمارە: ٢، زنجیرە: ٩١ تاج-٣ ژ-٣١٣٥ ج-٤}.

٩٧- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ الطُّفَيْلَ بْنَ عَمْرٍو الدَّوْسِيَّ أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلْ لَكَ فِي حِصْنٍ حَصِينٍ وَمَنَعَةٍ؟! قَالَ حِصْنٌ كَانَ لِدَوْسٍ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَأَبَى ذَلِكَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِلَّذِي ذَخَرَ اللَّهُ لِلأَنْصَارِ، فَلَمَّا هَاجَرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى الْمَدِينَةِ هَاجَرَ إِلَيْهِ الطُّفَيْلُ بْنُ عَمْرٍو، وَهَاجَرَ مَعَهُ رَجُلٌ مِنْ قَوْمِهِ، فَاجْتَوَوُا الْمَدِينَةَ فَمَرِضَ فَجَزِعَ، فَأَخَذَ مَشَاقِصَ لَهُ فَقَطَعَ بِهَا بَرَاجِمَهُ، فَشَخَبَتْ يَدَاهُ حَتَّى مَاتَ، فَرَآهُ الطُّفَيْلُ بْنُ عَمْرٍو فِي مَنَامِهِ، فَرَآهُ وَهَيْئَتُهُ حَسَنَةٌ، وَرَآهُ

مُغَطِّيًا يَدَيْهِ، فَقَالَ لَهُ: مَا صَنَعَ بِكَ رَبُّكَ؟ فَقَالَ: غَفَرَ لِي بِهِجْرَتِي إِلَى نَبِيِّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَ: مَا لِي أَرَاكَ مُغَطِّيًا يَدَيْكَ؟ قَالَ: قِيلَ لِي: لَنْ نُصْلِحَ مِنْكَ مَا أَفْسَدْتَ، فَقَصَّهَا الطُّفَيْلُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): اللَّهُمَّ وَلِيَدَيْهِ فَاغْفِرْ». {الحديث/ ٣٠٧. إيمان}:

جابیر (رهزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: طوفەیلی کوڕی عەمری دەوسی هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بیٚ) عەرزی کرد: ئەی رەوانەکراوی خودا! ئەگەر دەفەرموویت ئەوا کۆچ بکە بۆ وڵاتی ئێمە، بۆت دەبین بە قەڵای قایمو شوورای پۆڵایین. فەرمووی: قەڵاکە هی هۆزی دەوس بوو، هی سەردەمی نەزانی پێش هاتنی ئیسلام بوو.

بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) قوبوڵی نەکرد، چونکە خودا ئەو سەربەرزیو شانازییو دەستی خێرلێنانەی هەڵگرتبوو بۆ یاریدەدەران (ئەنصار)و کردی بەخەڵاتی ئەوان. جا کاتیٚ کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بیٚ) کۆچی کرد بۆ مەدینەی پیرۆزو رۆشنو نووردار، توفەیلو پیاویٚ لە هۆزەکەی هەردووکیان بەیەکەوە کۆچیان کرد بۆ خزمەتی، ئاوو هەوای مەدینەیان پیٚ نەکەوت، لەویٚ پیاوەکە نەخۆش کەوتو ئۆقرەی لیٚ بڕاو بەدەمە تیرێکی پانکۆڵە، جەمسەری پەنجەکانی خۆی بڕییەوە، ئیتر هەردوو دەستی زامار بوونو خوێنیان بەربوو، وە خوێنەکەیان نەوەستایەوە هەتا مرد، لەپاشا توفەیل لەخەودا لەشێوەیێ جواندا دەیبینیٚ، بەڵام دەڕوانیٚ کەوا هەردوو دەستی خۆیی داپۆشیوە، جاپێی دەڵیٚ: پەروەردگارت چۆن بوو لەگەڵتا؟ دەڵیٚ: بەهۆی کۆچ کردنم بۆ خزمەتی پێغەمبەرەکەی لێم خۆش بوو، بەتایبەتی لەتاوانی خۆکوشتن.

جا طوفەیل دەڵیٚ: ئەدی دەبینم کە هەردوو دەستی خۆتت داپۆشیوە هۆی ئەوە چییە؟ دەڵیٚ: پێم گوترا: ئەوەی کەخۆت خراپت کردووە لە لەشی خۆت، ئێمە چاکی ناکەینەوە بۆت! جا کاتیٚ توفەیل ئەم خەونەی گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) فەرمووی: (ئەی خودای گەورەمان لە دەستەکانیشی خۆش بە).

**ڕوونکردنەوە:**

١-دیارە کە خودا لە دەستەکانیشی خۆش بووەو بۆی چاککردۆتەوە، چونکە نزای پێغەمبەر گیرایە.

٢-گەرچی ئەم داستانە خەونە، بەڵام مادەم پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئیقراری کردووە، بڕیاری فەرموودەی هەیە.

٣-ئەم فەرموودەیە سەرچاوەو سەر بەڵگەیێ بۆ ڕێسایەکی سەرەکی کە لەناو زاناکانا ناسراوە، کە پوختەکەی ئەمەیە: (هەر موسوڵمانێ لەسەر باوەڕ بمرێ، با تاوانی گەورە گەورەیش بکاو تەوبەیش نەکا، لەبازنەی باوەڕ دەرناچێو هەر بە موسوڵمان دادەنرێو بڕیارەکانی ئیسلامی بەسەردا جێبەجێ دەکرێ، وە دوورنییە کە خودا بە مەهانەیێ لێی خۆش ببێ!!).

٤-کەسانێ کەخۆیان دەکوژنو لەبەر هەرمەهانەیێ، خۆکوژی ئەنجام دەدەن، بەوە لە بازنەی ئیسلامەتی دەرناچن، ڕاستە کە کارێکی گەلێ ناباش دەکەن، بەڵام کردەوەی باشی خۆیان فریایان دەکەوێ، ئەگەر خوا حەزکا بۆیان دەبێ بەمایەی لێخۆشبوون. دیارە کە گەورەترین کردەوەی باشیش باوەڕە بەخوداو بە پێغەمبەرو خۆشەویستی ئەوانە.

٥-توفەیلی کوڕی عەمری دەوسی، لە هۆزی دەوسە، لە مەککە بەخزمەت پێغەمبەر دەگاو موسوڵمان دەبێو دەگەڕێتەوە بۆناو هۆزەکەی، لەخاکی دەوس، هەتا پێغەمبەر کۆچ دەکا بۆ مەینە، ئەویش لەکاتی غەزای خەیبەردا، لەگەڵ کۆمەڵێ لە هۆزەکەیدا، کە یەکێکیان ئەبو هورەیرە دەبێ، دەوری هەشتا کەسێ دەبن، کۆچ دەکەن بۆ خزمەتی، ئیتر لە خزمەت پێغەمبەردا دەمێنێتەوە هەتا کاتی مەرگی، لەوەدواش لەگەڵ موسوڵمانان دەمێنێ، هەتا لەجەنگی یەمامەدا شەهید دەکرێ. توفەیل داوا لە پێغەمبەر دەکا، کە نیشانەیەکی وای پێ ببەخشێ کە بیکا بە بەڵگە لەسەر ڕاستی داواکەی پێغەمبەر، پێغەمبەریش نزای بۆدەکا، نوورێ وەك چرا لەناوچاوانی پەیدا دەبێ، بەشەوی تاریك دەوروبەری خۆی ڕۆشن دەاتەوە، هەتا توفەیل لەخودا داوادەکا کە ئەو نوورە نەقڵ ببێ بۆ سەری

قەمچییەکەی، نوورەکە دەچێتە سەری قەمچییەکەیەوە وەك چرای هەڵواسراو ڕووناکی دەبەخشێ، وەك فانۆسێ. باوکیو ژنەکەی توفەیل لەسەر دەستی ئەودا ئیسلام دەبن، وە موسوڵمانی جوانیان لێ دەردەچێ، بەڵام دایکی بەگوێی ناکاو موسوڵمان نابێ. توفەیل هەستیارێکی جوان دەبێ. لەلای ئوبەییەی کوڕی کەعب فێری قورئان دەبێ.

لەشەڕی یەمامەدا، لە ڕێگە خەونێ دەبینێ: لەخەویدا دەبینێ سەری تاشراوە، باڵندەیێ لەدەمیەوە دەردەچێ، ژنێ پێی دەگا، دەیخاتە ناو شەرمی خۆیەوە، عەمری کوڕی کە لەوغەزایەدا لەگەڵیدا دەبێ، هەرهەوڵ دەدا کەپێی بگا، بەڵام پێی ناگات...)

وەخۆی ئاوا خەو پەرژێنی دەکا: لەم غەزایەدا سەری دەبڕرێو شەهید دەبێ، باڵندەکە ڕۆحەکەیەتی، ژنەکە زەوییە، دەچێتەوە ناو سکی دایکی، کوڕەکەی هەوڵی زۆر دەدا بۆ شەهید بوون، بەڵام لەم غەزایەدا شەهید نابێ... جاخۆی شەهید دەبێ، عەمری کوڕی زامار دەبێ، بەڵام چاك دەبێ، لەپاشا لە غەای یەرمووکا، لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتابا شەهید دەبێ (رەزای خودا لە هەموویان بێ). {تاج/٣، لاپەڕە: ١٤، زنجیرە: ٨١ = تاج-٣ ژ-٢٣٠٠ چ-٤}.

## ٦٣) باسی فەرمایشتی یەزدانی مەزن: (وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ).
## باب: فِي قَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ: (وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ).

٩٨- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: (لَمَّا أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: {وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الأَقْرَبِينَ} دَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قُرَيْشًا، فَاجْتَمَعُوا فَعَمَّ وَخَصَّ، فَقَالَ: يَا بَنِى كَعْبِ بْنِ لُؤَىٍّ أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ، يَا بَنِى مُرَّةَ بْنِ كَعْبٍ أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ، يَا بَنِى عَبْدِ شَمْسٍ أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ، يَا بَنِى عَبْدِ مَنَافٍ أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ، يَا بَنِى هَاشِمٍ أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ، يَا بَنِى عَبْدِ الْمُطَّلِبِ أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ، يَا فَاطِمَةُ أَنْقِذِى نَفْسَكِ مِنَ النَّارِ، فَإِنِّى لاَ أَمْلِكُ لَكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا غَيْرَ أَنَّ لَكُمْ رَحِمًا سَأَبُلُّهَا بِبَلاَلِهَا». {الحديث/ ٥٠٠. إيمان}.

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە {وَأَنـذِرْ عَشِـيرَتَكَ الْـأَقْرَبِينَ - سـورة الشـعراء/٢١٤}. (واتـە: ئـەی موحەممـەد! خزمـە هـەرە نزیکەکانت هۆشیار بکەرەوەو بیانترسێنە لەقارو غەزەبی خودا) حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) قورەیشی بانگ کرد، کە کۆبوونەوە خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) هـەم بەشـێوەی گشـتیو هـەم بەشـێوەی تایبـەتی مەترسـی دەنانـە بـەرو هۆشـیاری دەکردنەوە، یەکە یەکەو کۆمەڵ کۆمـەڵ نـاوی هێنـانو بـۆ نموونـە فـەرمووی: ئـەی نـەوەی کـەعبی کـوڕی لوئـەیی! خۆتـان لـەئاگری سـووری دۆزەخ، بـەئیمان هێنـان، رزگارکەن، ئـەی نـەوەی مـوررەی کـوڕی کـەعب، ئـەی نـەوەی عەبـدو شـەمس، ئـەی نـەوەی عەبدومـەناف، ئـەی نـەوەی هاشـم، ئـەی نـەوەی عەبدولموتتـەلیب خۆتـان رزگارکەن لەئاگری دۆزەخ! ئەی فاتیمەی کچی موحەممەد خـۆت رزگارکـە لـەئاگری دۆزەخ! بزانن کەمن لەلای خودا دەسەڵاتی هیچم نییە کە بیکەم بۆ ئێـوە، ئەوەنـدە هەیە لەدنیادا مافی خزمایەتیتان بەجێ دەهێنم). {ریاض/١، لاپـەڕە: ٢٦٤، زنجیـرە: ٤٠، ژمارە: ٣٢٩/١٨} + {تاج/٧، لاپەڕە: ٧٤، زنجیرە: ٩، ژمارە: ٣ - تاج-٤ ژ-٤٠١٩ چ-٤}.

**روونکردنەوە:**

بەکۆی دەنـگ زاناکان دەفەرموون، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لـەجیهانو لـەدوا رۆژدا، سـوودی هەیـە بـۆ موسـوڵمان، وە مەبەسـت لـەم فەرموودەیـەو وێنـەی ئـەم فەرموودەیە ئەمەیە: (ئەگەر کەسێ موسوڵمان نەبێو لەسەر بێ بڕوایی بمـرێ، نـە لەجیهاناو نە لەدوا رۆژدا، پێغەمبەر سوودی نابێ بۆی، چونکە کلیلی رزگـاری کـە باوەڕە بە پـەیامی ئیسلام نییـەتی). {بڕوانـە فـەرموودەی ژمـارە: ٩٩ و ١٠٠ کـەوان لەدوا ئەم فەرموودەیەوە}.

**٦٤) باسی ئەوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سوودی بووە بۆ ئەبو طالیبی مامەی (٥٠٩ - ٥١٦). باب: مَا نَفَعَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَبَا طَالِبٍ**

٩٩- عَنِ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلْ نَفَعْتَ أَبَا طَالِبٍ بِشَـيْءٍ فَإِنَّهُ كَانَ يَحُوطُكَ وَيَغْضَبُ لَـكَ؟ قَالَ: « نَعَمْ هُوَ فِي ضَحْضَاحٍ مِنْ نَارٍ، وَلَوْلاَ أَنَا لَـكَانَ فِي

الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ ». {الحديث/ ٥٠٩. إيمان. تجريد = مختصر صحيح البخاري، بەرگی/٤، لاپەڕە: ١٩٩، ژمارە: ١٥١٠، تجريد = ٣٨٨٣و تەرەفەکانی/٦٢٠٨، ٦٥٧٢ فەتحولباری} :

عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب، کە حەق مامەی پێغەمبەر بوو، عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا هیچ کەڵکێ، سوودێکت هەبوو بۆ ئەبوتالیبی مامەت، چونکە بەڕاستی ئەو زاتە لەکاتی خۆیدا، هەتا لەژیانا بوو، داڵدەی تۆی دەداو، لەسەری دەکردیتەوە؟ خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەڵێ وا لەناو تەنکاوی ئاگرەکەدا، خۆ ئەگەر من نەبوومایە جێگەی بن بنەوەی ناخی دۆزەخ دەبوو!). {تاج/٦، لاپەڕە: ٢١٣، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٢٢ - تاج-٤ ژ-٣٩١٣ - باسی سوورەتی تەوبە} .

١٠٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِىَ اللّهُ عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « أَهْوَنُ أَهْلِ النَّارِ عَذَابًا أَبُو طَالِبٍ، وَهُوَ مُنْتَعِلٌ بِنَعْلَيْنِ مِنْ نَارٍ يَغْلِي مِنْهُمَا دِمَاغُهُ». {الحديث/ ٥١٤. إيمان. تجريد/٥، لاپەڕە: ٢٩٢، ژمارە: ٢٠٣٦/٦٥٦٢} :

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس، کەناسراوە بە ئیبنو عەباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەبو تالیبی مامی پێغەمبەر، باوکی ئیمامی عەلی، لە دۆزەخا، سزای لەگشت کەسێ سووکترە، سزاکەی ئەوەیە: جووتێ پێڵاوی ئاگرینی والەپێدا، مێشکی پێیان دەکوڵێ، وەك مەنجەڵو حەوجۆشی سەر ئاگر). {تاج/١٠، لاپەڕە: ٥٨، ژمارە: ٣، زنجیرە: ١٥٥} + {تاج/٦، لاپەڕە: ٢١٣، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٢٠، ٢١، ٢٢} .

**٦٥) ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر، کە دەفەرموێ: (حەفتا هەزار کەس لەگەڵی موسوڵمانی من بەبێ پرسینەوە دەچنە بەهەشت). (٥١٩ - ٥٢٧).**

**باب: قول النبي (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يدخل الجنة من أُمَّتِى سَبْعُونَ الْفاً بِغَيْرِ حِسَابٍ.**

١٠١- عَنْ حُصَيْنُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ فَقَالَ: أَيُّكُمْ رَأَى الْكَوْكَبَ الَّذِى انْقَضَّ الْبَارِحَةَ؟ قُلْتُ: أَنَا. ثُمَّ قُلْتُ: أَمَا إِنِّى لَمْ أَكُنْ فِى صَلاَةٍ، وَلَكِنِّى

لُدِغْتُ. قَالَ: فَمَاذَا صَنَعْتَ؟ قُلْتُ: اسْتَرْقَيْتُ، قَالَ: فَمَا حَمَلَكَ عَلَى ذَلِكَ؟ قُلْتُ: حَدِيثٌ حَدَّثَنَاهُ الشَّعْبِيُّ، قَالَ: وَمَا حَدَّثَكُمُ الشَّعْبِيُّ؟ قُلْتُ: حَدَّثَنَا عَنْ بُرَيْدَةَ بْنِ حُصَيْبٍ الأَسْلَمِيِّ أَنَّهُ قَالَ: لاَ رُقْيَةَ إِلاَّ مِنْ عَيْنٍ أَوْ حُمَةٍ، فَقَالَ: قَدْ أَحْسَنَ مَنِ انْتَهَى إِلَى مَا سَمِعَ، وَلَكِنْ حَدَّثَنَا ابْنُ عَبَّاسٍ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « عُرِضَتْ عَلَيَّ الأُمَمُ، فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ وَمَعَهُ الرُّهَيْطُ، وَالنَّبِيَّ وَمَعَهُ الرَّجُلُ وَالرَّجُلاَنِ، وَالنَّبِيَّ لَيْسَ مَعَهُ أَحَدٌ، إِذْ رُفِعَ لِي سَوَادٌ عَظِيمٌ فَظَنَنْتُ أَنَّهُمْ أُمَّتِي، فَقِيلَ لِي: هَذَا مُوسَى وَقَوْمُهُ، وَلَكِنِ انْظُرْ إِلَى الأُفُقِ، فَنَظَرْتُ فَإِذَا سَوَادٌ عَظِيمٌ فَقِيلَ لِي: انْظُرْ إِلَى الأُفُقِ الآخَرِ، فَنَظَرْتُ فَإِذَا سَوَادٌ عَظِيمٌ، فَقِيلَ لِي: هَذِهِ أُمَّتُكَ، وَمِنْهُمْ سَبْعُونَ أَلْفًا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ بِغَيْرِ حِسَابٍ وَلاَ عَذَابٍ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: فَلَعَلَّهُمُ الَّذِينَ صَحِبُوا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَقَالَ بَعْضُهُمْ فَلَعَلَّهُمُ الَّذِينَ وُلِدُوا فِي الإِسْلاَمِ، وَلَمْ يُشْرِكُوا بِاللَّهِ، وَذَكَرُوا أَشْيَاءَ فَخَرَجَ عَلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: مَا الَّذِي تَخُوضُونَ فِيهِ؟ فَأَخْبَرُوهُ، فَقَالَ: هُمُ الَّذِينَ لاَ يَرْقُونَ وَلاَ يَسْتَرْقُونَ، وَلاَ يَتَطَيَّرُونَ، وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ، فَقَامَ عُكَّاشَةُ بْنُ مِحْصَنٍ، فَقَالَ: ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، فَقَالَ: أَنْتَ مِنْهُمْ، ثُمَّ قَامَ رَجُلٌ آخَرُ فَقَالَ: ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، فَقَالَ: سَبَقَكَ بِهَا عُكَّاشَةُ». {الحديث/ ٥٢٦. إيمان. تجريد البخاري. بەرگی/٥، لاپەڕە: ١٦٨، ژمارە: ١٨٧٦ = ٥٧٠٥، ٣٤١٠، ٥٧٥٢، ٦٤٧٢، ٦٥٤١}:

حوصەینی کوڕی عەبدوڕەحمان فەرمووی: لە خزمەتی سەعیدی کوڕی جوبەیردا بووم، فەرمووی: دوێنێ شەو کێ ئەستێرە کشانەکەی بینی؟ گوتم: من. لەپاشا گوتم: لەڕاستیدا لەوکاتە درەنگەی شەودا خەریکی شەونوێژ نەبووم، بەڵام شت پێوەی دابووم. فەرمووی: ئەی چیت کرد؟ گوتم: نووشتم کردو دووعاو نزام بەسەردا خوێند، فەرمووی: چی ئەوەی پێکردیتو هۆی کردنی ئەو نووشتەکردنە چی بوو؟ گوتم: فەرمایشتێ کە شەعبی بۆی گێڕاینەوە، فەرمووی: ئەو فەرموودەیە چی بوو کە شەعبی گێڕایەوە بۆتان؟ گوتم: شەعبی فەرمووی: بورەیدەی کوڕی حوصەیبی ئەسلەمی ئەم فەرمایشتەی پێمان فەرموو: (نووشتووی فرە تەواو ئەوەیە کە بۆ چاوەزاربێ، یا بۆ چارەی ژاری گەزەندو جانەوەری ژەهردار بێ!).

سەعید فەرمووی: (بەڕاستی کارێ جوانە، کە مرۆڤ پابەندبێ بەو فەرموودەو فەرمایشتەوە، کە لەزانایانی دەبیستێ!).

بەڵام ئێمە ئیبنو عەباس گێڕایەوە بۆمان، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رۆژێ لەماڵ دەرچوو، هات بۆناومانو فەرمووی: (لەخەوما نەتەوەکانم یەکە یەکە پێ نیشاندرانو رانوێنران لەبەرچاوم، دیارە کە خەوی پێغەمبەرانیش هەقەو راستەو دروستە، تەماشام کرد: پێغەمبەری وا هەبوو، نزیکەی دە پیاوێکی لەگەڵدا بوو، وە هەبوو دوو پیاوی لەگەڵدا بوو، وە پێغەمبەری وا هەبوو کە یەك پیاوی لەگەڵدا بوو، وە هەموو گەلەکەیان برێتی بوون لەوچەند کەسە، یا لەو دوو پیاوە، یا لەو تاقە زەلامە!! هەتا پێغەمبەری وابوو کە تەشریفی بە بەردەمما رەت دەبوو کەسی لەگەڵ نەبوو، چونکە لە دنیادا لە گەلەکەی کەس باوەڕی پێی نەهێنا بوو!!)

هەتا لەدوای ئەوان تارماییو عەشاماتێکی زۆرم بینی، تا چاو بڕکات ئاسۆیان داگرتبوو، گوتم: دەبێ ئەم گەلە زۆرە کێ بن، تۆ بڵێی گەلی ئیسلامی من بێ؟ زەینم بۆئەوە چوو کە ئەوان بن، بەڵام پێم گوترا: ئەمە مووساو گەلی مووسان، ئەنجا پێم گوترا: ئادەی تەماشای ئێرەوە بکەو چاو بگێڕە بە ئاسۆی ئاسمانا، کاتێ تەماشام کرد تارمایی عەشاماتێکی زۆرم دی، هەتا چاو بڕکا ئاسۆی داپۆشی بوو، دیسان گوتیانەوە پێم: ئادەی تەماشای ئەملاو لای خۆت بکەو سەیری ئاسۆ لەهەموو لایەکەوە بکە، جا دیسان کە تەماشام کرد، هەتا چاوبڕکا بەڕاستو بەچەپا، بەهەر چوارلادا، تارمایی عەشاماتێ بێشمار ئاسۆی داگرتبوو، پێم گوترا: ئەمە هەمووی نەتەوە (ئوممەت)ی تۆنو ئەمانە گەلی ئیسلامی موحەممەدن! لەمانە حەفتا هەزار کەسیان بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشت).

جا لەپێش ئەوەدا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باسی ئەو حەفتا هەزار کەسەیان بۆ بکا، کە کێنو کێ نینو چ کارەن، خۆی رۆیشتەوە بۆ ماڵەوە، یارانیش بڵاومیان لێ کردو لەناو خۆیانا کردیان بە مقۆ مقۆو گوتیان: ببێو نەبێ، ئەوانە ئێمەین، چونکە ئێمە بەردی بناغەی ئیسلاممان دامەزراند: بڕوامان هێنا بەخوداو پەیرەوی پێغەمبەرەکەیمان کرد، هەندێکی تریان گوتیان: ئێمە هەرچەند باوەرمان

هێناوە بەخوداو، بە پێغەمبەری خودا، بەڵام لەبەرئەوەی کە ئێمە لەسەردەمی فرە خودایی (شِرْك)دا لە دایك بووین، رەنگ بێ لەبەرئەوە ئەوانە ئێمە نەبین، بەڵکوو ئەوانە نەتەوەی ئێمە بن، کە یەکسەر لە ئیسلامەتیدا لەدایك بوونو هەرگیز هاوبەشیان بۆ خودا دانەناوە، وە هەندێ تر هەندێ بۆ چوونی تریان هەبوو. جا کاتێ ئەم وتوو ویژە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هات بۆ ناویان، فەرمووی: (ئەوە مقۆ مقۆی چیتانە؟ عەرزیان کرد: کە باسی ئەوەمان دەکرد، فەرمووی: (ئەوانە کەسانێکن لە نەتەوەی ئیسلام، کە خۆیان نووشتە ناکەنو داوای نووشتە کردنیش لەکەس ناکەنو نوقلانەی خراپ لێ نادەنو (لەبەر هەندێ نەخۆشی، وەك مایەسیری، کەوا باوە هەندێ کەس، هەندێ شوێنی تایبەتی خۆیان، بە نیازی چارەسەرو دەرمان، ئەو شوێنەیان، داخ دەکەن، ئەوان ئەوە ناکەنو خۆیان لەبەر شتی وا داخ ناکەن) بەڵکوو هەمیشە بۆ جێبەجێ بوونی کاروفرمانیان پشت بە لوتفو کەرەمو بەخششو ویستی خودا دەبەستنو بەس).

جا وەکاشە (عەککاشە)ی کوڕی میحصەن (رەزای خودای لێ بێ) هەڵسا فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا من لەم دەستەیەم یانا؟ وە نزام بۆ بکە لەلای خودا کە من یەکێ بم لەوان. فەرمووی: (بەڵێ تۆ لەوانی). پیاوێکی تریش هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! نزام بۆ بکە لەلای خودا کە منیش بکا لەیەکێ لەوان. فەرمووی: (وەکاشە دەسپێشکەری لێ کردیو ئەو بەهرە گەورەیەی برد بۆ خۆی). {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ٨٠، لاپەڕە: ٣٨٦، ژمارە: ٣٠٦٣/١ + زنجیرە: ٧٣ هەتا زنجیرە: ٧٥ — باسی دووعاو نووشتە} + {ریاض صالحین/کوردی/١، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٧٤، لاپەڕە: ٨٧ — چاپی دووەم} + {تەجریدی بوخاری = مختصر صحیح البخاری/کوردی/٥، لاپەڕە: ١٦٨، ژمارە: ١٨٧٤ = ٥٧٠٥ فتح الباری و تەرەفەکانی، کە ئەم ژمارانەی ترن: ٣٤١٠، ٥٧٥٢، ٦٤٧٢، ٦٥٤١}.

**ڕوونكردنەوە:**

١ -وەك لە ژمارە (٩٧)دا ڕوونكرايەوە خەونى پێغەمبەر هەقەو بەشێكە لە سرووش (وەحى). (بڕوانە: تەجريد/كورد/١، لاپەڕە: ١٢، ژمارە: ٣/٣و تەرەفەكانى).

٢ -لە تەجريدا، بەرگى سێ كوردى ژمارە: ٢٢٧٦/١٠٠٦. باسێكى جوانم لەبارەى نووشتەو دووعاوە نووسيوە، گەر بفەرمووى سەرەنجى بدەى بێ سوود نابێ. لەبەرگى پێنجيشدا، ژمارە: ٥٧٠٥/١٨٧٦ ژيننامەى حەزرەتى وەكاشەم زۆر بەجوانى نووسيوە، لەگەڵ چەند سەرنجێكا سەبارەت بە وەكاشەو مەرقەدە زۆرەكانى، ديسان تەماشاى مايەى ڕەحمەتو پيتو فەڕە. هەروا ژيننامەى سەعيدى كوڕى جوبەيريشم لە تەجريدا، بەرگى پێنجى كوردى ژمارە: ٥٥١٥/١٨٣٣ زۆر بەجوانى نووسيوە، لەگەڵ چەند سەرنجێكا، خوێندنەوەى هۆى پيتو فەڕە.

**٦٦) ئەو فەرموودەى خۆشەويست (درووودى خوداى لەسەر بێ) كە دەفەرمووێ:**
**(لەڕاستيدا من ئومێد دەكەم كە ئێوە نيوەى دانيشتوانى بەهەشت بن)** (٥٢٨ - ٥٣٢).
**باب: قول النبي (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (إِنِّي لأَرْجُو أَنْ تَكُونُوا نِصْفَ أَهْلِ الْجَنَّةِ).**

١٠٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي قُبَّةٍ نَحْوًا مِنْ أَرْبَعِينَ رَجُلاً، فَقَالَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا رُبُعَ أَهْلِ الْجَنَّةِ؟ قَالَ: قُلْنَا: نَعَمْ، فَقَالَ: « أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا ثُلُثَ أَهْلِ الْجَنَّةِ؟» فَقُلْنَا: نَعَمْ، فَقَالَ: وَالَّذِي نَفْسُ محمدٍ بِيَدِهِ، إِنِّي لأَرْجُو أَنْ تَكُونُوا نِصْفَ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَذَاكَ أَنَّ الْجَنَّةَ لاَ يَدْخُلُهَا إِلاَّ نَفْسٌ مُسْلِمَةٌ، وَمَا أَنْتُمْ فِي أَهْلِ الشِّرْكِ إِلاَّ كَالشَّعْرَةِ الْبَيْضَاءِ فِي جِلْدِ الثَّوْرِ الأَسْوَدِ. أَوْ كَالشَّعْرَةِ السَّوْدَاءِ فِي جِلْدِ الثَّوْرِ الأَحْمَرِ». {الحديث/ ٥٢٨، ٥٢٩، ٥٣٠. إيمان. بخاري. رقاق: ٦٥٢٨، ٦٦٤٢} + {تجريد/٤، رقم: ١٣٤٢=فتح:٣٣٤٨} :

عەبدوڵڵاى كوڕى مەسعوود (ڕەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: لەناو خێوەتێكا بووين، دەورى چل پياوێ دەبووين، لە خزمەتى پێغەمبەردا بووين، پێغەمبەر (درووودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (ئەدى ڕازى دەبن كە ئێوەى گەلى موسوڵمان چواريەكى خەڵكى بەهەشت بن؟). فەرمووى: گوتمان: ئەرێ، ڕازى دەبين، فەرمووى (درووودى خوداى لەسەر بێ): ئەى ڕازى دەبن كە ئێوە سێيەكى خەڵكى بەهەشت بن؟ گوتمان: بەڵێ، فەرمووى

(درودى خوداى لەسەر بێ): (بەوکەسە کە گیانی موحەممەدی بەدەسە، کە خوداى تاك‌و تەنيايە، من ئومێد دەکەم کە ئێوە نيوەى خەڵکی بەهەشت بن، چونکە ئەوەى کە موسوڵمانە دەچێتە بەهەشت، ناموسوڵمان ناچێتە بەهەشت، دەى ئێوە لەچاو بتپەرست‌و هاوبەش پەيداکەرانا، وەك تاقە تەڵێ مووى سپى وايە، بە پێستى گايەکی رەشەوە، ياوەك تەڵێ مووى رەش وايە لە پێستى نۆبەنگايەکی سووردا).
تاج/٢٦٦/٦، ژمارە: ٧، زنجيرە: ١٨ - تاج-٤ ژ-٣٩٢١ + تاج/٧/٣٠، زنجيرە: ٥، ژمارە: ١ - تاج-٤ ژ-٣٩٩٥ + تاج/١٠/٢٦٦، ژمارە: ٥، ٦}.

**٦٧) باسی ئەو فەرموودەيەى پێغەمبەر (درودى خوداى لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: خوداى گەورەو سەروەر بەباوە ئادەم دەفەرموێ: (ئادەى ئادەم! لەنەوەى خۆت، لەهەزار کەسی، نۆسەدو نەوەدو نۆ کەسی جيابکەرەوە، کە بەشی دۆزەخن).**
**بابٌ: فِي قَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ لآدَمَ: (أَخْرِجْ بَعْثَ النَّارِ، مِنْ كُلِّ أَلْفٍ تِسْعُمَائَةٍ وَتِسْعَةً وَتِسْعِينَ).**

١٠٣- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: يَا آدَمُ، فَيَقُولُ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ فِى يَدَيْكَ، قَالَ: يَقُولُ: أَخْرِجْ بَعْثَ النَّارِ، قَالَ: وَمَا بَعْثُ النَّارِ؟ قَالَ: مِنْ كُلِّ أَلْفٍ تِسْعَمِائَةٍ وَتِسْعَةً وَتِسْعِينَ، قَالَ: فَذَاكَ حِينَ يَشِيبُ الصَّغِيرُ (وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُمْ بِسُكَارَى وَلَـكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ)» . قَالَ: فَاشْتَدَّ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَأَيُّنَا ذَاكَ الرَّجُلُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَبْشِرُوا فَإِنَّ مِنْ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ أَلْفاً وَمِنْكُمْ رَجُلٌ، قَالَ: وَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ إِنِّى لأَطْمَعُ أَنْ تَكُونُوا رُبُعَ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَحَمِدْنَا اللَّهَ تَعَالَى وَكَبَّرْنَا، ثُمَّ قَالَ: وَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ إِنِّى لأَطْمَعُ أَنْ تَكُونُوا ثُلُثَ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَحَمِدْنَا اللَّهَ وَكَبَّرْنَا، ثُمَّ قَالَ: وَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ إِنِّى لأَطْمَعُ أَنْ تَكُونُوا شَطْرَ أَهْلِ الْجَنَّةِ، إِنَّ مَثَلَكُمْ فِى الأُمَمِ كَمَثَلِ الشَّعَرَةِ الْبَيْضَاءِ فِى جِلْدِ الثَّوْرِ الأَسْوَدِ أَوِ الرَّقْمَةِ فِى ذِرَاعِ الْحِمَارِ».
{الحديث/ ٥٣١. إيمان. تجريدى بوخارى به كوردى = مختصر صحيح البخاري/٤، لاپەرە: ٢٠، ژمارە: ١٣٤٢ = ٣٣٤٨، ٤٧٤١، ٦٥٣٠، ٧٦٨٣}:

ئەبو سەعيدى خودرى (رەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: خۆشەويست (درودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (خوداى گەورەو سەروەر دەفەرموێ: ئەى ئادەم! ئادەم (درودى خوداى لەسەر بێ)

دەفـەرموێ: بفـەرموو ئـەی پـەروەردگارم! وام لەخزمـەتتا، فـەرمانت بەچی هەیـە هـەتا جێبـەجێی بکـەم، هـەتا خۆشـنوودیو ڕەزامەنـدی تـۆ دەردەسـت دەکـەم، خێروچاکە وا لەدەستی تۆداو هەموو چاکەیێ بەدەستی تۆیە).

خـودای گـەورە پێـی دەفـەرموێ: (ئـەی ئـادەم! بەشـی دۆزەخ لەنـەوەی خـۆت جیاوەکـە، بـابڕۆن بـۆ نـاوی). ئـادەمیش عـەرزی دەکـا: (خودایـە! بەشـی دۆزەخ لەنەوەی من چەند لەچەندە؟). دەفەرموێ: (لەگشت هەزار کەسێ نۆسـەدو نـەوەدو نۆی بەشی ئاگری دۆزەخە، وە تاقە یەکێکی بەشی بەهەشتە!).

فەرمووی: ئەمە ئەوکاتەیە کە منالْ پیر دەبێ وەك لە قورئانا دەفەرموێ: {يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَـرَى النَّـاسَ سُـكَارَى وَمَا هُم بِسُكَارَى وَلَـكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ}.

وە هـەموو ئـاوسو دووگیانـێ خورپـەی لێ دەکـەوێو سـکەکەی لەباردەچـێو بەچکەکەی فڕە دەدا، دەبێ بەفەرتەنەو بشێوییەکی وا کـەس سەرکەسـی ناپـەرژێ، کە تەماشای مەردووم دەکەی، لەتۆ وایە کە مەستو سەرخۆشنو ئارەقو بادەنۆشن، وا حەپەساوو شلەژاوو پەرۆشن، وەگێژو وڕن، بەلام سـەرخۆشو مەستی چی؟ کـێ دەیپەرژێتە سەرشتی وا، نەء نـەء، مەسـتو سـەرخۆش نـین، بـەلام سـزای سـەختو توندی ئەو ڕۆژە واگێژو وڕی کردوون، دەلێی سەرخۆشن.

فەرمووی: جا موسـوڵمانەکان زۆر سـەخلەت بـوونو دەسـتیان کـرد بـە گریـانو عەرزی حەزرەتیان کرد: جا ئەی پێغەمبەری خودا! دەبێ ئـەو تاقـە کەسـە کامـان بێت؟ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (موژدەتان لێ بێ، شتەکە خۆی ئاوایـە، نەوەك وەك ئـەوەی کـە ئێـوە بـۆی دەچـن: لـە ئێـوە یـەك کـەس بـۆ بەهەشـتو لـە یەئجوجو مەئجوج هەزار کەس بۆ دۆزەخ دەبێ).

ئـەوجا خۆشەویست فـەرمووی: (سـوێندم بـەو تاقـە خودایـە کـە گیـانی مـن وا لەدەستی توانایی ئەودا، من ئومێد دەکەم کە ئێوەی دەستەی ئیمانداران چواریەکی خەڵکی بەهەشت بن). ئێمەیش لەخۆشیانا ئەڵلاهو ئەکبەرمان بەدەنگی بـەرزکرد، بۆ دەربڕینی خۆشیو شادی، بە بۆنەی ئەم موژدەی پێغەمبـەرەوە. حـەزرەت (درودی

خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (دەی من ئومێد دەکەم کە ئێوە سێیەکی خەڵکی بەهەشت بن). ئێمە دیسان لەخۆشیانا دەستمان کرد بە (الله اکبر) کردن.**

**خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (دەی من ئومێد دەکەم کە ئێوە نیوەی دانیشتوانی بەهەشت بن). ئێمە دیسانەوە دەستمان کردەوە بە (الله اکبر) کردن. ئەوسا خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (ڕێژەی ئێوە لەچاو ئەو خەڵکەی تردا، وەك تاقە موویەکی سپی وایە لە پێستی گایەکی ڕەشدا، یا وەك ئەو پوولەکەیە وان کەوا بە دیوی ناوەوەی ڕەفیسکی گوێدرێژەوە!). {بڕوانە: کۆتایی فەرموودەی پێش خۆی}.**



# ٢-٢/٢- نامەی دەسنوێژ

## ٦٨) خودای گەورە نوێژ بەبێ دەسنوێژو پاکی گیرا ناکات (٥٣٣)

## باب: لاَ يَقْبَلُ اللّه صَلاَةً بِغَيْرِ طَهُور

١٠٤- عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: دَخَلَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ عَلَى ابْنِ عَامِرٍ يَعُودُهُ، وَهُوَ مَرِيضٌ. فَقَالَ: أَلاَ تَدْعُو اللّهَ لِي يَا ابْنَ عُمَرَ؟ قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «لاَ يَقْبَلُ اللّهُ صَلاَةً بِغَيْرِ طُهُورٍ، وَلاَ صَدَقَةً مِنْ غُلُولٍ». وَكُنْتَ عَلَى الْبَصْرَةِ}. {الحديث/ ٥٣٤. طهارة}:

موسعەبی کوڕی سەعد فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر چوو بۆلای ئیبنو عامیر، بۆ هەواڵ پرسینی، چونکە نەخۆش بوو، ئیبنو عامیر بە ئیبنو عومەری گوت: ئەی ئیبنو عومەر! بۆ لەخودا ناپاڕێیتەوە بۆم؟ فەرمووی: بۆخۆم لە پێغەمبەرم بیست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (خودای گەورە نە نوێژ بەبێ دەسنوێژو پاکی گیرا دەکاو، نەخێر لەگزیو دزیو فزی قەبووڵ دەکا).

دەی تۆیش فەرمانداری سەر شاری بەصرە بوویت. {بڕوانە: تاج/١، لاپەڕە: ٢٠٨، زنجیرە: ٥٢، ژمارە: ١/٣٩٠}.

نەوەوی دەفەرموێ: دوعاو نزاو پاڕانەوە بۆ بەدکارو ناموسوڵمان دروستە، وە پێغەمبەرو یارانی شتی وایان کردووەو پێشینانو پاشینانیش شتی وادەکەن، کە خودا هیدایەتی ناموسوڵمانان بداو تەوبە بەنسیبی تاوانبار بکا، کەواتە: مەبەستی ئیبنو عومەر لەم گوتەیە سەرکۆنەی ئیبنو عامیر بووە، هەتا واز لە نافەرمانی خودا بێنێو تەوبە بکا.

## ٦٩) شۆردنی دەست لەکاتی لەخەو هەڵسان، پێش دەست کردن بە ناوەکەدا.

## (٦٤١ - ٦٤٥). {باب: غَسْلِ الْيَدِ عِنْدَ الْقِيَامِ مِنَ النَّوْمِ قَبْلَ إِدْخَالِهَا فِي الإِنَاءِ}

١٠٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ نَوْمِهِ، فَلاَ يَغْمِسْ يَدَهُ فِي الْإِنَاءِ، حَتَّى يَغْسِلَهَا ثَلاَثاً، فَإِنَّهُ لاَ يَدْرِي أَيْنَ بَاتَتْ يَدُهُ». {الحديث/ ٦٤١. طهارة. بخاري: ١٦٢. تجريد: ١٢٧}.

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ لەخەو هەڵدەسن، پێش ئەوە دەست بکەن بەناو دەفرەکەدا، لە دەرەوەی دەفرەکە سێ جار بەئاو دەستتان بشۆرن، لەوەدوا ئەگەر دەست بکەن بەناو دەفرەکەداو بەمشتو لامستو شتی وا، ئاوی لێ دەربێنن، بۆ دەسنوێژ گرتنو شتی تر قەیدی نییەو دروستە. بۆیە دەبێ وابکا، چونکە نازانێ کە لەکاتی خەوەکەدا دەستی بەرچی کەوتووە، دوور نییە کە خۆی خوراندبێو دەستی بەرشتێ قێزون یاپیس کەوتبێ!). {تاج/١، زنجیرە: ٢٧، ژمارە: ١، لاپەڕە: ١٣٠}.

نەوەوی دەفەرموێ: هەرکاتێ مرۆڤ گومانی هەبوو لە ناپاکی دەستەکانیدا بەپێی دەقی ئەم فەرموودەیە، سوننەتە دەستی بشوات). واتە: خەو مەرج نییە، بەڵکوو نموونەیە، یا خەو نموونەی زۆرینەی کاتە.

### ٧٠) پێشگیریی کردن لە سەراوکردن لەسەرە رێگەو لە سێبەردا
### باب: النهي عَنِ التَّخَلّي فِي الطَّرِيقِ وَالظِّلاَلِ

١٠٦- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « اتَّقُوا اللَّعَّانَيْنِ ». قَالُوا: وَمَا اللَّعَّانَانِ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «الَّذِى يَتَخَلَّى فِى طَرِيقِ النَّاسِ أَوْ فِى ظِلِّهِمْ ». {الحديث/ ٦١٧}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خۆتان بپارێزن لەو دووشتە ناشیرینە کە دەبن بەهۆی ئەوە کە خەڵکی نەفرەتو لەعنەتتان لێ بکەن). گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو دوو شتەیە چیو چین؟ فەرمووی: (یەکێکیان سەراوکردنە لەسەرە رێدا، ئەوی تریان سەراوکردنە لە سێبەری جێگە دانیشتنی خەڵکیدا). {تاج/١، لاپەڕە: ١٢١، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ١٦٩/١٤}.

### ٧١) پەناگاو حەشارگەی کاتی سەراوکردن {باب: مايَسْتَتِرُ بِهِ لِقَضَاءِ الحاجَةِ}

١٠٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ (رَضِىَ اللّهُ عنهما) قَالَ: أَرْدَفَنِى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَاتَ يَوْمٍ خَلْفَهُ، فَأَسَرَّ إِلَىَّ حَدِيثًا لاَ أُحَدِّثُ بِهِ أَحَدًا مِنَ النَّاسِ، وَكَانَ

أَحَبَّ مَا اسْتَتَرَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، لِحَاجَتِهِ هَدَفٌ، أَوْ حَائِشُ نَخْلٍ (قَالَ ابْنُ أَسْمَاءَ فِي حَدِيثِهِ): يَعْنِي حَائِطَ نَخْلٍ. {الحديث/ ٧٧٢. حيض + ٦٢٢٠ فضائل الصَّحَابَة}:

**عەبدوڵلای کوڕی جەعفەر** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **لەپاشکۆی خۆیەوە سواری کردمو، فەرمایشتێکی بە پەنهانی پێ فەرمووم، بۆ کەسی ناگێڕمەوە، وە باشترین شتیش کە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **بۆ سەراو خۆی لەپاڵدا حەشاربدایە بارستاییو بەرزاییو شوورەی باخە خورما بوو).** (تاج/١/١١٧، ژمارە: ٣/١٨٥).

**ڕوونکردنەوە:**

عەبدوڵلای کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب برازای ئیمامی عەلیو عەقیلو طالیب بووە، کە هەرچواریان برا بوون، ئامۆزای حەقی پێغەمبەری خودا بوون، کەواتە: عەبدوڵلا ئامۆزازای پێغەمبەر بووە، دایکی ناوی ئەسمای کچی عومەیسە، عەبدوڵلا یەکەم منالی موسوڵمانانە کە لەخاکی حەبەشە لەدایك بووە، لەوکاتەدا کە دایكو باوکیو کۆمەڵێ لە موسوڵمانان لە حەبەشە ئاوارەو کۆچبار بوون!

عەبدوڵلایش وەك باوکی بەخشندەو سەخی بوو، زۆر ڕەوشت بەرزو دەستو دامەن پاكو هەست ناسك بوو، ناسراو بوو بە دەریای بەخشندەیی! دەڵێن: لەسەردەمی ئیسلامەتیدا لەو سەخیتر نەبووە.

عەبدوڵلا گوێی لە گۆرانی دەگرت، گوێگرتن لە گۆرانی بەناباش نەدەزانی. شەو نوێژێکی زۆری دەکرد، ئیبنو عومەر، کاتێ پێی دەگەیشت پێی دەگوت: سلاوت لێ بێت، ئەی کوڕی خاوەنی دوو باڵ!).

عەبدوڵلا فەرموودە لە پێغەمبەرو لە باوكو دایکیو لە عەلی مامەیو لە ئەبوبەکرو کەسانی تریشەوە دەگێڕێتەوە، ئەم زاتانەیش فەرموودەیان لەوەوە لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە: ئیسماعیلو ئیسحاقو موعاوییە، کە ئەم سێ زاتە کوڕی خۆی بوون، هەروا ئەبو جەعفەری باقیرو عورووەو شەعبیو کەسانی تریش، لە

بوخاری پیرۆزا دوو فەرموودەی هەیە، لە مووسلیما فەرموودەی هەیە، بە حەوت ساڵی ئەوو عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر پەیمانو بەیعەت دەدەن بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) عەبدوڵڵا لەتەمەنی نەوەد ساڵیدا لەساڵی هەشتای کۆچیدا، لەشاری مەدینە دەمرێ، إبانی کوڕی عوسمان نوێژی لەسەر تەرمەکەی کرد، کە ئەوکاتە إبان میری سەر مەدینە بوو. (بڕوانە: تەجرید بە کوردی/٢، لاپەڕە: ١٨٨، ژمارە: ١٥٨٨/٧٦١ فەتح) + (بەرگی/٣١٦/٤، ژمارە: ١٥٧٥ تەجرید = ٤٢٢٨ فتح الباری).

### ٧٢) گوتەی کاتی سەراوکردن (٨٢٩ - ٨٣٠).
### بابٌ: ماذا يقول إذا دَخَل الخلاءَ

١٠٨- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) إِذَا دَخَلَ الْخَلاَءَ قَالَ: « اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ». {الحديث/ ٨٢٩. طهارة. بخاري. وضوء: ١٤٢}:

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە دەیویست بچێتە ناو ئاودەستەوە دەیفەرموو: {اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ}. واتە: ئەی خودایە! پەنا دەگرم بە پەنای تۆ لە شەڕی گۆڵو دێڵی شەیتانی چەپەڵ). {تەجرید/١/١٤١، ژمارە: ١١٥/١٤٢. تاج/١/١١٨، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ١٨٧/٥}.

### ٧٣) لەکاتی سەراوکردنا، واباشە روونەکاتە رووگە یا پشتی تێ نەکات (٢٠٥ - ٦٢٠).
### باب: لاَ تُستَقْبَلُ القِبلَةُ بِغائِطٍ ولاَ بَوْلٍ

١٠٩- عَنْ أَبِى أَيُّوبَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِىَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِذَا أَتَيْتُمُ الْغَائِطَ فَلاَ تَسْتَقْبِلُوا الْقِبْلَةَ، وَلاَ تَسْتَدْبِرُوهَا، بِبَوْلٍ وَلاَ غَائِطٍ، وَلَكِنْ شَرِّقُوا أَوْ غَرِّبُوا». قَالَ أَبُو أَيُّوبَ: فَقَدِمْنَا الشَّامَ فَوَجَدْنَا مَرَاحِيضَ قَدْ بُنِيَتْ قِبَلَ الْقِبْلَةِ، فَنَنْحَرِفُ عَنْهَا، وَنَسْتَغْفِرُ اللَّهَ). {الحديث/ ٦٠٨. طهارة. تجريد/١/١٤١، رقم: ١١٧/١٤٤}:

ئەبو ئەییوبی ئەنصاری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کە دەچنە سەرپێشاو نە رووبکەنە رووگە (قیبلە) وە نەپشتی تێ بکەن، بەڵام رووبکەنە ئەملاو ئەولا).

ئەبو ئەییوب دەیفەرموو: لەوەدوا کە چووینە ولاتی شام، دەبینین ئاودەست هەیە رووەو رووگە دروست کراوە، کە دەچووینە ئەوجۆرە ئاودەستانەوە، بەپێی توانا، رووی خۆمان لە ئاستی رووگە وەردەچەرخان‌و لەگەڵ ئەوەشا داوای لێبووردنمان لە خودا دەکرد، کە لێمان نەگرێ. {تاج/١/١١٩، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ١٩١/١٠}.

**روونکردنەوە:**

ئەبو ئەییوبی ئەنصارییە، نجارییە، لە هۆزی بەنی نجاری خاڵوانی پێغەمبەرە، بەدرییە، ئامادەی پەیمانی بەیعەتولعەقەبەی دووەم بووە، پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) کاتێ کۆچی کرد بۆ مەدینە، نزیکەی مانگێ میوانی ئەو بوو، یەکێکە لە خانەدان‌و نوجەباکانی صەحابەکان (رەزای خودایان لێ بێ) سەدو پەنجا فەرموودەی لە کتێبە ناودارەکانی حەدیثدا هەیە، حەوتیان پەسەندی پیری بوخاری‌و پیری موسلیمن. کە یەکێ لەو حەوت فەرموودەیە ئەم فەرموودەیە کەواین لە خزمەتیدا. یەك فەرموودەی تریشی لە بوخاریدا بەتەنها هەیە، کەواتە: کۆی فەرموودەکانی لە صەحیحەیندا، دەکاتە: ٧ + ١ = ٨. ئەبو ئەییوب لایەنگیری ئیمامی عەلی بوو، لەگشت جەنگەکانیدا لەگەڵیدا بوو، لەگەڵ سوپاکەی یەزیدی کوڕی موعاوییەدا لەکاتی جێنشینی یەزییدا، دەچێ بۆ ئازادکردنی قوستەنتەنییە، جا کاتێ نزیك دەکەونەوە نەخۆش دەکەوێ، بەهاوڕێکانی خۆی دەفەرموێ: (کاتێ کە مردم لەگەڵ خۆتان تەرمەکەم هەڵگرن‌و بەرەو شارەکە بمبەن، لەکوێدا بەرانبەری دوژمن ریزتان بەست، لەبەردەم پێی خۆتاندا بمنێژن، ئەوانیش وایان کرد).

گۆڕەکەی لەنزیك شوورا کۆنەکەی قوستەنتەنییە بوو، کە ئێستا ناونراوە: ئەستەمبووڵ، کە هەندێ پێی دەڵێن ئیسلامبووڵ، مزگەوتێکی مەزن لەسەر گۆڕەکەی دروست کراوە، موسوڵمانان ریزێکی زۆر لە گۆڕەکەی دەگرن، ئێستا بووە بەزیارەتگایەکی گەورە، لەخزمەتیدا لەکاتی بێبارانیدا، داوای بارینی باران لە خودای گەورە دەکرێ، وە نزاکەیان گیرا دەبێ‌و باران دەبارێ. لەساڵی پەنجای کۆچیدا وەفاتی کردووە، (رەزاو رەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ). ئەم فەرموودەیە

له موسليما بەپێی تەخریجی ئێرە ژمارەکەی: (٦٠٨) بەلاّم بەپێی تەخریجێ کەوا لەسەر تەجریدی بوخاری، کەلەلایەن دوکتور موصطەفا البغاوە ئەنجامدراوە بۆ صەحیحی مسلم ژمارەکەی: (٢٦٤). {بڕوانە: عەینی/٢/٢٧٦}.

### ٧٤) لەناو خانوودا مۆڵەتی ئەوە دراوە کە روو یا پشت بکرێتە رووگە.

### باب: الرُّخْصَةُ فِي ذلِكَ بِالأَبْنِيَةِ

١١٠- عَنْ وَاسِعِ بْنِ حَبَّانَ قَالَ: كُنْتُ أُصَلِّي فِي الْمَسْجِدِ، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ مُسْنِدٌ ظَهْرَهُ إِلَى الْقِبْلَةِ، فَلَمَّا قَضَيْتُ صَلاَتِي انْصَرَفْتُ إِلَيْهِ مِنْ شِقِّي، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: يَقُولُ نَاسٌ: إِذَا قَعَدْتَ لِلْحَاجَةِ فَلاَ تَقْعُدْ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ، وَلاَ بَيْتَ الْمَقْدِسِ، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: وَلَقَدْ رَقِيتُ عَلَى ظَهْرِ بَيْتٍ. فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَاعِدًا عَلَى لَبِنَتَيْنِ مُسْتَقْبِلاً بَيْتَ الْمَقْدِسِ، لِحَاجَتِهِ}. {الحديث/ ٦١٠. طهارة. تجريد به كوردى/١/١٤٢، رقم: ١١٨/١٤٥}:

واسیعی کوڕی حەببان فەرمووی: لە مزگەوت نوێژم دەکرد، عەبدوڵلای کوڕی عومەر پشتی دابوو بە دیوارەکەی رووی قیبلەوە، کە نوێژەکەم تەواوکرد، لەلاکەی خۆمەوە چووم بۆلای، عەبدوڵلا فەرمووی: کەسانێ هەن دەڵێن: کاتێ لەسەر پێشاو دانیشتی بۆ سەراوکردن، رووبەرووی قیبلە، یا رووبەرووی بەیتولمەقدیس دامەنیشە. بەلاّم من جارێ ئیشم هەبوو، چوومە سەر سەربانەکەی حەفصەی خوشکم، کە هاوسەری پێغەمبەر بوو، پێغەمبەرم دی خەریك بوو دەستی بەئاو دەگەیاند، لەسەر دووخشتی کاڵ رووبەرووی شام دانیشتبوو، کە بەیتولمەقدیس والەوێ، پشتی لەرووگە بوو، سەراوی دەکرد}.

### ٧٥) پێشگیری لەمیزکردنە ناو ئاوی کەمی راوەستاوەوە (٦٥٣ - ٦٥٥).

### باب: النهيُ أنْ يُبَالَ فِي المَاءِ، ثُمَّ يُغْتَسَلُ مِنْهُ

١١١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « لاَ يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ فِي الْمَاءِ الدَّائِمِ، ثُمَّ يَغْتَسِلُ مِنْهُ ». {الحديث/ ٦٥٤. تجريد/١، لاپەڕە: ١٨٩، رقم: ١٧١/٢٣٩}.

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بێ) لـە پێغەمبـەرەوە (دروودی خـودای لەسـەر بێ) دەفـەرموێ: (کەستان گمێز مەکەنە ناو ئاوی راوەستاوەوە کـە لەبـەری نـەڕوا، لەپاشیشا بچێت خۆی تیادا بشوات). {تاج/١/١٠٥/٦ = تاج/١، لاپەڕە: ١٠٥، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ١٥١/٦}.

١١٢- عَنْ أبي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) قال: قال رَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « لاَ تَبُلْ فِى الْمَاءِ الدَّائِمِ الَّذِى لاَ يَجْرِى، ثُـمَّ تَغْتَسِـلُ مِنْـهُ ». {الحديث/ ٦٥٥. طهـارة. تجريد/١، لاپەڕە: ١٨٩، رقم: ١٧١/ ٢٣٩}: وەرگەڕاوەکەی لە ژمارە (١١١)دا رابورد.

### ٧٦) خۆپاراستنو خۆپاك كردنەوەی تەواو، لەمیزو لەپاش میزو خۆ حەشاردان لەپاڵ شتێکا، یا لەناو شتێکا لەکاتی میزو پیسایی کردندا (٦٧٥ - ٦٧٦).

### باب: فِى الاسْتِبْرَاءِ والاسْتِتَارِ مِنَ الْبَوْلِ

١١٣- عَنْ ابْنُ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهمـا) قَـالَ: مَـرَّ رَسُـولُ اللّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) عَلَى قَبْرَيْنِ، فَقَالَ: «أَمَا إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ، أَمَّا أَحَـدُهُمَا فَكَـانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ، وَأَمَّا الآخَرُ فَكَانَ لاَ يَسْتَتِرُ مِنْ بَوْلِهِ» . قَالَ: فَـدَعَا بِعَسَـبٍ رَطْـبٍ فَشَـقَّهُ بِاثْنَيْنِ. ثُمَّ غَرَسَ عَلَى هذَا وَاحِداً وَعَلَى هذَا وَاحِداً، ثُمَّ قَالَ: « لَعَلَّهُ أَنْ يُخَفَّـفُ عَنْهُمَـا مَـا لَمْ يَيْبَسَا». {الحديث/ ٦٧٥. طهارة. تجريد/١/ ١٧٢، ژمارە: ١٥٩/ ٢١٦}:

ئیبنـو عـەباس (رەزای خودایـان لێ بێ) فـەرمووی: جـارێ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) لەمەدینە، یا لە مەکە، بـەلای باخـە خورمایـەکا رابـورد، گـوێی لـەدەنگی دوو مـرۆڤ بوو، کە تازە مردبوون، لەناو گۆڕەکانیاندا سزا دەدران. پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) فەرمووی: (خاوەنی ئەم دوو گۆڕە سزا دەدرێن، لەسەر شتێ سزا دەدرێن کە خۆیـان لە ژیانیانا بە گەورەو گرانیان دانەناوە، بەبێ نرخیان زانیوە، بەڵام ئەو شتە لـەلای خودا، گوناهو تاوانێـکی گەلێ گەورەیە، یەکێـکیان لەسـەر ئـەوە ئـازار دەدرێ کـە لـە دنیادا قسە چێن بـوو، دوو زمـانی دەکـرد، قسـەی دەهێنـاو دەبـرد، بۆ تێـکبەردانی خەڵـك لەیـەکتری، ئەویتریشـیان لەسـەرئەوە ئـازار دەدرێ، چـونکە لـەحاڵی ژیانیـدا خۆی لە گمێزی خۆی نەدەپاراستو، لەکاتی مێزکردندا خۆی لەپاڵ شتێـکدا حەشار نەدەدا).

ئەنجا خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) داوای پەلکە دارخورمایەکی تەڕی کردو کردی بەدوو لەتەوەو، هەرکەرتەی لەسەر گۆڕێکیان داچەقاند.

عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمەت بۆچی کرد، بۆ وات کرد؟ فەرمووی: (چونکە گیاو داری سەوزو درەختی تەڕی سەر گۆڕ، تاوشك دەبێ‌و تەڕایی تیادا نامێنێ، دەپاڕێنەوە بۆ مردووەکە، جا کەوابوو بەشکوو ئەم دوولەتە پەڵکە خورما سەوزەیە لەم روانگەیەوە، باری ئازاریان سووك بکەن، هەتا ئەوکاتەی کە وشك دەبن‌و لە تەسبیحات کردن دەکەون بۆیان ببن بەمایەی رەحمەت). {تاج/١/١١٠، زنجیرە: ٢٣، ژمارە: ١٦٦/٣ – ش/د/ت/ن = بوخاری‌و موسلیم‌و ئەبو داوودو تەرمەزی‌و نەسائی – پڕ گۆڕە پیرۆزەکانیان لە رەحمەتی خودا بێ}.

## ٧٧) نەیی کردن لەتاراتکردن بەدەستی راست
## باب: النَّهْی عَنِ الإسْتِنْجَاءِ بِالیَمِین

١١٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِی قَتَادَةَ عَنْ أَبِیهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ): « لاَ یُمْسِکَنَّ أَحَدُکُمْ ذَکَرَهُ بِیَمِینِهِ وَهُوَ یَبُولُ، وَلاَ یَتَمَسَّحْ مِنَ الْخَلاَءِ بِیَمِینِهِ، وَلاَ یَتَنَفَّسْ فِی الإِنَاءِ». {الحدیث/ ٦١٢. بخاري/ ١٥٣، تجرید/١، لاپەڕە: ١٤٥، ژمارە: ١٥٣/١٢١}:

عەبدوڵلای کوڕی ئەبو قەتادە دەفەرموێ: باوکم فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ سەراوی بچووك دەکەن، بەدەستی راستتان چووکتان مەگرن، هەروا تاراتیش بەدەستی راستتان مەگرن، کاتێ شتیش دەخۆنەوە، لەوکاتەدا، لەناو جامەکەدا هەناسە مەدەن). (تاج/١/١٢٠، ژمارە: ١٩٤/١٣).

**روونکردنەوە:**

ئەبو قەتادە ناوی حاریث، یا نوعمان، یا عەمری کوڕی رەبیعییە، نازناوی (فارس رَسُولِ اللّهِ)یە. واتە: شاسوارەکەی پێغەمبەری خودا، لەخزمەت حەزرەتدا ئامادەی غەزای ئوحودو غەزای خەندەق‌و غەزاکانی تری پاش خەندەق بووە، بەڵام

واناوداره كه ئامادەی بەدر نەبووه، سەدو حەفتا فەرمووده‌ی هەیە، یازدەیان پەسەندی هەردوو پیرن، واتە: هەم بوخاری، هەم موسلیم گێڕاویانەتەوه، دوو فەرموودەی تری لە بوخاریدا هەیە، بێجگە لەو یازدەیەی کە پەسەندی هەردوو پیرن، هەشت فەرموودەی تری لە صەحیحی موسلیمدا هەیە، واتە: کۆی فەرموودەکانی لە بوخاریدا دەکاتە: ١١ + ٢ = ١٣ فەرموودە، وەکۆی فەرموودەکانی لە موسلیمدا دەکاتە: ١١ + ٨ = ١٩ فەرموودە. سەرجەمی فەرموودەکانی لە بوخاریو موسلیمدا دەکاتە: ١١ + ٢ + ٨ = ٢١ فەرموودە.

راجیایی هەیە لە شوێنی مردنیدا، هەندێ دەفەرموون: لە مەدینە، هەندێ دەڵێن: لە کووفە، بە مەرگی خوا مردووە، لەساڵی پەنجاو چواری کۆچیدا لەتەمەنی حەفتا ساڵیدا فەرمانی حەقی یەزدانی بەجێ هێناوە، (رەزای خودای لێ بێ).

لەزانستی فەرموودەدا، زانینی زێدو شوێنی مەرگو چەندێتی تەمەنو ساڵی مەرگی فەرموودەزان (راوی)و جێگەی دانیشتنیو ناوی ناسیاوی، بایەخێکی چاکی هەیە، زۆرجار دەبێ بەسەرچاوە بۆ روونکردنەوەی فەرموودەکە، یا بۆ لەباریو نالەباریی رشتەکەی.

## ٧٨) تارات گرتن بەئاو {باب: الاستنجاءُ بِالْمَاءِ مِنَ التَّبَرُّزِ}

١١٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دَخَلَ حَائِطًا وَتَبِعَهُ غُلَامٌ مَعَهُ مِيضَأَةٌ، هُوَ أَصْغَرُنَا، فَوَضَعَهَا عِنْدَ سِدْرَةٍ فَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَاجَتَهُ فَخَرَجَ عَلَيْنَا وَقَدِ اسْتَنْجَى بِالْمَاءِ). {الحديث/ ٦١٨. طهارة. تجريد/١/١٤٤، ذمارة: ١٢٠ = ١٥٠ فتح الباري}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ سەراوکردن رۆیشتە ناو باخێکەوە، کوڕێ کە لە هەمووومان گچکە تربوو، بە مەسینەیێ ئاوەوە شوێنی کەوت، لەبن شێخەڵی دارمۆردێکا مەسینە ئاوەکەی بۆدانا، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەراوەکەی تەواوکرد بە ئاوەکە تاراتی گرت). {تاج/١/١٢٢ ژمارە: ٢٠٢/١، زنجیرە: ٢٥}.

**٧٩) خۆپاككردنەوە بە بەرد، دەبێ بەردەكان تاك بن(٥٥٩-٥٦٤).**

**باب: الاستجمارُ وِتْرٌ**

١١٥م- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) يَبْلُغُ بِهِ النَّبِىَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « إِذَا اسْتَجْمَرَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَجْمِرْ وِتْرًا، وَإِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَلْيَجْعَلْ فِى أَنْفِهِ مَاءً، ثُمَّ لْيَنْتَثِرْ». {الحديث/ ٥٥٩. طهارة}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) ئەم فەرموودەیە لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە، دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): (هەركەسێ بە بەرد یان بەشتی وا، تارات دەگرێ، با بەچەند بەردێكی تاك خۆی پاك بكاتەوە، وە با ئەو شتەی كە خۆی پێ پاك دەكاتەوە تاك بێ، وەك سێ پارچەدار، یا سێ پارچە ئاسن، یا پێنج پارچە تەپەتۆر... تاد. وە هەركەسێ دەسنوێژ دەگرێ باهنگ بكاو ئاو لە لووتی رابدا). {تاج/١/١٢٤، ژمارە: ٢٠٦/٥ — ش/ت/ن} + {بخاری: ١٦١ = تەجرید: ١٢٧}.

**٨٠) خۆپاككردنەوەو تارات گرتن بە بەرد دروستە، بەلام بە تەپاڵەو تەرسە قوڵو ئێسقان دروست نییە (٦٠٥ - ٦٢٠).**

**باب: الاسْتِجْمارِ وَالمَنْعِ مِنَ الرَّوْثِ وَالعظمِ**

١١٦- عَنْ سَلْمَانَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قِيلَ لَهُ: قَدْ عَلَّمَكُمْ نَبِيُّكُمْ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كُلَّ شَيْءٍ حَتَّى الْخِرَاءَةَ، قَالَ فَقَالَ: أَجَلْ نَهَانَا أَنْ نَسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةَ لِغَائِطٍ أَوْ بَوْلٍ، وَأَنْ نَسْتَنْجِىَ بِالْيَمِينِ، وَأَنْ نَسْتَنْجِىَ بِأَقَلَّ مِنْ ثَلاَثَةِ أَحْجَارٍ، أَوْ أَنْ نَسْتَنْجِىَ بِرَجِيعٍ أَوْ بِعَظْمٍ}. {الحديث/ ٦٠٥}:

گوتیان بە سەلمان (رەزای خودای لێ بێ) ئەم پێغەمبەرەی ئێوە هەموو شتێكتان فێردەكا، تەنانەت دەستووری سەراویشتان فێردەكا، سەلمانیش فەرمووی: بەڵێ وایە، ئەوەتانێ یاساخی كردووە لێمان كە لەكاتی پیسایی‌و میزكردندا رووبكەینە رووگە، یا بەدەستی راست تارات بگرین، یا بەسێ بەرد كەمتر خۆمان پاك بكەینەوە، یا بەتەپاڵەو تەرس‌و شتی واو ئێسقان خۆمان پاك بكەینەوە). {تاج/١/١٢٤، ژمارە: ٢٠٣/٣}.

ئەبو عەبدوڵلا سەلمانی فارسی، یەکێکە لە هاوڕێ نازدارەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خەڵکی رامە هورموزە، لە وڵاتی ئەسپەهان، تەمەنی زۆر زۆر درێژ بووە، تەنانەت زۆر لە مێژوو نووسەکان دەڵێن: (٢٥٠ - ٣٥٠) ساڵ ژیاوە، مرۆڤێکی هەست ناسکی سروشت پاك بووە، بەسرو شتپاکی خۆی، بێزی لە ئایینە پووچەکانی پێش ئیسلام کردۆتەوە، وێڵ بووە لە شوێن ئایینێکی راستو دروستو رێکی سروشتی پاکی، هەتا لەسەرەنجاما بە خزمەت حەزرەت دەگا، وە ئەشقی ئیسلام دەبێ، کاتێ دەنگو باسی هاتنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەبیستێ، دێ بۆ خزمەتی، بەڵام لەڕێ دیل دەکرێو، لە مەدینە دەفرۆشرێو دەکرێ بە کۆیلە، لە سایەی ئیسلامەوە ئازاد دەبێ، لە غەزای خەندەقا بەشداری کردووە، ئەو ئەندازیاری هەڵکەندنی خەندەقەکە بووە، بەدەوری شاری مەدینەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆری خۆش دەویست، دەیفەرموو: (سَلْمَانُ مِنَّا أَهْلَ البَيْتِ = سەلمان لە خۆمانە، کە ئەهلی بەیتی نبوە وەتین). هەروا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەهەشت ئارەزوومەندی دیداری ئەم سێ کەسەیە: عەلیو عەممارو سەلمان).

ئامادەی غەزای خەندەقو هەموو غەزاکانی دوا خەندەق بووە، هەروا بەشداریی لە ئازادکردنی وڵاتی عێراقدا کردووە، بۆ ماوەیێ بووە بە سەرەکشاری مەدائین، کە ئێستا ناوداره بە سەلمانی پاك، لەنزیك بەغداوەیە، تاقی کیسرا والەوێ، گۆڕەکەیشی والەوێ، هەتا ئێستا زیارەتگایە.

سەلمان پیاوێکی زانای بەهرەمەندی خێرخوای خاوەن زوهدی لەخوا ترسی سۆفیلکەی چلە کێش (مُتَقَشِّف) بوو، مووچەو بەراتەکەی پێنج هەزار درەم بوو، هەرکەوەری دەگرت، یەکسەر دەیکرد بەخێر، بەدەستی خۆی لە پەلکە خورماو شتی تری وا، چنراوی دەچنیو بەوە دەژیا، دیاریو دەسەنەو خێرو یارمەتی لەکەس وەرنەدەگرت، بەرەنجی شانی خۆی دەژیا، وەك حەزرەتی داوود پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ). سەلمان خانووی نەبوو، زوربەی کات لەبن سێبەری دیوارو درەختا

دادەنیشت، هەتا پیاوێ قایلی کرد، کە کولبەیەکی وای بۆ دروست بکا، کە لەباران‌و خۆرەتاو بیپارێزێ، بەڵام بەمەرجێ ئەوەندە تەنگەبەرو تەسك‌و تروسك بێ، ئەگەر لەناویدا رابوەستێ سەری بدا لە بنمیچەکەی، ئەگەر قاچ درێژبکا، قاچی بدا لە دیوارەکەی! ئەویش بەوە ڕازی بوو.

سەلمان گوێی بەجێگەی خۆش‌و بەرگی کەشخە نەدەدا، عابایەکی هەبوو لایەکی دەکردە بەری‌و، ئەو لایەکەی تری لەژێریا دادەخست!

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ پەیمانی برایەتی (موئاخات)ی بەست لەنێوانی موسوڵمانان‌دا، سەلمان‌و ئەبو دەردای کرد بە برای ئایینی یەکتری. گەلێ لە هاوڕێیانی پێغەمبەرو لە چینی دووەمی موسوڵمانان (واتە: لە سەحابەو تابیعین) زانست‌و سوننەت‌و شەریعەتیان لەسەلمان وەردەگرت. لە هاوڕێیان وەك ئەم زاتانە: ئیمامی ئەنەسی کوڕی مالیك‌و کەعبی کوڕی عوجرەو ئیبنو عەباس‌و ئەبو سەعیدی خودری‌و ئیبنو عومەرو ئەبو طوفەیل، لە پەیڕەوانیش (تابیعین: شوێن کەوتووان) وەك ئەم زاتانە: ئەبو عوسمانی ئەل‌نەهدی‌و ئیبنو شهاب‌و سەعیدی کوڕی وەهاب. سەلمان لەساڵی سیی‌و پێنجی کۆچیدا عەمری خودای کرد. {بڕوانە: تەجرید بە کوردی، بەرگی/١، لاپەڕە: ٤٤٣، ژمارە: ٨٨٣/٤٦٨}.

## ٨١) کەڵك‌و سوود وەرگرتن لە کەوڵی مردار دروستە. (٨٠٤ - ٨١٣)

## بابٌ: الانتِفاعُ بِأهَبِ المَيْتَة

١١٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عنهما) قَالَ: تُصُدِّقَ عَلَى مَوْلاَةٍ لِمَيْمُونَةَ بِشَاةٍ فَمَاتَتْ، فَمَرَّ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: « هَلاَّ أَخَذْتُمْ إِهَابَهَا فَدَبَغْتُمُوهُ فَانْتَفَعْتُمْ بِهِ؟ فَقَالُوا: إِنَّهَا مَيْتَةٌ. فَقَالَ: « إِنَّمَا حَرُمَ أَكْلُهَا». {الحديث/ ٨٠٤. حيض. تجري/كوردي/٢، لاپەڕە: ١٤١، رقم: ١٤٩٢/٧١٧}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ مەڕێکیان بەزەکات دابوو بە کارەکەرێکی مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر، کە ئازادکراوی مەیموونە بوو، مەڕەکە مردارەوە بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەلاکی مەڕەکەی بینی فڕەدرابوو،

فەرمووی: (ئەی ئەوە بۆچی کەڵکتان لە پێستەکەی وەرنەگرتووە؟). گوتیان: ئاخر ئەمە مردارەوە بووە، ئیتر چۆن کەڵکی لێ وەربگرین؟ فەرمووی: (شتی مردارەوە بوو تەنیا خواردنی دروست نییە، واتە: دروستە سوود لەکەوڵی مردارەوە بوو وەربگیرێ).

**روونکردنەوە:**

مەیموونەی کچی حاریث، دایکی موسوڵمانان، لەساڵی شەش، یا حەوتی کۆچی، لەسەریف پێغەمبەر هێنای، لەهەمان شوێن لەساڵی (٥١) ی کۆچی مردووە، هەندێ دەفەرموون لە (٦٦)ی کۆچیدا لەوشوێنە کۆچی دوایی کردووە، ئیبنو عەبباس، کە خوشکەزای بوو نوێژی تەرمی لەسەر کردو لەگەڵ دوو خوشکەزای تریدا دایانهێڵایە ناو گۆڕەکەیەوە، مەیموونە لەپێشا ناوی (بەڕە)بوو، پێغەمبەر ناوەکەی گۆڕی‌و ناوی نا مەیموونە. واقیدی دەفەرموێ: (دوا هەمین ژنی پێغەمبەر بووە کە مردووە).

## ٨٢) هەرکەوڵێ خۆشەکرا پاك دەبێتەوە {باب: إِذَا دُبِغَ الإِهَابُ فَقَدْ طَهُرَ}

١١٨- عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ أَنَّ أَبَا الْخَيْرِ حَدَّثَهُ قَالَ : رَأَيْتُ عَلَى ابْنِ وَعْلَةَ السَّبَائِيِّ فَرْوًا ، فَمَسِسْتُهُ. فَقَالَ : مَا لَكَ تَمَسُّهُ ؟ قَدْ سَأَلْتُ عَبْدَاللّه بْنَ عَبَّاسٍ قُلْتُ: إِنَّا نَكُونُ بِالْمَغْرِبِ، وَمَعَنَا الْبَرْبَرُ وَالْمَجُوسُ نُؤْتَى بِالْكَبْشِ قَدْ ذَبَحُوهُ وَنَحْنُ لاَ نَأْكُلُ ذَبَائِحَهُمْ وَيَأْتُونَنَا بِالسِّقَاءِ يَجْعَلُونَ فِيهِ الْوَدَكَ. فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: قَدْ سَأَلْنَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عن ذلِك فَقَالَ: « دِبَاغُهُ طَهُورُهُ». {الحديث/ ٨١٢} :

یەزیدی کوڕی ئەبو حەبیب دەفەرموێ: ئەبولخەیر قسەی بۆم کرد، فەرمووی: ئیبنو وەعلەی سەبائی فەروەیەکی لەبەردا بوو، منیش دەستم لێدا، تا بزانم چییە، فەرمووی: ئەوە بۆ دەستی لێ دەدەی؟ بۆ خۆم لە عەبدوڵلای کوڕی عەباسم پرسی، گوتم: رێ دەکەوێ دەچین بۆ وڵاتی رۆژاوا، بەربەرو ئاگر پەرست لەوێ هەن، بەران سەردەبڕن‌و دەیهێنن بۆمان، بەڵام ئێمە سەربڕاوی ئەوان ناخۆین چونکە خواردنی نادروستە بۆ موسوڵمان، هەروا کوندە ئاوو مەشکە پیومان بۆ دێنن، نازانین ئەو کوندەو مەشکانە هی ئاژەڵی سەربڕاون یانا؟ ئیبنو عەبباس فەرمووی: لەو کوندەو

مەشکانە بخۆنەوە. گوتم: ئەمە بەڕای خۆت وا دەفەرموویت، یان شتێکت لەم بارەیەوە بیستووە؟ فەرمووی: بۆ ئەمە لە پێغەمبەرمان بیست دەیفەرموو: (خۆشە کردنەکەی پاکی دەکاتەوە). {تاج/١/١٠٩، ژمارە: ٣/١٦٣}.

**٨٣) کاتێ سەگ دەم بخاتە ناو حاجەتەوە، دەبێ حەوت جار بشۆرری** (٦٤٦ - ٦٥٢).

**باب: إذا وَلغَ الكَلْبُ فِي إِناءِ أحدِكُمْ فَليَغسْلهُ سَبْعاً**

١١٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْمُغَفَّلِ قَالَ: أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِقَتْلِ الْكِلاَبِ، ثُمَّ قَالَ: « مَا بَالُهُمْ وَبَالُ الْكِلاَبِ؟». ثُمَّ رَخَّصَ فِي كَلْبِ الصَّيْدِ وَكَلْبِ الْغَنَمِ، وَقَالَ: « إِذَا وَلَغَ الْكَلْبُ فِي الإِنَاءِ، فَاغْسِلُوهُ سَبْعَ مَرَّاتٍ، وَعَفِّرُوهُ الثَّامِنَةَ فِي التُّرَابِ». وَفِي رِوَايَةِ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ: (وَرَخَّصَ فِي كَلْبِ الْغَنَمِ وَالصَّيْدِ وَالزَّرْعِ). {الحديث/ ٦٥١، ٦٥٢، طهارة + ٣٩٩٧. مساقاة + ٣٩٩٨ مساقاة}. (رقم: ١٣٢/ ١٧٢، تجريد/ ١/ ١٥٥).

عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی دەرکرد بۆ کوشتنی سەگەل، لەپاشا فەرمووی: (ئەوە بۆچی واز لە ڕاگرتنی سەگ ناهێنن؟). لەپاشا مۆڵەتی ڕاگرتنی سەگی ڕاوی و سەگی پاسی ئاژەڵ و کشتوکاڵی دا. وە فەرمووی: (کە سەگ یا بەراز دەمی نایە ناو حاجەت و قاپەوە، هەرچی تێدایە بیرێژن، ئەنجا حەوت جار بەئاوی پاك بیشۆرن، یەکێ لەو جارانە بە خۆڵاو بێ، جاری خۆڵاوەکە دائەنرێ بە دووجار، بەم تەئویلە جارەکان دەکەنە هەشت). {تاج/١/١٠٩، زنجیرە: ٢٢، ژمارە: ٤/١٦٢}.

**ڕوونکردنەوە:**

عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل، یەکێکە لە دەستەی پەیمانی خۆشنوودی، (کە ناودارە بە بەیعەتولڕیضوان) کە پێشیان دەگوترێ: (أصحاب الشَجْرَه: یارانی درەختەکە). عەبدوڵڵا دەیفەرموو: بە دەستی خۆم لق و پۆپی ئەو درەختەم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوور دەخستەوە، کە لەکاتی ڕێکەوتنی حودەیبییەدا

پەیمانی بەیعەتولرپیضوانی لە ژێردا سازدا، چلو سێ فەرموودەی هەیە، لە بوخاریدا پێنجی هەیە، کاتێ شاری (تستر) ئازادکرا، عەبدوڵلا یەکەم کەس بوو لە دەروازەکەیەوە چووە ژوورەوە، لەهەموو کەسێ زیاتر حەسەنی بەصری فەرموودەکانی ئەو دەگێڕێتەوە، یەکێ بوو لەو دەکەسە کە ئیمامی عومەر ناردنی بۆ بەصرە، هەتا دانیشتوانی شارەزای ئایین بکەن، حەوت منالی هەبوو، ساڵی شەستی کۆچی لە بەصرە، بە مەرگی خوا مردووە، لەسەر راسپێری خۆی ئەبو بەرزەی ئەسلەمی، نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی کرد.

### ٨٤) گەورەییو بەهرەی دەستنوێژ (٥٣٣). {باب: فَضْلُ الوُضُوءِ}

١٢٠- عَنْ أَبِي مَالِكٍ الأَشْعَرِيِّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « الطُّهُورُ شَطْرُ الإِيمَانِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلأُ الْمِيزَانَ، وَسُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلآنِ، أَوْ تَمْلأُ، مَا بَيْنَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، وَالصَّلاَةُ نُورٌ وَالصَّدَقَةُ بُرْهَانٌ، وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ، وَالْقُرآنُ حُجَّةٌ لَكَ أَوْ عَلَيْكَ. كُلُّ النَّاسِ يَغْدُو، فَبَائِعٌ نَفْسَهُ، فَمُعْتِقُهَا أَوْ مُوبِقُهَا». {الحديث/ ٥٣٣. طهارة. فضل الوضوء}:

ئەبو مالیکی ئەشعەری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پاکیو خاوێنی دڵو دەمو دەستو لەشو بەرگو جێو شوێن، نیوەی تەواوی ئیمانو باوەڕە! وە خێری زیکری (الحمد لله) تای خێری تەرازووی خێرو شەڕ پڕدەکا، وە خێری زیکری (سبحان اللهِ وَالحمدُ لِلّهِ) پڕ بە مابەینی ئەرزو ئاسمانەکانە، وە نوێژ نوورە بۆ چاوو هەناو، رووناکییە بۆ دڵو دەروون، وە خێرو خێراتو زەکاتو شت بەخشین لەبەر خودا، بەڵگەیە لەسەر دامەزراندنی ئیمانو باوەڕ لە دڵو دەروونو قەڵغانە بۆ خاوەنی، صەبرو ئارامو خۆگری مایەی رۆشنایی دڵو دەروونەو چرای دەستی مرۆڤی موسوڵمانە لە ژیانا، بەتایبەتی لەکاتی چورتمو لێقەومانا، وە قورئان شایەتو بەڵگەیە: جا یا لەسەرت دەکاتەوە، ئەگەر لەسەری بکەیتەوە، یا لە دژت دەوەستێ، ئەگەر رەفتو کاری پێ نەکەی. وە هەموو کەسێ، کە رۆژ دەکاتەوە، خۆی بەلایەکا ساخ دەکاتەوە، جا یاخۆی دەفرۆشێ بە

خـوداى میهرەبـان‌و خـۆى ئـازاد دەكـا لـە ئـاگرى دۆزەخ، یـاخود خـۆ دەفرۆشـێ بـە شەیتان‌و خۆى ماڵ وێران دەكا). {تاج/١/١٠٠، ژمارە: ١٤٢/٥، زنجیرە: ٢٠}.

**ڕوونكردنەوە:**

ئیمامى ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتى خوداى لێ بێ) لە پەڕاوى تەهزیبو تەهزیبا دەفەرموێ: (ئیمـامى موسـلیم‌و كەسـانى تـریش فـەرموودەى (الطَّهُـورُ شَـطْرُ الإِيمَـانِ) لـە ئـەبو سەلامەوە لە ئەبو مالیكى ئەل‌ئەشعەرییەوە، لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، كەناوى كەعبى كوڕى عاصیمە، بوخارى دەفەرموێ: (هاوڕێتیى پێغەمبەرى بۆچەسپاوە).

بەغـەوى دەفـەرموێ: لـە میصـر نیشـتەجێ بـوو، ئـوم دەرداء ریوایـەتى لێـوە كـردووە، ئـەم نـاوە زۆر پێچیدەیە. لەبەرئـەوە بـا ئەوەنـدە بـەس بێـت). {بڕوانـە: الحاريث بن الحارث، ژمارە: ٢٣٢ تهذيب التهذيب}.

## ٨٥) دەرچوونى گوناهەكان لە ئەندامى دەسنوێژ لەگەڵ ئاوى دەستنوێژدا (٥٧٦ - ٥٨٥).

## باب: خُرُوجُ الخَطَايَا مَعَ الوُضُوءِ

١٢١- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: « إِذَا تَوَضَّأَ الْعَبْدُ الْمُسْلِمُ، أَوِ الْمُؤْمِنُ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ خَرَجَ مِنْ وَجْهِهِ كُلُّ خَطِيئَةٍ نَظَرَ إِلَيْهَـا بِعَيْنَيْـهِ مَعَ الْمَاءِ أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاءِ، فَإِذَا غَسَلَ يَدَيْهِ خَرَجَ مِنْ يَدَيْهِ كُلُّ خَطِيئَةٍ كَانَ بَطَشَتْهَا يَدَاهُ مَعَ الْمَاءِ أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاءِ، فَإِذَا غَسَـلَ رِجْلَيْـهِ خَرَجَـتْ كُـلُّ خَطِيئَـةٍ مَشَـتْهَا رِجْلاَهُ مَـعَ الْمَاءِ، أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاءِ حَتَّى يَخْرُجَ نَقِيًّا مِنَ الذُّنُوبِ».{الحديث/٥٧٦.طهارة}:

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزاى خـوداى لێ بـێ) دەفـەرموێ: خۆشەویسـت (درووودى خـوداى لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (كاتـێ بەنـدەى موسـوڵمان) یـا فـەرمووى: (كاتـێ بەنـدەى بـڕوادار، دەسنوێژ دەگرێ، كە دەموچاوى دەشوا، هەرچى گوناهێ كـە بەچاوەكانى كردوونـى، وەك روانینـى نـاڕەواو شـتى وا، لەگـەڵ چـۆڕاوگەى ئـاوى دەسـنوێژەكەدا دەكەونـە خـوارەوەو دەڕۆن، یـا لەگـەڵ دوا دڵـۆپى ئاوەكـەدا، دادەكـەون‌و دەڕۆن، كـە هـەردوو

دەستی دەشۆرێ ئەو گوناهانەی کە بە دەستەکانی کردوونی لەگەڵ چۆڕاوگەی ئاوی دەسنوێژەکەدا دادەکەونە خوارەوە، یا لەگەڵ دوا دڵۆپی ئاوەکەدا دادەکەونو دەڕۆن، کە هەردوو قاچی دەشوا هەروا، هەتا پاك دەبێتەوە لە گوناه). {ریاض/١/١٢٨، ژمارە: ١٣/١٢٩، زنجیرە: ١٣ + تاج/١، لاپەڕە: ٩٩، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ٣/١٤١}.

## ٨٦) سیواك بۆ دەستنوێژ سوننەتە (٥٨٨ - ٥٩٥).

## باب: فِي السِّوَاكِ عِنْدَ الوُضوءِ

١٢٢- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِىَ اللّٰهُ عنهما) أَنَّهُ بَاتَ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَقَامَ نَبِيُّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ، فَخَرَجَ فَنَظَرَ إِلَى السَّمَاءِ ثُمَّ تَلاَ هَذِهِ الآيَةَ فِى آلِ عِمْرَانَ: (إِنَّ فِى خَلْقِ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ) حَتَّى بَلَغَ (فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ) ثُمَّ رَجَعَ إِلَى الْبَيْتِ، فَتَسَوَّكَ فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى ثُمَّ اضْطَجَعَ، ثُمَّ قَامَ فَخَرَجَ فَنَظَرَ إِلَى السَّمَاءِ، فَتَلاَ هَذِهِ الآيَةَ، ثُمَّ رَجَعَ فَتَسَوَّكَ فَتَوَضَّأَ ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى). {الحديث/ ٥٩٥. طهارة}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: شەوێ لەلای پێغەمبەر، لەماڵی مەیموونەی پوورم شەوم کردەوە، لە کۆتایی شەودا پێغەمبەری خودا، (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسا، چووە دەرەوەو سەرەنجێکی ئاسمانی دا، ئەوجا ئەم ئایەتەی خوێند، لە سوورەتی ئالی عیمران: {إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لِّأُوْلِي الأَلْبَابِ. الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَىَ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذا بَاطِلاً سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ - سورة آل عمران - ٣/١٨٩ - ١٩٠}.

واتە: بەڕاستی لە دروستکردنی ئاسمانەکانو لە ئەوزاعی زەمینو لە جیاوازی شەوو رۆژدا، بەکورتیو درێژی، گەلێ ئایاتو عەلاماتو بەڵگەو نیشانە هەن، بۆ ئەو کەسانە کە دارای هۆشو گۆشنو بەچاوی دڵ تەماشای ئەم بوونەوەرە دەکەنو بەوردی سەرەنجی لێ دەدەن، بۆ ئەوانە کە یادو زیکری خودا تێکەڵی خوێنو مۆخیان بووە، لە هەموو بارو دۆخێکیانا هەر یادی خوا دەکەن، بە راوەستانەوە،

بە دانیشتنەوە، بە پاڵەوە، لەسەر لا، هەمیشە یادی خوا دەکەنو بیر لەکاری خوا دەکەنەوە کە چۆن ئاسمانەکانو زەوی دروست کردووە، سەرەنجام تەسلیم دەبنو دەڵێن: پەروەردگاری ئێمە، تۆ زاناو دانای، ئەم بوونەوەرەت بە بەلاش دروست نەکردووە، تۆ پاكو پیرۆزی لەکەمو کووڕی، لە سزای ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە).

ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گەڕایەوە ناو ماڵەوە، سیواکی کردوو دەسنوێژی گرتو ئەوسا هەڵسا نوێژی کرد، ئەوجا راکشایەوە. پاش ماوەیێ دیسان هەڵسایەوەو رۆیشتەوە دەرەوەو ئایەتەکەی خوێندەوە، دیسان گەڕایەوە بۆ ناو ماڵەوە، سیواکی کردوو دەسنوێژی گرتەوەو دەستی کردەوە بە شەو نوێژ کردن). {بڕوانە ئەم ژمارانە لە صەحیحی موسلیم: ١٧٩٠، ١٧٩١ هەتا ژمارە: ١٧٩٧ — صلاة المسافرین}.

١٢٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها) أَنَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ إِذَا دَخَلَ بَيْتَهُ بَدَأَ بِالسِّوَاكِ}. {الحديث/ ٥٩٠. طهارة} :

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، کاتێ دەهاتەوە بۆ ماڵەوە، لەپێش پێشا سیواکی دەکرد). {بۆ بابەتی سیواك بڕوانە: ریاض/٣، لاپەڕە: ١٤٢، زنجیرە: ٢١٥ چاپی دووەم + فیقهی ئاسان/١، لاپەڕە: ٢٤، زنجیرە: ٧. چاپی دوو} + {تاج/١، لاپەڕە: ١٣٠ — ١٣٢، زنجیرە: ٢٧ + تەجرید/کوردی/١، لاپەڕە: ١٩٣، ژمارە: ٢٤٤/١٧٥، ٢٤٥/١٧٦، ٢٤٦/١٧٧}.

### ٨٧) پێشخستنی لای راست لەکاتی دەستنوێژو شتی تردا

١٢٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها)، قَالَتْ: إِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيُحِبُّ التَّيَمُّنَ فِي طُهُورِهِ إِذَا تَطَهَّرَ، وَفِي تَرَجُّلِهِ إِذَا تَرَجَّلَ، وَفِي انْتِعَالِهِ إِذَا انْتَعَلَ}. {الحديث/ ٦١٥. تجريد البخاري: ١٢٩/١٦٨ فتح} :

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکردنی ئەم شتانەدا حەزی لەوە بوو کەلای راستی پێش بخات: لەدەسنوێژ شۆردنو

خۆشۆردنداو، لەقژ شانەکردنو پێڵاو لەپێکردندا). {تاج/١، لاپەڕە: ١٥٤، ژمارە: ٤، زنجیرە: ٣٢}.

**٨٨) چۆنێتی دەسنوێژی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **(٥٥٤ - ٥٥٨).**

**باب: صِفَةُ وُضُوءِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).**

١٢٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَاصِمٍ الأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ، قَالَ: قِيلَ لَهُ: تَوَضَّأْ لَنَا وُضُوءَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَدَعَا بِإِنَاءٍ فَأَكْفَأَ مِنْهَا عَلَى يَدَيْهِ فَغَسَلَهُمَا ثَلاثًا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فَاسْتَخْرَجَهَا، فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ مِنْ كَفٍّ وَاحِدَةٍ فَفَعَلَ ذَلِكَ ثَلاثًا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فَاسْتَخْرَجَهَا، فَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاثًا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فَاسْتَخْرَجَهَا، فَغَسَلَ يَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ مَرَّتَيْنِ، مَرَّتَيْنِ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فَاسْتَخْرَجَهَا فَمَسَحَ بِرَأْسِهِ، فَأَقْبَلَ بِيَدَيْهِ وَأَدْبَرَ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ إِلَى الْكَعْبَيْنِ. ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا كَانَ وُضُوءُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). {الحديث/ ٥٥٤. طهارة. بخاري: ١٨٥. تجريد/١، لاپەڕە: ١٦٠}:

عەبدوڵلای کوڕی زەیدی کوڕی عاصیمی ئەنصاری (رەزای خودای لێ بێ) کە یەکێ بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر پیاوێ پێی گوت: ئایا دەتوانی کە پیشانمان بدەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چۆن دەسنوێژی دەگرت؟ عەبدوڵلا فەرمووی: بەڵێ باشە، جا داوای ئاوی کردو جامێ ئاویان بۆ هێنا، جامەکەی لار کردەوەو بە لێوی جامەکە ئاوی کرد بە دەستی خۆیداو سێ جار هەردوو دەستی خۆی لەدەرەوەی جامەکە بەو شێوەیە شۆرد، ئەوجا دەستی کرد بە جامەکەداو لوێچی ئاوی هەڵگرتو لەوتاقە لوێچە هەم ئاوی لەدەمی راداو هەم لە لووتیو هنگی کرد، سێ جار ئاوای کرد، ئەوجا بەسێ مشت ئاو دەموچاوی شۆرد، ئەوجا دەستی کردەوە بە دەفرەکەداو هەردوو دەستی کردەوە بەناو ئاوەکەداو دەستی دەرهێنایەوەو دەستی تەڕی هێنا بەسەر سەریدا، لەپێشا لە پێشە سەریەوە دەستەکانی بردن بۆ پشتە سەری، لەسەرەتاوە هەردوو دەستی بەتەڕی لە پێشی سەریەوە خشان بەسەر سەریدا هەتا پشتە ملی، ئەوجا بەرەودوا بەسەر سەریدا، بەکێشی کردن هەتا ئەو

شوێنەی کە لەوێوە دەستی پێکرد، ئەوجا هەردوو پێی هەتا هەردوو قاپەڕە قەڵەی شۆرد. ئەوجا فەرمووی: ئەمە شێوەی دەسنوێژی پێغەمبەر بوو (درووودی خودای لەسەر بێ).

**روونکردنەوە:**

عەبدوڵڵای کوڕی زەید ئەنصارییە، ئوحودییە، بەدری نییە، واتە: ئامادەی غەزای ئوحود بووە، هاوبەشی تیادا کردووە، لەریزی لەشکری ئیسلاما، بەڵام بەشداری لە غەزای بەدردا نەکردووە، عەبدوڵڵا خۆیو باوکیو دایکی (رەزای خودایان لێ بێ) هاوڕێی پێغەمبەر بوون، چلو هەشت فەرموودەی هەیە، هەشتیان پەسەندی هەردوو پیرن، واتە: هەم شێخی بوخاریو هەم شێخی موسلیم ئەو هەشت فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، یەکێکیان ئەم فەرموودەیەیە کەواین لە خزمەتیدا، کە لەبوخاریدا لە هەشت جێگەدا، بەهەشت بۆنەوە دووبارە بۆتەوە، ئاوا: ١٨٥، ١٨٦، ١٩١، ١٩٢، ١٩٧، ١٩٩. بەشداری لە کوشتنی موسەیلەمەی کەزابا کردووە. ئەم زاتانە فەقێی بوون بۆ گێڕانەوەی فەرموودەکانی: عەبادی کوڕی تەمیم کە برازای بوو، لەگەڵ یەحیای کوڕی عەمارەو کەسانی تریش. لەتەمەنی حەفتا ساڵیدا، لەمانگی قوربانندا، لە شەڕەکەی رۆژی حەررەدا، کە لە (٦٣)ی کۆچیدا بوو، شەهید کرا (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ).

### ٨٩) ئاو لەدەمو لووت رادان (٥٥٩ - ٥٦٤). {باب: الاستنثار}

١٢٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَنْشِقْ بِمَنْخِرَيْهِ مِنَ الْمَاءِ ثُمَّ لِيَنْتَثِرْ». {الحديث/ ٥٦٠، ٥٦١. تجريد/١/١٥١، رقم: ١٢٧ = ١٦١ فتح الباري شرح صحيح البخاري}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ لەئێوە دەسنوێژ دەگرێ، با ئاو لەهەردوو کونە لووتی رابداو هەنگ بکاو ناو کونە لووتەکانی پاك بکاتەوە). {تاج/١/١٢٥، زنجیرە: ٢٦، ژمارە: ٢٠٦/٥ — ش/ت/ن}.

١٢٧- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ أَنَّ النَّبِىَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « إِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ مَنَامِهِ، فَلْيَسْتَنْثِرْ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَبِيتُ عَلَى خَيَاشِيمِهِ». {الحديث/ ٥٦٣. بخاري. بدء الخلق: ٣٢٩٥}:

ئـەبو هـورەيرە (رەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: خۆشەویست (دروودی خـودای لەسـەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ کەسێکتان لەخەو خەبەری دەبێتەوە، باسێ جار ئاو لە دەم‌و لووتی رابدا، چونکە شەیتان لەناو سەرووی کونە لووتەکانیدا شەو دەکاتەوە، بەنیازی ئەوەی لەپاش خەبەر بوونەوە، لەوێوە بەرەو دڵ بڕوات‌و خوتورەی خراپی پێ بکا، بەڵام کە خەوتووەکە ئاوی لەدەم‌و لووتی رادا، ئەو هەلەی لەکیس دەچێ).

### ٩٠) دەموچاو نوورانی‌و چارە شیرینی بەهۆی دەسنوێژی تێرو پڕەوە.
### باب: الغُرُّ المحجَّلينَ منْ إسْبَاغِ الوُضُوءِ

١٢٨- عَنْ نُعَيْمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْمُجْمِرِ قَالَ: رَأَيْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَتَوَضَّأُ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ، فَأَسْبَغَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ غَسَلَ يَدَهُ الْيُمْنَى حَتَّى أَشْرَعَ فِى الْعَضُدِ، ثُمَّ يَدَهُ الْيُسْرَى، حَتَّى أَشْرَعَ فِى الْعَضُدِ، ثُمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَهُ الْيُمْنَى، حَتَّى أَشْرَعَ فِى السَّاقِ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى، حَتَّى أَشْرَعَ فِى السَّاقِ، ثُمَّ قَالَ لِي: هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَوَضَّأُ. وَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « أَنْتُمُ الْغُرُّ الْمُحَجَّلُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، مِنْ إِسْبَاغِ الْوُضُوءِ، فَمَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ فَلْيُطِلْ غُرَّتَهُ، وَتَحْجِيلَهُ». {الحديث/ ٥٧٨، ٥٧٩. تجريد البخاري: مجلد أول. رقم: ١١٠ = فتح رقم: ١٣٦، لاپەڕە: ١٣٥}:

نوعەیمی کوڕی عەبدوڵڵای ئەل‌موجمیر (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: بۆ خۆم ئەبو هورەیرەم بینی، ئاوا دەسنوێژی دەگرت: لەپێشا روخساری خۆی شۆرد، زۆر بە تێرو پڕی، ئەوجا دەستی راستی شۆرد، لە ئانیشکی تێپەڕان، هەنێ لە قۆڵی لەگەڵیا شۆرد، ئەوجا دەستی چەپی شۆرد، هەتا گەیشتە قۆڵی، ئەنجا دەستی بەتەڕی هێنا بەسەر سەریدا، ئەوجا قاچی راستی شۆرد هەتا لاقی، ئەوجا قاچی چەپی شۆرد

هەتا لاقی، ئەوجا ئەبو هورەیرە بەمنی فەرموو: (ئەی نوعەیم! ئا بەم شێوەیە پێغەمبەرم دیوە دەسنوێژی گرتووە).

ئەبو هورەیرە فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئێوەی گەلی ئیسلامی من، لە رۆژی قیامەتا، روخسار گەش‌و نوورین دەبن‌و، چوارپەل سپی‌و نەخشین دەبن، چونکە ئەو شوێنانەتان کەئاوی دەسنوێژ دەیانگرێتەوە، سپی‌و گەش‌و درەوشاوەن، بەهۆی ئاسەواری دەسنوێژی تەواوی تێرو تەسەلەوە، کەواتە بۆ مسۆگەر کردنی ئەم بەهرە گەورەیە، لەکاتی دەسنوێژ گرتندا، چەندە دەتوانن قەشی روخسارو گەشیی دەست‌و پێی خۆتان زۆرتر بکەن).

١٢٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، أَتَى الْمَقْبُرَةَ فَقَالَ: « السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللّهُ بِكُمْ لاَحِقُونَ، وَدِدْتُ أَنَّا قَدْ رَأَيْنَا إِخْوَانَنَا، قَالُوا: أَوَلَسْنَا إِخْوَانَكَ؟ يَا رَسُولَ اللّهِ! قَالَ: بَلْ أَنْتُمْ أَصْحَابِي، وَإِخْوَانُنَا الَّذِينَ لَمْ يَأْتُوا بَعْدُ، فَقَالُوا: كَيْفَ تَعْرِفُ مَنْ لَمْ يَأْتِ بَعْدُ مِنْ أُمَّتِكَ يَا رَسُولَ اللّهِ؟ قَالَ: أَرَأَيْتَ لَوْ أَنَّ رَجُلاً لَهُ خَيْلٌ غُرٌّ مُحَجَّلَةٌ، بَيْنَ ظَهْرَيْ خَيْلٍ دُهْمٍ بُهْمٍ، أَلاَ يَعْرِفُ خَيْلَهُ؟ قَالُوا: بَلَى، يَا رَسُولَ اللّهِ، قَالَ: فَإِنَّهُمْ يَأْتُونَ يَوْمَ القِيامَةِ غُرًّا مُحَجَّلِينَ مِنَ الْوُضُوءِ، وَأَنَا فَرَطُهُمْ عَلَى الْحَوْضِ، أَلاَ لَيُذَادَنَّ رِجَالٌ عَنْ حَوْضِي كَمَا يُذَادُ الْبَعِيرُ الضَّالُّ، أُنَادِيهِمْ: أَلاَ هَلُمَّ، فَيُقَالُ: إِنَّهُمْ قَدْ بَدَّلُوا بَعْدَكَ، فَأَقُولُ: سُحْقًا سُحْقًا». {الحديث/ ٥٨٣. طهارة}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوو بۆسەر گۆڕستانی بەقیع، کە گۆڕستانی موسوڵمانەکان بوو لە مەدینە، فەرمووی: (السَّلاَمُ عليكم دَارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللهُ بِكُمْ لاَحِقُونَ: سڵاوتان لێ بێ، مەبەستم لەو موسوڵمانانەیە کە ئەم گۆڕستانە بووە بەماڵی دوارۆژیان، دروودو سڵاوتان لێ بێ ئەی دانیشتوانی شاری خامۆشان! ئێمەیش (خوا حەزکا) دەگەینەوە پێتان، ئێمەیش دەمرین‌و دێینەوە بۆلای ئێوە). ئینجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خۆزگەم براکانی خۆشمان دەبینی). یارانیش فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! بۆچی براکانت زیاد لە ئێمە کێی ترن؟ فەرمووی: (ئێوە

**براو هاوڕێو یارو یاوەری منن، بەڵام براکانمان ئەو موسوڵمانانەن کە هێشتا نەهاتونەتە جیهانەوەو جارێ لەدایك نەبوونو لەمەودوا، چەرخ لەدوا چەرخ لەدایك دەبنو بە موسوڵمانەتی دەمرن، هەتا ڕۆژی قیامەت).**

**گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە چۆن ئەوانە لە ئۆمەتت دەناسیتەوە کە هێشتا لەدایك نەبوونو لەجیهانا نایان بینی؟ خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (پێم بڵێن ئەگەر پیاوێ ڕەوگە ماینێکی مارۆی چوار پەل سپی هەبێ، لەناو ڕەوگە ماینێکی ڕەشی پەتی دابێ، ئایا ڕەوگەکەی خۆی ناناسێتەوە؟). گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا! خۆشەویست فەرمووی: (دەسا ئۆمەتی منیش لە قیامەتا کەدێن بۆلام، خۆم لەسەر حەوزی کەوسەر چاوەنوارِیان دەکەم، هەموویان قەشو مارۆو روخسار گەشو نوورانینو چوارپەل سپینو ئەو شوێنانەیان کە ئاوی دەسنوێژ دەیانگرێتەوە سپیو گەشو جوانن، ئاگاداربن گەلێ کەس لەسەر حەوزی کەوسەر گورێیان لێ دەکرێ، وەك چۆن خاوەن ئاژەڵ گورێ لە ئاژەڵی ئاوەکی دەکاو ناهێڵێ بێنەماڵیو بەس ئاژەڵو وشترەکانی خۆی رێ دەدا، کە برۆنە جێگەو رێگەی ئاسایی خۆیان، زۆرکەسیش لە ئۆمەتی من ئاوا گورێیان لێ دەکرێو ناهێڵن لەگەڵ جەماوەرەکەدا بێن بۆلام بۆسەر حەوزی کەوسەر، خۆم کەلەوێم بانگیان لێ دەکەم: وەرن بۆسەر حەوزەکەم، خۆ ئێوە لە ئۆمەتی من بوون. فریشتەکان دەڵێن: ئەوانە لەپاش تۆ وەرگەڕا بوون، بۆیە ئێستا رێگەیان پێ نادرێ کە بێن بۆ خزمەتت! جا منیش دەڵێم: کەوایە دەچش لەچارەیان، لەوە ئەولاتر برۆن!).** {تاج/١، لاپەڕە: ٥٧، زنجیرە: ٩، ژمارە: ٧٠/٩ + تەجرید: ١٣٦/١١٠ + ریاض/٣، زنجیرە: ١٨٥، ژمارە: ١٠٢٩/٦}.

**٩١) گرتنی دەسنوێژ بەجوانی** (٥٣٧ - ٥٣٨).

**باب: مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الوُضُوءَ**

**١٣٠- عَنْ حُمْرَانَ مَوْلَى عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ دَعَا بِوَضُوءٍ، فَتَوَضَّأَ، فَغَسَلَ كَفَّيْهِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ مَضْمَضَ وَاسْتَنْثَرَ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاَثَ**

مَرَّاتٍ، ثُمَّ غَسَلَ يَدَهُ الْيُمْنَى إِلَى الْمِرْفَقِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ غَسَلَ يَدَهُ الْيُسْرَى مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ مَسَحَ رَأْسَهُ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَهُ الْيُمْنَى إِلَى الْكَعْبَيْنِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ غَسَلَ الْيُسْرَى مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هَذَا ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « مَنْ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هَذَا، ثُمَّ قَامَ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ لاَ يُحَدِّثُ فِيهِمَا نَفْسَهُ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ». قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَكَانَ عُلَمَاؤُنَا يَقُولُونَ هَذَا الْوُضُوءُ أَسْبَغُ مَا يَتَوَضَّأُ بِهِ أَحَدٌ لِلصَّلاَةِ. {الحديث/ ٥٣٧. تجريد البخاري: ١/١٤٨، رقم: ١٢٦ = فتح الباري شرح صحيح البخاري: ١٥٩، ١٦٠، ١٦٤، ١٩٣٤، ٦٤٣٣}:

حومرانی نۆکەری ئیمامی عوسمان (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عوسمان (رەزای خودای لێ بێ) داوای ئاوی دەسنوێژی کردو ئاوا لەسەر ئەم شێوەیە دەسنوێژی گرت: لەپێشا لە دەفرەکە ئاوی کرد بەهەردوو دەستی خۆیدا، هەردوو دەستی تا هەردوو مووچەکانی سێجار شۆرد، ئینجا دەستی راستی کرد بەناو دەفرەکەداو سێجار ئاوی لەدەمیو لە لووتی راداو هنگی کرد، ئینجا سێجار دەموچاوی شۆرد، ئینجا سێجار دەستی راستی هەتا ئەنیشکی شۆرد، ئینجا سێجار بەوچەشنە دەستی چەپیشی شۆرد، ئەنجا دەستی تەڕی هێنا بەسەر سەریدا، سەری خۆی مەسح کرد، ئینجا پێی راستی هەتا هەردوو قاپەڕە قەڵەی سێجار شۆرد، ئینجا سێجار بەوچەشنە قاچی چەپیشی شۆرد، لەپاشا عوسمان فەرمووی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دی، وەك ئەم دەسنوێژەی من گرتم لەبەرچاوی ئێوە، ئاوا دەسنوێژی گرتو، ئەوجا فەرمووی (درووودو سلاوی خودای گەورەی لەسەر بێ): (هەرکەسێ دەسنوێژێ بگرێ لەچەشنی ئەم دەسنوێژەی کە ئێستا من گرتم، ئەوجا هەڵسێ دوو رکات نوێژی پوختی دوور لە خەیاڵی کاروباری دنیایی بکا، یا پتر لەدوو رکات بکا بەهەمان شێوە، ئیتر خودای گەورە لە گوناهی لەوەپێشی خۆش دەبێ). (تاج/١، زنجیرە: ٢٨، ژمارە: ١).

ئیبنو شەهاب فەرمووی: (زانایانی ئێمە دەفەرموون: ئەمە نموونەی تێرو تەسەلترینی دەسنوێژی نوێژە، بۆکەسێ بیەوێ دەسنوێژی تەواو بگرێ).

١٣١- عَنْ حُمْرَانَ أَنَّ عُثْمَانَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « مَنْ أَتَمَّ الْوُضُوءَ كَمَا أَمَرَهُ اللَّهُ تَعَالَى، فَالصَّلَوَاتُ الْمَكْتُوبَاتُ كَفَّارَاتٌ لِمَا بَيْنَهُنَّ». {الحديث/ ٥٤٦}:

حومران فەرمووی: عوسمان فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەر موسوڵمانێ دەسنوێژێکی تەواو بگرێ، وەك خودا فەرمانی پێکردووە، ئیتر نوێژە فەرزەکان کە دەیانکات دەبن بە کەفارەتی گوناهەکانی نێوانیان).

١٣٢- عَنْ عُثْمَانَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، يَقُولُ: « مَنْ تَوَضَّأَ لِلصَّلاَةِ، فَأَسْبَغَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ مَشَى إِلَى الصَّلاَةِ الْمَكْتُوبَةِ فَصَلاَّهَا مَعَ النَّاسِ، أَوْ مَعَ الْجَمَاعَةِ أَوْ فِي الْمَسْجِدِ غَفَرَ اللَّهُ لَهُ ذُنُوبَهُ».{الحديث/ ٥٤٨. بخاري. ٦٤٣٣}:

عوسمان (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ژنەوتم لە خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (هەرکەسێ دەسنوێژێکی تەواو بگرێ بۆ نوێژ، لەپاشا بڕوا بۆ نوێژگە، هەتا نوێژێکی فەرز بە کۆمەڵی لەگەڵ موسوڵمانانا بکا، یا بەجەماعەت بکا، یا لەمزگەوت بکا، خودای گەورە لەگوناهەکانی خۆش دەبێ).

## ٩٢) دەسنوێژ گرتنی تێرو تەسەل لەکاتی خۆشیو ناخۆشیدا (٥٨٦ - ٥٨٧).

١٣٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « أَلاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا يَمْحُو اللَّهُ بِهِ الْخَطَايَا وَيَرْفَعُ بِهِ الدَّرَجَاتِ؟ قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: « إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ عَلَى الْمَكَارِهِ، وَكَثْرَةُ الْخُطَا إِلَى الْمَسَاجِدِ، وَانْتِظَارُ الصَّلاَةِ بَعْدَ الصَّلاَةِ، فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ». {الحديث/ ٥٨٦. طَهَارَة}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئاگاداربن! با ئەوەتان پێ نیشان بدەم کە خودا تاوانو گوناهی بەندەی پێ دەکوژێنێتەوەو، پایەی موسوڵمانی پێ بەرز دەکاتەوە چییە؟).

گوتیان: فەرموو بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (دەسنوێژ گرتنی تێرو تەسەلو جوانو تەواو لەکاتی خۆشیو ناخۆشیدا، کاتی ناخۆشی وەك کاتی سەرماو سۆڵەو نەخۆشیو ئێشو ئازاری لەش، وە هاموشۆکردنی مزگەوت

بەگەرمی، وەچاوەنوارِ کردنی نوێژ، یەك لەدوای یەكو كردنی نوێژەكان بە رێكو پێكی بەرودوا، ئا ئەمانەن خەباتو تێكۆشانو لێبڕان بۆ خودا). {ریاضی صالحین/١، لاپەڕە: ١٢٨، ژمارە: ١٣١/١٥، زنجیرە: ١٣}.

## ٩٣) هەتا کوێ لە ئەندامەکانی دەستنوێژ ئاوی دەستنوێژ بیگرێتەوە لە قیامەتا هەتا ئەوێ خشڵی تێ دەکرێ

## باب: تَبْلُغُ الحِلْيَةُ حَيْثُ يَبْلُغُ الوَضُوءُ

١٣٤- عَنْ أَبِي حَازِمٍ قَالَ: كُنْتُ خَلْفَ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَهُوَ يَتَوَضَّأُ، فَكَانَ يَمُدُّ يَدَهُ حَتَّى يَبْلُغَ إِبْطَهُ، فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ مَا هَذَا الْوُضُوءُ؟ فَقَالَ: يَا بَنِي فَرُّوخَ أَنْتُمْ هَا هُنَا؟! لَوْ عَلِمْتُ أَنَّكُمْ هَا هُنَا مَا تَوَضَّأْتُ هَذَا الْوُضُوءَ! سَمِعْتُ خَلِيلِي يَقُولُ: «تَبْلُغُ الْحِلْيَةُ مِنَ الْمُؤْمِنِ حَيْثُ يَبْلُغُ الْوَضُوءُ». {الحديث/ ٥٨٥. طهارة. رياض الصالحين/٣/٦٣، زنجيرة: ١٨٥، رقم: ٢/١٠٢٥}:

ئەبو حازیم فەرمووی: لەپشت ئەبو هورەیرەوە بووم، خەریکبوو دەسنوێژی دەگرت، لەکاتی شۆردنی دەستەکانیدا، شۆردنەکەی درێژە کردەوە، هەتا دەگەیشتە بن باڵی، جا پێم گوت: ئەی ئەبو هورەیرە! ئەمە چۆن دەسنوێژێکە؟ فەرمووی: ئەی نەوەی فەڕوخی نەوەی ئیبراهیم، ئەوە ئێوە لێرەن؟! ئەگەر دەمزانی کەوا ئێوە لێرەن ئەم دەسنوێژەم ئاوا بەم شێوەیە نەدەگرت! لە پێغەمبەری خۆشەویستی خۆمم ژنەوت، دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): هەتا کوێ ئەندامەکانی دەستنوێژی موسوڵمان ئاوی دەستنوێژ بیانگرێتەوە، لە قیامەتا هەتا ئەوێ خشڵ دەیانگرێتەوە!).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەوەی ئەبو هورەیرە بە ئەبو حازم دەفەرموێ: (ئەگەر دەمزانی کەوا ئێوە لێرەن ئەم دەسنوێژەم ئاوا بەم شێوەیە نەدەگرت) مەبەستی مەوالیەکان بووە، کە زۆربەیان نۆکەرو ئازادکراو بوون، وە مەبەستی ئەبو هورەیرە لەم قسەیە ئەمە

بووە: بۆ زاناو مەلاو پێشەوا، کە ڕەشە خەڵك چاویان لێ دەکەن‌و گەلێ جار هەرچی ئەوان بیکەن، رەشە خەڵکە نەزانەکە، ئەوە بە فەرزو پێویست دەزانن، بۆ زاناو مەلاو پێشەوا، باش نییە کە ئەوجۆرە شتانە لەبەرچاوی ئەوان بکەن، هەتا سەریان لێ نەشێوێ‌و بەهەڵە نەیکەن بەمەهانەو بیانوو.

### ٩٤) کەسێ شتێ، یا جێگەیێ، لە ئەندامەکانی دەستنوێژ نەشۆرێ، دەبێ بیشۆرێ‌و ئەو دەستنوێژەی دووبارە بکاتەوە (٥٧٥).

### باب: مَنْ تركَ مِنْ مَوَاضِعِ الوُضُوءِ شَيْئاً غَسَلَهُ وأعادَ الوُضُوءَ.

١٣٥- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَخْبَرَنِي عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَجُلاً تَوَضَّأَ، فَتَرَكَ مَوْضِعَ ظُفُرٍ عَلَى قَدَمِهِ، فَأَبْصَرَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: «ارْجِعْ فَأَحْسِنْ وُضُوءَكَ». فَرَجَعَ، ثُمَّ صَلَّى). {الحديث/ ٥٧٥. طَهَارَة} :

جابیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عومەری کوڕی خەطاب (رەزای خودای لێ بێ) هەواڵی پێمدا، فەرمووی: پیاوێ لەخزمەت پێغەمبەردا، دەستنوێژی گرت، بەقەد جێگەی نینۆکێکی لەپێی نەشۆرد، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەوەی بینی، فەرمووی: (بچۆرەوە دەستنوێژەکەت بەجوانی بگرە) ئەویش گەڕایەوە دەستنوێژەکەی بەتەواوی شۆردەوە، ئەوسا نوێژەکەی کرد} .

### ٩٥) چەندێ ئاو بەشی دەستنوێژ، یا خۆشۆردن (غوسل) دەکا.

### بابٌ: مايَكفي مِنَ الماءِ في الغَسْلِ والوُضُوءِ

١٣٦- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَوَضَّأُ بِالْمُدِّ وَيَغْتَسِلُ بِالصَّاعِ، إِلَى خَمْسَةِ أَمْدَادٍ). {الحديث/ ٧٣٥. حيض. تجريد البخاري/١، لاپەڕە: ١٦٧، رقم: ١٤٨ = ٢٠١ فتح الباری} :

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گەلێ جار وادەبوو کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەمشت (مودد)ێك ئاو دەستنوێژی دەگرت، جاروباریش بە مەن (صاع)ێك ئاو خۆی دەشۆردو غوسلی دەردەکرد، جار جارەیش بە پێنج مودد خۆی دەشۆرد} .

**ڕوونكردنەوە:**

صاع ئەیارەیەكە چوار مودد (مست: مشت) دەگرێ، مووددیش ئەیارەیەكی شەش گۆشەیە، درێژیی لایەكی (٩,٢) نۆ سانتیم‌و لەدەدا دووی سانتیمێكە، مودد لە عەرەبیدا بە مستیش دەگوترێ، جا لە حەدیث‌و شەرعا، مەگەر نیشانەیەكی لابەر (قرینە صارفە) هەبێ، دەنا مەبەست لە مودد مشتی مرۆڤ نییە، بەڵكوو مەبەست ئەو ئەیارە ناوبراوەیە، كە زۆربەی وەرگێڕە كوردەكان تەرجەمەیان كردووە بە مشت، یا بە مست، بەڵام وەرگێڕانەكە زۆر سەركەوتوو نییە، چونكە خەڵك بە مشتی دەستی تێ دەگەن، مەگەر بڵێین: لە كوردیشا وەك عەرەبی، مشتی زمانی جیایە لە مشتی شەرعی، جێگەی داخە لە تەجریدی بوخاریدا، لەجیاتی (٩,٢) ئاوا ٩/٢ دوو لەسەر نۆ نووسراوە.

### ٩٦) دەستی تەڕهێنان بەسەر سۆل (خوف)دا.(٦٢١-٦٣٦).

### باب: المَسْحُ عَلَى الْخُفَّيْنِ

١٣٦ب- عَنْ هَمَّامٍ قَالَ: بَالَ جَرِيرٌ، ثُمَّ تَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ، فَقِيلَ: أَتَفْعَلُ هَذَا؟ فَقَالَ: نَعَمْ، رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَالَ ثُمَّ تَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ، قَالَ الأَعْمَشُ قَالَ إِبْرَاهِيمُ: كَانَ يُعْجِبُهُمْ هَذَا الْحَدِيثُ لأَنَّ إِسْلاَمَ جَرِيرٍ كَانَ بَعْدَ نُزُولِ الْمَائِدَةِ}.

{الحديث/ ٦٢١. بخاري. صلاة: ٣٨٧} = {٢٤٧ تجريد البخاري = ٣٨٧ فتح الباري}:

هەممام (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: جەریری كوڕی عەبدوڵلا جارێ گمێزی كردو خۆی پاك كردەوەو ئەوجا دەستنوێژی گرت‌و، لەباتی شۆردنی قاچەكانی دەستی تەڕی بەسەر سۆلەكانیدا كە لەپێیدا بوون هێنا، ئەوسا هەڵسا بەسۆلەكانیەوە نوێژی كرد، جا پیاوێ ڕەخنەی لێ گرت‌و لێی پرسی: چۆن شتی وادەكەی، پێت ناشۆری‌و بەپێلاوەوە نوێژ دەكەی؟! فەرمووی: بۆنایكەم، من بەچاوی خۆم دیومە كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەمان شتی كردووە.

ئەعمەش كە یەكێكە لە پیاوانی ڕشتەی ئەم فەرموودەیە فەرمووی: ئیبراهیم كە مامۆستای ئەعمەشە لەم ڕشتەیەدا، فەرمووی: موسوڵمانان ئەم فەرموودەی جەریریان زۆر بەدڵ بوو، چونكە جەریر لەدوا هاتنی ئایەتی دەستنوێژ كەوا لە

سوورەتی مائیدەدا، ئیسلام بووە، ئەمەیش واتای وایە دەستهێنان بە سۆلدا، کە لەپێش هاتنی ئەم ئایەتەدا هەبووە نەسخ نەبۆتەوە بەهاتنی ئەم ئایەتە.

١٣٧- عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: كَانَ أَبُو مُوسَى يُشَدِّدُ فِي الْبَوْلِ، وَيَبُولُ فِي قَارُورَةٍ وَيَقُولُ: إِنَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ كَانَ إِذَا أَصَابَ جِلْدَ أَحَدِهِمْ بَوْلٌ قَرَضَهُ بِالْمَقَارِيضِ، فَقَالَ حُذَيْفَةُ لَوَدِدْتُ أَنَّ صَاحِبَكُمْ لاَ يُشَدِّدُ هَذَا التَّشْدِيدَ، فَلَقَدْ رَأَيْتُنِي أَنَا وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَتَمَاشَى، فَأَتَى سُبَاطَةَ قَوْمٍ خَلْفَ حَائِطٍ، فَقَامَ كَمَا يَقُومُ أَحَدُكُمْ فَبَالَ، فَانْتَبَذْتُ مِنْهُ، فَأَشَارَ إِلَيَّ، فَجِئْتُ فَقُمْتُ عِنْدَ عَقِبِهِ حَتَّى فَرَغَ. زادَ في روايةٍ: (فَتَوَضَّأَ فَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ). {الحديث/ ٦٢٤. بخاري. وضوء: ٢٢٥، ٢٢٤، ٢٢٦، ٢٤٧١- تجريد/١، لاپەڕە: ١٨٣، رقم: ١٦٣}:

ئەبو وائیل فەرمووی: ئەبو مووسای ئەشعەری خۆی زۆر دەپاراست لەکاتی میزکردنا، تەنانەت میزی دەکردە شووشەوە مەبادا پریشکی بەرکەوێ، بۆ پاساوی ئەم توندڕەوییەی لەم بارەیەوە دەیفەرموو: ئەگەر کەسێ لەنەوەی ئیسرائیل، واتە: لە ملەتی جوولەکە، ئەگەر میز لە لەشیان بکەوتایە، ئەوجێگەیەی بە مەقەست دەبڕی، چونکە بە ئاوو شتی وا پاك نەدەبۆوە. حوزەیفەیش فەرمووی: خۆزگەم ئەبو مووسای برادەرتان، لەم بارەیەوە ئەوەندە بەتوندی نەیگرتایە، چونکە شتی وا بەپێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرەوەیە، چونکە جارێ لە خزمەت پێغەمبەردا پێکەوە دوو بەدوو دەڕۆیشتین، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چووە سەر سەرانگوێلکی هۆزێ، لەپەنا دیوارێکا بوو، وەك چۆن ئێوە بە ڕاوەستانەوە لەسەر پێ گمێز دەکەن، ئەویش ئاوا لەسەر ئەو سەلوێنکە بە پێوە وەستاو گمێزی کرد، منیش ویستم لەکاتی گمیز کردنەکەدا لێی دوور بکەومەوە، بەڵام ئاماژەی بۆکردم کە لێی نزیك ببمەوە، هەتا ببم بە حەشارگە بۆیو خەڵکەکە لەسەر ئەو شێوەیە نەیبینن، منیش وام کرد، چووم لەلای قنگە پاژنەیدا راوەستام خۆم کرد بە پەردە هەتا گمێزەکەی تەواو کرد. {تاج/١/١٢٠ – ش/د/ت/ن} لە گێڕانەوەیەکا: (ئەنجا دەستنوێژی گرتو مەسحی دوو سۆلەکەی پێی کرد).

**روونكردنەوە:**

وا دەردەكەوێ كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم سەراوكردنەدا مەهانەی رەوای بووبێ، وەك نەپەرژانو خۆپاراستن لە بۆنو پیسی زبڵدانەكە، لەهەمان كاتدا بەڵگەی ئەوەیشە بە پێوە گمیزكردن، لەبەر هەندێ هۆ دروستەو نارەوا نییە، گەرچی پێغەمبەر نەیی كردووە لە میزكردن بە پێوە.

١٣٨- عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَاتَ لَيْلَةٍ فِي مَسِيرٍ، فَقَالَ لِي: أَمَعَكَ مَاءٌ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَنَزَلَ عَنْ رَاحِلَتِهِ، فَمَشَى حَتَّى تَوَارَى فِي سَوَادِ اللَّيْلِ، ثُمَّ جَاءَ، فَأَفْرَغْتُ عَلَيْهِ مِنَ الإِدَاوَةِ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ، وَعَلَيْهِ جُبَّةٌ مِنْ صُوفٍ، فَلَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يُخْرِجَ ذِرَاعَيْهِ مِنْهَا، حَتَّى أَخْرَجَهُمَا مِنْ أَسْفَلِ الْجُبَّةِ، فَغَسَلَ ذِرَاعَيْهِ، وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ أَهْوَيْتُ لأَنْزِعَ خُفَّيْهِ، فَقَالَ: دَعْهُمَا فَإِنِّي أَدْخَلْتُهُمَا طَاهِرَتَيْنِ». وَمَسَحَ عَلَيْهِمَا}.
{الحديث/ ٦٣٠، تجريد البخاري/١/١٥٨، رقم: ١٣٧ = ١٨٢، ٢٠٣، ٢٠٦، ٣٦٣، ٣٨٨، ٢٩١٨، ٤٤٢١، ٥٧٩٨، ٥٧٩٩ فتح الباري شَرْحُ صحيح البخاري}:

موغیرەی كوڕی شوعبە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەرێكا، شەوێ لە خزمەتی پێغەمبەردا بووم، فەرمووی پێم: ئاوت پێیە؟ گوتم: بەڵێ. لە وڵاخەكەی دابەزیو رۆیشت بۆ سەراوكردن، هەتا لەتاریكی شەوەكەدا لەبەرچاو وون بوو، لەپاشا هاتەوەو ویستی دەستنوێژ بگرێ، منیش لە جەوەندەكە ئاوم كرد بە دەستیدا، جا دەموچاوی شۆرد، جبەیەكی خوری لەبەردا بوو، ویستی قۆڵەكانی هەڵماڵێ، بەڵام قۆڵی جبەكە تەسك بوو، بۆی هەڵنەماڵرا، هەتا قۆڵەكانی داكەندو لەژێر جبەكەوە هەردوو باسكی شۆرد، دەستی تەڕی هێنا بەسەریدا، دانەوێمەوە كە سۆڵەكانی لەپێ داكەنم هەتا پێیەكانی بشوات، فەرمووی: (وازیان لێ بێنە، بە دەستنوێژەوە لەپێم كردوون، پێویست بەشۆردن ناكا). ئەوجا لەجیاتی شۆردنی پێی دەستی تەڕی هێنا بەسەر هەردوو سۆڵەكانیدا، سۆل واتە: خوفف}.
(تاج/١/١٤٠، ژمارە: ١ — ش/ن).

**ڕوونكردنەوە:**

موغیرەی كوڕی شوعبە لەپێش ساڵی عەمرەی حودەیبییەدا ئیسلام بووە، ئامادەی پەیمانی خۆشنوودیی (بیعة الرضوان) بووە، لەو پەیمانەدا ڕۆڵێكی جوانی بووە، چاوێكی لەغەزای یەرمووكا كوێر بوو، شەعبی دەڵێ: (بلیمەتەكانی عەرەب ئەم چوارەن: موعاویەی كوڕی ئەبو سوفیانو عەمری كوڕی عاصو موغیرەی كوڕی شوعبەو زیادی كوڕی باوكی خۆی، كە ناسراوە بە زِيادُ ابْنُ أَبِيهِ).

## ٩٧) كاتی دەستهێنان بەسەر سۆڵدا چەندە (٦٣٧ - ٦٣٩).

## باب: التَّوْقِيتِ فِي الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ

١٣٩- عَنْ شُرَيْحِ بْنِ هَانِئٍ قَالَ: أَتَيْتُ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عنها)، أَسْأَلُهَا عَنِ الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ، فَقَالَتْ: عَلَيْكَ بِابْنِ أَبِي طَالِبٍ فَسَلْهُ، فَإِنَّهُ كَانَ يُسَافِرُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَأَلْنَاهُ، فَقَالَ: جَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ وَلَيَالِيَهُنَّ لِلْمُسَافِرِ، وَيَوْمًا وَلَيْلَةً لِلْمُقِيمِ}. {الحديث/ ٦٣٧. طهارة}:

شورەیحی كوڕی هانی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بۆ مەسحی خوفف لە عائیشەم پرسی، فەرمووی: بۆ ئەمە بچۆ لە عەلی كوڕی ئەبو طالیب بپرسە، چونكە ئەو دەچوو بۆ سەفەر لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) جا كەلەومان پرسی، فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سێ شەوو سێ ڕۆژی داناوە بۆ ڕێبوار، كە لەوماوەیەدا دەستنوێژگری ڕێبوار بۆی هەیە لەجیاتی شۆردنی قاچەكانی دەستی تەڕ بهێنێ بەسەر سۆڵەكانیدا، وە شەوو ڕۆژێكیشی داناوە بۆ نیشتەجێ (تاج/١/١٤٢).

## ٩٨) دەستی تەڕ هێنان بەسەر پێشە سەرو مێزەردا

## باب: المسح عَلَى النَّاصِيَةِ وَالعَمَامَةِ

١٤٠- عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ: تَخَلَّفَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَتَخَلَّفْتُ مَعَهُ، فَلَمَّا قَضَى حَاجَتَهُ، قَالَ: أَمَعَكَ مَاءٌ؟ فَأَتَيْتُهُ بِمِطْهَرَةٍ، فَغَسَلَ كَفَّيْهِ وَوَجْهَهُ، ثُمَّ ذَهَبَ يَحْسِرُ عَنْ ذِرَاعَيْهِ، فَضَاقَ كُمُّ الْجُبَّةِ، فَأَخْرَجَ يَدَهُ مِنْ تَحْتِ الْجُبَّةِ، وَأَلْقَى الْجُبَّةَ عَلَى

مَنْكِبَيْهِ، وَغَسَلَ ذِرَاعَيْهِ، وَمَسَحَ بِنَاصِيَتِهِ وَعَلَى الْعِمَامَةِ وَعَلَى خُفَّيْهِ، ثُمَّ رَكِبَ وَرَكِبْتُ، فَانْتَهَيْنَا إِلَى الْقَوْمِ، وَقَدْ قَامُوا فِي الصَّلاَةِ، يُصَلِّي بِهِمْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ وَقَدْ رَكَعَ بِهِمْ رَكْعَةً، فَلَمَّا أَحَسَّ بِالنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَهَبَ يَتَأَخَّرُ، فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ فَصَلَّى بِهِمْ، فَلَمَّا سَلَّمَ قَامَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَقُمْتُ، فَرَكَعْنَا الرَّكْعَةَ الَّتِي سَبَقَتْنَا}.
{الحديث/ ٦٣٢. طهارة}:

موغیرەی کوڕی شوعبە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەرێکا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە لەشکرەکە دواکەوت، منیش لە خزمەتیدا دواکەوتم، چوو دەستی بەئاو گەیاندو فەرمووی: (ئایا ئاوت پێیە؟) گوتم: بەڵێ. جا مەتارەکەم بۆ برد، لەئاوی مەتارەکە هەردوو دەستی هەتا مووچەکانی شۆرد، ئینجا روخساری شۆرد، ئەنجا ویستی قۆڵەکانی هەڵماڵێ، بەڵام قۆڵی جبەکەی تەسك بوو بۆی هەڵنەماڵرا، بۆیە لەژێر جبەکەوە قۆڵی دەرهێناو جبەکەیدا بەسەر شانیاو هەردوو باسکی شۆردو، مەسحی پێشە سەریو سەر مێزەرەکەی کرد، هەروا مەسحی سۆڵەکانی کرد لەباتی شۆردنی قاچەکانی. ئەنجا سواری وڵاخەکەی بوو، منیش سواری وڵاخەکەی خۆم بوومو شوێنی کەوتمو رۆیشتین هەتا گەیشتینەوە بە خەڵکەکە، روانیمان دەستیان کردووە بە نوێژ، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف بەرنوێژییەکەی بۆ دەکردن، رکاتێکی پێ کردبوون، کاتێ هەستی بەهاتنی پێغەمبەر کرد، ویستی بێتە دواوەو شوێنەکەی چۆڵ بکا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاماژەی بۆکرد، کە لە شوێنی خۆی بمێنێو نوێژەکەیان بۆتەواو بکا، ئەویش وایکردو تەواوی نوێژەکەی بۆمان کرد، منو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە هاتین، لەپشت عەبدوڕەحمانەوە نوێژمان دابەست، جا کاتێ کە ئەو سڵاوی نوێژی دایەوە، پێغەمبەر سڵاوی نەدایەوە، بەڵکوو هەڵسا ئەو رکاتەی کرد کە لەپێش ئێمەوە ئەوان کردبوویان، ئەوجا سڵاوی دایەوە، جا منیش هەڵسام پێغەمبەر چی کرد منیش هەمان شتم کردو سڵاوم دایەوە}.

## ٩٩) مەسحی مێزەر {بابُ: المَسْحِ عَلَى الخِمَارِ}

١٤١- عَنْ بِلَالٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللّه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ وَالْخِمَارِ. {الحديث/ ٦٣٦. طَهَارَةَ}:

**بیلال** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **جار جارە لەجیاتی شۆردنی پێیەکانی مەسحی خوففەکانی دەکرد، هەروا زۆرجار لەکاتی مەسحی سەردا مەسحی مێزەرەکەیشی دەکرد}.**

**روونکردنەوە:**

**بیلالی کوڕی ڕەباحی حەبەشی** (ڕەزای خودای لێ بێ) **ناوداره بە بانگدەری پێغەمبەر، یەکێکە لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکان، دەڵێن: حەوتەم کەس بووە کە ئیسلام بووە، دایکی ناوی حەمامە بووە، برایەکی هەبوو ناوی خالید بوو، خوشکێکی هەبوو ناوی عەفرە بوو، پیاوێکی کەڵەگەتی لاوازی سەوزە بوو، زۆر دڵپاك بوو، زۆر موسوڵمانێکی جوان و ڕاست و دروست بوو، لەسەر ئیسلامەتی بتپەرستەکان ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆریاندا، ئومەییەی کوڕی خەلەف لە قرچەی گەرمای نیوەڕۆدا، لەسەر زیخ و لمی زیخەڵانەکەی مەککە، لەسەر گازەرەی پشت تەخت ڕای دەکێشاو تاوێرێکی گەورەی دەخستە سەر سکی و پێی دەگوت: یا کافردەبی بە موحەممەد، یا ئەمە حاڵتە تا دەمری، ئەویش هەر دەیفەرموو: (أَحَد أحد: خودا یەکە خودا یەکە) لەسەر ئەم حاڵە ئەبوبەکر لەم کاتەدا بینی، کڕی و ڕزگاری کردو ئازادی کرد.**

**بیلال لەهەموو شەڕگەو غەزاو مەڵبەندەکاندا، لەخزمەت پێغەمبەردا ئامادەی شەڕ بووە، هەمیشە لەخزمەت پێغەمبەردا بووە، لێی جیا نەدەبۆوە مەگەر لەکاتی تایبەتدا، لەکاتی پەیمان بەستنەکەدا پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **کردی بە برای ئەبو عوبەیدەی جەڕاح، لەپاش وەفاتی پێغەمبەریش** (درودی خودای لەسەر بێ) **بیلال دەچوو بۆ غەزا کردن، هەتا لەسەردەمی جێنشینی عومەردا لەشام لەتەمەنی شەست و سێ ساڵیدا گیانی پاکی سپارد. پێغەمبەر بیلالی زۆر خۆش دەویست، ئەوانەی کەبۆ یەکەم جار ئیسلامبوونیان ئاشکرا کرد ئەم حەوت کەسە بوون:**

پێغەمبەرو ئەبوبەکرو عەممارو سومەیەی دایکی عەمارو صوهەیبو بیلالو میقداد. بیلال لەسەردەمی پێغەمبەرو لەسەردەمی جێنشینی ئەبوبەکردا بانگی دەدا، ئیتر بانگی نەدا، بەڵام کاتێ پێشەوا عومەر داخڵی شام بوو بانگی دا، عومەرو هەموو خەڵکەکەی کردە گریان. بیلال فەرموودەی لە کوتوبی سیتتە (شەش پەڕاوە)کەدا هەیە، لە فەتحولباریدا دەفەرموێ: بیلال سێ فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە، لەژمارە: ٦٣٦ و ٣٢١٧ی موسلیمدا، لە تەخریجەکەی شێخ خەلیل مەئموون شیحادا، ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە ئیمامی بیلال، سەرەڕای موسلیم، بوخاریو ئەبو داوودو تەرمەزیو نەسائیو ئیبنو ماجەیش گێڕانەوەیان لەوەوە ئەنجامداوە.

ئەم زاتانە گێڕانەوەیان لە بیلالەوە ئەنجامداوە: ئەبوبەکرو عومەرو ئوسامەو عەبدوڵلای کوڕی عەمرو کەسانی تریش. بیلال خوا بۆی دەڕەخسێنێ ئومەییەی کوڕی خەلەف دەکوژێ، ئەبوبەکری صدیق بەم هەڵبەستە پیرۆزباییو دەستخۆشی لێ دەکا (وافیر):

هنيئـــاً زَادَكَ الـــرحمنُ خــــيراً
فَقَـدْ أدْرَكْـتَ ثَـأْرَكَ يَـابِلاَلُ؟:

بـيلال! دەسـتت خـۆش، پیرۆزبـێ یـاخوا
تۆڵـەی خۆتـت سـەند لـە دوشمنـی خـــوا

### ١٠٠) کردنی چەند نوێژێ بەیەك دەستنوێژ (٦٤٠).

### بابٌ: فِي الصَّلَوَاتِ بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ

١٤٢- عَـنْ بُرَيْـدَةَ (رَضِـي اللهُ عَنْـهُ): أَنَّ النَّبِـيَّ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) صَـلَّى الصَّلَوَاتِ يَوْمَ الْفَتْحِ بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ، وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ (رَضِي اللهُ عَنْهُ): لَقَدْ صَنَعْتَ الْيَوْمَ شَيْئًا لَمْ تَكُنْ تَصْنَعُهُ. قَـالَ: « عَمْدًا صَـنَعْتُهُ يَـا عُمَـرُ». {الحـديث/ ٦٤٠. طهارة} :

بورەیـــدە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـــەرمووی: پێغەمبــەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـــەرۆژی ئـــازادکردنی شـــاری مەککـــەدا، بەیـــەك دەســـتنوێژ، هـــەموو نوێـــژەکانی کـــرد، وە قاچەکانیشی نەشۆرد بەڵـکوو لـەجیاتی ئـەوە دەسـتی تـەڕی هێنـا بەسـەر سـۆل (خـوف)ەکانیـا، کـە لەپێیـدا بـوون، ئیمـامی عومـەریش عـەرزی کـرد: قوربـان ئـەی پێغەمبەری خودا! ئەمەی ئەمڕۆ کردت نەم دیوە کە لەمەوپێش بیکەی هۆی ئەمە چی بوو؟

فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (بەقەستی وامکرد ئەی عومـەر! تـا ئێـوەش ئەگـەر بتانەوێ لەکاتی پێویستدا ئاوا وەك من بکەن). {تاج/١، زنجیرە: ٢٨ — م/د/ت/ن}.

**ڕوونکردنەوە:**

١- مـرۆڤ کـە دەسـتنوێژی بـوو هـەتا دەسـتنوێژەکەی دەشکێ دەتوانـێ هـەموو جۆرە نوێژێ، لە فەرزو سونـنەت، بەو دەستنوێژەوە بکا، وە هـەروەها ئەوشـتانە بکـا کـە لـەبێ دەسـتنوێژ قەدەغـەن، وەك دەسـتدان لـە قورئـانو کوڕنووشـی سـوپاسو نوێژی مردوو.

٢- بورەیدە کوڕی حوصەیب هاوڕێی پێغەمبەرە، لەپێش غەزای بـەدرا ئیسلام بـــووە، بـــەڵام ئامـــادەی ئـــەم غەزایـــە نـــەبووە، ئامـــادەی حودەیبییـــە بـــووە، لـــە بەیعـەتولڕضـوان (پـەیمانی خـۆش نـوودی)دا، لـەژێر درەختەکـەدا پەیمانیـدا بـە پێغەمبەر، کاتێ پێغەمبەر کۆچی کـرد بـۆ مەدینـە، کـە گەیشـتە غـەمیم، بورەیـدە هات بـۆ خزمـەتی، لەگـەڵ هاوماڵـەکانی، کـە نزیکـەی هەشـتا مـاڵ دەبـوون، هـەموو موسوڵمان بوون، پێغەمبـەر نوێژی خەوتنانی بـۆکردن، ئـەوانیش لـە پشتیەوە ئـەو نوێـژەیان بەجەماعـەت کـرد، بورەیـدە دەفـەرموێ: لەخزمـەت پێغەمبـەر خۆیـدا، شازدە غـەزام کـردووە، ماوەیـێ لـە مەدینـە نیشـتەجێ بـوو، لەپاشا گواسـتیەوە بـۆ بەصرە، لەپاشا بـەدەم غەزاکردنـەوە رۆیشـت بـۆ خۆراسـان، لەسـەردەمی جێنشـینی عوسمانا، لەپاشا گواسـتیەوە بـۆ مـەرو، وە لـەوێ نیشـتەجێ بـوو، هـەتا لەسـەردەمی جێنشینی یەزیدی کوڕی موعاوییەدا لەوێ، لەساڵی شەسـتو سێی کۆچیـدا، کۆچـی

دوایی کردو بەڕەحمەت چوو، لە ئیستیعابا دەفەرموێ: بوخاری بە سەنەدی خۆی، لە عەبدوڵلای کوڕی بورەیدەوە دەگێڕێتەوە: دەفەرموێ: باوکم لەمەرو مرد، لە ئەلحوصەین نێژرا، وە ئەوپێشەوای خەڵکی وڵاتی خۆرهەڵات دەبێو دەبێ بە نوورو چرا بۆیان، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەر پیاوێ لەهاوەڵانی من لەهەر وڵاتێ بمرێ، لەرۆژی قیامەتا، لە مەشاهیدەکانیا، وەك حەشرو پردی سیراتو میزان، دەبێ بە پێشەواو نوورو رووناکی بۆیان).

## ١٠١) گوتنی چ گوتەیە سوننەتە لەپاش گرتنی دەستنوێژ (٥٥٢ – ٥٥٣)

## باب: القَوْلُ بَعْدَ الوُضُوءِ (الذكر المستحبُ بَعْدَ الوُضوءِ).

١٤٣- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَتْ عَلَيْنَا رِعَايَةُ الإِبِلِ، فَجَاءَتْ نَوْبَتِي، فَرَوَّحْتُهَا بِعَشِيٍّ، فَأَدْرَكْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَائمًا يُحَدِّثُ النَّاسَ، فَأَدْرَكْتُ مِنْ قَوْلِهِ: « مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَتَوَضَّأُ فَيُحْسِنُ وُضُوءَهُ، ثُمَّ يَقُومُ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ مُقْبِلٌ عَلَيْهِمَا بِقَلْبِهِ وَوَجْهِهِ، إِلاَّ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ، قَالَ: فَقُلْتُ مَا أَجْوَدَ هَذِهِ، فَإِذَا قَائِلٌ بَيْنَ يَدَيَّ يَقُولُ: الَّتِي قَبْلَهَا أَجْوَدُ، فَنَظَرْتُ فَإِذَا عُمَرُ (رَضِي اللهُ عَنْهُ)، قَالَ: إِنِّي قَدْ رَأَيْتُكَ حِينَ جِئْتَ آنِفًا، قَالَ: مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ يَتَوَضَّأُ فَيُبْلِغُ أَوْ فَيُسْبِغُ الْوُضُوءَ، ثُمَّ يَقُولُ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُ وَرَسُولُهُ، إِلاَّ فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةُ يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ». {الحديث/ ٥٥٢. طهارة}:

عوقبەی کوڕی عامیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کۆمەڵێ ماڵ بووین، بەسەرە هەر رۆژێ ماڵێ وشترەکانی دەبرد بۆ لەوەڕ، رۆژێ سەرەی من هات، وشترەکانم برد بۆ لەوەڕ، سەر لە ئێوارێ وشترەکانم بردەوە بۆ پەچەکەیانو ئیتر ئەرکم لەم لایەنەوە تەواو بوو، ئەوجا چووم بۆ کۆڕو مەجلیسی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە خەریك بوو گوتاری دەدا، بەم گوتەیەدا گەیشتم: (هەر موسوڵمانێ دەستنوێژێکی جوان بگرێ، ئەوجا هەستێ دوو رکات نوێژ بکاو دڵی لەلایان بێو بەدڵو بەکوڵ ئەو دوو رکاتە ئەنجام بدا، بێگومان بەهەشت مسۆگەر دەبێ بۆی).

عوقبه فه‌رمووی: منیش گوتم: ئای له‌م موژده خۆشه! كه‌سێ له‌به‌رده‌ممه‌وه گوتی: موژده‌كه‌ی پێشی له‌مه‌یش خۆشتر بوو، كه سه‌یریم كرد عومه‌ری كوڕی خه‌تاب بوو، فه‌رمووی پێم: من چاوم لێت بوو كه ئێستا هاتی، له‌پێش ئه‌مه‌دا پێغه‌مبه‌ر (دروودی خودای له‌سه‌ر بێ) فه‌رمووی: (هه‌ركه‌سێ له‌ئێوه ئه‌ی گه‌لی ئیسلام! ده‌ستنوێژێكی ته‌واوی تێرو ته‌سه‌ل بگرێ، فه‌رزو سوننه‌ته‌كانی جێبه‌جێ بكا، ئه‌وجا به‌دوایا بڵێ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلـهَ إِلاَّ اللَّـهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ محمداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ) واته: شایه‌تی ده‌ده‌م كه‌به‌س خودا خودای به‌هه‌قه‌و موحه‌ممه‌د به‌نده‌و پێغه‌مبه‌ری ئه‌وه، هه‌ركه‌سێ له‌ئێوه له‌م كاته‌دا، ئه‌م وشه پیرۆزه بڵێ، ئه‌وا هه‌ر هه‌شت ده‌رگاكانی به‌هه‌شتی بۆ ده‌كرێته‌وه، له‌هه‌ر كامیانه‌وه خۆی ئاره‌زوو بكا ده‌چێته ژووره‌وه).

**روونكردنه‌وه:**

عوقبه‌ی كوڕی عامیری جوهه‌نی، هاوه‌ڵێكی ناوداری پێغه‌مبه‌ره فه‌رمووده‌ی زۆری له پێغه‌مبه‌ره‌وه گێڕاوه‌ته‌وه، كۆمه‌ڵێ له هاوه‌ڵان‌و په‌یڕه‌وان (سه‌حابه‌و تابعین) فه‌رمووده‌كانی ئه‌ویان گێڕاوه‌ته‌وه، ئه‌بو سه‌عیدی كوڕی یونس ده‌ڵێ: عوقبه قورئان خوێن‌و فه‌رائیززان‌و شه‌رعزانێكی جوان بوو، زمان ره‌وان‌و شاعیرو نووسه‌ر بوو، هه‌موو قورئانی له‌به‌ربوو، قورئانێكی بۆ خۆی نووسیبوو، له‌سه‌ر شێوه‌ی ته‌ئلیفی موصحه‌فی عوسمان نه‌بوو، له ئاخره‌وه نووسرابوو: (كَتَبَهُ عُقْبَةُ بْنُ عَامِرٍ بِيَدِهِ: عوقبه‌ی كوڕی عامیر به‌ده‌ستی خۆی نووسیویه‌تی). فه‌رمایشته‌كه‌ی ئه‌بو سه‌عید ته‌واو.

عوقبه به‌رید بوو كه موژده‌ی ئازادكردنی شاری دیمه‌شقی برد بۆ ئیمامی عومه‌ر، له‌لایه‌نگرانی موعاویه بوو، له‌شه‌ڕی صه‌فیندا له‌گه‌ڵ معاویه‌دا بوو، ماوه‌یێ معاویه كردی به والی سه‌ر میصر، له‌سه‌رده‌می معاویه‌دا عه‌مری خودای كرد (ره‌زاو ره‌حمه‌تی خودای لێ بێ).

### ١٠٢) مەزی پیسی شەرعییە دەشۆرێو دەستنوێژ دەشکێنێ (٦٩٣ - ٦٩٥).

### باب: فى غَسْلِ المذِيّ وَالوُضُوءِ مِنْهُ

١٤٤- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ رَجُلاً مَذَّاءً، فَكُنْتُ أَسْتَحْيِى أَنْ أَسْأَلَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِمَكَانِ ابْنَتِه، فَأَمَرْتُ الْمِقْدَادَ بْنَ الأَسْوَدِ، فَسَأَلَهُ، فقال: «يَغْسِلُ ذَكَرَهُ وَيَتَوَضَّأُ». {الحديث/ ٦٩٣. حيض. تجريد البخاري/١، لاپەڕە: ١٣٢، رقم: ١٠٦ = ١٣٢، ١٧٨، ٢٦٩ فتح الباري}:

**ئیمامی عەلی** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی:** مەزیم زۆر بوو، شەرمیشم دەکرد بۆ خۆم ڕاستەوخۆ لە پێغەمبەر بپرسم، چونکە فاطیمەی کچی خێزانم بوو، جا بە میقدادی کوڕی ئەسوەدم گوت کە بۆ ئەمە لێی بپرسێ، کەلێی پرسی بوو فەرموو بووی: (چووکی بشۆرێو دەستنوێژ بگرێ، چونکە دەرچوونی وەزی دەستنوێژ دەشکێنێ، بەلاّم شتی وا خۆشۆردن (غوسڵ) پێویست ناکا، چونکە لەش پیس ناکات). {تاج/١/١١٣ — ش/د/ت/ن = بوخاریو موسلیمو ئەبو داودو تەرمەزیو نەسائی ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە}.

**ڕوونکردنەوە:**

١-مەزی وشەیەکی عەرەبییە، ئاوێکی ڕوونی سپی لینجە، لەکاتی دەستبازیو ماچو مۆچو وروژانی ئارەزوودا دەردەچێ، بەبێ خۆشیو بەبێ هەڵقوڵینو دەرپەڕین، چووکیشی پێ سست نابێتەوە، زۆرجار هەست بە دەرچوونی ناکرێ، لەژنا زۆرترە هەتا پیاو، ڕۆڵی چەورکردن دەبینێ لە کرداری جووت بووندا. بەپێی شەرع پیسە بەر هەرکوێ بکەوێ، پێویستە ئەو جێگە بشۆرێ، دەستنوێژ دەشکێنێ بەلاّم دەرچوونی لەش پیس ناکات.

٢-ڕەفتاری شیرین لەگەڵ ماڵی خەزورانا سوننەتە، هەروا لەگەڵ خێڵی زاوادا، وا سوننەتە مێرد لەگەڵ خێڵی خەزوورانا باسی سەرجێیو شتی وا نەکا کەبۆنی شتی وای لێبێ.

کاتێ فەقێ بووم، لەگەڕەکی خۆمان، لە مزگەوتی قەرەچێوار، لەگەڕەکی چوارباخ، لە سلێمانی، مامۆستا مەلا موحەممەدی حافظ، کە خەڵکی ئەو پشت کێوە بوو گێڕایەوە، گوتی:

(جارێ لە گوندێ لای ئێمە، کابرایێ کچێکی خۆی دابوو بەزەلامێ، دێکە یەك حەوزی هەبوو، زۆرجار کابرای زاوا لەبەرچاوی خەزووریو خەڵکی دێکە خۆی رووت دەکردەوەو غوسڵی لەش پیسی دەردەکرد، رۆژێ لەناو حەوزەکەدا، خەزورەکەی بە خەنجەر دایگرتو کوشتیو گوتی: ئاوا دەتکوژم، چەندم پێ گوتیت شەرمت هەبێ، شەو چی لەکچێم دەکەی بەرۆژ باسی مەکە، هەروازت نەهێنا، دەبخۆ دەردت بێت!!).

### ١٠٣) خەوی دانیشتوو دەستنوێژ ناشکێنێ (٨٣١ - ٨٣٤).

### باب: نَوْمُ الجَالِسِ لاَ يَنْقُضُ الوُضُوءَ

١٤٥- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ، وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَجِيٌّ لِرَجُلٍ - وَفِي حَدِيثِ عَبْدِ الْوَارِثِ: وَنَبِيُّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُنَاجِي الرَّجُلَ - فَمَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ حَتَّى نَامَ الْقَوْمُ. {الحديث/ ٨٣١. حيض. تجريدی بوخاری/١، لاپەڕە: ٣٦١، رقم: ٣٦٦ = ٦٤٢، ٦٤٣، ٦٢٩٢ فتح الباري}:

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ قامەت کرا بۆ نوێژی خەوتنان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوکاتەدا، لە گۆشەیەکی مزگەوتدا، لەگەڵ پیاوێکا دانیشتبوو، دوو بەدوو چپەیان دەکردو قسەی نهێنی خۆیان دەکرد، هەر نەهات بەلای نوێژەکەوە هەتا هەندێ لە نوێژکەرەکان خەو بردنیەوەو خەویان لێ کەوت، ئەوسا پێغەمبەر هەڵساو هات بەرنوێژییەکەی بۆ کردین).

وفي رِوَايَةٍ: قَالَ: أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ وَالنَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُنَاجِي رَجُلاً، فَلَمْ يَزَلْ يُنَاجِيهِ حَتَّى نَامَ أَصْحَابُهُ، ثُمَّ جَاءَ فَصَلَّى بِهِمْ. {الحديث ٨٣٢. حيض}.

## ١٠٤) خواردنی گۆشتی حوشتر دەستنوێژ دەشکێنێ (٨٠٠ - ٨٠١)
## باب: الوُضُوءُ مِنْ لُحُومِ الإبِلِ

١٤٦- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَ أَتَوَضَّأُ مِنْ لُحُومِ الْغَنَمِ؟ قَالَ: «إِنْ شِئْتَ فَتَوَضَّأْ، وَإِنْ شِئْتَ فَلاَ تَوَضَّأْ». قَالَ: أَتَوَضَّأُ مِنْ لُحُومِ الإِبِلِ؟! قَالَ: « نَعَمْ، فَتَوَضَّأْ مِنْ لُحُومِ الإِبِلِ». قَالَ: أُصَلِّى فِى مَرَابِضِ الْغَنَمِ؟ قَالَ: « نَعَمْ » قَالَ: أُصَلِّى فِى مَبَارِكِ الإِبِلِ؟ قَالَ: « لاَ ». {الحديث/ ٨٠٠. حيض}:

جابیری کوڕی سەموورە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لە پێغەمبەری پرسی: قوربان! ئەگەر گۆشتی مەڕ یا بزنم خوارد دەستنوێژ بگرمەوە؟ فەرمووی: (ئارەزووی خۆتە، حەزدەکەی دەستنوێژ بگرەوە، حەزیش ناکەی دەستنوێژ مەگرەوە، چونکە خواردنی گۆشتی ئەو دوو جۆرە ئاژەڵە دەستنوێژ ناشکێنێ). پیاوەکە گوتی: ئەی ئەگەر گۆشتی وشترم خوارد دەستنوێژم لەسەرە؟) فەرمووی: (بەڵێ، کاتێ گۆشتی وشترت خوارد دەستنوێژت دەشکێ، لەبەرئەوە نابێ نوێژو شتی وا بکەی هەتا دەستنوێژ نەگریتەوە). پیاوەکە گوتی: ئایا لەپەچە ڕانا نوێژ دروستەو نوێژی تیابکەم؟ فەرمووی: (بەڵێ دروستە، بەمەرجێ جێگەی نوێژەکەت پاک بێت). پیاوەکە گوتی: ئەی لە مۆڵگای وشتردا نوێژبکەین؟ فەرمووی: (بۆ ئەمەیان نەء). {تاج/١/١٢٦ ف-١١ ژ-٢١٧ چ-٤ + تەجرید/١/١٨٨، ژمارە: ١٦٨ = ٢٣٤ فەتح}.

**ڕوونکردنەوە:**

١-بەپێی مەزهەبی شافیعی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) خواردنی گۆشتی هیچ ئاژەڵێ دەستنوێژ ناشکێنێ، ئەگەر لەپاش گۆشت خواردن دەستنوێژ تازە بکرێتەوە کارێ باشە، بەتایبەتی لەکاتی خواردنی گۆشتی حوشتردا.

٢-لەپەچە ڕانا نوێژ دروستە، بەلاّم بەمەرجێ جێگەی نوێژەکە پاک بێ، وەك بەردێکی بەرزی تەخت کە لەناو پەچە ڕانێکا بێ، یا نوێژکەر بەرماڵێ ڕابخاو نوێژی لەسەر بکا، بەلاّم نوێژکردن لەپەچە وشتردا کارێ باش نییە.

٣ -جابیری کوڕی سەموورە خۆیو باوکی هاوڕێی پێغەمبەر بوون، سەدو چلو شەش فەرموودەی هەیە، دوانیان پەسەندی هەردوو پیرن، واتە: شێخی بوخاریو شێخی موسلیم ئەو دوو فەرموودەیان گێڕاوەتەوە. بیستو شەش فەرموودەی تری لە موسلیمدا بەتەنیا هەیە، کە لە بوخاریدا نین، جابیر خوشکەزای سەعدی کوڕی ئەبو وەقاسە. لە فەرموودەیەکا جابیر دەفەرموێ: (شەوێ مانگە شەو بوو، لە خزمەت پێغەمبەردا بووم، دەستێ جلی سووری لەبەردا بوو، سەرەنجی ئەوو سەرنجی مانگەکەم دا، لەبەرچاوم ئەو گەلێ لە مانگەکە جوانتربوو!).

لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ: (سەدجار زیاتر لە خزمەت پێغەمبەردا دانیشتووم) لە فەرموودەی دروستدا هاتووە دەفەرموێ: (لەدوو هەزار جار زیاتر نوێژم بەجەماعەت لەگەڵ پێغەمبەردا کردووە).

دەڵێن: جابیر (رەزای خودای لێ بێ) لەسەردەمی حوکمی ئەل-موختاردا، لەساڵی شەستو شەشی کۆچیدا، لە کووفە مردووە.

## ١٠٥) دەستنوێژگرتن لەبەر خواردنی شتێ بە ئاگر دروست کرابێ (٧٨٥ - ٧٩٩)
## باب: الوضوءِ مِمّا مَسَّت النّارُ

١٤٧- عَنْ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ إِبْرَاهِيمَ بْنِ قَارِظٍ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ وَجَدَ أَبَا هُرَيْرَةَ يَتَوَضَّأُ عَلَى الْمَسْجِدِ، فَقَالَ: إِنَّمَا أَتَوَضَّأُ مِنْ أَثْوَارِ أَقِطٍ أَكَلْتُهَا، لأَنِّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: « تَوَضَّئُوا مِمَّا مَسَّتِ النَّارُ». {الحديث/ ٧٨٦. حيض} :

خەلیفەی عادلو راشید عومەری کوڕی عەبدولعەزیز فەرمووی: عەبدوڵلای کوڕی ئیبراهیمی کوڕی قاریظ هەواڵی پێم داوە، گوتی: ئەبو هورەیرەم بینی لە مزگەوت دەستنوێژی دەگرت، دەیفەرموو: بۆیە دەستنوێژ دەگرم، چونکە چەند کولۆیەك کەشکم خواردووە، دیارە کە کەشك بەئاگر دروست دەکرێ، چونکە بیستم لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (کاتێ شتێ دەخۆن کە بەئاگر دروست کرابێت دەستنوێژ بگرنەوە). {تاج/١/١٣٠، ژمارە: ١٢+١٣+١٤ = ژ-٢١٨، ٢١٩، ٢٢٠ چ-٤} .

**روونكردنەوە:**

١- **جابير** (رەزای خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: لەدوا دواییدا، دوا كاری پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **هاتە سەرئەوە: وازی لە دەستنوێژ گرتن هێنا بۆ خواردنی ئەو خواردەمەنییەی كە بەئاگر پوختە بكرێ!** (تاج/١/١٣٠، ژمارە: ١٤) — نەوەوی دەفەرموێ: ئەمە فەرموودەیەكی ساخە، ئەبو داوودو نەسائی گێڕاویانەتەوە.

٢- عومەری كوڕی عەبدولعەزیز ئەمەوییە، جێنشینێكی دادپەروەر بوو، نوسخەیێ بوو لە عومەری كوڕی خەطاب، كە لەدایكەوە باپیرەی بوو، چونكە دایكی ناوی (عاصمی كچی عاصمی كوڕی عومەری كوڕی خەطاب) بوو.

فەرموودەی پێغەمبەری زۆر گێڕاوەتەوە، تابیعییەكی ثقە بوو، جامێ هەبوو هی پێغەمبەر بوو، شتی پێ دەخواردەوە، جامەكە لەلای سەهلی كوڕی سەعد بوو، عومەر داوای لێكرد كەپێی ببەخشێ، ئەویش پێی بەخشیو شتی پێ دەخواردەوە.

ئیبنو سەعد دەفەرموێ: ساڵی (٦٣) ك. لەدایك بووە، بەڵام عەبدوڵڵای كوڕی داوود دەفەرموێ: (ساڵی ٦١) لەدایك بووە، كەساڵی شەهید بوونی ئیمام حوسەینە، پیاوێكی سەوزەی گەنم رەنگ بوو، دەموچاوێكی باریكی هەبوو، لەشی لاواز بوو، ریشێكی جوانی هەبوو، جێ لەقەی ماینێ بە تەوێڵیەوە بوو، لە تەویلەكەی باوكیدا ماین لەقەی لێدا بوو، سەری بۆز بوو بوو، پیاوێكی راستگۆی جێگەی متمانە بوو، زانایەكی پایە بەرزبوو، شەرعزانێكی جوان بوو، خاوەنی وەرعو تەقوا بوو، پێشەوایەكی دادپەروەر بوو یەكێ بوو لە (الخُلَفَاءِ الراشدين).

داوودی كوڕی ئەبو هیند دەیفەرموو: (لەم دەرگایەوە عومەری كوڕی عەبدولعەزیز هاتە ژوورەوە بۆلامان، یەكێ لە پیاوگەل گوتی: پیاوە بەدكارەكە (فاسیقەكە) ئەم كوڕی خۆی نارد بۆلای ئێمە هەتا فێری فەرزو سوننەتەكان ببێ، ئەم كوڕە گوایە دەڵێ: من نامرم هەتا دەبم بەجێنشین (بەخەلیفە) كە بووم بەجێنشین رێبازە جوانەكەی عومەری كوڕی خەطابی باپیرم دەگرم).

داوود دەیفەرموو: (دەی بەخودا چۆنی فەرموو وابوو، نەمرد هەتا بەچاوی خۆمان ئەوەی گوتی دیمانو هاتەدی، بوو بە جێنشینو رێبازەكەی باپیری گرت).

مالیکی کوڕی ئەنەس دەیفەرموو: (سەعیدی کوڕی مسیّب دێنیو هاموشۆی هیچ میرێکی نەدەگرت، بێجگە لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز).

موجاهید دەیفەرموو: (ئێمە دەچووین بۆلای عومەری کوڕی عەبدولعەزیز کەفێری زانستی بکەین، بەڵام زۆری نەخایاند کە ئەو ئێمەی فێری زانست دەکرد). مەیموونی کوڕی مەهران دەیفەرموو: (زانایان لە خزمەت عومەردا وەك قوتابی وابوون). ئەییوب دەیفەرموو: (لەسەردەمی ئێمەدا کەسێ شك نابەم کە بەقەد ئەو سوننەتی پێغەمبەری وەرگرتبێ). ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) دەیفەرموو: (کەسم نەدیوە کە وەك ئەم لاوە نوێژەکەی لە نوێژی پێغەمبەر بکا). رەباحی کوڕی عوبەیدە دەفەرموێ: (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز رۆیشت بۆ نوێژ، پیرەمێردێ خۆی دابوو بەسەر دەستیداو لەگەڵیا دەڕۆیشت، کەلێم پرسی: ئەوە کێ بوو؟ فەرمووی: بۆ تۆ ئەو پیاوەت بینی؟). گوتم: بەڵێ بینیم، فەرمووی: (دەی وابێ بەزەینم تۆ پیاوی باشیت، دەنا ئەوت نەدەبینی، ئەوە خدری زیندەی برادەرم بوو، هاتبوو بۆلام پێی راگەیاندم کە من دەبم بە دەسەڵاتداری سەر ئەم نەتەوەی ئیسلامە، وە فەرمووشی پێم: کە من بۆئەم فەرمانە پیرۆزە یارمەتیت ئەدەم). یەعقووب دەڵێ: سولەیمانی کوڕی عەبدولەلیك لەمانگی سەفەری (٩٩)ی کۆچیدا مرد، یەکسەر عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لەجێگەی ئەو کرا بەجێنشین، چووە سەر دوانگەو فەرمووی: (ئەی خەڵکینە! ئەگەر منتان بەدڵ نییە نابم بەجێنشین لەسەرتان). بەیەك دەنگ گوتیان: (رازین ... رازین!!). ابن حبّان بەثقاتی تابعینی دادەنێ).

ماوەی جێنشینییەکەی دوو ساڵو نیو بوو، چل ساڵ ژیاوە، زۆر کەس دەڵێن: لەمانگی رەجەبی (١٠١) سەدو یەکی کۆچیدا مردووە، لە بوخاریدا یەك فەرموودەی هەیە، کە فەرموودەی (أَيُّمَا امْرِئٍ أَفْلَسَ) بڕوانە فەرموودەی ژمارە: ٢٤٠٢ فتح الباری.

**١٠٦) دەستنوێژگرتن بەهۆی خواردنو خواردنەوەی شتێکەوە کە بەئاگر پوختە کرابێ هەڵوەشاوەتەوە {باب: نسخ الوُضُوءِ مِمَّا مَسَّت النَّارُ}**

١٤٨- عَنْ جَعْفَرُ بْنُ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ الضَّمْرِيِّ عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَحْتَزُّ مِنْ كَتِفِ شَاةٍ، فَأَكَلَ مِنْهَا، فَدُعِيَ إِلَى الصَّلاَةِ، فَقَامَ، وَطَرَحَ السِّكِّينَ، وَصَلَّى، وَلَمْ يَتَوَضَّأْ). {الحديث/ ٧٩١. حيض. بخاري. وضوء: تجريد: ١٥٢ = ٢٠٨، ٦٧٥، ٢٩٢٣، ٥٤٠٨، ٥٤٢٢، ٥٤٦٢}:

جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی ئومەییەی ئەل‌ضەمری، لەعەمری باوکیەوە، فەرمووی: باوکم فەرمووی: پێغەمبەرم دی (دروودی خودای لەسەر بێ)، شانە مەڕێکی بەدستەوە بوو، بەچەقۆیێ پارچە پارچەی دەکردو دەیخوارد، لەوکاتەدا بانگیان کرد بۆ نوێژ، ئیتر گۆشتو چەقۆکەی داناو هەڵساو چوو بەرنوێژییەکەی بۆ کردن، بەڵام لەبەر خواردنی گۆشتەکە کە بەئاگر دروست کرابوو، دەستنوێژی نەگرتەوە).

**ڕوونکردنەوە:**

عەمری کوڕی ئومەییە زۆر ڕەشیدو قسە زان بوو، گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەینارد بە نوێنەر بۆ کاری گرنگ، نامەیەکی پێغەمبەری برد بۆ نەجاشی لە حەبەشە، هەروا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردی بۆ مەککە، لەوێ تەرمەکەی خوبەیبی شەهیدی، لەسێدارەکەی کردەوەو هێنایەوە، بیست فەرموودەی هەیە، لە بوخاریدا دوو فەرموودەی هەیە، هەتا سەردەمی جێنشینی موعاوییە مابوو، لەمەدینە مردووە.

١٤٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عنهما) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شَرِبَ لَبَنًا ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ فَتَمَضْمَضَ وَقَالَ: «إِنَّ لَهُ دَسَمًا». {الحديث/ ٧٩٦. حيض. تجريد/١، لاپەڕە: ١٧١، رقم: ١٥٥ = ٢١١، ٥٦٠٩ فتح}:

ئیبنو عەباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شیری خواردەوە، لەپاشا ئاوی لەدەمی رادا، فەرمووی: (شیر چەوریو بەڵخی هەیە).

## ١٠٧) كەسێ لەناو نوێژا وا هەست بكا، وەك شتێ دەستنوێژ بشكێنێ رووی دابێ، بڕیاری ئەم بارودۆخە چییە.

## باب: الَّذِي يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أنه يَجِدُ الشيئَ فِي الصَّلاَةِ

١٥٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « إِذَا وَجَدَ أَحَدُكُمْ فِي بَطْنِهِ شَيْئًا، فَأَشْكَلَ عَلَيْهِ أَخَرَجَ مِنْهُ شَيْءٌ أَمْ لاَ؟ فَلاَ يَخْرُجْ مِنَ الْمَسْجِدِ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتًا، أَوْ يَجِدَ رِيحًا». {الحديث/ ٨٠٣. حيض. تجريد. رقم: ١١١ = ١٣٧، ١٧٧، ٢٠٥٦ فتح}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جاری وا هەیە كە مرۆڤ وا هەست دەكا، كە تەڕاییەك، یا بایەك، یا هەرشتێ كە دەستنوێژ بشكێنێ، لە پێشیەوە، یا لە پاشیەوە، لەسكی دەردەچێ، بەلاّم دوو دڵە لەوەو دڵنیا نییە لە روودانی، با لەكاتی وادا، وا دابنێ كە دەستنوێژەكەی ماوەو نەشكاوە، لەبەرئەوە پێویست ناكا (ئەگەر) لەناو مزگەوتدا بوو، مزگەوتەكە بەجێ بهێڵێ، یا ئەگەر لەناو نوێژا بوو، نوێژەكەی ببڕێو خۆی بدزێتەوە. بەلاّم هەركاتێ كە سوور دەیزانی كەوا دەستنوێژەكەی شكا، وەك ئەوە بایەكی لێ بۆوەو گوێی لەدەنگی بوو، یا بۆنی چوو بەسەریا، یا هەستی بە دەرچوونی دەستنوێژ شكێنی لە سكی كرد، وە شتەكەی لەلا روونو ئاشكراو بێگومان بوو، ئەوە لەباری وادا دەستنوێژەكەی دەشكێ، جا ئەگەر لەناو نوێژدا بوو، با نوێژەكەی ببڕێ، ئەگەر لەناو مزگەوتا بوو چاوەڕوانی نوێژی دەكرد، با دەرچێو بچێ دەستنوێژەكەی تازە بكاتەوە).

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٣-٢/٣- نامەی خۆشۆردن (غوسڵ) {كِتَابُ الغُسْلِ}

## ١٠٨) ئاو لە ئاوەوەیە {باب: إنَّمَا المَاءُ مِنَ المَاءِ}

١٥١- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ الاثْنَيْنِ إِلَى قُبَاءٍ، حَتَّى إِذَا كُنَّا فِي بَنِى سَالِمٍ، وَقَفَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى بَابِ عِتْبَانَ فَصَرَخَ بِهِ، فَخَرَجَ يَجُرُّ إِزَارَهُ، فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « أَعْجَلْنَا الرَّجُلَ ». فَقَالَ عِتْبَانُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ الرَّجُلَ يُعْجَلُ عَنِ امْرَأَتِهِ وَلَمْ يُمْنِ مَاذَا عَلَيْهِ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّمَا الْمَاءُ مِنَ الْمَاءِ». {الحديث/ ٧٧٣. تجريد/١، لاپەڕە: ١٥٧، رقم: ١٣٦ = ١٨٠ فتح}:

عەبدورەحمانی کوڕی ئەبو سەعیدی خودری فەرمووی: باوکم فەرمووی: جارێ ڕۆژی دوو شەممە بوو، لە خزمەت پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) چووم بۆ شاری قوباء، هەتا گەیشتینە ناو خێڵی بەنی سەلیم، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەبەر دەرگای عیتبان ڕاوەستاو بەدەنگی بەرز بانگی کرد، عیتبان هاتە دەرەوە، لە پەلە پەلیدا بەرکۆش (إزار)ەکەی بەکێش دەکرد، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ڕەنگ بێ ئەم پیاوە لەبەر پەلە پەل فریا نەکەوتبێ ئیشەکەی جێبەجێ بکا). عیتبان گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! پێم بفەرموو ئەگەر پیاو لەگەڵ ژنەکەیدا خەریکی جووت بوون بێ، بەڵام ئاوی نەیەتەوە، چی لەسەرە؟ فەرمووی: (ئاو لە ئاوەوەیە) واتە: خۆشۆردن بەئاو هاتنەوە پێویست دەبێ). {تاج/١، لاپەڕە: ١٤٥، ژمارە: ٤، زنجیرە: ٣٠ تاج١ ژ-٢٦٢ چ-٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

١ -ئەم فەرموودەیە بە فەرموودەکەی دوای خۆی سڕاوەتەوە.

٢-ئەبو سەعیدی خودری ئەنصارییە، لەرۆژی غەزای ئوحوددا، لەبەر منالّی ڕێگەی پێ نەدرا کە بەشداری لەم غەایەدا بکا، بەلاّم لەوەدوا لە خزمەت پێغەمبەردا ئامادەی دوازدە غەزا بووە، باوکی لە غەزای ئوحوددا شەهید بووە، هەزارو سەدو حەفتا فەرموودەی هەیە، لە بوخاریدا شەستو دوو فەرموودەی هەیە، لە موسلیمدا نەوەدو هەشتی هەیە، چلو شەشیان پەسەندی هەردوو لایانن، بەپێی ئەم فەرموودەیە ئاو لە ئاوەوە بووە، بەلاّم دوایی ئەوە نەسخ بۆتەوە. ئەبو سەعید ناوی سەعدی کوڕی مالیکی کوڕی سینانە، لەناو هاوڕێ منالّکارەکانا، لەویان زاناتر تیانەبووە، لەسالّی حەفتاو چواری کۆچیدا مردووە.

**١٠٩) فەرموودەی (ئاو لە ئاوەوەیە) سڕاوەتەوە، خۆشۆردن لەسەر نێرو مێ، پێویست دەبێ، کاتێ سوننەتگای پیاو بچێتە ناو سوننەتگای ژنەوە (٧٨١ - ٧٨٤)**

**باب: نسخ الماء مِنَ الماءِ، وُجُوبُ الغسْلِ بالتقاءِ الختانَيْنِ**

١٥٢- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: اخْتَلَفَ فِي ذَلِكَ رَهْطٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ، فَقَالَ الأَنْصَارِيُّونَ: لاَ يَجِبُ الْغُسْلُ إِلاَّ مِنَ الدَّفْقِ، أَوْ مِنَ الْمَاءِ، وَقَالَ الْمُهَاجِرُونَ: بَلْ إِذَا خَالَطَ فَقَدْ وَجَبَ الْغُسْلُ، قَالَ: فَقَالَ أَبُو مُوسَى: فَأَنَا أَشْفِيكُمْ مِنْ ذَلِكَ، فَقُمْتُ فَاسْتَأْذَنْتُ عَلَى عَائِشَةَ، فَأُذِنَ لِي، فَقُلْتُ لَهَا: يَا أُمَّاهْ، أَوْ يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَكِ عَنْ شَيْءٍ، وَإِنِّي أَسْتَحْيِيكِ، فَقَالَتْ: لاَ تَسْتَحْيِي أَنْ تَسْأَلَنِي عَمَّا كُنْتَ سَائِلاً عَنْهُ أُمَّكَ الَّتِي وَلَدَتْكَ، فَإِنَّمَا أَنَا أُمُّكَ، قُلْتُ: فَمَا يُوجِبُ الْغُسْلَ؟ قَالَتْ: عَلَى الْخَبِيرِ سَقَطْتَ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « إِذَا جَلَسَ بَيْنَ شُعَبِهَا الأَرْبَعِ، وَمَسَّ الْخِتَانُ الْخِتَانَ، فَقَدْ وَجَبَ الْغُسْلُ». {الحديث/ ٧٨٣. حيض. تجريد/١، لاپەڕە: ٢٠٨، رقم: ١٩٧ = ٢٩١ فتح}:

ئەبو مووسا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: سەبارەت بەم بابەتە، کۆمەلێ لە کۆچکاران‌و لە یاریدەدەران، ڕاجیایی کەوتە نێوانیان، یاریدەدەران دەیانگوت: خۆشۆردن پێویست نابێ، هەتا ئاو نەیەتەوە، بەلاّم کۆچکاران دەیانگوت: بەلّکو هەرکاتێ چووک ڕۆچوو بەشەرمگادا، ئیتر خۆشۆردن پێویست دەبێ، فەرمووی:

ئەبو مووسا فەرمووی: من چارەی ئەم پرسیارەتان بۆ دەکەم، فەرمووی: جا هەڵسام چووم بۆ خزمەتی دایکە عائیشە، لە دەرگاکەوە داوای ڕێخوازیم کرد، کەبچم بۆ خزمەتی، ڕێگەم پێدرا، عەرزیم کرد: ئەی دایکە! یا عەرزیم کرد: ئەی دایکی موسوڵمانان! من دەمەوێ پرسیارێکت لێ بکەم، بەڵام شەرمت لێ دەکەم، فەرمووی: (هەرپرسیارێ کە شەرم ناکەی لەو دایکەتی بپرسیت کەلێی بوویت، شەرم مەکە ئەو پرسیارەش لەمن بکە، خۆ منیش بە شەرعی خوا دایکتم، گوتم: خۆشۆردنی لەش پیسی بەچی پێویست دەبێ؟ فەرمووی: بەڕاستی لە کەسێکی شارەزات پرسی، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ پیاو لەناو چوار پەلی ئافرەتدا، دانیشتو لەگەڵیا دروست بوو، با ئاویشی نەیەتەوە، ئیتر خۆشۆردن لەسەر هەردوو لا پێویست دەبێ).

١٥٣- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أُمِّ كُلْثُومٍ عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَتْ: إِنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الرَّجُلِ يُجَامِعُ أَهْلَهُ ثُمَّ يُكْسِلُ، هَلْ عَلَيْهِمَا الْغُسْلُ؟ وَعَائِشَةُ جَالِسَةٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنِّي لأَفْعَلُ ذَلِكَ أَنَا وَهَذِهِ ثُمَّ نَغْتَسِلُ». {الحديث/ ٧٨٤}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا فەرمووی: ئوم کەلثومی کچی ئەبوبەکری صەدیق، کە خوشکی حەزرەتی عائیشەیە، کە تابیعییە، فەرمووی: عائیشەی خۆشکم کە هاوسەری پێغەمبەرە (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: من دانیشتبووم لە خزمەتی حەزرەتدا، پیاوێ لێی پرسی: ئەگەر پیاوێ دروست بوو لەگەڵ حەلاڵی خۆیدا، بەڵام بۆی تەواو نەکراو ئاوی نەهاتەوە، ئایا لەم حاڵەدا، ژنو پیاوەکە خۆشۆردنیان لەسەرە یانا؟ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (من خۆمو ئەم ژنەی خۆم ئاوا دەکەینو لەپاشا هەردوکمان خۆمان دەشۆرینو لەشپیسیی خۆمان دەردەکەین).

{تاج/١/١٤٥، زنجیرە: ٣٠، ژمارە: ٢ ژ-٢٦٠ چ-٤}.

**روونكردنەوە:**

١-ئەم فەرموودەیە لە ئەفرادی موسلیمە، بوخاری دەری نەهێناوە، ئەم ناسككاریەی واتیادا: گەورە لە بچوكەوە گێڕانەوە دەكا، شتی وا لە زاراوی خەڵكی فەرموودەدا پێی دەگوترێ: ریوایەتی ئەكابیر لە ئەصاغیرەوە، چونكە جابیر صەحابەیە، ئوم كولثوم تابیعییە، جابیر بە تەمەنو بە پایەو بە بەهرەمەندی لە ئوم كەلثوم گەورەترە.

٢-لە زانستی فەرموودەدا، جیاوازی لەنێوانی ژنو پیاودا، لە گێڕانەوەدا نییە، كۆمەڵێ فەرموودەی زۆری پێغەمبەر، لەسەرەتاوە لە ژنێكەوە ریوایەتكراوە.

٣-ئەگەر مەبەستێكی رەوای شەرعی هەبوو، دروستە مرۆڤ باسی سەرجێیو ئەوشتانەی كە لەنێوانی ژنو مێرددا روودەدەن لەكاتی جووتبووندا بكات، ئەوەتا لەم فەرموودەیەدا، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەر بەیانی حوكمی شەرعی، باسی سەرجێیی خۆیو عائیشەی هاوسەری دەكا، بەڵام ئەگەر شتی وا بەبێ حیكمەت بێ حەرامەو تاوانە.

**١١٠) ژنیش وەك پیاو شەیتانی دەبێو خۆشۆردنی لەشپیسی دەكەوێتە سەر**
(٧٠٧ – ٧١٣). {**باب: فِى الْمَرأةِ تَرى فِى النَّوْمِ مِثْلَ مايَرى الرَّجُلُ وَتَغْتَسِلُ**}

١٥٤- عَنْ إِسْحَاقُ بْنُ أَبِى طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسُ قَالَ: جَاءَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ وَهِىَ جَدَّةُ إِسْحَاقَ، إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَتْ لَهُ، وَعَائِشَةُ عِنْدَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ الْمَرْأَةُ تَرَى مَا يَرَى الرَّجُلُ فِى الْمَنَامِ، فَتَرَى مِنْ نَفْسِهَا مَا يَرَى الرَّجُلُ مِنْ نَفْسِهِ؟ فَقَالَتْ عَائِشَةُ: يَا أُمَّ سُلَيْمٍ فَضَحْتِ النِّسَاءَ تَرِبَتْ يَمِينُكِ، فَقَالَ لِعَائِشَةَ: « بَلْ أَنْتِ فَتَرِبَتْ يَمِينُكِ، نَعَمْ فَلْتَغْتَسِلْ يَا أُمَّ سُلَيْمٍ إِذَا رَأَتْ ذَالِكِ». {الحديث/ ٧٠٧}:

ئیسحاقی كوڕی ئەبو طەلحە فەرمووی: ئەنەسی كوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئوم سولەیم، كە دایكی ئەنەس بوو، وە نەنكی ئەم ئیسحاقە بوو، كە ناوی تەواوی: ئیسحاقی كوڕی عەبدوڵلای كوڕی ئەبو طەلحە بوو، ئوم سولەیم هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوكاتەدا عائیشە لەوێ بوو، ئوم سولەیم

به پێغەمبەری فەرموو: (ئەی پێغەمبەری خودا! خودا لەگوتنی قسەی ڕەوا شەرم ناکا، وە قسەی ڕەوای پێ خۆشە، دەی چۆن پیاو لەخەونا شەیتانی دەبێ، ژنیش ڕێك وەك ئەو لەخەونا شەیتانی دەبێو ڕەحەت دەبێو ئاوی دێتەوە، جا لەکاتی وادا ئەگەر ژنێ شەیتانی بوو خۆشۆردنی لەسەرە یانا؟ حەزرەتی عائیشە کەلەوێ بوو، پێی فەرمووی: ئەی ئوم سولەیم! واوات لێ بێ، ئەم پرسیارە ناشیرینە چی بوو کردت، حەیای ژنانت برد، ئافرەتانت ڕیسوا کرد، چونکە نهێنی ئەوانت ئاشکرا کرد)، پێغەمبەریش بە عائیشەی هاوسەری فەرمووی: (بەڵکوو تۆ واوات لێ بێت، ئەم پرسیارەی ئوم سولەیم جێگەی خۆیەتی، پرسیارێکی ڕەوایە، هیچ عەیبی نییە) ئەوجا حەزرەت بە ئوم سولەیمی فەرمووی: (بەڵێ ئەی ئوم سولەیم، ئەگەر ژن خەونی وای بینیو شەیتانی بوو، ئەوە بە شەرع لەشی پیس دەبێو خۆشۆردنی لەشپیسی لەسەرە، کەواتە باخۆی بشۆرێو لەشپیسی خۆی دەربکا). {تاج/١/١٤٦، زنجیرە:٣٠، ژمارە: ٥}.

**ڕوونکردنەوە:**

١-ئیسحاق کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئەبو طەلحەیە، ئەبو طەلحە مێردی ئوم سولەیمی دایکی ئەنەسی کوڕی مالیکە، کە مامی دایکی ئیسحاقەو برای دایکی عەبدوڵلای کوڕی ئەبو طەلحەیە، کە عەبدوڵلا باوکی ئیسحاقە.

٢-ئەبو طەلحە زڕبابی ئەنەسی کوڕی مالیکە، مێردی ئوم سولەیمە. {بڕوانە: تەجرید/٣/٤٤، ژمارە: ٦١٧ = ١٢٨٥ فەتح}.

### ١١١) چۆنێتی خۆشۆردنی لەشپیسی (٧١٦ - ٧٢٣).
### باب: صِفَةُ الغُسْلِ مِنَ الجَنَابَةِ

١٥٥- عَنْ مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَتْ: أَدْنَيْتُ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) غُسْلَهُ مِنَ الْجَنَابَةِ، فَغَسَلَ كَفَّيْهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ، ثُمَّ أَفْرَغَ بِهِ عَلَى فَرْجِهِ، وَغَسَلَهُ بِشِمَالِهِ، ثُمَّ ضَرَبَ بِشِمَالِهِ الأَرْضَ فَدَلَكَهَا دَلْكًا

شَدِيدًا، ثُمَّ تَوضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلاَةِ، ثُمَّ أَفْرَغَ عَلَى رَأْسِهِ ثَلاَثَ حَفَنَاتٍ، كُلُّ حَفْنَةٍ مِلْءُ كَفِّهِ، ثُمَّ غَسَلَ سَائِرَ جَسَدِهِ، ثُمَّ تَنَحَّى عَنْ مَقَامِهِ ذَلِكَ فَغَسَلَ رِجْلَيْهِ، ثُمَّ أَتَيْتُهُ بِالْمِنْدِيلِ فَرَدَّهُ). {الحديث/ ٧٢٠. تجريد/١/١٩٨، ژمارە: ١٨٠ = ٢٤٩، ٢٥٧، ٢٥٩، ٢٦٠، ٢٦٥، ٢٦٦، ٢٧٤، ٢٧٦، ٢٨١}:

**مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئاوی خۆشۆردنی لەشپیسیم، بۆ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دانا، لەپێشا دووجار، یا سێ جار هەردوو دەستی خۆی لە دەرەوەی دەفرەکەدا شۆرد، ئەوجا دەستی کرد بەناو دەفرەکەداو ئاوی کرد بە دەستی چەپیداو، ناوگەڵی خۆی بەدەستی چەپی شۆرد، لەپاشا بە زەوییەکە دەستی خۆی زۆر باش سڕیو شوێنەواری چەپەڵییەکەی لێ کردەوە، هەتا بەتەواوی شوێنەواری تاراتگرتنەکە بەدەستیەوە نەما، ئەوجا دەستنوێژێکی گرت وەك دەستنوێژی نوێژ، ئەوجا دەستی کرد بە خۆشۆردنو لەپێشا سێ مشتی کرد بەسەر سەری خۆیدا، کە هەرمشتێ پڕ هەردوو لوێچە، ئەوجا هەموو لەشی خۆی شۆرد، ئەوجا شوێنەکەی خۆی گۆڕیو لە جێگە تازەکەیدا هەردوو قاچی شۆری. ئەوجا منیش خاولییەکم هێنا بۆی، کەخۆی پێ وشك بکاتەوە، بەڵام خاولییەکەی نەویست).** {تاج/١/١٥٢، زنجیرە: ٣٢، ژمارە: ١ ژ-٢٩٠ چ-٤}.

## ١١٢) ئەندازەی ئەو ئاوەی کە غوسڵی لەشپیسی پێ دەردەکرێ (٧٢٤ - ٧٣٧)
## باب: قَدرُ الْمَاءِ الَّذِي يَغْتَسِلُ بِهِ مِنَ الجَنَابَةِ

١٥٦- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عنها)، أَنَا وَأَخُوهَا مِنَ الرَّضَاعَةِ، فَسَأَلَهَا عَنْ غُسْلِ رَسُولِ اللّه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنَ الْجَنَابَةِ؟ فَدَعَتْ بِإِنَاءٍ قَدْرِ الصَّاعِ، فَاغْتَسَلَتْ، وَبَيْنَنَا وَبَيْنَهَا سِتْرٌ، وَأَفْرَغَتْ عَلَى رَأْسِهَا ثَلاَثًا. قَالَ: وَكَانَ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَأْخُذْنَ مِنْ رُءُوسِهِنَّ، حَتَّى تَكُونَ كَالْوَفْرَةِ). {الحديث/ ٧٢٦. حيض. تجريد/١، لاپەڕە: ١٩٩، رقم: ١٨٢ = ٢٥١ فتح}:

**ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان، کە خوشکەزای شیریی حەزرەتی عائیشە بوو، چونکە ئوم کولثومی خوشکی شیری پێدابوو، فەرمووی: (منو برایەکی شیریی**

عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕۆیشتین بۆ خزمەتی، برا شیرییەکەی، کەناوی عەبدوڵڵای کوڕی یەزید بوو، لەبارەی چۆنێتیی خۆشۆردنی لەشپیسی پێغەمبەرەوە پرسیاری لێکرد، ئەویش داوای نزیکەی صاعێ ئاوی کرد، خۆی شۆرد، لە تەوقە سەریەوە دەستی کرد بە ئاوکردن بەسەر خۆیدا، سێ مشتی لە ئاوەکە دەرهێناو کردی بەسەر سەری خۆیدا، لەنێوانی ئێمەو لەنێوانی عائیشەدا پەردەیێ هەبوو، ئەو شوێنانەی لە جەستەی عائیشە شاردبۆوە، کە لە لەشی ئافرەتی خۆیی، تەماشاکردنی نادروستە) فەرمووی: لەپاش وەفاتی پێغەمبەر، هاوسەرەکانی، قژی سەری خۆیان کورت دەکردەوە، هەتا وەك تۆپەڵەی لێ دەهات لە دەوری سەریان و لە گوێچکەیان ڕەت نەدەبوو.

**١١٣) پەردە گێڕانەوە بۆ خۆشۆردن** (٧٦٢ - ٧٦٥). {**باب: تَسَتُّرُ المغتَسِلِ بِالثوبِ**}

١٥٧-عَنْ أُمِّ هَانِئٍ بِنْتَ أَبِى طَالِبٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهَا): أَنَّهَا لَمَّا كَانَ عَامُ الْفَتْحِ، أَتَتْ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ بِأَعْلَى مَكَّةَ، قَامَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى غُسْلِهِ، فَسَتَرَتْ عَلَيْهِ فَاطِمَةُ، ثُمَّ أَخَذَ ثَوْبَهُ فَالْتَحَفَ بِهِ، ثُمَّ صَلَّى ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ سُبْحَةَ الضُّحَى). {الحديث/ ٧٦٣. حيض}:

ئوم هانی کچی ئەبو طالیب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ساڵی ئازادکردنی شاری مەککە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەرووی مەککەوە بوو، چووم بۆ خزمەتی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەستا چوو خۆی بشۆرێ، فاطیمەی کچی پەردەیەکی بۆ گێڕایەوە، هەتا لەشی لەکاتی خۆشۆردنەکەیدا دەرنەکەوێ، کاتێ لێ بۆوە جلەکانی کردەوە بەری، ئەوجا هەشت رکات نوێژی سوننەتی چێشتەنگاوی کرد، لەهەموو دوو رکاتێکا سلاوی دەدایەوە). {تەجرید/١/٢٠٧، ژمارە: ١٩٤ = ٢٨٠، ٣٥٧، ٣١١٧، ٦١٥٨ + تاج/١/٤٨٥، ژمارە:٩٥٦ چ-٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

بڕوانە: فەرموودەی ژمارە (٣) لەم بەرگە، ژیاننامەی ئەبو طالیب، هەروا بڕوانە فەرموودەی ژمارە: (٣٦) لەم بەرگە، ژیانی ئیمامی عەلی کە برای ئوم هانیئە. ئوم

هانی چلو شەش فەرموودەی هەیە، دەڵێن: ئەم لەدوا ئیمامی عەلی مردووە، هەق ئامۆزای پێغەمبەرە، ئوم هانی ناوی فاخیتەیە، خوشکی هەقی عەلیو عەقیلو جەعفەرو طالیبە، دایکیان ناوی فاطیمەی کچی ئەسەدە، ئوم هانی ژنی هوبەیرە بوو، لە هوبەیرە ئەم منالانەی بووە: عەمرو هانیو یوسفو جەعدە. ئوم هانی فەرموودەی لە شەش کتێبەکەدا هەیە، حەدیثەکانی ئەو ئەم زاتانە دەیگێڕنەوە: جەعدەی کوڕیو یەحیای کوڕی جەعدەی کوڕیو کوڕەزایەکی تری کەناوی هاروون بووەو ئیبنو عەباس کە ئامۆزای بووە، ساڵی ئازادکردنی مەککە ئیسلام بووە.

**١١٤) مرۆڤ ئەگەر بەتەنهایش خۆی بشۆری، واباشە پەردە بگیرێتەوە (٧٦٨).**

**باب: غُسْلُ الرَّجُلِ وَحْدَهُ مِنَ الجَنَابَةِ**

١٥٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنْ مُحَمَّدٍ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، (فَذَكَرَ أَحَادِيثَ مِنْهَا) وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « كَانَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ يَغْتَسِلُونَ عُرَاةً، يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى سَوْأَةِ بَعْضٍ، وَكَانَ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ يَغْتَسِلُ وَحْدَهُ، فَقَالُوا: وَاللَّهِ مَا يَمْنَعُ مُوسَى أَنْ يَغْتَسِلَ مَعَنَا، إِلاَّ أَنَّهُ آدَرُ. قَالَ: فَذَهَبَ مَرَّةً يَغْتَسِلُ، فَوَضَعَ ثَوْبَهُ عَلَى حَجَرٍ، فَفَرَّ الْحَجَرُ بِثَوْبِهِ. قَالَ: فَجَمَحَ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ بِإِثْرِهِ يَقُولُ: ثَوْبِي حَجَرُ! ثَوْبِي حَجَرُ. حَتَّى نَظَرَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ إِلَى سَوْأَةِ مُوسَى، وَقَالُوا: وَاللَّهِ مَا بِمُوسَى مِنْ بَأْسٍ، فَقَامَ الْحَجَرُ حَتَّى نُظِرَ إِلَيْهِ، قَالَ: فَأَخَذَ ثَوْبَهُ، فَطَفِقَ بِالْحَجَرِ ضَرْبًا، قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَاللَّهِ إِنَّهُ بِالْحَجَرِ نَدَبٌ: سِتَّةٌ أَوْ سَبْعَةٌ، ضَرْبُ مُوسَى بِالْحَجَرِ. {الحديث/ ٧٦٨. حيض. تجريد/١/٢٠٤، ژمارە: ١٩٢ = ٢٧٨، ٣٤٠٤، ٤٧٩٩}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نەوەی ئیسرائیل (کە ناسراون بە بەنی ئیسرائیل) بەرووتو قووتی، لەبەرچاوی یەکتری خۆیان دەشۆرد، بەڵام مووسا (سڵاوی لێ بێ) پیاوێکی زۆر بە شەرمو شکۆ بووە، هەمیشە خۆی باش دادەپۆشی، بە ڕەنگێکی وا پێستی لەشی هیچ نەدەبینرا، وەهەر بەتەنهایش خۆی دەشۆرد، جا هەندێ کەسیان بەم جۆرە قسە ناشیرینانە ئازاری دڵی مووسایان دەداو، دەیانگوت: ببێو نەبێ بۆیە مووسا بەو شێوەیە خۆی

دادەپۆشیو بەجیا خۆی دەشواو لەگەڵ ئێمەدا خۆی ناشۆری، دیارە نەنگیێ بە لەشیەوە هەیە، سایا بەڵەکە، یا دەبەو قۆڕە، یا دەردێکی تری هەرهەیە).

جا خودای گەورەو سەروەر ویستی ئەم قسەو باسەی ئەوانە بەدرۆ بخاتەوە، پاکیو بیێ نەنگی موسا (سڵاوی لیێ بیێ) دەربخا، جا بۆیە رۆژیێ مووسا (سڵاوی لەسەر بیێ) بەتەنیا خۆی لەوان کلا کردو رۆیشت بۆ چۆڵیێ، لەویێ خۆی بشۆریێ، جا جلەکانی لەبەرخۆی داکەندو، لەسەر بەردیێ دانان، کاتیێ کەخۆی تەواو شۆرد، چوو بۆلای جلەکانی تا لەبەریان بکاتەوە، بەڵام بەفەرمانی خودای گەورە بەردەکە جلەکەی مووسای فڕاند!

مووساش داردەستەکەی خۆی هەڵگرتو نیشتە سەربەردەکەو رایکرد بەشوێنیداو بانگی کرد: بەردەکە! جلەکانم دانیێ، بەردەکە! جلەکانم دانیێ، بەردەکەیش رۆیشت، مووسایش شوێنی کەوت، هەتا گەیشت بە کۆمەڵیێ لەنەوەی ئیسرائیلو گشتیان تەماشای لەشی مووسایان کرد، بە رووتو قووتیو بەچاوی خۆیان بینییان کە لەشو لارو جەستە لەوە جوانترو پاکتر نابیێو زۆر دوورە لەو درۆیانەی کە ئەوان دەیانلێن، جا ئەوجا بەردەکە رەق راوەستاو مووسایش جلەکەی هەڵگرتەوەو دەستی کرد بە لێدانی بەردەکە، بە گۆچانەکەی چەند کوتەکێکی باشی لێدا!

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لیێ بیێ) دەفەرمویێ: سوێندم بە خودای گەورە، مووسا وا بەتوندی بەردەکەی داپلۆسی بوو، سیێ یا چوار، یا پێنج، یا شەش، یا حەوت خاڵی لیێ کردبوو، ئاوا قرنجاندبووی وەك جێگە برین، ئەمە ئەو داستانەیە کە خودای گەورە بەم ئایەتە ئاماژەی بۆ دەکاو دەفەرمویێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ آذَوْا مُوسَى فَبَرَّأَهُ اللَّهُ مِمَّا قَالُوا وَكَانَ عِندَ اللَّهِ وَجِيهًا - سورة الأحزاب/ ٦٩/٣٣} :

واتە: ئەی کەسانیێ کە باوەڕتان هێناوە بە خوداو بە پێغەمبەری خودا! وەك ئەوانە مەبن کە ئازاری دڵی مووسایان دەدا، تا خودای گەورە پاکیو بیێ نەنگیو بیێ گەردی مووسای دەرخستو قسە ناهەقەکانی ئەوانی بەدرۆ خستەوە، لە راستیدا مووسا لەلای خودای گەورە گەڵیێ خاوەن خاترو قەدرو زۆر پایە بەرزو رێزدار بوو).

{تاج/١٠١/٧ — ١٩ — ش/ت}.

### ١١٥) تەماشاکردنی شەرمگای پیاو یا ژن نادروستە (٧٦٦ - ٧٦٧).
### باب: النهى عَنِ النَّظَرِ إِلَى عَوْرَةِ الرَّجُلِ وَالمَرْأَةِ

١٥٩- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « لاَ يَنْظُرُ الرَّجُلُ إِلَى عَوْرَةِ الرَّجُلِ، وَلاَ الْمَرْأَةُ إِلَى عَوْرَةِ الْمَرْأَةِ، وَلاَ يُفْضِى الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ فِى ثَوْبٍ وَاحِدٍ، وَلاَ تُفْضِى الْمَرْأَةُ إِلَى الْمَرْأَةِ فِى الثَّوْبِ الْوَاحِدِ». {الحديث/ ٧٦٦. حيض}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نە پیاو تەماشای شەرمگای پیاوێکی تر بکاو نە ژنیش تەماشای شەرمگای ژنێکی تر بکا، وە پیاو بە رووتی خۆی نەنووسێنێ بە پیاوێکی ترەوە، لەژێریەك نوێنا، وەهەروەها ژنیش نابێ بەرووتی خۆی بنووسێنێ بە ژنێکی ترەوە لەژێر یەك پارچە نوێنا). {تاج/١٤٩/١، ژمارە: ٢٢٠ ج-٤ = چاپی-٤}.

### ١١٦) خۆداپۆشین، مرۆڤ نابێ لەبەرچاوی خەڵك رووت بێ (٧٦٩ - ٧٧١)
### باب: التَسَتُّر، وَلاَ يُرى الإِنْسَانُ عُرْيَاناً

١٦٠- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَنْقُلُ مَعَهُمُ الْحِجَارَةَ لِلْكَعْبَةِ، وَعَلَيْهِ إِزَارُهُ، فَقَالَ لَهُ الْعَبَّاسُ عَمُّهُ: يَا ابْنَ أَخِى لَوْ حَلَلْتَ إِزَارَكَ فَجَعَلْتَهُ عَلَى مَنْكِبِكَ دُونَ الْحِجَارَةِ، قَالَ: فَحَلَّهُ فَجَعَلَهُ عَلَى مَنْكِبِهِ، فَسَقَطَ مَغْشِيًّا عَلَيْهِ. قَالَ: فَمَا رُؤِىَ بَعْدَ ذَلِكَ الْيَوْمِ عُرْيَانًا). {الحديث/ ٧٧٠. بخارى: ٣٦٤، ١٥٨٢، ٣٨٢٩ = ٢٣١ تجريد}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: کاتێ هۆزی قورەیش لەپێش رەوانەکردن (بیعثەت)ی پێغەمبەردا، کەعبەیان دروست کردەوە، پێغەمبەرو عەباسی مامەی بەیەکەوە لەگەڵ خەڵکەکەدا بەردیان دەهێنا بۆ دروستکردنەوەی کابە، عەباس بە پێغەمبەری فەرموو: ئەی کوڕی برام! ئەی برازای ئازیزم! تۆیش وەك هاوەڵەکانت، شەرواڵەکەت بکەرەوەو بیخەرە سەر شانت، با بەرد سەرشانت نەبا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەوا دەکا شەرمگای دەردەکەوێ، ئیتر لەشەرمانا دەبوورێتەوەو خرپ بەردەبێتەوەو دەکەوێتە سەر زەوی، وەچاوی لەترسی خودا

بەرەو ئاسمان ئەبڵەق دەبێ، وە دەفەرموێ: (دەرپێکەم کوانێ؟) ئەوجا دەرپێکەی لەبەردەکاتەوە، ئیتر لەورۆژەوە بەدواوە بەرووتی نەبینراوە).

**١١٧) ژنو مێرد پێکەوە لەیەك دەفر خۆشۆردنی لەشپیسی جێبەجێ دەکەن** (٧٢٤ - ٧٣٧). {**باب: غَسْلُ الرَّجُلِ وَالْمَرْأَةِ مِنَ الإِنَاءِ الْوَاحِدِ مِنَ الْجَنَابَةِ**}

١٦١- عَنْ مُعَاذَةَ عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) قَالَتْ: كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ بَيْنِي وَبَيْنَهُ، فَيُبَادِرُنِي حَتَّى أَقُولَ: دَعْ لِي دَعْ لِي، قَالَتْ: وَهُمَا جُنُبَانِ}. {الحديث/٧٢٩. حيض. تجريد/١/٢٠٢، ژمارە: ١٨٦ = ٢٦١ فتح الباری}:

موعازە فەرمووی: عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران منو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەیەکەوە لەیەك دەفر خۆمان دەشۆرد، دەفرەکە لەنێوانی منو ئەودا بوو، ڕێدەکەوت لەناو دەفرەکەدا دەستمان بەرەنگاری یەکتر دەبوون، جاری وا دەبوو ئەو پێش دەستی لەمن دەکرد، منیش پێم دەگوت: بەشی منیش ئاو بهێڵەرەوە، عائیشە فەرمووی: هەردووکیشمان لەم کاتەدا لەشمان پیس بوو) {بڕوانە: ژمارە/١٨٠ بۆ ژیننامەی معازە}.

**١١٨) دەستنوێژگرتنی لەشپیس لەکاتی خەوتنو خواردندا** (٦٩٧ - ٧٠٧)
**باب: وُضُوءُ الْجُنُبِ إِذَا أَرَادَ النَّوْمَ وَالأَكْلَ**

١٦٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا كَانَ جُنُبًا فَأَرَادَ أَنْ يَأْكُلَ أَوْ يَنَامَ، تَوَضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ). {الحديث/٦٩٨. حيض}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ لەشی پیس بوایە، کە دەیویست شت بخوات، یا بخەوێ، دەستنوێژێکی دەگرت وەك دەستنوێژی نوێژ).

**١١٩) دروستە لەشپیس بخەوێ پێش ئەوەی کەخۆی بشۆرێ.** (٦٩٧ - ٧٠٧).

١٦٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَيْسٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها) عَنْ وِتْرِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (فَذَكَرَ الْحَدِيثَ) قُلْتُ: كَيْفَ كَانَ يَصْنَعُ فِي الْجَنَابَةِ، أَكَانَ

يَغْتَسِلُ قَبْلَ أَنْ يَنَامَ أَمْ يَنَامُ قَبْلَ أَنْ يَغْتَسِلَ؟ قَالَتْ: كُلُّ ذَلِكَ كَانَ يَفْعَلُ، رُبَّمَا اغْتَسَلَ فَنَامَ، وَرُبَّمَا تَوَضَّأَ فَنَامَ، قُلْتُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي جَعَلَ فِي الأَمْرِ سَعَةً. {الحديث/٧٠٣. حيض} :

عەبدوڵلای کوڕی ئەبو قوبەیس فەرمووی: پرسیارم لە عائیشە کرد، (رەزای خودای لێ بێ) سەبارەت بەکردنی وەتری پێغەمبەر خۆی، کە چەندو کەیو چۆن بووە، جا کە وەڵامی ئەمەی دامەوە، عەرزیم کرد: ئەی جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی لەشپیسیدا چی دەکرد؟ ئایا لەپێشا خۆی دەشۆردو ئەوجا دەنووست، یا لەپێشا دەخەوت، لەپاشا خۆی دەشۆرد؟ عائیشە فەرمووی: هەردوو لایانی دەکرد: جار جارە لەپێشا خۆی دەشۆردو ئەوجا دەنووست، یا لەپێشا دەخەوت، لەپاشا خۆی دەشۆرد، جار جارەیش بەس دەستنوێژی دەگرتو دەخەوت. قسە گێڕەوە کە عەبدوڵلای کوڕی قەیسە دەڵێ: منیش گوتم: سوپاس بۆ ئەو خودایەی کەئەم کارەی ئاوا گوشاد کردووە. {تاج/١/١٥٦ ژ-٢٨٥ چ-٤ — م/د/ت/ن} .

**١٢٠) کەسێ لەگەڵ حەڵاڵی دروست ببێ، لەپاشا ویستی دووبارەی بکاتەوە، چی بکا باشە. {باب: مَنْ أَتَى أَهْلَهُ ثُمَّ أَرَادَ أَنْ يَعُودَ فَلْيَتَوَضَّأْ}**

١٦٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « إِذَا أَتَى أَحَدُكُمْ أَهْلَهُ ثُمَّ أَرَادَ أَنْ يَعُودَ فَلْيَتَوَضَّأْ». {الحديث/ ٧٠٥. حيض} :

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر کەسێکتان ڕۆیشتە لای حەڵاڵی خۆیو لەپاشا ویستی دووبارەی بکاتەوە، با لەنێوانی هەر دووجارێکا، دەستنوێژێ تەواو بگرێ، ڕێك وەك دەستنوێژی نوێژ). {تاج/١/١٥٧، ژمارە: ١١ ژ-٢٨٧ چ-٤} .

**١٢١) باسی تەیەمموم (٨١٤ - ٨٢١). {باب: التيمم}**

١٦٥- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) أَنَّهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالْبَيْدَاءِ، أَوْ بِذَاتِ الْجَيْشِ انْقَطَعَ عِقْدٌ لِي، فَأَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى الْتِمَاسِهِ، وَأَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ، وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ، وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ، فَأَتَى النَّاسُ أَبَا بَكْرٍ، فَقَالُوا: أَلاَ تَرَى مَا صَنَعَتْ عَائِشَةُ؟ أَقَامَتْ

بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَبِالنَّاسِ مَعَهُ وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ؟ قَالَتْ عَائِشَةُ: فَعَاتَبَنِى أَبُوبكْر، وَقَالَ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقُولَ، وَجَعَلَ يَطْعُنُنِى بِيَدِهِ فِى خَاصِرَتِى، فَلاَ يَمْنَعُنِى مِنَ التَّحَرُّكِ إلاَّ مَكَانُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى فَخِذِى، فَنَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى أَصْبَحَ عَلَى غَيْرِ مَاءٍ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ آيَةَ التَّيَمُّمِ، فَتَيَمَّمُوا، فَقَالَ أُسَيْدُ بْنُ الْحُضَيْرِ وَهُوَ أَحَدُ النقبَاءِ: مَا هِىَ بِأَوَّلِ بَرَكَتِكُمْ يَا آلَ أَبِى بَكْرٍ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ (رَضِيَ اللَّهُ عنها): فَبَعَثْنَا الْبَعِيرَ الَّذِى كُنْتُ عَلَيْهِ، فَوَجَدْنَا الْعِقْدَ تَحْتَهُ ). {الحديث/ ٨١٤. حيض. تجريد البخارى: ٢١٦ = فتح البارى: ٣٣٤، ٣٣٦، ٣٦٧٢، ٣٧٧٣، ٤٥٨٣، ٤٦٠٧، ٤٦٠٨، ٥١٦٤، ٥٢٥٠، ٥٨٨٢، ٦٨٤٤، ٦٨٤٥}:

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو هاوسەرەکانی بێ) لەسەفەرێکا، کەوتینەرێ، رۆیشتین تا گەیشتینە بەیداء، یا گەیشتینە (ذات الجیش) لەوێ گەردانەیەکی من پچڕایەوەو گوم بوو، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوێ مایەوە بەهیوای دۆزینەوەی ئەو گەردانەیە، خەڵکەکەیش لەخزمەتیدا مانەوە، ئەمە لەکاتێکا بوو، کە نەشوێنەکە ئاوی لێ بوو، وە نەخەڵکەکە ئاویان پێ بوو، جا خەڵکەکە چوون بۆلای ئەبوبەکری باوکم‌و گلەیی دەکەن‌و دەڵێن: نابینی کە عائیشەی کچت چی کرد؟ پێغەمبەرو ئەو عەشاماتەی لەم بیابانە چۆڵ‌و بێ ئاوەدا، بۆ گەردانەیێ گل داوەتەوەو، ئاویشمان پێ نییە! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خەوتبوو، سەری لەسەر رانم بوو، لەوکاتەدا ئەبوبەکر بە تووڕەیی هات، فەرمووی: پێغەمبەرو ئەم عەشاماتەت لەم شوێنە چۆڵ‌و بێ ئاوەدا، بەبێ ئاو گل داوەتەوە، ماتڵت کردوون بەخوت‌و خۆڕایی، ئەمە ئیش بوو تۆ کردت؟ ئیتر چەندە خودا حەزکا ئەبوبەکر گلەیی لێ کردم‌و بۆ تەمێ کردن قسەی پێ گوتم، خۆش خۆشیش بەسەرە سیخورمە دەیکوتایە کەلەکەم، منیش هەرچەندە ئێشم پێ گەیشتبوو، بەڵام لەبەرئەوەی کەسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر رانم بوو — جووڵەم پێ نەدەکرا!

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوشەوە خەوت تا بەیانی، کاتێ کەبەیانی هەستا ئاو نەبوو بۆ دەستنوێژ، جا خودا ئایەتی تەیەممومی نارده خوارەوە کە دەفەرموێ:

{فَلَمْ تَجِدُواْ مَاء فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُ}:

واتە: ئەگەر لەهەموو ئەم شێوە کارانەدا، کەباسکران بۆتان، ئاونەبوو، بۆ دەستنوێژگرتنو خۆشۆردنی لەشکرانی، ئەوا قەستی هەڵگرتنی گڵێکی پاك بکەنو، لەباتی دەستنوێژ، یا لەجیاتی خۆشۆردنی لەشکرانی، لە تۆزی ئەو گڵە پاکە دەست بهێنن بەڕوخسارو بەهەردوو دەستتاندا، هەتا ئانیشك، ئیتر ئەوە برێتی دەستنوێژ، یا لەشپیسی دەرکردن بەئاو دەکەوێ). ئیتر تەیەمموممان کرد. جا بەم بۆنەیەوە، ئوسەیدی کوڕی حوضەیر (کە لەشەوی پەیمانی بەیعەتول عەقەبەی دووەمدا یەکێك بوو لە نەقیبەکان) فەرمووی: ئەی خانەوادەی ئەبوبەکری صەدیق! بەڕاستی ئێوە بنەماڵەیەکی پیرۆزن، بۆ ئەم نەتەوەی ئیسلامە بوون بەپیتو فەڕو خێرو بەرەکەتو مایەی پیرۆزیی، ئەوەتا ئەم داهاتنەی تەیەممومە، کەکار ئاسانییەکی گەورەیە بۆ موسوڵمانان، بەهۆی ئێوەوە بوو، چونکە گومبوونی گەردانەکەی عائیشە بوو بەهۆی پەیدابوونی تەیەمموم، ئەمەیش یەکەم پیتو فەڕی ئێوە نییە بۆ ئەم نەتەوەیە، بەڵکوو پیتو فەڕی ئێوە لەم بابەتەوە زۆر زۆرە.

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: سەیر لەوەدا بوو ئەو وشترەی کەمن لەو سەفەرەدا سواری دەبووم، پاڵکەوتبوو، کاتێ هەڵمان ساند گەردانەکە لەژێریدا بوو، ئیتر دۆزیمانەوە {تاج/١٧١/١، ژمارە: ١، زنجیرە: ٣٩ + تاج/٥، لاپەڕە/ ١٧٦، زنجیرە: ٤٦، ژمارە/٣٤٣٢/١ = تاج-٣ ژ-٣٤٧ چ-٤}.

## ١٢٢) تەیەمموم لەجیاتی خۆشۆردنی لەشپیسی. {بابٌ: تَيَمُّمُ الْجُنُبِ}

١٦٦- عَنْ شَقِيقٍ قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا مَعَ عَبْدِ اللَّهِ وَأَبِى مُوسَى، فَقَالَ أَبُو مُوسَى: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَرَأَيْتَ لَوْ أَنَّ رَجُلاً أَجْنَبَ فَلَمْ يَجِدِ الْمَاءَ شَهْرًا كَيْفَ يَصْنَعُ بِالصَّلاَةِ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لاَ يَتَيَمَّمُ، وَإِنْ لَمْ يَجِدِ الْمَاءَ شَهْرًا، فَقَالَ أَبُو مُوسَى: فَكَيْفَ بِهَذِهِ الآيَةِ فِى سُورَةِ

الْمَائِدَةِ: (فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا) فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لَوْ رُخِّصَ لَهُمْ فِي هَذِهِ الآيَةِ لأَوْشَكَ إِذَا بَرَدَ عَلَيْهِمُ الْمَاءُ أَنْ يَتَيَمَّمُوا بِالصَّعِيدِ! فَقَالَ أَبُو مُوسَى لِعَبْدِ اللَّهِ: أَلَمْ تَسْمَعْ قَوْلَ عَمَّارٍ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي حَاجَةٍ فَأَجْنَبْتُ فَلَمْ أَجِدِ الْمَاءَ فَتَمَرَّغْتُ فِي الصَّعِيدِ كَمَا تَمَرَّغُ الدَّابَّةُ، ثُمَّ أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: « إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيكَ أَنْ تَقُولَ بِيَدَيْكَ هَكَذَا». ثُمَّ ضَرَبَ بِيَدَيْهِ الأَرْضَ ضَرْبَةً وَاحِدَةً ثُمَّ مَسَحَ الشِّمَالَ عَلَى الْيَمِينِ، وَظَاهِرَ كَفَّيْهِ وَوَجْهَهُ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: أَوَلَمْ تَرَ عُمَرَ لَمْ يَقْنَعْ بِقَوْلِ عَمَّارٍ (رَضِيَ اللّهُ عنها)؟. {الحديث/ ٨١٦. حيض. تجريد/١/٢٢٧، رقم: ٢١٩ = ٣٣٨، ٣٣٩، ٣٤٠، ٣٤١، ٣٤٢، ٣٤٣، ٣٤٥، ٣٤٦، ٣٤٧}:

شەقیق (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەت عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودو ئەبو مووسای ئەشعەریدا، دانیشتبووم، ئەبو مووسا بە ئیبنو مەسعوودی فەرموو: ئەی باوکی ئەورەحمان! تۆ رات چییە بۆ ئەم پرسیارە: گریمان پیاوێ، لەشی پیس بوو، وە ئاو نەبوو، تەنانەت ئەگەر هەتا مانگێکیش ئاوی دەست نەکەوێ، کە دەستنوێژ بگرێ بۆ نوێژ، چۆن نوێژ بکا؟

ئیبنو مەسعوود فەرمووی: نابێ تەیەمموم بکا، ئەگەر مانگێکیش ئاوی دەست نەکەوێ. ئەبو مووسا فەرمووی: ئەی ئەم ئایەتە چۆن کاری پێ بکرێ، کە لە سوورەتی مائیدەدایە، کە دەفەرموێ: {فَلَمْ تَجِدُواْ مَاء فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا}.

ئیبنو مەسعوود لە وەڵامی ئەم پرسیارەی ئەبو مووسادا فەرمووی: ئەگەر ئەو خەڵکە بەپێی ئەم ئایەتە مۆڵەت بدرێن، دوورنییە هەر کەئاو ساردبوو، بچن بەخۆڵ تەیەمموم بکەن، ئەبو مووسایش بە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودی فەرموو: باشە ئەم فەرموودەیەی عەمماری کوڕی یاسرت نەبیستووە کە دەفەرموێ: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) منی نارد بۆ کارێ، لەرێ لەشم پیس بوو، خۆشۆردنی لەشپیسیم کەوتە سەر، وە ئاوم دەست نەکەوت بۆ خۆشۆردن، چووم خۆم لە خۆڵە پەتانێدا گەوزان، وەك چۆن وڵاخ لە خۆڵا خۆی دەگەوزێنێ ئاوا، لەپاشا کە هاتمەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەمەم بۆی باسکرد، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (تەنها

ئاوەهات بەس بوو: کە بەدەست ئاوا بکەی) ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەردوو دەستی خۆی ماڵی بە زەوییەکەدا یەکجارو، فووی لێ کردن، تا تۆزەکەیان تۆزێ سووک بێ، ئەوسا بەهەردوو ناولەپی مەسحی دەموچاوی‌و هەردوو دەستی خۆی کرد}.

بەلاّم عەبدوڵلا فەرمووی: با ئاگام لەم داستانە هەیە، بەلاّم ئەوەبوو ئیمامی عومەر قەناعەتی بەم قسەیەی عەمار نەبوو (تاج/١/١٧٧ ژ-٣١٧ چ-٤).

**روونکردنەوە:**

١-کاتێ ئاو نەبوو، یا ئاو لە حوکمی نەبوودا بوو، ئەوە دروستە بۆ لەشپیس، ژن بێ یا پیاو، بەهەر هۆیێ لەشی پیس بووبێ، لەباتی دەستنوێژ تەیەمموم بکا، وە لەجیاتی خۆشۆردن تەیەمموم بکا، بۆ هەموو نوێژێ تەیەممومێ دەکا، هەتا بەئاو خۆی دەشوا.

٢-دروستە بۆ حەڵاڵ‌و هاوسەر، لەگەڵ یەکتری دروست ببن، با سووریش بزانن کە ئاو نییە بۆ خۆشۆردن، لەکاتی وادا دەتوانن تەیەمموم بکەن‌و نوێژ بکەن.

### ١٢٣) تەیەمموم کردن بۆ وەڵامی سڵاو. {باب: التيمُّم لِردِّ السَّلَامِ}

١٦٧- عَنْ عُمَيْرًا مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّه سَمِعَهُ يَقُولُ: أَقْبَلْتُ أَنَا وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ يَسَارٍ مَوْلَى مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى دَخَلْنَا عَلَى أَبِى جُهَيْمِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ الصِّمَّةِ الأَنْصَارِيِّ فَقَالَ أَبُو الْجُهَيْمِ: أَقْبَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ نَحْوِ بِئْرِ جَمَلٍ، فَلَقِيَهُ رَجُلٌ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ فَلَمْ يَرُدَّ رَسُولِ اللّه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَيْهِ حَتَّى أَقْبَلَ عَلَى الْجِدَارِ فَمَسَحَ بِوَجْهِهِ وَيَدَيْهِ ثُمَّ رَدَّ السَّلَامَ). {الحديث/ ٨٢٠. حيض. تجريد/١/٢٢٦، ژمارە: ٢١٨ = ٣٣٧ فتح}:

عومەیری ئازادکراوی ئیبنو عەباس فەرمووی: لە ئیبنو عەباسم بیست فەرمووی: من‌و ئەورەحمانی کوڕی یەساری ئازادکراوی مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چووین بۆلای ئەبو جەهمی کوڕی حاریثی کوڕی صوممەی ئەنصاری، کە هاوەڵی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بوو، کە چووینە

خزمەتی، ئەبوجەهم فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای بیری جەمەلەوە هات، پیاوێ پێی گەیشت و سڵاوی لێکرد، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) سڵاوەکەی نەسەندەوە، هەتا رووی کردە دیوارەکەو لە گەردی سەر بەردی دیوارەکە روخساری خۆیو هەردوو دەستی هەتا ئانیشکەکانی مەسح کرد، ئەوجا کە تەیەممومەکەی تەواوکرد، وەڵامی سڵاوی پیاوەکەی دایەوە. {تاج/١/١٧٧، ژمارە: ٣١٨ چ-٤}.

**١٢٤) موسوڵمان پیس نابێت** (٨٢٢ - ٨٢٣). {**باب: المؤمنُ لا ينْجسُ**}

١٦٨- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ): أَنَّهُ لَقِيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِى طَرِيقٍ مِنْ طُرُقِ الْمَدِينَةِ وَهُوَ جُنُبٌ، فَانْسَلَّ فَذَهَبَ فَاغْتَسَلَ، فَتَفَقَّدَهُ النَّبِىُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَمَّا جَاءَهُ قَالَ: أَيْنَ كُنْتَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ؟ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَقِيتَنِى وَأَنَا جُنُبٌ فَكَرِهْتُ أَنْ أُجَالِسَكَ حَتَّى أَغْتَسِلَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « سُبْحَانَ اللَّهِ إِنَّ الْمُؤْمِنَ لاَ يَنْجُسُ». {الحديث/ ٨٢٢. حيض. تجريد/١/٢٠٧، ژمارە: ١٩٥ = ٢٨٥ فتح}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەشم پیس بوو، لەیەکێ لە رێگەکانی مەدینە تووشی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بووم، لەبەرئەوە کە لەشم گران بوو، خۆم لێ شاردەوەو چووم خۆم شۆردو ئەوسا هاتمەوە بۆ خزمەتی، لەو ماوەیەدا پێغەمبەر هەواڵی منی پرسی بوو، کە ئەبو هورەیرە چی لێ هات، کە گەڕامەوە خزمەتی فەرمووی: (ئەی ئەبو هورەیرە! ئەوە لەکوێ بووی؟). گوتم: راستیەکەی لەشم پیس بوو، لەبەرئەوە حەزم نەکرد کە بەلەشی ناپاکەوە لە خزمەتتا دابنیشم، چووم خۆم شۆردو هاتمەوە بۆ خزمەتت. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سوبحانەڵلا! چەند سەیریت! موسوڵمان چۆن پیس دەبێت! جەستەی موسوڵمان بە زیندوویی و بە مردوویی پاکە پیس نابێت).

**روونكردنەوە:**

١- مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوەیە زاتی مرۆڤ بە سروشت پاكە، بەهیچ شتێ پیس نابێ، نە بەلەشگرانی، نە بەكفر، نە بەكردنی گوناهو تاوانو نەبە حەیزو منالبوون.

٢- بەلام ئەگەر پیسیەك بەر شوێنێكی كەوت، پێویستە كە بیشۆرێ، چونكە ئەم پیسیە جیایە لە پیسی سروشتی.

٣- لەهەمان كاتدا واباشە كە مرۆڤ بە زووترین كات لەشپیسی خۆی دەربكاتو بە لەشی پاكو بەشێوەی جوانو رێكو پێكەوە بچێتە ناو كۆڕو مەجالیسەوە.

## ١٢٥) لەهەموو بارودۆخێكا، یادو زیكری خودا باشە (٨٢٤).

## باب: ذِكْرُ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى كُلِّ الأَحْيَانِ

١٦٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها) قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَذْكُرُ اللَّهَ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ. {الحديث/٨٢٤. حيض. بخاري. أذان: ٦٣٤}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو: لەهەموو حالێكدا، لەشی پاك بوایە، لەشی پیس بوایە، دەستنوێژی ببوایە، دەستنوێژی نەبوایە، بە دانیشتنەوە بوایە، بە پێوە بوایە، بە راكشانەوە بوایە، بە سوارییەوە بوایە، یادی خودای دەكرد، وەك تەسبیحاتو تەكبیراتو تەلیلەو شتی تری وا}.

## ١٢٦) بۆ كەسێ دەستنوێژی نەبێ خواردنو خواردنەوە دروستە (٨٢٥ - ٨٢٨)

## باب: أَكْلُ الْمُحْدِثِ وَإِنْ لَمْ يَتَوَضَّأْ

١٧٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللّه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَرَجَ مِنَ الْخَلاَءِ فَأُتِيَ بِطَعَامٍ، فَذَكَرُوا لَهُ الْوُضُوءَ، فَقَالَ: « أُرِيدُ أَنْ أُصَلِّيَ فَأَتَوَضَّأَ؟». {الحديث/ ٨٢٥. حيض}:

ئیبنو عەباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ئاودەست دەرچوو، نانیان بۆ دانا، عەرزیان كرد: قوربان! دەستنوێژی بۆ دەگریت یانا؟ فەرمووی: (نان خواردن دەستنوێژی بۆچییە، خۆ نوێژ ناكەم هەتا دەستنوێژی بۆ بگرم).

## پوختەی نامەی دەستنوێژو نامەی غوسڵ

١-نوێژی بەبێ دەستنوێژ دروست نییە.

٢-سەراو دەستوری تایبەتی خۆی هەیە، پێویستە پەیڕەوی بکرێ.

٣-لەکاتی سەراو کردندا خۆحەشاردان سوننەتە.

٤-نزای تایبەتی سەراو کردن.

٥-رووکردنە رووگە، یا پشت تێکردنی، لەکاتی سەراودا، لەسارادا، ناباشە.

٦-دروست کردنی ئاودەست کارێ رەوایە.

٧-نابێ میز بکرێتە ئاوی راوەستاوەوە.

٨-خۆپارازتنی تەواو لەمیز.

٩-بە دەستی راست تاراتگرتن ناباشە، مەگەر لەبەر ناچاری.

١٠- تاراتگرتن بەئاو زۆر پەسەندە.

١١. تاراتگرتن بە بەردیش دروستە، وا باشە بەردەکان تاك‌و پاك بن.

١٢. تەپاڵەو ئێسك‌و شتی وا تاراتی پێ ناگیرێ.

١٣. کەوڵی مردار بە خۆشەکردن پاك دەبێتەوە.

١٤. گلاوی سەگ دەرکردن.

١٥. فەزڵ‌و گەورەیی دەستنوێژ.

١٦. لەکاتی دەستنوێژ گرتندا، کۆمەڵ کۆمەڵ، گوناه لە ئەندامەکان هەڵ دەوەرێن.
لە سەرەتای دەستنوێژەوە سیواك سوننەتە.

١٧. پێش خستنی شۆردن‌و مەسح کردنی لای راست لەکاتی دەستنوێژو سیواك سوننەتە.

١٨. ئاو لەدەم‌و لووت رادان سوننەتە.

١٩. شۆردنی ئەندامەکان سێ جار سێ جار.

٢٠. نورانی بوون بەهۆی دەستنوێژی تەواوەوە.

٢١. لە قیامەتا پێغەمبەر بە شوێنەواری دەستنوێژ ئۆمەتی دەناسێتەوە.

٢٢. کەسێ دەستنوێژێکی جوان بگرێ‌و دوو رکات نوێژی پێوە بکا، خوا لە گوناهی لەوەبەری خۆش ئەبێ.

٢٣. ئاوی دەستنوێژ بگاتە کوێی ئەندامەکان، لە بەهەشتا هەتا ئەوێ خشڵی تێ دەکرێ.

٢٤. یەك تۆز لە جێگە دەستنوێژ نەشۆری، ئەو دەستنوێژە دانامەزری.

٢٥. مەسحی خوف.

٢٦. تا خۆت لەمیز زیاتر پاك بكەیتەوە كەمە.

٢٧. لەكاتی مەسحی سەردا، سونەتە هەمووی مەسح بكری، ئەگەر لەسەر مێزەریشەوە بووە.

٢٨. چەندین نوێژ بەیەك دەستنوێژ دەكری.

٢٩. نزای پاش دەستنوێژ.

٣٠. مەزی پیسە، دەستنوێژ دەشكێنی، لەش پیس ناكا.

٣١. خەو دەستنوێژ دەشكێنی.

٣٢. دەستنوێژ گرتن بۆ خواردنی گۆشتی حوشتر.

٣٣. لە پەچە ران نوێژ دروسمتە.

٣٤. تا بەیەقینی دەستنوێژ نەشكی، دڵە راوكی كاریگەری نییە.

٣٥. بە جووت بوون، با كەسیشیان ئاویان نەیەتەوە، هەردووكیان لەشیان پیس دەبی.

٣٦. ژنیش شەیتانی دەبی‌و دەبی لەشپیسی دەربكا.

٣٧. پەردە گرتنەوە لەكاتی خۆشۆردندا.

٣٨. بەرد جلەكانی مووسا، لەكاتی خۆشۆردندا دەفرێنی.

٣٩. ژن‌و پیاوی بیانی نابی بەیەكەوە بخەون.

٤٠. پێغەمبەر قەت شەرمگای دەرنەكەوتووە.

٤١. دەستنوێژ لەنێوانی دوو جوتبووندا.

٤٢. تەیەمموم چۆن دەكری، چۆن پەیدا بوو.

٤٣. مرۆڤ پاكە پیس نییە.

٤٤. هەموو كاتی، لەسەر هەموو بارو دۆخی، یادی خوا دەكری، بەپێی حاڵ، بەلەشی پاكەوە، بە لەشی پیسەوە، زیكرو یادی خودا، كە لەباربی بۆ شوێن‌و كات دروستە بكری.

**ڕوونکردنەوە:**

ئیبنو عەبباس ناوی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسە، هەق ئامۆزای پێغەمبەرە، باوکیمان برا بوون، باسی فەزڵو گەورەیی لە بەرگی پێنجەمی تاجدا، لە لاپەڕە (١٢١)دا هەیە = تاج-٣ ز-٢١ ژ-٣٣٨١ هەتا ٣٣٨٣. هەروا لەبەرگی/١، لاپەڕە: ١٩ تەجریدی بوخاریدا هەیە. بۆ ژینامەی عەباسی باوکی بڕوانە ژمارە: ٢٥ی ئەم کتێبە پیرۆزە. ئەم زاتە: پایە بەرزە ناسراوە بە حیبری ئوممەتو بە تەرجومانی قورئان، چونکە بەڕاستی دەریای زانستو راڤەو شیکردنەوە کاری قورئانە، یەکێکە لەو شەش هاوڕێیانە کە فەرموودەی زۆریان، لە فەرموودەکانی پێغەمبەر گێڕاوەتەوە (١٦٦٠) حەدیثی گێڕاوەتەوە، لە بوخاریدا (٢١٥) فەرموودەی هەیە، لە موسلیمدا (١٤٢) حەدیثی هەیە، نەوەدو پێنجیان پەسەندی هەردوو پیری بوخاریو موسلیمە، لەتەمەنی (٧١) ساڵیدا لە طائیف کۆچی دوایی کردووە، لە کۆتایی تەمەنیدا کوێر بووە.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٣-/... نامەی بێنوێژیی (حەیض).
## {كِتَابُ: الحيض}

### ١٢٧) فەرموودەی خودای گەورە: (يَسألُونكَ عَنِ الحيض) الآية:

واتە لەبارەی بێنوێژی ژنانـەوە پرسیارت لێ دەکـەن، لـە بڕیـاری بێنوێـژی: کـە چۆنەو چی لێ پەیدا دەبێ؟ بفـەرموو پێیـان: خـوێنی بێنوێـژی، قیزاوییـەو مایـەی ڕەنج و ئێش و ئازارە، هەم بۆ ژنەکە خۆی، هەم بۆ مێردەکەی، دەی کەنار بگـرن لـە ژنــەکان لــەکاتی بێنوێژیــدا، وە نزیکیــان مەبنــەوە هــەتا پــاك دەبنــەوەو خۆیــان دەشۆرن، جا کاتێ کە خۆیان پاك کردەوەو لەشپیسی خۆیانیان دەرکرد، بچنە لایـان لەو شوێنەوە کە خودا ڕێی داون و ڕەوای دیوە بۆتان).

١٧١- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللهُ عَنْـهُ): أَنَّ الْيَهُـودَ كَـانُوا إِذَا حَاضَـتِ الْمَـرْأَةُ فِـيهِمْ، لَـمْ يُؤَاكِلُوهَا، وَلَمْ يُجَامِعُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ، فَسَأَلَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ)، فَأَنْزَلَ اللَّـهُ عَـزَّ وَجَـلَّ: (وَيَسْـأَلُونَكَ عَـنِ الْمَحِيضِ، قُـلْ: هُـوَ أَذًى فَـاعْتَزِلُوا النِّسَـاءَ فِـي الْمَحِيضِ) إِلَى آخِرِ الآيَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « اصْـنَعُوا كُـلَّ شَـيْءٍ إِلاَّ النِّكَاحَ». فَبَلَغَ ذَلِكَ الْيَهُودَ، فَقَالُوا: مَا يُرِيدُ هَذَا الرَّجُلُ أَنْ يَـدَعَ مِـنْ أَمْرِنَـا شَـيْئًا إِلاَّ خَالَفَنَا فِيهِ، فَجَاءَ أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ وَعَبَّادُ بْنُ بِشْرٍ، فَقَالاَ: يَا رَسُـولَ اللَّـهِ إِنَّ الْيَهُـودَ تَقُـولُ كَذَا وَكَذَا، أَفَلاَ نُجَامِعُهُنَّ؟ فَتَغَيَّرَ وَجْهُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّـى ظَنَنَّـا أَنْ قَدْ وَجَدَ عَلَيْهِمَا، فَخَرَجَا فَاسْتَقْبَلَهُمَا هَدِيَّةٌ مِـنْ لَـبَنٍ إِلَـى رَسُـولِ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ)، فَأَرْسَلَ فِي آثَارِهِمَا، فَعَرَفَا أَنْ لَمْ يَجِدْ عَلَيْهِمَا}. {الحديث/ ٦٩٢. حيض}:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری جوولەکە وابوو: کە ژنیان دەکەوتـە بێنوێژییەوە، ئیتر پارێزیان لێ دەکردن و، نە لەگەڵیاندا نان و ئاویـان دەخـواردو، نـە لەماڵیشەوە لەگەڵیاندا دادەنیشتن، بەڵکوو جێیان لێ جیادەکردنەوە!

یارانی پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم بارەیەوە لێیان پرسی، جا خودا بۆ وەڵامی پرسیارەکەیان ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە:
{وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُواْ النِّسَاء فِي الْمَحِيضِ وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىَ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللّهُ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ – بقرة/٢/٢٢٢}.

واتاکەی لەسەرەتای ئەم باسەدا رابورد.

جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەگەڵ ژنەکانتانا، لەکاتی بێنوێژیدا، هەموو شتێ بکەن لەگەڵیانا، تەنیا چوونەلا نەبێ).

کاتێ جوولەکەکان ئەمەیان بیست، گوتیان: ئەم پیاوە (واتە: پێغەمبەر) دەیەوێ لەهەموو یاسایەکی ئێمەدا دژی ئێمە بوەستێ!).

جا ئوسەیدی کوڕی حوضەیرو عوببادی کوڕی بشیر، هاتن بۆ خزمەتی حەزرەتو ئەم باسەیان بۆ گێڕایەوەو گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆچی رێگەمان پێ نادەی، هەتا لەکاتی بێنوێژیدا بچینە لاشیانو دروست ببین لەگەڵیاندا؟! جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رووی گرژ کردو رەنگی گۆڕا، پرسیارەکەیانی پێ ناخۆش بوو، هەتا گومانمان برد کە حەزرەت لە دڵەوە لێیان زویر بووە، جا هەردووکیان هەڵسانو رۆیشتن، لەپاشا هەندێ شیریان بەدیاری هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وە حەزرەت هەندێ لەو شیرەی نارد بۆیانو خواردیانەوەو تێگەیشتن کە حەزرەت دڵی لێیان نەئێشاوە بەهۆی پرسیارەکەیانەوە). {تاج/١/١٥٩ ژ-٢٩٠ چ-٤} .

**١٢٨) چۆنێتی غوسڵ دەرکردنی ژن لەپاش بێنوێژیو لەشپیسی (٧٤٦ - ٧٥٠).**

**باب: صفةُ غسلِ المرأةِ مِنَ الحيضَةِ والجنابَة**

١٧٢- عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ أَسْمَاءَ (رَضِيَ اللَّهُ عنهما) سَأَلَتِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ غُسْلِ الْمَحِيضِ؟ فَقَالَ: « تَأْخُذُ إِحْدَاكُنَّ مَاءَهَا وَسِدْرَتَهَا، فَتَطَهَّرُ فَتُحْسِنُ الطُّهُورَ، ثُمَّ تَصُبُّ عَلَى رَأْسِهَا فَتَدْلُكُهُ دَلْكًا شَدِيدًا حَتَّى تَبْلُغَ شُئُونَ رَأْسِهَا، ثُمَّ تَصُبُّ

عَلَيْهَا الْمَاءَ، ثُمَّ تَأْخُذُ فِرْصَةً مُمَسَّكَةً فَتَطَهَّرُ بِهَا» فَقَالَتْ أَسْمَاءُ: وَكَيْفَ أَتَطَهَّرُ بِهَا؟ فَقَالَ: «سُبْحَانَ اللَّهِ تَطَهَّرِينَ بِهَا». فَقَالَتْ عَائِشَةُ: (كَأَنَّهَا تُخْفِي ذَلِكَ) تَتَبَّعِينَ أَثَرَ الدَّمِ، وَسَأَلَتْهُ عَنْ غُسْلِ الْجَنَابَةِ؟ فَقَالَ: « تَأْخُذُ مَاءً فَتَطَهَّرُ فَتُحْسِنُ الطُّهُورَ أَوْ تُبْلِغُ الطُّهُورَ، ثُمَّ تَصُبُّ عَلَى رَأْسِهَا فَتَدْلُكُهُ حَتَّى تَبْلُغَ شُئُونَ رَأْسِهَا، ثُمَّ تُفِيضُ عَلَيْهَا الْمَاءَ». فَقَالَتْ عَائِشَةُ: نِعْمَ النِّسَاءُ نِسَاءُ الأَنْصَارِ لَمْ يَكُنْ يَمْنَعُهُنَّ الْحَيَاءُ أَنْ يَتَفَقَّهْنَ فِي الدِّينِ} . {الحديث/ ٧٤٨. حيض. بخاري. تجريد/١/٢١٥، رقم: ٢٠٦ = ٣١٤، ٣١٥، ٧٣٥٧} :

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەسمائی کچی شەکەل، کە ژنێکی ئەنصاری بوو، لە پێغەمبەری پرسی، لەبارەی چۆنێتی خۆشۆردنی بێنوێژیی؟ فەرمووی: (هەرکامێکتان لە ئێوەی ژنان، هەرکاتێ کەویستی خۆی بشۆرێو لەشپیسی خۆی دەربکا، با لەپێشا ئاوو مۆردەکەی ئامادە بکاو خۆی پاك بکاتەوەو تاراتێ جوان بگرێ، ئینجا دەستنوێژێکی جوان بگرێ، ئینجا ئاو بکا بەسەر سەریاو دەستی تێ بخا، زۆر باش هەڵی بگلۆفێ تا ئاو دەگاتە بنی مووەکانی سەری، ئەو حەلە ئاو بکا بەسەر خۆیا سەراپا، ئینجا گوڵە لۆکەیەکی میسکاوی، یا گوڵێ خوری میسکاوی، یا پەڕۆیەکی پاکی بۆنخۆش بهێنێ خۆی پێ پاك بکاتەوەو تاراتی پێ بگرێ!).

ئەسمائیش باش تێ نەگەیشت، گوتی: چۆن چۆن خۆی پێ پاك بکاتەوەو تاراتی پێ بگرێ؟ فەرمووی: (سوبحانەڵلا سەیرە بۆ تێ ناگەی؟! خۆتی پێ پاك بکەرەوەو تاراتی پێ بگرەو تەواو).

عائیشەیش (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: منیش ئەسمام راکێشا بەلای خۆمەوە، کە کچی شەکل بوو، وە پێم گوت: وەرە من تێت دەگەیەنم: پەڕۆ بۆنخۆشەکە بهێنە بەشوێنی خوێنەکەداو، دایبنێ لەناو شەرمتا، تاناو گیانت بۆ ساردی لێ نەیێو بۆنی خۆش بێ.

لەکاتی ئەم قسانەدا، کە عائیشە دەیویست ئەسماء لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەر حاڵی بکا، بەچپە دوو بەدوو لەگەڵ ئەسمادا قسەی دەکرد، بەشێوەیێ کە هەر ئەسما گوێی لێ بێ، خەڵکەکەی تر قسە شەرماوییەکانی ئەوانی نەدەبیست.

لەگێڕانەوەیەکدا: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) سێجار فەرمووی: پارچەیەکی میسکاوی بێنەو، تاراتی پێ بگرە، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شەرم گرتیو رووی کرد بەولاوە، عائیشە دەیگوت: ژنگەلی یاریدەدەران (أنْصَار) ژنگەلی چاکن، ئافەریم بۆخۆیان! شەرمو شکۆ رێگەی ئەوەی لێ نەدەگرتن کە بۆخۆیان شارەزای ئایین بکەن). {تاج/١/١٦٢، زنجیرە: ٣٥، ژمارە: ١ — ش/د/ن}.

## ١٢٩) بەرماڵو جل وەرگرتن لە ئافرەتی بێنوێژ
## باب: مُنَاوَلَةُ الحائِضِ الخُمْرَةَ والثَّوْبَ

١٧٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ) قَـالَ: بَيْنَمَـا رَسُولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فِي الْمَسْجِدِ، فَقَالَ: « يَا عَائِشَةُ نَاوِلِينِي الثَّوْبَ ». فَقَالَتْ: إِنِّي حَائِضٌ. فَقَالَ: « إِنَّ حَيْضَتَكِ لَيْسَتْ فِي يَدِكِ ». فَنَاوَلَتْهُ. {الحديث/ ٦٨٩، ٦٨٧، ٦٨٨}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو مزگەوتا بوو، عائیشەیش لەناو هۆدەکەی خۆیدا بوو، کە دەرگای لەسەرماڵی مزگەوت بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ئەی عائیشە بەرماڵەکەم بدەرێ) یا فەرمووی: (جلەکەم بدەرێ). عائیشەیش فەرمووی: ئاخر چۆن دەبێ، خۆ من بێنوێژم چۆن دەست درێژبکەم بۆ ناو مزگەوت؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (قەیناکا، خۆ خوێنی بێنوێژییەکەت لەناو دەستتا نییەو دەستت پاکە، ئەگەر دەستیش درێژکەی بۆ ناو مزگەوتەکەو بەرماڵەکە بدەی بەمن قەیدی نییە) . جا منیش لەناو هۆدەکەی خۆمەوە دەستم درێژکرد بۆناو مزگەوتەکەو پۆشاکەکەم داپێی} . {تاج/١/١٥٩، زنجیرە: ٣٤، ژمارە: ٢٩١ ج/٤}.

## ١٣٠) سەر شانەکردنو سەر شۆردنی مێرد لەکاتی بێنوێژیدا. (٦٨٢ - ٦٩٢)
## باب: تَرْجِيلُ الحَائِضِ وَغَسْلُهَا رأسَ الرَّجُلِ

١٧٤- عَـنْ عَائِشَـةَ (رَضِـيَ اللّـهُ عنهـا) قَالَـتْ: إِنْ كُنْـتُ لأَدْخُـلُ الْبَيْـتَ لِلْحَاجَـةِ، وَالْمَرِيضُ فِيهِ، فَمَا أَسْأَلُ عَنْهُ إِلاَّ وَأَنَا مَارَّةٌ، وَإِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ)

لَيُدْخِلُ عَلَىَّ رَأْسَهُ وَهُوَ فِى الْمَسْجِدِ فَأُرَجِّلُهُ، وَكَانَ لاَ يَدْخُلُ الْبَيْتَ إِلاَّ لِحَاجَةٍ، إِذَا كَانَ مُعْتَكِفًا}. {الحديث/ ٦٨٣. حيض. تجريد البخاري: ٩٢٨ = ٢٠٢٩، ٢٠٣٣، ٢٠٣٤، ٢٠٤١، ٢٠٤٥}:

**عائیشه** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: جاری وادەبوو خۆم لەناو مزگەوتا خەڵوەم دەکێشا، کە لە زاراوی شەرعی پیرۆزدا پێی دەگوترێ: (إعتكاف)، جا بۆ کاروباری تایبەت دەچوومەوە بۆ ماڵەوەم، بەڵام زۆر بە پەلە کارەکەمم ئەنجام دەداو دەگەڕامەوە بۆ مزگەوت، تەنانەت ڕێ دەکەوت: نەخۆشی لێ بوو، هەواڵپرسی دوورو درێژم لەگەڵ ئەنجام نەدەدا، بەڵکوو هەر بەدەم ڕێگەوە، بەسەر پێوە هەواڵم دەپرسی‌و بەس، یەکسەر دەگەڕامەوە بۆ خەڵوەگاکەم لە مزگەوت.**

**هەروا عائیشە دەفەرموێ: جاران پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **کە لەناو مزگەوتا خەڵوەی دەکێشا، لە دەرگای هۆدەکەی خۆمەوە، کە لەسەر ماڵی مزگەوتا بوو، من لەناو هۆدەکەی خۆمدا بووم، لەسەر ئەو حاڵە قژە سەریم شانە دەکرد، وە حەزرەت** (دروودی خودای لەسەر بێ) **بۆ سەراویش نەبوایە، لەکاتی خەڵوە کێشانا، نەدەهاتەوە بۆ ماڵەوە}. {تاج/٢/١٤٦، زنجیرە: ٧٥، ژمارە: ١٤٦٣ ج/٤ — ش/د/ت/ن}. {بڕوانە: ژمارە: ١٧٧ لە زنجیرە: ١٣٤دا، کە لەدوا دوو فەرموودەی تردێ}.**

## ١٣١) سەرکردنە سەر ڕانی ژنی بێنوێژو قورئان خوێندن لەکاتی وادا.
## باب: الإتِّكَاءُ فِي حِجْرِ الحائضِ والقراءة

١٧٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِىَ اللّهُ عنها) أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَّكِئُ فِى حِجْرِى وَأَنَا حَائِضٌ، فَيَقْرَأُ الْقُرْآنَ}. {الحديث/ ٦٩١. حيض. تجريد البخاري: ٢٠٠ = ٢٩٧، ٧٥٤٩ فتح الباري شرح صحيح البخاري}:

**عائیشه** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: جاری وا دەبوو، پێغەمبەری خوا،** (دروودی خودای لەسەر بێ) **سەری لەسەر کۆشم دادەنا، لەوکاتەدا من بێنوێژ بووم، وە لەسەر ئەو حاڵە قورئانی دەخوێند}.**

### ١٣٢) خەوتن لەگەڵ ژنی بێنوێژدا لەیەك پێخەفدا (٦٨٠ - ٦٨١).
### باب: النوم مع الحائض في لحاف واحد

١٧٦- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها) قَالَتْ: بَيْنَمَا كُنْتُ مُضْطَجِعَةٌ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِى الْخَمِيلَةِ، إِذْ حِضْتُ فَانْسَلَلْتُ، فَأَخَذْتُ ثِيَابَ حَيْضَتِى، فَقَالَ لِى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَنُفِسْتِ؟» قُلْتُ: نَعَمْ، فَدَعَانِى فَاضْطَجَعْتُ مَعَهُ فِى الْخَمِيلَةِ. قَالَتْ: وَكَانَتْ هِىَ وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَغْتَسِلاَنِ فِى الإِنَاءِ الْوَاحِدِ مِنَ الْجَنَابَةِ). {الحديث/ ٦٨١. تجريد البخاري/١/٢١١، رقم: ٢٠١ = ٢٩٨، ٣٢٢، ٣٢٣، ٩٢٩}:

ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لە هەموو هاوسەرە پاکیزەکانی)، دیارە کە ئوم سەلەمە یەکێکە لە دایکانی موسوڵمانان، فەرمووی: جارێ لەگەڵ پێغەمبەردا، لەژێر جاجمێکا، یا لەژێر پۆپە شمینێکی بازوودا ڕاکشابووم، لەناکاو لەوکاتەدا کەوتمە بێنوێژیی، ئیتر گورج خۆم لەژێر پێخەفەکە دزییەوەو، چووم خۆم گۆڕیو جلی بێنوێژییەکەمم لەبەرکرد، فەرمووی پێم: (ئەوە تێکەوتیت؟) گوتم: بەڵێ. ئەوجا بانگی کردمەوە لەگەڵیا لەژێر لێفەکەدا ڕاکشامەوە.

فەرمووی: زۆرجار وادەبوو کە منو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێکەوە، لەیەك دەفر، غوسڵی لەشپیسیمان دەردەکرد.

### ١٣٣) خۆتێکەڵ کردن لەگەڵ هاوسەری بێنوێژدا لەسەر پەردەوە (٦٧٧ - ٦٧٩).
### باب: مباشرة الحائض فوق الإزار

١٧٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها) قَالَتْ: كَانَ إِحْدَانَا إِذَا كَانَتْ حَائِضًا، أَمَرَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ تَأْتَزِرَ فِى فَوْرِ حَيْضَتِهَا، ثُمَّ يُبَاشِرُهَا، قَالَتْ وَأَيُّكُمْ يَمْلِكُ إِرْبَهُ كَمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَمْلِكُ إِرْبَهُ. {الحديث/ ٦٧٨. تجريد البخاري/١/٢١٢ = ٣٠٢، ٣٠٣، ٢٠٣٠}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لە پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەوبێ)، فەرمووی: ئەگەر یەکێ لە ئێمەی هاوسەرانی پێغەمبەر، بێنوێژ بوایە،

تەنانەت ئەگەر لە گەرمەی بێنوێژیشدا بوایە، ئەگەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیویستایە لەوکاتی بێنوێژییەدا، دەستی لەگەڵ تێکەڵ بکا، فەرمانی پێدەدا، بەرکۆشێکی دەدا بە نێوانی ناوکیو ئەژنۆیدا، ئەوجا لەسەر ئەو بەرکۆشەوە دەستی بۆی دەبردو لەگەڵیدا خۆی تێکەڵ دەکردو خۆشی لێ وەردەگرت، تارادەی رەحەتبوون، بەڵام بەبێ دروستبوونو تێخستن. عائیشە فەرمووی: بەڵام کێ لە ئێوە دەتوانێ، لەکاتی وا ناسکا، یارۆی خۆی بۆ زەوت بکرێ، وەك پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) یارۆی خۆی بۆ زەوت دەکراو لە جێگەی حەرام کە دامەنو شەرمگایە، دەیپاراست}.

## ١٣٤) خواردنو خواردنەوە، لەگەڵ ژنی بێنوێژدا لەیەك دەفر
## باب: الشرب مَعَ الحائضِ منَ الإناءِ الواحد

١٧٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عنها) قَالَتْ: كُنْتُ أَشْرَبُ وَأَنَا حَائِضٌ ثُمَّ أُنَاوِلُهُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَيَضَعُ فَاهُ عَلَى مَوْضِعِ فِيَّ، فَيَشْرَبُ، وَأَتَعَرَّقُ الْعَرْقَ وَأَنَا حَائِضٌ، ثُمَّ أُنَاوِلُهُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَيَضَعُ فَاهُ عَلَى مَوْضِعِ فِيَّ}. {الحديث/ ٦٩٠}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: جاری وا دەبوو، لەقاپێ ئاوم دەخواردەوە، لەوکاتەدا لە بێنوێژیدا بووم، ئەوجا قاپەکەم دەدا بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لێی وەردەگرتم، ئەویش لەهەمان قاپی دەخواردەوە، تەنانەت جاری وا دەبوو، دەمی دەنا بە شوێن دەمەکەی منەوەو ئاوەکەی دەخواردەوە، گەلێ جاریش گرتکە گۆشتم دەکرانەوەو چەند قەپێکم لێ دەخواردو ئەوجا دەمدا بە پێغەمبەر، ئەویش لەجێ قەپەکانی منەوە بەدەم دەیکرِاندەوە}.

## ١٣٥) نوێژی ژنی هەمیشە بێنوێژ (٧٥١ - ٧٥٨).
## باب: فِي المُسْتَحاضَةِ وَصلاتِها

١٧٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عنها) قَالَت: اسْتَفْتَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ بِنْتُ جَحْشٍ (رَضِيَ اللَّهُ عنها) رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَتْ: إِنِّي أُسْتَحَاضُ؟ فَقَالَ: «إِنَّمَا ذَلِكِ عِرْقٌ فَاغْتَسِلِي ثُمَّ صَلِّي»، فَكَانَتْ تَغْتَسِلُ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ. قَالَ اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ: لَمْ يَذْكُرِ

ابْنُ شِهَابٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَمَرَ أُمَّ حَبِيبَةَ بِنْتَ جَحْشٍ (رَضِـىَ اللّـهُ عنها) أَنْ تَغْتَسِلَ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ، وَلَـكِنَّهُ شَيْءٌ فَعَلَتْهُ هِيَ}. {الحديث/ ٧٥٣}:

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئوم حەبیبەی کچی جەحش، کە ژنخوشکی پێغەمبەر بوو، لە وەختو ناوەختا دەکەوتە سەر خوێنی بێنوێژیی، هات داوای فەتوای لە پێغەمبەر کرد، عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! من هەمیشە بێنوێژم، چارم چییە؟

فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەوە بێنوێژیی نییە، بەڵکوو هەمیشە بێنوێژییە، حەیز نییە، إستحاضەیە، چونکە ئەوە رەگێکی تایبەتە خوێنی بەربووە، کەواتە هەرکاتێ بەپێی ئەو بەڵگەو نیشانانەی کە بۆماوەی بێنوێژیی ژنی هەمیشە بێنوێژ دانراون، هەرکاتێ بەپێی ئەو بەڵگەو نیشانانە، زانیت کە واماوەی بێنوێژییەکەت تەواو بووە ئیتر خۆت بشۆرەو لەشپیسی خۆت دەرکەو، ئیتر نوێژەکانت بەئەدا بە رێکوپێکی بکە).

ئیتر ئوم حەبیبە بۆ هەموو نوێژێکی فەرز، لەکاتی کردنی ئەو نوێژەدا، لەپێش کردنەکەیدا غوسڵێکی دەکرد.

لەیثی کوڕی سەعد، کە مامۆستای مامۆستاکەی شێخی بوخارییە، کە ئەم فەرموودەیە لە ئیبنو شەهابەوە دەگێڕێتەوە، ئەویش لە عورووەوە دەیگێڕێتەوە، عورووەیش لە عائیشەی پووریەوە دەیگێڕێتەوە، ئەم لەیثی کوڕی سەعدە دەفەرموێ: ئیبنو شەهاب باسی ئەوەی بۆمن نەکردووە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بە ئوم حەبیبەی کچی جەحش کردبێ، کە بۆ هەموو نوێژێ خۆی بشۆرێ، بەڵام ئەمە شتێ بوو کە ئوم حەبیبە خۆی دەیکرد}. {بڕوانە: بەرگی/١ تاج. زنجیرە: ٣٦، ٣٧، ٣٨}.

**١٣٦) ژنی بێنوێژ نوێژ ناکا لەکاتی بێنوێژییەکەیداو لەوەدواش نایگێڕێتەوە، لەوکاتەدا ڕۆژووش ناگرێ، بەڵام دەبێ لەوەدوا بیگێڕێتەوە.** (٧٥٨ - ٧٦١)

١٨٠- عَنْ مُعَاذَةَ قَالَتْ سَأَلْتُ عَائِشَةَ، فَقُلْتُ: مَا بَالُ الْحَائِضِ تَقْضِي الصَّوْمَ وَلاَ تَقْضِي الصَّلاَةَ، فَقَالَتْ: أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ؟! قُلْتُ: لَسْتُ بِحَرُورِيَّةٍ، وَلَكِنِّي أَسْأَلُ، قَالَتْ: كَانَ يُصِيبُنَا ذَلِكَ، فَنُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّوْمِ، وَلاَ نُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّلاَةِ}. {الحديث/ ٧٦١. تجريد البخاري/١/٢١٩، رقم: ٢٠٩ = ٣٢١ فتح الباري}:

موعازە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە عائیشەم پرسی: گوتم: بۆچی ژنی بێنوێژ ڕۆژووی ڕەمەزان دەگرێتەوە لەوەدوا، کەچی نوێژە فەرزەکان، هی کاتی بێنوێژییەکەی لەوەدوا ناگێڕێتەوە؟! فەرمووی: بۆ تۆویش حەرووریيەیتو لەو خەواریجانەی کە دەڵێن: دەبێ ژن نوێژی کاتی بێنوێژیش وەك ڕۆژوو بگێڕێتەوە؟ گوتم: نەخەیر، من لەوان نیم، بەڵام پرسیارەو دەیکەم، فەرمووی: چونکە جاران بە سەرینیی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەکەوتینە بێنوێژییەوە، لەپاش پاکبوونەوەو خۆشۆردن، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێمان دەکرد کە ڕۆژوو بگرینەوە، بەڵام نوێژ نەگێڕینەوە} . {بڕوانە: تاج/١/١٦٣، زنجیرە: ٣٥، ژمارە: ٣٢٩٩ ج٤ — ش/د/ت/ن} .

**ڕوونکردنەوە:**

موعازەی کچی عەبدوڵڵای عەدەوییە، کە ناسراوە بە ئوم صەهبائی بەصرییە، ژنی ئەصیلەی کوڕی ئەشیەم بوو، لە پەیڕەوانە، واتە: تابیعییە، گێڕانەوە لە عائیشەو عەلیو کەسانی ترەوە ئەنجام دەدا، لەشەش کتێبەکەدا، کە ناودارن بە کوتوبی سیتتە گێڕانەوەی هەیە، کە ئەم کتێبانەن: بوخاریو موسلیمو ئەبو داوودو تەرمەزیو نەسائیو ئیبنو ماجە، ئەمانەیش لەوەوە گێڕانەوەی فەرموودەیان لەوەوە ئەنجام داوە: ئەبو قەلابەو قەتادەو یەزیدی ڕەشكو ئەییوبو عاصمی ئەحوەلو کەسانی تریش.

ژنێکی متمانە پێکراو بوو، یەکێ بوو لە فەرموودە زانە گەورەکان، واتە: حوججە بوو لە بابەتی فەرموودەدا، ژنێکی زۆر خوا پەرست بوو، دەڵێن: لەپاش

مردنی ئەبو صەهبای مێردی لەناو نوێنا نەخەوتووەو لەسەر قاڵیو دۆشەك دانەنیشتووە هەتا مردووە. ئەبو بشیر، کە خوا ناسێکی بەصرەییە، دەڵێ: چووم بۆ سەردانی خاتوو موعازە، فەرمووی: سکم دێشێ، دەڵێن: نەبیزی جەڕ (خۆشاوی کووپەڵە) دەرمانی ئەم ژانە سکەی تۆیە. منیش چووم پڕ قاپێکم لەو خۆشاوە بۆ هێنا، ئەویش لەلای خۆیا داینا و فەرمووی: (خودایە! خۆت ئاگات لێیەتی، کە من لە عائیشەی هاوسەری پێغەمبەرەوە ئەم حەدیثەیەم گێڕاوەتەوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەیی کردووە لە نەبیزی جەڕە، خودایە ئەگەر ڕاستم کردووە لە گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیەدا، ئەم خۆشاوەم لە کۆڵ بخەیتو کارێکی وابکەیت کە نەیخۆمەوە بۆ ئەم ژانە سکە!

ئەبو بشیر فەرمووی: جاهەر لەخۆیەوە قاپەکە قلپەوە بوو، خۆشاوەکە هەمووی ڕژا، خودا سك ئێشەکەی لە کۆڵ خستو ژانەکەی نەما.

ئیمامی زەهەبی دەفەرموێ: موعازە بە شەو هەر خەریکی شەو نوێژو تاعەت بوو، وە دەیفەرموو: سەرم سوڕدەمێنێ، لەچاوێ کە بە شەو دەخەوێ، ئیبنو جەوزی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ساڵی هەشتاو سێی کۆچی، مەرگی بەهەقی بەجێهێناوە.

## ١٣٧) پێنج ڕەفتارە سروشتیەکان. (٥٩٦ - ٦٠٤).

## باب: خَمْسٌ مِنَ الفِطْرَةَ

١٨١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِي (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «الْفِطْرَةُ خَمْسٌ، أَوْ خَمْسٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: الْخِتَانُ وَالاسْتِحْدَادُ وَتَقْلِيمُ الأَظْفَارِ وَنَتْفُ الإِبْطِ وَقَصُّ الشَّارِبِ». {الحديث/ ٥٩٦: بخاری. لباس: ٥٨٨٩، ٥٨٩١، ٦٢٩٧. رياض الصالحين/٣/١٤٣، رقم: ٨/١٢٠٨}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەم پێنجە لە سروشتی پاکن: خۆسوننەتکردن، بەرتاشین، نینۆك کردن، هەڵکێشانی مووی بنباڵ، بەرسمێڵ کردنو قرتاندنی مووی سمێڵ).

## ١٣٨) ئەم دە شتە لە سروشتە پاکەکانن. (٥٩٦ - ٦٠٤).
## باب: عشرٌ من الفطرَة

١٨٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها)، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « عَشْرٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: قَصُّ الشَّارِبِ، وَإِعْفَاءُ اللِّحْيَةِ، وَالسِّوَاكُ، وَاسْتِنْشَاقُ الْمَاءِ، وَقَصُّ الأَظْفَارِ، وَغَسْلُ الْبَرَاجِمِ، وَنَتْفُ الإِبْطِ، وَحَلْقُ الْعَانَةِ، وَانْتِقَاصُ الْمَاءِ، قَالَ زَكَرِيَّا: قَالَ مُصْعَبٌ: وَنَسِيتُ الْعَاشِرَةَ إِلاَّ أَنْ تَكُونَ الْمَضْمَضَةَ. زَادَ قُتَيْبَةُ: قَالَ وَكِيعٌ: انْتِقَاصُ الْمَاءِ يَعْنِي الاِسْتِنْجَاءَ}. {الحديث/ ٦٠٣. رياض الصالحين/٣/١٤٥، رقم: ١٢٠٤/٩} :

**عائیشه** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (ئەم دە شتە رەوشتێکی سروشتینو لەبەر کۆنیو لەمێژیی خۆیان، دەڵێی خوویەکی زکماکینو سوننەتی هەموو پێغەمبەرانو پەسەندی هەموو ئاینێکن: یەکەم: بەرسمێڵ کردنو قرتاندنی مووی سمێڵ، دووەم: ریش هێشتنەوە، سێیەم: سیواك کردنو فرچە کردنی دەمو ددان، چوارەم: ئاو لە لووت رادان، پێنجەم: نینۆك کرتاندن، شەشەم: شۆردنی لۆچی سەر جمگەو گرێ پەنجەکانو جێی لۆچاوی لەش، وەك دەوروبەری گوێو چاڵی چەناگەو ناوك، حەوتەم: هەڵکێشانی مووی بنباڵ، هەشتەم: تاشینی مووی بەر، نۆیەم: تاراتگرتن بەئاو، واتە: خۆشۆردن بە ئاو لەپاش سەرئاو کردن. زەکەریا فەرمووی: موصعەب (کە یەکێکە لە گێڕەوەکانی ئەم فەرموودەیە) فەرمووی: دەهەمیانم لەیاد نەماوە، مەگەر ئاو لەدەم وەردان بێ. قوتەیبەیش فەرمووی: مەبەست لە (انتقاص الماء) (إستنجاء)ە، کە ئیستینجایش بەواتا: تاراتگرتنە بەئاو).**

## ١٣٩) سیواك لەپێشدا دەدرێتە دەست کەسی بەتەمەنتر

١٨٣- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «أَرَانِي فِي الْمَنَامِ أَتَسَوَّكُ بِسِوَاكٍ، فَجَذَبَنِي رَجُلاَنِ أَحَدُهُمَا أَكْبَرُ مِنَ الآخَرِ، فَنَاوَلْتُ السِّوَاكَ الأَصْغَرَ مِنْهُمَا فَقِيلَ لِي: كَبِّرْ، فَدَفَعْتُهُ إِلَى الأَكْبَرِ». {الحديث/ ٧٤٣٣، ٥٨٩٢. تجريد البخاري/١/١٩٤، رقم: ١٧٧ = ٢٤٦ فتح الباري} :

ئیبنو عومەر (ڕەزاو ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) فەرمووی: سەروەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەخەوما دیتم کەوا بەدار سیواکێ سیواك دەکەم، دوو پیاو هاتن بۆلام، یەکێکیان لەویتریان، بە تەمەن گەورەتر بوو، هەریەکەیان بۆلای خۆی رامی دەکێشا، منیش ویستم دار سیواکەکە بدەم بە بچکۆلەکەیان، کەچی پێم گوترا: گەورەکەیان وەپێشخە، منیش وامکردو سیواکەکەم دا بە گەورەکەیان). {تاج/١٨/٨، زنجیرە: ٥، ژمارە: ٤٢٥٩ چ-٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

بەپێی ئەدەبی ئایینی، هەرچی لە بابەتی ڕێزو پیرۆزی بێ، دەبێ گەورە لە بچووك پێش بخرێ، لای ڕاست پێش لای چەپ بخرێ، وەك سڵاوو ڕۆژباشیو تەوقە کردنو خواردنەوەو بۆنی خۆشو سواریو چوونە ناو مزگەوتو شتی تری لەم بابەتانە، وەك چوونە ژوورەوەو دەرچوونو کاتی ڕۆیشتن.

**١٤٠) سمێڵ تەواو کورت بکەنەوەو ڕیش بهێڵنەوە.** (٥٩٦ - ٦٠٤).

**بَابٌ: أحْفُوا الشَّوَارِبَ وَأعْفُوا اللحى**

١٨٤- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) عَنْ النَّبِّي (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «خَالِفُوا الْمُشْرِكِينَ، وَفِّرُوا اللِّحى وَأحْفُوا الشَّوَارِبَ». {الحديث/ ٦٠١. مسلم. تجريد البخاري/٥/١٩٤، رقم: ١٩٠٤ = ٥٨٩٢ فتح الباري}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بە پێچەوانەی بت پەرستانو فرە خوا پەرستان بکەن، بەم ڕەنگە ئێوە بە پێچەوانەی ئەوانەوە ڕیش تەواو بهێڵنەوەو سمێڵ تەواو کورت بکەنەوە). {تاج/٤، لاپەڕە: ١٣٧، زنجیرە: ٤٢ ژ-٢٨٥٨— ش/د/ت/ن}.

١٨٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: وُقِّتَ لَنَا فِي قَصِّ الشَّارِبِ، وَتَقْلِيمِ الأَظْفَارِ، وَنَتْفِ الإِبْطِ، وَحَلْقِ الْعَانَةِ أَنْ لاَ نَتْرُكَ أَكْثَرَ مِنْ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً). {الحديث/ ٥٩٨}:

**ئەنەسی کوڕی مالیك** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرموی: بۆ قرتاندنی مووی سمێڵو کردنی ناخونو هەڵکەندنی مووی بنباڵو تاشینی مووی بەر، لەلایەنی پێغەمبەرەوە، کاتمان بۆدانراوە: کە لەچل شەو زیاتر دوایان نەخەین!).**
**{تاج/١٣٨/٤، زنجیرە: ٤٢، ژمارە: ٢٨٦٠/٤ — م/د/ت/ن}.**

## ١٤١) شۆردنی میزی ناو مزگەوت. (٦٥٧ - ٦٥٩).

## بابٌ: غَسْلُ البَوْلِ فِي المَسْجِدِ

١٨٦- عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ فِي الْمَسْجِدِ، مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذْ جَاءَ أَعْرَابِيٌّ فَقَامَ يَبُولُ فِي الْمَسْجِدِ، فَقَالَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): مَهْ مَهْ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « لاَ تُزْرِمُوهُ دَعُوهُ » فَتَرَكُوهُ حَتَّى بَالَ، ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دَعَاهُ فَقَالَ لَهُ: « إِنَّ هَذِهِ الْمَسَاجِدَ لاَ تَصْلُحُ لِشَيْءٍ مِنْ هَذَا الْبَوْلِ وَلاَ الْقَذَرِ، إِنَّمَا هِيَ لِذِكْرِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، وَالصَّلاَةِ وَقِرَاءَةِ الْقُرْآنِ» أَوْ كَمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). قَالَ: فَأَمَرَ رَجُلاً مِنَ الْقَوْمِ، فَجَاءَ بِدَلْوٍ مِنْ مَاءٍ فَشَنَّهُ عَلَيْهِ}. {الحديث/ ٦٥٩. تجريد البخاری/١/١٨٢. رقم: ١٦١ = ٢٢٠، ٦١٢٨ فتح الباری}:

**ئەنەسی کوڕی مالیك** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرموی: جارێ لەخزمەتی پێغەمبەردا بووین،** (دروودی خودای لەسەر بێ)**، لەناو مزگەوتەکەی پێغەمبەر، لە مەدینە، لە خزمەتیدا دانیشتبووین، لەناکاوا عەرەبێکی دەشتەکی هات، هەڵسا لەناو مزگەوتەکەدا، لەبەرچاوی ئێمە بەپێوە راوەستاو دەستی کرد بەمیزکردن!**

**هاوڕێیانی پێغەمبەریش** (دروودی خودای لەسەر بێ) **تێیان خوڕی: کوڕە! نەکەی، کوڕە! نەکەی. پێغەمبەریش** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (میزەکەی پێ مەبڕن، وازی لێ بێنن، با میزەکەی تەواو بکا).**

**ئەوانیش وازیان لێ هێنا هەتا میزەکەی تەواوکرد. ئەوجا پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **کابرای میزکەری بانگ کرد بۆلای خۆیو پێی فەرموو: (مزگەوت خانەی خودایە، جێگەی پاكو خاوێنییە، جێگەی میز لێکردنو هیچ جۆرە پیسییەکی تر**

نییـه، بەڵـكوو جێـگای زیكـرو یـادی خـودای گـەورەو سـەروەرە، جێـگای نوێـژزە، جێگەی قورئان خوێندنو شتی وا پیرۆزە).

فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) یا ئاوای پێ فـەرموو، یـا فەرمایشتێـكی تری ئاوای پێ فەرموو. فەرمووی: ئەوجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی كـرد بـە پیـاوێ، سـەتڵێ ئـاوی هێنـا، بـەرە بـەرە كـردی بەسـەر جێ میزەكـەی كابرادا). {تاج/١٠/١١٠، زنجیره: ٢٣ تاج-٥ چ-٤ ز-٢٣— ش/د/ت/ن}.

**روونكردنەوە:**

١- راگرتنـی پـاكو خـاوێنی مزگـەوت، گسـكدانو پاككردنـەوەی لەهـەموو جـۆرە پیسییەك، مزگەوت جێـگەی خوا پەرستیو یـادو زیكری خوداو دەورو دەرسـی قورئـانو سـوننەتو زانسـتە شـەرعییەكانە، دەسـت نـادا بـۆ شـتی تـر، وەك شـتی پیسو كاری ناشەرعیو ناڕەوایی، نەرمو نیانی لەگەڵ نەزانو نەفامو ئـەم جـۆرە كەسانەدا، كارێـكی زۆر پەسـەند، خـراپیش پلـە پلەیـە، كەواتـە: رێـگە بـەكردنی خراپ دەدرێ، هەتا خراپتر روونەدات، كەشتی وا لەشەرعا پێی دەگوترێ: دەفعی ئەقبەح بە قەبیح.

٢ -لە تەدریبی راویدا، بەرگی/١، لاپەڕە: ٥٣٨. دەفەرموێ: (وَيَنْبَغِي لِلـراوي بـالمَعْنَى أنْ يَقُولَ عُقَيْبَهُ: أوْ كَمَا قَال، أوْ نَحْوَهُ، أوْ شِبْهَهُ، أوْ مَا أشْبَهَ هذا مِنَ الألْفَـاظِ): واتـە: بـۆ كەسێ فەرموودەكـە، بەمـەعنا ریوایـەت دەكـا، دەبـێ یەكسـەر لەدوایـەوە بڵـێ: پێغەمبەر یا ئاوای فەرموو، وەك ئەمەی كە ئێستا من گێڕامەوە، یا شتێـكی تـری ئاوای فەرموو، كە ئەمە واتاكەی بوو!).

**١٤٢) ئاو پڕژاندن لە میزی منداڵ بەجلو بەرگەوە.** (٦٦٠ - ٦٦٥).

**باب: نَضْحِ بَوْلِ الصَّبِيِّ مِنَ الثَّوْبِ**

١٨٧- عَنْ أمِّ قَيْسٍ بِنْتَ مِحْصَنٍ (رَضِيَ اللّهُ عنها)، أنَّهَا أتَتْ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِابْنٍ لَهَا لَمْ يَبْلُغْ أنْ يَأكُلَ الطَّعَامَ، قَالَ عُبَيْدُ اللّهِ: أخْبَرَتْنِي أنَّ ابْنَهَا ذَاكَ بَالَ فِي حِجْرِ رَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَدَعَا رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ)

بِمَاءٍ فَنَضَحَهُ عَلَى ثَوْبِهِ وَلَمْ يَغْسِلْهُ غَسْلاً}. {الحديث/ ٦٦٥. تجريد/١/١٨٣، رقم: ١٦٢ = ٢٢٣، ٥٦٩٣}:

ئوم قەیسی کچی میحصەن (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کوڕێکی کورپەم هەبوو، نانە خۆرە نەبوو بوو، بۆ موبارەکی‌و پیرۆزی بردم بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە کۆشی خۆیدا داینیشاند، منالەکە میزی کرد بە جلەکانیدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داوای ئاوی کردو ئاوەکەی لە جلەکەی پرژاند، ئیتر نەیشۆرد). {تاج/١/١١١/٤ ژ-١٦٦ چ-٤- ش/د/ت/ن}.

**ڕوونکردنەوە:**

ئوم قەیس خوشکی وەکاشەی کوڕی میحصەنە، لە موسوڵمانە پێشینەکانە، لە مەککە ئیسلام بووە، وە کۆچی کردووە بۆ مەدینە، بیست‌و چوار فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، لە صەحیحەیندا دوو فەرموودەی هەیە، زۆر تەمەن درێژ بووە، ئیمامی نەسائی، بەڕشتەی خۆی دەگێڕێتەوە کە ئوم قەیس دەفەرمویٚ: کوڕێکم مرد، زۆر بۆی پەرۆش بووم، بە مردوو شۆرەکەم گوت: تەرمی کوڕەکەم بە ئاوی سارد مەشۆرە دەیکوژیت، وەکاشەی برام ئەمە دەگێڕێتەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمویٚ: (ئەوە چییەتی وادەکا، تەمەنی درێژبێ). ئەبولحەسەن کە ئەم فەرموودەیە لە ئوم قەیسەوە دەگێڕێتەوە، دەفەرمویٚ: بە پیرۆزیی ئەو نزایەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ژنێکی تر گومان نابەم کە بەقەد ئەو تەمەن درێژبێت).. {بڕوانە: تەجریدی بوخاری/١٦٨/٥، ژمارە: ١٨٧٦ = ٥٧٠٥و ئەترافەکانی: ٣٤١٠، ٥٧٥٢، ٦٤٧٢، ٦٥٤١ فەتحولباری}.

**١٤٣) شۆردنی تۆماوی پیاو بەجلەوە.** (٦٦٦ - ٦٧٢).

**باب: غَسْلُ المَني مِنَ الثَّوْب**

١٨٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شِهَابٍ الْخَوْلاَنِيِّ قَالَ: كُنْتُ نَازِلاً عَلَى عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها)، فَاحْتَلَمْتُ فِي ثَوْبَيَّ، فَغَمَسْتُهُمَا فِي الْمَاءِ، فَرَأَتْنِي جَارِيَةٌ لِعَائِشَةَ، فَأَخْبَرَتْهَا، فَبَعَثَتْ إِلَيَّ عَائِشَةُ فَقَالَتْ: مَا حَمَلَكَ عَلَى مَا صَنَعْتَ بِثَوْبَيْكَ؟ قَالَ: قُلْتُ: رَأَيْتُ مَا يَرَى

النَّائِمُ فِى مَنَامِهِ، قَالَتْ: هَلْ رَأَيْتَ فِيهِمَا شَيْئًا؟ قُلْتُ: لاَ، قَالَتْ: فَلَوْ رَأَيْتَ شَيْئًا غَسَلْتَهُ؟ لَقَدْ رَأَيْتُنِى وَإِنِّى لأَحُكُّهُ مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَابِسًا بِظُفُرِى}. {الحديث/ ٦٧٢}:

عەبدوڵڵای کوڕی شەهابی خەولانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەلای عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) میوان بووم، دوو لۆ جلم لەبەردا بوو، لەخەوا شەیتانی بووم، هەردوو جلەکەمم هەڵکێشا لە ئاوو شۆردمن، کارەکەرێکی عائیشە، ئەم حاڵی جل شۆردنەی من دەبینێ، وە دەچێ هەواڵی ئەمە دەدا بە عائیشە، عائیشە ناردی بەشوێنما، چووم بۆلای، فەرمووی: خێربوو وا جلەکانی خۆتت شۆردووە، هۆی ئەوە چی بوو؟ منیش گوتم: لەخەوا شەیتانی بووم، کەشتی وا بۆ نووستوو کارێ ئاساییە کە جلەکەی بشوات. عائیشە فەرمووی: ئایا تۆماوت بەو دوو جلەوە بینی؟ گوتم: نەء. فەرمووی: گریمان ئەگەر تۆماویان پێوە بوایە باوەڕت وابوو کە تۆماوەکە پیسەو لەبەرئەوە پێویستە جلەکان بشۆرێن و لەبەرئەوە دەتشۆرین؟ چۆن شتی وا دەکەیت و کەی شتی وا پیسە، لە کاتێکا کە من بەخودی خۆم تۆماوم دەدی بەجلەکەی پێغەمبەرەوە، کە وشکەوە بوو بوو بە نینۆك دەمکرِان و ئیتر نەیم دەشۆرد، پێغەمبەریش بەوە ئیکتیفای دەکردو فەرمانی نەدەکرد کە بیشۆرین، کەواتە: تۆماو پاکە).

## ١٤٣) شۆردنی خوێنی بێنوێژیی بە جلوبەرگەوە. (٦٧٣ - ٦٧٤).

## باب: غسل دَمِ الحَيْضَةِ مِنَ الثَّوْبِ

١٨٩- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ (رَضِىَ اللَّهُ عنهما) قَالَتْ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِىِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَتْ: إِحْدَانَا يُصِيبُ ثَوْبَهَا مِنْ دَمِ الْحَيْضَةِ كَيْفَ تَصْنَعُ بِهِ؟ قَالَ: «تَحُتُّهُ، ثُمَّ تَقْرُصُهُ بِالْمَاءِ، ثُمَّ تَنْضَحُهُ، ثُمَّ تُصَلِّى فِيهِ». {الحديث/ ٦٧٣. تجريد البخاري/١/ ١٨٥، رقم: ١٦٤ = ٢٢٧ طرفه في: ٣٠٧}:

ئەسمای کچی ئەبوبەکر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ژنێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: ئەگەر خوێنی بێنوێژی بەر جلەکانمان

کەوت چی لێ بکەین؟ فەرمووی: (بی وولێنو بی کرێننو ئەوجا بە ئاو هەڵی گوڵۆفنو دەستی تێ بخەن، لەپاشا پاك بیشۆرن، ئیتر نوێژی پێوە بکەن). {تاج/١/١١٠، زنجیرە: ٢٣، ژمارە: ١٦٣ — ش/د/ت/ن}.

**ڕوونکردنەوە:**

ئەسماء کچی ئەبوبەکری صدیقە، خوشکی باوکی عائیشەی هاوسەری پێغەمبەرە، خوشکی دایكو باوکی عەبدوڵلای کوڕی ئەبوبەکرە، ژنی حەزرەتی زوبەیرە، (بڕوانە ژمارە: ٨)، ناودارە بە (ذات النِّطَاقين) لەپێش کۆچدا بە بیستو حەوت ساڵ لەدایك بووە، هەژدەهەم کەس بووە کە موسوڵمان بووە، پەنجاو شەش فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) هەژدە فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە، هەژدەیشی لە موسلیمدا هەیە، چواردەیان پەسەندی هەردوو لایە، کەواتە سەرجەمی فەرموودەکانی لە بوخاریو موسلیمدا، دەکاتە: ١٤ + ٤ + ٤ = ٢٢ فەرموودە، لەپاش شەهید بوونی عەبدوڵلای کوڕی، لە مەککە، لەساڵی حەفتاو سێی کۆچیدا، لە تەمەنی سەد ساڵیدا، بە مردنی خوا، کۆچی دوایی کرد، کە مرد هیچ ددانی نەکەوتبوو، ئەقڵیشی ساغو تەواو بوو، (ڕەزای خودای لێ بێ). {بڕوانە ژمارە: ٧٨٤ تەجرید/٢، لاپەڕە: ٣}.

## ڕوونکردنەوەیەکی گرنگ

لەبەرئەوەی کە نوێژ کۆڵەکەی دینە، وە زۆرینەی خوێنەرانیش هێزیان بە فامی تەواوی زۆر لە فەرموودەکان ناشکێ، لەبەرئەوە بەپێی سەرچاوەکانی بەردەست، بەتایبەتی شەرحی نەوەویو فەتحولباری، بڕیارە شەرعییەکان لە فەرموودەکان ڕوون دەکەینەوە، هەتا سەر لەخوێنەر نەشێوێ. ئیتر بەپشتی خوداو خودا یاریدەرمان بێ.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٣/٤- نامەی نوێژ. (٨٣٥).
## {كِتَابُ الصَّلَاةِ}

### ١٤٥) باسی سەرەتای داهاتنی بانگ. {باب: بَدْءِ الأذان}

{بڕوانە: فیقهی ئاسان/١، لاپەڕە: ١٦٠ - ١٦٤ + تاج/١/٢١١ – ٢٣٢ + تەجرید/١، لاپەڕە: ٣٥٠}.

١٩٠- عَنْ عبدالله بْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عنهما) أَنَّهُ قَالَ: كَانَ الْمُسْلِمُونَ حِينَ قَدِمُوا الْمَدِينَةَ يَجْتَمِعُونَ فَيَتَحَيَّنُونَ الصَّلَوَاتِ، لَيْسَ يُنَادَى بِهَا أَحَدٌ، فَتَكَلَّمُوا يَوْمًا فِي ذَلِكَ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: اتَّخِذُوا نَاقُوسًا مِثْلَ نَاقُوسِ النَّصَارَى، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: قَرْناً مِثْلَ قَرْنِ الْيَهُودِ، فَقَالَ عُمَرُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): أَوَلاَ تَبْعَثُونَ رَجُلاً يُنَادِي بِالصَّلاَةِ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « يَا بِلاَلُ قُمْ فَنَادِ بِالصَّلاَةِ ». {الحديث/ ٨٣٥، تجريد البخاری/١/٣٥٠، رقم: ٣٥٠ = ٦٠٤ فتح الباری شرح صحيح البخاری}:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: کاتێ موسوڵمانان کۆچیان کرد بۆ مەدینە، هێشتا بانگ دانەمەزرابوو، خۆیان لە مزگەوت کۆ دەبوونەوەو چاودێری کاتی نوێژیان دەکردو بۆی کۆدەبوونەوە. رۆژێ لەم بارەیەوە دەستیان کرد بە راوێژو گفتوگۆ، هەندێکیان فەرموویان: بازەنگێ دابنێین وەك هی نەصرانییەکان، وەك ئەوان لەکاتی نوێژدا ناقووس (بۆڵ) لێ بدەین، هەندێ تریان فەرموویان: ئەی بۆ ئێمەیش وەك جوولەکەکان کەڕەنایەك دروست نەکەین بۆ خۆمان و لەکاتی نوێژا فووی پیابکەین!

عومەریش (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەی بۆ پیاوێ نانێرن کەبچێ بانگ بدا بۆ نوێژ؟ ئیتر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) راوێژو پێشنیارەکەی عومەری پەسەند کردو فەرمووی: (ئەی بیلال! هەڵسە بانگ بدە بۆ نوێژ) بیلالیش هەڵسا بانگی فەرموو.

## ١٤٦) چۆنیێتی بانگ. (٨٤٠). {باب: صِفَةَ الأذَانِ}

١٩١- عَنْ أَبِى مَحْذُورَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَّمَهُ هَذَا الأَذَانَ: « اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، ثُمَّ يَعُودُ فَيَقُولُ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، مَرَّتَيْنِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، مَرَّتَيْنِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، مَرَّتَيْنِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، مَرَّتَيْنِ، (زَادَ إِسْحَاقُ يَعْنِي إِبْنَ إِبْرَاهِيمَ): « اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ». {الحديث/ ٨٤٠}:

ئەم فەرموودەیە لەتاجدا ئاوایە، دەیکەین بە شەرح‌و راڤەو روونکەرەوە بۆ ئەم گێڕانەوەی ئێرە: ئەبو مەحذوورە فەرمووی (رەزای خودای لێ بێ): پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بانگی فێرکردم، نۆزدە وشە بوو، قامەتیشی فێرکردم حەڤدە وشە بوو، بانگ ئەمەیە بەدەنگی بەرز لەسەرەتاوە بڵێ:

(الله اكبر، الله اكبر، الله اكبر، الله أَكْبَرُ). تەواو دەنگی خۆتیان لێ هەڵبڕە، ئینجا بە دەنگی نزم دەڵێیت: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إله إِلاَّ الله، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إله إِلاَّ الله، أَشْهَدُ أَنَّ محمداً رَسُولُ اللهِ، أَشْهَدُ أَنَّ محمداً رَسُولُ اللهِ).

لە گێڕانەوەیەکا، ئەمەی زیاترە: لەژێر لێوەوە ئەم چوار وشەی شایەتمانە بڵێ، ئینجا بە دەنگی بەرز وشەکانی شایەتمان دووبارە بلێرەوەو بڵێ:

(أَشْهَدُ أَنْ لاَ إله إِلاَّ الله، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إله إِلاَّ الله، أَشْهَدُ أَنَّ محمداً رَسُولُ اللهِ، أَشْهَدُ أَنَّ محمداً رَسُولُ اللهِ).

ئینجا دوا بەدوای ئەم شایەتمانە، بەدەنگی بەرز بڵێ:

(حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الفَلاَحِ، حَيَّ عَلَى الفَلاّحِ).

ئەگەر بۆ نوێژی بەیانی بانگت دەدا، لەپاش ئەمە بشڵێ:

(الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ).

کۆتایی بانگەکەش هەمیشە بەم وشە پیرۆزە بهێنە:

(الله اكبر، الله اكبر، لاَ إله إِلاَّ الله).

قامەتیش ئەمەیە: (ألله اكبر، ألله اكبر، ألله اكبر، ألله أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلـه إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِله إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنَّ محمداً رَسُولُ اللهِ، أَشْهَدُ أَنَّ محمداً رَسُولُ اللهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الفَلاَحِ، حَيَّ عَلَى الفَلاَّحِ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلَوةُ، ألله اكبر، ألله اكبر، لاَ إِلـه إِلاَّ اللهُ). {م/د/ت/ن = موسلیمو ئەبو داوودو، تەرمەزیو، نەسائی}.

لە گێڕانەوەیەکدا: قامەت بەم جۆرەیە: (ألله اكبر، ألله أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلـه إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنَّ محمداً رَسُولُ اللهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الفَلاَّحِ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، ألله اكبر، ألله اكبر، لاَ إِلـه إِلاَّ اللهُ). {تاج/١، لاپەڕە: ٢٢٤، زنجیرە: ٦٠، ژمارە: ٤٢٠}

**روونکردنەوە:**

{بڕوانە: فیقهی ئاسان/١، لاپەڕە: ١٦٠ - ١٦٤}.

١ - بۆئەوەی بەباشی لەم فەرموودەیە حاڵی ببین، واتای وشەی (تەرجیع)و (تەثویب) دەکەین. تەرجیعو تەثویب سوننەتن، تەرجیع ئەوەیە کە بانگدەر لەپێش ئەوەدا کە بەدەنگی بەرز دوو وشەی شەهادەت بڵێ، لەژێر لێوەوە بە پەنامەکی ئەم دوو وشەیە بڵێ، ئەوجا بە دەنگی بەرز بیبیانڵێت، مەبەست ئەم دووبارە کردنەوەیە کەلە فەرموودەکەی ئێرەدا دەفەرموێ: (عَنْ أَبِى مَحْذُورَةَ أَنَّ نَبِىَّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَّمَهُ هَذَا الأَذَانَ « اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ - ثُمَّ يَعُودُ فَيَقُولُ - أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ حَىَّ عَلَى الصَّلاَةِ - مَرَّتَيْنِ - حَىَّ عَلَى الْفَلاَحِ - مَرَّتَيْنِ ». زَادَ إِسْحَاقُ يَعْنِي إِبْنَ إِبْرَاهِيمَ: « اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ).

تەثویبیش ئەوەیە کە لەبانگی بەیانیدا،، بانگدەر لەپاش (حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ) دووجار بلێ: (الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ) ئەم دووە سوننەتن بەپێی فەرموودەکەی ئەبو مەحذوورە.

٢ - ئەبو مەحذوورە ناوی سەمورەیە، قورەیشییە، لەپاش غەزای حونەین ئیسلام بووە، دەنگی زۆر خۆش بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە جەعرانە فێری بانگی کرد، جیعرانە جێگەیەکە لەنزیك مەککەوە، لەخاکی حیللە میقاتی ئیحرام دابەستنە. کۆچی نەکرد بۆ مەدینە، هەر لە مەککە ماوەتەوە، کاتێ پێغەمبەر لەغەزای حونەین گەڕایەوە کردی بە بانگدەری خۆی لە مەککە، ئیتر هەتا مرد بانگدەری مەککە بوو. ئەبو مەحذوورە خۆی ئاوا چیرۆکی ئەم داستانە دەگێڕێتەوە: دەفەرموێ: دە کەسێ دەبووین، کاتێ پێغەمبەرو سوپاکەی لە غەزای حونەین گەڕانەوە، لەڕێگە پێیان گەیشتین، ئێمە خۆمان دوور گرتبوو، بانگدەری پێغەمبەر، بانگی فەرموو، ئێمەیش بە دەنگی بەرز لاسکایی بانگەکەمان کردەوەو قەشمەریمان پێ دەکرد، پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ)، گوێی لە دەنگەکەی ئێمە دەبێ، ناردی بەشوێنمانا، چووین بۆ خزمەتی، فەرمووی: ئەوە دەنگی کامتان بوو، کە لە دەنگی هەمووتان بەرزتر بوو، هاوڕێکانم ئاماژەیان بۆمن کردو منی گل دایەوەو، ئەوجا فەرمووی: (ئادەی هەڵسە بانگ بدە بۆ نوێژ). منیش لەوکاتەدا، لەهەموو کەسێ زیاتر رقم لە پێغەمبەر بوو، وە لەهەموو شتێ زیاتر رقم لەبانگ بوو، جا هەڵسام لەبەردەم پێغەمبەردا راوەستام، پێغەمبەر خۆەی (دروودی خودای لەسەر بێ) وشە بەوشە، وشەکانی بانگەکەی پێم دەگوت، تامنیش لەشوێن ئەوەوە بە دەنگی بەرز بیانڵێمو بانگیان پێ بڵێم، جا فەرمووی: (بلێ: اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ...) تا بانگ تەواو دەبێ. ئەوجا کە بانگەکەم تەواوکرد، بانگی کردم بۆلای خۆیو پریاسکەیەکی داپێم، هەنێ پارەی زیوینی تیادا بوو، ئەوجا دەستی لەسەر تەوێڵم دانا، ئەوجا دەستی شۆڕ کردەوەو دەستی هێنا بەسینگو بەرۆکما، هەتا دەستی گەیشتە سەر ناوکم، ئەوجا

فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێت):- (خوا پیتو فەڕت تێ بخاو خوا پیرۆزو فەڕدارت بکا).

عەرزیم کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! بفەرموو بمکە بە بانگوێژ لە مەسجیدولحەرام لە مەککە؟ فەرمووی: (ئەوا فەرمانم پێ کردیت بەوە).

ئیتر ئەو کینەو دەغەزو رقەی کە لەدڵما بوو، بەرابەر بە پێغەمبەر، هیچی نەما، بەڵکوو هەمووی بوو بە خۆشەویستی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)، دوایی گەڕامەوە بۆ مەککەو چووم بۆلای عتابی کوڕی أسید، کە کاربەدەستی پێغەمبەر بوو لەسەر مەککە، وە فەرمانەکەی پێغەمبەرم پێ راگەیاند، ئیتر بە حوزوری ئەو دەستم کرد بە بانگدان، هەتا ئەبو مەحذوورە خۆی مابوو، خۆی بانگدەری مەککە بوو، لەپاش خۆشی وەچەو نەوەکەی بەرپرسی بانگدان بوون!

طەبەری دەفەرموێ: ئەبو مەحذوورە لە مەککە مردووە، ساڵی پەنجاو نۆی کۆچی.

**١٤٦) وشەکانی بانگ جووت جووت دەگوترێن بەڵام وشەکانی قامەت تاك تاك دەگوترێن.** (٨٣٦ - ٨٣٩). {**بابٌ: يَشْفَعُ الأذانَ وَيُوتِرُ الإقَامَةَ**}

١٩٢- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أُمِرَ بِلاَلٌ أَنْ يَشْفَعَ الأَذَانَ وَيُوتِرَ الإِقَامَةَ - زَادَ يَحْيَى فِي حَدِيثِهِ عَنِ ابْنِ عُلَيَّةَ - فَحَدَّثْتُ بِهِ أَيُّوبَ فَقَالَ: إِلاَّ الإِقَامَةَ. {الحديث/ ٨٣٦. تجريد البخاري/١/ ٣٥٠، رقم: ٦٠٥، ٦٠٣}:

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بە بیلال کرد، کە وتەکانی بانگ جووتە جووتە بڵێ، وە وتەکانی قامەت تاك تاك بڵێ، یەحیا کە لە ئیبنو عولەییەوە ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە، ئەمەی زیادە: ئیبنو عولەییە فەرمووی: کە ئەم فەرموودەیەم گێڕایەوە بۆ ئەییوب، ئەمەی لێ پتر کرد: (إلاّ الإقامَةَ) واتە: وتەی (قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ) نەبێ، بەڵام ئەم وتەیە لە قامەتا دووجار بڵێ). {تاج/١/٢٢٦/٤٢١ — ش/د/ت/ن}

**روونكردنەوە:**

١-مەبەست لەم وەرگێڕانو تەرجەمەیە، تێگەیشتنە لەمەبەستی تەواوی فەرموودەکە، کە لەڕووی فیقەو بڕیارە شەرعییەکانو چۆنێتی ڕووداوو داستانەکانەوە.

٢-تێگەیشتنو حاڵیبوون لەم ڕستەیە: {زَادَ يَحْيَى فِي حَدِيثِهِ عَنِ ابْنِ عُلَيَّةَ فَحَدَّثْتُ بِهِ أَيُّوبَ فَقَالَ إِلاَّ الإِقَامَةَ}. پێویستی بەم شیکردنەوە هەیە: (ڕشتەی ئەم فەرموودەیە لە صەحیحی موسلیمدا ئیمامی موسلیم لەدوو شەیخی خۆیەوە دەیگێڕێتەوە، یەکەمیان ئیمامی موسلیم (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: حَدَّثَنَا خَلَفُ بْنُ هِشَامٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ خَالِدٍ الْحَذَّاءِ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: أُمِرَ بِلاَلٌ أَنْ يَشْفَعَ الأَذَانَ، وَيُوتِرَ الإِقَامَةَ). گێڕانەوەی مامۆستای یەکەمی موسلیم لەم گێڕانەوەیەدا کە خەلەفە، لێرەدا تەواو دەبێ، گێڕانەوەی مامۆستای دووەمی موسلیم ئاوایە: موسلیم دەفەرموێ: (یەحیای کوڕی یەحیا ئەم فەرموودەیەی پێمان فەرموو، کە ئیسماعیلی ناسراو بە ئیبنو عولەییە، ئەم هەواڵەی پێمان فەرموو، لە خالیدی کوڕی حەذذائەوە، لە ئەبو قیلابەوە، لە ئەنەسەوە، فەرمووی: {أُمِرَ بِلاَلٌ أَنْ يَشْفَعَ الأَذَانَ، وَيُوتِرَ الإِقَامَةَ}. یەحیا فەرمووی: ئیبنو عولەییە فەرمووی: کە ئەم فەرموودەیەی خالیدی حەذذائم گێڕایەوە بۆ ئەییوبی سەختییانی کە ئەویش شاگردی ئەبو قیلابەیەو ئەبو قیلابە مامۆستای ئەویشە، وەك مامۆستای خالیدی حەذذاءە، ئەییوب ئاوا فەرموودەکەی لە ئەبو قیلابەوە، لە ئەنەسەوە گێڕایەوە: {أُمِرَ بِلاَلٌ أَنْ يَشْفَعَ الأَذَانَ، وَيُوتِرَ الإِقَامَةَ إِلاَّ الإِقَامَةَ} بە زیادەی وشەی (إِلاَّ الإِقَامَةَ).

**١٤٧) دانانی دوو بانگبێژ بۆ یەك مزگەوت.** (٨٤١ - ٨٤٢). **{باب: إتخاذ مُؤَذِّنَيْنِ}**

١٩٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عنهما) قَالَ: كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُؤَذِّنَانِ، بِلاَلٌ وَابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ الأَعْمَى}. {الحديث/ ٨٤١}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودا لەخۆی‌و لە عومەری باوکی) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو بانگدەری هەبوو: یەکێکیان بیلالی حەبەشی بوو، وە ئەوی تریان عەبدوللای کوڕی ئومی مەکتووم بوو، کە پیاوێکی کوێر بوو، کە ناسراوە بە ئیبنو ئومی مەکتووم. {تاج/١/٢٢٩، زنجیرە: ٦٢، ژمارە: ٤٢٧}.

١٤٨) دانانی بانگبێژی کوێر. (٨٤٣ - ٨٤٤). {**باب: إتخاذ المؤذن الأعمى**}

١٩٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها) قَالَتْ: كَانَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ يُؤَذِّنُ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَهُوَ أَعْمَى. {الحديث/ ٨٤٣}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران ئیبنو ئوممی مەکتووم، کە پیاوێکی کوێر بوو، بانگی دەدا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

**ڕوونکردنەوە:**

ئیبنو ئوم مەکتووم ناوی عەمری کوڕی قەیس بوو، هەندێ دەڵێن: ناوی عەبدوللای کوڕی زائیدە بووە، هەندێ دەڵێن: ناوی عەبدوللای کوڕی قەیسی کوڕی مالیك بووە. دایکی ناوی عاتیکەی کچی عەبدوللا بوو، قوڕەیشییە، لەپێشینانی کۆچکارانە، لەگەڵ موصعەبی کوڕی عومەیردا کۆچی کرد بۆ مەدینە، پێش تەشریف هێنانی پێغەمبەر بۆ مەدینە، زۆرینەی کات کە پێغەمبەر دەچوو بۆ غەزا ئیبنو ئوممی مەکتوومی دەکرد بەجێگە نشینی خۆی لەسەر شاری مەدینە، پێش نوێژیی بۆ مەردومەکە دەکرد، بانگدەری پێغەمبەر بوو، لەگەڵ بیلالا، دەڵێن: خاڵۆزای خەدیجەی هاوسەری پێغەمبەر بووە، کوڕی برای دایکی خەدیجە بووە لە دایکەوە، پێغەمبەر سیازدە جار لەجێگەی خۆی کردی بە سەرەکشار، کە پێغەمبەر ڕۆیشت بۆ حەجی مالاوایی هەر ئەوی کرد بەجێگە نشینی خۆی لەسەر شاری مەدینە. ئیبنو بەکار دەفەرموێ: ئامادەی جەنگی قادسیە بوو، ئالای سوپای ئیسلام لەلای ئەو بوو، هەر لەوێش شەهیدکرا.

ئەو کوێرەیە کە لەبارەیەوە سەرەتای سوورەتی عەبەسە هات بۆ پێغەمبەر، هەروا ئەو کوێرەی ترە کەبوو بەهۆی هاتنی (غير أُلِي الضَّرَرِ).

**١٤٩) بەهرەی بانگ.** (٨٥٠ - ٨٥٨). {**باب: فضل الأذان**}

١٩٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُغِيرُ إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ، وَكَانَ يَسْتَمِعُ الأَذَانَ، فَإِنْ سَمِعَ أَذَانًا أَمْسَكَ، وَإِلاَّ أَغَارَ، فَسَمِعَ رَجُلاً يَقُولُ: اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « عَلَى الْفِطْرَةِ ». ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « خَرَجْتَ مِنَ النَّارِ ». فَنَظَرُوا، فَإِذَا هُوَ رَاعِي مِعْزًى}. {الحديث/ ٨٤٥}:

**ئەنەسی کوڕی مالیك** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **وابوو، کە دەچوو بۆ غەزا، لەناو وڵاتی بێبڕوایانا، لەگەڵ شەبەقی بەیانا دەیدا بەسەریانا، لەپێشا لە دەوروبەری ئەو شوێنە گوێی هەڵ دەخست بۆ بیستنی بانگ، جا ئەگەر گوێی لەبانگ بوایە دەستی بۆ نەدەبردن، دەنا پەلاماری دەدان و سوپای ئیسلام هێرشیان دەبردە سەریان. جارێ لەبارو دۆخێکی ئاوادا، گوێی لێ بوو پیاوێ بانگی دەدا، کە پیاوەکە گوتی: (اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ = خودا لەهەموو کەسێ و لەهەموو شتێ گەورەترە). پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **بۆ ڕەزا بوون بەحاڵ، فەرمووی: (لەسەر سروشتی پاك و خاوێنی ئایینی ئیسلامیت) لەپاشا کە پیاوەکە لە بانگەکەدا گوتی: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ = شایەتی دەدەم کە بێجگە لە یەزدانی پاك خودای تر نییە) پێغەمبەریش** (دروودی خودای لەسەر بێ) **ئەم شایەتییەی بۆ ئەوداو فەرمووی: (بەهۆی پیرۆزی ئەم وشە پیرۆزەوە، کە کلمەی توحیدەو وشەی یەکتا پەرستییە، ڕزگارت بوو لەئاگری دۆزەخ). کە تەماشا دەکەن ئەمە شوانی بزنە، گوندو شتی وا نییە.**

**ڕوونکردنەوە:**

**نەوەوی** (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن: بانگدان بۆ تاکە کەسیش سوننەتە، هەروەك چۆن بۆ کۆمەڵ و گوندو خێڵ و شتی وا سوننەتە، بانگ لەهەر شوێنێ درا دەبێ بەرێگر لە پەلاماردانی خەڵکی ئەو شوێنە، چونکە بە موسوڵمان دادەنرێن، گوتنی وشەی شایەتمان بەزمان، بەڵگەی موسوڵمانەتییە.**

١٩٦- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِذَا نُودِىَ لِلصَّلاَةِ أَدْبَرَ الشَّيْطَانُ، وَلَهُ ضُرَاطٌ حَتَّى لاَ يَسْمَعَ التَّأْذِينَ، فَإِذَا قَضَى التَّأْذِينُ أَقْبَلَ حَتَّى إِذَا ثُوِّبَ بِالصَّلاَةِ أَدْبَرَ حَتَّى إِذَا قَضَى التَّثْوِيبَ أَقْبَلَ، حَتَّى يَخْطُرَ بَيْنَ الْمَرْءِ وَنَفْسِهِ يَقُولُ لَهُ: اذْكُرْ كَذَا، اذْكُرْ كَذَا - لِمَا لَمْ يَكُنْ يَذْكُرُ مِنْ قَبْلُ، حَتَّى يَظَلَّ الرَّجُلُ مَا يَدْرِى كَمْ صَلَّى». {الحديث/ ١٢٦٧. تجريد البخارى/١/٣٥١، رقم: ٣٥٢ = ٦٠٨، ١٢٢٢، ١٢٣١، ١٢٣٢، ٣٢٨٥}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ بانگ دەدرێ بۆ نوێژ شەیتان هەڵدەتۆرێنێو جرت لێ دەدا، تا گوێی لە بانگەکە نەبێ، جا کە بانگەکە تەواو دەبێ، دیسان دێتەوە تاقامەت دەکرێ بۆ نوێژ ئەوجا دووبارە هەڵدەتۆرێنێتەوە، کە قامەت تەواو دەبێ دیسان دێتەوە، دەچێتە بنکلێشەی نوێژکەرەوەو پێی دەڵێ: بیر لەمە بکەرەوەو بیر لەوە بکەرەوە، وە ئەوشتانەی لەناو نوێژەکەدا وەبیردێنێتەوە کە لەوەپێش لەبیری نەبوون، هەتا خەریکی بکاو دڵی لەلای نوێژەکەی نەبێو خوضوعو خوشوعی لێ تێک بدا، هەتا بەڕادەیەکی وا، دڵی بێ ئاگادەکا، لەئاستی نوێژەکەی، کەنازانێ چەن رکات نوێژی کردووە). {تاج/١/٢٢٢، زنجیرە: ٥٩، ژمارە: ٤١٤}.

### ١٥٠) بەهرەی بانگدەران. (٨٥٠ - ٨٥٨). {باب: فضل المؤذنين}

١٩٧- عَنْ عيسى بْنِ طَلْحَةَ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِى سُفْيَانَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ)، فَجَاءَهُ الْمُؤَذِّنُ يَدْعُوهُ إِلَى الصَّلاَةِ، فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: « الْمُؤَذِّنُونَ أَطْوَلُ النَّاسِ أَعْنَاقًا، يَوْمَ الْقِيَامَةِ». {الحديث/ ٨٥٠}:

عیسای کوڕی تەلحە (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەلای موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان بووم (رەزای خودایان لێ بێ) بانگوێژەکە هات بەشوێنیدا کە بچێ بۆ نوێژ، موعاویە فەرمووی: (بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو: لەرۆژی قیامەتدا بانگدەران لەهەموو کەسێ گەردنیان بەرزترە!). {تاج/١/٢٢٣، زنجیرە: ٥٩، ژمارە: ٤١٧}.

**روونکردنەوە:**

موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان، ئەمەوییە، ساڵی ئازادکردنی مەککە موسوڵمان بووە، ژنبرای پێغەمبەر بووە، چونکە برای ئوم حەبیبەی هاوسەری پێغەمبەرە (بڕوانە: ٦١٤ تەجرید = ١٢٨١ = بەرگی/٢، لاپەڕە: ٤٠).

موعاوییە نووسەری سرووش بوو، کاتێ کە قورئان دەهاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر، زۆرجار ئەو دەینووسییەوە، لەپێش بیعثەتدا بە پێنج ساڵ لەدایك بووە، پیاوێکی زۆر سەلارو هێمنو بەحەوسەڵە بوو، پیاوێکی باڵا بەرزی قژ رووتاوە بوو، خۆی دەفەرموێ: پێغەمبەر عەمرەی تەواوکرد، من لەلای تەپۆڵکەی مەڕوەدا، بە دەمە تیرێکی پانکۆڵە مووی سەریم کورت کردەوە، بۆ شکاندنی ئیحرام، باوکی موعاویە لە موئەللەفەتولقولوب بوو، موعاوییە لەنەخۆشی سەرە مەرگا بە کوڕەکەی خۆی گوت: کراسێکی پێغەمبەرم هەیە کە کاتی خۆی پێغەمبەر خۆی داوێتی پێم، وە هەندێ نینۆکی کرتاوی پێغەمبەریشم هەیە، لەگەڵ هەندێ موویدا، شاردوومنەتەوە بۆ ئەمڕۆ، جا کاتێ مردم، لەژێر کفنەکەوە لەسەر گۆشتەکەوە ئەوکراسەم بکەرەبەر، موو نینۆکەکانیش هەندێکی بکەرە ناو دەمم‌و ئەویتریشی بخەرە سەرچاوم‌و سەر ئەو جێگایانەی لەشم کە سەجدەم لەسەر بردوون، بەپشتی خودا سوودیان دەبێ بۆم).

موعاوییە مووی خۆی تەواو زەرد دەکرد، خۆی دەفەرموێ: هەتا چەند ساڵێ مووە سپییەکانی سەرو ریشمم هەڵ دەکەند، سەدو شەست‌و سێ فەرموودەی هەیە، هەشت فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە، پێنجیشی لە موسلیمدا هەیە، چواریان پەسەندی هەردوو پیرە، کەواتە کۆی فەرموودەکانی لە بوخاری‌و موسلیمدا دەکاتە: ٤ + ٤+ ١ = ٩ فەرموودە، تەمەنی (٧٨) ساڵ بووە، لەکۆتایی تەمەنیدا تووشی دەمخواریی دەبێ، لە رەجەبی ساڵی شەستی کۆچیدا دەمرێ، (رەزای خودای لێ بێ).
{تەجرید/١/٨٨، ژمارە: ٦٣ — تاج/٥، لاپەڕە: ١٤٥ تاج-٣ ز-٣٣ ژ-٣٤٢٢-٣٤٢٣}.

## ١٥١) كەسێ گوێی لەبانگ بێ چۆن وەڵامی بداتەوە. (٨٤٦ - ٨٤٩).

## باب: القَولُ مِثْلَ ما يَقُولُ المؤَذِّنُ

١٩٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِىَ اللّٰهُ عنهما) أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولِ اللّٰه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: « إِذَا سَمِعْتُمُ الْمُؤَذِّنَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ، ثُمَّ صَلُّوا عَلَيَّ، فَإِنَّهُ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلاَةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ بِهَا عَشْرًا، ثُمَّ سَلُوا اللَّهَ لِيَ الْوَسِيلَةَ، فَإِنَّهَا مَنْزِلَةٌ فِى الْجَنَّةِ، لاَ تَنْبَغِى إِلاَّ لِعَبْدٍ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ، وَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَنَا هُوَ، فَمَنْ سَأَلَ اللّٰهَ لِيَ الْوَسِيلَةَ حَلَّتْ لَهُ الشَّفَاعَةُ». {الحديث/ ٨٤٧}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودا لەخۆی و لە عەمری باوکی) فەرمووی: ژنەوتم لە خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (کاتێ گوێتان لەبانگ بوو، بانگدەر چی دەڵێ ئێوەش ئەوە بڵێنەوە، لەپاشا کە لەوەڵامی بانگەکە دەبێتەوە، صەڵاوات لە دیاری من بدەن، چونکە هەر کەسێ یەك صەلاوات لەسەر من بدا، خودای گەورە لەباتی ئەوە دە ڕەحمەت دەڕێژێ بەسەریدا، لەپاش ئەوەیش داوای پایەی (الوسیلة)م لە خودا بۆ بکەن، کە یەکێکە لە پایە هەرە بەرزەکانی بەهەشت، دانراوە بۆ بەندەیەکی فرە باش لە بەندە هەرە باشەکانی خودا، وە بۆ ئەو نەبێ بۆ کەسی تر دەست نادا، وەمن ئومێد دەکەم و هیوام هەیە کە خۆم ئەو بەندەیە بم، جا ئەوەیش بزانن ئەو کەسەی کە داوای ئەم پایەی ئەلوەسیلەیە، لەخودا بکا بۆ من، ئیتر تکاو شەفاعەتی منیش بۆ ئەو لەڕۆژی قیامەتا سەر دەگرێ). {تاج/١/٢٣٠، زنجیرە: ٦٣، ژمارە: ٤٢٩}.

**ڕوونکردنەوە:**

پێشەوا نەوەوی دەفەرموێ: (وەڵامدانەوەی بانگ لەم کەسانەوە سوننەتە: کەسێ دەستنوێژی هەبێ، یا نەیبێ، لەشی پاك بێ، یا لەشی پیس بێ، بێنوێژ بێ یا لەپاکیدا بێ، بۆ هەموو کەسێ لەسەر هەر حاڵێ بێ، لەهەر بارودۆخێکا بێ وەڵامدانەوە سوننەتە، لەم کاتانەدا نەبێ: لەکاتی سەراوداو لەکاتی جووتبوونی ژن و مێرداو لەکاتی ئەم جۆرە شتانەدا، هەروا لەناو نوێژدا).

## ١٥٢) بەهرەی ئەو کەسەی وەڵامی بانگ ئەسەنێتەوە
## باب: فَضْلِ مَنْ قَالَ مِثْلَ مَا يَقُولُ المؤذِّنُ

١٩٩- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « إِذَا قَالَ الْمُؤَذِّنُ اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، فَقَالَ أَحَدُكُمْ: اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، قَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، ثُمَّ قَالَ: حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، قَالَ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ، ثُمَّ قَالَ: حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، قَالَ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، قَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، ثُمَّ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ مِنْ قَلْبِهِ دَخَلَ الْجَنَّةَ». {الحديث/ ٨٤٨}:

مەبەست لەم فەرموودەیە ئەمەیە کەوا لەم فەرموودەیەدا، کە لەسەر فەرمایشتی تاجول ئوصولْ، موسلیمو ئەبو داوود گێڕاویانەتەوە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ کە بانگدەر بانگ دەدا چی دەڵێ، ئەویش وشە بە وشە، لەشوێن ئەوەوە، گوتەکەی ئەو بە زمان بڵێتەوەو بە دڵیش باوەڕی پێی هەبێو بەسۆزی دڵ بیڵێ، ئەوە دەچێتە بەهەشت! بەڵام لە وشەی (حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ) و (حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ)یدا، وەك بانگدەر نەڵێ، بەڵکوو لەکاتی ژنەوتنی ئەم دوو وشەیەدا بڵێ: (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ): هێزو تەوانایی هەر بەدەستی خودا خۆیەتیو بەس). {تاج/١/٢٣٢، زنجیرە: ٦٣، ژمارە: ٤=٤٣٢ ج-٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

عومەری کوڕی خەتتاب قورەیشییە، عەدەوییە، لەپشتی هەشتەما ڕەچەڵەکی لە باوکەوە دەگاتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دایکی ناوی حەنتەمەی کچی هاشمە، کەسناوی (کونیەی) ئەبو حەفصە، نازناو (لەقەب)ی فاروقە، لە عەشەرەی موبەشەرەیە، کە پێغەمبەر مژدەی بەهەشتی پێیان داوە، جێنشینی (خەلیفە)ی دووەمە، لەپێش هاتنی پێغەمبەردا، بە (٣٠) سیی ساڵ، یا بە سیازدە ساڵ، لەدایك بووە، لەسەردەمی نەزانیدا پایەی نوێنەری قورەیش بەو سپێرراوە، کە شەڕێ،

هـەرایێ سـەری هەڵـدەدا، ئـەو دەکەوتـە نێوانیانـەوە، لەسـەرەتای ئیسـلامەوە زۆر توندو تیژ بـوو لـە دژی موسـوڵمانان، بـەڵام کاتـێ ئیسلام بـوو موسوڵمانێـکی زۆر جوانی لێ دەرچوو، ئیسلامبوونی دانـرا بـە سەرکەوتنێـکی گـەورە بۆ موسـوڵمانان، ئیبنو مەسعوود دەیفەرموو: (هەتا عومەر ئیسلام نەبوو، نەمان دەوێـرا بـە ئاشـکرا خودا بپەرستین!).

عومەر یەکێـکە لـە کۆچکارە پێشینەکان، ئامـادەی بەیعـەتی ریزوان و غـەزای بـەدرو هـەموو شـەڕگەو مەڵبەنـدو جەنگـەکانی تـری پێغەمبـەر بـووە. یـەکێ بـوو لەوچـەند کەسـانە، کـە پێغەمبـەر وەفـاتی کـرد لێیـان رازی بـوو، لـەپاش مـەرگی ئەبوبەکر، لەساڵی سیازدەی کۆچیدا بوو بە دووەم جێنشین، ئەم وڵاتانەو چەندین شوێنی تری ئازادکردو لەسەر دەستی ئەودا ئیسلام بـوون: شام و عێـراق و میصـر، دیوان ئەو داینا، هەر ئەو مووچەی بۆ پیاوانی سوپا، بەپێی خزمـەتیان بۆ ئیسلام بڕییەوە، کارە هـەرە گرنگـەکانی تـری: ئـەو نوێـژی تـەراویحی لەسـەر ئـەم شـێوەی ئێستا (لە شەوانی رەمەزاندا) دامەزراند، مێژووی کۆچی دانا، کەهـەتا ئەمڕۆکە ٤/ ربيع الأوَّلي ساڵی (١٤٢٨)ە بەردەوامـە، وە بەپشـتی خـودا هـەتا نزیکی قیامـەت هـەر بەرقەرار دەبێ.

ئـەو یەکـەم کـەس بـوو، کـە نازنـاوی (ئـەمیرولمؤمنین: فـەرمانڕەوای موسوڵمانان)ی پێ بەخشرا.

سەرەتای صەحیحی بوخاری، لەناوی صەحابەکاندا، بەناوی عومـەر دەسـت پـێ دەکا، هەر خـۆی لـەناو یـارانی پێغەمبـەردا نـاوی (عومـەری کـوڕی خـەتتاب) بـووە، بەڵام بیستو چوار عومەر ناوی تریان لەناودا بـووە، پێشـەوا عومـەر (رەزای خودای لێ بێ) پیاوێـکی باڵا بەرزی تەواو کەڵەگەتی تێـکسمڕاوی گڕانـە (أصلع) بـوو، قووچێـکی وابوو کە لەناو خەڵـکا دەوەستا، دەتگوت: ئەو سوارەو ئـەو خەڵـکەی تـر لـە دەوری پیـادەن، لەسـاڵی گرانـیو برسـێتییەکەدا، وازی لـەخواردنی گۆشـت و چـەوری و خواردنی شـتی خـۆش هێنـا، لـەجیاتی ئەوە بـە خـواردنی رۆن زەیتـوون ئیکتیفـای

دەگرد، هەتا هەست بەو ئێش‌و ئازارو سەختڵەتییە بکا، کە خەڵکانی هەژاری ئەو رۆژگارە ناهەمووارە هەستیان پێی کردووە، ئەوەندە جەرەبابەی خۆی دابوو، رەنگی هەڵبڕسکا بوو، عومەر پیاوێکی تووکن بوو، مووی خۆی دەگرتە خەنەو وسمە، عومەر زۆر دادپەروەر بوو، عەداڵەت‌و دادپەروەری عومەر زۆر ئاشکرایە، عومەر چەپەوانە بوو، ریشی زۆر پڕبوو، لە فەرموودەو سوننەتی زۆر دروستدا، وەسپ‌و مەتحی زۆری عومەر، لە لایەنی پێغەمبەرو یارانی پێغەمبەرەوە کراوە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (گریمان لەپاش من پێغەمبەری تر ببوایە عومەر دەبوو، بەڵام لەدوا من پێغەمبەری تر نییە).

عومەر خەزووری پێغەمبەر بوو، باوکی حەفصەی هاوسەری پێغەمبەرە، مۆری ئەموستیلەکەی (كَفَى بالموتِ واعِظاً يا عمر: ئەی عومەر! بەڕاستی مردن ئامۆژگاری چاکە) عومەر یەکەم قازی بوو لەئیسلاما، ئەبوبەکر کردی بە قازی، دە ساڵ‌و نیو جێنشین بوو، لەتەمەنی شەست‌و سێ ساڵیدا، لەشاری مەدینە، لە مانگی قوربانی ساڵی بیست‌و سێی کۆچیدا، لەناو میحرابی مزگەوتەکەی پێغەمبەردا، لەکاتێکدا کە بەرنوێژی نوێژی بەیانی بۆ موسوڵمانان دەکرد، ئەبو لوئلوئەی فارسی بە کێردێکی دوو دەم کوشتی وە سیازدە کەسی تریشی زامار کرد، حەوتیان مردن، هەرلەوێدا ئەبو لوئلوئە خۆشی کوشت، ئەو رۆژە رۆژی چوارشەممە بوو، هەندێ دەفەرموون: کاتێ عومەر شەهید بوو تەمەنی لە شەست‌و سێ کەمتر بوو، هەندێ دەڵێن: ئەبو لوئلوئە مەجووسی بووە، هەندێ دەڵێن: مەسیحی بووە، عومەر سێ شەو بە برینەکەیەوە ژیا ئەوسا مرد، بۆ شارەزایی تەواو لە ژیان‌و شانازیەکانی عومەر بڕوانە صەحیحی بوخاری، فضائل الصحابة لە فەرموودەی ژمارە/٣٦٨٢ — وە هەتا ٣٦٩٤، هەروا ئەم ژمارانە: ٣٨٦٣، ٦١٧١، ٧١٥٣، ٦٢٦٤، ٦٦٣٢، ٣٧٠٠. هەروا بڕوانە فضائلی صەحابە لە صەحیحی موسلیمدا لە فەرموودەی ژمارە: ٦١٣٩ — وەهەتا ژمارە: ٦١٥٨. هەروا بڕوانە: تاج/٢٠/٥، زنجیرە: ٤ + تاج/٥، لاپەڕە: ٢٨، فەرموودە/١ +

٢ + ٣ + ٤ تا ١٢ + زنجيره: ٦ + زنجيره: ٧ + تاج/٥، لاپەڕە: ٧٥ + تەجريد/٢، لاپەڕە: ١٤٠، ژمارە: ١١٦) + (تاج/٥، لاپەڕە: ٣٤، ژمارە: ٣٢٣٣/١).

٢٠٠- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِى وَقَّاصٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ الأَذَانَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً، وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا، غُفِرَ لَهُ ذَنْبُهُ». {الحديث: ٨٤٩}.

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ لەوکاتەدا کە بانگ دەبیستێ بڵێ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا: شایەتی دەدەم کە هەر خودا خودایەو تاكو تەنیایەو هیچ هاوەڵو هاوبەشی نییە، وە هەروەها شایەتی دەدەم کە موحەممەد بەندەو پێغەمبەری ئەوە، یەزدانی پاکم بەخودا قوبووڵەو موحەممەدم بە پێغەمبەر قوبووڵەو ئیسلامم بەدینو ئایین قوبووڵە).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ لەوکاتەدا کە بانگ دەبیستێ، ئەمە بڵێ، خودا لەگوناهی خۆش دەبێ). {تاج/١/٢٣١، زنجیرە: ٦٣ ژ-٤٣١}.

**ڕوونکردنەوە:**

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاس، ناوی سەعدی کوڕی مالیکە، یەکێکە لەو دەکەسە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) موژدەی بەهەشتی پێیان داوە، دوا کەسیان بووە کە مردووە، حەوتەم کەس بووە کە ئیسلام بووە، لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا موسوڵمان بووە، خۆی دەفەرموێ: (لەپێش فەرزبوونی نوێژدا ئیسلام بووم). ئامادەی بەدرو حودەیبییەو شەڕگاکانی تری پێغەمبەر بووە، یەکێ بوو لەو شەش کەسە کە عومەر هەڵی بژاردن بۆ جێنشینی لەپاش خۆی، نزا گیرابوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوعای بۆکرد کە دوعای گیرابێ، یەکەم کەس بوو کە یەکەم تیری لە پێناوی ئایینی ئیسلاما هاویشت، یەکێ بوو لەسوار چاکەکانی قورەیش، لە شەڕگەو غەزاکانی پێغەمبەرا سەعد ئێشکی دەگرت، ئەو کووفەی دروست کرد، عومەر

كردی به فەرماندەی موسوڵمانان بۆ ئازادكردنی وڵاتی فارس، وە زوربەی وڵاتی فارس لەسەر دەستی ئەوا ئازاد بوو، لە نەبەردەكەی قادسییەدا دەستی باڵای بوو.

لەپاش شەهید بوونی پێشەوا عوسمان، لەكاتی ئاژاوەكەدا، لە ماڵی خۆی دانیشتو لە جەنگ كەناری گرتو شەڕی برا كوژیو موسوڵمان كوژی نەكرد، وە بەخێزانەكەی خۆی گوت كە لەبارەی ئەم جەنگو ئاژاوەوە هەواڵی پێ نەڵێن.

لە عەقیق وەفاتی كرد، كە دە میل لەشاری مەدینەوە دوورە، پیاوان بەشان تەرمەكەیان هەڵگرتو بردیانەوە بۆ مەدینە، لە مزگەوتەكەی پێغەمبەرا نوێژی تەرمی لەسەر كرا، مەڕوانی كوڕی حەكەم بەرنوێژیی كرد. دەڵێن: ساڵی پەنجاو پێنجی كۆچی گیانی سپاردووە، لە گۆڕستانی بەقیع نێژراوە، كاتێ مرد تەمەنی بەچەند ساڵێ لە حەفتا تێپەڕی كردبوو، لەسەرە مەرگا راسپێری كرد: كە جبەیەكی كۆنی هەیە، لەو جبە كۆنەدا كفنی بكەنو ئەو جبەیە بكەن بە كفنی، چونكە لەرۆژی غەزای بەدردا، كاتێ بەرەنگاری هاوبەش پەیداكەرەكان بووە، ئەو جبەیەی لەبەردا بووە، وە بۆ ئەم رۆژە ئەو جبەی هەڵگرتووە، ئەو جوبەیە لە خوری بوو. {بڕوانە ئەم شوێنانە: تاج/٥، لاپەڕە: ٨٦، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٣٢٨٩/١ تاج-٣ چ-٤ هەتا كۆتایی زنجیرەكە + ریاض/٣، لاپەڕە: ٣٥٧، زنجیرە: ٢٥٣، ژمارە: ١٥٠٥/٣}.

**١٥٣) فەرزبوونی نوێژ**. (١٠٢ - ١٠٣). {**باب**: **فرض الصَّلَاةِ**}

٢٠١- عَنْ أَنسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ)، قَالَ: نُهِينَا أَنْ نَسْأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ شَيْءٍ، فَكَانَ يُعْجِبُنَا أَنْ يَجِيءَ الرَّجُلُ مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ الْعَاقِلُ، فَيَسْأَلَهُ وَنَحْنُ نَسْمَعُ، فَجَاءَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ! أَتَانَا رَسُولُكَ فَزَعَمَ لَنَا أَنَّكَ تَزْعُمُ أَنَّ اللَّهَ أَرْسَلَكَ؟ قَالَ: صَدَقَ، قَالَ: فَمَنْ خَلَقَ السَّمَاءَ؟ قَالَ: اللَّهُ، قَالَ: فَمَنْ خَلَقَ الأَرْضَ؟ قَالَ: اللَّهُ، قَالَ: فَمَنْ نَصَبَ هَذِهِ الْجِبَالَ، وَجَعَلَ فِيهَا مَا جَعَلَ؟ قَالَ: اللَّهُ، قَالَ: فَبِالَّذِي خَلَقَ السَّمَاءَ وَخَلَقَ الأَرْضَ وَنَصَبَ هَذِهِ الْجِبَالَ، آللَّهُ أَرْسَلَكَ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: وَزَعَمَ رَسُولُكَ، أَنَّ عَلَيْنَا خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي يَوْمِنَا وَلَيْلَتِنَا، قَالَ: صَدَقَ، قَالَ: فَبِالَّذِي أَرْسَلَكَ آللَّهُ أَمَرَكَ بِهَذَا؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: وَزَعَمَ رَسُولُكَ أَنَّ عَلَيْنَا زَكَاةً فِي أَمْوَالِنَا، قَالَ: صَدَقَ.

قَالَ: فَبِالَّذِي أَرْسَلَكَ آللَّهُ أَمَرَكَ بِهَذَا؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: وَزَعَمَ رَسُولُكَ أَنَّ عَلَيْنَا صَوْمَ شَهْرِ رَمَضَانَ فِي سَنَتِنَا، قَالَ: صَدَقَ. قَالَ: فَبِالَّذِي أَرْسَلَكَ آللَّهُ أَمَرَكَ بِهَذَا؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ وَزَعَمَ رَسُولُكَ أَنَّ عَلَيْنَا حَجَّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً، قَالَ: صَدَقَ، ثُمَّ وَلَّى، قَالَ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لاَ أَزِيدُ عَلَيْهِنَّ وَلاَ أَنْقُصُ مِنْهُنَّ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « لَئِنْ صَدَقَ لَيَدْخُلَنَّ الْجَنَّةَ». {الحديث/ ١٠٢. مختصر صحيح البخاري = تجريد البخاري/١، لاپەڕە: ٨١، ژمارە: ٥٦ = ٦٣ فتح البارى شرح صحيح البخارى} :

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: نەییمان لێ کرابوو، لە پرسیارکردنی زۆر، کە پرسیاری زۆر لە پێغەمبەر بکەین، مەگەر بەپێی پێویست، جا لەبەرئەوە حەزمان دەکرد کە پیاوێکی هۆشیاری سارا نشین بێ بۆ خزمەتی، وە پرسیاری لێ بکا، تا ئێمەیش گوێمان لێ بێو شتێ فێرببین!

جا رۆژێ پیاوێ (لە سارا نشینان) هات، گوتی: ئەی موحەممەد! نوێنەری تۆ هاتووە بۆ ناومان دەڵێ: گوایە تۆ دەڵێی: من فروستادەو پێغەمبەری خودام؟ فەرمووی: راست دەکا، گوتی: کەواتە کێ ئەم ئاسمانەی دروست کردووە؟ فەرمووی: خودا، گوتی: ئەی کێ ئەم زەوییەی دروست کردووە؟ فەرمووی: خودا، گوتی: ئەی کێ ئەم شاخو کێوانەی وەك گوڵمێچ داکوتاوەو ئەم کانو کانیو جۆرەها بەروبوومو شتومەکەی تیا داناوە؟ فەرمووی: خودا. گوتی: تۆ بیتو ئەو خودایەی کە ئەم ئاسمانو زەوییەی دروست کردووەو ئەم شاخانەی داکوتاوەو کردوونی بە مێخ بۆ دامەزراندنی زەویو بۆ راگرتنی لەنگەری جموجووڵی، ئایا خودا تۆی کردووە بە پێغەمبەرو رەوانەی کردووی بۆسەر ئێمە، کە پەیامی ئیسلاممان پێ رابگەیەنی یانا؟ فەرمووی: (بەڵێ من رەوانەکراوو پێغەمبەری ئەو خودایەم). گوتی: نوێنەرەکەت هەروا دەڵێ: گوایە هەموو کەسێ لە ئێمە شەوو رۆژی پێنج نوێژمان لەسەرە؟ فەرمووی: (راست دەکا). گوتی: جا تووئەو کەسەی کە تۆی کردووە بە پێغەمبەرو رەوانەی کردووی بۆسەر بەرەی جنۆکەو مرۆڤ، ئایا خودا فەرمانی بەوە پێ کردووی؟ فەرمووی: (بەڵێ). گوتی: رابەرەکەت: هەروا دەڵێ: زەکات لە

ماڵەکانیشمان دەکەویٚ؟ فەرمووی: (ڕاست دەکا). گوتی: جاتوو ئەو کەسەی کەتۆی کردووە بە پێغەمبەر ئایا خودا ئەمەی پیٚ گوتووی؟ فەرمووی: (بەڵیٚ). گوتی: ڕابەرەکەت دەشڵیٚ: گوایە هەموو ساڵیٚ ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانمان لەسەرە. فەرمووی: (ڕاست دەکا). گوتی: جا توو ئەو کەسەی کەتۆی کردووە بە پێغەمبەر ئایا خودا ئەمەی پیٚ گوتووی؟ فەرمووی: (بەڵیٚ). گوتی: نوێنەرەکەت دەشڵیٚ: گوایە حەجی خانەی خودایشمان لەسەرە، بۆ کەسیٚ کە تەوانای چوونو هاتنەوەی هەبیٚ. فەرمووی: (ڕاست دەکا).

ئەنجا پیاوەکە ڕۆیشتو گوتی: بەو کەسە کەتۆی کردووە بە پێغەمبەرو ئەم ئایینە ڕاستو دروستەی پیٚ داوی‌و کردوویتی بە نوێنەری خۆی، بۆ ڕاگەیاندنی ئایینی ئیسلام، نە لەمانە زیاتر دەکەمو نە لەمانەیش کەمتر دەکەم. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بیٚ) فەرمووی: (ئەگەر ڕاست بکا دەچێتە بەهەشت). {تاج/٢، لاپەڕە: ٦٦، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ١٢٩٥}.

## ١٥٤) نوێژ لەسەرەتاوە کە فەرزکرا دوو ڕکات دوو ڕکات بوو.

## باب: فرض الصَّلاَة رِكعَتَينِ رَكْعَتَين

٢٠٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها): أَنَّ الصَّلاَةَ أَوَّلَ مَا فُرِضَتْ رَكْعَتَيْنِ، فَأُقِرَّتْ صَلاَةُ السَّفَرِ، وَأُتِمَّتْ صَلاَةُ الْحضَرِ. قَالَ الزُّهْرِيُّ: فَقُلْتُ لِعُرْوَةَ: مَا بَالُ عَائِشَةَ تُتِمُّ فِي السَّفَرِ؟ قَالَ: إِنَّهَا تَأَوَّلَتْ كَمَا تَأَوَّلَ عُثْمَانُ. {الحديث/ ١٥٧٠. تجريد الباری/١/٢٣٨، رقم: ٢٢٢ = ٣٥٠، ١٠٩٠، ٣٩٣٥ فتح الباری شرح صحيح البخاری}:

عائیشەی دایکی موسوڵمانان (ڕەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: لەسەرەتاوە یەکەمجار کە خودای گەورە نوێژی فەرزکرد، دوو ڕکات دوو ڕکات فەرزی کرد، ئیتر نوێژ خوێن نیشتەجیٚ بوایە، یا ڕێبوار بوایە، گشت نوێژیٚ، دوو ڕکاتی دەکرد، جا نوێژی سەفەر وەك خۆی بە دوو ڕکاتی مایەوەو، لەسەر شێوەی یەکەمجاری چەسپاو دامەزرا، بەڵام نوێژی نیشتەجیٚ (مقیم) لێی زیادکرا.

ئیمامی زوهری (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: بە عورووەم گوت: ئـەوە هـۆی چییە کە عائیشـەی پـوورت لـە سـەفەردا، نوێـژە چـوارینەکان کـورت ناکاتـەوە، بەڵـکوو بەتەواوی دەیانکا بەچوار ڕکات؟

فەرمووی: (دیارە ئەویش وەك ئیمامی عوسمان، شتەکەی تەئویل کردووە کەلـە سەفەریشا، دروستە نوێژ کورت نەکرێتەوەو وەك نیشتەجێ بەچوار ڕکات بکرێ).

**ڕوونکردنەوە:**

ئیـمامی زوهـری (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) نـاوی پێشـەوا ئەبوبـەکر موحەممـەدی کـوڕی موسلیمە، نازناوی زوهرییە، ناسراوە بە ئیبنو شەهاب، لـە پەیڕەوانـە، لـە تابیعییـە بچکۆلەکانە، لەپەنجا – هەتا - پەنجاو شەشی کۆچی لەدایك بووە، لە پیاوانی شەش پەڕاوەکەیە، واتە: لە ڕیجالی کوتوبی سیتتەیە، کە بوخاریو موسلیمو ئـەبو داوودو نەسائیو ئیبنو ماجەن، فـەرموودەی لـە ئیبنـو عومـەرو ئەنـەسو هاوەڵانی تـرەوە وەرگرتـووە، ئیبنـو عومـەری بینیـوەو بـە خزمـەتی گەیشـتووە، وە فـەرموودەی لەوێشەوە گێڕاوەتەوە، هەندێ دەفەرموون: تەنیا دوو فەرموودەی لە ئیبنو عومـەر وەرگرتووە، فەقیەو شەرعزانێـکی گەورە بووە، یەکێ لە فەقێکانی زوهـری پێشـەوا عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بووە، کە پێشەوایەکی گـەورەی دادپـەروەری ناسـراوە، کـەپێش ئـەوەی ببـێ بـە جێنشینی موسـوڵمانان، ئیمـامی ئەنـەس جەماعـەتی لـە پشـتیەوە دەکـرد، پێشـەوا عومـەر کاتـێ دەمـرێ هەنـدێ پارچـە نینـۆكو مـووی پێغەمبەری هەبوو، ڕایسپارد کە لەناو کفنەکەیدا دایبنێنو لەگەڵیدا بینێژن.

ئیـمامی زوهـری هـەر وەك شـێخو مامۆسـتای زۆری هـەبووە، فـەقێو شـاگردی زۆریشـی هـەبووە، کـە فـەرموودەکانی ئـەویان گێڕاوەتـەوە، نزیکـەی دوو هـەزار فـەرموودەی هەیـە، نیوەیـان موسـنەدن. لـەیث دەفـەرموێ: زوهـری فـەرمووی: (هەرچیم لەبەرکردبێ لەبیرم نەچۆتەوە).

پیاوێـکی زۆر بەخشندە بوو، دەڵێن: ساڵی پـەنجای کۆچـی لـەدایك بـووە، وە لـە ڕەمەزانی ساڵی سەدو بیستو پێنجی کۆچیدا مردووە. (ڕەحمەتی خودای لێ بێ).

**١٥٩) پێنج نوێژە فەرزەکان دەبن بە کەفارەتی گوناهی نێوانیان.** (٥٣٩ - ٥٥١).
**باب: الصَّلَوَاتُ الخَمْسُ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُنَّ**

٢٠٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: « الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ، وَالْجُمُعَةُ إِلَى الْجُمُعَةِ، كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُنَّ، مَا لَمْ تُغْشَ الْكَبَائِرُ، وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ مُكَفِّرَاتٌ لِمَا بَيْنَهُنَّ مَا اجْتُنِبَتِ الْكَبَائِرُ). {الحديث/ ٥٥١} :

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەر پێنج نوێژە فەرزەکان، ئەم نوێژ تا ئەو نوێژو، نوێژی هەینی تا ئەو هەینی، دەبن بە کەفارەتی ئەو گوناهانەی کە لە نێوانیانا دەکرێن، بە مەرجێ گوناهی گەورە نەکرابێ، وە هەروەها گرتنی رۆژووی ئەم رەمەزان تا ئەو رەمەزانی تر دەبێ بە کەفارەت بۆ گوناهی نێوانیان، بەمەرجێ گوناهی گەورە نەکرابێ).
{ریاض/١، زنجیرە: ٣، ژمارە: ١٤/١٣٠} + {تاج/١، زنجیرە: ٤٣، ژمارە: ٧=ژ-٣٢٨ چ-٤} .

**١٦٠) نوێژ نەکردن کوفرە، واتە: بەو موسوڵمانەش دەگوترێ کافر کە تەرکی نوێژ بکات.** (٢٤٠ - ٢٤٣). {**باب: ترك الصَّلاَة كُفْرٌ**}

٢٠٤- عَنْ جَابِر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولِ اللّه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: « بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ الشِّرْكِ وَالْكُفرِ تَرْكَ الصَّلاَةِ ». {الحديث/ ٢٤٢} :

**جابیر** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی:** بەگوێی خۆم لە زاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیست، دەیفەرموو: (جیاوازی نێوانی پیاوی موسوڵمانو پیاوی بتپەرستو بێ بڕوا نوێژ نەکردنە کە تەرکی نوێژی کرد جیاوازی نامێنێ لەگەڵ ناموسوڵمانا).
{بڕوانە: ریاض/٣، زنجیرە: ١٩٣، ژمارە: ١٠٧٨/٥} + {تاج/١، زنجیرە: ٤٦، ژمارە: ٣٤٥} .

**١٦١) ڕێسایەکی کۆگیر بۆ دیاریکردنی کاتی نوێژە فەرزەکان.** (١٣٧٨ - ١٣٩٣).
**باب: جَامِعُ المَوَاقِيت**

٢٠٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللّهُ عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « وَقْتُ الظُّهْرِ إِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ، وَكَانَ ظِلُّ الرَّجُلِ كَطُولِهِ مَا لَمْ يَحْضُرِ الْعَصْرُ، وَوَقْتُ الْعَصْرِ مَا لَمْ تَصْفَرَّ الشَّمْسُ، وَوَقْتُ صَلاَةِ الْمَغْرِبِ مَا لَمْ يَغِبِ الشَّفَقُ،

وَوَقْتُ صَلاَةِ الْعِشَاءِ إِلَى نِصْفِ اللَّيْلِ الأَوْسَطِ، وَوَقْتُ صَلاَةِ الصُّبْحِ مِنْ طُلُوعِ الْفَجْرِ مَا لَمْ تَطْلُعِ الشَّمْسُ، فَإِذَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ فَأَمْسِكْ عَنِ الصَّلاَةِ، فَإِنَّهَا تَطْلُعُ بَيْنَ قَرْنَيْ الشَّيْطَانِ». {الحديث/ ١٣٨٧}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتی نوێژی نیوەڕۆ لەوکاتەوە دەست پێ دەکا، کە بەدیمەن خۆر لادەدا لە ناوەڕاستی ئاسمانو سێبەری هەموو کەسێك ڕێك بەقەد درێژی خۆی بێت، وە دەمێنێ هەتا نوێژی عەسر دادێ، وەکاتی نوێژی عەصر دەست پێ دەکا، لەوکاتەوە کە سێبەری هەموو شتێ بەقەد خۆی دەبێ، زیاد لە سێبەری کاتی زەوالی، وە دەمێنێ هەتا گۆی خۆر زەرد هەڵ دەگەڕێ، هەتا کاتی زەردەپەڕ. وەکاتی نوێژی شێوان (کە خۆرئاوا بوو) دەست پێ دەکا، وە دەمێنێ هەتا سووری کەناری ئاسمان ون دەبێ، ئیتر کاتی نوێژی خەوتنان دەست پێ دەکا، وە هەتا نیوە شەو دەمێنێ، بەڵکوو هەتا بانگی بەیانی دەمێنێ، کاتی نوێژی بەیانیش لە شەبەقی بەیانەکییەوە دەست پێ دەکا هەتا خۆر دەکەوێ، جا کاتێ خۆر کەوت ئیتر واز لە نوێژکردن بهێنن، چونکە خۆر کە هەڵ دێ لەنێوانی دوو شاخەی شەیتانەوە هەڵ دێو ناموسوڵمانەکان لەودەمەدا کوڕنووشی بۆ دەبەن). {تاج/١، زنجیره: ٤٧، ژماره: ٣٥٠ هەتا ژماره: ٣٧٧}.

**ڕوونکردنەوە:**

ئەوەوی دەفەرموێ: (باشتر ئەوەیە کە مەبەست لەدوو شاخەی شەیتان ئەوەیە: کە شەیتان لەوکاتەدا سەری لە ئاستی گۆی خۆر نزیك دەکاتەوە، هەتا بەدیمەن خۆر پەرستەکان کە لەوکاتەدا کوڕنووش بۆ خۆر دەبەن، وەك کوڕنووش بۆ شەیتان بەرن وا).

٢٠٦- عَنْ أَبِي مُوسَى الأشعري (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (أَنَّهُ أَتَاهُ سَائِلٌ يَسْأَلُهُ عَنْ مَوَاقِيتِ الصَّلاَةِ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ شَيْئًا، قَالَ: فَأمَرَ بِلالاً، فَأَقَامَ الْفَجْرَ حِينَ انْشَقَّ الْفَجْرُ، وَالنَّاسُ لاَ يَكَادُ يَعْرِفُ بَعْضُهُمْ بَعْضًا، ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ بِالظُّهْرِ حِينَ زَالَتِ الشَّمْسُ، وَالْقَائِلُ يَقُولُ: قَدِ انْتَصَفَ النَّهَارُ، وَهُوَ كَانَ أَعْلَمَ مِنْهُمْ، ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ بِالْعَصْرِ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ، ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ بِالْمَغْرِبِ حِينَ وَقَعَتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ أَمَرَهُ

**فَأَقَامَ الْعِشَاءَ حِينَ غَابَ الشَّفَقُ، ثُمَّ أَخَّرَ الْفَجْرَ مِنَ الْغَدِ حَتَّى انْصَرَفَ مِنْهَا وَالْقَائِلُ يَقُولُ: قَدْ طَلَعَتِ الشَّمْسُ أَوْ كَادَتْ، ثُمَّ أَخَّرَ الظُّهْرَ حَتَّى كَانَ قَرِيبًا مِنْ وَقْتِ الْعَصْرِ بِالأَمْسِ، ثُمَّ أَخَّرَ الْعَصْرَ حَتَّى انصَرَفَ مِنْهَا وَالْقَائِلُ يَقُولُ: لَقَدِ احْمَرَّتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ أَخَّرَ الْمَغْرِبَ حَتَّى كَانَ عِنْدَ سُقُوطِ الشَّفَقِ، ثُمَّ أَخَّرَ الْعِشَاءَ حَتَّى كَانَ ثُلُثُ اللَّيْلِ الأَوَّلُ، ثُمَّ أَصْبَحَ، فَدَعَا السَّائِلَ، فَقَالَ: « الْوَقْتُ بَيْنَ هَذَيْنِ». {الحديث/ ١٣٩٢}:**

**ئەبو موسای ئەشعەری** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: جارێ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **پرسیار کارێ پرسیاری کاتی نوێژە فەرزەکانی لێ کرد، کە کەی و کەین؟**

**پێغەمبەریش** (دروودی خودای لەسەر بێ) **هیچ وەڵامی نەدایەوە، گوتی: جا فەرمانی کرد بە بیلال بانگی بەیانیدا، ئەوکاتە نوێژی بەیانی بۆ کردین کە شەبەق دەدا، کە هێشتا لەبەر تاریکی نوێژ خوێنەکان بەباشی یەکتریان نەدەناسییەوە، پاشان فەرمانی پێکرد، ئەوکاتە بانگی نیوەڕۆی دا کەخۆر بەدیمەن لە ناوەڕاستی ئاسمان لادەدا، کە لەزاراوی شەرعی پیرۆزدا ناسراوە بەکاتی زەوال، یا کاتی لادانی گۆی خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان، کە هەموو کەس دەیگوت: ڕۆژ نیوە بووە، بەڵام پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **خۆی لەم بارەیەوە لەوان باشتر ئەوکاتەی دەزانی، چونکە بەنیگا کاتی نوێژەکانی بۆ دیاری کرابوو، ئەوکاتەیش فەرمانی بە بیلال کرد، کە نوێژی عەصر رابگەیەنێ، کە خۆر هێشتا زۆر بەرز بوو، پاشان کاتێ خۆر تەواو ئاوا بوو، فەرمانی بە بیلال کرد کە نوێژی شێوان رابگەیەنێ، ئەوجا ئەوکاتە فەرمانی پێکرد کە نوێژی خەوتنان رابگەیەنێ، کە سوورایی کەناری ئاسمان ون دەبێ و نامێنێ.**

**بۆ سبەینێش کردنی نوێژی بەیانی وا دواخست، تەنانەت کە لەنوێژەکە بۆوە، هەبوو دەیگوت: خۆ ئەوە خۆر کەوتووە، یا خەریکە کەخۆر بکەوێ، وە نوێژی نیوەڕۆشی ئەوەندە دواخست، هەتا نزیکی کاتی بوونی نوێژی عەصری دوێنێ، وە نوێژی عەصریشی وا دواخست، کاتێ کە لەنوێژ بۆوە، هەبوو دەیگوت: خۆ خۆر زەرد هەڵگەڕاوەو کاتی زەردە پەڕە، وە نوێژی شێوانیشی دواخست، هەتا کاتی نەمانی سوورایی کەناری ئاسمان، وە نوێژی خەوتنانیشی دواخست هەتا سێیەکی**

یەکەمی شەو ڕۆیشت. ئەوجا بۆ بەیانی ناردی بەشوێن پرسیارکەرەکەداو کەهات پێی فەرموو: (وەکاتی سەرەتاو کۆتایی هەموو نوێژێ لەناوەندی ئەم دوو کاتەدایە، کە دوێنێو ئەمڕۆ نیشانی ئێوەم دا). ئەوەوی دەفەرموێ: چونکە پیاوەکە کەپرسیاری کاتی نوێژەکانی لە پێغەمبەر کرد، پێی فەرموو: (ئەم دوو ڕۆژە بە کۆمەڵ (جەماعەت) نوێژ لەگەڵ ئێمە بکە، هەتا بەکردەوە بزانیت).

### ١٦٢) کردنی نوێژی بەیانی بە تاریك و لیلەکە. (١٤٥٥ - ١٤٦٢).

### بابٌ: التغليس في صلاة الصُبْح

٢٠٧- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو (بْنِ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ) (رضيَ اللّٰهُ عنهم)، قَالَ: لَمَّا قَدِمَ الْحَجَّاجُ الْمَدِينَةَ، فَسَأَلْنَا جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ، فَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي الظُّهْرَ بِالْهَاجِرَةِ، وَالْعَصْرَ وَالشَّمْسُ نَقِيَّةٌ، وَالْمَغْرِبَ إِذَا وَجَبَتْ، وَالْعِشَاءَ أَحْيَانًا يُؤَخِّرُهَا وَأَحْيَانًا يُعَجِّلُ، كَانَ إِذَا رَآهُمْ قَدِ اجْتَمَعُوا عَجَّلَ، وَإِذَا رَآهُمْ قَدْ أَبْطَئُوا أَخَّرَ، وَالصُّبْحَ كَانُوا أَوْ - قَالَ - كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّيهَا بِغَلَسٍ. {الحديث/ ١٤٥٨ = تجريد البخاري بەرگی/١، لاپەڕە: ٣٣٢، ژمارە: ٣٣٠ = ٥٦٠، ٥٦٥ = فتح الباري شرح صحيح البخاري}:

موحەممەدی کوڕی حەسەنی کوڕی ئیمامی عەلی (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: کاتێ حەججاج هات بۆ مەدینە، لە جابیری کوڕی عەبدوڵلامان پرسی: لەچی کاتێکا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نوێژە فەرزەکانی دەکرد؟ فەرمووی: لە قرچەی گەرمای نیوەڕۆدا، نوێژی نیوەڕۆی دەکرد، کە نوێژی عەصریشی دەکرد خۆر هێشتا بەگوڕ بوو، تینی مابوو، زەرد هەڵنەگەڕابوو، کە خۆریش ئاوا دەبوو نوێژی شێوانی دەکرد،، نوێژی خەوتنانیشی جاروبار پێش دەخستو، جاروباریش دوای دەخست، لەسەر ئەم شێوەیە: ئەگەر نوێژ خوێنەکان زوو کۆببونایەتەوە، ئەوا زوو بەزوو جەماعەتی خەوتنانی بۆ دەکردین، بەڵام ئەگەر نوێژکەرەکان درەنگ بهاتنایە، ئەویش جەماعەتی نوێژی خەوتنانی دوادەخست، بە تاریکو لێڵەکەیش نوێژی

بەيانيانيان دەكرد، يا فەرمووى: تاريكو لێڵەكەيش پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) نوێژى بەيانى بۆ دەكردن). {تاج/١/١٩٦، ژمارە: ٣٥١/٤}.

**روونكردنەوە:**

١-هۆى ئەم پرسيارەيان ئەوەبوو، كە حەجاجى كوڕى يوسوفى ثەقەفى بوو بە فەرمانڕەواى مەدينە، بە پێچەوانەى سوننەتەوە، نوێژە فەرزەكانى لەكاتى پەسەندى خۆيان دوادەخست.

٢-لەپاش شەهيد كردنى عەبدوڵڵاى كوڕى زوبەير، عەبدولمەليكى كوڕى مەڕوان، حەجاجى كرد بە ميرى سەر مەدينەو مەككەو دەوروبەريانو دواتر گواستيەوە بۆ عێراق. (فتح رقم: ٥٦٠).

٣-موحەممەدى كوڕى عەمرى كوڕى حەسەنى كوڕى عەلى كوڕى ئەبوطاليب، لە پياوانى ئەم پەڕاوانەى فەرموودەيەو خاوەنانى ئەم پەڕاوانە، فەرموودەى پێغەمبەريان لەوەوە گێڕاوەتەوە: بوخارىو موسليمو ئەبو داوودو نەسائى، واتە: جێى باوەڕى ئەم زاتانە بووە، گێڕانەوەى لەم زاتانەوە ئەنجامداوە: (لەزەينەبى كچى عەلى كەپوورى باوكى بووە، لە ئيبنو عەبباسو لە ئيمامى جابيرەوە).

### ١٦٣) پارێزگارى نوێژى بەيانىو عەصر (١٤٣٠ - ١٤٣٧).

### باب: المحافظة علَى صَلَاةِ الصُّبْحِ وَالعَصْرِ

٢٠٨- عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عُمَارَةَ بْنِ رُؤَيْبَةَ عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: « لَنْ يَلِجَ النَّارَ أَحَدٌ صَلَّى قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ، وَقَبْلَ غُرُوبِهَا، يَعْنِي الْفَجْرَ وَالْعَصْرَ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْبَصْرَةِ: آنْتَ سَمِعْتَ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ الرَّجُلُ: وَأَنَا أَشْهَدُ أَنِّي سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سَمِعَتْهُ أُذُنَايَ وَوَعَاهُ). {الحديث/ ١٤٣٤}:

ئەبوبەكرى كوڕى عومارەى كوڕى روئەيبە (رەزاى خودايان لێ بێ) فەرمووى: عومارەى باوكم فەرمووى: لە پێغەمبەرم بيست دەيفەرموو (دروودى خوداى لەسەر بێ): (هەر

موسـوڵمانێ نوێـژی بـەیانی بکـا، کـە هـەتا خۆرکـەوتن دەمێنـێ، هـەروەها نوێـژی عەسریش بکا، کـە هـەتا خۆرئـاوا بـوون دەمێنـێ، هـەر موسـوڵمانێ ئـەم دوو نوێـژە لەکاتی خۆیاندا بکا، هەرگیز ناچێتە ناو ئاگری دۆزەخ).

پیاوێـکی خەڵـکی بەصرە پێـی دەفـەرموێ: (ئایا تـۆ بۆخـۆت ئەمـەت لـەزاری پیرۆزی پێغەمبەر خۆی، بەگوێی خۆت بیستووە کەوا بفەرموێ؟).

فـەرمووی: بـەڵێ، پیاوەکـەیش فـەرمووی: دەی منـیش شـایەتی دەدەم کـە ئـەم فەرموودەیەم بەگوێی خۆم لـەزاری پـیرۆزی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیسـتووە، وە بەدڵیشم تێی گەیشتووم).

**روونکردنەوە:**

عومـارەی کـوڕی رەئوبـەی ثـەقـەفی، کونیـەی ئـەبو زهرەیـە، کووفییـە، دوو فەرموودەی هەیە، ئەمە یەکێـکیانە، ئـەم زاتانـە لـەوەوە گێڕانـەوەیان ئەنجامـداوە: ئەبوبەکری کوڕیو حوصەینو عەبدوڵەلیکی کوڕی عومەیر.

٢٠٩- عَنْ أَبِى بَكْرِ بن أبى موسى الأشعرى عَنْ أَبِيهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: « مَـنْ صَـلَّى الْبَـرْدَيْنِ دَخَـلَ الْجَنَّـةَ ». {الحـديث/ ١٤٣٦ = تجريـد البخارى/١/٣٣٧، رقم: ٣٣٥ = ٥٧٤ فتح البارى}:

ئەبوبـەکری کـوڕی ئـەبو مووسـای ئەشـعەری فـەرمووی: بـاوکم فـەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ دوو نوێـژە فێنکەکـە بکـا، کـە نوێژی بەیانیو نوێژی عەصرن، دەچێتە بەهەشت). {ریاض/٣، زنجیرە: ١٨٨، ژمارە: ١٠٧٤ + تاج/١، لاپەڕە: ١٩٠ چاپی یەکەم، ژمارە: ٣٣٩ چاپی دووەم}.

**١٦٤) لەم دوو کاتەدا نوێژکردن ناباشەو نەیی لێکراوە لەکاتی خۆرکەوتنو لەکاتی خۆر ئاوا بووندا.**

٢١٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِىَ اللَّهُ عنها) قَالَتْ: لَمْ يَدَعْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعَصْرِ، قَـالَ: فَقَالَـتْ عَائِشَـةُ: قَـالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ): « لاَ تَتَحَرَّوْا طُلُوعَ الشَّمْسِ وَلاَ غُرُوبَهَا، فَتُصَلُّوا عِنْدَ ذَلِكَ». {الحديث/ ١٩٢٩ + تجريد البخاري: ٣٤٣ = ٥٩٢، ٣٩٠ فتح}:

**خاتوو عائیشه** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دوو رکات نوێژی سوننەتی پاش عەصری تەرك نەدەكرد.**

**راوی دەفەرموێ: عائیشه فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەیفەرموو: (بەقەستی لەكاتی خۆركەوتن، یا لەكاتی خۆر ئاوابوونا،، نوێژ مەكەن). {تاج/١/٥٠، ژمارە: ٣٧٣}.**

**نەوەوی دەفەرموێ: ئەم نەیی كردنە لە نوێژ لەم دوو كاتەدا، ئەم دوو جۆرە نوێژە دەگرێتەوە:**

**١-كەسێ بەقەستی نوێژی فەرز، وەك نوێژی بەیانی، یا نوێژی عەصر، دوابخات، بۆ ئەوكاتە ناباشە، بەبێ مەهانەیەكی رەوا.**

**٢-كردنی ئەو نوێژە سوننەتانەی كە هۆیەكی تایبەتییان نییە، لەوكاتی ناباشییەدا.**

## ١٦٥) كردنی نوێژی نیوەڕۆ لەسەرەتای كاتەكەیدا (١٤٠٣ - ١٤٠٦).

## باب: صَلاَةُ الظُّهْرِ أَوَّلَ الوَقْتِ

٢١١- عَنْ خَبَّابٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَشَكَوْنَا إِلَيْهِ حَرَّ الرَّمْضَاءِ، فَلَمْ يُشْكِنَا، قَالَ زُهَيْرٌ: قُلْتُ لأَبِى إِسْحَاقَ: أَفِى الظُّهْرِ؟ قَالَ: نَعَمْ، قُلْتُ: أَفِى تَعْجِيلِهَا؟ قَالَ: نَعَمْ). {الحديث/ ١٤٠٥}:

**خەبباب** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: چووینە خزمەتی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **سكاڵای گەرمی چەوولی جێگە كوڕنووشی خۆمان لە خزمەتدا كرد، كە ڕێگەمان پێ بدا، كە نوێژ دوا بخەین، هەتا فێنك دەكا، بەڵام سكاڵای نەپرسین و ڕێگەی ئەوەی نەدایـن. زوهەیر (كە مامۆستای مامۆستاكەی موسلیمە لە گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیەدا) دەفەرموێ: لە ئەبو ئیسحاقی مامۆستای خۆمم پرسی: ئایا مەبەست لەم نوێژە لەمكاتە گەرمەدا نوێژی نیوەڕۆیە؟ فەرمووی: بەڵێ، گوتم: ئایا سكاڵای ئەوەیان لە خزمەت پێغەمبەردا كردووە كە نوێژەكە لە قرچەی گەرمای**

نیوەڕۆدا نەکەنو دوای بخەن هەتا فێنك دەکا، ئەویش ڕێگەی ئەوەی نەداون؟ فەرمووی: بەڵێ.

**ڕوونکردنەوە:**

١- کاتی زۆرباش بۆ کردنی هەموو نوێژێ، سەرەتای کاتەکەیەتی.

٢- خەبابی کوڕی ئەرەت (ڕەزای خودای لێ بێ) لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکانە، ئازاری زۆری چەشتووە لەسەر ئیسلامەتی لە زوربەی شەڕو شەڕگاکانی ئیسلامدا بەشداری کردووە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەیمانی برایەتی بەست، لەنێوانی ئەوو جەبری کوڕی عەتیکدا، سیو دوو فەرموودەی هەیە، بوخاری پێنجیانی گێڕاوەتەوە، لەسەردەمی نەزانیدا ئاسنگەر بوو، شمشێری دروست دەکرد، خەبباب دەیفەرموو: جارێ لەسەر ئیسلامەتی ئاگرێکیان کردەوە بۆم، ئەوجا ڕایانکێشام بەسەریدا، بەرە بەرە چەوریو بەزی پشتم ئاگرەکەی کوژاندەوە! پشتی بەهۆی ئەم کارەساتی سووتاندنەوە چاڵو چوێڵ بوو بوو، لە کووفە نیشتەجێ بوو، لە تەمەنی شەستو سێ ساڵیدا، لە کووفە، لە (٣٧) سیو حەوتی کۆچیدا بە مەرگی خودا مرد، پێشەوا عەلی نوێژی لەسەر تەرمەکەی کرد.

## ١٦٦) کردنی نوێژ لە فێنکیدا لەکاتی گەرمای سەختدا
## باب: الإبْرادِ بِالصَّلَاةِ فِي شِدَّةِ الحَرِّ

٢١٢- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَذَّنَ مُؤَذِّنُ رَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالظُّهْرِ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « أَبْرِدْ أَبْرِدْ » أَوْ قَالَ: «انْتَظِرِ انْتَظِرْ» وَقَالَ: إِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ، فَإِذَا اشْتَدَّ الْحَرُّ فَأَبْرِدُوا عَنِ الصَّلَاةِ » . قَالَ أبو ذَر: حَتَّى رَأَيْنَا فَيْءَ التُّلُولِ). {الحديث/ ١٣٩٩، تجريد بخارى/١/٣٢٢، رقم: ٣١٦ = ٥٣٩، ٥٣٥ فتح البارى}:

ئەم فەرموودەیە لە بوخاریدا ئاوایە، باشترین شەرحو ڕاڤەیە بۆ ئەم گێڕانەوەی موسلیم: ئەبو زەڕی غیفاری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەرێکا، لە

خزمـەتی پێغەمبـەردا بووین، بانگبێـژ کـە بـیلال بـوو، ویستـی بـانگی نیوەڕۆبـدا، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) پێـی فـەرموو: (بیخـەرە کـاتی فێنکـی) لەپاشـا پـاش ماوەیێ تـریش بـیلال ویستـی بـانگ بـدا، دیسان پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) پێـی فەرموو: (زیاتریش بیخەرە فێنکی). ئیتر هەموو جارێ کـە بـیلال دەیویست بـانگ بـدا، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێـی دەفـەرموو: (زیـاتریش بـا فێنـك بکا) هـەتا روانیمان کەوا گردو تەپۆڵکەی دەوروبەرمان سێبەری لای ئێوارەیان پەیدا کـردووە، ئەوجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) رێـگەی بیلالی دا، بانگی ئەو نیوەڕۆیەی دا).

لێرەدا ئەمەی پترە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (کـە گـەرما داهـات، بەفێنکی نوێژی نیـوەڕۆ بکـەنو ماوەیـێ دوای بخـەن، لەقرچـەی گـەرمای نیـوەڕۆدا مەیکەن، چونکە گەرمای قرچەی نیوەڕۆ لە هالاوی ئاگری دۆزەخە).

**١١٧) سەرەتای کاتی نوێژی عەسر.** (١٤٠٧ - ١٤١٥). {**باب**: **أَوَّلِ وَقْتِ صلاة العَصْرِ**}

٢١٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يُصَلِّي الْعَصْرَ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ حَيَّةٌ، فَيَذْهَبُ الذَّاهِبُ إِلَـى الْعَـوَالِي فَيَـأْتِي الْعَـوَالِيَ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ). {الحديث/ ١٤٠٧، تجريد البخاری/١/٣٢٧، رقم: ٣٢٢ = ٥٥٠ فتح الباری شرح صحيح البخاری}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران کـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) جەماعەتی نوێـژی عەصـری بۆمـان دەکـرد، هێشـتا خـۆر بـەرزو بـەتینو بەشـەوق بوو، هەبوو دوائەوە دەچوو بـۆ عـەوالی کـە دەگەیشـتە ئـەوێ هێشـتا هـەر خـۆر بـەرز بوو. عەوالی چەند گوندێـك بـوون، لـە دەوری شـاری مەدینـە بـوون، نزیکەکـەیان دوو میل دوور بوو، لە مەدینەوە، دوورەکەیان هەشت میل دەبوو، هەیان بوو دەوری چـوار میل دوور بوو). {تاج/١، زنجيرە: ٤٧، ژمارە: ٣٥٧}.

٢١٤- عَنِ الْعَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) فِي دَارِهِ بِالْبَصْرَةِ حِينَ انْصَرَفَ مِنَ الظُّهْرِ، وَدَارُهُ بِجَنْبِ الْمَسْجِدِ، فَلَمَّا دَخَلْنَا عَلَيْـهِ، قَـالَ: أَصَلَّيْتُمُ الْعَصْرَ؟ فَقُلْنَا لَهُ: إِنَّمَا انْصَرَفْنَا السَّاعَةَ مِنَ الظُّهْرِ، قَـالَ: فَصَلُّوا الْعَصْـرَ، فَقُمْنَـا

فَصَلَّيْنَا فَلَمَّا انْصَرَفْنَا قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: « تِلْكَ صَلاَةُ الْمُنَافِقِ يَجْلِسُ يَرْقُبُ الشَّمْسَ، حَتَّى إِذَا كَانَتْ بَيْنَ قَرْنَيِ الشَّيْطَانِ فَنَقَرَهَا أَرْبَعًا لاَ يَذْكُرُ اللَّهَ فِيهَا إِلاَّ قَلِيلاً». {الحديث/ ١٤١١}:

عەبدوڵلا كوڕی عەبدوڕەحمان فەرمووی: چووین بۆ خزمەتی ئەنەسی كوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) بۆ ماڵەكەی ئەنەس خۆی كە لەپاڵ مزگەوتدا بوو، لەشاری بەصرە، هەر كە لەجەماعەتی نوێژی نیوەڕۆ بووینەوە یەكسەر چووین بۆ خزمەتی، ئەنەس پێی فەرمووین: ئایا نوێژی عەصرتان كردووە؟ پێمان گوت: نوێژی عەصری چی؟ ئێمە ئا ئێستا لەنوێژی نیوەڕۆ بووینەوە، نوێژی عەصر زۆری ماوە كە ببێ!! فەرمووی: دەهەڵسن نوێژی عەصر بكەن، دوایی تێتان دەگەیەنم، ئێمەیش هەڵساین‌و لەوێ، لەلای ئەو، نوێژی عەصرمان بەجەماعەت كرد، كە سڵاومان دایەوە ئەنەس فەرمووی: (لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: ئەو جۆرە نوێژە، كە نوێژ خوێن چاوەنواڕی خۆر دەكا، هەتا دەچێتە نێوانی دوو شاخەی شەیتانەوە، كەكاتی خۆرئاوا بوون‌و خۆركەوتنە، ئەوسا بە پەلەپەل، وەك مەلێ دەنووك بدا لە زەوی، چوار ركات نوێژی عەسر دەكا، یا دوو ركات نوێژی بەیانی دەكا، ئەوە ئەو جۆرە نوێژ كردنە، لەم دوو كاتە ناپەسەندەدا، نوێژی ناپاك‌و مونافیقانە، كە بەدەگمەن یادی خودای تیادەكەن).

**روونكردنەوە:**

١-بۆ تێگەیشتنی تەواو لە واتای دوو شاخەی شەیتان، بفەرموو بڕوانە روونكردنەوەكەی نەوەوی لە فەرموودەی ژمارە: ٢٠٥ كە كەمێ لەمەوپێش رابورد، هەروا بڕوانە رای نەوەوی لەپاش فەرموودەی ژمارە: ٢١٠.

٢-عەلای كوڕی عەبدوڕەحمانی یەعقوب لە ریجالی كوتوبی ئەربەعەیە، عەبدوڵلای كوڕی ئیمام ئەحمەد دەفەرموێ: متمانە پێكراوە، نەمدیوە كەسێ ناوی بەخراپە بەرێ، گێڕانەوەی لە باوكی‌و ئیبنو عومەرو ئەنەس‌و كەسانی ترەوە ئەنجام داوە.

### ١١٨) پارێزگاری نوێژی عەصرو نەیی کردن لەنوێژ لەپاشی (١٩١٧ - ١٩٣٤).
### باب: المحافظة على العصر والنهي عن الصلاة بعدها

٢١٥- عَنْ أَبِى بَصْرَةَ الْغِفَارِيِّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْعَصْرَ بِ(الْمُخَمَّصِ) فَقَالَ: « إِنَّ هَذِهِ الصَّلاَةَ عُرِضَتْ عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ فَضَيَّعُوهَا، فَمَنْ حَافَظَ عَلَيْهَا، كَانَ لَهُ أَجْرُهُ مَرَّتَيْنِ، وَلاَ صَلاَةَ بَعْدَهَا حَتَّى يَطْلُعَ الشَّاهِدُ». — وَالشَّاهِدُ: النَّجْمُ -. {الحديث/ ١٩٢٤}. {تاج/١، لاپەرە: ١٩١، زنجیرە: ٤٥، ژمارە: ٣٤٣}:

ئەبو بەسرەی غیفاری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە موخەممەص، کەناوی شوێنێکی ناسراوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێشنوێژی نوێژی عەصری بۆمان کردو فەرمووی: (نوێژکردن لەم کاتی نوێژی عەسرەدا، دانرابوو لەسەر نەتەوەکانی پێش ئێوە، بەڵام ئەوان نوێژی ئەم کاتی عەسرەیان زایە کردو بایەخیان پێ نەدا، دەی ئێوە بە پێچەوانەی ئەوانەوە ئاگاداری ئەم نوێژی عەسرە بکەنو بایەخی پێ بدەنو لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا ئەنجامی بدەن، ئەوەی کە ئاوا بکا لەجیاتی پاداشێ دوو پاداشی باشی بۆ هەیە). فەرمووشی (دروودی خودای لەسەر بێ): (لەپاش کردنی نوێژی عەسریش هەتا ئەستێرە هەڵ دێ نوێژی تر ناکرێ). راوی دەفەرموێ: مەبەست لە (شاهید) لە فەرموودەکەدا ئەستێرەی ئاسایيە، کە هەڵهاتنەکەی بەڵگەی هاتنی شەوە.

**روونکردنەوە:**

ئەبو بەسرەی غیفاری لە حیجاز نیشتەجێ بوو، ئامادەی ئازادکردنی وڵاتی میصر بوو، وە لەوێ نیشتەجێ بوو وە لەوێش مرد.

### ١١٩) هەڕەشەکردن لەو کەسەی کە نوێژی عەسری دەچێ
### باب: التشديد في الذي تفوته صلاة العصر

٢١٦- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « الَّذِى تَفُوتُهُ صَلاَةُ الْعَصْرِ كَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلَهُ وَمَالَهُ». {الحديث/ ١٤١٦. بخاري/٥٥٢ = تجريد البخاري/١/٣٢٨، ژمارە: ٣٢٣}:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ نوێژی عەسری بچێ، وەك ماڵو منداڵو کەسوکاری خۆی بەفیڕۆ دابنێ وایە). {تاج/١/١٩٠/٤، ژمارە: ٣٤٠ — ش/د/ت}.

**١٢٠) مەبەست لە (الصَّلاةُ الوُسْطى) کام نوێژەیە، کە لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: {حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ والصَّلاةِ الوُسْطَى}. {باب: مَاجاءَ فِي الصَّلاةِ الوُسْطى}**

٢١٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: حَبَسَ الْمُشْرِكُونَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ صَلاَةِ الْعَصْرِ، حَتَّى احْمَرَّتِ الشَّمْسُ أَوِ اصْفَرَّتْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «شَغَلُونَا عَنِ الصَّلاَةِ الْوُسْطَى صَلاَةِ الْعَصْرِ، مَلأَ اللَّهُ أَجْوَافَهُمْ وَقُبُورَهُمْ نَارًا، أَوْ قَالَ: حَشَا اللَّهُ أَجْوَافَهُمْ وَقُبُورَهُمْ نَارًا». {الحديث/ ١٤٢٥، بخاري: ٢٩٣١، ٤١١١، ٤٥٣٣، ٦٣٩٦}:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی غەزای خەندەق، بێباوەڕانی قوڕەیش، مەودای پێغەمبەریان نەدا، کە نوێژی عەصر بکا، هەتا خۆر سوور یا زەرد هەڵگەڕاو ئاوابوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم بۆنەیەوە فەرمووی: (خودا هەناوو گۆڕیان پڕکا لە ئاگر، بەهۆی ئەوانەوە نەمان پەڕژا، کە نوێژی ناوەڕاست بکەین، کە نوێژی عەصرە) یا فەرمووی: (خودا هەناوو گۆڕیان لەئاگر بئاخنێ... تاد).

لە تاجول ئوصولا دەفەرموێ: (لەپاشان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی عەصری لەناوەندی نوێژی شێوانو خەوتناندا کرد). {تاج/١، لاپەڕە: ١٩١، زنجیرە: ٤٥، ژمارە: ٣٤٢ — ش/د/ت/ن = شەیخانو ئەبو داوودو تەرمەزیو نەسائی}.

**١٢١) نەهی کردن لە نوێژکردن لەپاش کردنی نوێژی عەصرو لەپاش کردنی نوێژی بەیانی. (١٩١٧ - ١٩٣٤). {باب: النَّهْيُ عَنِ الصَّلاةِ بَعْدَ العَصْرِ وبَعْدَ الصُّبْحِ}**

٢١٨- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، نَهى عَنِ الصَّلاَةِ بَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ، وَعَنِ الصَّلاَةِ بَعْدَ الصُّبْحِ، حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ). {الحديث/ ١٩١٧}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیری لەکردنی نوێژی سوننەت دەکرد لەپاش کردنی نوێژی عەصر، هەتا خۆرئاوا دەبوو، هەروەها لەپاش کردنی نوێژی بەیانی، تا خۆر هەڵ دەهات، رێگەی کردنی نوێژی سوننەتی نەدەدا). {بڕوانە: تاج/١، زنجیرە: ٥٠ بەتەواوی} + {تەجرید/١، لاپەڕە: ٣٣٨ هەتا ٣٤١ لە ژمارە: ٣٣٨ وە هەتا ژمارە: ٣٤٣}.

## ١٢٢) سێ كات هەن نە نوێژیان تیادەكرێ نە مردوویان تیا دەنێژرێ.
## باب: ثلاث ساعَاتٍ لاَ يُصلّي فيهنَّ ولاَ يُقْبَرُ

٢١٩- عَنْ عُلَيِّ بْنِ رَبَاحٍ قَالَ: سَمِعْتُ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ الْجُهَنِيَّ يَقُولُ: ثَلاَثُ سَاعَاتٍ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَنْهَانَا أَنْ نُصَلِّيَ فِيهِنَّ أَوْ أَنْ نَقْبُرَ فِيهِنَّ مَوْتَانَا: حِينَ تَطْلُعُ الشَّمْسُ بَازِغَةً حَتَّى تَرْتَفِعَ، وَحِينَ يَقُومُ قَائِمُ الظَّهِيرَةِ حَتَّى تَمِيلَ الشَّمْسُ، وَحِينَ تَضَيَّفُ الشَّمْسُ لِلْغُرُوبِ حَتَّى تَغْرُبَ). {الحديث/ ١٩٢٦.}:

عەلی كوڕی رەباح فەرمووی: لە عوقبەی كوڕی عامیری جوهەنیم بیست دەیفەرموو: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم سێ كاتەدا نەهی لێ كردین، كە نوێژیان تیا بكەین، یا مردوومانیان تیا بنێژین: یەكەم: ئەوكاتە كە خۆر هەڵ دێو گزنگ دەدا هەتا بەقەد رمێك بەرز دەبێتەوە، دووەم: ئەوكاتە كە قرچەی نیوەڕۆ هەڵ دەستێو راوەستاو لەبەر خۆر لەوكاتەدا سێبەری نامێنێ، نە بەلای خۆر هەڵاتاو نە بەلای خۆرئاوادا سێبەری شتی بەرخۆر نامێنێ، سێیەم: ئەوكاتەیش كەخۆر بەرەو ئاوا بوون شۆڕ دەبێتەوە، هەتا ئاوا دەبێ.

{تاج/١، لاپەڕە: ٥٧٦، زنجیرە: ٢٢١، ژمارە: ١١٣٧}.

**روونكردنەوە:**

عوقبەی كوڕی عامیری جوهەنی، پەنجاو پێنج فەرموودەی هەیە، لە بوخاریو موسلیمدا فەرموودەی هەیە، لە صەحیحی بوخاریدا هەشت فەرموودەی هەیە، قورئان خوێنێكی جوان بوو، فەرائیززان بوو، شارەزای شەرع بوو، زمانێكی رەوانو

پاراوی هەبوو، هەستیار (شاعیر) بوو، نووسەر بوو، هەموو قورئانی لەبەربوو، قورئانێکی بەدەستی خۆی بۆ خۆی نووسیبوو، لەکۆتاکەیەوە نووسیبووی: عوقبەی کوڕی عامیر بەدەستی خۆی نووسیویەتی.

والی موعاویە بوو لەسەر وڵاتی میصر، ساڵی پەنجاو هەشتی کۆچی لە میسر مردووە.

## ١٢٣) لەبارەی دوو رکات نوێژ لەپاش کردنی نوێژی عەصر
## باب: فِي الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعَصْرِ

٢٢٠- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عنهما) عَنِ السَّجْدَتَيْنِ اللَّتَيْنِ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّيهِمَا بَعْدَ الْعَصْرِ؟ فَقَالَتْ: كَانَ يُصَلِّيهِمَا قَبْلَ الْعَصْرِ ثُمَّ إِنَّهُ شُغِلَ عَنْهُمَا، أَوْ نَسِيَهُمَا، فَصَلاَّهُمَا بَعْدَ الْعَصْرِ، ثُمَّ أَثْبَتَهُمَا، وَكَانَ إِذَا صَلَّى صَلاَةً أَثْبَتَهَا، قَالَ إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ: تَعْنِي دَاوَمَ عَلَيْهَا). {الحديث/ ١٩٣١}:

ئەبو سەلەمە دەفەرموێ: سەبارەت بەو دوورکاتە نوێژە سوننەتەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کردبوونی بەعادەت لەپاش کردنی نوێژی عەصر دەیکردن، سەبارەت بەم دوو رکاتە نوێژە لە دایکە عائیشەم پرسی، هۆی کردنی ئەم دوو رکاتە لەم کاتەدا چی بوو؟

عائیشە فەرمووی: ئەمە ئەو دوو رکاتە سوننەتە بوون کە لەپێش نوێژی عەصردا دەیکردن، هەتا جارێ نەیپەرژا کە لەکاتی خۆیاندا لەپێش عەصردا بیانکا، یا لەبیری نەبوو کە لەکاتی خۆیاندا بیانکا، لەپاش عەصر کردنی، ئیتر لەوەدوا تەرکی نەکردن، چونکە دەستووری وابوو کە نوێژێکی سوننەتی دەکرد ئیتر لەوکاتەدا تەرکی نەدەکرد، ئیسماعیلی کوڕی جەعفەر، کە یەکێکە لە پیاوانی رشتەی ئەم فەرموودەیە دەفەرموێ: مەبەستی عائیشە ئەوە بووە، کە لەوەپاش بەردەوام لەوکاتەدا دەیکرد}.

**روونکردنەوە:**

ئەو بڕیارانەی لەم چەند فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١-نوێـژی سـوننەت کـە هۆیـەکی تایبـەتی نـەبێ، کردنـی لـەم کاتانـەدا ناباشـەو ناپەسەندە.

٢-بەقەسـتی کردنـی نوێـژی فـەرز دوابخـرێ بـۆ ئـەم کاتانـە، کارێـکی فـرە نابـاش‌و ناپەسەندە گەرچی نوێژەکە دادەمەزرێ.

٣-واباش‌و پەسەندو سوننەتە، کە لەنزیکترین هەلی رەخساودا، نوێژی فـەوتاو قـەزا بکرێتەوە، وەکاتی دیاریکراو نییە بۆ ئەو قەزاکردنەوەیە.

٤-هەر نوێژێ کەهۆی تایبەتی هەبێ، کردنی لەم کاتانەدا ناباش‌و ناپەسەند نییـەو بەڵکوو سوننەتە، وەك سوننەتی دەستنوێژو سوننەتی دیـاری مزگـەوت‌و نوێـژی تەرم‌و نوێژ گێڕانەوە.

## ١٢٤) گێڕانەوەی فەرزی نوێژی عەصر لەپاش خۆرئاوا بوون.
## باب: قَضَاء صَلَاةِ الْعَصْرِ بَعْدَ الْغُرُوبِ

٢٢١- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِي اللهُ عَنْـهُ): أَنَّ عُمَـرَ بْـنَ الْخَطَّـابِ، (رَضِـي اللهُ عَنْهُ)، يَوْمَ الْخَنْدَقِ، جَعَلَ يَسُبُّ كُفَّارَ قُرَيْشٍ، وَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ مَا كِدْتُ أَنْ أُصَلِّيَ الْعَصْرَ حَتَّى كَادَتْ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ): «فَوَاللَّـهِ إِنْ صَلَّيْتُهَا».

فَنَزَلْنَا إِلَى بُطْحَانَ، فَتَوَضَّأَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَتَوَضَّأْنَا فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْعَصْرَ بَعْدَ مَـا غَرَبَـتِ الشَّـمْسُ، ثُمَّ صَـلَّى بَعْـدَهَا الْمَغْـرِبَ. {الحديث/ ١٤٢٨. تجريـد/١، لاپـەڕە: ٣٤٢، ژمـارە: ٣٤٥ = ٥٩٦، ٦٤١، ٥٩٨، ٩٤٥، ٤١١٢}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: رۆژی غەزای خەندەق، لەپاش خۆرئاوا، عومەری کوڕی خەطاب (رەزای خودای لێ بێ) هـات‌و دەسـتی کـرد بـەجنێودان بـە بێبـاوەڕانی قـوڕەیش، فـەرمووی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! بـەخودا، خـەریك بـوو خۆرئـاوا دەبـوو، ئەوسـا نوێـژی عەصـرم بـۆکرا؟ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فەرمووی: (بەخودا من هێشتا نوێژی عەصرم نەکردووە!).

ئەوجا هەڵساین چووین بۆ شیوی بوطحان کەوا لەمەدینە، لەوێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەستنوێژی گرت بۆ نوێژو، ئێمەیش هەروا دەستنوێژمان گرت بۆی، ئەوجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەقەزا، نوێژی عەصری بەکۆمەڵ، لەپاش خۆرئاوا بوون بۆ کردین، لەپاشا بەحازری، نوێژی شێوانیشی بەجەماعەت بۆ کردین).

**١٢٥) کردنی دوورکات نوێژی سوننەت لەپاش خۆرئاوا بوون لەپێش نوێژی شێواندا.** (١٩٣٥ - ١٩٣٨). {**باب: فِي الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْمَغْرِبِ بَعْدَ الْغُرُوبِ**}

٢٢٢- عَنْ مُخْتَارِ بْنِ فُلْفُلٍ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ عَنِ التَّطَوُّعِ بَعْدَ الْعَصْرِ، فَقَالَ: كَانَ عُمَرُ يَضْرِبُ الأَيْدِي عَلَى صَلاَةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ، وَكُنَّا نُصَلِّي عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللّه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَكْعَتَيْنِ بَعْدَ غُرُوبِ الشَّمْسِ قَبْلَ صَلاَةِ الْمَغْرِبِ، فَقُلْتُ: أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَلاَّهُمَا؟ قَالَ: كَانَ يَرَانَا نُصَلِّيهِمَا، فَلَمْ يَأْمُرْنَا وَلَمْ يَنْهَنَا). {الحديث/ ١٩٣٥}:

موختاری کوڕی فولفول فەرمووی: سەبارەت بەکردنی نوێژی سوننەت لەپاش نوێژی عەصر لە ئەنەسی کوڕی مالیکم پرسی، کە زانیاری ئێوە چییە لەم بارەیەوە؟

فەرمووی: ئیمامی عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) لەسەردەمی جێنشینی خۆیدا لەوکەسانەی دەدا، کە لەپاش نوێژی عەصر، نوێژی سوننەت دەکەن، لەسەرئەوە لێی دەدان، کە نەیی لە نوێژ کراوە لەم کاتەدا.

ئەنەس فەرمووی: بەڵام ئێمەی هاوەڵانی پێغەمبەر (درودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەیارانی بێ) لەپاش خۆرئاوا بوون، لەدوا بانگی شێوان، لەنێوانی بانگو نوێژی شێوانا، دوو رکات نوێژی سوننەتی پێش نوێژی شێوانمان دەکرد، پێم گوت: ئایا پێغەمبەر خۆی ئەم دوو رکاتە سوننەتەی دەکرد، کە ئێوە لەم کاتەدا دەتانکردن؟ فەرمووی: (چاوی لێمان بوو کە دەمانکردن، بەڵام بەچاكو خراپ هەقی نەبوو بەسەرمانەوە: نەدەیفەرموو بیکەن، نە دەیفەرموو مەیکەن).

**١٢٦) كاتێ خۆر ئاوادەبێ ئیتر كاتی نوێژی شێوانە.** (١٤٢٨ - ١٤٤٠).

**باب: وقت المغرب إِذَا غَرَبَتِ الشَّمْسُ**

٢٢٣- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يُصَلِّى الْمَغْرِبَ إِذَا غَابَتِ الشَّمْسُ). {الحديث/ ١٤٣٨. بخارى. مواقيت الصلاة/ ٥٦١}:

سەلەمەی كوڕی ئەكوەع (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوكاتە بەرنوێژی نوێژی شێوانی بۆ دەكردین، كە گۆی خۆر ئاوادەبێ).

**روونكردنەوە:**

رشتەی ئەم فەرموودەیە لە بوخاریدا، لە رشتە (سند)ە سێ كەسیەكانی بوخارییە، كە ئاوایە:

١-مەكی كوڕی ئیبراهیم.

٢-یەزیدی كوڕی ئەبی عوبەید.

٣-سەلەمەی كوڕی ئەكوەع، بەلام لە رشتە چوارینەكانی ئیمامی موسلیمە، كە ئەم زاتانەن:

- ماموستاكەی موسلیم: قوتەیبەی كوڕی سەعید.
- حاتەمی كوڕی ئیسماعیل، كە ماموستای قوتەیبەیە.
- یەزیدی كوڕی ئەبو عوبەید، كە تابیعییە.
- سەلەمەی كوڕی ئەكوەع كە هاوەڵی پێغەمبەرە.

لەصەحیحی موسلیمدا، لە رشتەی چوارینی بەرزتر تیانیە، بەلام لە بوخاریدا زیاتر لەبیست فەرموودەی واتیا، كە رشتەكەیان (ثلاثي) سێ كەسییە، لەم لایەنەوە بوخاری یەكەمەو خاوەنی ئەم شانازییەیە.

سەلەمەی كوڕی ئەكوەع، ناوی تەواوی: سەلەمەی كوڕی عەمری كوڕی ئەكوەعە، ئامادەی غەزای حودەیبییە بووە، ئامادەی پەیمانی خۆشنوودیی بووە، كە ناودارە بە (**بیعة الرضوان**) كە لەحودەیبییە كرا.

حەفتاو حەوت فەرموودەی هەیە، شازدەیان پەسەندی هەردوو پێری بوخاریو موسلیمن، بیستو یەكیان وان لە بوخاریدا، بیستو پێنجیان وان لە موسلیمدا، سەرجەمی فەرموودەكانی لە صەحیحەیندا دەكاتە: ١٦ + ٥ + ٩ = ٣٠ سیی فەرموودە.

سەلەمە پیاوێکی ئازای تیر ئەندازی تیژڕەو بوو، لە راکردنـدا ولاخـی بـەرزەی بەجێ دەهێشت، پیاوێـکی بەهرەمەنـدی خێرکـەر بـوو، کۆمەڵەی فـەرموودە زانـە گەورەکان، کەناودارن بە (**الجماعة**) فـەرموودەیان لـە سـەلەمەوە گێڕاوەتـەوە، وەك: شـافیعیو ئیمـام أحمـدو بوخـاریو موسـلیمو ئـەبو داوودو تیرمیـزیو نەسـائیو بەیهەقیو دارە قوطنـیو ... تـاد. لـەرۆژی پـەیمانی خۆشـنوودیدا سێجار پـەیمانی بەسـت لەگـەڵ پێغەمبـەردا، لـە سـەرەتای خەڵـکەکەوەو لـە ناوەڕاسـتەوەو لـەدوا دوایانـەوە، دەڵـێن: گـورگ قسـەی لەگەڵـدا کـردووە، سـەلەمە دەفـەرموێ: لـەپێش ئیسـلام بوونمـا، جـارێ گورگـێ ئاسکێـکی رفانـد، نیشـتمە سـەری لـە گورگەکـەم سەندەوە، گورگەکە گوتی: خانە خراپ چیتە بەسەر منەوە رزقم دەبڕی، خۆ ئەمە مـاڵی تـۆ نییـە، رزقو رۆژییەکـە، خـودا رەخسـاندوویەتی بـۆم، کەچـی تـۆ لـێم دەسەنیتەوە، منیش گوتم: ئەی بەندەکانی خودا! بەڕاسـتی ئەمـە شتێـکی سـەیرە، خۆ ئەوەتە گورگ قسە دەکا!

کەچی گورگەکە گوتی: لەمە سەیرتر ئەوەیە، کە پێغەمبەری خوا والـەناو ئـەو بنکـە دارخورمایانـەدا، بانگتـان دەکـا بۆسـەر دینـی هـەقو خـوا پەرستی راسـتو دروست، کەچی ئێوە هێشتا هەر دەست لەبتپەرستی هەڵناگرن!! ئـیتر منـیش رێـك چووم موسوڵمان بووم.

کوڕەکـەی دەیفـەرموو: سـەلەمەی بـاوکم قـەت درۆی نـەدەکرد، سـەلەمە دەیفـەرموو لـە خزمـەت پێغەمبـەر خۆیـدا ئامـادەی حـەوت غـەزا بـووم، لەحـەوت غەزای تریشدا بەشداریم کردووە.

سەلەمە لەتەمەنی هەشتا ساڵیدا، لە مەدینـە لەسـاڵی حـەفتاو چواری کۆچیدا بـەمردنی خـوا مـردووە، (رەزای خـودای گـەورەی لێ بـێ) . {تـەجریـدی بوخـاری/١، لاپەڕە: ١١٣ چاپی یەکەم. ژمارە: ١٠٩/٩٠ + عێني/١٥٣/٢} .

## ١٢٧) كاتی نوێژی خەوتنان‌و دواخستنی نوێژی خەوتنان.
## باب: وقتُ صلاةِ العِشاءِ وتأخيرُها

٢٢٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها) قَالَتْ: أَعْتَمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَاتَ لَيْلَةٍ، حَتَّى ذَهَبَ عَامَّةُ اللَّيْلِ، وَحَتَّى نَامَ أَهْلُ الْمَسْجِدِ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى فَقَالَ: « إِنَّهُ لَوَقْتُهَا، لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي». {الحديث: ١٤٤٣} :

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: شەوێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی خەوتنانی تەواو دواخست، هەتا شەو زرنگایەوەو زوربەی شەو رۆیشت، تەنانەت هەندێ کەس لە دانیشتوانی ناو مزگەوت، کە چاوەڕوانی نوێژی خەوتنانیان دەکرد، خەویان لێ کەوت، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەماڵ تەشریفی دەرچوو هات بۆ مزگەوت‌و بەرنوێژی نوێژی خەوتنانی بۆ کردین‌و فەرمووی: (بەڕاستی ئەمە کاتی پەسەندی ئەم نوێژەیە، بەڵام مەبادا ببێ بەبارو زەحمەت بۆ ئۆمەتم، کەواتە بادوای نەخەن بۆ ئەم کاتە تانەبێ بەزەحمەت بۆیان). {تاج/١/١٩٩، زنجیرە: ٤٧، ژمارە: ٣٦٠}.

## ١٢٨) سەبارەت بەناوی نوێژی خەوتنان. {باب: في اسم صلاة العَشاءِ}

٢٢٥- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « لاَ يَغْلِبَنَّكُمُ الأَعْرَابُ عَلَى اسْمِ صَلاَتِكُمْ فَإِنَّهَا الْعِشَاءُ، فَإِنَّهَا فِي كِتَابِ اللّهِ العِشَاءُ، وَإِنَّهَا تُعْتِمُ بِحِلاَبِ لإِبِلِ». {الحديث/ ١٤٥٤} :

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (عەرەبە دەشت نشینەکان ناوی نوێژی عیشاتان لێ نەگۆڕن‌و، نەکەن ئێوەیش وەك ئەوان بەنوێژی عیشا بڵێن نوێژی عەتەمە، چونکە نوێژی خەوتنان لە قورئانا، کە نامەی پیرۆزی خودایە، ناوی عیشایە، وەك دەفەرموێ: {وَمِن بَعْدِ صَلَاةِ الْعِشَاءِ – نور – ئایەتی/٥٨}.

عەرەبە دەشتەکییەکان بۆیە بەنوێژی خەوتنان (عیشاء) دەڵێن: عەتەمە، چونکە دوای دەخەن بۆکاتی عەتەمە، کە ئەوکاتەیە کە شەو تەواو تاریك دەبێ‌و ئەوان لەوکاتەدا حوشتر دەدۆشن کەواتە بەپێی ئەم ناونانەی ئەوان (صلاة العتمة) واتە: نوێژی تاریکە دۆش!!

## ١٢٩) جڵەوگیریی لەدواخستنی نوێژ لەکاتی پەسەندی خۆی. (١٤٦٣ - ١٤٦٩).

## باب: النَّهْيِ عَنْ تَأْخِيرِ الصَّلَاةِ عَنْ وَقْتِهَا

٢٢٦- عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « كَيْفَ أَنْتَ إِذَا كَانَتْ عَلَيْكَ أُمَرَاءُ يُؤَخِّرُونَ الصَّلَاةَ عَنْ وَقْتِهَا، أَوْ يُمِيتُونَ الصَّلَاةَ عَنْ وَقْتِهَا؟ قَالَ: قُلْتُ: فَمَا تَأْمُرُنِي؟ قَالَ: صَلِّ الصَّلَاةَ لِوَقْتِهَا، فَإِنْ أَدْرَكْتَهَا مَعَهُمْ فَصَلِّ فَإِنَّهَا لَكَ نَافِلَةٌ». {الحديث/ ١٤٦٣}:

ئەبو زەڕ (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (ئەی ئەبو زەڕ! دەبێ حاڵت چۆن بێ، ئەو سەردەمەی کە کاربەدەستو فەرمانڕەواکانت نوێژی فەرز لەکاتی پەسەندی خۆی دوادەخەن، یا بەهۆی دواخستنی زۆرەوە وەك نوێژێکی بێ گیانی مردوو بکەن وایە؟).

منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! لەبارو دۆخی وادا، فەرمانت بەچییە کە بیکەم؟ فەرمووی: (نوێژەکان لەکاتی دیاریکراوی خۆیانا، لە سەرەتاوە بکە، ئەگەر دنیا بوو لەگەڵ ئەوانیشا فریای ئەو نوێژە کەوتیتەوە، ئەوا دووبارە ئەو نوێژە کەخۆت بەتەنیا کردووتە لەگەڵ ئەوانیشا بەجەماعەت بیکەرەوە، ئەوە دەبێ بەنوێژی سوننەت بۆت).

**ڕوونکردنەوە:**

بەپێی ئەم فەرموودەیەو چەند فەرموودەیەکی تری دروست، دووبارە کردنەوەی نوێژ بەجەماعەت سوننەتە، خوای جاری یەکەم نوێژەکەی بەتەنیا کردبێ، یا بەجەماعەت کردبێ، جیاوازی نییە.

لەم جۆرە فەرموودانەیەدا، بایەخ بەگشتایەتی وشەو ڕستەکەیە، نەوەك بەتایبەتی هۆ، کەواتە بڕیاری دووبارە کردنەوەی نوێژ بە جەماعەت، هەر تایبەت نییە بە ئەبو زەڕەوە، بەڵکوو بۆ گشت کەسێکە. ئەم نوێژ دووبارە کردنەوە تەنیا یەك جار سوننەتەو بەس، دروست نییە کە نوێژێ سێ جار، یا زیاتر دووبارە بکرێتەوە، وە هەموو نوێژێکیش دووبارە دەکرێتەوە، جیاوازی لەنێوانی نیوەڕۆو

عەصرو بەیانیو خەوتنانو شێواندا، لەم لایەنەوە نییە. {تاج/١، زنجیرە: ١٢٧، ژمارە: ٨١٢ و ٨١٣} . لەکاتی حوکمی بەنی ئومەیەدا، ئەم نوێژ دواخستنە روویدا، بەڵام دووبارە کردنەوەی نوێژ مەرج نییە کەهەر لەگەڵ فەرمانڕەوادا بێ، لەگەڵ هەموو جەماعەتێکا، لەهەموو کاتو سەردەمێکا، ئەم دووبارە کردنەوەیە سوننەتە.

**١٣٠) خێرترین کردەوە کردنی نوێژە لەکاتی خۆیدا.** (٢٤٤ - ٢٥٢).

**باب: أفْضَلُ العَمَلِ الصَّلوةُ لِوَقْتِها**

٢٢٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَيُّ الْعَمَلِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: « الصَّلاَةُ لِوَقْتِهَا». قَالَ: قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «بِرُّ الْوَالِدَيْنِ». قَالَ: قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: « الْجِهَادُ فِى سَبِيلِ اللَّهِ». فَمَا تَرَكْتُ أَسْتَزِيدُهُ إِلاَّ إِرْعَاءً عَلَيْهِ. {الحديث/ ٢٤٨. تجريد/١، لاپەڕە: ٣١٩، رقم: ٣١٢ = ٥٢٧، ٢٧٨٢، ٥٩٧٠، ٧٥٣٤} :

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پرسیارم کرد لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کام کردەوەیێ زۆر خێرترە؟ فەرمووی: نوێژ لەکاتی خۆیدا) گوتم: پاش ئەو چی تر خێرترە؟ فەرمووی: چاکە کردنو باشبوون لەگەڵ باوكو دایکدا) گوتم: پاش ئەو چی تر؟ فەرمووی: خەباتو تێکۆشان لەڕێگەی خودادا). ئیتر پرسیاری ترم لێی نەکرد، مەبادا سەخڵەتی بکەم.

**١٣١) کەسێ فریای یەك رکات بکەوێ لەهەر نوێژێ، لەکاتی ئاسایی ئەو نوێژەدا، ئەوە فریای کردنی ئەو نوێژە بەئەدا کەوتووە.** (١٣٦٤ - ١٣٦٩).

**باب: مَنْ أدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الصَّلاَةِ فَقَدْ أدْرَكَ الصَّلاَةَ**

٢٢٨- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النبي (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الصَّلاَةِ فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلاَةَ». {الحديث/١٣٧٠. بخاري. مواقيت الصلوة:٥٨٠} :

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) لە خۆشەویستەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ لەهەر نوێژێ، فریای یەك رکاتی بکەوێ، لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا،

ئەوە بەتەواوی فریای ئەو نوێژە کەوتووەو بەحازری کردوویەتی، نەك بە قەزا).
{تاج/١، لاپەڕە: ٢٠٠، زنجیرە: ٤٨، ژمارە: ٣٦٥}.

**١٣٢) کەسێ بەهۆی خەوتنەوە، یا بەهۆی لەبیرچوونەوە نوێژێکی چوو، ئەوە کاتێ بیری کەوتەوە با ئەو نوێژە بکا. (١٥٥٨ - ١٥٦٧).**

**باب: من نامَ عن صلاةٍ أوْ نسيها فليُصلّها إذا ذكرها**

٢٢٩- عَنْ أَبِى قَتَادَةَ قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: «إِنَّكُمْ تَسِيرُونَ عَشِيَّتَكُمْ وَلَيْلَتَكُمْ وَتَأْتُونَ الْمَاءَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ تَعَالى غدًا، فَانْطَلَقَ النَّاسُ لاَ يَلْوِى أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ، قَالَ أَبو قَتَادَةَ: فَبَيْنَمَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَسِيرُ حَتَّى ابْهَارَّ اللَّيْلُ وَأَنَا إِلَى جَانِبِهِ، قَالَ: فَنَعَسَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَمَالَ عَنْ رَاحِلَتِهِ، فَأَتَيْتُهُ فَدَعَمْتُهُ مِنْ غَيْرِ أَنْ أُوقِظَهُ، حَتَّى اعْتَدَلَ عَلَى رَاحِلَتِهِ، قَالَ: ثُمَّ سَارَ حَتَّى تَهَوَّرَ اللَّيْلُ مَالَ عَنْ رَاحِلَتِهِ، قَالَ: - فَدَعَمْتُهُ مِنْ غَيْرِ أَنْ أُوقِظَهُ حَتَّى اعْتَدَلَ عَلَى رَاحِلَتِهِ، قَالَ: ثُمَّ سَارَ حَتَّى إِذَا كَانَ مِنْ آخِرِ السَّحَرِ مَالَ مَيْلَةً هِىَ أَشَدُّ مِنَ الْمَيْلَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ، حَتَّى كَادَ يَنْجَفِلُ، فَأَتَيْتُهُ فَدَعَمْتُهُ، فَرَفَعَ رَأْسَهُ فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟ فَقُلْتُ: أَبُو قَتَادَةَ، قَالَ: مَتَى كَانَ مَسِيرَكَ مِنِّى؟ قُلْتُ: مَا زَالَ هَذَا مَسِيرِى مُنْذُ اللَّيْلَةِ، قَالَ: حَفِظَكَ اللَّهُ بِمَا حَفِظْتَ بِهِ نَبِيَّهُ، ثُمَّ قَالَ: « هَلْ تَرَانَا نَخْفَى عَلَى النَّاسِ؟»، ثُمَّ قَالَ: « هَلْ تَرَى مِنْ أَحَدٍ؟». قُلْتُ: هَذَا رَاكِبٌ، ثُمَّ قُلْتُ: هَذَا رَاكِبٌ آخَرُ، حَتَّى اجْتَمَعْنَا فَكُنَّا سَبْعَةَ رَكْبٍ، قَالَ: فَمَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الطَّرِيقِ فَوَضَعَ رَأْسَهُ، ثُمَّ قَالَ: احْفَظُوا عَلَيْنَا صَلاَتَنَا، فَكَانَ أَوَّلَ مَنِ اسْتَيْقَظَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَالشَّمْسُ فِى ظَهْرِهِ، قَالَ: فَقُمْنَا فَزِعِينَ، ثُمَّ قَالَ: ارْكَبُوا، فَرَكِبْنَا فَسِرْنَا، حَتَّى إِذَا ارْتَفَعَتِ الشَّمْسُ نَزَلَ، ثُمَّ دَعَا بِمِيضَأَةٍ كَانَتْ مَعِى، فِيهَا شَىْءٌ مِنْ مَاءٍ، قَالَ: فَتَوَضَّأَ مِنْهَا وُضُوءًا دُونَ وُضُوءٍ، قَالَ: وَبَقِىَ فِيهَا شَىْءٌ مِنْ مَاءٍ، ثُمَّ قَالَ لأَبِى قَتَادَةَ: احْفَظْ عَلَيْنَا مِيضَأَتَكَ فَسَيَكُونُ لَهَا نَبَأٌ، ثُمَّ أَذَّنَ بِلاَلٌ بِالصَّلاَةِ، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ صَلَّى الْغَدَاةَ، فَصَنَعَ كَمَا كَانَ يَصْنَعُ كُلَّ يَوْمٍ، قَالَ: - وَرَكِبَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَرَكِبْنَا مَعَهُ، قَالَ: فَجَعَلَ بَعْضُنَا يَهْمِسُ إِلَى بَعْضٍ: مَا كَفَّارَةُ مَا صَنَعْنَا بِتَفْرِيطِنَا فِى صَلاَتِنَا؟ ثُمَّ قَالَ: «أَمَا لَكُمْ فِىَّ أُسْوَةٌ؟ ثُمَّ قَالَ: « أَمَا إِنَّهُ

لَيْسَ فِي النَّوْمِ تَفْرِيطٌ، إِنَّمَا التَّفْرِيطُ عَلَى مَنْ لَمْ يُصَلِّ الصَّلاَةَ حَتَّى يَجِيءَ وَقْتُ الصَّلاَةِ الأُخْرَى، فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَلْيُصَلِّهَا حِينَ يَنْتَبِهُ لَهَا، فَإِذَا كَانَ مِنَ الْغَدِ فَلْيُصَلِّهَا عِنْدَ وَقْتِهَا، ثُمَّ قَالَ: مَا تَرَوْنَ النَّاسَ صَنَعُوا؟ قَالَ: ثُمَّ قَالَ: «أَصْبَحَ النَّاسُ فَقَدُوا نَبِيَّهُمْ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ (رَضِيَ اللَّهُ عنهما): رَسُولُ اللَّهِ بَعْدَكُمْ، لَمْ يَكُنْ لِيُخَلِّفَكُمْ، وَقَالَ النَّاسُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيْنَ أَيْدِيكُمْ، فَإِنْ يُطِيعُوا أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ يَرْشُدُوا، قَالَ: فَانْتَهَيْنَا إِلَى النَّاسِ حِينَ امْتَدَّ النَّهَارُ وَحَمِيَ كُلُّ شَيْءٍ، وَهُمْ يَقُولُونَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلَكْنَا، عَطِشْنَا، فَقَالَ: لاَ هُلْكَ عَلَيْكُمْ، ثُمَّ قَالَ: أَطْلِقُوا لِي غُمَرِي، وَدَعَا بِالْمِيضَأَةِ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَصُبُّ، وَأَبُو قَتَادَةَ يَسْقِيهِمْ، فَلَمْ يَعْدُ أَنْ رَأَى النَّاسُ مَاءً فِي الْمِيضَأَةِ تَكَابُّوا عَلَيْهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « أَحْسِنُوا الْمَلأَ كُلُّكُمْ سَيَرْوَى». قَالَ: فَفَعَلُوا، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَصُبُّ وَأَسْقِيهِمْ، حَتَّى مَا بَقِيَ غَيْرِي وَغَيْرُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: ثُمَّ صَبَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ لِي: اشْرَبْ، فَقُلْتُ: لاَ أَشْرَبُ حَتَّى تَشْرَبَ يَا رَسُولَ اللَّهِ! قَالَ: إِنَّ سَاقِيَ الْقَوْمِ آخِرُهُمْ شُرْبًا، قَالَ: فَشَرِبْتُ، وَشَرِبَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: فَأَتَى النَّاسُ الْمَاءَ جَامِّينَ رِوَاءً، قَالَ: فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَبَاحٍ: إِنِّي لأُحَدِّثُ النَّاسَ هَذَا الْحَدِيثَ فِي مَسْجِدِ الْجَامِعِ، إِذْ قَالَ عِمْرَانُ بْنُ حُصَيْنٍ: انْظُرْ أَيُّهَا الْفَتَى كَيْفَ تُحَدِّثُ، فَإِنِّي أَحَدُ الرَّكْبِ تِلْكَ اللَّيْلَةَ، قَالَ: قُلْتُ: فَأَنْتَ أَعْلَمُ بِالْحَدِيثِ، فَقَالَ: مِمَّنْ أَنْتَ؟ قُلْتُ: مِنَ الأَنْصَارِ، قَالَ: حَدِّثْ فَأَنْتُمْ أَعْلَمُ بِحَدِيثِكُمْ. قَالَ: فَحَدَّثْتُ الْقَوْمَ، فَقَالَ عِمْرَانُ: لَقَدْ شَهِدْتُ تِلْكَ اللَّيْلَةَ وَمَا شَعَرْتُ أَنَّ أَحَدًا حَفِظَهُ كَمَا حَفِظْتُهُ). {الحديث/ ١٥٦٠}:

**ئـەبو قـەتادە** (رەزای خـوای لێ بێ) **فـەرمووی: پێغەمبـەری خـودا** (درودی خـودای لەسەر بێ) **وتارێکی دا بۆمان، فەرمووی: ئێوە ئەم پاش نیوەڕۆیەتانو ئـەم شـەوتان بەتـەواوی بەڕێوە دەبن، بۆ سبەینێ، خوا حەزکا دەگەنە سەرئاو).**

**ئیتر خەڵکەکە بەرەو مەبەست کەوتنە ڕێ، کەس ئاوڕی لەکەس نەدەدایەوە، کۆمەڵ کۆمەڵ ملی ڕێگەیان گرتبوو، ئـەبو قـەتادە فـەرمووی: پێغەمبـەریش** (درودی خودای لەسەر بێ) **ئەو شەوە بەڕێوە بوو هەتا شـەو دوو کوت بـوو، منـیش لەتەنیشتیەوە**

دەڕۆیشتم. جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەدەم وەنەوزەوە، بەسەر وڵاخەکەی ژێریەوە لاربۆوە، منیش پەلاماریمداو بەهێواشی بەبێ ئەوە خەبەری بکەمەوە راستم کردەوە، هەتا وەك جاران رێك راوەستا لەسەر پشتی وڵاخەکەی.

ئیتر رۆیشتین هەتا شەو بەرەو بەیان شۆڕ بۆوە، دووبارە پێغەمبەر، بەدەم وەنەوزەوە بەسەر پشتی وڵاخەکەیەوە لار بۆوە، منیش دیسان بەهێواشی راستم کردەوەو لەسەر پشتی وڵاخەکەی رێك بۆوە، دیسانەوە کەوتینەوە رێ، هەتا دوا کاتی بەرەبەیان، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەسەر وڵاخەکەیەوە لارەوە بوو، گەلێ لەدوو جارەکەی پێشوو زیاتر، تەنانەت خەریك بوو بەرەوە بێ، دیسان چوومەوە راستم کردەوە، سەری بەرزەوە کردو فەرمووی: ئەوە کێ بوو؟ گوتم: من بووم ئەبو قەتادەم، فەرمووی: لەکەیەوە لەگەڵ مندا وای بەڕێگەوە؟) عەرزیم کرد: لەسەرەتای شەوەوە من لەگەڵ تۆدا وام بەڕێگەوە. فەرمووی: خودای گەورە بتپارێزێ، وەك چۆن تۆ ئەم شەو پێغەمبەرەکەی ئەوت پاراست. ئەوجا فەرمووی: (بەزەینت ئێمە لە خەڵکەکە دیارینو ونیان نەکردووین؟) ئەوجا فەرمووی: (ئایا کەسیان دەبینی؟) گوتم: بەڵێ ئەوە سوارێکە، ئا ئەوە سوارێکی تریشە، هەتا کۆمەڵ بووینو بووین بەحەوت سوار، جا پێغەمبەر خۆی لایدا بۆ لاڕێکەو ئێمەیش لەگەڵیدا لاماندا بۆ وچانو سەرخەو شکاندن، جا راکشاو سەری نایەوە کە بخەوێو فەرمووی: (ئاگاتان لە نوێژی بەیانیمان بێ، بەهۆی خەو لێکەوتنەوە نەفەوتێ). بەڵام لەبەر شەکەتیو ماندوویی رێگە هەمووومان خەوێکی قووڵمان لێ کەوتو کەسمان خەبەرمان نەبۆوە هەتا خۆر دەکەوێو تینەکەی دەدا لەپشتی پێغەمبەرو ئەو یەکەم کەسمان بوو کە خەبەری دەبێتەوە.

فەرمووی: جا بەشەڵەژاوی لەخەو راپەڕین، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سواربن با بکەوینە رێ) ئەوجا سواربووینو دەستمان کردەوە بە رۆیشتن، هەتا خۆر بەرزەوە بوو، لەشوێنێ پێغەمبەر دابەزیو ئێمەیش دابەزین، من جەوەندەیەکم پێ بوو، کەمێ ئاوی تیا بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داوای

جەوەندەکەی منی کردو دەستنوێژێکی سووکەڵەی لێ گرت، لەپاش دەستنوێژەکەی کەمێ ئاو لە جەوەندەکەدا مابوو، بەمنی فەرموو: ئەبو قەتادە! ئاگات لەم چۆڕە ئاوە بێ کەوا لەم جەوەندەی تۆدا، زایەی نەکەی، پاش کەمێ دەبێ بەهۆی موعجیزەیەکی وا کە لەدنیادا دەنگ بداتەوە).

ئەوجا بیلال بانگی بۆ نوێژی بەیانی دا، لەپاش بانگەکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو رکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی وەك جاران کرد، ئێمەش هەروا ئەو دوو رکاتە سوننەتەمان کرد، ئەوجا بەجەماعەت نوێژی بەیانی دەق وەك رۆژانی تری بۆمان کرد، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سواربوو کەوتەڕێ، ئێمەیش سواربووین‌و لەخزمەتیدا کەوتینەڕێ.

فەرمووی: جا لەناو خۆمانا بەچپەو سرتە کەوتینە مقۆ مقۆ: دەبێ کەفارەتی ئەم کارەمان چی بێ، کە لەم نوێژەماندا کەمتەرخەمی‌و درێغیمان کرد، تا نوێژەکەمان چوو؟

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئایا من سەر مەشق نیم بۆ ئێوە؟ کەوابوو ئێوەیش وەك من هەر ئەوەندەتان لەسەرە کە ئەو نوێژە بگێڕنەوەو بەس).

ئەنجا فەرمووی: (لەڕاستیدا، نوێژ چوون بەهۆی خەوەوە قەیدی نییە، بەڵام ئەوەی قەیدی هەیە نوێژ چوونی کاتی خەبەربوونە، کە نوێژ خوێن، بە قەستی، بەبێ بەهانەی رەوا، نوێژەکە نەکا لەکاتی خۆیدا هەتا کاتی نوێژەکەی دوای دێ، جا ئەگەر کەسێ شتی وای کرد، بەهۆی خەوەوە، یا بەهۆی لەبیرچوونەوە، یا بەقەستی نوێژێکی چواند، هەرکەس وایکرد، با هەرکاتێ بیری کەوتەوە، یا ویستی،، با نوێژە فەوتاوەکەی بگێڕێتەوە، بەڵام لەوەدوا، باهەموو کاتێ ئەو نوێژە فەوتاوە، لەکاتی ئاسایی رۆژانیدا بکا، نەوەك لەوکاتەدا کە نوێژەکەی تیا گێڕاوەتەوە).

ئەوجا فەرمووی: (ئەو خەڵکەی لەگەڵمان بوون، کە ئێستا لێمان دابڕاون، بەڕای ئێوە، سەبارەت بە دابڕانی ئێمە لێیان، دەبێ چییان گوتبێ؟). کە کەسێ لەو

شەش حەوت کەسەی کە لەگەڵیدا بوون وەڵامیان نەدایەوە، پێغەمبەر خۆی فەرمووی: (کاتێ ڕۆژیان لێ دەبێتەوە دەبینن پێغەمبەرەکەیان دیارنیەو لێیان ون بووە، دەست دەکەن بەڕاوێژو بە دەربڕینی بۆچوونی خۆیان لەبارەی جێگەو ڕێگەی ئێمەوە، ئەبو بەکرو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) بە خەڵکەکە دەڵێن: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە دوامانەوەیە، دڵی نایێ لێمان پێش بکەوێ، کەواتە با چاوەڕوانی بکەین هەتا تەشریفی دێنێ و پێمان دەگا، بەڵام خەڵکەکە دەڵێن: پێغەمبەر پێش کەوتووەو لە پێشمانەوەیە، کەواتە زووکەن با پێی بگەین، جا ئەگەر بەگوێی ئەبوبەکرو عومەر بکەن، پەی بەڕاستی دەبەن، چونکە قسەی ئەوان ڕاستە).

ئەبو قەتادە دەفەرموێ: جا ئەوکاتە گەیشتینەوە بە خەڵکەکە، کە ڕۆژ درەنگ دەبێ و تینی خۆر هەموو شتێ گەرم دەکا.

جا خەڵکەکە هاواریان لێ هەڵسا: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر فریامان نەکەوی، فەوتاوین، تینومانە!!

فەرمووی: (موژدەبێ نافەوتێن!!) ئەوجا فەرمووی: جامۆڵکەکەی خۆمم بۆ بهێنن) ئەنجا داوای جەوەندەکەی ئەبو قەتادەی کرد، کە چۆڕێ ئاوی تیا مابوو، جا پێغەمبەر خۆش خۆش جامۆڵکەکەی لە جەوەندەکە پڕدەکردو دەیدا بە ئەبو قەتادەو ئەویش دەرخواردی یەکێکیانی دەدا، جا کاتێ مەردومەکە ئاوی ناو جەوەندەکەیان بینی پەلاماریان داو دابارین بەسەریا، پێغەمبەریش پێی فەرموون: بێ وێڵی مەکەن، ڕەفتارتان جوان بێ، مەترسی ئەوەتان نەبێ کە ئاوەکە بەشتان نەکا، دڵنیابن کە خودای گەورە پیتو فەڕێکی وای تێدەخا کە بەزیادەوە بەشی هەمووتان بکاو هەمووتان تێراوو پاراو بن!!). فەرمووی: ئیتر ئەوانیش هێوور بوونەوەو وایانکرد، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆش خۆش ئاوی ڕۆدەکردە جامۆڵکەکەوەو منیش دەمدا بە یەکێکیان دەیخواردەوە، هەتا هەموویان تێراو بوونو ماینەوە منو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوجا پێغەمبەر

جامۆڵکەکەی پڕکردو دای بەمنو فەرمووی پێم: بخۆرەوە، عەرزیم کرد: هەتا تۆ نەخۆیتەوە من ناخۆمەوە ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (ئاخر کەسێ خواردنەوە بدا بە کۆمەڵێ دەبێ خۆی لەدوا هەموویان بخواتەوە!!) قەتادە فەرمووی: جامنیش خواردمەوەو پێغەمبەریش ئاوی خواردەوە.

فەرمووی: جا کاتێ گەیشتینە سەر کانیو ئاو خەڵکەکە حەوابوونەوەو پاراو بوونو بەتێراوی گەیشتنە سەری!!

ثابیتی بەنانی فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی ڕەباح فەرمووی: ئەوا جارێ لە مزگەوتی گەورەی بەصرە، کە جومعەو جەماعەتی تیا دەکرێ، ئەم فەرموودەیەم بۆ دانیشتوان دەگێڕایەوە، لەناکاو عیمرانی کوڕی حوصەین پێی فەرمووم: ئەی نەوجەوان! ورد بەرەوە کەچۆن فەرموودە دەگێڕیتەوە، وریابە بە هەڵە نەیگێڕیتەوە، دەی بزانە کە ئەو شەوە، من سوارێ بووم لەو کۆمەڵە سوارانە. منیش گوتم: دەی تۆ زاناتری بەم فەرموودەیە. جا فەرمووی: (تۆ چ کەسەی؟) گوتم: لە یاریدەدەرانم، سەربە ئەنصارم، فەرمووی: کەواتە خۆت فەرموودەکە بگێڕەرەوە، ئێوەی ئەنصار خۆتان لە فەرموودەکانتان باشتر دەزانن! جا منیش دەستم کرد بەگێڕانەوەی فەرموودەکە بۆ کۆمەڵەکە، جا بۆ پشتیوانی من عیمران فەرمووی: (من ئامادەی ئەو شەوە بووم، لەمن وابوو کە کەسی تر وەك من ئەم فەرموودەی لەبەرنەکردووە، بەڵام بۆم دەرکەوت کە تۆش زۆر بەباشی ئەم ڕووداوو داستانەت لەبەرە).

**ڕوونکردنەوە:**

**ئەو بەهرانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:**

١-چەند موعجیزەیەکی واتیا، وەك ئەوە فەرمووی: (کە ئاوی جەوەندەکە دەبێ بە موعجیزەیەکی گەورە، وە خۆشی وابوو، وەك ئەوە خودی ئەو ئاوە کەمەی جەوەندەکە، بەرەکەتێکی وای تێکەوت بەشی ئەو خەڵکەی کرد، وەك چەند شتێکی تر، کە خوێنەری ئازیز. بەهۆشیاری خۆی هەستیان پێ دەکات.

٢ -بەپێی ئەم فەرموودەیە، نوێژی فەوتاو پێویستە قەزا بکرێتەوە، وە هەتا زووتریش قەزا بکرێتەوە باشترە، بەڵام بەهۆی گێڕانەوەیەوە لەکاتێکی تردا، جێگەی ناوبراوی خۆی لەناو شەوا، یا لەناو رۆژدا ناگۆڕێ وە هەمیشە ئەدای ئەو نوێژە لەدوا ئەو قەزا کردنەوە، لەکاتی ئاسایی لەوەپێشی خۆیدا بەئەدا دەکرێ، نەقڵ ناکرێ بۆ شوێنی جاری قەزاکەی.

٣ -نوێژی فەوتاو، لەکاتی گێڕانەوەیدا، لەپێشا بانگی بۆ دەدرێ، ئەوسا سوننەتی پێشەوەی دەکرێ، ئەوجا قامەتی بۆ دەکرێ، ئەوجا نوێژەکەی وەك بەئەدا بکرێ، ئاوا بە قەزا ئەنجام دەدرێ، بۆ نموونە ئەگەر نوێژی بەیانی قەزا بکرێتەوە، لەشەوا، یا لەرۆژا، قونووتی تیا دەخوێنرێ، وە سوننەتە بە جەماعەت بکرێ، ئەگەر مەودای جەماعەت هەبوو. {بڕوانە: فیقهی ئاسان/١/١٢٣، زنجیرە: ٥٥، بڕگەی: دووەمو سێیەم}

### ١٣٣) نوێژکردن بەیەك لۆ جلەوە (١١٤٨ - ١١٦٠).

### باب: الصلاة في الثوب الواحد

٢٣٠- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الصَّلاَةِ فِى الثَّوْبِ الْوَاحِدِ؟ فَقَالَ: « أَوَلِكُلِّكُمْ ثَوْبَانِ؟». {الحديث/١١٤٨. تجريد البخاری/١، لاپەڕە: ٢٤٠، ط/١، رقم: ٢٢٥ = ٣٥٨ فتح الباری} :

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هەڵسا لە پێغەمبەری پرسی: ئایا نوێژ بەیەك لۆ جلەوە دروستە؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوە تۆ دەڵێی چی، ئەی چۆن دروست نییە، کوا هەرکەسێ لە ئێوە بگرێ، دوو لۆ جلی هەیە؟). {تاج/١، زنجیرە: ٥٥، ژمارە: ٣٩٨}.

٢٣١- عَنْ عُمَرَ بْنَ أَبِى سَلَمَةَ (رَضِىَ اللَّهُ عنهما) قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّى فِى ثَوْبٍ وَاحِدٍ مُشْتَمِلاً بِهِ فِى بَيْتِ أُمِّ سَلَمَةَ، وَاضِعًا طَرَفَيْهِ عَلَى عَاتِقَيْهِ). {الحديث/١١٥٢. تجريد البخاری/١/٢٣٩، رقم: ٢٢٣ = ٣٥٤، ٣٥٥، ٣٥٦ = فتح الباری} :

عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەرم دی، بەیەك لۆ جلەوە نوێژی دەکرد، ئالاندبووی لەخۆیەوە، هەردوو چمکەکەی لەسەر هەردوو شانی راستو چەپ کردبوو، لەوکاتەدا لەماڵی ئوم سەلەمە بوو).

**روونکردنەوە:**

عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە (رەزای خودای لێ بێ) زڕ کوڕی پێغەمبەر بوو، کوڕی ئوموسەلەمەی هاوسەری پێغەمبەرە، لە خاکی حەبەشە لەدایك بووە، چەند فەرموودەیەکی لە صەحیحەیندا هەیە، تەنیا دوو فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە، لەسەردەمی جێنشینی عەبدولەلیکی کوڕی مەڕواندا، لە مەدینە، لە هەشتاو سێی کۆچیدا، بەمردنی خودا مردووە، لە لایەنگیرانی ئیمامی عەلی بوو، لە جەنگی جەمەلدا لەگەڵ عەلی بوو، هەندێ بەهەڵە دەڵێن: لەو جەنگەدا کوژراوە. {بڕوانە: تاج/١، زنجیرە: ١٩٢، ژمارە: ١٠١٦و ژمارە: ١٠١٧ + تاج/٤، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ٢٩٦٢ + تاج/٤، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٣٧ + تەجرید/٢، لاپەڕە: ١٢٨ چاپی یەکەم، ژمارە: ٧٠٥ = ١٤٦٧، ٥٣٦٩ فتح الباری} .

### ١٣٤) نوێژ بەجلی نەخشینو خەتدارەوە(١٢٣٨-١٢٣٩).

### باب: الصلاة في الثوب المعلم

٢٣٢- عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّى فِى خَمِيصَةٍ ذَاتِ أَعْلاَمٍ، فَنَظَرَ إِلَى عَلَمِهَا، فَلَمَّا قَضَى صَلاَتَهُ، قَالَ: « اذْهَبُوا بِهَذِهِ الْخَمِيصَةِ إِلَى أَبِى جَهْمِ بْنِ حُذَيْفَةَ وَائْتُونِى بِأَنْبِجَانِيِّهِ، فَإِنَّهَا أَلْهَتْنِى آنِفًا فِى صَلاَتِى». {الحديث/١٢٣٩. تجريد البخاري/١/٢٥١، چاپی/١، ژمارە: ٢٣٧ = ٣٧٣، ٧٥٢، ٥٨١٧} .

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسا دەستی کرد بە نوێژکردن، کراسێکی خوری لەسەر خەتی گوڵ گوڵی لەبەردا بوو، لەناو نوێژەکەدا سەرەنجێکی گوڵو نەخشەکانی کراسەکەی دا، کاتێ لە نوێژەکەی بۆوە فەرمووی: (گوڵو نەخشی ئەم کراسە خەریکیان کردمو نەیانهێشت لەناو

نوێژەکەمدا باش دڵ بدەمە نوێژەکەم، کەواتە ئەمە ببەنەوە بۆ ئەبو جەهمی کوڕی حوزەیفەو کراسە ئەنبیجانییە سادەکەی ئەو بێنن بۆ من). {تاج/١، زنجیرە: ٩٦، ژمارە: ٥٧٧}.

**ڕوونکردنەوە:**

ئەبو جەهم هاوڕێیەکی ناوداری پێغەمبەرە، کراسێکی گوڵ گوڵی خوری، بەدیاری دەدا بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەر ئەو هۆیەی کە لە فەرموودەکەدا باس کرا، کراسەکە دەنێرێتەوە بۆ ئەبو جەهم، بەڵام لەبەرئەوەی کە بەهۆی گێڕانەوەی دیاریەکەیەوە بۆی دڵگیر نەبێ، داوای لێ دەکا کە بیگۆڕێتەوە بە کراسێکی سادەی بێ نەخش بۆی. ئەبو جەهم لە مەسلەمەی فەتحە، یەکێ بوو لە پیاو ماقوڵانی قوڕەیش، ڕەگەز ناسێکی چاک بوو، یەکێ بوو لەوچوار کەسە، کە قوڕەیش زانستی ڕەگەزو نژادی لێ وەردەگرتن، زۆر تەمەن درێژ بوو، دووجار ئامادەی دروست کردنەوەی خانووی کەعبە بوو بوو، جارێ لەسەردەمی نەزانیداو، جارێ لەسەردەمی إبن زوبەیردا، یەکێ بوو لەو چوار کەسەی کە تەرمی ئیمامی عوثمانیان ناشت، کە حەکیمی کوڕی حزامو جوبەیری کوڕی موطعیمو نیاری کوڕی مکرمو ئەبو جەهم بوون.

ئەبو جەهم دەیفەرموو: لە نەزانیدا وازم لە مەینۆشی هێنا، مەبادا بێ ئەقڵم بکا، ناوی لە بوخاریو موسلیمدا هاتووە، ئەمە ئەو ئەبو جەهمەیە، کە فاطیمەی کچی قەیس ڕاوێژی بە پێغەمبەر کرد لەبارەیەوەو عەرزی کرد: موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیانو ئەبو جەهم خوازبێنییان کردووم، تۆ فەرمانت بەچییە؟ {بڕوانە: تاج/٣، لاپەڕە: ١٩٢، زنجیرە: ٨٠، ج/١، ژمارە: ٢٢٨٠، ج/٤} + {تاج/١/٢٩٨/٦، رقم: ٥٧٧}.

ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو نەخشو نیگارو نووسینو وێنانەی کەوان بە میحرابو مینبەرو دیواری ڕووی قیبلەی مزگەوتەوە، هەمووی کارێکی ناباشن، نەبوونیان گەلێ چاکترە، بگرە ئەگەر بکرێ فەرشو ڕایەخی ناو مزگەوتیش

هەتا سادەو بێ نەخش‌و نیگاربێ باشترە. بەڵام هەرچۆن بێ بەم جۆرە شتانە نوێـژ بەتاڵ نابێتەوە، بگرە بەرگی ژنیش لەکاتی نوێژدا هەروا، هەتا سادە تربێ چاترە.

## ١٣٥) نوێژکردن لەسەر حەسیر (١٤٩٧ - ١٥٠٣).

## باب: الصَّلاَةُ عَلَى الحَصِيرِ

٢٣٣- عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ جَدَّتَهُ مُلَيْكَةَ دَعَتْ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِطَعَامٍ صَنَعَتْهُ، فَأَكَلَ مِنْهُ، ثُمَّ قَالَ: « قُومُوا فَأُصَلِّيَ لَكُمْ ». قَالَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ: فَقُمْتُ إِلَى حَصِيرٍ لَنَا قَدِ اسْوَدَّ مِنْ طُولِ مَا لُبِسَ، فَنَضَحْتُهُ بِمَاءٍ، فَقَامَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَصَفَفْتُ أَنَا وَالْيَتِيمُ وَرَاءَهُ، وَالْعَجُوزُ مِنْ وَرَائِنَا، فَصَلَّى لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ انْصَرَفَ). {الحديث/١٤٩٧. تجريد البخاری/١/٢٥٦، ژمارە: ٢٤٢ = ٣٨٠، ٧٢٧، ٨٦٠، ٨٧١، ٨٧٤، ١١٦٤ فتح الباری شرح صحيح البخاری} :

ئیسحاقی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئەبو طەلحە، فەرمووی: مامەم ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: مولەیکەی نەنکم نانی دروست کرد بۆ پێغەمبەرو بانگی کرد، کە تەشریفی هات‌و نانی خوارد، ئەوجا فەرمووی: (ئادەی هەستن با دوو رکات نوێژی سوننەتتان لە ماڵەکەتانا، بۆ پیرۆزی بە جەماعەت بۆ بکەم). ئەنەس فەرمووی: حەسیرێکمان هەبوو، لەبەر راخستنی زۆر کۆن بوو بوو، رەنگی رەش بوو بوو، لە پووشی خورما بوو، منیش چووم ئەو پارچە حەسیرەم ماڵی‌و ئاوم لێ پڕژاند هەتا کەمێ نەرم بێ، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەر دەممانەوە لەسەر حەسیرەکە راوەستاو، نوێژی دابەست، من‌و ضەمیرەی کوڕی ئەبو ضەمیرەیش کە ئەوکاتە هەتیو بوو، لە پشتیەوە نوێژمان بە جەماعەت دابەست‌و بووین بەڕیزێ، پیرێژنەکەی نەنکیشم لەپشت ئێمەوە بە تەنیا بوو بە ریزێ‌و نوێژی بە جەماعەت لەپشت پێغەمبەرەوە دابەست، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەر خاتری ئێمە، بۆ پیرۆزی، دوو رکات نوێژی سوننەتی بە جەماعەت بۆ

کـردین، ئـەوجا لـەپاش تـەواوکردنی نوێژەکـە تەشـریفی گەڕایـەوە بـۆ ماڵـەوەی. {تاج/١، لاپەڕە: ٣٨٩، چ/١، ژمارە: ٧٧٥، زنجیرە: ١٢٩، چ/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

لـەم فەرموودەیـەدا ئـەم بەهرانـەی واتیـادا: جەماعـەت لـە نوێـژی سـوننەتا دروستە، لە ماڵیشا جەماعـەت دروسـتە، جێـگە نوێـژ بماڵرێو ئامادە بکرێو پـاك ڕابگیرێ، بە دووکەس ڕیزێ دروست دەبێ، دروستە مناڵ لە ڕیزی پیاوانا ڕاوەسـتێ، بە پیاوێـكو مناڵێ ڕیز دروست دەبێ، کەسێ بەتەنیا خـۆی ڕاوەستێ لـەناو نوێـژدا دەبـێ، نوێژەکـەی دروسـتە، نوێـژی منـاڵی فامیـدەی نابـاڵق دادەمـەزرێ، هـەروا دەستنوێژی، نوێژ لەسەر حەسیر دروستە، لـەماڵی خـاوەن دەعوەتـا نوێـژ بکـرێ بـۆ پیرۆزی. (عەبدوڵڵای کوڕی طەلحەو ئەنەسی کوڕی مالیك بـرای دایکین).

### ١٣٦) نوێژ بە نەعلەوە. (١٢٣٦ - ١٢٣٧).
### باب: الصَّلَاةِ فِي النَّعْلَيْنِ

٢٣٤- عَنْ سَعِيدِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: قُلْتُ لأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَكَانَ رَسُولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّى فِى النَّعْلَيْنِ؟ قَالَ: نَعَمْ. {الحديث/١٢٣٦. تجريد البخارى/١/٢٥٩، چاپی/١، ژمارە: ٢٤٦ = ٣٨٧، (٣٨٦) فتح البارى شرح صحيح البخارى}:

سەعیدی کوڕی یەزید فەرمووی: پرسیارم لە ئەنەسـی کـوڕی مالیـك کـرد: ئایـا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بـە پـێڵاوەوە نوێـژی دەکـرد یانـا؟ فـەرمووی: بـەڵێ بـە پێڵاوی پاکەوە جار جارە نوێژی دەکرد}.

### ١٣٧) یەکەم مزگەوت کە لەسەر زەوی دروست کراوە (١١٦١ - ١١٧٥).
### باب: أَوَّل مَسْجِدٍ وُضِعَ فِي الأَرْضِ

٢٣٥- عَنْ أَبِى ذَرٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قُلْتُ: يا رَسُولَ اللَّـهِ أَىُّ مَسْجِدٍ وُضِعَ فِـى الأَرْضِ أَوَّلُ؟ قَالَ: الْمَسْجِدُ الْحَرَامُ، قُلْتُ: ثُمَّ أَىٌّ؟ قَالَ: الْمَسْجِدُ الأَقْصَى، قُلْتُ: كَمْ بَيْنَهُمَـا؟

قَالَ: أَرْبَعُونَ سَنَةً، وَأَيْنَمَا أَدْرَكْتَ الصَّلاَةُ فَصَلِّ فَهُوَ مَسْجِدٌ». {الحديث/١١٦١. تجريد/٤/٤٠، رقم/١٣٥٢ = ٣٣٦٦، ٣٤٢٥}:

ئەبو زەڕ (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لە پێغەمبەرم پرسی: کام مزگەوتە یەکەم مزگەوتە کە لەسەر ڕووی زەوی بۆ خوا پەرستی دروست کراوە؟ فەرمووی: (مەسجید ولحەرام، کەوا لە مەککە). گوتم: ئەی پاش ئەو کام مزگەوتە دروست کراوە؟ فەرمووی: (مەسجیدول ئەقصا). گوتم: چەند ساڵیان بەین بووە؟ فەرمووی: (چل ساڵ، پاش ئەمەش زەوی هەمووی بۆ تۆو بۆ هەموو موسوڵمانێ، لە حوکمو بڕیاری مزگەوتدایەو، لەهەرکوێ نوێژت لێ بوو نوێژی خۆت بکەو مەرج نییە کە نوێژکردن هەر لەناو مزگەوت دابێو بەس). {ریاض/٤، لاپەڕە: ١٣٦٩، ژمارە: ١٨٦٧/٦٠، زنجیرە: ٣٧٠} + {تاج/١/٣٤٩، زنجیرە: ١١٥، چ/١، ژمارە: ٦٩١ و ٦٩٢}.

## ١٣٨) دروستکردنی مزگەوتەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

## باب: إبْتِناءُ مَسْجِدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

٢٣٦- عَنْ أَنَسِ بْنُ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَدِمَ الْمَدِينَةَ فَنَزَلَ فِي عُلْوِ الْمَدِينَةِ فِي حَيٍّ يُقَالُ لَهَا: بَنُو عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، فَأَقَامَ فِيهِمْ أَرْبَعَ عَشْرَةَ لَيْلَةً، ثُمَّ إِنَّهُ أَرْسَلَ إِلَى مَلإِ بَنِي النَّجَّارِ، فَجَاءُوا مُتَقَلِّدِينَ بِسُيُوفِهِمْ، قَالَ: فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى رَاحِلَتِهِ، وَأَبُو بَكْرٍ رِدْفُهُ، وَمَلأُ بَنِي النَّجَّارِ حَوْلَهُ حَتَّى أَلْقَى بِفِنَاءِ أَبِي أَيُّوبَ، قَالَ: فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي حَيْثُ أَدْرَكَتْهُ الصَّلاَةُ، وَيُصَلِّي فِي مَرَابِضِ الْغَنَمِ، ثُمَّ إِنَّهُ أَمَرَ بِالْمَسْجِدِ، قَالَ: فَأَرْسَلَ إِلَى مَلإِ بَنِي النَّجَّارِ فَجَاءُوا فَقَالَ: يَا بَنِي النَّجَّارِ ثَامِنُونِي بِحَائِطِكُمْ هَذَا، قَالُوا: لاَ وَاللَّهِ مَا نَطْلُبُ ثَمَنَهُ إِلاَّ إِلَى اللَّهِ، قَالَ أَنَسٌ: فَكَانَ فِيهِ مَا أَقُولُ: كَانَ فِيهِ نَخْلٌ، وَقُبُورُ الْمُشْرِكِينَ وَخِرَبٌ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالنَّخْلِ فَقُطِعَتْ، وَبِقُبُورِ الْمُشْرِكِينَ فَنُبِشَتْ، وَبِالْخِرَبِ فَسُوِّيَتْ، قَالَ: فَصَفُّوا النَّخْلَ قِبْلَةً، وَجَعَلُوا عِضَادَتَيْهِ حِجَارَةً، قَالَ: فَكَانُوا يَرْتَجِزُونَ، وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَعَهُمْ، وَهُمْ يَقُولُونَ:

اللَّهُمَّ لاَ خَيْرَ إِلاَّ خَيْرُ الآخِرَهْ ... فَانْصُرِ الأَنْصَارَ وَالْمُهَاجِرَهْ

{الحديث/١١٧٣. بخاری (تجريد): ٢٦٤ = ٤٢٨، ٤٣٤، ١٣٤١، ٣٥٧٣، ١٨٦٨، ٣٩٣٢، ٢١٠٦، ٢٧٧١، ٢٧٧٤، ٢٧٧٩}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆچی کرد بۆ مەدینە، لەپێشا لە عەوالی مەدینە دابەزی، عەوالی چەند گوندێك بوون، لە دەوری شاری مەدینە بوون، لەناو خێڵێکا کە پێیان دەگوتن: بەنی عەمری کوڕی عەوف، لەناویانا چواردە شەو مایەوە، ئەوجا هەواڵی نارد بۆ بەنی نەجاری خاڵوانی، کە هاتن هەموو شمشێرەکانیان کردبوو شانیان و ئامادەیی تەواویان وەرگرتبوو، ئێستایش ئەڵێی ئەو دیمەنە لەبەرچاومە، کە چۆن پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە سواریی وشترەکەی ژێری بوو، بۆ زێدە ڕێز ئەبو بەکر لە پاشکۆیەوە سوار بوو بوو، لەگەڵیا بەرەو شاری مەدینە دەڕۆیشتن، تا گەیشتنە ناو شار ئێشکی پێغەمبەریان لەناحەز دەگرت، کە گەیشتنەجێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بارگەکەی لە حەوشەی ئەبو ئەیوبا خست، وە لەپێش دروست کردنی مزگەوتەکەیدا، لە کوێدا نوێژی لێ دەبوو لەوێدا نوێژی دەکرد، ڕێ دەکەوت لەناو پەچەڕانیشا نوێژی دەکرد، تا لە پاشتر فەرمانی کرد بە دروست کردنی مزگەوت، جا ناردی بەشوێن کۆمەڵەی بەنی نەجاردا، کەهاتنە خزمەتی پێی فەرموون: (ئەی بەنی نەجار! ئەم باخەی خۆتانم پێ بفرۆشن و نرخەکەیم پێ بڵێن لێتان دەکڕین و دەیکەین بە مزگەوت) گوتیان: نەبەخودا بە فرۆشتن نایدەین، بەڵام بە خۆڕایی پێشکەشی دەکەین بەخوداو پێغەمبەری خوداو، بەهاکەیمان هەر لە خودا دەوێ و بەس.

ئەنەس دەیفەرموو: با پێتان بڵێم کەچی تیادا بوو: کۆمەڵێ دارخورماو چەند گۆڕێکی بتپەرستان و چەند کەلاوەیەکی تیادا بوو، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد: دارخورماکانیان بڕی و گۆڕی بتپەرستەکانیان هەڵتەکاندو چاڵاویی شوێن گۆڕەکانیان پڕکردەوەو کەلاوەکانیان تەخت کردو دارخورماکانیان لەلای رووگەی مزگەوتەکەوە ریز کردو، هەردوو لاشیپانی دەرگاکەشیان لەتاشە بەرد

دروست کرد، کاتێ کە تلە بەردەکانیان دەگواستەوە سۆزیان دەکردو پێغەمبەریش لەگەڵیان سۆزی دەکردو پێکەوە دەیانفەرموو:

اللهمَّ لاَ خَيْرَ إلاّ خير الآخرهْ فَانْصُرِ الأنصارَ وَالْمُهَاجِرَهْ

واتە:
خێر ئەو خێرەیە سبەی لەخوانە! نەصرەت بۆ ئەنصار بۆ کۆچکارانە

بە پەخشانیش واتە:

پەروەردگارا! باش ئەوەیە کە لەدوا رۆژا باش بێ و بەس، خودایە! یاریدەدەران و کۆچکاران سەرکەوتوو بکە. {تاج/١، زنجیرە: ٢٢٢، ژمارە: ١١٤٢، چاپی/٤} + {تاج/٤، لاپەڕە: ٣١٦، چ ١، ژمارە: ٣١٦١ و ٣١٦٠}.

**١٣٩) ئەو مزگەوتەی کە خودا لە قورئانا بە ئایەتی {لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى} پەسنی کردووە کامەیە؟**(٣٣٧٣-٣٣٧٤).

**باب: فِي المسجدِ الّذِي أُسّسَ عَلَى التّقْوى**

٢٣٧- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: مَرَّ بِى عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِىَ اللّٰهُ عنهُم) قَالَ: قُلْتُ لَهُ: كَيْفَ سَمِعْتَ أَبَاكَ يَذْكُرُ فِى الْمَسْجِدِ الَّذِى أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى؟ قَالَ: قَالَ أَبِى: دَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِى بَيْتِ بَعْضِ نِسَائِهِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ الْمَسْجِدَيْنِ الَّذِى أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى؟ قَالَ: فَأَخَذَ كَفًّا مِنْ حَصْبَاءَ فَضَرَبَ بِهِ الأَرْضَ، ثُمَّ قَالَ: « هُوَ مَسْجِدُكُمْ هَذَا » لِمَسْجِدِ الْمَدِينَةِ. قَالَ: فَقُلْتُ: أَشْهَدُ بِأَنِّى سَمِعْتُ أَبَاكَ هَكَذَا يَذْكُرُهُ. {الحديث/ ٣٣٧٣}:

ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان فەرمووی: عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودایان لێ بێ) هات بۆلام، عەرزیم کرد: چیت لەباوکت بیستووە، کە بیڵێت، لەبارەی ئەو مزگەوتەوە کە لەسەر تەقوا دامەزراوە، بەپێی شایەتیی دەقی ئایەتی قورئان، کە دەفەرموێ: {لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن

تَقُومَ فِيهِ – ٩/١٠٨} واتە: بەبێ گومان ئەو مزگەوتەی کە لەیەکەم ڕۆژەوە بناغەی لەسەر تەقوای خوای گەورە دامەزراوە، شایانترە کەتۆ نوێژی تیادا بکەی).

عەرزیم کرد: سەبارەت بەم مزگەوتە چیت لەباوکت بیستووە کە بیڵێ؟ ئەو مزگەوتە کامەیە؟ ئەویش فەرمووی: باوکم فەرمووی: چوومە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ماڵی یەکێ لە ژنەکانی بوو، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! کام لەم دوو مزگەوتەیە، کە مزگەوتی قوباءو مزگەوتی مەدینەیە ئایەتی {لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى} سەبارەت بەو هاتووە؟ باوکم فەرمووی: جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە جێگەکەی خۆیەوە، کە لەناو ماڵی یەکێ لە ژنەکانیدا بوو، پڕ چنگێ چەوی هەڵگرتو کێشای بەزەوی مزگەوتەکەی مەدینەداو فەرمووی: (ئەو مزگەوتە ئەم مزگەوتەی ئێوەیە لەشاری مەدینە، کە ناسراوە بە مزگەوتەکەی پێغەمبەر).

ئەبو سەلەمەیش دەڵێ: بە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو سەعیدم گوت: شایەتی دەدەم کە منیش ئەمەم ئاوا لە باوکت بیستووە، وەك تۆ گێڕاتەوە). {بڕوانە: تاج/١، زنجیرە: ١١٩}.

**ڕوونکردنەوە:**

ڕاجیایی هەیە لەوەدا کە ئەم ئایەتە پیرۆزە، سەبارەت بە مزگەوتی قوباء هاتووە، کە یەکەم مزگەوت بووە کە پێغەمبەر دروستی کردووە لە قوباء، یا سەبارەت بە مزگەوتەکەی پێغەمبەر هاتووە کەوا لە مەدینە، ئەم دوو مزگەوتە پاكو پیرۆزن، دوورنیە کە مەبەست هەردوو لایانبێ.

### ١٤٠) پیرۆزیی نوێژ لە مزگەوتەکەی پێغەمبەرو لە مەسجیدول حەرامدا

**(٣٣٦١ - ٣٣٦٩) باب: فَضْلُ الصَّلاَةِ فِي مَسْجِدِ الْمَدِينَةِ وَمَكَّةَ**

٢٣٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عنهما): أَنَّ امْرَأَةً اشْتَكَتْ شَكْوَى، فَقَالَتْ: إِنْ شَفَانِى اللَّهُ لأَخْرُجَنَّ فَلأُصَلِّيَنَّ فِى بَيْتِ الْمَقْدِسِ، فَبَرَأَتْ، ثُمَّ تَجَهَّزَتْ تُرِيدُ الْخُرُوجَ، فَجَاءَتْ

مَيْمُونَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تُسَلِّمُ عَلَيْهَا ، فَأَخْبَرَتْهَا ذَلِكَ ، فَقَالَتِ: اجْلِسِي فَكُلِي مَا صَنَعْتِ ، وَصَلِّي فِي مَسْجِدِ الرَّسُولِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: « صَلاَةٌ فِيهِ أَفْضَلُ مِنْ أَلْفِ صَلاَةٍ فِيمَا سِوَاهُ مِنَ الْمَسَاجِدِ إِلاَّ مَسْجِدَ الْكَعْبَةِ». {الحديث/٣٣٩٦. راجع: تجريد البخاری/١، لاپەڕە: ٣، رقم: ٥٨٧ = ١١٩٠ فتح الباری} :

**ئیبنو عەباس** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی:** ژنێ لە مەدینە تووشی نەخۆشینێ بوو، نەزری کرد گوتی: ئەگەر خودا چاکی کردمەوە، دەچم بۆ قودس لەناو مەسجیدو ئەقصادا نوێژ دەکەم، جا خودا چاکی کردەوە، ئەوجا تەدارەکی سەفەری خستو ویستی بکەوێتەڕێ، مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەچێ بۆ سەردانیو سڵاوی لێ دەکا، ژنەکەیش باسەکەی بۆ باس دەکا، مەیموونەیش پێی دەڵێ: دانیشە، مەچۆ، لێرە ئەو توێشەیە بخۆ کە ئامادەت کردووە بۆ ئەم سەفەرە، نەزرەکەت لە مزگەوتەکەی پێغەمبەردا جێبەجێ بکەو نوێژەکە لەوێ مەکە، لێرە بیکە، چونکە من بۆ خۆم لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (تەنیا مەسجیدول حەرامی لێ دەرچێ، یەك نوێژ لەم مزگەوتەی مندا، لەهەزار نوێژ لە شوێنانی تردا خێرترە).

**١٤١) خێری چوون بۆ مزگەوتی قوباو نوێژکردن لەناویدا.** (٣٣٧٥ - ٣٣٨٦).

**باب: إتيان مَسْجِدِ قُبَاءَ والصَّلاَةِ فِيهِ**

٢٣٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عنهما) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَأْتِي مَسْجِدَ قُبَاءٍ رَاكِبًا ، وَمَاشِيًا ، فَيُصَلِّي فِيهِ رَكْعَتَيْنِ). {الحديث/٣٣٧٦. بخاری/١١٩٤ تعليقاً} :

**ئیبنو عومەر** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **گەلێ جار،** بە سواری، یا بەپێ، دەچوو بۆ مزگەوتی قوباء، لەوێ دوو رکات نوێژی سوننەتی تیادەکرد).

### ١٤٢) خێری دروست کردنی مزگەوت لەڕێگەی خوادا. (١١٨٩ - ١١٩٠)
### باب: فَضْلُ مَنْ بَنى لِلّهِ مَسْجِداً

٢٤٠- عَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيدٍ: أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) أَرَادَ بِنَاءَ الْمَسْجِدِ، فَكَرِهَ النَّاسُ ذَلِكَ، فَأَحَبُّوا أَنْ يَدَعَهُ عَلَى هَيْئَتِهِ، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «مَنْ بَنَى مَسْجِدًا لِلَّهِ، بَنَى اللَّهُ لَهُ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ».
{الحديث/١١٩٠. تجريد البخارى/١، لاپەڕە: ٢٨٣، ط/١، رقم: ٢٧٤ = ٤٥٠ فتح}:

مەحمودی کوڕی لەبید فەرمووی: پێشەوا عوثمانی کوڕی عەففان (ڕەزای خودای لێ بێ) لەکاتی جێنشینی خۆیدا، ویستی مزگەوتەکەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) گەورە بکا، خەڵکەکەیش ئەوەیان پێ ناخۆش بوو، بێزارییان دەربڕی، حەزیان دەکرد وازی لێ بهێنێ‌و وەك خۆی بمێنێ، ئەویش فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو: (هەرکەسێ مزگەوتێ دروست بکا، ساخ لەبەر ڕەزای خودا، خودایش لە قیامەتا، لە پاداشی ئەوەدا، لە بەهەشتا، تەلارێکی بۆ دروست دەکا). {تاج/١، زنجیرە: ١١٤، ژمارە: ٦٧٥، چاپی/٤، لاپەڕە: ٢٤٢، چاپی/١}.

### ١٤٣) پیرۆزیی مزگەوت (١٥٢٣ - ١٥٢٦). بڕوانە: فیقهی ئاسان/١/ل-٣٨٤
### باب: فَضْلُ الْمَسَاجِدِ

٢٤١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «أَحَبُّ الْبِلاَدِ إِلَى اللَّهِ تعالى مَسَاجِدُهَا، وَأَبْغَضُ الْبِلاَدِ إِلَى اللَّهِ تَعَالى أَسْوَاقُهَا».
{الحديث/١٥٢٦}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خۆشەویسترینی شوێنی هەموو وڵاتێ لەلای خودای گەورە مزگەوتەکانیەتی، وە دزێوترین‌و ناخۆشترین شوێنی هەموو وڵاتێ، لەلای خودای گەورە بازاڕەکانیەتی، چونکە جێگەی فڕوفێڵ‌و درۆو دەلەسەو سوێندی درۆو دەستبڕینە). {تاج/١/٣٤٢، زنجیرە: ١١٤، لاپەڕە: ٣٤٣، چاپی یەکەم، ژمارە: ٦٧٩ = چاپی چوارەم}.

## ١٤٤) پیرۆزیی هەنگاوانی زۆر بۆ مزگەوت. (١٥٠٤ - ١٥٢٢).

## باب: فَضْلُ كَثْرَةِ الخُطَا إِلَى المَسَاجِدِ

٢٤٢- عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: كَانَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ، بَيْتُهُ أَقْصَى بَيْتٍ فِي الْمَدِينَةِ، فَكَانَ لاَ تُخْطِئُهُ الصَّلاَةُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: فَتَوَجَّعْنَا لَهُ، فَقُلْتُ لَهُ: يَا فُلاَنُ لَوْ أَنَّكَ اشْتَرَيْتَ حِمَارًا يَقِيكَ مِنَ الرَّمْضَاءِ، وَيَقِيكَ مِنْ هَوَامِّ الأَرْضِ، قَالَ: أَمْ وَاللَّهِ مَا أُحِبُّ أَنَّ بَيْتِي مُطَنَّبٌ بِبَيْتِ رَسُولِ اللَّه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: فَحَمَلْتُ بِهِ حِمْلاً، حَتَّى أَتَيْتُ نَبِيَّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَخْبَرْتُهُ، قَالَ: فَدَعَاهُ، فَقَالَ لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ وَذَكَرَ لَهُ أَنَّهُ يَرْجُو فِي أَثَرِهِ الأَجْرَ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « إِنَّ لَكَ مَا احْتَسَبْتَ». {الحديث/١٥١٤} + {رياض/١، لاپەڕە: ١٣١، چاپی/٢، رقم: ١٣٧/٢١}:

ئوبەییەی کوڕی کەعب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی ئەنصاری هەبوو، ماڵەکەی لەوپەڕی مەدینەوە بوو، دوورترین ماڵ بوو، لە مزگەوتەکەی پێغەمبەرەوە، لەگەڵ ئەوەیشا بۆ هەموو نوێژە فەرزەکان، دەهات بۆ مزگەوتەکەی پێغەمبەر، بە جەماعەت دەیکرد لەگەڵ پێغەمبەردا، جا بەزەوییمان پیادا هاتەوە، من بۆخۆم پێم گوت: ئەی فیسار! خۆزگە گوێ درێژێکت دەکڕی، کە دەهاتی بۆ مزگەوت سواری دەبوویت، هەم دەیپاراستیت لە گەرمیی چەوو لـی داخ بووی رێگەو، هەم دەیپاراستیت لە مارو مێروو و گەزندەو جرو جانەوەری رێگە. کەچی گوتی: دەی بە یەزدانی پاك سا من حەزناکەم کە ماڵەکەم نووسابێ بە خانووەکەی پێغەمبەرەوە! منیش قسەکەیم لەبەر گران بوو، بەلامەوە وەڵامێکی ناشیرین بوو، لەبەرئەوە چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم هەواڵەم پێی راگەیاند، فەرمووی: جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردی بەشوێنیداو، لەم بارەیەوە قسەی لەگەڵیدا کرد، پیاوەکە هەمان وەڵامی کە بەمنی گوت، بە پێغەمبەریشی گوتو گوتیشی: (ئومێد دەکەم کە هەموو هەنگاوێکم، لەهەردوو سەرەوە، خودا بەخێرێ بۆم بنووسێ، بۆیە حەزناکەم کە لە مزگەوت نزیك ببمەوە). پێغەمبەریش پێی فەرموو: (ئەم نیازە پاکەت لای خودا قەبووڵە).

**روونکردنەوە:**

١. احتساب واتە: کردنی کاری باش، یاخۆپاراستن لەکاری خراپ، بە نیازی پاداشی باشی لای خوداو بەس.

٢. ئوبەیەی کوڕی کەعب ئەنصارییە، کەسناوی ئەبولمونزیرە، نازناوی {سیّد القراء = ئاغای قورئان خوێنەکان} بوو، ئامادەی عەقەبەی دووەم بوو، هەروا ئامادەی غەزای بەدرو هەموو غەزاکانی تر بوو، پیاوێکی چوار شانەی ریش سپی بوو، ریشی بۆیە نەدەکرد، واقیدی دەفەرموێ: یەکەم نووسەری پێغەمبەر بوو، لە رووداوە گەورەکاندا ئیمامی عومەر راوێژی پێ دەکرد، لەبەرئەوەی کە لە پێغەمبەری بیستبوو کە هەموو دەردو نەخۆشیو ئێشو ئازارێ، با زۆر کەمیش بێ، وەك تێهەڵچەقینی درکێ، دەبێ بە پۆشەرو کەفارەتی گوناه، لەبەرئەمە داوای لە خودا کرد، کە هەتا دەمرێ، نچە تایەکی وا لە لەشیا بێ، کە رێگەی حەجو عەمرەو غەزاو خەباتو نوێژی جەماعەتی لێ نەگرێ، وە هەتا مرد وابوو، هەرکەس دەستی لە دەستی دەدا هەستی بە گەرمیی تایەکەی دەکرد، یەکێ بوو لەشەرع زانەکانی سەحابە، را جیایی زۆر هەیە لەسەر مێژووی مردنی، ئیستیعاب دەفەرموێ: زۆرینەی مێژوو ناسان دەفەرموون: لە سەردەمی جێنشینی عومەردا مردووە، عەسقەلانی لە ئیصابەدا دەڵێ: ئەبو نەعیم ئەوە بەڕاست دەزانێ: کە لەساڵی (٣٠) سیی کۆچیدا، لەسەردەمی جێنشینی عوسماندا مردووە.

**١٤٥) رۆیشتن بۆ نوێژەکان گوناهان دەسڕێتەوەو پلەو پایەی نوێژکەری لە بەهەشتا پێ بەرز دەبێتەوە.**

**باب: المشي إلَى الصَّلَاةِ تُمْحى بِهِ الخطَايَا وَ تُرفَعُ بِهِ الدَّرَجَاتُ.**

٢٤٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ تَطَهَّرَ فِي بَيْتِهِ، ثُمَّ مَشَى إِلَى بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللَّهِ، لِيَقْضِيَ فَرِيضَةً مِنْ فَرَائِضِ اللَّهِ، كَانَتْ خَطْوَاتُهُ إِحْدَاهَا تَحُطُّ خَطِيئَةً، وَالأُخْرَى تَرْفَعُ دَرَجَةً». {الحديث/١٥١٩} :

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: (هەرکەسێ لەماڵەوە خۆی پاك‌و خاوێن بکاتەوەو دەستنوێژ بگرێ‌و بە پاکی‌و بە دەستنوێژەوە، لەماڵ دەرچێ‌و بچێ بۆ خانەیێ لە خانەکانی خودا، بۆئەوەی کە فەرزێ لە فەرزەکانی خودا بەجێ بهێنێ، ئەوە هەر هەنگاوێ دەنێ، بە قاچێکی گوناهێکی لێ هەڵ دەوەرێ‌و بەو قاچەکەی تری پایەیێ لە بەهەشتا بڵند دەبێتەوە!). {تاج/١، لاپەڕە: ٣٤٥، زنجیرە: ١١٤، ژمارە: ٦٨٤. چاپی دووەم}. {فیقهی ئاسان/١/٢٢٢، زنجیرە: ٧١، چاپی دووەم}**

## ١٤٦) دەشێ نوێژکەر بەشێنەیی بڕوا بۆ نوێژو هەڵەشەیی‌و پەلە پەل نەکات (١٣٥٨-١٣٦٣).

٢٤٤- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ نُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَمِعَ جَلَبَةً، فَقَالَ: « مَا شَأْنُكُمْ؟» قَالُوا: اسْتَعْجَلْنَا إِلَى الصَّلاَةِ، قَالَ: «فَلاَ تَفْعَلُوا، إِذَا أَتَيْتُمُ الصَّلاَةَ فَعَلَيْكُمُ السَّكِينَةُ، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا، وَمَا سَبَقَكُمْ فَأَتِمُّوا». {الحديث/١٣٦٢. تجريد = مختصر صحيح البخاری/١، لاپەڕە: ٣٦٠، چاپی/١، رقم: ٣٦٤ = ٦٣٥ فتح}:

**ئەبو قەتادە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **ڕۆژێ بەرنوێژیی بۆ دەکردین، لەوکاتەدا گوێی لێ بوو کەوا چەن پیاوێ کردوویانە بە گاڵە گاڵ‌و غەڵبە غەڵب‌و زرمە زرم، جا کە نوێژەکەی تەواو کرد فەرمووی: (ئەوە چیتان بوو، بۆ واتان کرد؟) یاران فەرموویان: پەلەی نوێژمان بوو، کە بگەین بە جەماعەتا. فەرمووی: (وامەکەن، بەڵکو کاتێ دێن بۆ نوێژ لەسەرە خۆو ئارام بن، بە هێمنی‌و بە هێوری‌و بە شێنەیی بچن بۆ نوێژ، ئیتر چەندەی فریاکەوتن بە جەماعەت بیکەن، ئەوەیشی کە پیانەگەیشتن، خۆتان بە تەنها تەواوی بکەن!). {تاج/١، لاپەڕە: ٣٧٩، زنجیرە: ١٢٥، ژمارە: ٢٥٥، چاپی دووەم}.**

**١٤٧) ڕێگە دراوە بە ژنان کە بەجوانی هاموشۆی مزگەوت بکەن.** (٩٨٧ - ٩٩٩).

**باب: خروج النساء إلى المساجد**

٢٤٥- عَنْ زَيْنَبَ الثَّقَفِيَّةِ (رَضِيَ اللَّهُ عنها) قَالَتْ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « إِذَا شَهِدَتْ إِحْدَاكُنَّ الْمَسْجِدَ فَلاَ تَمَسَّ طِيبًا». {الحديث/٩٩٦}:

زەینەبی ثەقەفییە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی بە ئێمەی ژنان: (کاتێ دەچن بۆ مزگەوت بۆنی خۆش لەخۆتان مەدەن).
{تاج/١/٣٥٤، زنجیرە: ١١٧، ژمارە: ٧٠٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

١. بڕوانە تاج/١، زنجیرە: ١١٧ بەتەواوی، هەروا (زنجیرە: ١١٨) هەتا بە باشی مەبەست لەم فەرموودەیە حاڵی ببیت.

٢. زەینەبی کچی عەبدوڵڵای ثەقەفییە، هاوسەری عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود، ژنێکی دەست ڕەنگین بوو، خۆشیو مێردەکەیشیو منداڵەکانیشیانی، بە ڕەنجە شانی خۆی بەخێو دەکرد. {بڕوانە: تەجریدی بوخاری ژمارە: ١٤٧٣ ژیننامەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود + تاج/٥، لاپەڕە: ١٢٣، = تاج/٣ ل/٦٥٣ ج/٤ زنجیرە/٢٨، چاپی یەکەم. باسی گەورەیی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود}.

**١٤٨) پێشگیریی لە چوونی ژنان بۆ مزگەوت** (٩٨٧ - ٩٩٩).

**باب: منع النساء الخروج**

٢٤٦- عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّهَا سَمِعَتْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عنها) زَوْجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَقُولُ: (لَوْ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَأَى مَا أَحْدَثَ النِّسَاءُ لَمَنَعَهُنَّ الْمَسْجِدَ كَمَا مُنِعَتْ نِسَاءُ بَنِي إِسْرَائِيلَ، قَالَ: فَقُلْتُ لِعَمْرَةَ: أَنِسَاءُ بَنِي إِسْرَائِيلَ مُنِعْنَ مِنَ الْمَسْجِدِ؟ قَالَتْ: نَعَمْ. {الحديث/٩٩٨. بخاري: ٨٦٩}:

عەمرەی کچی عەبدوڕەحمان فەرمووی: بیستم لە خاتوو عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (درودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لە عائیشە بێ) دەیفەرموو: ئەمەی کە ئێستا ژنان بەرپایان کردووە، لەخۆ ئارایشدانو لەخۆ ڕازانەوە، ئەگەر

پێغەمبەر نەمردایەو فریای ئەمە بکەوتایەو بەچاوی خۆی ئەمەی بدیایە، وەك ئێمە ئەمڕۆ دەیبینین، مزگەوتی لە ژنان قەدەغە دەکرد، هەروەك چۆن لەکاتی خۆیانا، مزگەوت لە ژنانی نەوەی ئیسرائیل قەدەغە کرابوو، لە ئایینی خۆیانا، راوی ئەم فەرموودەیە لە عەمرەوە دەڵێ: منیش گوتم بە عەمرە: بۆچی مزگەوت لە ژنانی نەوەی ئیسرائیل، لەدینی خۆیانا قەدەغە کرابوو، رێگە بە ژنانی جوولەکە نەدەدرا، کە هاموشۆی کەنیشتەی خۆیان بکەن؟ عەمرە گوتی: بەڵێ.

**١٤٩) نزای کاتی چوونە ناو مزگەوت** (١٦٤٩ - ١٦٥٠).

**باب: مَا يَقُولُ إِذَا دَخَلَ الْمَسْجِدَ**

٢٤٧- عَنْ أَبِى حُمَيْدٍ - أَوْ عَنْ أَبِى أُسَيْدٍ - قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلْيَقُلِ: (اللَّهُمَّ افْتَحْ لِى أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ) وَإِذَا خَرَجَ فَلْيَقُلِ: (اللَّهُمَّ إِنِّى أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ»). {الحديث/١٦٤٩}:

ئەبو حومەید (یا ئەبو ئوسەید) (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ دەچنە ناو مزگەوت، لەپێشا سڵاو لە پێغەمبەر بکەن، ئنجا بڵێن: (أَللّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ: خودایە! دەرگاکانی رەحمەتو میهرەبانی خۆتم لێ بکەرەوە) کاتێ چوونە دەرەوە بڵێن: (أَللّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ: خودایە! داوای بەخششو بەهرەی خۆتت لێ دەکەم). {تاج/١/٣٥٥، چاپی یەکەم، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٧٠٦، چاپی دووەم}.

**روونکردنەوە:**

ئیمامی نەوەوی (پڕ گۆڕی پیرۆزی لە نووری خودا بێ) دەفەرموێ: پوختەی کۆی ئەو زیکرو یادانەی کە لەم کاتەدا سوننەتە بگوترێن ئەمەیە: (أَعُوذُ بِاللّهِ العَظِيمِ، وَ وَجْهِهِ الكَرِيمِ، وَسُلْطَانِهِ القَدِيمِ، مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، بِسْمِ اللهِ، وَالحَمْدُ لِلّهِ، اللّهُمَّ صَلِّ عَلَى محمد وَعَلَى آلِ محمدٍ وَسَلِّمْ، أللّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذُنُوبِي، وَافْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ). واتە:

پەنا دەگرم بە خودای گەورە، بەزاتی پیرۆزی، بە دەسەڵاتی دێرینی، لە شەیتانی بەشبڕاو لە ڕەحمەتی خودا، بەناوی خودا، سوپاس بۆ خودا، خودایە! دروودو سڵاو برژێنە بەسەر موحەممەدو بەسەر کەسوکاری موحەممەدا، خودایە! لە گوناهەکانم خۆش بە، هەموو دەرگاکانی سۆزو ڕەحمەتی خۆتم لێ بکەرەوە). دەفەرموێ: لەکاتی دەرچوونیشا لە مزگەوت هەمان شت بلێ، بەڵام لە کۆتایدا، لەباتی (وَافْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ) ئەمە بلێ: (أَللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ).

{تاج/١، لاپەڕە: ٣٥٦، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٧٠٨}.

**١٥٠) کاتێ دەچیتە ناو مزگەوت دوو ركات نوێژی دیاری مزگەوت بكە**.(١٦٥١ - ١٦٥٣). {**باب: إذا دخل المسجد فليركع ركعتين**}

٢٤٨- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ)، قَالَ: ( دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جَالِسٌ بَيْنَ ظَهْرَانَيِ النَّاسِ، قَالَ: فَجَلَسْتُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « مَا مَنَعَكَ أَنْ تَرْكَعَ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ تَجْلِسَ؟». قَالَ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ رَأَيْتُكَ جَالِسًا وَالنَّاسُ جُلُوسٌ، قَالَ: « فَإِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلاَ يَجْلِسْ حَتَّى يَرْكَعَ رَكْعَتَيْنِ». {الحديث/١٦٥٢. تجريد/١/٢٨١، رقم: ٢٧١ = ٤٤٤، ١١٦٣ فتح الباری}:

ئەبو قەتادە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ، ڕۆیشتم بۆ مزگەوت، ڕوانیم وا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو خەڵکەکەدا دانیشتووە، ئیتر منیش دانیشتم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: (ئەوە بۆچی لەپێش ئەوەدا کە دابنیشیت دوو ركات نوێژی سوننەتی مزگەوتت نەکرد؟). عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! کەدیم تۆ دانیشتووی‌و مەردومەکەیش لە خزمەتتا دانیشتوون ئیتر منیش چاوم لە ئێوە کردو یەکسەر دانیشتم. فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (دەی هەرکاتێ کەسێ لەئێوە کە دەچێتە ناو مزگەوتەوە، لەپێش ئەوەدا کە دابنیشێ، با دوو ركات نوێژی دیاری مزگەوت بکا).

## ١٥١) كەبانگ درا، دەرچوون لە مزگەوت ناپەسەندە
## باب: النَّهْيُ أَنْ يَخْرُجَ مِنَ المَسْجِدِ بَعْدَ الأَذانِ

٢٤٩- عَنْ أَبِي الشَّعْثَاءِ قَالَ: كُنَّا قُعُودًا فِي الْمَسْجِدِ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ)، فَأَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ، فَقَامَ رَجُلٌ مِنَ الْمَسْجِدِ يَمْشِي، فَأَتْبَعَهُ أَبُو هُرَيْرَةَ بَصَرَهُ، حَتَّى خَرَجَ مِنَ الْمَسْجِدِ، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: (أَمَّا هَذَا فَقَدْ عَصَى أَبَا الْقَاسِمِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). {الحديث/١٤٨٧}:

ئەبو شەعثاء (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: رۆژێ لە مزگەوت لە خزمەت ئەبو هورەیرەدا بووین، لەوکاتەدا کە بانگبێژ بانگی دەدا، بۆ نوێژی عەصر، پیاوێ هەڵسا لە مزگەوتەکە چووە دەرەوە، ئەبو هورەیرە چاوی تێ بڕی، هەتا لەمزگەوت دەرچوو، ئەوجا فەرمووی: (بەڵێ ئەم پیاوە بەم دەرچوونی ناوەختە، بەم کردەوە ناشیرینە، لە فەرمانی پێغەمبەری خۆشەویست دەرچوو). {تاج/١، لاپەڕە: ٢٣٣، زنجیرە: ٦٤، ژمارە: ٤٣٦}.

**روونکردنەوە:**

دەرچوون لەم کاتەدا لە مزگەوت ناباش و ناپەسەندە، مەگەر بۆ کەسێ کە مەهانەی رەوای هەبێ، وەك مەلایێ لەوکاتەدا دەربچێ هەتا بچێ لە مزگەوتەکەی خۆی بەرنوێژی بۆ خەڵکی مزگەوتەکەی خۆی بکا، یا کەسێ دەستنوێژی نەبێو ئاویش نەبێ لەو مزگەوتەدا، یا مەلاکە بیدعەتکار بێ. {بڕوانە ژمارە: ٦٣٩ فتح الباری}.

## ١٥٢) کەفارەتی تف رۆکردن لەناو مزگەوتا. (١٢٢٣ - ١٢٣٥).
## باب: كفارة البزاق في المَسْجِد

٢٥٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «الْبُزَاقُ فِي الْمَسْجِدِ خَطِيئَةٌ، وَكَفَّارَتُهَا دَفْنُهَا». {الحديث/١٢٣١. تجريد/١/٢٦٨ = ٤١٥ فتح}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا فەرمووی: (تف رۆکردن لەناو مزگەوتا گوناهە، کەفارەتەکەی ئەوەیە: کە بەخۆڵی ناو مزگەوتەکە دایپۆشێ). {تاج/١/٣٥٧، ژمارە: ٧١٢}.

**١٥٣) ناپەسەندە سیر بخۆیت‌و بچیت بۆ مزگەوت.** (١٢٤٨ - ١٢٥٩).

٢٥١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِىَ اللّٰهُ عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ فِى غَزْوَةِ خَيْبَرَ: « مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ (يَعْنِى الثُّومَ) فَلاَ يَأْتِيَنَّ الْمَسَاجِدَ». {الحديث/١٢٤٨. تجريدى البخارى: ٤٥٩ = ٨٥٥، ٥٤٥٢، ٧٣٥٩ + ٨٥٣، ٤٢١٥، ٤٢١٧، ٤٢١٨، ٥٥٢١، ٥٥٢٢ فتح}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەغەزای خەیبەردا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ لەم گیایەی خوارد (واتە: لەسیر) با توخنی مزگەوتەکانمان نەکەوێ، هەتا بۆنەکەی دەڕوا). {تاج/١/٣٦٢، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٧٢٥}.

**١٥٤) کەنارگرتن لە مزگەوت، لەکاتی خواردنی پیازو کەوەرو سیر.** (١٢٤٨ - ١٢٥٩).

**باب: إعْتِزَال المَسْجِدِ مِنْ أَكْلِ البَصَلِ وَالكُرَّاثِ وَالثَّوْمِ**

٢٥٢- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِىَ اللّٰهُ عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « مَنْ أَكَلَ ثُومًا أَوْ بَصَلاً فَلْيَعْتَزِلْنَا، أَوْ لِيَعْتَزِلْ مَسْجِدَنَا، وَلْيَقْعُدْ فِى بَيْتِهِ، وَأَنَّهُ أُتِىَ بِقِدْرٍ فِيهِ خَضِرَاتٌ مِنْ بُقُولٍ، فَوَجَدَ لَهَا رِيحًا، فَسَأَلَ فَأُخْبِرَ بِمَا فِيهَا مِنَ الْبُقُولِ، فَقَالَ قَرِّبُوهَا إِلَى بَعْضِ أَصْحَابِهِ، فَلَمَّا رَآهُ كَرِهَ أَكْلَهَا قَالَ: « كُلْ فَإِنِّى أُنَاجِى مَنْ لاَ تُنَاجِى». {الحديث/١٢٥٣. تجريد البخارى/ ٤٦٠ = ٨٥٥، ٨٥٤ فتح البارى}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ سیر، یا پیازی خوارد، با کەنار گیربێ لە ئێمە) یا فەرمووی: (با ئەوکەسە دوور بگرێ لە مزگەوتمان‌و لەماڵی خۆی دابنیشێ‌و لەوێ نوێژی خۆی بکات).

جارێکیش تەبەقێکیان بۆ پێغەمبەر هێنا، هەندێ سەوزەواتی لەسەر بوو، کە بۆنی سەوزەکە چوو بەسەریدا، پرسیاری کرد: ئەمە چییە؟ عەرزیان کرد: ئەوە سەوزەواتە. فەرمووی: (من ئەوە ناخۆم، داینێن بۆ ئەم پیاوە). پیاوەکەیش (کە یەکێك بوو لە یارانی پێغەمبەر) حەزی نەکرد کە بیخوات، چونکە پێغەمبەر لێی نەخوارد، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (تۆ بیخۆ، خۆئەمە حەرام

نييه، من بۆيه نـايخۆم چونكه گوفتوگۆ لهگهڵ فريشته دهكهم، خۆ تـۆ گوفتوگۆ لهگهڵ فريشته ناكهى، ئيتر بۆ نايخۆى).

### ١٥٥) دهركردنى كهسێ بۆنى پيازو سيرى لێ بێ له مزگهوت.
### باب: إِخْرَاجُ مَنْ وُجِدَ مِنْهُ رِيحُ الْبَصَلِ وَالثُّومِ مِنَ الْمَسْجِدِ

٢٥٣- عَنْ مَعْدَانَ بْنِ أَبِى طَلْحَةَ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) خَطَبَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَذَكَرَ نَبِىَّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَذَكَرَ أَبَا بَكْرٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: إِنِّى رَأَيْتُ كَأَنَّ دِيكًا نَقَرَنِى ثَلاَثَ نَقَرَاتٍ، وَإِنِّى لاَ أُرَاهُ إِلاَّ حُضُورَ أَجَلِى، وَإِنَّ أَقْوَامًا يَأْمُرُونَنِى أَنْ أَسْتَخْلِفَ، وَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لَمْ يَكُنْ لِيُضَيِّعَ دِينَهُ، وَلاَ خِلاَفَتَهُ، وَلاَ الَّذِى بَعَثَ بِهِ نَبِيَّهُ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ، فَإِنْ عَجِلَ بِى أَمْرٌ فَالْخِلاَفَةُ شُورَى بَيْنَ هَؤُلاَءِ السِّتَّةِ الَّذِينَ تُوُفِّىَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ عَنْهُمْ رَاضٍ، وَإِنِّى قَدْ عَلِمْتُ أَنَّ أَقْوَامًا يَطْعَنُونَ فِى هَذَا الأَمْرِ، أَنَا ضَرَبْتُهُمْ بِيَدِى هَذِهِ عَلَى الإِسْلاَمِ، فَإِنْ فَعَلُوا ذَلِكَ فَأُولَئِكَ أَعْدَاءُ اللَّهِ الْكَفَرَةُ الضُّلاَّلُ، ثُمَّ إِنِّى لاَ أَدَعُ بَعْدِى شَيْئًا أَهَمَّ عِنْدِى مِنَ الْكَلاَلَةِ، مَا رَاجَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِى شَىْءٍ مَا رَاجَعْتُهُ فِى الْكَلاَلَةِ، وَمَا أَغْلَظَ لِى فِى شَىْءٍ مَا أَغْلَظَ فِيهِ، حَتَّى طَعَنَ بِإِصْبَعِهِ فِى صَدْرِى، فَقَالَ: يَا عُمَرُ أَلاَ تَكْفِيكَ آيَةُ الصَّيْفِ الَّتِى فِى آخِرِ سُورَةِ النِّسَاءِ؟! وَإِنِّى إِنْ أَعِشْ أَقْضِ فِيهَا بِقَضِيَّةٍ يَقْضِى بِهَا مَنْ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، وَمَنْ لاَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّى أُشْهِدُكَ عَلَى أُمَرَاءِ الأَمْصَارِ فَإِنِّى إِنَّمَا بَعَثْتُهُمْ عَلَيْهِمْ لِيَعْدِلُوا عَلَيْهِمْ وَلِيُعَلِّمُوا النَّاسَ دِينَهُمْ، وَسُنَّةَ نَبِيِّهِمْ، وَيَقْسِمُوا فِيهِمْ فَيْئَهُمْ، وَيَرْفَعُوا إِلَىَّ مَا أَشْكَلَ عَلَيْهِمْ مِنْ أَمْرِهِمْ، ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا النَّاسُ تَأْكُلُونَ شَجَرَتَيْنِ، لاَ أَرَاهُمَا إِلاَّ خَبِيثَتَيْنِ، هَذَا الْبَصَلَ وَ هَذَا الثُّومَ لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا وَجَدَ رِيحَهُمَا مِنَ الرَّجُلِ فِى الْمَسْجِدِ أَمَرَ بِهِ فَأُخْرِجَ إِلَى الْبَقِيعِ، فَمَنْ أَكَلَهُمَا فَلْيُمِتْهُمَا طَبْخًا). {الحديث/١٢٥٨} :

مهعدانى كوڕى ئـهبو طهلحه دهفـهرموێ: ڕۆژى هـهينى بـوو، عومـهرى كوڕى خهطاب، وتارى ههينى دهدا، لهپێشا يادى پێغهمبهرى كرد، ئهوجا يادى ئهبوبهكرى صهديقى كرد، ئـهوجا عومـهر فـهرمووى: (لهخـهوما كهڵهشێرێ سێ دهنـدووكى لێ دام، من وا خهو پهرژێنى دهكهم كه ئاكامم هاتووهو ئهجـهلم زۆر نزيكه، جا بـهم

بۆنەیەوە چەندین پیاو پێم دەڵێن: کە جێنشین بۆ خۆم دابنێم، مەبادا شتێ وا رووبداو موسوڵمانان بەهۆی بێ جێنشینییەوە تووشی ئاژاوە ببن، بەڵام من دڵنیام ئەگەر من جێنشینیش دانەنێم خودا شتی وا ناکاو نە ئایینی خۆی زایە دەکاو نە جێنشینی خۆیو نە ئەو بەرنامە پیرۆزەی کە بە پێغەمبەرەکەیدا ناردوویەتی.

جا ئەگەر شتی وا بوو، مردن بە پەلە گەیشتە سەرم، ئەوا راسپێری بێ لێتان کە بە تەگبیرو راوێژ لەناو خۆتانا یەکێ لەم شەش کەسە هەڵبژێرنو بیکەن بەجێنشین لە جێگەی من، چونکە کاتێ کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گیانی پاکی سپارد، لەم شەش کەسە رازی بوو، کە عوثمانی کوڕی عەفانو، عەلی کوڕی ئەبو طالیبو، طەلحەو، زوبەیرو، سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصو، عەبدورەحمانی کوڕی عەوف بوون، ئەو رەزابوونەی پێغەمبەریش لەمانە، بەڵگەی شایانییانە بۆ ئەم کاری جێنشینییە، وە من ئەوە دەزانم کە خەڵکانێکی ئاژاوە گێڕ بەم راسپێرییەی منو بە راوێژی ئێوە، سەبارەت بەم شەش کەسە رازی نینو تانەو تەشەر لەکاری وا دەدەن، بەڵام شتی وا دڵتان سارد نەکاتەوە لەم بارەیەوە، لەبەر ئەم دوو هۆیە:

یەکەم: ئەوانە کەسانێ وا نین، کە دڵسۆزی ئەم نەتەوەی ئیسلامە بن، من خۆم لەسەر ئیسلامەتی بەدەستی خۆم دارکاریم کردوون.

دووەم: ئەگەر شتی وایان کردو لەکاتی وا ناسكو هەستداردا، ئاژاوەو دووبەرەکییان بەرپا کرد، ئەوە دیارە کە دۆستی ئیسلام نینو دوشمنانی دینی خوانو، کافرو بێباوەڕو گومڕا خۆیانن!!

لەپاش ئەمە، بەلامەوە گرنگترین شت کە لەپاش مردنی خۆم، ئەگەر وا بەزوویی رووبدا، کە بەبێ چارەسەرو حەل بەجێی بهێڵم، مەسەلەی کەلەپوورو میراتی کەلالەیە، لەکاتی پێغەمبەریشا لەم بابەتەم زۆر کۆڵییەوە، بۆ هیچ شتێ، وەك پرسی کەلالە، چەندجار پرسیارم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەکردووە، وە پێغەمبەریش لەسەر هیچ شتێ وەك کەلالە لێم توندو تووڕە نەبووە، تەنانەت لەدواجاردا، پەنجەی ژەند بە سینەمداو فەرمووی: (ئەی عومەر! تۆ ژیرو داناو

زانای، ئەوەندە لەشت مەپرسەو، ئەوەندە لەشت مەكۆڵەرەوە، ئوصوولی مەسائیل‌و رونوسول ئەقلام لە قورئانی پیرۆزو لە سوننەتی مندا هەیە، جا لەو دەق‌و پرسە سەرمەشقانە، بڕیارەكان دەربهێنن‌و بۆ هەموو جوزئیاتێ داوای دەقێكی تایبەت مەكەن!

وەكی تریش ئەی عومەر! بۆ ئەم پرسە ئەم ئایەتەت بەسە كەوا لە سوورەتی نیساءدا، كە لە هاویندا هاتۆتە خوارەوە، كە دەفەرموێ: {يَسْتَفْتُونَكَ، قُلِ اللّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلاَلَةِ – مائیدة – ٤/١٧٦}.

ئەوجا عومەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەگەر مام‌و نەمردم، بڕیارێكی وا دەدەم لەبارەی مەسەلەی كەلەپووری كەلالەوە، ئەوەندە روون‌و ئاشكرا بێ، كە قورئان خوێن‌و قورئان نەخوێن پێی رازی بن‌و بەو شێوە بڕیاربدەن‌و حوكمی پێ بكەن. لەپاشا ئیمامی عومەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەی خودایە! تۆ بەشایەت بە، كەوا من بەشایەتی تۆ، ئەم فەرمانڕەوایانەم لەسەر ئەم شارانە، لە وڵاتی ئیسلاما داناوەو بۆئەوە ناردوومن بۆسەر ئەو وڵات‌و شارانە كە دادپەروەر بن‌و بە عەداڵەت بڕانن لەناویانا، وە بۆ ئەوەیش كە ئەو خەڵكە فێری ئایینی پیرۆزی ئیسلام بكەن، كە تاكە ئایینی خۆیانە، وە هەروەها فێری بەرنامەی پیرۆزی پێغەمبەریان بكەن، كە ناودارە بە سوننەتی پێغەمبەر، هەروا بە دادپەروەرانە دەسكەوتی جەنگ‌و تالانی شەرعی‌و مفتە ماڵ (فەیأ)یان بەسەردا دابەش بكەن، وە ئەگەر كارێكیشیان لێ بوو بەكێشەو بۆیان چارەسەر نەكرا، بەرزی بكەنەوە بۆلای خۆم، هەتا ئێمە لەلای خۆمان بەڕاوێژو تەگبیری ناو خۆمان چارە سەری بۆ بدۆزینەوە!

پاش ئەم باس‌و خواسەیش، ئەی خەڵكە! ئێوە لەدوو گیا دەخۆن، من بەخودی خۆم بە پیسیان دەزانم، ئەو دووەیش پیازو سیرن، من بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دیوە، ئەو كەسەی لەناو مزگەوتەكەی خۆیدا، بۆنی یەكێ لەم دوو گیایەی لێ بكردایە، فەرمانی دەدا لە مزگەوت دەریان دەكردو دەیان برد بۆ بەقیع، كە گۆڕستانی موسوڵمانانە لە مەدینە، وا لە نزیك مزگەوتەكەی پێغەمبەرەوە، جا

هەرکەسێ دەیانخوات با بیان کوڵێنێ، تا بۆنەکەیان بمرێ، جا ئەوسا بەکوڵاوی لەناو چێشتا یا بەتەنیا بیانخوات). {تاج/١، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٧٢٦ + تاج/٣، زنجیرە: ٥، ژمارە: ١٩٧٤ و ١٩٧٥ + تاج/١، لاپەڕە: ١٠٧، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ١٥٨/١٣}.

**١٥٦) پێشگیریی لەبانگەواز هەڵدان بۆ شتی ونبوو، لەناو مزگەوتدا**.(١٢٦٠ - ١٢٦٤). {**باب: النَّهْيِ عَنْ أَنْ تُنْشَدَ الضَّالَّةُ فِي الْمَسْجِدِ**}

٢٥٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ سَمِعَ رَجُلاً يَنْشُدُ ضَالَّةً فِي الْمَسْجِدِ فَلْيَقُلْ: لاَ رَدَّهَا اللَّهُ عَلَيْكَ، فَإِنَّ الْمَسَاجِدَ لَمْ تُبْنَ لِهَذَا». {الحديث/١٢٦٠}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر گوێتان لێ بوو کە یەکێ لەناو مزگەوتا بانگەواز هەڵ دەدات بۆ دۆزینەوەی شتی گومبوو، بڵێن: یاخوا نەیدۆزیتەوە، چونکە مزگەوت بۆ ئەمە دروست نەکراوە). {تاج/١، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٧٢٢}.

**١٥٧) پێشگیری لەوە کە گۆڕ بکرێ بە مزگەوت**. (١١٨١ - ١١٨٨).
**باب: النهي أَنْ تُتَّخَذَ القُبُورُ مَسَاجِدَ**

٢٥٥- عَنْ عَائِشَةَ وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) قَالاَ: لَمَّا نَزَلَ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) طَفِقَ يَطْرَحُ خَمِيصَةً لَهُ عَلَى وَجْهِهِ فَإِذَا اغْتَمَّ كَشَفَهَا عَنْ وَجْهِهِ، فَقَالَ، وَهُوَ كَذَلِكَ: «لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ». يُحَذِّرُ مِثْلَ مَا صَنَعُوا). {الحديث/١١٨٧. تجريد/١/٢٧٧، ژمارە: ٢٦٧ = ٤٣٦، ١٣٣٠، ١٣٩٠، ٣٤٥٣، ٤٤٤١، ٤٤٤٣، ٥٨١٩}:

عائیشەو عەبدوڵڵای کوڕی عەباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموویان: (کاتێ فریشتەی گیان کێشان هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی سەرە مەرگا، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) پۆپەشمینێکی گوڵ گوڵی دابوو بەسەر روخساری خۆیدا، ناو بەناو کە پۆپەشمینەکە خەفەو تەنگە نەفەسی دەکرد، رووی خۆی لادەدا، وە

لەکاتی ئەم سەخڵەتی سەرە مەرگەدا فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (لەعنەتو نەفرینی خودا لەسەر جوولەکەو گاور بێ، کە گۆڕی پێغەمبەرەکانی خۆیان کردووە بە مزگەوت).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم فەرمایشتە هەڕەشەی لەم کردارە ناپەسەندەیان دەکرد، نەبادا موسوڵمانانیش چاو لەوان بکەنو، هەمان تاوان بکەنو، گۆڕی پێغەمبەر بکەن بە مزگەوتو نوێژو پەرستشی تیادا بکەنو، بەرە بەرە لەپاش رۆژگارێکی دوورو درێژ، گۆڕەکە خۆشی بپەرستن). {تاج/١، زنجیرە: ١٢١، ژمارە: ٧٣٦}.

**روونکردنەوە:**

١. مەبەست ئەوەیە کە گۆڕەکە بکرێ بە هۆدەو شتی واو، ئەوسا لەناویا وەك مزگەوت نوێژ بکرێ بەتایبەت لەباتی رووگەو قیبلە روو بکرێتە گۆڕەکە بۆ رێزو بەگەورە زانین. پەنا بەخوا لە هەڵەی وا.
٢. مەبەست ئەوەنییە کە شوێنی گۆڕو جێگەی گۆڕستان نەکرێ بە مزگەوت، چونکە شتی وا، بەپێی مەرجی تایبەت دروستە وەك لەپێشەوە لە ژمارە: ٢٦٣/١١٧٣ دا رابورد.

## ١٥٨) پێشگیری لە دروستکردنی مزگەوت لەسەر گۆڕ.
## باب: النهي عَنْ بِنَاءِ المَسَاجِدِ عَلَى القُبُورِ

٢٥٦- عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ وَأُمَّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُنَّ) ذَكَرَتَا كَنِيسَةً رَأَيْنَهَا بِالْحَبَشَةِ فِيهَا تَصَاوِيرُ لِرَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « إِنَّ أُولَئِكِ إِذَا كَانَ فِيهِمُ الرَّجُلُ الصَّالِحُ فَمَاتَ بَنَوْا عَلَى قَبْرِهِ مَسْجِدًا وَصَوَّرُوا فِيهِ الصُّوَرَ، أُولَئِكِ شِرَارُ الْخَلْقِ عِنْدَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ». {الحديث/١١٨١. تجريد البخاري/١/٢٧٤، رقم: ٢٦٣=٤٢٧، ٤٣٤، ١٣٤١، ٣٥٧٣}:

عائیشە فەرمووی: ئوممو حەبیبەو ئوممو سەلەمە، کە هەردووکیان وەك عائیشە، هاوسەری پێغەمبەر بوون (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا

لەهەموو هاوسەرو یارانی بێ) عائیشە فەرمووی: ئەم دوو خاتووونە، لە وڵاتی حەبەشە، لەکاتی کۆچ کردنیاندا بۆ ئەوێ، کڵێسایەکیان دیبوو، بەناوی مارییە، باسی ئەو پەیکەرو وێنانەیان بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گێڕایەوە، کە لەناو ئەو کڵێسایەدا دیبوویانن. فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەوانە هۆزێکن کاتێ بەندەیەکی باش، یا پیاو چاکێ لەناویاندا هەڵدەکەوێ، کە دەمرێ دەچن مزگەوت لەسەر گۆڕەکەی دروست دەکەن و ئەو وێنانەی تیا دەکێشن، ئەم جۆرە کەسانەیش کە ئەم جۆرە رەوشتە نا پەسەندەیان داهێناوە، بەدترینی دروستکراوانی خودان، لەلای خودای مەزن لە رۆژی قیامەتدا). {تاج/١/٣٦٦، ژمارە: ٧٣٥}.

### ١٥٩) سەر رووی زەوی هەمووی بۆ موسوڵمان وەك مزگەوت وایە بۆ نوێژ، خۆڵەکەشی پاکەوە کەرە.

### باب: جُعِلَتْ لِيَ الأَرْضُ مَسْجِداً وَطَهُوراً

٢٥٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «فُضِّلْتُ عَلَى الأَنْبِيَاءِ بِستٍّ: أُعْطِيتُ جَوَامِعَ الْكَلِمِ، وَنُصِرْتُ بِالرُّعْبِ، وَأُحِلَّتْ لِيَ الْغَنَائِمُ وَجُعِلَتْ لِيَ الأَرْضُ طَهُورًا وَمَسْجِدًا، وَأُرْسِلْتُ إِلَى الْخَلْقِ كَافَّةً، وَخُتِمَ بِيَ النَّبِيُّونَ». {الحديث/١١٦٧}:

لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەم شەش خەڵاتە باوم دراوە بەسەر پێغەمبەرانی پێش خۆماو، ئەم شەش بەهرە گەورەیەم لە لایەنی پەروەردگارەوە پێ خەڵات کراوە، ئەم شەش بەهرەیە بەسەر یەکەوە، لەپێش مندا، بە هیچ پێغەمبەرێکی تر نەبەخشراوە:

١. فەرمایشتی پڕ واتاو فەرموودەی کۆ گیرم پێ بەخشراوە.

٢. تا ماوەی مانگە رێیەك دوژمن لەسامو شکۆی خۆم و لەشکرم زەندەقیان دەچێ، هەر بە بیستنی ناوو شۆرەتی ئازایی سوپای ئیسلام، لەسایەی خوداوە، ورە بەردەدەن و، خۆگرییان دەرووخێ، ئەمەیش بووە بەهۆی سەرکەوتن بۆ ئێمەی گەلی ئیسلام.

٣. ماڵی تالآنی بێ بڕواکانیش حەڵاڵ کراوە بۆ منو بۆ نەتەوەی ئیسلام، لەپێش مندا بۆ کەسی تر خواردنی ماڵی تالآنی کافران حەڵاڵ نەبووە.

٤. رووی زەویش هەمووی بۆ خۆمو بۆ نەتەوەی ئیسلام دانراوە بە مزگەوتو، لەهەر شوێنێ مزگەوتی لێ نەبوو، لەسەر رووی زەوی نوێژی خۆمانی لێ دەکەینو، مەرج نییە کە ئێمە وەك نەتەوەکانی تر هەر لەناو کلێساو کەنیشتەو پەرستگاکاندا نوێژ بکەینو بەس! لەهەمان کاتدا خۆڵەکەشی پاكو پاکەوە کەرە، لەکاتی پێویستدا خۆمانی پێ پاك دەکەینەوەو تەیەمومی پێ دەکەین، کەواتە: هەر موسوڵمانێ، لەهەر کوێیەك بوو، خوای مزگەوتی لێ بوو یانا، وە خوای ئاو هەبوو بۆ دەسنوێژو شتی وا یانا، با بەکەماڵی حەواوەیی نوێژی خۆی لێ بکا.

٥. جاران لەپێش مندا، زۆربەی پێغەمبەرەکان کە دەکران بە پێغەمبەر، بەتایبەتی رەوانە دەکران بۆسەر هۆزەکەی خۆیانو بەس، بەڵام من لەسایەی خوداوە، خودا کردوومی بە پێغەمبەرو رەوانەی کردووم بۆسەر هەموو کەسێ، لە مرۆڤو لە جنۆکە بەگشتی.

٦. کراوم بەدوا پێغەمبەرو دەرگای پێغەمبەرایەتی بەمن مۆر کراوەو لەپاش من هەرگیز پێغەمبەری تر نابێ!). {تاج/١/٣٦، ژمارە: ٣٦ + تەجرید/١/٢٢٥، ژمارە: ٢١٧ = ٣٣٥، ٤٣٨، ٣١٢٢}.

## ١٦٠) ئەندازەی ئەو شتەی کەدەبێ بە بەربەست بۆ نوێژ خوێن.
## باب: قَدْرُ مَا يَسْتُرُ الْمُصَلّي

{بڕوانە: تجریدی بوخاری/١/٣٠٨، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٢٩٦ ← ٣٠٨}.

٢٥٨- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ يُصَلِّي فَإِنَّهُ يَسْتُرُهُ إِذَا كَانَ بَيْنَ يَدَيْهِ مِثْلُ آخِرَةِ الرَّحْلِ، فَإِذَا لَمْ يَكُنْ بَيْنَ يَدَيْهِ مِثْلُ آخِرَةِ الرَّحْلِ، فَإِنَّهُ يَقْطَعُ صَلاَتَهُ الْحِمَارُ، وَالْمَرْأَةُ، وَالْكَلْبُ الأَسْوَدُ، قُلْتُ: يَا أَبَا ذَرٍّ! مَا بَالُ الْكَلْبِ الأَسْوَدِ مِنَ الْكَلْبِ الأَحْمَرِ، مِنَ الْكَلْبِ الأَصْفَرِ؟ قَالَ: يَا ابْنَ أَخِي سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَمَا سَأَلْتَنِي، فَقَالَ: « الْكَلْبُ الأَسْوَدُ شَيْطَانٌ».
{الحديث/١١٣٧}:

ئـەبو زەڕ (ڕەزای خـوداى لىٚ بـىٚ) فـەرمووى: خۆشەويسـت (دروودى خـوداى لەسـەر بىٚ) فـەرمووى: (لەكاتى نوێـژ كردنـدا، ئەگـەر شـتىٚ بەقـەد قوتكەى دواوەى كۆپانـە وشـترىٚ لەبـەر دەمتانا بىٚ، ئيتر ئەوە دەبـىٚ بـە محەججـەرەو پـەردە بـۆىو، هەرشـتىٚ لـەوديو ئـەو بەربەسـتەوە بـڕوا زيـانى بـۆ نوێژەكـەى نابـىٚ، بـەلاّم ئەگـەر شتێـكى وا لەبـەردەم نوێژەكـەتانا نـەبوو، ئـەوە لـەم حالّـەدا كـەرو ژنو سـەگى رەش، ئەگـەر بـە بـەردەم نوێژەكـەتانا تێپـەڕن نوێژەكـەتان دەبـڕن. عەبـدوللاّى كـوڕى صـاميت كـە ئـەم فەرموودەيە لە ئەبو زەڕەوە دەگێڕێتەوە، دەڵـىٚ: گوتم: ئـەى ئـەبو زەڕ! سـەگ هـەر سەگە، سەگى رەش جياوازى چييە لـە سـەگى سوور يـا لـە سـەگى زەرد، يـا لەهـەر سەگێـكى تـر؟ فـەرمووى: ئـەى كـوڕى بـرام! ئـەم پرسـيارەى كـەتۆ لـەمنت پرسـى، منيش هەمان پرسيارم لە پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بىٚ) پرسـى، لـە وەرامـا فـەرمووى: (سەگى رەش شەيتانە). {تاج/١/٢٤٢، ژمارە: ٤٦٣}.

### ١٦١) نزيكى لە بەربەست. {الدُّنُوُّ مِنَ السُّتْرَةِ}

٢٥٩- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عنهما) قَالَ: كَانَ بَيْنَ مُصَلَّى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَبَيْنَ الْجِدَارِ مَمَرُّ الشَّاةِ). {الحديث/١١٣٤. تجريد البخاري/١/٣٠٩، ژمارە: ٢٩٨ = ٤٩٦، ٧٣٣٤}:

سـەهلى كـوڕى سـەعدى ئـەل‌سـاعيدى (ڕەزاى خودايـان لىٚ بـىٚ) فـەرمووى: نوێـژگا (موصـەللا)كـەى پێغەمبـەر (دروودى خوداى لەسەر بىٚ) لەجێـگـەى پێـكانيەوە، تـا ديوارەكـە، بەقەد گوزەرگاى مەڕىٚ، يا بزنىٚ، دەبوو). {تاج/١/٢٣٦، ژمارە: ٤٤٦، زنجيرە: ٦٧}.

**ڕوونكردنەوە:**

سەهل خۆىو سەعدى باوكى صەحابە بوون.

١. سەهل لە گەورە پياوانى هاوڕێيانە، ناوى حەزن بووە، واتە: سەخت (سەهل) واتە: خۆشو ئاسان، پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بىٚ) ناوەكـەى گـۆڕىو نـاوى نـا سـەهل، ئەنصاريە، سەدو سىو هەشت فـەرموودەى لـە پێغەمبـەرەوە گێڕاوەتـەوە، سـىو

نۆ فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە، یان چل‌و یەك فەرموودە، پتر لەسەد ساڵ ژیاوە، لە نەوەدو یەکی کۆچیدا لە مەدینە بە مەرگی خودا مردووە، کاتێ پێغەمبەر مردووە پازدە ساڵ بووە، ئیمامی زوهری فەقێی بووە، یەکێ بووە لەو هاوڕێ نازدارانەی پێغەمبەر، کە حەججاجی ثەقەفی گەڕی پێ کردوون‌و، ئازاری داون! {بڕوانە: تەجرید/١/١٩٢، ژمارە: ١٧٤}.

٢. سەعدی کوڕی مالیکی کوڕی خالید باوکی سەهلی کوڕی سەعدی ئەل-ساعیدییە، خۆی ئامادە کرد، کە لە خزمەت پێغەمبەردا بچێ بۆ غەزای بەدر، لەڕێ نەخۆش دەکەوێ‌و دەمرێ، راسپێرینامەکەی لەپاشکۆی کۆپانی ولاخەکەی دەنووسێ، رادەسپێرێ: کە ولاخەکەی بە کۆپانەکەیەوە بۆ پێغەمبەر بێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە تالانی بەدر پشکی بۆ داناو هەواڵیشی دا کە پاداشی تەواوی هاوبەشکەرانی غەزای بەدری بۆ هەیە لەلای خودا.

## ١٦٢) راکشان لەبەردەم نوێژ خوێندا.
## باب: الإعتراض بين يدَي المُصلّي

٢٦٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها)،(وَذُكِرَ عِنْدَهَا مَا يَقْطَعُ الصَّلاَةَ: الْكَلْبُ وَالْحِمَارُ وَالْمَرْأَةُ) فَقَالَتْ عَائِشَةُ: قَدْ شَبَّهْتُمُونَا بِالْحَمِيرِ وَالْكِلاَبِ، وَاللَّهِ لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي وَأَنَا عَلَى السَّرِيرِ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ مُضْطَجِعَةٌ، فَتَبْدُو لِي الْحَاجَةُ فَأَكْرَهُ أَنْ أَجْلِسَ فَأُوذِيَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَنْسَلُّ مِنْ عِنْدِ رِجْلَيْهِ). {الحديث/١١٤٣. تجريد البخاري/١/٣١١، رقم: ٣٠٣ = ٥٠٨، ٣٨٢ = فتح الباري، تاج/١، زنجيره: ٧١، ژمارە: ٤٦٦}:

هەندێ کەس لەخزمەتی عائیشەی دایکی موسوڵمانانندا (ڕەزای خودای لێ بێ) باسی ئەو شتانەیان دەکرد کە گوایە ئەگەر بە بەردەم نوێژکەردا بڕۆن نوێژەکەی دەبڕن، وە گوتیان: سەگ‌و کەرو ژن ئەگەر بە بەردەم نوێژدا بڕۆن، نوێژەکە دەبڕن!

عائیشەیش فەرمووی: ئەمە چۆن قسەیەکە، ئێمەی ژنان دەکەن بە هاوتای سەگ‌و کەر؟! شتی وا راست نییە، چونکە رێکەوتووە من خۆم لەسەر شێوەی

دانـانی تـەرم لەبـەردەم نوێژکـەر لەسـەری، راکشـاوم لەسـەر تـەختێ، لەبـەردەم پێغەمبەردا، لەوکاتەدا نوێژی دەکرد، من لەسـەر ئـەو حاڵە لـە بـەینی پێغەمبـەرو قیبلەکەیدا بووم، جا وادەبوو ئیشێکم بۆ پەیدا دەبوو، حـەزم نـەدەکرد کە رێـك و راست لەبەردەم نوێژەکەیدا دابنیشم، نەبادا ئازاری پێغەمبەر بدەم، لەبەرئـەوە بـە هێواشـی لـەلای پـاینی چـارپایەکەوە خـۆم دەدزییـەوەو دەچـووم بـۆ کارەکـەم و پێغەمبەریش بەردەوام بوو لەسەر نوێژەکەی}.

## ١٦٣) فەرمانکراوە بە رووکردنە رووگە لەکاتی نوێژ کردندا
## باب: الأمر باستقبال القِبْلَةِ

(فیقهی ئاسان/١/١٣٧، زنجیرە: ٥٥ پێنجەم + زنجیرە: ٥٦)

٢٦١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَجُلاً دَخَلَ الْمَسْجِدَ فَصلَّى، وَرَسُولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي نَاحِيَةٍ ... وَفِيـهِ: إِذَا قُمْـتَ إِلَـى الصَّلاَةِ فَأَسْـبِغِ الْوُضُـوءَ، ثُـمَّ اسْتَقْبِلِ الْقِبْلَةَ فَكَبِّرْ». {الحديث/٨٨٤. بخاری: ٦٢٥١، ٦٦٦٧}:

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: جـارێ پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لـە گۆشەیەکی مزگەوتدا دانیشتبوو، لەو کاتەدا پیـاوێ هاتـە ژوورەوە، دەسـتی کـرد بـە نوێژ کردن.... فەرموودەکەی گێڕایەوە تا دەگاتـە ئـەوێ کـە دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (کاتێ دەتەوێ نوێـژ بکـەی، دەستنوێژێـکی تێـرو پـڕ بگـرە، ئـەوجا روو بکـەرە رووگـەو بـە وشـەی ئـەڵڵاهو ئەکبـەری تـەحروم نوێـژ دابەستە). {تاج/١، زنجیرە: ٧٢، ژمارە: ٤٧٠}.

## ١٦٤) گۆڕینی رووگە لە بەیتولمەقدیسەوە بۆ کەعبە. (١١٧٦ - ١١٨٠).
## باب: فِي تحويل القبلةِ عَنِ الشَّامِ إِلَى الكعبةِ

٢٦٢- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) إِلَى بَيْتِ الْمَقْدِسِ سِتَّةَ عَشَرَ شَهْرًا حَتَّى نَزَلَتْ الآيَةُ الَّتِي فِي الْبَقَـرَةِ (وَحَيْثُمَـا كُنْـتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ) فَنَزَلَتْ بَعْدَ مَا صَلَّى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَانْطَلَقَ رَجُلٌ مِنَ

الْقَوْمِ، فَمَرَّ بِنَاسٍ مِنَ الأنْصَارِ وَهُمْ يُصَلُّونَ، فَحَدَّثَهُمْ بِالْحَدِيثِ، فَوَلَّوْا وُجُوهَهُمْ قِبَلَ الْبَيْتِ).
{الحديث/١١٧٦. تجريد/١/٥٧، رقم: ٣٨ = ٤٠، ٣٩٩، ٤٤٨٦، ٤٤٩٢، ٧٢٥٢}:

بەرائی کوڕی عازیب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لە مەککەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە، تا شازدە مانگ لە مەدینە لەگەڵ پێغەمبەردا، نوێژمان بەرەو (بيت المقدس) دەکرد، کەوا لەشاری قودس، لە وڵاتی شام، هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، کەوا لە سوورەتی بەقەرەدا،، کە دەفەرموێ: {وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ - سورة البقرة/ ١٤٤}، کە بەپێی ئەم ئایەتە، پێغەمبەرو موسوڵمانان، خودا فەرمانی پێکردن، کە ئیتر لەمەودوا، لەباتی بەیتولەقدیس رووبکەنە کەعبە لە مەککە. جا لەدوائەوە کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە پێغەمبەرو موسوڵمانان نوێژی عەصریان بەجەماعەت کرد بەرەو کابە لەمەککە، جا پیاوێ لەم کۆمەڵەی کەلەگەڵ پێغەمبەردا نوێژی عەصریان بەرەو کابە کردبوو، هەمان رۆژ ڕێی دەکەوێتە مزگەوتێ لە مزگەوتەکانی ئەنصار لە مەدینە، تەماشا دەکا نوێژکەرەکان نوێژی عەصر دەکەن بە جەماعەت بەلاٌم بەوەیان نەزانیوە کە رووگە گۆڕاوەو وەك جاران روویان لە بەیتولەقدیسەو وان لە روکوعدا، جا پێیان دەفەرموێ: سوێند دەخۆم بەخودا، کە ئەم عەصرە، بە جەماعەت لەپشت پێغەمبەرەوە رووەو کەعبە نوێژی عەصرمان کرد، ئیتر ئەوانیش لەسەر شایەتییەکەی ئەو، هەر لەناو نوێژەکەدا بەرەو کابە، کەوا لەناو مەسجیدولحەرامدا، لەشاری مەککە، روویان وەرچەرخاندو باقی مەندەی ئەو نوێژەیان روەو کابە تەواو کرد). {تاج/١/٢١٠، زنجیرە:٥٣، ژمارە: ٣٨٧ و ٣٨٨ و ٣٨٩}.

**روونکردنەوە:**

بەرائی کوڕی عازیب ئەنصارییە، خەزرەجییە، لە رۆژی بەدرا، لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی تری پێغەمبەردا، بە بچووك دانران، لەبەرئەوەی رێگەی هاوبەشیکردنیان لەو غەزایەدا نەدرا، یەکەم غەزا کە بەشداری تیا کردووە، لەسەر فەرمایشتی واقیدی، غەزای خەندەق بووە، خۆی دەفەرموێ، وەك لە إصابەدا دەفەرموێ: ئامادەی چواردە

نەبەرد (غەزا) بووم، لە خزمەت پێغەمبەر خۆیدا، هەروا دەفەرموێ: هەژدە سەفەریشم لە خزمەت پێغەمبەردا کردووە، بەراء دەیفەرموو: (مەرج نییە کە هەموو فەرموودەیێ، کە دەیگێڕینەوە بۆ ئێوە کە لەزاری خودی پێغەمبەر خۆیمان بیستبێ، هەیانە کە لە هاورێیانی خۆمانمان بیستووە، وە ئەوان لە پێغەمبەریان بیستووەو بۆ ئێمەیان گێڕاوەتەوەو ئێمەیش دەیگێڕینەوە بۆ ئێوە). ئامادەی شەڕگای (تستر) بووە، لەگەڵ ئەبو موسادا، لە لایەنگیرانی ئیمامی عەلی بوو، ئامادەی شەڕی جەمەڵو صفینو کوشتاری خەواریج بووە، لە کوفە نیشتەجێ بوو، لەوێ خانوویەکی دروستکرد بۆ خۆی، کۆمەڵێ فەرموودەی پێغەمبەری گێڕاوەتەوە، خۆیو عازیبی باوکی هاورێی پێغەمبەر بوون، لە صەحیحەینا دەفەرموێ: بەڕائی کوڕی عازیب فەرمووی: ئەبوبەکری صەدیق کۆپانە وشترێکی لە عازیبی باوکم کڕی، ئەبوبەکر بە باوکمی فەرموو: بە بەڕائی کوڕت بڵێ با ئەم کۆپانەم بۆ هەڵ بگرێ هەتاماڵەوە، باوکیشم فەرمووی: (پێی ناڵێم هەتا بۆمان نەگێڕیتەوە کە چۆن کۆچت کرد لەگەڵ پێغەمبەردا ..... هەتا کۆتایی فەرموودەکە).

**١٦٥) کاتێ قامەت کرا، نوێژی تر ناکرێ، بێجگە لە فەرزەکە.** (١٦٤٢ - ١٦٤٨)
**باب: إذَا أقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَلاَ صَلاَةَ إلاَّ المَكْتُوبَةَ**

{بڕوانە: فیقهی ئاسان/١/١٥٨، زنجیرە: ٥٩ + زنجیرە: ٦٠}.

٢٦٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَلاَ صَلاَةَ إِلاَّ الْمَكْتُوبَةُ».

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر قامەت کرا بۆ نوێژە فەرزەکان، ئیتر هیچ نوێژێکی تر نابێ بکرێت، بێجگە لە نوێژە فەرزەکەی کە قامەتی بۆ کراوە).

**ڕوونکردنەوە:**

نەوەوی دەفەرموێ:

١-كاتێ قامەت کراو لەپاش دەسپێکردنی قامەت، ناپەسەندو ناباشە، کە پاش نوێژ (مەئمووم) نوێژی سوننەت دابەستێ، ئیتر هەر سوننەتێ بێ. ئەمە مەزهەبی شافیعیو جەماوەرە.

٢-ئەگەر لەپێش دەست پێکردن بە قامەت، دەستی کردبوو بە نوێژی سوننەت ناپەسەند نییە کە تەواوی بکا.

٣-لەپاش دەست پێکردنی قامەتیش، سوننەتە دامەزراوەکانی نوێژە فەرزەکان، دروستە بکرێن، وەك راتیبەی بەیانیو نیوەڕۆو خەوتنان، هەندێ دەفەرموون: بەمەرجێ فریای رکاتی دووەم بکەوێ بە جەماعەت لەگەڵ پێش نوێژدا.

٤-ثەوری دەفەرموێ: (بەمەرجێ فریای رکاتی یەکەم بکەوێ لەگەڵ پێش نوێژدا بە کۆمەڵ).

**١٦٦) کاتێ قامەت کرا، کەی نوێژکەرەکان هەڵدەستن بۆ نوێژ دابەستن.**

**(١٣٦٤ - ١٣٦٩) باب: مَتى يَقُومُ النَّاسُ لِلصَّلاَةِ إِذَا أُقِيمَتْ**

٢٦٤- عَنْ أَبِى قَتَادَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَلاَ تَقُومُوا حَتَّى تَرَوْنِى». {الحديث/١٣٦٤. تجريد البخاري/١/٣٦٠، رقم: ٣٦٥ = ٦٣٧، ٦٣٨، ٩٠٩ فتح الباري شرح صحيح البخاري}:

ئەبو قەتادە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ قامەتی نوێژ دەکرێ، هەڵ مەسن بۆ نوێژ، هەتا کاتێ کەوا من دەبینن دێم بۆ نوێژ). {تاج/١/٣٨٠، چاپی/١، زنجیرە: ١٢٥، ژمارە: ٧٥٦}.

**روونکردنەوە:**

ئیمامی نەوەوی لە راڤەی ئەم فەرموودەیەدا، ئاوا روونی دەکاتەوە:

١-رای جیا جیا هەیە لەم بارەیەوە، مەزهەبی شافیعیو کۆمەڵێ لە زانایان وایە: کەس هەڵ نەسێ بۆ نوێژ هەتا بانگ بێژ لە قامەت دەبێتەوە.

٢-رای ئیمامی مالیكو زۆرینەی زانایان، دەڵێن: وا جوانە هەر لەگەڵ بانگ بێژ دەستی کرد بە قامەت کردن، ئەوان هەڵسن.

٣ -ئیمامی ئەنەسی کوڕی مالیك ئەوکاتە هەڵ دەسا، کە قامەتکەر دەڵێ: (قَدْ قامَتِ الصلاة) ئیمامی ئەحمەدیش هەروا دەڵێ.

٤ -جەماوەر دەفەرموون: کاتێ پێشنوێژ نوێژ دادەبەستێ کە قامەت تەواو بووبێ، دیارە کە پاشنوێژ لەپاش پێشنوێژ نوێژ دادەبەستێ، وە نابێ لە ئەڵلاهو ئەکبەری تەحەررومدا پێشی بکەوێ (پێشنوێژو پاشنوێژ واتە: ئیمامو مەئموم).

٥ -منیش کە وەرگێڕم عەرزتان دەکەم: کە کارکردن بەهەر کامێ لەم رایانە، بۆ ئێمەی عەوامو رەشە خەڵك دروستە.

## ١٦٧-م) قامەت ئەوکاتە دەکرێ کە پێش نوێژ ئامادەیە بۆ بەرنوێژی کردن.

## (١٣٦٤ - ١٣٦٩). باب: إقامة الصَّلاةِ إذا خرجَ الإمامُ

٢٦٥- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ بِلاَلٌ يُؤَذِّنُ إِذَا دَحَضَتْ، فَلاَ يُقِيمُ حَتَّى يَخْرُجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَإِذَا خَرَجَ أَقَامَ الصَّلاَةَ حِينَ يَرَاهُ). {الحديث/١٣٦٩} :

جابیری کوڕی سەمورە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: بیلال ئەوکاتە بانگی نیوەڕۆی دەدا، کە خۆر بەدیمەن لە ناوەڕاستی ئاسمان لای دەدا،ماڵەکانی پێغەمبەریش، زۆرینەیان دەرگایان لەسەر حەرەمی مزگەوت هەبوو، وەك حوجرەکەی عائیشە، جا کاتێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەردەچوو لەماڵو تەشریفی بەرەو میحرابەکە دەهاتو بیلال ئەوەی دەبینی ئیتر قامەتی نوێژی دەکردو پاشان جەماعەتیان دادەبەست).

## ١٦٧) رۆیشتنی پێش نوێژ بۆ خۆشۆردنی لەشگرانی لەپاش قامەت کردن.

## باب: خروج الإمامِ بعد الإقامة للغُسْلِ

٢٦٦- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) يَقُولُ: أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ، فَقُمْنَا فَعَدَّلْنَا الصُّفُوفَ قَبْلَ أَنْ يَخْرُجَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فأتى رَسُولُ اللّه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى إذَا قَامَ فِى مُصَلاَّه قَبْلَ أَنْ يُكَبِّرَ، ذَكَرَ (أى تذكَّرَ شَيْئاً وهُوَ لُزُومُ الإغْتِسَالِ) فَانْصَرَفَ، وَقَالَ لَنَا: « مَكَانَكُمْ ». فَلَمْ نَزَلْ قِيَامًا نَنْتَظِرُهُ حَتَّى خَرَجَ إِلَيْنَا وَقَدِ اغْتَسَلَ يَنْطِفُ رَأْسُهُ مَاءً، فَكَبَّرَ فَصَلَّى بِنَا). {الحديث/١٣٦٦. تجريد البخارى = مختصر صحيح البخارى/١، ص ٢٠٤، رقم: ١٩١ = ٢٧٥، ٦٣٩، ٦٤٠ فتح البارى}:

ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف، دەفەرموێ: گوێم لە ئەبو هورەیرە بوو دەیفەرموو: جارێ قامەتی نوێژکراو ئێمە هەڵساینو لە ریزدا وەستاینو ریزەکانمان رێك خست بەرلەوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە شوێنەکەی خۆی دەربچێو بێ بۆلای ئێمە، جا پێغەمبەر لە هۆدەکەی خۆیەوە تەشریفی هاتە دەرەوەو هات لە نوێژگاکەی خۆیدا، لەناو میحرابەکەدا، لە پێشمانەوە راوەستا، جا بەرلەوە ئەڵلاهو ئەکبەری تەحورروم بکاو نوێژ دابەستێ، بیری کەوتەوە کە لەشی گرانەو لەشپیسی لەسەرە، جا فەرمووی پێمان: (لە جێگەی خۆتان لەسەر ئەم حاڵە بمێننەوە تا دێمەوە). ئەوجا رۆیشتەوە بۆ ماڵەوە، کە حوجرەی یەکێ لە هاوسەرەکانی بوو، کە دەرگای لەناو ماڵی مزگەوتا بوو، ئیتر ئێمەیش ئاوا بە پێوە راوەستاینو چاوەڕوانی ئەومان دەکرد، هەتا گورج خۆی شۆرد، کە هاتەوە بۆلامان سەری ئاوی لێ دەتکا، هی خۆشۆردنەکەی، ئینجا ئەڵلاهو ئەکبەری نوێژ دابەستنی کردو ئێمەیش لە پشتیەوە بە جەماعەت لەگەڵیدا نوێژمان دابەستو نوێژەکەی بۆمان کرد).

## ١٦٨) رێکخستنی ریزەکانی نوێژی جەماعەت(٩٧١-٩٨٥).
## باب: في تَسْوِية الصُّفُوفِ

٢٦٧- عَنْ أَبِى مَسْعُودٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَمْسَحُ مَنَاكِبَنَا فِى الصَّلاَةِ وَيَقُولُ: « إسْتَوُوا وَلاَ تَخْتَلِفُوا فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ، لِيَلِيَنِى مِنْكُمْ أُولُو الأَحْلاَمِ وَالنُّهَى، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ». {الحديث/٩٧١}:

ئەبو مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران کە لەریزی جەماعەتی نوێژدا رادەوەستاین، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم پەڕی ریزەوە تا ئەوپەڕی ریز دەکەوتە ناو ریزەکەوەو دەستی دەهێنا بە سینگو بە شانماناو رێکی دەخستینو دەیفەرموو: (رێك بوەستن لە ریزەکانتاناو، نارێك مەوەستن، دەنا ناڕێکیو ناکۆکیتان تێ دەکەوێو دڵەکانتان تاقو لۆق دەکەن، با سەلارو هۆشیارو فامیدەکانتان لەمنەوە نزیك ببنەوەو لە ریزی پشت منەوە بن، ئەنجا ئەوانەی کە لەزرنگیو هۆشیاریدا لەوانی نزیك دەکەنەوە، دووبارە فەرموویەوە: ئەنجا ئەوانەی کە لەزرنگیو هۆشیاریدا لەوانی نزیك دەکەنەوە).

**روونکردنەوە:**

١-ئەبو مەسعوودی بەدری ناوی عوقبەی کوڕی عەمرە،،، ئەنصارییە، خەزرەجییە، بەدرییە، لەگەڵ حەفتا کەسەکەدا، بەکۆی را، ئامادەی پەیمانی عەقەبە بووە، لەوکاتەدا لە هەموویان بەتەمەن بچووکتر بووە، ئامادەی جەنگی ئوحودو نەبەردەکانی دوای بووە، سەدو دوو فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، لە بوخاریدا دە فەرموودەی هەیە، لە موسلیمدا شازدەی هەیە، نۆیان پەسەندی هەردوولان واتە: بوخاریو موسلیم ئەو نۆیەیان گێڕاوەتەوە، کۆی فەرموودەکانی لە بوخاریو موسلیمدا یەکسانە بە (٩+١+٧ = ١٧) فەرموودە، لە لایەنگیرانی عەلی بوو، لە کووفە نیشتەجێ بوو، هەر لەوێش مردووە (رەزاو رەحمەتی خودای گەورەو مەزنی لێ بێ).

٢-بۆ روونکردنەوەی تەواوی ئەم باسە، بڕوانە: تاجول ئوصول، بەرگی/١، لاپەڕە: ٣٩٨، چاپی/١، زنجیرە: ١٣٤ بە تەواوی، لە ژمارە: ٧٩٣وە هەتا ژمارە: ٨٠٠.

١٦٩) **خێری ریزی یەکەمی نوێژی جەماعەتو ریزە پێشینەکانی**. (٩٧١ - ٩٨٥).

**باب: فضل الصف المقدّم**

٢٦٨- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِى النِّدَاءِ وَالصَّفِّ الأَوَّلِ، ثُمَّ لَمْ يَجِدُوا إِلاَّ أَنْ يَسْتَهِمُوا عَلَيْهِ لاَسْتَهَمُوا

وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِى التَّهْجِيرِ لاَسْتَبَقُوا إِلَيْهِ، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِى الْعَتَمَةِ وَالصُّبْحِ لأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا». {الحديث/٩٨٠. تجريد البخارى/٣٥٧ = ٦١٥، ٦٥٤، ٧٢١، ٢٦٨٢}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:** (ئەگەر ئەو خەڵکە دەیانزانی خێری بانگدان‌و ریزی یەکەمی نوێژی جەماعەت چەندێ گەورەیە، وچاری تریان نەبوایە، جگە لەوە کە تیرو پشکیان لەسەر بکەن، ئەوا تیرو پشکیان لێ دەکردن، جا پشکی کێ دەربچوایە ئەوە بانگی دەدا، یا لە ریزی یەکەما دەوەستا، ئەگەر ئەو خەڵکە دەشیان زانی کە خێری زوو چوون بۆ نوێژی قرچەی گەرمای نیوەڕۆ چەندە گەورەیە بە هەڕاکردن دەچوون بۆی، وەك كاتی پێشبڕکێ، ئەگەر دەیشیانزانی خێری جەماعەتی خەوتنان‌و جەماعەتی بەیانی، چەنێ گەورەیە، ئەگەر بە گاڵگۆڵکەیش بوایە دەهاتن بۆیان).

٢٦٩- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «خَيْرُ صُفُوفِ الرِّجَالِ أَوَّلُهَا، وَشَرُّهَا آخِرُهَا، وَخَيْرُ صُفُوفِ النِّسَاءِ آخِرُهَا، وَشَرُّهَا أَوَّلُهَا». {الحديث/٩٨٤}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (باشترینی ریزی پیاوان لە جەماعەتا، ریزی یەکەمیانە،،، خراپترینیشیان دوا ریزیانە باشترینی ریزی ژنانیش دوا ریزیانە، خراپترین ریزیشیان یەکەم ریزیانە). {تاج/١/٣٩٤، زنجیرە: ١٣١، ژمارە: ٧٨٤}.

**روونکردنەوە:**

١-ریزی پیاوان هەموو کاتێ، هەتا لە پێش نوێژەوە نزیکتربێ، خێری زیاترە، وەهەتا لە دواوەبێ خێری کەمترە.

٢-بەڵام ریزی ژنان ئەگەر لەگەڵ جەماعەتی پیاوانا بێ ئەوە بڕیارەکەی ئەوەیە کە لە فەرموودەکەدا باس کراوە، بەڵام ئەگەر هەر ژنان خۆیان بوون، ئەوە باشترین ریزیان ریزی پێشەوەیانەو ناباشترینیشیان ریزی دواوەیانە. ئێستا لەزۆر شوێن جێگەی پیاوان جیایەو جێگەی ژنان جیایە، وە بەهیچ جۆرێ ژن‌و پیاو لەکاتی

جەماعەتدا، تێكەڵی یەكتر نابن‌و بێ ئاگان لە حاڵی یەكتری، گەرچی هەردوو لایان لەپشت یەك مەلاوە جەماعەت دەكەن، لەكاتی وادا خێری ریزی پێشەوەی ژنان زیاترە لە خێری ریزی دواوەیان.

٣-مەبەست لە (خیر) و (شەڕ) زۆری پاداش‌و كەمی پاداشە، دەنا مەبەست (شەڕ)ی بەرامبەر خێر نییە!!

٤-راسترین گوتە ئەوەیە كە ریزی یەكەمی جەماعەت كە خێری زۆرترە، ئەو ریزەیە كە یەكسەر وا لەپشت ماموستای مەلاوە، با بەهۆی پایەو كۆڵەكەو شتی وایشەوە، ریزەكە لەیەك پچڕابێ، یا ئەوەی كە تیادا دەوەستێ درەنگیش هاتبێ.

### ١٧٠) بۆ هەموو نوێژێ سیواك سوننەتە (٥٨٨ - ٥٩٥).
### باب: السِّوَاكُ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ

٢٧٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ {وَفِي حَدِيثِ زُهَيْرٍ: عَلَى أُمَّتِي} لأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ». {الحديث/٥٨٨} :

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نەبادا ئازارو زەحمەتی موسوڵمانان‌و ئۆمەتم بدەم، دەنا فەرمانم پێ دەكردن كە بۆ هەموو نوێژێ سیواك بكەن). {تاج/١، لاپەڕە: ١٣١، زنجیرە: ٢٧، ژمارە: ٢٢٣ چاپی دووەم + تاج/١، لاپەڕە: ٢٣٤، زنجیرە: ٦٥، ژمارە: ٤٣٩ هەروا لە ژمارە: ٤٣٧ هەتا ٤٤٢}.

### ١٧١) خێرو گەورەیی زیكرو ویردی پاش نوێژ دابەستن لەپێش فاتیحادا. (١٣٥٣ - ١٣٥٧). باب: فَضْلُ الذِّكْرِ عِنْدَ دُخُولِ الصَّلاَةِ

٢٧١- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): أَنَّ رَجُلاً جَاءَ فَدَخَلَ الصَّفَّ وَقَدْ حَفَزَهُ النَّفَسُ، فَقَالَ: (الْحَمْدُ لِلَّهِ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ، فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَلاَتَهُ، قَالَ: أَيُّكُمُ الْمُتَكَلِّمُ بِالْكَلِمَاتِ، فَأَرَمَّ الْقَوْمُ، فَقَالَ: أَيُّكُمُ الْمُتَكَلِّمُ بِهَا، فَإِنَّهُ

لَمْ يَقُلْ بَأْسًا؟» فَقَالَ رَجُلٌ: جِئْتُ وَقَدْ حَفَزَنِى النَّفَسُ فَقُلْتُهَا. فَقَالَ: « لَقَدْ رَأَيْتُ اثْنَىْ عَشَرَ مَلَكا يَبْتَدِرُونَهَا أَيُّهُمْ يَرْفَعُهَا». {الحديث/١٣٥٦} :

ئەنەس (رەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پیاوێ هات، جەماعەت دابەسرا بوو، بە پەلە پەل خۆی کرد بە ریزەکەدا، لە پەلە پەلیدا هەناسەی سوار بوو بوو، لەپاش ئەللاهو ئەکبەری نوێژ دابەستن، یەکسەر گوتی: (الحَمْدُ لِلّهِ حَمْداً كَثِيراً طَيِّباً مُبارَكاً فِيهِ) واتە: سوپاس بۆ خودا، سوپاسێکی زۆری پاكو پیرۆز). جا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە بەرنوێژییەکەی بوەوە، فەرمووی: (ئەوە کێ بوو کە ئەو چەند وشەیەی گوت؟). نوێژکەرەکان هەموو خامۆش بوون، دووبارە فەرموویەوە: (کامتان بوون کە ئەوەتان گوت، بۆ قسە ناکەن، خۆ خراپی نەگوتووە؟).

پیاوەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من بووم، کە هاتم لەبەر پەلە پەلکردن، هەناسەم سوار بوو، ئیتر بۆ سوپاسی خودا لەسەر ئەوە کە فریای جەماعەتەکە کەوتم، ئەوەم گوت.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو گوتەیەی کە تۆ گوتت ئەوەندە پاكو پیرۆز بوو، چاوم لێ بوو، کە دوازدە فریشتە پەلاماریانداو قۆستیانەوە، هەریەکێ لەوان پەلەی ئەوەی بوو کە خۆی لەپێشا بینووسێتەوەو بەرزی بکاتەوە بۆلای خوا لەناو کردەوە باشەکانتا). {تاج/١/٢٧٣، زنجیرە: ٨٤، ژمارە: ٥٢٣}.

**روونکردنەوە:**

١-ئاماژەیە بۆ ئەم ئایەتە: { إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ}. کە پوختەی واتاکەی ئاوایە: (قسەی پاكو پیرۆزو گوتەی باشو کردەوەی چاك بەرز دەکرێنەوە بۆ خزمەت خواوەندی بالا).

٢-بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو فریشتانەی کاری باشی بەندەکان دەنووسنەوە، مەرج نییە کە هەر فریشتە حەفەظەکان بن.

٣-ئەم یادە یەکێکە لە دوعاکانی ئیفتیتاح، واتە: نزای سەرەتای دەستکردن بە نوێژ، هەروەك ئەم فەرموودە دروستەو چەندین فەرموودەی تری راستو

دروست، بەڵگەی ڕۆشنن لەسەر ئەوە کە نزای سەرەتاو دەست پێکردنی نوێژ سوننەتە، وە قسەی ئیمامی مالیك (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەدەنە دواوە کە دەفەرموێ: نزای سەرەتای نوێژ (دعاء الافتتاح) سوننەت نییە. ئەم فەرموودەیە جۆرێکە لە تەقریری قەولی، لەبەرئەوە بڕیاری پێ دادەمەزرێ.

## ١٧٢) دەست بەرزکردنەوە لە نوێژدا. (٨٥٩ - ٨٦٤).
## باب: رفع اليدَيْنِ فِي الصَّلاَةِ

٢٧٢- عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عنهما) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا قَامَ لِلصَّلاَةِ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى تَكُونَا حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، ثُمَّ كَبَّرَ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، وَإِذَا رَفَعَ مِنَ الرُّكُوعِ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ وَلاَ يَفْعَلُهُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ مِنَ السُّجُودِ). {الحديث/٨٦٠. تجريد/١/٣٨٩، رقم: ٤٠٢ = ٧٣٥، ٧٣٦، ٧٣٨، ٧٣٩ فتح الباری شرح صحيح البخاری}:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ هەڵدەسا بۆ نوێژ دابەستن، لەپێشا بەرەو رووگە دەوەستاو ئەوجا هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە، هەتا پشتی هەردوو دەستی ڕێك دەگەیشتنە بەرابەر هەردوو شانیو سەرپەنجەکانی دەگەیشتنە ئاستی نەرمەی گوێکانی، ئاوا لەسەر ئەو شێوەیە رووی هەردوو لەپەکانی بەرەو رووگە بوو، ئەوجا بە ئەڵڵاهو ئەکبەر نوێژی دادەبەست. وەکاتێ دەیویست کە بچێت بۆ چەمینەوە، دیسان بەو چەشنە دەستەکانی بەرز دەکردەوەو ئەڵڵاهو ئەکبەری دەکردو دەچەمایەوە. کاتێ لە چەمینەوە هەڵ دەسایەوە دەیفەرموو: (سَمِعَ اللّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) دیسان لەم کاتەیشدا هەردوو دەستی بەهەمان چەشن بەرز دەکردەوە، هەتا ئاستی هەردوو سەر شانەکانی، ئەوجا دەیفەرموو: (رَبَّنَا وَلَكَ الحَمْدُ). بەڵام کاتێ کوڕنووشی دەبردو کاتێ سەری لە کوڕنووش هەڵ دەبڕی ئەڵڵاهو ئەکبەری دەکرد، بەڵام دەستی بەرز نەدەکردەوە). {تاج/١/٢٥٥، زنجیرە: ٧٣ چاپی یەکەم. ژمارە: ٤٨٦ – ش/د/ت/ن}.

**١٧٣) بەچی دەست بە نوێژ دەكرێ‌و بەچی كۆتایی پێ دێت.** (١١٠٥ - ١١١٠).
**باب: ما يُفْتَتَحُ بِهِ الصَّلاةُ وَيُخْتَمُ**

**٢٧٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عنها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَسْتَفْتِحُ الصَّلاَةَ بِالتَّكْبِيرِ، وَالْقِرَاءَةَ بِالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، وَكَانَ إِذَا رَكَعَ لَمْ يُشْخِصْ رَأْسَهُ وَلَمْ يُصَوِّبْهُ، وَلَكِنْ بَيْنَ ذَلِكَ، وَكَانَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ لَمْ يَسْجُدْ حَتَّى يَسْتَوِيَ قَائِمًا، وَكَانَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ السَّجْدَةِ لَمْ يَسْجُدْ حَتَّى يَسْتَوِيَ جَالِسًا، وَكَانَ يَقُولُ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ التَّحِيَّةَ، وَكَانَ يَفْرِشُ رِجْلَهُ الْيُسْرَى، وَيَنْصِبُ رِجْلَهُ الْيُمْنَى، وَكَانَ يَنْهَى عَنْ عُقْبَةِ الشَّيْطَانِ، وَيَنْهَى أَنْ يَفْتَرِشَ الرَّجُلُ ذِرَاعَيْهِ افْتِرَاشَ السَّبُعِ، وَكَانَ يَخْتِمُ الصَّلاَةَ بِالتَّسْلِيمِ).**
{الحديث/١١١٠}:

**عائیشە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: هەمیشە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **نوێژی بە ئـەڵلاهو ئەكبـەر دادەبەسـت، وە قورئـان خوێنـدنی بـە سـوورەتی (الحمـد لله رَبِّ العَالَمِينَ)ە دەست پێ دەكرد، لە چەمینەوەشا نە سەری قیت‌و رەپ دەگـرت‌و نـەملی شۆڕ دەكردەوە، بەڵام سەرو مل‌و پشتی خۆی ڕێـك دەگرت لەیەك ئاست وەك دووخ، وە هەمیشە كە سەری لە چەمینەوە هەڵ دەبڕی، ڕێـك رادەوەستایەوەو پشتی خۆی بە تەواوی راست دەكردەوە، ئەوجا دادەنەوی بۆ كوڕنووش، وە هـەروەها كـە سـەری بەرز دەكردەوە لـە كوڕنووشـی یەكـەم قـنج دادەنیشـت، ئەوسـا كوڕنووشـی دووەمـی دەبرد، وە لەهەموو دوو ركاتێـكیشدا، لە كۆتایی ركاتی دووەمدا تەحیاتی دەخوێند، هەمیشە كەدایش دەنیشت بۆ تەحیات خوێندن‌و بۆ وچانی نێـوانی دوو كوڕنـووش، پێی چەپی رادەخست‌و پێی راستی هەڵ دەناو لەسەریان دادەنیشت.**

**پێغەمبـەر** (دروودی خـودای لەسـەر بێ) **جڵـەوگیریی (نـەهی) دەكـرد لـە قنگـەڵتس لـە تەحیاتا، كە ئەوەیە لەسەر قنگ چیچكە بكاو هەردوو دەستی لەسـەر زەوی دابنـێ! وە هەروەها جڵەوگیریی دەكرد لە راخستنی بـاڵ لەسـەر زەوی لـەناو كوڕنووشا، لـە چەشـنی راكشـانی دڕنـدە لەسـەردەم، وە بـەردەوام كۆتـایی بـە نوێـژ دەهێنـا بـە سـلاّودانەوە بـەلای راسـت‌و بـەلای چـەپا).** {تـاج/١، لاپـەڕە: ٢٨٢، زنجـیرە: ٨٩، چاپی/١/٥٤٧}.

## ١٧٤) ئەڵڵاهو ئەكبەر كردن لەناو نوێژدا. (٨٦٥ - ٨٧١).

## باب: التكبير في الصَّلاة

٢٧٤- عَنْ أبي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قال: كَانَ رَسُولُ اللّه (صَلَّى اللّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ) إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ يُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْكَعُ، ثُمَّ يَقُولُ: سَمِعَ اللّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ حِينَ يَرْفَعُ صُلْبَهُ مِنَ الرُّكُوعِ، ثُمَّ يَقُولُ وَهُوَ قَائِمٌ: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَهْوِي سَاجِدًا، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَسْجُدُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ، ثُمَّ يَفْعَلُ مِثْلَ ذَلِكَ فِي الصَّلاَةِ كُلِّهَا حَتَّى يَقْضِيَهَا، وَيُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ مِنَ الْمَثْنَى بَعْدَ الْجُلُوسِ. ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: إِنِّي لأَشْبَهُكُمْ صَلاَةً بِرَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). {الحديث/٨٦٦. تجريد/١/٤٠٨، رقم: ٤٢٧ = ٧٨٩، ٧٨٥ فتح}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، کاتێ هەڵ دەستا بۆ نوێژ، رووەو رووگەی پیرۆز رادەوەستاو، ئەوجا لەپێش هەموو شتێکا بە ئەڵڵاهو ئەکبەری نوێژ دابەستن، نوێژی دادەبەست، کە دەچووش بۆ چەمینەوە ئەڵڵاهو ئەکبەری دەکرد، کاتێ لە چەمینەوەیش پشتی هەڵ دەبڕی دەیفەرموو: (سَمِعَ اللّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ: هەرکەسێ سوپاسی خودا بکا، خودا سوپاسەکەی قەبووڵ دەکا). ئینجا کە رێك رادەوەستا دەیفەرموو: (رَبَّنا وَلَكَ الحمدُ: ئەی پەروەردگارمان! سوپاس هەر بۆ تۆیە).

ئەوجا کە دائەنەوی بۆ کوڕنووش، لەوکاتەدا دەیفەرموو: ئەڵڵاهو ئەکبەر، کاتێکیش کە سەری لە کوڕنووش هەڵدەبڕی دیسان ئەڵڵاهو ئەکبەری دەکرد، دیسان کە دادەنەوی بۆ کوڕنووشی دووەم ئەڵڵاهو ئەکبەری دەکرد، دیسان کە سەری لە کوڕنووشی دووەم هەڵ دەبڕی دەیفەرموو: ئەڵڵاهو ئەکبەر. ئیتر لەهەموو رکاتێکا ئاوای دەکرد، هەتا نوێژەکەی تەواو دەکرد، لەپاش دانیشتنی تەحیاتی یەکەمیش کە لە رکاتی دووەمدا دەخوێندرێ، کە هەڵ دەسایەوە بۆ رکاتی سێیەم ئەڵڵاهو ئەکبەری دەکرد.

ئەوجا ئەبو هورەیرە فەرمووی: (من لە هەمووتان زیاتر هەوڵ دەدەم کە نوێژەکەم لە نوێژی پێغەمبەر بچێت، هەتا کار بەو فەرموودەیەی پێغەمبەر بکەن

كە دەفەرموێ: صَلّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِي: وەك خۆم نوێژ بكەن، كە دەمبينن لەبەر چاوتان نوێژ دەكەم!).

**روونكردنەوە:**

١. ئەم فەرموودەيە بەڵگەيە لەسەر ئەوە كە تەكبير كردنو ئەم زيكرانەی تر، دەبێ هاوكات بن لەگەڵ ئەم جمو جووڵانەداو درێژ بكرێنەوە لەگەڵيانا، لەسەرەتايانەوە تا كۆتايان. بۆ نموونە كاتێ دەست دەكا بە دانەوين بۆ روكووع ئەڵلاهو ئەكبەر دەكاو درێژی دەكاتەوە، هەتا دەگاتە حەددی روكووع، ئەوجا ويردی ناو روكووع دەخوێنێ، ئەوجا لەكاتی سەرەتای بەرزەوە بوونا، لە روكووع دەڵێ: (سمع الله لمن حمده) وە درێژی دەكاتەوە، هەتا رێك رادەوەستێ، ئەوجا بەراوەستانەوە ويردی ئيعتيدال دەخوێنێ، كەلای كەمەكەی ئەمەيە: (رَبَّنَا لَكَ الحمدُ). ئيتر هەموو ئەڵلاهو ئەكبەرەكانی تريش لەسەرەتای شوێنەكەيانەوە دەست پێ دەكاو درێژی دەكاتەوە تا كۆتايی شوێنەكەيان.

٢. أ- هەموو نوێژێكی دوو ركاتی، يازدە ئەڵلاهو ئەكبەری واتيادا، كە ئەڵلاهو ئەكبەری نوێژ دابەستنو هەر ركاتەی پێنج ئەڵلاهو ئەكبەر.

ب- هەموو نوێژێكی سێ ركاتی حەڤدە ئەڵلاهو ئەكبەری واتيا كە ئەڵلاهو ئەكبەری نوێژ دابەستنو ئەڵلاهو ئەكبەری هەستانەوە لە تەحياتی يەكەمو هەر ركاتەی پێنج تەكبيرە.

ج- نوێژی چوار ركاتی بيستو دوو ئەڵلاهو ئەكبەری واتيادا.

د- لە پێنج فەرزەكەدا، نەوەدو چوار ئەڵلاهو ئەكبەری واتيادا.

هـ- لەيەك ركاتەكەی وەتريشا شەشی واتيادا.

ز- ئەم ئەڵلاهو ئەكبەرانە هەموويان سوننەتن، جگە لە ئەڵلاهو ئەكبەری نوێژ دابەستن، ئەو فەرزو پێويستە.

٣. دانيشتنەكانی ناو نوێژ، كە لە زاراوی شەرعی پيرۆزدا پێيان دەگوترێ (جەلەساتی نوێژ) چوارن:

أ- دانیشتن لەنێوانی دوو کوڕنووشدا.

ب- دانیشتنی وچان (جەلسەی ئیستراحە) کەوا لەکۆتایی رکاتا، کە تەحیاتی تیادا نەبێ، وە لەپاش تەواو بوونی کوڕنووشی دووەم، نوێژکەر لە رکاتی یەکەمو لە رکاتی سێیەمدا، کەمێ دادەنیشێتو ئەوسا هەڵ دەستێ بۆ رکاتی دووەم، یا بۆ رکاتی چوارەم.

ج- دانیشتنی تەحیاتی یەکەم، لە نوێژی سێ رکاتیو چوار رکاتیدا، یا دانیشتنی تەحیاتی دووەم، یا سێیەم، یا چوارەم لە هەندێ کاتی تایبەتیدا، وەك ئەوە پاش نوێژ دواکەوتووبێ.

د- دانیشتنی تەحیاتی کۆتایی، بەمەرجێ کوڕنووشی هەڵەی تیادا نەبێ. وا سوننەتە ئەم دانیشتنانە هەموو لەسەر شێوەی إفتراش بن، تەنیا دانیشتنی کۆتا تەحیات نەبێ، کە سوننەتە لەسەر شێوەی تورّك بێ، وەك تەحیاتی نوێژی بەیانیو تەحیاتی کۆتایی نوێژە فەرزەکانی تر، یا دواترین تەحیات لە نوێژی سوننەتدا. تەحیاتی کۆتاییش ئەگەر کوڕنووشی هەڵەی تیا برد، تەنیا لەنێوانی کوڕنووشەکەو سلاو دانەوەدا تورّك دەکا.

**١٧٥) پیشگیریی لەوە کە پاشنوێژ لە ئەڵلاهو ئەکبەر کردنو ئەمانەدا، پێش پێشنوێژ بکەوێ.** (٩٢٠ - ٩٣٤). **باب: النهي عن مُبادرَةِ الإمامِ بِالتكبيرِ وغَيْرِه**

٢٧٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُعَلِّمُنَا، يَقُولُ: «لاَ تُبَادِرُوا الإِمَامَ، إِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا قَالَ: (وَلاَ الضَّالِّينَ) فَقُولُوا: آمِينَ، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا قَالَ: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) فَقُولُوا: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ)». {الحديث/٩٣١}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فێری کاروباری ئاپینی ئیسلامی دەکردین، دەیفەرموو: (لە گوتارو کردارەکانی نوێژدا دەست پێشکەری لە پێش نوێژ مەکەنو، نە بەکردارو نە بەگوتار، پێش مەلای پێش نوێژ مەکەون، کاتێ ئیمام دەڵێ: ئەڵلاهو ئەکبەر ئێوەیش بڵێن: ئەڵلاهو ئەکبەر، کە گوتی:

(وَلاَ الضَّالِّين) ئێوەیش بڵێن: (آمین) کە ئەو چوو بۆ چەمینەوە، ئێوەیش بچن بۆ چەمینەوە، کە ئەو گوتی: (سَمِعَ اللّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) ئێوەیش بڵێن: (رَبَّنَا لَكَ الحَمْدُ).

## ١٧٦) دەبێ پاش نوێژ پەیڕەوی پێش نوێژ بکا. (٩٢٠ - ٩٣٤).

## باب: إئْتِمامُ المَأمُومِ بالإمَامِ

٢٧٦- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَقَطَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ فَرَسٍ فَجُحِشَ شِقُّهُ الأَيْمَنُ، فَدَخَلْنَا عَلَيْهِ نَعُودُهُ، فَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ، فَصَلَّى بِنَا قَاعِدًا فَصَلَّيْنَا وَرَاءَهُ قُعُودًا، فَلَمَّا قَضَى الصَّلاَةَ قَالَ: إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا، وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا، وَإِذَا قَالَ: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) فَقُولُوا: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ) وَإِذَا صَلَّى قَاعِدًا فَصَلُّوا قُعُودًا أَجْمَعِينَ». {الحديث/٩٢٠. بخارى: ٨٠٥}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە وڵاخێکی بەرزە بەرەوە بوو، لای ڕاستی ڕووشا، بەم بۆنەیەوە چووین بۆ سەردانی، بۆ هەواڵپرسی، لە خزمەتیدا ماینەوە هەتا نوێژ بوو، جا بە دانیشتنەوە بەرنوێژییەکەی بۆمان کرد، ئێمەیش لە پشتیەوە، بەدانیشتنەوە بە جەماعەت نوێژمان کرد، کاتێ بەر نوێژییەکەی بۆمان تەواو کرد، فەرمووی: (بەرنوێژ (ئیمام) بۆ ئەوە کراوە بە بەرنوێژ کە پەیڕەوی بکرێو، چاوی لێ بکرێ، جا کە ئەو گوتی ئەللاهو ئەکبەر، ئێوەیش بڵێن ئەللاهو ئەکبەر، هەتا ئەو نەڵێ ئەللاهو ئەکبەر، ئێوە مەڵێن ئەللاهو ئەکبەر، کە ئەو کوڕنووشی برد ئێوەیش کوڕنووش بەرن، وە هەتا ئەو کوڕنووش نەبا ئێوە کوڕنووش مەبەن، ئەگەر ئەو سەری بەرزکردەوە لە چەمینەوە، یا لە کوڕنووش ئێوەیش دوا بەدوای ئەو سەر بەرزبکەنەوە، کاتێ دەڵێ: (سَمِعَ اللّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) ئێوە بڵێن: (رَبَّنَا وَلَكَ الحَمْدُ) وە کاتێ پێش نوێژ لەبەر هۆیەکی ڕەوا، وەك نەخۆشیو شتی وا، بە دانیشتنەوە نوێژی کرد، ئێوەیش چاو لەو بکەنو ئەو بکەن بەسەر مەشقو بە دانیشتنەوە جەماعەتەکەتان بکەن، هەمووتان وەك ئەو بکەن). {تاج/١، لاپەڕە: ٣٨١، زنجیرە: ١٣٠، چاپی/١، ژمارە: ٧٧٧/١ و ٧٧٨/٢ و ٧٧٩/٣}.

**روونكردنەوە:**

١-بەپێی ئەم فەرموودەیەو چەند فەرموودەیەكی تری ساخ، كۆمەڵێ بڕیاری فیقهی دەردەكەون، وەك پەیڕەویی پاش نوێژ بۆ پێش نوێژ لە تەكبیرو هەڵسانو وەستانو دانیشتنو چەمینەوەو كوڕنووشا، هەروا لە سلاّودانەوەدا، لەدوو شتا ئەگەر پاش نوێژ لە پێش نوێژ پێش بكەوێ، نوێژەكەی پووچو بەتاڵە، لە ئەللّاهو ئەكبەری نوێژ دابەستنو لە سلاّودانەوەدا، لەوانی تردا ئەگەر پێشی بكەوێ كاری نابەجای كردووە، وەلێ نوێژەكەی دروستە.

٢-دوا كاری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتە سەر ئەوە، ئەگەر پێش نوێژ بە دانیشتنەوە نوێژی كرد، پاش نوێژ بە پێوە نوێژ بكا، جەماوەری زانایان دەفەرموون: لە نوێژی فەرزا، چی بۆ پێش نوێژ، چی بۆ پاش نوێژ، چی بە تەنیا، چی لە جەماعەتا، بۆ كەسێ بتوانێ بە پێوە نوێژ بكا، دروست نییە كە لەكاتی قیامو راوەستانا بە دانیشتنەوە نوێژ بكا. بەلاّم بۆ نوێژی سوننەت نوێژكەر ئاغای خۆیەتی، چۆن حەز دەكا بۆی هەیە ئاوا نوێژ بكا. كۆمەڵێ زانا دەفەرموون: (توانا ئەگەر بە دانیشتنەوە نوێژی سوننەت بكا، نیوەی خێری راوەستاوی هەیە).

### ١٧٧) چۆنێتیی دانانی دەست لەسەر دەست لەناو نوێژدا. (٨٩٤ - ٩٠٥).

### باب: وَضع اليدين إحداهما على الأخرى في الصّلاة

٢٧٧- عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ): أَنَّهُ رَأى النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَفَعَ يَدَيْهِ حِينَ دَخَلَ فِي الصَّلَاةِ كَبَّرَ (وَصفَ هَمَّامٌ حِيالَ أُذُنَيْهِ) ثُمَّ الْتَحَفَ بِثَوْبِهِ، ثُمَّ وَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى، فَلَمَّا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ أَخْرَجَ يَدَيْهِ مِنَ الثَّوْبِ ثُمَّ رَفَعَهُمَا، ثُمَّ كَبَّرَ فَرَكَعَ، فَلَمَّا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَفَعَ يَدَيْهِ، فَلَمَّا سَجَدَ سَجَدَ بَيْنَ كَفَّيْهِ). {الحديث/٨٩٤}:

وائیلی كوڕی حوجر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دیوە، كە نوێژی دادەبەست، هەردوو دەستەكانی خۆی هەتا ئاستی هەردوو نەرمەی گوێكانی بەرز دەكردنەوەو ئەوجا بە وشەی (الله اكبر) نوێژی دادەبەست، ئەوجا جلەكەیی

دەپێچا بەخۆیەوە، ئەوجا لەسەر سینگی دەستی دەگرتو دەستی راستی لەسەر دەستی چەپی خۆی دادەنا، وە کاتێ کە دەیویست کە چەمینەوە ئەنجام بدا، دەستەکانی خۆی لە جلەکانی دەردەهێناو ئەوسا بەرزی دەکردنەوەو ئەوجا ئەڵلاهو ئەکبەری دەکردو روکووعی دەبرد، کاتێکیش لە چەمینەوە بەرز دەبۆوە دەیفەرموو: (سَمِعَ اللّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) وە هەردوو دەستیشی بەرز دەکردەوە، کە کوڕنووشیشی دەبرد، هەردوو لەپەکانی لەسەر زەوی دادەناو ئەوجا لەنێوانیانا کوڕنووشی دەبرد لەسەر جێگە نوێژەکەی).

**روونکردنەوە:**

وائیلی کوڕی حوجر هاوەڵێکی مەزنی پێغەمبەرە، لە قەیلەکانی حەضرەمەوتە، لەنێوانی سعودییەو یەمەنو عەدەنو دەریای عوماندایە، قەیل بە شایەك دەگوترێ کە پایەی لەخوار پایەی شاهەنشاوەبێ، هەروا حوجری باوکی لە پاشایانی حەزرەمەوت بووە، وائیل بە خواستی خۆی هات بۆ مەدینەو موسوڵمان بوو، دەڵێن: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر شێوەی موعجیزە، موژدەی ئەمەی لە پێشادا بەهاوەڵەکانیو پێی فەرموون: (وا وائیلی کوڕی حوجر، لە حەضرەمەوتەوە، لەو وڵاتە دوورەوە دێ بۆ لاتان، بەخۆشی خۆی دێ، کەس بەزۆر نەیهێناوە، بەڵکوو لەبەرئەوە دێ چونکە حەزی لە دۆستایەتی خوداو پێغەمبەری خودایە).

جا کاتێ وائیل گەیشتەجێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێشوازییەکی گەرمی لێ کردو نزیکی کردەوە لەخۆیو عاباکەی خۆی بۆ راخستو خۆیو ئەو دوو بەدوو لەسەری دانیشتنو وائیلی لە جێگەی دانیشتنی خۆیدا دانیشاندو فەرمووی: (خودایە! وائیلو نەوەی وائیلو نەوەی نەوەی وائیل پیرۆزو پیتداربکە).

ئەوجا کردی بە کارگێڕی خۆی لەسەر قەیلەکانی وڵاتی حەضرەمەوت، وە موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیانی لەگەڵا ناردەوە بۆ وڵاتی خۆی، موعاوییە لەڕێ پیادە بوو، بەڵام حوجر بە سواری وشترە مێیەکی خۆی بوو، موعاوییە لەڕێ سکاڵای حاڵی خۆی لەلای حوجر کردو پێی گوت: گەرمای چەوو لی رێگەکە زۆری

بۆ هێناوم، حوجریش پێی گوت: لە سێبەری وشترەکەوە بڕۆ، سێبەرەکە بکە بە پێڵاو بۆ خۆت، موعاوییە گوتی: ئەوە دادم نادا، بریا لە پاشکۆی خۆتەوە جێت دەکردمەوە! حوجر پێی گوت: دە وسبە، لەکوێ تۆ شایانی ئەوەیت کە ببی بە پاشکۆی پاشایان، وائیل ما هەتا موعاوییە بوو بە جێنشین، وائیل چوو بۆلای، موعاوییە ناسییەوەو بەخێرهاتنێکی شایانی لێ کردو ئەمەی وەبیر هێنایەوەو ویستی خەڵاتی پێ بدا، وەری نەگرت، گوتی: من داراو دەوڵەمەندم، بیدە بە کەسێ کە کاری پێی هەبێ، بەڵام گوتی: خۆزگەم کاتی خۆی لەبەردەم خۆمەوە سوارم دەکردی. وائیل لە ئەفرادی صەحیحی موسلیمە لە صەحیحی بوخاریدا فەرموودەی نییە. لەکاتی جێنشینی موعاویەدا بە مەرگی خودا مردووە.

## ١٧٨) گوتەی نێوانی ئەڵڵاهو ئەکبەری نوێژ دابەستنو خوێندنی سوورەتی فاتیحە (١٧٨٥ - ١٨١٠). {باب: ما يُقالُ بَيْنَ التكبيرِ والقراءَة}

٢٧٨- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَنَّهُ كَانَ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ قَالَ: « وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ، إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ، وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ، اللَّهُمَّ أَنْتَ الْمَلِكُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَنْتَ رَبِّي، وَأَنَا عَبْدُكَ، ظَلَمْتُ نَفْسِي وَاعْتَرَفْتُ بِذَنْبِي، فَاغْفِرْ لِي ذُنُوبِي جَمِيعًا، إِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ، وَاهْدِنِي لأَحْسَنِ الأَخْلاَقِ، لاَ يَهْدِي لأَحْسَنِهَا إِلاَّ أَنْتَ، وَاصْرِفْ عَنِّي سَيِّئَهَا، لاَ يَصْرِفُ عَنِّي سَيِّئَهَا إِلاَّ أَنْتَ، لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ كُلُّهُ فِي يَدَيْكَ، وَالشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْكَ، أَنَا بِكَ وَإِلَيْكَ، تَبَارَكْتَ وَتَعَالَيْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ».

وَإِذَا رَكَعَ قَالَ: « اللَّهُمَّ لَكَ رَكَعْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ وَلَكَ أَسْلَمْتُ، خَشَعَ لَكَ سَمْعِي وَبَصَرِي، وَمُخِّي، وَعَظْمِي، وَعَصَبِي».

وَإِذَا رَفَعَ قَالَ: « اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ، مِلْءَ السَّمَوَاتِ وَمِلْءَ الأَرْضِ وَمِلْءَ مَا بَيْنَهُمَا، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ».

وَإِذَا سَجَدَ قَالَ: « اللَّهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ وَلَكَ أَسْلَمْتُ، سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ، وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ، تَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ».

ثُمَّ يَكُونُ مِنْ آخِرِ مَا يَقُولُ بَيْنَ التَّشَهُّدِ وَالتَّسْلِيمِ: « اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِى مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ، وَمَا أَعْلَنْتُ، وَمَا أَسْرَفْتُ، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّى، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ». {الحديث/١٨٠٩} :

وَفِي رِوَايَةٍ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا اسْتَفْتَحَ الصَّلاَةَ كَبَّرَ ثُمَّ قَالَ: «وَجَّهْتُ وَجْهِى». وَقَالَ: « وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ». وَقَالَ: وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ قَالَ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ». وَقَالَ: « وَصَوَّرَهُ فَأَحْسَنَ صُورَهُ ». وَقَالَ: وَإِذَا سَلَّمَ قَالَ: « اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِى مَا قَدَّمْتُ ». إِلَى آخِرِ الْحَدِيثِ، وَلَمْ يَقُلْ: بَيْنَ التَّشَهُّدِ وَالتَّسْلِيمِ. {الحديث/١٨١٠} :

**عەلی كوڕی ئەبو تالیب** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **وابوو، كە هەڵ دەسا بۆ نوێژ، لە پێشا ئەڵلاهو ئەكبەری نوێژ دابەستنی دەكرد، ئینجا یەكسەر دەیفەرموو:** (وَجَّهْتُ وَجْهِىَ لِلَّذِى فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ إِنَّ صَلاَتِى وَنُسُكِى وَمَحْيَاىَ وَمَمَاتِى لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ اللَّهُمَّ أَنْتَ الْمَلِكُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ. أَنْتَ رَبِّى وَأَنَا عَبْدُكَ ظَلَمْتُ نَفْسِى وَاعْتَرَفْتُ بِذَنْبِى فَاغْفِرْ لِى ذُنُوبِى جَمِيعًا إِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ وَاهْدِنِى لأَحْسَنِ الأَخْلاَقِ لاَ يَهْدِى لأَحْسَنِهَا إِلاَّ أَنْتَ وَاصْرِفْ عَنِّى سَيِّئَهَا لاَ يَصْرِفُ عَنِّى سَيِّئَهَا إِلاَّ أَنْتَ لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ وَالْخَيْرُ كُلُّهُ فِى يَدَيْكَ وَالشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْكَ أَنَا بِكَ وَإِلَيْكَ تَبَارَكْتَ وَتَعَالَيْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ).

**بە دڵێكی پاكو بێ گەردەوە، ڕوو دەكەمە ئەو خودایە كە ئەم ئاسمانانەو زەمینەی لە نەبوون دروست كردووە، من موسوڵمانێكی پاكو بێ خەوشمو بە هیچ جۆرێ لە دەستەی هاوبەش پەیداكەران نیم، بێ گومان نوێژو ئادابی حەجو خوا پەرستیمو ژیانمو مردنم، هەمووی هەر بۆ خودایە، كە پەروەردگاری هەموو جیهانە، كە هیچ هاوبەشو هاوڕێیەكی بۆ نییە، وە بەمە فەرمانم پێ كراوە، وەمن یەكێكم لە موسوڵمانانو یەكێكم لە فەرمانبەرانی خودا، ئەی خودایە! پادشای ڕاستو ڕاستەقینە هەر تۆی، لەتۆ بەولاوە خودای تر نییە، تۆ خودای منیت، منیش بەندەی تۆم، زۆرو ستەمم لەخۆم كردووەو، پێ لە تاوانی خۆم دەنێم، دەی**

تۆیش بـه گـەورەییو مەرحەمـەتو سۆزو میهرەبانی خۆت، لەهـەموو تاوانـەکانم خۆش بە، پەروەردگاری من! فێری ڕەوشتی بەرزو خوی شیرینم بفـەرموو، چونکه ئەوە هەر لەتۆ دەوەشێتەوە، وە لام بدە لە خووی خراپو لە ڕەفتاری بـەد، چونکه ئەوە هەر بەتۆ دەکرێ، من هەمیشە گوێ لـە مشتی تـۆمو ئامـادەم بـۆ جێبـەجێ کردنی فـەرمانی تـۆ، خێـرو خۆشـیو چاکە هـەمووی بـە دەسـتی تۆیـە، شـەڕ لـەتۆ ناوەشێتەوە، من لە بنەڕەتەوە بەتۆ بەندمو لە سایەی تـۆوە هـەم، وە پشـتو پـەنام هەر تۆیو سەرەنجام هەردێمەوە بەردەستی خۆت!

بەڕاستی ئەی پەروەردگارم! تۆ خودایـەکی بـە فـەڕو پیرۆزو گـەورەو بـەرزیت، داوای لێخۆشـبوونت لێ دەکـەمو پەشـیمانمو تەوبـە دەکـەمو دەگەڕێمـەوە بـە کۆڵـێ پەشیمانییەوە بۆلای تۆ). {تاج/١، لاپەڕە: ٢٥٩، زنجیرە: ٧٤، چاپی/١، ژمارە: ٤٩٤/٣}.

کاتێـکیش دەچەمییەوە، واتە: ڕوکووعی دەبرد، دەیفەرموو: ( اللَّهُمَّ لَـك رَكَعْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَلَـك أَسْلَمْتُ خَشَعَ لَــك سَـمْعِي وَبَصَـرِي وَمُخِّـي وَعَظْمِـي وَعَصَـبِي: خودایـە! سەری بەنـدەیی بـۆ گـەورەیی تـۆ دادەنـەوێنمو ئـەم ڕوکووعو چـەمینەوەیەم هـەر لەبەر خاتری تۆیە، وە باوەڕم بەتۆ هەیە، وە ملکەچی فـەرمانی تـۆمو خـۆم سپارد بەتۆ، خودایە! گوێم، چاوم، مۆخم، ئێسکم، ڕەگو ریشەم، گشتی سـەرکزو ملکەچـن بۆ فەرمانی تۆ). {تاج/١، لاپەڕە: ٢٧٢، زنجیرە: ٨٣، چاپی/١، ژمارە: ٥١٩/٣}.

کاتێـکیش سەری بەرز دەکردەوە لـە چـەمینەوە دەیفـەرموو: ( اللَّهُمَّ رَبَّنَـا لَـك الْحَمْدُ مِلْءَ السَّمَوَاتِ وَمِلْءَ الأَرْضِ وَمِلْءَ مَا بَيْنَهُمَا وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ: ئـەی خـودای مـن! ئـەی پـەروەردگارم! سوپاسێـکی زۆری بـێ شـومار بـۆ تـۆ، پـڕ بـە ئاسمانەکانو پڕ بە زەوی، پڕ بە نێوانی ئەم دوانە، سەرەڕای ئەمانەیش پـڕ بەهـەر شتێـکی تریش سوپاس بۆ تۆ بێ، کە حەزی تۆی لەسەر بێ). {تـاج/١، لاپـەڕە: ٢٧٤، زنجیرە: ٨٤، چاپی/١، ژمارە: ٥٢٦/٤}.

کاتێـکیش کوڕنووشـی دەبـرد، لەپـەو ڕوو دەکـەوتو دەیفـەرموو: « اللَّهُمَّ لَـك سَجَدْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَلَـك أَسْلَمْتُ سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَـرَهُ تَبَـارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ: ئەی خودایە! تەوێڵی بەندەیی بۆ تۆ دەنێمە سـەر زەوی، بـڕوام

هێناوه بەتۆ، بڕوایەکی وا کە ئارامیو دڵنیایی بۆ مسۆگەر کردووم، خۆم سپارد بە تۆو ملکەچی فەرمانی تۆم، روخسارم دەنێمە سەر خاكو کوڕنووشی بەندەیی دەبەم بۆ ئەو خودایە کە ئەم روخسارەی منی دروست کردووەو شەقڵو نەخشەو وێنەی کێشاوەو، گوێچکەو چاوی پێوە دا تەراشیوەو داقەڵەشاندووە، دیارە کە یەزدانی مەزن خودایەکی پاكو پیرۆزو گەورەیەو، جوانترین دروستکارو کردگارە!). {تاج/١، لاپەڕە: ٢٧٧، زنجیرە: ٨٥، ژمارە: ٥٣٢/٥}.

دواترین شتیش کە دەیفەرموو، لەنێوانی تەحیاتو سڵاو دانەوەدا ئەمە بوو: (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ وَمَا أَسْرَفْتُ وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ أَنْتَ: ئەی خودایە! لێم خۆش بە، لە گوناهی بەرودوامو لە گوناهی ئاشکراو نهێنیمو، لەو تاوانە زۆرانەی کە لەخۆمم کردووەو لە رادەبەدەر کردوومن، لەو گوناهانەیش کەتۆ لە خۆم باشتر ئاگات لێیانەو دەیانزانی، پەروەردگارا! پێشخەرو پاشخەر هەر خۆتیو پێشخستنو پاشخستن، لە پایەو پلەداو لەهەموو شتێکا بە دەستی تۆیە، خودایەکی تر نییە تۆ نەبێ!). {تاج/١، لاپەڕە: ٢٩١، زنجیرە: ٩٣، ژمارە: ٥٦٧/٣}.

لە گێڕانەوەی ژمارە: ١٨١٠، شەرحی صەحیحی موسلیم تەحقیقی مامۆستا (الشیخ خلیل مأمون شیحا) ئاوایە:

دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، بە ئەڵڵاهو ئەکبەری نوێژ دابەستن دەستی دەکرد بە نوێژ، ئەوجا یەکسەر دەیفەرموو: (وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ) بەڵام لەم گێڕانەوەدا ئاوایە: (وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ: وە من یەکەم موسوڵمانم لەم ئۆمەتی ئیسلامە، کە ئۆمەتی خۆمە). وە کاتێکیش لە چەمینەوە سەری بەرزەوە دەکرد، دەیفەرموو: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ مِلْءَ السَّمَوَاتِ وَمِلْءَ الأَرْضِينَ وَمَا بَيْنَهُمَا وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ. اللَّهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَلَكَ أَسْلَمْتُ سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ)، دەیفەرموو: (...لِلَّذِي خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ فَأَحْسَنَ صُورَهُ: بۆ ئەو خودایە کە

ئەم روخسارەی منی دروست کردووەو شەقڵو وێنەی زۆر بەجوانی کێشاوە...).
عەلی فەرمووی: (کاتێکیش دەیویست کە سلاو بداتەوە دەیفەرموو: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِى مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ وَمَا أَسْرَفْتُ وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّى أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ)، عەلی لەم گێڕانەوەدا نالێ: (بَيْنَ التَّشَهُّدِ وَالتَّسْلِيمِ) واتە: لەباتی ئەم رستەیە ئەم رستەیەی تربوو: (وَإِذَا سَلَّمَ مِنَ الصَّلاَةِ قَالَ « اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِى مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ وَمَا أَسْرَفْتُ وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّى أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ).

**١٧٩) خوێندنی (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) بە دەنگی نزم.** (٨٨٨ - ٨٩٠).

**باب: ترك الجهر ببسم الله الرحمن الرحيم**

٢٧٩- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَبِى بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ، فَلَمْ أَسْمَعْ أَحَدًا مِنْهُمْ يَقْرَأُ (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ).
{الحديث/٨٨٨. بخاري: ٤٧٣} :

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەپشتی پێغەمبەرو ئەبوبەکرو عومەرو عوثمانەوە، نوێژی زۆرم بە جەماعەت (بە کۆمەڵ) کردووە، لێم نەبیستوون کە لەپێش سوورەتی فاتیحەوە (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) بخوێنن.

**١٨٠) بەڵگەی ئەوە کە (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) یەکەم ئایەتە لە سەرەتای هەموو سوورەتێکەوە.** (٨٩١ - ٨٩٢).

**باب: في بسم الله الرحمن الرحيم**

٢٨٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَيْنَما رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَاتَ يَوْمٍ بَيْنَ أَظْهُرِنَا، إِذْ أَغْفَى إِغْفَاءَةً، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ مُتَبَسِّمًا، فَقُلْنَا: مَا أَضْحَكَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: أُنْزِلَتْ عَلَىَّ آنِفًا سُورَةٌ، فَقَرَأَ: « بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ، فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ، إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الأَبْتَرُ». ثُمَّ قَالَ: أَتَدْرُونَ مَا الْكَوْثَرُ؟». فَقُلْنَا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: « فَإِنَّهُ نَهْرٌ وَعَدَنِيهِ رَبِّى عَزَّ وَجَلَّ، عَلَيْهِ خَيْرٌ كَثِيرٌ، وَهُوَ حَوْضٌ تَرِدُ

عَلَيْهِ أُمَّتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ، آنِيَتُهُ عَدَدُ النُّجُومِ، فَيُخْتَلَجُ الْعَبْدُ مِنْهُمْ، فَأَقُولُ: رَبِّ إِنَّهُ مِنْ أُمَّتِي، فَيَقُولُ: مَا تَدْرِي مَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ». {الحديث/٨٩٢}:

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەناو مزگەوتا، کۆمەڵێ لە یاران بووین دانیشتبووین، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ناومانا دانیشتبوو، لەپڕ سەر خەوێکی شکان، ئەوجا سەری هەڵبڕی‌و زەردە خەنەیەکی کرد، عەرزمان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! هۆی ئەم پێکەنینەت چی بوو، بۆچی پێکەنی؟ فەرمووی: (تۆزێ لەمەوبەر سوورەتێ قورئانم بۆ هات، ئەوجا ئەو سوورەتەی کە فەرمووی ئاوا خوێندەوە بۆمان: (بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ. إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ، فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ، إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ). کاتێ لە خوێندنەکەی بۆوە فەرمووی: (ئایا دەزانن کەوا کەوثەر کەوا لەم سوورەتەدا چییە؟ ئێمەیش گوتمان: خوداو پێغەمبەر ئەوە زۆر باش دەزانن. فەرمووی: (کەوسەر چۆمێکە، وا لەناو بەهەشتا، خودای باڵا دەستو خاوەن شکۆ، گفتی خەڵاتکردنی ئەو سەرچاوەیەی بەمن داوە، خێرو بێرێکی گەلێ زۆری لەسەرە، حەوزێکی لەسەرە، لە رۆژی قیامەتدا، ئۆمەتم دەچنە سەری، بۆ نۆشکردنی ئاوەکەی، بە ژمارەی ئەستێرەی ئاسمان جام‌و پیاڵەو سوراحی لەسەرە، لەناکاو بەندەیێ لەو کەسانەی کە دێن بۆلام بۆ سەر حەوزی کەوسەر، دایدەبڕن لەوان‌و ناهێڵن بگەنە لای من‌و ناهێڵن کە بێن بۆ سەر حەوزی کەوسەر!

منیش بۆ بەرگری لەوانە دەڵێم: ئەی خودایە! خۆ ئەم جۆرە کەسانە لە ئۆمەتی منن، ئیتر بۆ رێگە نادرێن کە بێن بۆلام، بۆ سەر حەوزی کەوسەر). جا خودا دەفەرموێ: (ئەمەی تۆ دەیڵێیت وایە، بەڵام تۆ نازانی کە ئەمانە لەپاش لەدنیا دەرچوونی تۆ، چی ئاژاوەو فەرتەنەیەکیان بەرپا کردبوو!!). {تاج/١٠، لاپەڕە: ٣٨٧، تاج-٥ زنجیرە: ١٢٨، ژمارە: ٥٦٨٧/١ + بەرگی/١٠، زنجیرە: ١٢٦، ژمارە: ٥٦٧٧/٣ و ٥٦٧٨/٤}..

**روونکردنەوە:**

ئەو بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١ -(بِسْمِ اللّٰه)ی سەرەتای هەموو سوورەتێ، دادەنرێ بە ئایەتێ لە قورئان.

٢ -نووستن بە مەرجی خۆی، لەناو مزگەوتا دروستە.

٣ -دروستە داوای روونکردنەوەی هەندێ کاروبار، لە خاوەنەکەی بکرێ، وەك خێرە وا پێ دەکەنی، یا ئەوە بۆ دەگریت.

٤ -حەوزی کەوثەر حەقەو راستەو باوەڕ پێی پێویستە.

**١٨١) خوێندنی سوورەتی فاتحە، لەهەموو رکاتێکی هەموو نوێژێکا پێویستو فەرزە.** (٨٧٢ - ٨٨٤).

**باب: وُجُوبُ القراءَةِ بأمّ القرآن في الصلاة**

٢٨١- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « مَنْ صَلَّى صَلاَةً لَمْ يَقْرَأْ فِيهَا بِأُمِّ الْقُرْآنِ فَهْىَ خِدَاجٌ). ( ثَلاَثًا ) غَيْرُ تَمَامٍ ». فَقِيلَ لأَبِى هُرَيْرَةَ: إِنَّا نَكُونُ وَرَاءَ الإِمَامِ؟ فَقَالَ: اقْرَأْ بِهَا فِى نَفْسِكَ، فَإِنِّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: « قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: قَسَمْتُ الصَّلاَةَ بَيْنِى وَبَيْنَ عَبْدِى نِصْفَيْنِ، وَلِعَبْدِى مَا سَأَلَ، فَإِذَا قَالَ الْعَبْدُ: ( الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ) قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: حَمِدَنِى عَبْدِى، وَإِذَا قَالَ: (الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ) قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: أَثْنَى عَلَىَّ عَبْدِى، فَإِذَا قَالَ: (مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ) قَالَ اللَّهُ: مَجَّدَنِى عَبْدِى {وَقَالَ مَرَّةً: فَوَّضَ إِلَىَّ عَبْدِى} وَإِذَا قَالَ: (إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ). قَالَ: هَذَا بَيْنِى وَبَيْنَ عَبْدِى، وَلِعَبْدِى مَا سَأَلَ. وَإِذَا قَالَ: (اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ. صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ ) قَالَ: هَذَا لِعَبْدِى وَلِعَبْدِى مَا سَأَلَ». {الحديث/٨٧٦} :

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ هەر نوێژێ بکاو سوورەتی فاتیحای تیا نەخوێنێ، ئەوە ئەو نوێژەی نابەکامە) پێغەمبەر سێجار وشەی (ئەو نوێژەی نابەکامە)ی دووبارە کردەوە، ئەنجا فەرمووی: (وە ناتەواویشە!).

جا گوترا بە ئەبو هورەیرە: ئەی باشە، ئەگەر لەپشت پێش نوێژەوە بە جەماعەت نوێژمان دەکرد، لەم کاتەدا چۆن؟

فەرمووی: لەم کاتەدا بە پەنامەکی لە دڵی خۆتا بیخوێنە، چونکە من بۆخۆم لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (خودای گەورە لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا دەفەرموێ: من نوێژم لەنێوانی خۆم‌و بەندەما کردووە بە دوو بەشەوە {بەشی یەکەم: سوپاس‌و ستایشی خودایە، بەشی دووەم: داوای یارمەتی‌و ڕێنماییە بۆ بەندە} جا کاتێ بەندە لە فاتیحادا دەڵێ: (الحمد لله رَبِّ العامين) هەموو سوپاس‌و ستایشێ هەر بۆ خودایە، کە خاوەن‌و پەروەردگاری هەموو شتێکە لە هەردوو جیهاندا، خودای گەورەش دەفەرموێ: ئەم بەندەیەی من سوپاس‌و ستایشی من دەکا. وە کاتێ بەندە دەڵێ: (الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ) کە خودایەکی بەخشندەی میهرەبانە، خودای گەورەش دەفەرموێ: ئەم بەندەیەی من پەسنی جوان‌و مەدحی من دەکا. وەکاتێ بەندە دەڵێ: (مَالِكِ يَوْمِ الدينِ): خاوەنی ڕۆژی تۆڵەو پاداشە، کە ڕۆژی دواییە، خودای گەورەش دەفەرموێ: ئەم بەندەیەی من بە شان‌و شکۆی مندا هەڵ دەداو وەسپی گەورەیی من دەکا، جارێ ئەبو هورەیرە لەم شوێنەدا فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: خودای گەورەیش دەفەرموێ: ئەم بەندەیەی من، کاری خۆی هەواڵە کرد بەمن‌و کاروباری خۆی سپارد بەمن. حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: وەکاتێ بەندە دەڵێ: (إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ): خودایە! هەرتۆ دەپەرستین‌و بەندەیی هەر بۆ تۆ دەکەین، وە هەر لەتۆ داوای یارمەتی دەکەین، خودای گەورەش دەفەرموێ: ئەمەیان هاوبەش‌و ناوکۆییە لە بەینی من‌و ئەم بەندەیەما، وە ئەم بەندەیەم داوای هەرچیم لێ بکا، دەیدەمێ‌و بێ دڵی ناکەم، وەکاتێ بەندە دەڵێ: {اهدِنَا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ، صِرَاطَ الَّذِينَ أنعَمتَ عَلَيهِمْ غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ}:

ئەی خودایە! شارەزاییم بکە بۆسەر ڕێگەی ڕاست‌و، بۆ ڕێگەی ئەو کەسانە کەنازو نیعمەتت ڕژاندووە بەسەریاناو چاکەت لەگەڵ کردوون، وە مەمانخەرە سەر ڕێگەی ئەو کەسانە کە ڕقت لێ گرتوون‌و بەر قاری تۆ کەوتوون‌و ڕێگەی ڕاستیان ون کردووە. خودای گەورەش دەفەرموێ: (ئەمە بەشی ئەم بەندەیەی منە، وە ئەم

بەندەیەم داوای هەرچیم لێ بکا، دەیدەمێو بێ دڵی ئەو ناکەم). {تاج/١، لاپەڕە: ٢٤٧، زنجیرە: ٧٢، چاپی/١، ژمارە: ٤٧٢}.

## ١٨٢) ئەوەندە قورئان دەخوێنێ کە دەست دەدا بۆی.
## باب: القراءةُ مِمّا تيسّر

٢٨٢- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دَخَلَ الْمَسْجِدَ، فَدَخَلَ رَجُلٌ فَصَلَّى، ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَرَدَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَيْهِ السَّلَامَ، قَالَ: « ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ ». فَرَجَعَ الرَّجُلُ فَصَلَّى كَمَا كَانَ صَلَّى، ثُمَّ جَاءَ إِلَى النَّبِىِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « وَعَلَيْكَ السَّلَامُ » ثُمَّ قَالَ: « ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ». حَتَّى فَعَلَ ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَقَالَ الرَّجُلُ: (وَالَّذِى بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أُحْسِنُ غَيْرَ هَذَا، عَلِّمْنِى، قَالَ: « إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلَاةِ فَكَبِّرْ، ثُمَّ اقْرَأْ مَا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ، ثُمَّ ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَعْتَدِلَ قَائِمًا، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا، ثُمَّ افْعَلْ ذَلِكَ فِى صَلَاتِكَ كُلِّهَا». {الحديث/٨٨٣. مختصر صحيح البخارى = تجريد/١، لاپەڕە: ٣٩٧، رقم: ٤١٢ = ٧٥٧، ٧٩٣، ٦٢٥١، ٦٢٥٢، ٦٦٦٧}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆ مزگەوت، پیاوێکیش کەناوی خەللادی کوڕی رافیع بوو، هاتە ژوورەوەو نوێژی کردو چوو بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)و سلاوی لێ کرد، ئەویش سلاوەکەیی سەندەوەو فەرمووی: (بچۆرەوە نوێژەکەت بکەرەوە، چونکە ئەوە نوێژ نەبوو کە تۆ کردت) هەتا سێجار پیاوەکە نوێژەکەیی دەکردەوەو دەهاتەوە سلاوی لە پێغەمبەر دەکردو ئەویش وەلامی سلاوەکەیی دەدایەوەو دیسانەوە هەروای پێ دەفەرمووەوە، تا لەسەری جاری سێیەما پیاوەکە گوتی: بەو خودایەی کە تۆی کردووە بە پێغەمبەری راستو دروست لەمە باشتری لێ نازانم، دەی ئەی پێغەمبەری خودا! بفەرموو نوێژم فێربکە. ئەویش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کە راوەستای بۆ نوێژ لەپێشا نوێژ بەم شێوە دابەستەو بڵێ: ئەللاهو ئەکبەر، ئنجا

چەندەت بۆ دەلوێ (لەو قورئانەی کە لەبەرتە) بیخوێنە، ئەوجا بچەمێرەوەو ئەوەندە لە چەمینەوە (روکووع)دا بمێنەرەوە هەتا لەشت لە جموجووڵ دەکەوێو ئەندامەکانت ئارام دەگرن، ئینجا رێك هەڵسەرەوەو پشت هەڵبڕە هەتا رەپو راست رادەوەستیت، ئەوسا دانەوێ بۆ کوڕنووش‌و کوڕنووشی یەکەم بەرەو ئەوەندە لە کوڕنووشدا بمێنەرەوە تا ئەندامەکانت ئارام دەگرن‌و جەستەت لە جموجووڵ دەکەوێ، ئەوجا سەر لە کوڕنووش بەرزکەرەوە هەتا قنج دادەنیشیت، ئینجا دیسانەوە کوڕنووشێکی تر، وەك کوڕنووشی یەکەم بەرەوە، ئیتر هەموو رکاتەکانی تریش هەتا سەر بەم شێوەیە بکەو، هەموو کاتێ لە نوێژەکانتا ئەمە کارت بێ).
{تاج/١، زنجیرە: ٧٢، ژمارە: ٢/٤٧٠}.

### ١٨٣) خوێندن لەپشت پێش نوێژەوە. (٨٨٥ - ٨٨٧).
### باب: القِراءَةُ خَلْفَ الإمامِ

٢٨٣- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَلاَةَ الظُّهْرِ أَوِ الْعَصْرِ، فَقَالَ: « أَيُّكُمْ قَرَأَ خَلْفِي (بِسَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى)؟ فَقَالَ رَجُلٌ: أَنَا، وَلَمْ أُرِدْ بِهَا إِلاَّ الْخَيْرَ، قَالَ: « قَدْ عَلِمْتُ أَنَّ بَعْضَكُمْ خَالَجَنِيهَا». {الحديث/٨٨٥}:

عیمرانی کوڕی حوصەین (رەزای خودا لە خۆی‌و باوکی) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) یا نوێژی نیوەڕۆژی بۆمان کرد، یا نوێژی عەصری بۆ کردین، کاتێ لە نوێژەکە بۆوە، فەرمووی: (ئەوە کامتان بوون کە لەپشتی منەوە، سوورەتی (سَبِحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى)ی خوێند؟). پیاوێ لە خەڵکی جەماعەت فەرمووی: قوربان! من بووم، مەبەستیشم تەنها پاداشی باش بوو، خۆ خوا نەخواستە کارێ نابەجام نەکردووە؟ خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەنگت زیاد لە پێویست بەرز بوو، هەستم کرد کە کەسێ لە ئێوە، بەهۆی دەنگ بەرز کردنەوەوە، خەریك بوو خوێندنەکەمم لێ بشەڵەژێنێ).

**ڕوونکردنەوە:**

**ئیمامی نەوەوی** (رەحمەتی خودای لێ بێ) **دەفەرموێ:**

١ -**پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **تەنیا رەخنەی ئەوەی لەو پیاوە گرتووە، کە دەنگی پتر لە ئەندازەی پێویست بەرزەوە کردووە.**

٢ -**ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەوەیە کە هاوەڵان لەپشت پێغەمبەرەوە لە نوێژە پەنامەکییەکانا، لەپاش فاتیحاوە سوورەتیشیان دەخوێند، هەروا پێش نوێژیش، کەواتە: شتی وا بۆ ئێمەیش سوننەتە بەهەمان مەرج.**

## ١٨٤) حەمد کردنو ئامین کردن. (٩١٢ - ٩١٩).
## باب: التَّحمِيدُ وَالتَّأمِينُ

**٢٨٤- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « إِذَا أَمَّنَ الإِمَامُ فَأَمِّنُوا، فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلاَئِكَةِ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ. قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: « آمِينَ ». {الحديث/٩١٤. تجريد/١/٤٠٧، رقم: ٤٢٤ = ٧٨٠، ٦٢٠٢}:**

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەری خودا** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: (کاتێ پێش نوێژ لەپاش خوێندنی فاتیحا، بە دەنگی بەرز دەڵێ: ئامین، ئێوەیش لەگەڵ ئەودا بڵێن ئامین، چونکە فریشتە لەم کاتەدا دەڵێن ئامین، هەر کەسێکیش بۆی رێ بکەوێ، لەگەڵ ئامین کردنی فریشتەکاندا ئامین بکا، خودای گەورە لە گوناهی لەوەو پێشی خۆش دەبێ).**

**ئیبنو شیهاب دەفەرموێ: پێغەمبەر خۆی** (دروودی خودای لەسەر بێ) **لەپاش (وَلاَ الضَّالِّين) دەیفەرموو: (ئامین).{تاج/١، لاپەڕە: ٢٦٢، زنجیرە: ٧٦، چاپی/١، ژمارە: ٤٩٧ و ٤٩٨ و ٤٩٩}.**

## ١٨٥) قورئان خوێندنی نوێژی بەیانی. (١٠٢١ - ١٠٣٥).
## باب: القِرَاءَةِ فِي صَلاَةِ الصُّبْحِ

**٢٨٥- عَنْ سِمَاكِ بِنِ حَرْبٍ قَالَ: سَأَلْتُ جَابِرَ بْنَ سَمُرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ)، عَنْ صَلاَةِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: كَانَ يُخَفِّفُ الصَّلاَةَ، وَلاَ يُصَلِّى صَلاَةَ هَؤُلاَءِ،**

قَالَ:(وَأَنْبَأَنِى أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقْرَأُ فِى الْفَجْرِ ب (ق وَالْقُرْآنِ) وَنَحْوِهَا}. {الحديث/١٠٢٨}:

سیماکی کوڕی حەرب فەرمووی: سەبارەت بە چۆنێتیی نوێژی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە جابیری کوڕی سەموورەم پرسی، فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، نوێژێکی سووکەڵەی کورتو پوختی دەکرد، نەك وەك نوێژی ئەم جۆرە کەسانە، کە تەواو درێژی دەکەنەوەو مەردمەکە سەخڵەت دەکەن.

فەرمووی: وە هەواڵی ئەوەیشی پێمدا، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش فاتیحە، لە نوێژی بەیانیدا، سوورەتی (قَ وَ القُرآنِ المجید)ی لە رکاتێکیانا دەخوێند، یا سوورەتێکی وەك ئەوی تیا دەخوێند، وە لە رکاتی دووەمیشا هەروا، سوورەتێکی لەو جۆرەی دەخوێند). {تاج/١/٢٦٨، زنجیرە: ٨١، چاپی/١، ژمارە: ٥١٢}.

### ١٨٦) قورئان خوێندنی نوێژی نیوەڕۆو عەصر. (١٠١١ - ١٠٢٠).
### باب: فِي القِرَاءَةِ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ

٢٨٦- عَنْ أَبِى قَتَادَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّى بِنَا فَيَقْرَأُ فِى الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ فِى الرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ ب(فَاتِحَةِ الْكِتَابِ) وَسُورَةٍ، وَيُسْمِعُنَا الآيَةَ أَحْيَانًا، وَيَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الأُخْرَيَيْنِ ب(فَاتِحَةِ الْكِتَابِ). {الحديث/١٠١٣. تجريد البخاری/١/٣٩٩، رقم: ٤١٣ = ٧٥٩، ٧٦٢، ٧٧٦، ٧٧٨، ٧٧٩}:

ئەبو قەتادە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە نوێژی بۆ دەکردین، دەستووری وابوو: لە رکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆو لە رکاتی یەکەمی نوێژی عەصردا، لەپێشا سوورەتی فاتیحای دەخوێند، ئەوجا لەپاش فاتیحاوە سوورەتێکی دەخوێند، هەروا لەرکاتی دووەمی نوێژی نیوەڕۆو لە رکاتی دووەمی نوێژی عەصردا، لەپێشا فاتیحای دەخوێند، ئەوسا سوورەتێ، ئەو سوورەتەی لە رکاتی یەکەما دەیخوێند درێژتر بوو لەو سوورەتەی کە لە رکاتی دووەمدا دەیخوێند. جار جارەیش دەنگی ئەوەندە بەرز دەکردەوە کە ئایەتەکە دەبیسترا. بەڵام لەم دوو نوێژەدا، لە رکاتی سێیەمو چوارەمدا، تەنها فاتیحەی تیا دەخوێندن).

٢٨٧- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقْرَأُ فِى صَلاَةِ الظُّهْرِ فِى الرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ فِى كُلِّ رَكْعَةٍ قَدْرَ ثَلاَثِينَ آيَةً، وَفِى الأُخْرَيَيْنِ قَدْرَ خَمْسَ عَشْرَةَ آيَةً، أَوْ قَالَ: نِصْفَ ذَلِكَ، وَفِى الْعَصْرِ فِى الرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ، فِى كُلِّ رَكْعَةٍ قَدْرَ قِرَاءَةِ خَمْسَ عَشْرَةَ آيَةً، وَفِى الأُخْرَيَيْنِ قَدْرَ نِصْفِ ذَلِكَ}. {الحديث/١٠١٤}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، لە نوێژی نیوەڕۆدا، لە دوو ڕکاتەکەی یەکەما، لەهەر یەکێکیانا بە ئەندازەی سیی ئایەتی دەخوێند، لە دوو ڕکاتەکەی تردا، لەهەر یەکێکیانا بە ئەندازەی پازدە ئایەتی دەخوێند. یا فەرمووی: نیوەی دوو ڕکاتی یەکەمی دەخوێند تیایانا، لە نوێژی عەصریشا، لە دوو ڕکاتەکەی یەکەما، لەهەر ڕکاتێکیاندا بە ئەندازەی پازدە ئایەتی دەخوێند، لە دوو ڕکاتەکەی تریشدا نیوەی ئەوەی دەخوێند).

## ١٨٧) قورئان خوێندنی نوێژی شێوان.
## باب: القراءةُ في صلاةِ المغرب

٢٨٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِىَ اللّهُ عنهما) قَالَ: إِنَّ أُمَّ الْفَضْلِ بِنْتَ الْحَارِثِ سَمِعَتْهُ وَهُوَ يَقْرَأُ (وَالْمُرْسَلاَتِ عُرْفًا) فَقَالَتْ: يَا بُنَيَّ! لَقَدْ ذَكَّرْتَنِى بِقِرَاءَتِكَ هَذِهِ السُّورَةَ، إِنَّهَا لآخِرُ مَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْرَأُ بِهَا فِى الْمَغْرِبِ}. {الحديث/١٠٣٣. تجريد البخارى/١، لاپەڕە: ٣٩٩، ژمارە: ٤١٤ = ٧٦٣، ٤٤٢٩ فتح البارى}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ سوورەتی (وَالْمُرْسَلاَتِ عُرْفًا)م دەخوێند، دایکم کە ناوی لوبابەی کچی حاریث بوو، کە ناسراو بوو بە ئوم فەزڵ، گوێی لێم بوو کە ئەم سوورەتەم خوێند، فەرمووی: ڕۆڵە گیان! بەخودا، بە خوێندنی ئەم سوورەتە، ئەوەت یاد خستمەوە: کە ئەم سوورەتە ئاخرەمین شت

بوو، گوێم لێ بوو كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە نوێژی شێوانا دەیخوێند).
{تاج/١/٢٦٧، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ٥٠٧} .

## ١٨٨) قورئان خوێندنی نوێژی خەوتنان. (١٠٣٦ - ١٠٤٢).
## باب: القراءة في العشاء الآخرة

٢٨٩- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ مُعَاذٌ يُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ثُمَّ يَأْتِي، فَيَؤُمُّ قَوْمَهُ، فَصَلَّى لَيْلَةً مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْعِشَاءَ، ثُمَّ أَتَى قَوْمَهُ فَأَمَّهُمْ، فَافْتَتَحَ بِسُورَةِ الْبَقَرَةِ، فَانْحَرَفَ رَجُلٌ فَسَلَّمَ، ثُمَّ صَلَّى وَحْدَهُ وَانْصَرَفَ، فَقَالُوا لَهُ: أَنَافَقْتَ يَا فُلاَنُ، قَالَ: لاَ وَاللَّهِ، وَلآتِيَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلأُخْبِرَنَّهُ، فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا أَصْحَابُ نَوَاضِحَ، نَعْمَلُ بِالنَّهَارِ، وَإِنَّ مُعَاذًا صَلَّى مَعَكَ الْعِشَاءَ، ثُمَّ أَتَى فَافْتَتَحَ بِـ (سُورَةِ الْبَقَرَةِ) فَأَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى مُعَاذٍ، فَقَالَ: « يَا مُعَاذُ أَفَتَّانٌ أَنْتَ؟!» اقْرَأْ بِكَذَا، وَاقْرَأْ بِكَذَا.

قَالَ سُفْيَانُ: فَقُلْتُ لِعَمْرٍو: إِنَّ أَبَا الزُّبَيْرِ حَدَّثَنَا عَنْ جَابِرٍ أَنَّهُ قَالَ: اقْرَأْ (وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا). (وَالضُّحَى). (وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى) وَ(سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى). فَقَالَ عَمْرٌو: وَنَحْوَ هَذَا} . {الحديث/١٠٤٠} :

جابیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: موعازی کوڕی جەبەل، دەستووری وابوو، نوێژی خەوتنانی بە کۆمەڵ لەپشت پێغەمبەرەوە دەکرد، ئەوجا دەچوو بۆلای هۆزەکەی بەرنوێژی بۆ ئەوان دەکرد، جا شەوێ لەگەڵ پێغەمبەردا نوێژی خەوتنانی بە جەماعەت کرد، ئەوجا ڕۆیشت بۆ ناو خزمەکانی، لەوێ بەرنوێژیی نوێژی خەوتنانی بۆ کردن، لەپاش سوورەتی فاتیحا دەستی کرد بە سوورەتی بەقەرە، جا پیاوێ نوێژەکەی بڕی و سلاوی دایەوەو ڕۆیشت لەولاوە بەتەنها خۆی نوێژی خۆیی کردو ڕۆیشتەوە. هاوڕێکانی پێیان گوت: بۆ وات کرد، دیارە ناپاك (منافق) بوویت. گوتی: نەبەخوا شتی وا نییە، بەخودا دەچم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سکالای ئەم بارو دۆخەی لە خزمەتا دەکەم، جا چوو بۆ خزمەتیو عەرزی کرد:

قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە ئاوكێشین، ڕۆژ تا ئێواریٚ بە وشتر ئاو دەكێشینو شەكەتو ماندووین، موعازیش لە خزمەت تۆدا نوێژی خەوتنانی بە كۆمەڵ كردبوو، ئەوجا هات بۆلای ئێمەو بەرنوێژیی نوێژی خەوتنانی بۆمان كردو بە سوورەتی بەقەرە دەستی پیٚ كردو تەواو درێژی كردەوەو ئێمەش ئەوە حاڵمانە؟!

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) هەقی دا بە پیاوەكەو بۆ پشتگیری ئەوە رووی كردە موعازو پێی فەرموو: (ئەی موعاز! بەڕەفتاری وا، خەڵك لە جەماعەت مەتەكێنەرەوە! ئەو سوورەتە بخوێنە، یا ئەو سوورەتەی تر بخوێنە).

ئیمامی موسلیم (ڕەحمەتی خودای لیٚ بیٚ) ئەم فەرموودەیە بەم رشتەیە دەگێڕێتەوە: لە موحەممەدی كوڕی عەببادەوە، لە سوفیانەوە، لە عەمرەوە، لە جابیرەوە. جا سوفیان دەفەرمویٚ: بە عەمری مامۆستای خۆمم گوت: من ئەم فەرموودەیەم لە ئەبو زوبەیریش وەرگرتووە، ئاخری فەرموودەكەی لە جابیرەوە ئاوا دەگێڕایەوە بۆمان، كە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بیٚ) بە موعازی فەرموو: (سوورەتیٚ لەم سوورەتانە بخوێنە: سوورەتی (والشَّمْسِ وَضُحاها) یا سوورەتی (وَالضُّحى) یا سوورەتی (واللَّيْلِ إذَا يَغْشى) یا سوورەتی (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأعْلى) بخوێنە). عەمریش لە وەڵاما فەرمووی: وە وێنەی یەكیٚ لەوانەیش بخوێنیٚ دەبیٚ}.

## ١٨٩) نەهیی كردن لە پێشكەوتن لە پێش نوێژ لە چەمینەوەو كوڕنووشو وێنەی ئەم دووە. (٩٦٠ - ٩٦٤).

## باب: النهي عَنْ سَبْقِ الإمَامِ بِالركُوْعِ والسُّجُود

٢٩٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَاتَ يَوْمٍ، فَلَمَّا قَضَى الصَّلاَةَ أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ، فَقَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي إِمَامُكُمْ، فَلاَ تَسْبِقُونِي بِالرُّكُوعِ، وَلاَ بِالسُّجُودِ، وَلاَ بِالْقِيَامِ، وَلاَ بِالانْصِرَافِ، فَإِنِّي أَرَاكُمْ أَمَامِي وَمِنْ خَلْفِي، ثُمَّ قَالَ: (وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَوْ رَأَيْتُمْ مَا رَأَيْتُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا، قَالُوا: وَمَا رَأَيْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: « رَأَيْتُ الْجَنَّةَ وَالنَّارَ ». {الحديث/٩٦٠}:

ئەنــەس (رەزای خــودای لێ بــێ) فــەرمووی: رۆژێــکیان پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر بــێ) بەرنوێژیی بۆ دەکـردین، کـە نوێژەکـەی تـەواو کـرد، رووی تـێ کـردینو فـەرمووی: ئەی خەڵکینە! من بەرنوێژو پێش نوێژی ئێوەم، کەوابوو نە بەچـەمینەوە، نـە بـە کورنـووش، نـە بـە هەڵسانەوە، نـە بـە سلاو دانـەوە، نـە بـە هیچـی تـر پـێش مـن مەکەون، ئێوە چ لە پێشمەوە بنو چ لە پاشمەوە بن، وەك یەك دەتان بینم، چونکە خودا بەهرەیەکی وای پێم داوە، کە لەهـەر چوار لای خۆمـەوە، لـە یـەك کاتـا، شت وەك یەك دەبینم).

ئەوجا فەرمووی: (بەو کەسە کە گیـانی منـی بەدەسـتە، ئـەوەی مـن دیـتم لـەم نوێژەدا، ئەگەر ئێوە بتان دیبایە، کەم پێ دەکەنینو زۆر دەگریان).

گوتیان ئـەی پێغەمبـەری خـودا! چیت بینـی؟ فـەرمووی: (بەهەشـتو دۆزەخو حاڵی شڕی دۆزەخ نشینەکانم بەچاوی خۆم بینی).

### ١٩٠) جڵەوگیری لەسەر بەرزکردنەوە لەپێش بەرنوێژدا
### بابٌ: النَّهْيُ عَنْ رَفْعِ الرَّأْسِ قَبْلَ الإِمَامِ

٢٩١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللّه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَا يَأْمَنُ الَّذِي يَرْفَعُ رَأْسَـهُ فِـى صَـلاَتِهِ قَبْـلَ الإِمَـامِ، أَنْ يُحَـوِّلَ اللَّـهُ صُـورَتَهُ فِـى صُـورَةِ حِمَارٍ». {الحديث/٩٦٣. تجريد البخارى/١/٣٨٠، رقم: ٣٨٩ = ٦٩١ فتح} :

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (ئەو کەسەتان کە لە جەماعەتا، لەپێش پێش نوێژدا، سەر لە چەمینەوە (رکوع) یا لە کورنووش بەرز دەکاتەوە، چۆن لەوە ناترسێ کـە خـودا لەسـەر ئـەو پەلـە پەلـە، سەری بکا بەسەری کەر، یا کە خودا شکڵو شێوەی بکا بە شکڵو شێوەی کەر!).

### ١٩١) کەراهەتی تەطبیق لە روکووعا. (١١٩١ - ١١٩٧).
### باب: التطبيقُ فِي الرُّكُوعِ

٢٩٢- عَنِ الأَسْوَدِ وَعَلْقَمَةَ قَالاَ: أَتَيْنَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) فِـى دَارِهِ، فَقَالَ: أَصَلَّى هَؤُلاَءِ خَلْفَكُمْ؟ فَقُلْنَا: لاَ، قَالَ: فَقُومُوا فَصَلُّوا، فَلَـمْ يَأْمُرْنَـا بِـأَذَانٍ وَلاَ إِقَامَـةٍ،

قَالَ: وَذَهَبْنَا لِنَقُومَ خَلْفَهُ، فَأَخَذَ بِأَيْدِينَا، فَجَعَلَ أَحَدَنَا عَنْ يَمِينِهِ وَالآخَرَ عَنْ شِمَالِهِ، قَالَ: فَلَمَّا رَكَعَ، وَضَعْنَا أَيْدِينَا عَلَى رُكَبِنَا، قَالَ: فَضَرَبَ أَيْدِينَا، وَطَبَّقَ بَيْنَ كَفَّيْهِ، ثُمَّ أَدْخَلَهُمَا بَيْنَ فَخِذَيْهِ، قَالَ: فَلَمَّا صَلَّى قَالَ: إِنَّهُ سَتَكُونُ عَلَيْكُمْ أُمَرَاءُ يُؤَخِّرُونَ الصَّلاَةَ عَنْ مِيقَاتِهَا، وَيَخْنُقُونَهَا إِلَى شَرَقِ الْمَوْتَى. فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمْ قَدْ فَعَلُوا ذَلِكَ، فَصَلُّوا الصَّلاَةَ لِمِيقَاتِهَا، وَاجْعَلُوا صَلاَتَكُمْ مَعَهُمْ سُبْحَةً، وَإِذَا كُنْتُمْ ثَلاَثَةً فَصَلُّوا جَمِيعًا، وَإِذَا كُنْتُمْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ فَلْيَؤُمَّكُمْ أَحَدُكُمْ، وَإِذَا رَكَعَ أَحَدُكُمْ فَلْيَفْرِشْ ذِرَاعَيْهِ عَلَى فَخِذَيْهِ، وَلْيَجْنَأْ، وَلْيُطَبِّقْ بَيْنَ كَفَّيْهِ، فَلَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى اخْتِلاَفِ أَصَابِعِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَأَرَاهُمْ}.
{الحديث/١١٩١، ١١٩٢، ١١٩٣، ١١٩٤، ١١٩٥، ١١٩٦، ١١٩٧. بخارى/٧٩٠}:

ئەسودو عەلقەمە فەرموویان: چووین بۆلای عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود، لە ماڵەوەی. فەرمووی: فەرمانڕەواو تاقمەکەی، کە ئێوە بەجێتان هێشتن‌و هاتن بۆ ئێرە جەماعەتەکەیان بۆتان کرد؟ گوتمان: نەء، نە ئەوان نوێژیان کردووەو نە ئێمە. فەرمووی: (دە هەڵسن نوێژەکەتان بکەن، نوێژ بووە).

فەرمانی پێ نەکردین کە بانگ بدەین، یا قامەت بکەین بۆ ئەو نوێژە فەرزە، کە لە ماڵەکەی ئەوا بە جەماعەت کردمان‌و خۆی بەرنوێژییەکەی بۆمان کرد. فەرمووی: جا ئێمەیش هەردوکمان هەڵساین کە لە پشتیەوە ببین بە ڕیزێك‌و نوێژ بە جەماعەت دابەستین، بەڵام دەستی گرتین‌و لەگەڵ خۆیدا کردینی بە ڕیزێك‌و یەکێکمانی خستە لای ڕاستی‌و ئەوی ترمانی خستە لای چەپی.

فەرمووی: کاتێ ئەو روکوعی برد ئێمەیش لەگەڵیا روکوعمان برد، لەناو چەمینەوەکەدا، وەك ئێستا باوە، هەردوو دەستمان لەسەر هەردوو کەشکە ئەژنۆمان دانا. فەرمووی: کەچی ئیبنو مەسعوود کێشای بە دەستمانا کەوا نەکەین، وە خۆی هەر دوو لەپی خۆی جووت کردو پەنجەکانی تێك پەڕاندو لەسەر ئەو شێوەیە داینان لەنێوانی هەردوو ڕانەکانیدا هەتا چەمینەوەکەی تەواوکرد، لە رکاتەکانی تریشا هەروا، وە ئێمەیش لەسەر ئاماژەکەی ئەو چاومان لەوکردو وامان کرد وەك ئەو. فەرمووی: کاتێ نوێژەکەی تەواوکرد بۆمان، فەرمووی: (ئەوە باش باش بزانن کە میرو فەرمانڕەوای وا دەبن بە فەرمانڕەوا بەسەرتانەوە، کە

پەیڕەوی سوننەت ناکەنو نوێژەکان لەسەرەتای کاتی دیاری کراوی خۆیاندا ناکەن، وە تەواو لەکاتی پەسەندی خۆیان دوایان دەخەن، هەتا دەگاتە کاتی پەلە قاژەی مەرگو خەریکە کاتەکەی بەسەر دەچێ، جا هەرکاتێ ئەمە رووی داو ئەم جۆرە فەرمانڕەوایانە بەرنوێژییان بۆتان دەکرد، ئێوە نوێژی خۆتان لەکاتی پەسەندی خۆیدا بکەن، وە بەجەماعەتیش لەگەڵ ئەواندا لەو دواکاتەدا نوێژەکەتان دووبارە بکەنەوە بە سوننەت دائەنرێ بۆتان. ئەگەر سێ کەس بوون وەك ئێستای خۆمان، هەمووتان ببن بە یەك ریزو پێش نوێژ لە ناوەڕاستتانا بوەستێ، ئەگەر لە سیانیش زیاتر بوون ئەوا با پێش نوێژ پێشتان بکەوێو ئێوەیش لە پشتیەوە ریز ببن، کاتێ روکووعیش دەبەن هەردوو باسکتان لەسەر هەردوو رانتان رابخەنو تەواو بچەمێنەوەو هەردوو لەپتان بنووسێنن بەیەکەوەو پەنجەکانی هەردوو دەستتان تێك پەڕێننو لەنێوانی هەردوو رانتاندا دایان بنێن، بۆیە واتان پێ دەڵێم چونکە بە چاوی خۆم پێغەمبەرم دیوە کە وایکردووە ئێستایش دەڵێی هەر لەبەر چاومە کە چۆن پەنجەکانی خۆی بەناو یەکا تێك دەپەڕاندو ئاوای دەکرد).

## ١٩٢) دەست گرتن بە ئەژنۆوەو نەسخی تەطبیق
## بَابٌ: وَضْعُ الْيَدَيْنِ عَلَى الرُّكَبِ وَنَسْخُ التَّطْبِيقِ

٢٩٣- عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: صَلَّيْتُ إِلَى جَنْبِ أَبِي، قَالَ: وَجَعَلْتُ يَدَيَّ بَيْنَ رُكْبَتَيَّ، فَقَالَ لِي أَبِي: اضْرِبْ بِكَفَّيْكَ عَلَى رُكْبَتَيْكَ، قَالَ: ثُمَّ فَعَلْتُ ذَلِكَ مَرَّةً أُخْرَى فَضَرَبَ يَدَيَّ، وَقَالَ: إِنَّا نُهِينَا عَنْ هَذَا، وَأُمِرْنَا أَنْ نَضْرِبَ بِالأَكُفِّ عَلَى الرُّكَبِ. {الحديث/١١٩٤. تجريد/١/٤٠٩، رقم/٤٢٨ = ٧٩٠}:

موصعەبی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لە تەنیشتی باوکمەوە نوێژم دەکرد، لەکاتی چەمینەوەدا، هەردوو لەپەکانم نووساند بەیەکەوەو دامنان لەنێوانی هەردوو رانمدا، کاتێ لە نوێژەکە بوومەوە، باوکم پێی فەرمووم: شتی وا مەکە، جاران ئێمە ئاوامان دەکرد، بەڵام لە پاشتر پێغەمبەر (دروودی

خودای لەسەر بێ) نەیی لێکردین لەوە، وە باوکم پێی فەرمووم: هەردوو لەپەکانت بگرە بە هەردوو ئەژنۆکانتەوە).

فەرمووی: جارێ تریش لەوەدوا، هەمان شتم کردەوە، باوکم کێشای بەهەردوو دەستمداو، فەرمووی: جاران ئێمە ئاوامان دەکرد، بەلاَم ئاخر شت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جلەو گیریی لێکردین لە کردنی ئەوە، وە فەرمانی پێکردین کە لە چەمینەوەدا دەست بگرین بە ئەژنۆمانەوە). {بڕوانە ئاخری ژمارە: ٢٩٦}.

### ١٩٣) ویردو نزای ناو چەمینەوەو کوڕنووش. (١٠٨٣ - ١٠٩٢).

### باب: مَا يُقَالُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ

٢٩٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي». يَتَأَوَّلُ الْقُرْآنَ. {الحديث/١٠٨٥ شرح النووي = ١٠٧١ فتح الملهم = ٤٣٠ تجريد = ٧٩٤، ٨١٧، ٤٢٩٣، ٤٩٦٧، ٤٩٦٨}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: یاسای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، لەناو چەمینەوەو کوڕنووشدا دەیفەرموو: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي): خودایە! تۆ خودایەکی پاكو بێ نەنگیت، ئەی پەروەردگارم! لەسایەی تۆوەیە کەمن تەسبیحو سوپاسو ستایشی تۆ دەکەم، ئەی خودایە لێم خۆش بە).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەگوتنی ئەم ویردە لە چەمینەوەو کوڕنووشدا، کاری بەم ئایەتەی قورئان دەکرد، کە دەفەرموێ: {فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ} وە مەبەستی ئایەتەکەی ڕوون دەکردەوە، کە خودا فەرمان دەکا بە خۆشەویست تەسبیحات بکا، وە سوپاسو ستایشی بکا، وە داوای لێ خۆش بوونی لێ بکا، چونکە ناو نوێژ باشترین کاتە بۆ جێبەجێ کردنی ئەم فەرمانە.

## ١٩٤) جلەو گیری لە خوێندنی قورئان لە چەمینەوەو کوڕنووشا. (١٠٧٣ – ١٠٨١).
## باب: النَّهْيِ عَنِ الْقِرَاءَةِ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ

٢٩٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) قَالَ: كَشَفَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) السِّتَارَةَ، وَالنَّاسُ صُفُوفٌ خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، فَقَالَ: « أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّهُ لَمْ يَبْقَ مِنْ مُبَشِّرَاتِ النُّبُوَّةِ إِلاَّ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ يَرَاهَا الْمُسْلِمُ، أَوْ تُرَى لَهُ، أَلاَ وَإِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَقْرَأَ الْقُرْآنَ رَاكِعًا أَوْ سَاجِدًا، فَأَمَّا الرُّكُوعُ، فَعَظِّمُوا فِيهِ الرَّبَّ، وَأَمَّا السُّجُودُ فَاجْتَهِدُوا فِي الدُّعَاءِ فَقَمِنٌ أَنْ يُسْتَجَابَ لَكُمْ ». {الحديث/١٠٧٤ شرح النووي = ١٠٦١ فَتْحُ الْمُلْهِمِ}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لە نەخۆشینی سەرە مەرگا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پەردەی دەرگای هۆدەکەی خۆی لادا، کە دەرگاکە لەسەر مالّی مزگەوت بوو، تەماشای کرد وا خەڵکەکە لەپشت ئەبوبەکرەوە ریز بوونو نوێژیان دابەستووەو ئەبوبەکر (ڕەزای خودای لەسەر بێ) بەر نوێژییان بۆ دەکا، فەرمووی: (ئەی خەڵکینە! لە پێغەمبەرایەتی لەدوای من هیچ نەماوە، جگە لە موژدە دەرەکانی، کە بریتین لە خەونی باش کە موسوڵمان دەیبینێ، یا کەسێ تر خەوی باشی پێوە دەبینێ.

هۆشیاربن کە من جلەوگیریی ئەوەم لێ کراوە، کە لەناو چەمینەوەدا، یا لەناو کوڕنووشدا، قورئان بخوێنم، جا لەناو چەمینەوەدا باسی مەزنیو گەورەیی یەزدانی پاك بکەن، لەناو کوڕنووشیشا زۆر بە کوڵو بە دڵ سەر گەرمی نزاو پاڕانەوە بن، لەبارو دۆخی وادا شایانی ئەوەن کە خودا نزاو پاڕانەوەکانتان لێ وەربگرێ).

## ١٩٥) نوێژ خوێن چی دەڵێ، کاتێ سەر لە چەمینەوە هەڵ دەبڕێ. (١٠٦٦ - ١٠٧٢).
## باب: ما يقول إذا رفع مِنَ الرُّكُوعِ

٢٩٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ، قَالَ: « رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ، مِلْءَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ، أَهْلَ الثَّنَاءِ وَالْمَجْدِ، أَحَقُّ مَا قَالَ الْعَبْدُ، وَكُلُّنَا

لَـكَ عَبْدٌ، لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَـا مَنَعْتَ وَلاَ يَنْفَـعُ ذَا الْجَـدِّ مِنْـكَ الْجَـدُّ».
{الحديث/ ١٠٧١ = ١٠٦٠م فتح المُلْهِمِ}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، کە سەری لە چەمینەوە بەرز دەکردەوە دەیفەرموو: (سَمِعَ اللّٰـهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا لَـكَ الْحَمْدُ، مِلْءَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ، أَهْلَ الثَّنَاءِ وَالْمَجْدِ، أَحَقُّ مَا قَالَ الْعَبْدُ، وَكُلُّنَا لَـكَ عَبْدٌ، لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ: ئەوی ستایش‌و سوپاسی یەزدانی پاك بکاو، نیازی خۆی عەرزی بارەگای ئەو زاتە بکا، ئەوە هەم سوپاسەکەی‌و هەم نیازەکەی گیرایە، پەروەردگارا! کەواتە سوپاسێکی زۆری بێ شومار بۆ تۆ، پڕ بە ئاسمانەکان‌و، پڕ بە زەوی، پڕ بە نێوانی ئەم دوانە. سەرەڕای ئەمانەیش پڕ بە هەر شتێکی تریش سوپاس بۆ تۆ بێ، کە حەزی تۆی لەسەر بێ، ئەی کەسێ کە شایان‌و شایستەی هەموو ستایش‌و گەورەییەکی! دروستترین‌و ڕەواترین وشەیێ، کە یەکێ لە ئێمە بیڵێ، کە هەموومان بەندەی تۆین‌و تۆ پەرستین ئەم وشە پیرۆزەیە: خودایە! هەرچی تۆ بیدەیت، بە کەسی تر نابڕێت، هەرچیش تۆ نەیدەیت بە کەسی تر نادرێ، دارایی داراو، دەستداریی دەستدار هیچ دادێکیان نادەن لەلای تۆ).
{تاج/١، زنجیرە: ٨٤، ژمارە: ٥٢٦، چاپی/٢}.

**ڕوونکردنەوە:**

١-بەسەر گرتنەوە، ژینامەی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص، بە هەڵە لەژمارە (٢٩٣)دا نە نووسرابوو، وا لێرە بەسەری دەگرینەوە:

٢-سەعد (ڕەزای خوای لێ بێ) لە عەشەرەی موبەششەرەیە، واتە: لەو دە کەسەیە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) موژدەی بەهەشتی پێیان داوە، لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکانە، لە تەمەنی چواردەساڵیدا ئیسلام بووە، ئامادەی غەزای بەدر بووە، هەروا هی غەزاکانی تری پاش بەدر بووە، نزای گیرا بوو، یەکەم کەس بوو کە یەکەم تیری لە ڕێگەی خودادا هاویشتووە، لە کۆچکارە هەرە پێشینەکان بوو،

دوو سەدو حەفتا فەرموودەی هەیە، لە بوخاریدا بیست فەرموودەی هەیە، لە موسلیمدا بیستو سێی هەیە، یازدەیان پەسەندی هەردوو لایە، لەسەردەمی پێشەوا عومەردا، لەسەر دەستی سەعددا، مەدائین ئازاد کرا، شاری کووفەی دروست کرد، عومەر کردی بە فەرمانداری وڵاتی عێراق، لە پەنجاو حەوتی کۆچیدا مردووە، لە گۆڕستانی بەقیع، کەوا لەنزیك مزگەوتی پێغەمبەر بەخاك سپێردراوە، دواترین کەسە کە لە عەشەرەی موبەششەرە کە مەرگی کردووە. لە تاجول ئوصولدا، لەبەرگی پێنجا، چاپی یەکەم، زنجیرە: ١٢ ژیاننامەی سەعد نووسراوە. ژمارە: ٣٣٢٦ هەتا ٣٣٣١ چاپی دووەم تاج-٣.

**١٩٦) باسی گەورەیی کوڕنووشو هاندانی موسوڵمان لەسەر کوڕنووش بردنی زۆر. (١٠٩٣ - ١٠٩٤). بابٌ: فَضْلُ السُّجُودِ وَالتَّرْغِيبُ فِي الإِكْثَارِ مِنْهُ**

٢٩٧- عَنْ مَعْدَانُ بْنُ أَبِى طَلْحَةَ الْيَعْمَرِيُّ قَالَ: لَقِيتُ ثَوْبَانَ مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقُلْتُ: أَخْبِرْنِى بِعَمَلٍ أَعْمَلُهُ يُدْخِلُنِى اللَّهُ بِهِ الْجَنَّةَ، أَوْ قَالَ قُلْتُ: بِأَحَبِّ الأَعْمَالِ إِلَى اللَّهِ، فَسَكَتَ، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَسَكَتَ، ثُمَّ سَأَلْتُهُ الثَّالِثَةَ، فَقَالَ: سَأَلْتُ عَنْ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: « عَلَيْكَ بِكَثْرَةِ السُّجُودِ لِلَّهِ، فَإِنَّكَ لاَ تَسْجُدُ لِلَّهِ سَجْدَةً إِلاَّ رَفَعَكَ اللَّهُ بِهَا دَرَجَةً وَحَطَّ عَنْكَ بِهَا خَطِيئَةً ». قَالَ مَعْدَانُ: ثُمَّ لَقِيتُ أَبَا الدَّرْدَاءِ فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ لِى مِثْلَ مَا قَالَ لِى ثَوْبَانُ. {الحديث/١٠٩٣ = ١٠٩٧ فَتْحُ الْمُلْهِمِ}:

مەعدانی کوڕی ئەبو طەلحەی یەعمەری فەرمووی: گەیشتم بە ئەوبان، کە بەندەی ئازادکراوی پێغەمبەر بوو، عەرزیم کرد: قوربان! کارێکی باشی وام پێ بفەرموو، کە بیکەم خودای گەورە بەهۆیەوە بمخاتە بەهەشتەوە، یا فەرمووی: عەرزیم کرد: خۆشەویسترین کردەوە لەلای خودا چییە؟ ئەوبان بێ دەنگ بوو، دیسان جارێکی تریش هەمان پرسیارم لێی کرد، دیسان بێ دەنگ بوو، لەجاری سێهەما کە هەمان پرسیارم لێی کردەوە، فەرمووی: بۆ ئەمە پرسیارم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد، فەرمووی: (ئەوەندەی دەتوانن کوڕنووشی زۆر بەرن بۆ خودای گەورە، چونکە تۆ هەموو جارێ کە سوژدەیێ دەبەی بۆ خودا، مسۆگەر کە

بەهۆی ئەو سوژدەیەوە، خودا پلەیێ بەرزت دەکاتەوە، وە گوناهێکت پێی لێ هەڵ دەوەرێنێ). مەعدان فەرمووی: لەدواتریش بە خزمەتی ئەبو دەرداء گەیشتم، هەمان پرسیارم لێی کرد، ئەویش فەرمایشتەکەی ثەوبانی پێم فەرموو).

**روونکردنەوە:**

ثەوبانی کوڕی بوجدود یەکێکە لە هاوڕێ ناودارەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆیلە بوو، پێغەمبەر کڕیو ئازادی کرد، لەبەرئەوە ناسراوە بە (ثەوبانی مەولای رەسولوڵلا = ثەوبانی ئازاد کراوی پێغەمبەری خودا) هەتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ژیاندا مابوو، ثەوبان خزمەتی دەکرد، لەپێشا خەڵکی (السَّراة) بوو، کە شوێنێکە لەنێوانی مەککەو یەمەندا، لەپاش مەرگی پێغەمبەر چوو بۆ شام، لە رەملە جێگیر بوو، لەپاشا چوو بۆ حومص، لەوێ خانوویەکی بۆ خۆی دروست کردو لەوێ ما هەتا لەساڵی (٥٤)ی کۆچیدا ئەمری هەقی بەجێ هێناو، بە مەرگی خودا مرد.

ثەوبان دەفەرموێ: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نزای دەکرد بۆ ئەهلو بەیتی خۆی، منیش عەرزیم کرد: من لە ئەهلو بەیتم یانا، لەسەری جاری سێیەما کە لێم پرسی، فەرمووی: (بەڵێ تۆ لە ئالو بەیتی منیت، بەمەرجێ نەچیتە بەردەرگای دەسەڵاتدارانو داوای شت لە میرو کاربەدەستان نەکەیت). لەبەرئەوە ثەوبان هەتا ما، هەرگیز داوای شتی لەکەس نەدەکرد، ثەوبان زانستو فەرموودەی زۆر جوانی لە پێغەمبەر وەرگرتو رایگەیاندن بەچینی پاش خۆی زۆر بەجوانی (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ).

## ١٩٧) نزاو پاڕانەوە لە کوڕنووشدا. (١٠٨٣ - ١٠٩٢).

## باب: الدُّعاءُ فِي السُّجُودِ

٢٩٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الْعَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وَهُوَ سَاجِدٌ، فَأَكْثِرُوا الدُّعَاءَ». {الحديث/١٠٨٣ = ١٠٦٩ فَتْحُ الْمُلْهِمِ}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (درووودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ:** (هیچ کاتێ وەك کاتی ناو سوژدە، بەندە لە رەحمەتی خوداوە نزیك نابێتەوە، کەواتە لەوکاتەدا دوعاو نزا زۆر بکەن، جێگەی خۆیەتی کە پاڕانەوەکەتان قەبووڵ بکرێ). {تاج/١، زنجیرە: ٨٦، ژمارە: ٥٤٠}.

## ١٩٨) نوێژ خوێن لەسەر چەند ئەندام سوژدە دەبا. (١٠٩٥ - ١١٠١).
## بابُ: عَلَى كَمْ يَسْجُدُ

٢٩٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ: الْجَبْهَةِ (وَأَشَارَ بِيَدِهِ عَلَى أَنْفِهِ) وَالْيَدَيْنِ وَالرِّجْلَيْنِ، وَأَطْرَافِ الْقَدَمَيْنِ، وَلاَ نَكْفِتَ الثِّيَابَ وَلاَ الشَّعْرَ». {الحديث/١٠٩٨ = ١٠٨٤ فَتْحُ الْمُلْهِمِ. تجريد البخاری/١/٤٢١ رقم: ٤٣٨ = ٨١٢ فتح الباری}:

**ئیبنو عەبباس** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درووودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:** (خودای گەورە فەرمانی پێم کردووە کە لەسەر ئەم حەوت ئێسکە کوڕنووش ببەم: لەسەر تەوێڵو هەردوو بەری دەستو هەردوو ئەژنۆو لەسەر نووکی هەردوو پێ!).

بە دەستیشی حەزرەت (درووودی خودای لەسەر بێ) ئاماژەی کرد بۆئەوە کە لووتیش، بۆ مەبەستی کوڕنووش لەسەر بردن، بەشێکە لە تەوێڵ. وە فەرمووشی: (هەروا فەرمانم پێ کراوە، کە لەناو نوێژا، جلو بەرگیش کۆنەکەینەوە، وەك هەڵکردنی چاکی کەواو بەستنی فەقیانەو شتی وا، وە قژە سەریش خڕ هەڵ نەدەین).

## ١٩٩) ڕێكوپێكی لە کوڕنووشاو بەرزکردنەوەی هەردوو ئانیشك. (١١٠٢ - ١١٠٤).
## باب: الإعتدال في السُّجُودِ وَرَفْعُ المِرْفَقَيْنِ

٣٠٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «اعْتَدِلُوا فِي السُّجُودِ، وَلاَ يَبْسُطْ أَحَدُكُمْ ذِرَاعَيْهِ انْبِسَاطَ الْكَلْبِ». {الحديث/١١٠٢ = ١٠٨٨ فَتْحُ الْمُلْهِمِ. تجريد البخاری/١/٣١٩ رقم: ٣١٤ = ٥٣٢ فتح الباری}:

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەناو کوڕنووشا ڕێکوپێك بن، لەناو کوڕنووشیشدا، لە چەشنی سەگ کە لەسەردەمی ڕابکشێ، ئاوا باڵتان لەسەر زەوییەکە ڕامەخەن).

**٢٠٠) باڵ بلاوکردنەوە لە کوڕنووشا.** (١١٠٥ - ١١١٠).

**باب: التَّجْنِيحُ فِي السُّجُود**

٣٠١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَالِكٍ ابْنِ بُحَيْنَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ إِذَا صَلَّى، فَرَّجَ بَيْنَ يَدَيْهِ حَتَّى يَبْدُوَ بَيَاضُ إِبْطَيْهِ). {الحديث/١١٠٥ = ١٠٩٠ فَتْحُ الْمُلْهِمِ. تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري بالكوردي/١/٢٦٠، رقم: ٢٤٨ = ٣٩٠، ٨٠٧، ٣٥٦٤}:

عەبدوڵلای کوڕی مالیك، کە بەناوی دایکیشیەوە ناودەبرێو پێی دەگوترێ: ئیبنو بوحەینە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە نوێژی دەکرد، لەناو کوڕنووشدا، هەردوو باڵی خۆی بلاو دەکردەوە، تەنانەت جاروبار، ئەوەندە بلاوی دەکردنەوە، سپیدەی بنباخەڵی دەردەکەوت).

**ڕوونکردنەوە:**

١. بڕوانە فیقهی ئاسان، بەرگی یەکەم، لاپەڕە: ١٨٢ – باسی ژمارە: ٦٦، چاپی یەکەم = لاپەڕە: ٢٠٣، زنجیرە: ٦٦ چاپی دووەم.

٢. عەبدوڵلای کوڕی مالیك، یەکێکە لە هاوڕێ ناودارەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بوحەینەی دایکیشی صەحابییە بووە، دەڵێن: باوکیشی لە هاوڕێیانی پێغەمبەر بووە، لە هۆزی ئەزدە، لە مێژەوە موسوڵمان بوو بوو، پیاوێکی سۆفیلکەی خوا پەرست بوو، ئەم زاتانە فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە: ئەعرەجو حەفصی کوڕی عاصمو عەلی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی بوحەینە، لە ئاخرو ئۆخری جێنشینیی موعاوییەدا، لەکاتی فەرمانڕەوایی مەڕوان لەسەر مەدینە، لە پەنجاو شەشی کۆچیدا مردووە، یەکێکە لە پیاوانی صەحیحەین.

## ٢٠١) چۆنێتی دانیشتن له ته‌حیاتا.(١٣٠٧-١٣١٢).
## بابٌ: صفة الجُلُوسِ فِي الصَّلاَة

٣٠٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ (رَضِىَ اللّٰهُ عنهما) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا قَعَدَ فِى الصَّلاَةِ، جَعَلَ قَدَمَهُ الْيُسْرَى بَيْنَ فَخِذِهِ وَسَاقِهِ، وَفَرَشَ قَدَمَهُ الْيُمْنَى، وَوَضَعَ يَدَهُ الْيُسْرَى عَلَى رُكْبَتِهِ الْيُسْرَى، وَوَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُمْنَى، وَأَشَارَ بِإِصْبَعِهِ. {الحديث/١٣٠٧ = ١٢٧٤ فَتْحُ الْمُلْهِمِ} :

عه‌بدوللّای كوڕی زوبه‌یر (ره‌زای خودا له‌ خۆی‌و باوكی) فه‌رمووی: ده‌ستووری پێغه‌مبه‌ر (درودی خودای له‌سه‌ر بێ) وابوو كاتێ له‌ نوێژدا، داده‌نیشت بۆ خوێندنی ته‌حیات، جاروبار ئاوا داده‌نیشت، بۆ به‌یانی جه‌واز:

پێی چه‌پی له‌ به‌ینی رانی‌و له‌ به‌ینی لاقیدا داده‌نا، وه‌ قاچی راستی راده‌خست، له‌سه‌ر شێوه‌ی ته‌وه‌رروك، وه‌ ده‌ستی چه‌پی له‌سه‌ر ئه‌ژنۆی چه‌پی داده‌نا، وه‌ ده‌ستی راستیشی له‌سه‌ر رانی راستی داده‌نا، وه‌ له‌كاتی شایه‌تمانا، كه‌ ده‌یفه‌رموو (إِلاَّ اللّه) په‌نجه‌ی شایه‌تمانی به‌رز ده‌كرده‌وه‌).

**روونكردنه‌وه‌:**

ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌ جۆره‌ كێشه‌یه‌كی واتیادا، نه‌وه‌وی (ره‌حمه‌ت‌و ره‌زای خودای لێ بێ) ئاوا چاری ئه‌و كێشه‌یه‌ ده‌كا: به‌كۆی ڕای زانایان، له‌ ته‌حیاتا، سوننه‌ته‌ پێی راست له‌سه‌ر نووكه‌كه‌ی هه‌ڵ بنرێ، نه‌وه‌ك رابخرێ، به‌ڵام پێغه‌مبه‌ر (درودی خودای له‌سه‌ر بێ) جاروبار، بۆ روونكردنه‌وه‌ی دروستبوون، قاچی راستی راده‌خست. {بڕوانه‌: تاج/١، زنجیره‌: ٨٩، ژماره‌: ٥٤٧، ٥٤٨، ٥٤٩. بڕوانه‌ ژماره‌: ٢٧٤ كه‌ له‌پێشه‌وه‌ رابورد}.

## ٢٠٢)دانیشتن له‌سه‌ر هه‌ردوو قنگه‌ پاژنه‌ی پێ.(١١٩٨).
## باب:الإِقْعَاءُ عَلَى الْقَدَمَيْن

٣٠٣- عَنْ طَاوُس قَالَ: قُلْنَا لاِبْنِ عَبَّاسٍ فِى الإِقْعَاءِ عَلَى الْقَدَمَيْنِ؟ فَقَالَ: هِىَ السُّنَّةُ، فَقُلْنَا لَهُ: إِنَّا لَنَرَاهُ جَفَاءً بِالرَّجُلِ! فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: بَلْ هِىَ سُنَّةُ نَبِيِّكَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). {الحديث/١١٩٨ = ١١٧٩ فَتْحُ الْمُلْهِمِ} :

طـاووس (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفـەرموێ: عـەرزی ئیبنـو عـەبباسمان کـرد، بڕیـاری ئیقعـاء چـییە، کــە ئەوەیــە نوێــژ خــوێن لــە دانیشــتنی وچــانی نێــوانی دوو کوڕنووشەکاندا، هەردوو قاچەکانی هەڵنێو لەسەر هەردوو قنگە پاژنەی دابنیشێ؟ فەرمووی: ئەوە سوننەتە، عەرزیمان کرد: دەی ئێمە شتی وا بـەبێ وێلیو دوور لـە شارستانێتی دەزانین! ئیبنو عەبباس فەرمووی: (نا بە پێچەوانەوە ئـەوە سـوننەتی پێغەمبەری ئێوەیە، چونکە جاروبار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئـەوەی دەکـرد، جـا یا بۆ بەیانی جەواز، یا لەبەر سکاڵاو شتی وا).

**ڕوونکردنەوە:**

دوو جۆرە (إِقْعَاء) هەیە، یەکەمیان: پێشی دەگـوترێ: عوقبـەتو شـەیتان، ئـەوە بـەم واتایـە لـە پێشـەوە لـە ژمـارە: ٢٧٣دا رابـورد، کـە ژمـارە: ١١١٠ لـە صـەحیحی موسلیمدا = ١٠٩٥ فتح الملهم.

دووەمیان: بەم واتایەیە کە لەم فەرموودەدا هاتووە:

تاووسی کوڕی کیسان، تابیعییـە، لەچینی دووەمـی موسـوڵمانانە، لـە پیـاوانی شـەش پــەڕاوە ناســراوەکانی ســوننەتە، لەچــوار عەبدوڵلاکانــەوە فــەرموودەی گێڕاوەتــەوە، هەروا لە عائیشەو ئەبو هورەیرەو زەیدی کوڕی ثابیتو کەسانی تریش، خۆی دەڵێ: بەخزمەت پەنجا کەس لە صەحابە گەیشتووم. پیاوێـکی زۆر خـوا پەرسـت بـوو، چـل حەجی کردووە، نزای گیرا بوو، ساڵی سەدو یەکی کۆچی مردووە، خۆی دەپاراسـت لـە دەرباری دەسەڵات. {بڕوانە: تەجریدی بوخاری، بەرگی یەکەم، ژمارە: ٦٦}.

### ٢٠٣) چۆنێتی تەحیات لە نوێژدا. (٨٩٤ - ٩٠٥).

### بابٌ: التَّشَهُّدُ فِي الصَّلَاةِ

٣٠٤- عَنْ حِطَّانَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الرَّقَاشِيِّ، قَـالَ: صَـلَّيْتُ مَـعَ أَبِـي مُوسَـى (رَضِـي اللهُ عَنْهُ) صَلاَةً، فَلَمَّا كَانَ عِنْدَ الْقَعْدَةِ قَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: أُقِرَّتِ الصَّلاَةُ بِالْبِرِّ وَالزَّكَـاةِ. قَـالَ: فَلَمَّا قَضَى أَبُو مُوسَى الصَّلاَةَ وَسَلَّمَ، انْصَرَفَ فَقَالَ: أَيُّكُمُ الْقَائِـلُ كَلِمَـةَ كَـذَا وَكَـذَا؟ فَـأَرَمَّ

الْقَوْمُ، ثُمَّ قَالَ: أَيُّكُم الْقَائِلُ كَلِمَةَ كَذَا وَكَذَا؟ فَأَرَمَّ الْقَوْمُ، فَقَالَ: لَعَلَّك يَا حِطَّانُ قُلْتَهَا؟ قَالَ: مَا قُلْتُهَا، وَلَقَدْ رَهِبْتُ أَنْ تَبْكَعَنِي بِهَا، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: أَنَا قُلْتُهَا، وَلَمْ أُرِدْ بِهَا إِلاَّ الْخَيْرَ، فَقَالَ أَبُو مُوسَى: مَا تَعْلَمُونَ كَيْفَ تَقُولُونَ فِي صَلاَتِكُمْ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) خَطَبَنَا، فَبَيَّنَ لَنَا سُنَّتَنَا، وَعَلَّمَنَا صَلاَتَنَا، فَقَالَ: « إِذَا صَلَّيْتُمْ فَأَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ، ثُمَّ لْيَؤُمَّكُمْ أَحَدُكُمْ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا قَالَ: (غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ) فَقُولُوا: آمِينَ، يُجِبْكُمُ اللَّهُ، فَإِذَا كَبَّرَ وَرَكَعَ، فَكَبِّرُوا وَارْكَعُوا، فَإِنَّ الإِمَامَ يَرْكَعُ قَبْلَكُمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «فَتِلْكَ بِتِلْكَ» وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ، يَسْمَعُ اللَّهُ لَكُمْ، فَإِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى قَالَ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) وَإِذَا كَبَّرَ وَسَجَدَ، فَكَبِّرُوا وَاسْجُدُوا، فَإِنَّ الإِمَامَ يَسْجُدُ قَبْلَكُمْ وَيَرْفَعُ قَبْلَكُمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «فَتِلْكَ بِتِلْكَ» وَإِذَا كَانَ عِنْدَ الْقَعْدَةِ فَلْيَكُنْ مِنْ أَوَّلِ قَوْلِ أَحَدِكُمْ: التَّحِيَّاتُ الطَّيِّبَاتُ الصَّلَوَاتُ لِلَّهِ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ».

{الحديث/٩٠٢ = ٩٠١ فَتْحُ الْمُلْهِمِ} + {تجريد/١/٤٢٥، رقم: ٤٤٦ = ٨٣١، ٨٣٥، ١٢٠٢، ٦٢٣٠، ٦٢٦٥، ٧٣٨١، ٦٣٢٨}:

حیطانی کوڕی عەبدوڵڵای ئەل‌ڕەقاشی، فەرمووی: جارێ لەپشتی ئەبو مووسای ئەشعەرییەوە نوێژی جەماعەتم دەکرد، کاتێ گەیشتە دانیشتنی تەحیات، پیاوێ لە نوێژ خوێنەکان لەناو تەحیاتا گوتی: نوێژ هاوتای چاکەو پاکەوەبوونە لە تاوانو، نوێژو خێرو زەکات وەك یەك فەرمان پێکراون. جا کاتێ ئەبو موسا بەر نوێژییەکەی تەواوکردو سڵاوی دایەوەو شوێن نوێژەکەی بەجێ هێشت، فەرمووی: ئەوە کامتان بوون، وشەیەکی واوای فەرموو؟ پاش نوێژەکان نقەیان نەکرد، دیسان فەرموویەوە: کێتان بوون قسەیەکی واوای گوت؟ دیسان کەسیان قسەی نەکرد. ئەبو مووسا فەرمووی: ڕەنگ بێت تۆ بیت کە ئەو گوتەیەت گوت ئەی حیطان!؟ گوتم: نەخێر من نەبووم، خۆشم هەر ترسی ئەوەم هەبوو کە تۆ بیهێنیت بەسەر منا، جا

پیاوێ لەپاش نوێژەکان گوتی: من بووم، مەبەستیشم لەم گوتەیە تەنیا باشە بوو، ئەبو مووسا فەرمووی: (خۆشتان نازانن لە نوێژەکەتانا دەڵێن چی، جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتاری دەدا بۆمان، سوننەتی دینی خۆمانی بۆ روونکردینەوە، فێری نوێژی خۆمانی کردین، فەرمووی: (کاتێ دەست دەکەن بە نوێژی جەماعەت، لەپێشا ریزەکانتان رێکخەن، وە با یەکێ لە خۆتان بەر نوێژییەکەتان بۆ بکات، جا هەرکاتێ ئەو ئەڵڵاهو ئەکبەری نوێژ دابەستنی کرد، ئێوەیش بە (الله اکبر) نوێژ دابەستن، کە پێشنوێژ گوتی: (غيرِ المغضوب عليهم وَلاَ الضَّالين) ئێوە بڵێن (ئامین) خودا وەڵامتان دەداتەوەو دووعاکەتان قەبووڵ دەکا، جا کاتێ ئەڵڵاهو ئەکبەری کردو چوو بۆ چەمینەوە، ئێوەیش ئەڵڵاهو ئەکبەر بکەنو بە شوێن ئەوا چەمینەوە ئەنجام بدەن، چونکە پێش نوێژ لەپێش ئێوەدا چەمینەوە ئەنجام دەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو تۆزە پێشکەوتنەی پێش نوێژ لە ئەڵڵاهو ئەکبەرو لە چەمینەوەدا، کە لە ئێوە پێش دەکەوێ، بەوە هەقتان بۆ دەکرێتەوە کە ئێوە تۆزێ پاش ئەو ئەڵڵاهو ئەکبەر دەکەنو پاش ئەو لە چەمینەوە بەرز دەبنەوەو بەوە یەکسان دەبنەوە).

وەکاتێ پێش نوێژ دەفەرموێ: (سَمِعَ اللّهُ لَمِنْ حَمِدَهُ) ئێوەش بڵێن: (اللّهُمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الحَمْدُ) خودا لێتان قەبووڵ دەکاو بەگوێی رەحمەتو قەبووڵ دەیبیستێ، چونکە خودای پیرۆزو گەورە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی (دروودی خودای لەسەر بێ) بڕیاری پێشینی داوە کە هەرکەسێ بەڕاستی سوپاسو ستایشی خودا بکا، خودا لێی وەردەگرێو سوپاسەکەی قەبووڵ دەکا. وەکاتێ ئەو ئەڵڵاهو ئەکبەر دەکاو کوڕنووش دەبا، ئێوەیش ئەڵڵاهو ئەکبەر بکەنو کوڕنووش ببەن، چونکە پێش نوێژ لەپێش ئێوەدا کوڕنووش دەبا، وە لەپێش ئێوەوە سەر لە کوڕنووش بەرزەوە دەکا. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەی ئەو تۆزە پێشکەوتنەی ئەو بەو تۆزە پاشکەوتنەی ئێوە یەك بەیەك دەبن).

وه فـــەرمووی: (وه کاتـــێ دادەنیشـــێ بـــۆ خوێنـــدنی تـــەحیات، لەســـەرەتای گوتەکەیەوە بڵێ: (التَّحِيَّاتُ الطَّيِّبَاتُ الصَّلَوَاتُ لِلّهِ، السَّلاَمُ عَلَيْـكَ أَيُّهَـا النَّبِـيُّ وَرَحْمَـةُ اللّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَ عَلَى عِبَادِ اللّهِ الصَّالِحِين، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلـهَ إِلاَّ اللّـهُ وَأَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ). واتە:

(هەرچی هۆی قـەدرو رێـزه، چ بـه گوفتـار، چ بـەکردار، وه هەرچـی سەرچاوەی پاکیو خاوێنیو خۆشبەختییە، چی بە گوتار یا بە کردار، یا بـه رەفتـار، وه هەرچـی نوێژو داخوازیو لالانـەوەو پاڕانـەوەو دوعـاو نزایـه، ئەمانـه هـەموویان لـه راسـتیدا، هەر شایستەن بـۆ خـودای گـەورە، درووود لەسـەر تـۆ ئـەی پێغەمبـەری خـودا! لەگـەڵ رەحمـەتو سـۆزو پیـتو فـەڕو بەرەکـەتی خـودا، درووود لەسـەر ئێمـەیشو لەسـەر هـەموو بەنـدە باشـەکانی خـودا، شـایەتی دەدەم کـه هـەر خـودا خودایـەو بـەس، وه خودای تر نییە بێجگە لەو، وه شایەتی دەدەم کە موحەممەدی کوڕی عەبـدوڵڵا هـەم بەندەی خوداو هەم پێغەمبەری خودایە). {بڕوانه: تاج/١، زنجیره: ٧٢، ژماره: ٤٨٠}.

٣٠٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) أَنَّهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) يُعَلِّمُنَا التَّشَهُّدَ كَمَا يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ فَكَانَ يَقُولُ: « التَّحِيَّاتُ الْمُبَارَكَـاتُ الصَّلَوَاتُ الطَّيِّبَاتُ لِلَّهِ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَـا النَّبِـيُّ وَرَحْمَـةُ اللَّـهِ وَبَرَكَاتُـهُ، السَّـلاَمُ عَلَيْنَـا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّـهِ». وَفِـي رِوَايَةِ ابْنِ رُمْحٍ: كَمَا يُعَلِّمُنَا الْقُرْآنَ. {الحديث/ ٩٠٠ = ٨٩٩ فَتْحُ الْمُلْهِمِ}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) چۆن فێری سوورەتەکانی قورئـانی دەکـردین، ئاوەهایش فێـری تـەحیاتی دەکـردین، گشـت جارێ دەیفەرموو: (التَّحِيَّاتُ المباركات الصَّلَوَاتُ الطَّيِّبَاتُ لِلّهِ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِـيُّ وَرَحْمَةُ اللّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَ عَلَى عِبَادِ اللّـهِ الصَّـالِحِين، أَشْـهَدُ أَنْ لا إِلـهَ إِلاَّ اللّـهُ وَأَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـداً رَسُـولُ اللهِ). لـه گێڕانـەوەی ئیبنـو رومحدا: چـۆن فێـری قورئـانی دەکردین، ئاوەهایش فێری تەحیاتی دەکردین. {تاج/١، زنجیره: ٧٢، ژماره: ٤٧٩}.

**روونكردنهوه:**

پێشەوا موسلیم (رەزاو رەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ) ئەم فەرموودەیە لە دوو مامۆستای خۆیەوە دەگێڕێتەوە: لە قوتەیبەی کوڕی سەعدو لە ئیبنو روومحەوە، هەردووکیان لە لەیثەوە، دەق (مەتن)ی فەرموودەکە، لەهەردوو مامۆستاکەی موسلیمەوە یەك شتە، تەنیا لەم وشەیەدا نەبێ، کە لەلای قوتەیبە ئاوایە: (كَمَا يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنَ القرآنِ) بەڵام لەلای ئیبنو رومح ئاوایە: (كَمَا يُعَلِّمُنَا الْقُرْآنَ).

جا ئیمامی موسلیم بۆئەوەی نەبێ بە درۆ بەدەم مامۆستاکانیەوە، ئەوەی روونکردۆتەوە.

**٢٠٤) ئەو شتانەی کە لە نوێژدا پەنا دەگیرێ بەخوا لە شەڕو لە زیانیان (١٣١٩ - ١٣٣٢) . باب: مَايُسْتَعَاذُ مِنْهُ فِي الصَّلاَةِ**

٣٠٦- عَنْ عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ أَنَّ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) زَوْجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَخْبَرَتْهُ: أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَدْعُو فِي الصَّلاَةِ: « اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ ». قَالَتْ: فَقَالَ لَهُ قَائِلٌ: مَا أَكْثَرَ مَا تَسْتَعِيذُ مِنَ الْمَغْرَمِ يَا رَسُولَ اللَّهِ! فَقَالَ: « إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا غَرِمَ حَدَّثَ فَكَذَبَ، وَوَعَدَ فَأَخْلَفَ ». {الحديث/١٣٢٥ = ١٢٩٢ فَتْحُ الْمُلْهِمِ} + {تجريد البخاري/١، ژمارە: ٤٤٧ = ٨٣٢، ٨٣٣، ٢٣٩٧، ٦٣٦٨، ٦٣٧٥، ٦٣٧٦، ٦٣٧٧، ٧١٢٩ فتح الباری}:

عوروەی کوڕی زوبەیر فەرمووی: عائیشەی پوورم کە هاوسەری پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر بێ) هەواڵی پێمدا فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، لە نوێژدا، لە کۆتایی تەحیاتدا، لەپێش سڵاودانەوەدا، دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ: خودایە! پەنا دەگرم بەتۆ لە سزای گۆڕ، پەنا دەگرم بەتۆ لە ئاژاوەو ئاشووبی جەجاڵە کوێرەی جادووگەر،

پەنادەگرم بەتۆ لە ئاژاوەی ژیانو مردن، خودایە! پەنادەگرم لە تاوانباریو لە باری نالەباری ژێرباری قەرزاری). عائیشە فەرمووی: یەکێ عەرزی کرد: قوربان! بۆ ئەوەندە دادتە لە دەست باری ژێر قەرزاریی؟ فەرمووی: (چونکە پیاو کەبوو بەژێر باری قەرزو قۆڵەوە تووشی درۆو دەلەسە دەبێ، ئەوجا بەڵێن دەداو بەڵێنەکەیشی بۆ ناچێتە سەر).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١-سزای گۆڕ ڕاستەو هەقە، بەپێی ئەم فەرموودەیە، کە بوخاریو موسلیم گێڕاویانەتەوە، ئەم قسە خۆشە بەم بۆنەیەوە لە (فَتْحُ الْمُلْهِمَ)ەوە ڕاگوێز دەکەم: موعتەزیلەکان باوەڕیان بە سزای گۆڕ نییەو ئینکاری دەکەن، جا جارێ مەلایەکی سوننی نوێژی مردوو لەسەر تەرمی کابرایەکی موعتەزیلە دەکا، لە نزاکەیدا دەڵێ: (خودایە! سزای گۆڕی پێ بچێژە، چونکە بڕوای پێی نەبوو بەدرۆی دەزانی!).

٢-بەڵگەیە لەسەر هەبوونی جەجاڵ، کە زوو یا درەنگ جەجاڵ هەڵ دەسێ.

٣-پەنا گرتن بەخودا، لەهەموو شتێکی خراپ سوننەتە، هەروا لەشتی ڕەوایش کە زوو یا درەنگ سەربکێشێ بۆ شتی خراپ سوننەتە، وەك سواڵو قەرزاری زۆر. {تاج/١/٢٩٠، زنجیرە: ٩٣، ژمارە: ٥٦٥}.

## ٢٠٥) نزاو پاڕانەوەی ناو نوێژ. (٦٨٠٢ - ٦٨٠٩).
## باب: الدُّعَاءُ فِي الصَّلاَةِ

٣٠٧- عَنْ أَبِى بَكْرٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): عَلِّمْنِي دُعَاءً أَدْعُو بِهِ فِي صَلاَتِي {وَفِي بَيْتِي}. قَالَ: « قُلِ: اللَّهُمَّ إِنِّى ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَبِيرًا {وَفِي رِوَايَةٍ: كَثِيراً} وَلاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ، وَارْحَمْنِي، إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ». {الحديث ٦٨٠٩ = ٦٨٢٥ فتح الملهم + تجريد/١/٤٢٧، رقم: ٤٤٨ = ٨٣٤، ٧٣٨٨، ٦٣٢٦ فتح الباري}.

ئەبوبەكرى صەديق (رەزاى خوداى لىٚ بىٚ) فەرمووى: بە پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بىٚ) قوربان! نزايەكم فێربكە كە لە نوێژەكەما بيكەم، لە گێڕانەوەيەكى موسليما، لە نوێژەكەماو لەماڵەوەم ئەو نزايە بخوێنم؟ فەرمووى: بلىٚ: (اللَّهُمَّ إِنِّى ظَلَمْتُ نَفْسِى ظُلْمًا كَثِيراً، وَلاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِى مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ، وَارْحَمْنِى، إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ:

خودايە! من زۆرو ستەمێكى گەلىٚ زۆرم لەخۆم كردووە، جگە لەتۆيش كەسى تر رادەى ئەوەى نييە كە لە گوناه خۆش ببىٚ، دەى بە لوتفو كەرەمى خۆت لێم خۆشبەو، سۆزو ميهرەبانيم لەگەڵ بنوێنە، بەڕاستى ئەى خودايە! هەر خۆت تاوانبەخشو بەسۆزو ميهرەبانيت). {تاج/١/٢٩١، ژمارە: ٥٦٦}.

## ٢٠٦) نەفرەت كردن لە شەيتانو پەنا گرتن بەخودا لە شەڕى شەيتان لەناو نوێژدا. (١٢٠٩ - ١٢١١).

٣٠٨- عَنْ أَبِى الدَّرْدَاءِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَمِعْنَاهُ يَقُولُ: « أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ » ثُمَّ قَالَ: « أَلْعَنُكَ بِلَعْنَةِ اللَّهِ » ثَلاَثًا، وَبَسَطَ يَدَهُ كَأَنَّهُ يَتَنَاوَلُ شَيْئًا، فَلَمَّا فَرَغَ مِنَ الصَّلاَةِ، قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ سَمِعْنَاكَ تَقُولُ فِى الصَّلاَةِ شَيْئًا لَمْ نَسْمَعْكَ تَقُولُهُ قَبْلَ ذَلِكَ؟ وَرَأَيْنَاكَ بَسَطْتَ يَدَكَ، قَالَ: « إِنَّ عَدُوَّ اللَّهِ إِبْلِيسَ جَاءَ بِشِهَابٍ مِنْ نَارٍ لِيَجْعَلَهُ فِى وَجْهِى، فَقُلْتُ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ، ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ قُلْتُ: أَلْعَنُكَ بِلَعْنَةِ اللَّهِ التَّامَّةِ فَلَمْ يَسْتَأْخِرْ، ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ أَرَدْتُ أَخْذَهُ، وَاللَّهِ لَوْلاَ دَعْوَةُ أَخِينَا سُلَيْمَانَ، لأَصْبَحَ مُوثَقًا يَلْعَبُ بِهِ وِلْدَانُ أَهْلِ الْمَدِينَةِ ». {الحديث/١٢١١ = ١١٨٧ فَتْحُ الْمُلْهِم} + {تجريد/١/٢٨٩، رقم: ٢٨٢ = ٤٦١، ١٢١٠، ٣٢٨٤، ٣٤٢٣، ٤٨٠٨ فتح البارى}:

ئەبو دەرداء (رەزاى خوداى لەسەر بىٚ) فەرمووى: جارىٚ پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بىٚ) شەو نوێژى دەكرد، لەناو نوێژەكەيدا، گوێمان لێى بوو دەيفەرموو: (پەنا دەگرم بەخودا لەتۆ) سىٚجار ئەم وشەيەى دووبارە كردەوە، ئەوجا سىٚ جاريش فەرمووى: (نەفرينت لىٚ دەكەم بە نەفرينى تەواوى خودا). وە بينيمان دەستى درێژكرد بۆ شتێكى دوور، وەك بيگرىٚو بيهێنىٚ وابوو. جا كاتىٚ لە نوێژەكە بوويەوە، عەرزيمان

کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! لەم نوێژەتدا گوێمان لێت بوو، شتێکت فەرموو، لەمەو پێش شتی وامان لێت نەبیستووە؟ وە هەروەها چاومان لێت بوو کە دەستت درێژ کرد بۆ شتێ وەك بتەوێ بیگری وابوو؟

فەرمووی: (ئەوە ئیبلیسی دوژمنی خودایە پەلاماری دام دەیویست نوێژەکەم پێ ببڕێ، سەرە بزووتکێ ئاگری پێ بوو، دەیویست بینێ بە دەمو چاومەوە، ئەوەبوو منیش سێجار گوتم: پەنا دەگرم بەخودا لە شەڕی تۆ، کەچی تەسی نەکردو نەڕۆیشتە دواوە، ئەوەبوو سێجاریش گوتم: بە نەفرینی تەواوی خودا نەفرینت لێ دەکەم، کەچی دیسان ترۆ نەبوو، وە نەڕۆیشتە دواوە. ئیتر منیش ویستم بیگرمو بیبەستمەوە، بەڵام کە نزاو داواکەی سولەیمان پێغەمبەری برامانم یادکرد، ئیتر ترۆو خوێڕیم کرد، دەنا ئەو نەفرەت لێکراوەم دەبەستەوە بەیەکێ لە کۆڵەکەکانی مزگەوتەوە، منالانی مەدینە بۆ بەیانی گەمەیان پێ دەکرد، چونکە بە پێی نزاو داواکەی سولەیمان بەس بۆ ئەو دەست دەدا کە شەیتانەکان یەخسیرو دەسگیرو کۆتو زنجیر بکات.

مەبەست ئەو داواو فەرمایشتەی سولەیمانە، کە قورئان بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: {قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مُلْكًا لَّا يَنبَغِي لِأَحَدٍ مِّنْ بَعْدِي} واتە: ئەی پەروەردگاری نازدارم! موڵكو دەسەڵاتو سامانێکی وام پێ ببەخشە، کە لەپاش من بۆکەسی تر دەست نەدا). {تاج/١/٣٦٠، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٧٢٠}.

**روونکردنەوە:**

١. ئەبو دەرداء (رەزای خودای لێ بێ) ناوی عوومیمرە، ئەنصارییە، خەزرەجییە، لە پیاوانی صەحیحەینە، ئەبو دەرداء لە رۆژی غەزای بەدردا ئیسلام بووە، لەچاو خزمانی خۆیدا، کەمێ درەنگ موسوڵمان بوو، بەڵام موسوڵمانێکی زۆر جوانی لێ دەرچوو، لەگەڵ ئەوەدا پیاوێکی شەرع زانی هۆشیاری داناو زانا بوو، دەگێڕنەوە: پێغەمبەر لە پەسنو مەتحی ئەبو دەرداءدا فەرموویەتی: (ئەبو دەرداء داناو هۆشمەندی نەتەوە -ئۆمەت-ی منە). ئامادەی جەنگی ئوحود بووە، نەبەردێکی

جوانی نواندووە لەم جەنگەدا، ئامادەی هەموو جەنگ‌و غەزاکانی پاش غەزای ئوحود بووە، دووژنی هەبووە، هەردووکیان ناسراون بە ئوم دەرداء، گەورەکەیان صەحابە بووە، ئوم دەردای بچکۆڵە تابیعی بووە، کاتێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پەیمانی برایەتی بەست لەنێوانی موسوڵماناندا، برایەتی بەست لە نێوانی ئەبو دەرداءو سەلمانی فارسیدا. مەسرووق دەفەرموێ: (روو بەروو گەڵێ گوفتوگۆم لەگەڵ هاوەڵانی موحەممەددا کردووە، سەرنجم داوە، زانستەکەیان هەموو لەلای ئەم شەش کەسەیان کۆوە بووە: عومەرو عەلی‌و عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودو موعازو ئەبو دەرداءو زەیدی کوڕی ثابیت (ڕەزای خودایان لێ بێ) ئەبو زەڕ بە ئەبو دەردائی دەفەرموو: (لەسەر ڕووی زەوی لەتۆ زاناتری تیا نییە ئەی ئەبو دەرداء!) لەسەردەمی جێنشینی عوثماندا، بە دوو ساڵ لەپێش شەهید بوونی عوثماندا، ئەبو دەرداء مردووە (ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لە هەموویان بێ). {بڕوانە: تەجرید/٢، لاپەڕە: ٢٨٣، ژمارە: ٨٩٧}.

٢. بۆ تەحەددوث بە نیعمەتی خودا ئەمەتان عەرز دەکەم، هەتا وشە بە وشە دڵنیابن لەم وەرگێڕاوە کوردییە، بۆ فامی تەواوی ئەم فەرموودەیە، بەهرەی تەواوم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە:

١- شەرحی نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیم.
٢- فتح الملهم شەرحی صەحیحی موسلیم.
٣- فەتحولباری‌و تەجریدی بوخاری.
٤- تاجول ئوصوڵ‌و زۆر لە تەفسیرەکان‌و شەرحی ترو إصابەو إستیعاب.

## ٢٠٧) ناردنی دروودو سەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ). (٩٠٦ - ٩١١).

٣٠٩- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَنَحْنُ فِي مَجْلِسِ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ، فَقَالَ لَهُ بَشِيرُ بْنُ سَعْدٍ: أَمَرَنَا اللَّهُ (عَزَّ وَجَلَّ) أَنْ نُصَلِّيَ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَكَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ قَالَ: فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ) حَتَّى تَمَنَّيْنَا أَنَّهُ لَمْ يَسْأَلْهُ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «(قُولُوا: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ فِي الْعَالَمِينَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، وَالسَّلاَمُ كَمَا قَدْ عَلِمْتُمْ». {الحديث/٩٠٦ = ٩٠٤ فَتْحُ الْمُلْهِمِ}:

ئەبو مەسعوودی بەدری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەدیوە خانەکەی سەعدی کوڕی عوبادە، لەلای دانیشتبووین، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆلامان، بەشیری کوڕی سەعد پێی فەرموو: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! خودای گەورەو سەروەر فەرمانی پێمان کردووە کە صەڵاوات لەسەر تۆ بدەین، لەم ئایەتەدا پێمان دەفەرموێ: {یَا أَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَیْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِیمًا – الأحزاب/٥٦}. باشە چۆن چۆنی صەڵاواتت لەسەر بدەین؟

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) تاوێ مات بوو، بێ دەنگیەکەی وا درێژەی کێشا، تەنانەت گوتمان: خۆزگە ئەم پرسیارەی لێ نەدەکرد، نەبادا لەو جۆرە پرسیارانە بێ، کە لەم ئایەتەدا نەهیان لێ کراوە: {لاَ تَسْأَلُواْ عَنْ أَشْيَاء إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ – مائدة/١٠١}.

جا لەپاش ماوەیێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) سرووشی بۆ هاتو فەرمووی: (بڵێن: أللُّهُمَّ صَلِّ عَلَى محمد...) هەتا (....إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ). ئینجا فەرمووی: (ئەمە یەکێکە لەشێوە نایابەکانی سەڵاواتدان لەسەر من، لەکۆتایی تەحیاتا، وە شێوەی سڵاو کردنیش لەمن، وەك لە تەحیاتا فێرکراون ئاوایە: بڵێن: (السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللّهِ وَبَرَكَاتُهُ). {ریاض/٢٧٣/٣، ژمارە: ١٤٠٦}.

**ڕوونکردنەوە:**

١ -لە هەندێ گێڕانەوەدا، کە لە فتح الملهمدا، ئاماژەی بۆ دەکا، دەفەرموێ: (فَسَكَتَ حَتَّى جَاءَهُ الوَحْيُ).

٢ -ئەم فەرموودەیە لەشەرحی صەحیحی موسلیمدا، ئیمامی نەوەوی لەژێر ئەم سەر باسەدا دایناوە: (باب: الصَّلاَةُ عَلَى النبيّ صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْدَ التشهُّدِ).

٣-بەپێی شەرحە گەورەکانی ئەم فەرموودەیە، مەبەست لەم فەرموودەیە، بەم تەرجەمەیە، تەواو روون دەبێتەوە، وە ئەوەیش مەبەستی سەرەکی ئێمەیە، کە بەباشی لە مەبەستو ناوەڕۆکی فەرموودەکان تێ بگەین.

**٢٠٨) چۆنێتی سڵاودانەوەی نوێژ.** (١٣١٥ - ١٣١٥).

**بَابٌ: التَّسْلِيم فِي الصَّلَاةِ**

٣١٠- عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كُنْتُ أَرَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ يَسَارِهِ حَتَّى أَرَى بَيَاضَ خَدِّهِ). {الحديث/١٣١٥ = ١٢٨٢ فَتْحُ الْمُلْهِمِ}:

عامیری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص (ڕەزای خودایان لێ بێ) لە باوکیەوە دەفەرموێ: زۆر جاران بەچاوی خۆم خۆشەویستم دەدی (دروودی خودای لەسەر بێ)، لەپێشا بەلای راستیا سڵاوی دەدایەوەو دەیفەرموو: (السلام عليكم ورَحمة الله) ئەوجا بەلای چەپیا سڵاوی دەدایەوەو دەیفەرموو: (السَّلاَمُ عليكُمْ ورَحمةُ اللّهِ). تەنانەت وا بەباشی لەکاتی سڵاو دانەوەکەدا لای دەکردەوە بەلای راستو بەلای چەپیا، هەموو جارێ سپیدەی سەر کوڵمەکانیم دەبینی.

**روونکردنەوە:**

سەعد لە عەشەرەی موبەششەرەیە، واتە: لەو دە کەسەیە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مژدەی بەهەشتی پێیان داوە، لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکانە، لە تەمەنی چواردە ساڵی دا ئیسلام بووە، ئامادەی جەنگی بەدر بووە، هەروا ئامادەی غەزاکانی تری پاش بەدر بووە، نزای گیرا بوو، یەکەم کەس بوو کە یەکەم تیری لە رێگەی خودادا هاویشت، لە کۆچەرە هەرە پێشینەکان بوو، دوو سەدو حەفتا فەرموودەی لە پەڕاوە ناودارەکانی سوننەتدا هەیە، لە بوخاری پیرۆزدا بیست فەرموودەی هەیە، لە موسلیمدا بیستو سێی هەیە، یازدەیان پەسەندی هەردوو پیرە، کۆی فەرموودەکانی لە صەحیحەیندا = ١١ + ٩ + ١٢ = ٣٢ فەرموودە،

لەسەردەمی ئیمامی عومەردا، لەسەر دەستی سەعددا مەدائین ئازادکرا، سەعد کووفەی دروست کرد، عومەر کردی بە فەرمانداری سەر وڵاتی عێراق، لە پەنجاو حەوتی کۆچیدا مردووە، لە بەقیع بەخاك سپێردراوە، دواترین کەسە لە عەشەرەی موبەششەرە کە مردووە. (تاج/٥، لاپەڕە: ٨٦، چاپی/١، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٣٣٢٦ هەتا ٣٣٣١) لەم شوێنەدا لە تاجول ئوصولدا، مەناقبی سەعد نووسراوە.

**٢٠٩) لەکاتی سڵاودانەوەدا ئاماژەکردن بەدەست ناباش و ناپەسەندە.**(٩٦٧ - ٩٧٠).

**بابُ: كَرَاهَةُ أنْ يُشِيرَ بِيَدِهِ إذَا سَلَّمَ مِنَ الصَّلَاةِ**

٣١١- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا إِذَا صَلَّيْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قُلْنَا: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، وَأَشَارَ بِيَدِهِ إِلَى الْجَانِبَيْنِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « عَلاَمَ تُومِئُونَ بِأَيْدِيكُمْ؟» وَفِي رِوَايَةٍ: « مَالِي أَرَاكُمْ رَافِعِي أَيْدِيكُمْ كَأَنَّهَا أَذْنَابُ خَيْلٍ شُمُسٍ؟ إِنَّمَا يَكْفِي أَحَدَكُمْ أَنْ يَضَعَ يَدَهُ عَلَى فَخِذِهِ، ثُمَّ يُسَلِّمُ عَلَى أَخِيهِ مَنْ عَلَى يَمِينِهِ وَشِمَالِهِ». {الحديث/٩٦٩ = ٩٦٦ فَتْحُ الْمُلْهِمِ}:

جابیری کوڕی سەموورە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: جاران کە بەکۆمەڵ نوێژمان لەپشتی پێغەمبەرەوە دەکرد، کاتێ سڵاومان دەدایەوە بەلای ڕاستا دەمانگوت: (السَّلاَمُ عليكُمْ وَرَحمةُ اللّهِ) و بە دەستیش ئاماژەمان دەکردو دەستمان هەڵ دەبڕی وەك کاتی سڵاوکردن بەدەست، وە بەلای چەپیشا هەروا: دەمانگوت: (السَّلاَمُ عليكُمْ وَرَحمةُ اللّهِ) وە بەهەمان شێوە بە دەستیش ئاماژەمان دەکرد.

هەتا جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوە ئەو ئاماژەیە چییە کە دەیکەن؟ ئەوە چیتانە کەوا دەستتان دەڵێی کلکی ماینی چەمووشە، بەملاو لادا رایدەوەشێنن و ئاماژەی پێ دەکەن؟ شتی وا مەکەن بەڵام دەستتان بە ئاسایی لەسەر رانتان دانێن و بەلای ڕاستا سڵاو لە براکانتان بکەن، هەروەها بەلای چەپیشا سڵاویان لێ بکەن). {تاج/١/٢٩٩، چاپی/١، ژمارە: ٥٨٢}.

## ٢١٠) ويردی پاش سڵاو دانەوەی نوێژ. (١٣٣٣ - ١٣٥٢).
## باب: مَا يُقَال بَعْدَ التّسْلِيم مِنَ الصّلاَة

٣١٢- عَنْ وَرَّادٍ مَوْلَى الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ: كَتَبَ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ إِلَى مُعَاوِيَةَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ إِذَا فَرَغَ مِنَ الصَّلاَةِ وَسَلَّمَ، قَالَ: « لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهْوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ». {الحديث/ ١٣٣٧ = ١٣٠٥ ف.م = فتح الملهم. تجريد/١/٤٣١، رقم: ٤٥٤ = ٨٤٤، ١٤٧٧، ٢٤٠٨، ٥٩٧٥، ٦٣٣٠، ٦٤٧٣، ٦٦١٥، ٧٢٩٢ = فتح الباری} :

وەڕادی نۆکەری موغیرەی کوڕی شوعبە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: موغیرە نامەی نووسی بۆ موعاوییە، لەسەر داوای موعاوییە خۆی، لەوکاتەدا کە موعاوییە فەرمانڕەوای موسوڵمانان بوو، موغیرەیش میری سەر کووفە بوو لەلایەن موعاوییەوە کرابوو، بە کارمەندی سەر کووفە، موغیرە دەیگوتو من دەمنووسی. بۆی نووسی: جاران کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە نوێژ دەبۆوەو سڵاوی دەدایەوە، ئەم ویردەی دەخوێند: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهْوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ:

واتە: تەنها خودا خودایەو بەس، خودای تر نییە بێجگە لەو، خوایەکی تاکو تەنهایە، بێ هاوەڵە، هیچ هاوبەشی نییە، موڵکو دارایىو دەسەڵات هەمووی لە راستیدا هەر بۆ ئەوە، سوپاسو ستایش هەر بۆ ئەوە، توانای هەموو شتێکی هەیە، ئەی پەروەردگارم! ئەوەی کە تۆ بیدەی بەکەس نابڕرێت، هەرچیش تۆ نەیدەیت بەکەس نادرێ، دارایی داراو، دەستداریی دەستدار، هیچ دادێکیان نادەن لەلای تۆ، تەنیا سۆزو میهری تۆ فریای بەندە دەکەوێو بەس). {تاج/١، ٣١٧،چاپی/١،زنجیرە:١٠٨،ژمارە:٦٢٦} .

**٢١١) ئەڵڵاهو ئەكبەر كردن لەپاش تەواو بوونی نوێژ. (١٣١٦ - ١٣١٨).**

**باب: التكبير بَعْدَ الصَّلاَة**

٣١٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِىَ اللّهُ عنهما) قَالَ: كُنَّا نَعْرِفُ انْقِضَاءَ صَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ بِالتَّكْبِيرِ. {الحديث/١٣١٦ = ١٢٨٣ فَتْحُ الْمُلْهِمِ = ف.م = مختصر صحيح البخاری/١/٤٢٩، رقم:٤٥٢ = ٨٤١، ٨٤٢}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جاران بەوە دەمانزانی کە نوێژەکەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) تەواو بووە، لەپاش سڵاودانەوە بە دەنگی بەرز ئەڵڵاهو ئەکبەرو یادو زیکری خودای دەکرد).

**روونکردنەوە:**

لە فەتحولمولهیمدا، لە (المشكاة)ەوە راگوێز دەکا، مەبەست لەم زیکرە ئەوەیە کەوا لەم فەرموودەی موسلیمدا: کە دەفەرموێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەپاش هەموو نوێژێ کە سڵاوی دەدایەوە بە ئەوپەڕی دەنگی بەرز دەیفەرموو: « لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ، لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَلاَ نَعْبُدُ إِلاَّ إِيَّاهُ، لَهُ النِّعْمَةُ وَلَهُ الْفَضْلُ، وَلَهُ الثَّنَاءُ الْحَسَنُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ». {بڕوانە: رقم: ١٣٤٢ صحيح مسلم بشرح النووي تخريج الشيخ خليل مأمون شيحا فەرموودەی ژمارە: ١٢٨٥ فتح الملهم}.

**٢١٢) کردنی (سبحان الله)و (الحمد لله)و (الله اكبر) لەپاش نوێژ. (١٣٣٣ - ١٣٥٢).**

٣١٤- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ سَبَّحَ اللَّهَ فِى دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَحَمِدَ اللَّهَ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَكَبَّرَ اللَّهَ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، فَتِلْكَ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ، وَقَالَ تَمَامَ الْمِائَةِ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ، غُفِرَتْ خَطَايَاهُ، وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ».
{الحديث/١٣٥١ = ١٣١٩ فَتْحُ الْمُلْهِمِ}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ (لەپاش هەموو نوێژێ) سیی‌و سێجار (سبحان الله)بکا، وە سیی‌و سێجار (الحمد لِلّه) بکا، وە سیی‌و سێجار (الله اکبر) بکا، کە ئەمە هەمووی دەکاتە نەوەدو نۆجار، وە لەسەری جاری سەدهەما بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ). هەرکەسێ لەپاش هەموو نوێژێ ئەمە بکا، خودا لەهەموو تاوانەکانی خۆش دەبێ، ئەگەرچی تاوانەکانی وەك کەفی دەریاش زۆربن). {تاج/١، زنجیرە: ١٠٨، ژمارە: ٦٢٨ - ش}.

## ٢١٣) بەجێهێشتنی جێ نوێژ لەلای راستەوە یا لەلای چەپەوە. (١٦٣٦ - ١٦٣٩).

## باب: الانصراف مِنَ الصَّلاَةِ عَنِ الْيَمِينِ وَالشِّمَالِ

٣١٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لاَ يَجْعَلَنَّ أَحَدُكُمْ لِلشَّيْطَانِ مِنْ نَفْسِهِ جُزْءًا لاَ يَرَى إِلاَّ أَنَّ حَقًّا عَلَيْهِ أَنْ لاَ يَنْصَرِفَ إِلاَّ عَنْ يَمِينِهِ، أَكْثَرُ مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَنْصَرِفُ عَنْ شِمَالِهِ). {الحديث/١٦٣٦ = ١٦٠٢ فَتْحُ الْمُلْهِمِ} + {تجريد/١/٤٣٥، رقم: ٤٥٨ = ٨٥٢ فتح الباری}:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کەستان کارێکی وامەکەن، کە بەشی شەیتان بکەوێتە نوێژەکەیەوە، بەهۆی ئەوەوە کەوا بزانێ دەبێ هەر لەلای راستەوە لەنوێژ دەرچێ، چونکە من بەچاوی خۆم دیومە کە زۆرجار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای چەپیەوە لە نوێژ دەرچووەو جێ نوێژەکەی بەجێ هێشتووە). {تاج/١/٤٠٣، زنجیرە: ١٣٦، چاپی/١، ژمارە: ٨٠٦، ٨٠٧، ٨٠٨}.

**روونکردنەوە:**

١. شەرحەکان دەفەرموون: واباشە کارەکەی لەکوێوە بوو لەو لایەوە دەرچێ، وە دەرچوون لەلای راستەوە، یا لەلای چەپەوە ناپەسەندی‌و ناباشیی نییە، بەڵام ئەگەر هەردوولا یەکسان بوون، دەرچوون لەلای راستەوە خێرترە.

٢. جاری وا هەیە جێگەو رێگە رۆڵ دەبینن‌و رۆیشتن لە لایەکەوە ناچارییە.

## ٢١٤) كێ له پێشتره بۆ پێش نوێژیی. (١٥٢٧ - ١٥٣٧).
## باب: مَنْ أَحَقُّ بِالإِمَامَةِ

٣١٦- عَنْ أَبِى مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « يَؤُمُّ الْقَوْمَ أَقْرَؤُهُمْ، لِكِتَابِ اللَّهِ، فَإِنْ كَانُوا فِى الْقِرَاءَةِ سَوَاءً، فَأَعْلَمُهُمْ بِالسُّنَّةِ، فَإِنْ كَانُوا فِى السُّنَّةِ سَوَاءً، فَأَقْدَمُهُمْ هِجْرَةً، فَإِنْ كَانُوا فِى الْهِجْرَةِ سَوَاءً، فَأَقْدَمُهُمْ سِلْمًا، وَلاَ يَؤُمَّنَّ الرَّجُلُ الرَّجُلَ فِى سُلْطَانِهِ، وَلاَ يَقْعُدْ فِى بَيْتِهِ عَلَى تَكْرِمَتِهِ إِلاَّ بِإِذْنِهِ». {الحديث/١٥٣٠ = ١٤٩٩ ف.م = فَتْحُ الْمُلْهِمِ}:

ئەبو مەسعوودی ئەنصاری (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کێ قورئانی زیاتر لەبەربوو، ئەوە پێش نوێژیی بۆ کۆمەڵەکە بکا، جا ئەگەر وەك یەك قورئانیان لەبەربوو، با کامەیان باشتر شارەزای سوونەتی پێغەمبەر بوو، ئەوەیان بەر نوێژییان بۆ بکا، جا ئەگەر لەمەیشا وەك یەك بوون با کامەیان لە پێشتردا کۆچی کردووە، لەوڵاتی کوفرەوە بۆ وڵاتی ئیسلام ئەوەیان بەر نوێژییان بۆ بکا، جا ئەگەر لەوەیشا چون یەك بوون با کامەیان لە پێشتردا ئیسلام بووە ئەوەیان پێش نوێژییان بۆ بکا، وە هەموو کەسێ لە قەڵەمڕەوی خۆیدا دەبێ خۆی بەر نوێژیی بکاو، نابێ کەسی تر بەر نوێژیی بکا، مەگەر لەسەر ڕەزای ئەو، لە ماڵەوەیش لەسەر جێگەو تەختی تایبەتی یەکتریی دامەنیشن مەگەر بەرەزامەندیی خاوەنەکەی). {تاج/١/٣٨١، زنجیرە: ١٢٩}.

## ٢١٥) پەیڕەوی پێش نوێژو چاو لێکردنی. (١٠٦١ - ١٠٦٥).
## باب: إِتِّبَاعُ الإِمَامِ وَالعَمَلُ بَعْدَهُ

٣١٧- عَنْ الْبَرَاءُ (رَضِي اللهُ عَنْهُ): أَنَّهُمْ كَانُوا يُصَلُّونَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَإِذَا رَكَعَ رَكَعُوا، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ فَقَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، لَمْ نَزَلْ قِيَامًا حَتَّى نَرَاهُ قَدْ وَضَعَ وَجْهَهُ فِى الأَرْضِ ثُمَّ نَتَّبِعُهُ). {الحديث/١٠٦٤ = ١٠٥٢ فتح الملهم}:

بەراء (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووریان وابوو کە لەگەڵ پێغەمبەردا (درووودی خودای لەسەر بێ) نوێژی بە کۆمەڵمان دەکرد، کە ئەو دەچەمییەوە، خەڵکەکەیش دوا

بەدوای ئەو دەچەمینەوە، کاتێ خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) سەری لە چەمینەوە بەرز دەکردەوە، دەیفەرموو: (سَمِعَ اللّٰهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) ئیتر ئێمەیش دوا بەدوای ئەو سەرمان بەرز دەکردەوەو ڕەق ڕادەوەستاین، هەتا دەمان بینی کەوا ئەو تەوێڵی لەسەر زەوی داناوە، ئەوجا ئێمەیش پەیڕەوی ئەومان دەکردو شوێن ئەو دەکەوتین).

**٢١٦) فەرمانکراوە بە پێش نوێژەکان کە نوێژێکی کورتو پوختو ڕێكو پێك بکەن.** (١٠٤٣ - ١٠٥٥). **باب: أمرُ الأئمَّة بالتخفيف في تَمامٍ**

٣١٨- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: إِنِّي لأَتَأَخَّرُ عَنْ صَلاَةِ الصُّبْحِ مِنْ أَجْلِ فُلاَنٍ، مِمَّا يُطِيلُ بِنَا، فَمَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) غَضِبَ فِي مَوْعِظَةٍ قَطُّ أَشَدَّ مِمَّا غَضِبَ يَوْمَئِذٍ، فَقَالَ: « يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ مِنْكُمْ مُنَفِّرِينَ، فَأَيُّكُمْ أَمَّ النَّاسَ فَلْيُوجِزْ، فَإِنَّ مِنْ وَرَائِهِ الْكَبِيرَ وَالضَّعِيفَ وَذَا الْحَاجَةِ ». {الحديث/١٠٤٤ = ١٠٣٤ ف.م، تجريد/١/١٠١ رقم: ٧٨ = ٩٠، ٧٠٢، ٧٠٤، ٦١١٠، ٧١٥٩}:

ئەبو مەسعوودی ئەنصاری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! من لەبەر فیسارە کەس لە جەماعەتی نوێژی بەیانی دوا دەکەوم، چونکە ئەوەندەی درێژ دەکاتەوە بۆمان، بەهۆی قورئان خوێندنی زۆرەوە، منیش زەبوونم توانای ئەوەم نییە! ئەبو مەسعوود فەرمووی: هەرگیز لەکاتی ئامۆژگاریدا وەك ئەو ڕۆژە ئاوا پێغەمبەرم بە تووڕەیی نەبینیوە، ئینجا فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەی موسوڵمانینە! هەندێ لە ئێوە مەردوم دەڕەوێننەوەو بە نوێژی دوورو درێژ خەڵك لە مزگەوتو نوێژی جەماعەت دەتەکێننەوە، جا هەرکامێکتان پێش نوێژیی هەر نوێژێ دەکا بۆ موسوڵمانان، با نوێژێکی کورتو پوختیان بۆ بکا، چونکە ئەو خەڵکەی کەوان لە پشتیەوە هەیانە لا زەبوونە، هەیانە پیرو ئیختیارە، هەیانە زەبوونە، هەیانە ئیشو کاری تری هەیەو پەلەیەتی. بەڵام ئەگەر کەسێکتان بە تەنها خۆی نوێژی دەکرد، ئەوە چەندێ ئارەزوو دەکا، با ئەوەندە درێژی بکاتەوە).

**٢١٧) دروسته پێش نوێژ جێنشین بۆ خۆی دابنێ.** (٩٣٥ - ٩٤٧).

## باب: استخلاف الإمام إذا مرض وصلاته بالنّاس

٣١٩- عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عنها) فَقُلْتُ لَهَا: أَلاَ تُحَدِّثِينِي عَنْ مَرَضِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ قَالَتْ: بَلَى، ثَقُلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَ: أَصَلَّى النَّاسُ؟ قُلْنَا: لاَ، هُمْ يَنْتَظِرُونَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: « ضَعُوا لِي مَاءً فِي الْمِخْضَبِ، فَفَعَلْنَا، فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ ذَهَبَ لِيَنُوءَ، فَأُغْمِيَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَفَاقَ، فَقَالَ: أَصَلَّى النَّاسُ؟ قُلْنَا: لاَ، وَهُمْ يَنْتَظِرُونَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ: ضَعُوا لِي مَاءً فِي الْمِخْضَبِ، فَفَعَلْنَا، فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ ذَهَبَ لِيَنُوءَ، فَأُغْمِيَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَفَاقَ، فَقَالَ: أَصَلَّى النَّاسُ؟ قُلْنَا: لاَ، وَهُمْ يَنْتَظِرُونَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ: ضَعُوا لِي مَاءً فِي الْمِخْضَبِ، فَفَعَلْنَا، فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ ذَهَبَ لِيَنُوءَ، فَأُغْمِيَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَفَاقَ، فَقَالَ: أَصَلَّى النَّاسُ؟ فَقُلْنَا: لاَ، وَهُمْ يَنْتَظِرُونَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَتْ: وَالنَّاسُ عُكُوفٌ فِي الْمَسْجِدِ، يَنْتَظِرُونَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِصَلاَةِ الْعِشَاءِ الآخِرَةِ، قَالَتْ: فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى أَبِي بَكْرٍ أَنْ يُصَلِّيَ بِالنَّاسِ، فَأَتَاهُ الرَّسُولُ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَأْمُرُكَ أَنْ تُصَلِّيَ بِالنَّاسِ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ وَكَانَ رَجُلاً رَقِيقًا: يَا عُمَرُ صَلِّ بِالنَّاسِ، فَقَالَ عُمَرُ: أَنْتَ أَحَقُّ بِذَلِكَ. قَالَتْ: فَصَلَّى بِهِمْ أَبُو بَكْرٍ تِلْكَ الأَيَّامَ. ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَجَدَ مِنْ نَفْسِهِ خِفَّةً فَخَرَجَ بَيْنَ رَجُلَيْنِ أَحَدُهُمَا الْعَبَّاسُ، لِصَلاَةِ الظُّهْرِ، وَأَبُو بَكْرٍ يُصَلِّي بِالنَّاسِ، فَلَمَّا رَآهُ أَبُو بَكْرٍ ذَهَبَ لِيَتَأَخَّرَ، فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ لاَ يَتَأَخَّرَ، وَقَالَ لَهُمَا: أَجْلِسَانِي إِلَى جَنْبِهِ،، فَأَجْلَسَاهُ إِلَى جَنْبِ أَبِي بَكْرٍ وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ يُصَلِّي وَهُوَ قَائِمٌ بِصَلاَةِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَالنَّاسُ يُصَلُّونَ بِصَلاَةِ أَبِي بَكْرٍ، وَالنَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَاعِدٌ. قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: فَدَخَلْتُ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ فَقُلْتُ لَهُ: أَلاَ أَعْرِضُ عَلَيْكَ مَا حَدَّثَتْنِي عَائِشَةُ عَنْ مَرَضِ النبيّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ قَالَ: هَاتِ، فَعَرَضْتُ حَدِيثَهَا عَلَيْهِ، فَمَا أَنْكَرَ مِنْهُ شَيْئًا، غَيْرَ أَنَّهُ قَالَ: أَسَمَّتْ لَكَ الرَّجُلَ الَّذِي كَانَ مَعَ الْعَبَّاسِ؟ قُلْتُ: لاَ، قَالَ: هُوَ عَلِيٌّ». {الحديث/٩٣٥ = ٩٣٣ فَتْحُ الْمُلْهِمِ = تجريد البخاري/١/٣٧٦، رقم: ٣٨٦ = ٦٨٧ فتح الباري} :

عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا فەرمووی: چووم بۆ خزمەتی عائیشە، (رەزای خودای لێ بێ) عەرزیم کرد: نافەرمووی کە باسی نەخۆشییەکەی سەرە مەرگی پێغەمبەرم بۆ بکەی؟ فەرمووی: بەڵێ باشە، بەچەند رۆژێ لە پێش مەرگی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ نەخۆشینەکەی قورس بوو، جارێ موسوڵمانان لە مزگەوت کۆبوو بوونەوە، بۆ جەماعەتی نوێژی خەوتنان، حەزرەت (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی پێمان: (ئەرێ موسوڵمانەکان نوێژیان کرد؟). گوتمان: نەء، ئەی پێغەمبەری خودا! چاوەڕوانی تۆیانە کە بەر نوێژییەکەیان بۆ بکەی. فەرمووی: (لە سوێنەیەکا ئاو بکەن بەسەرما، لە حەوت کوندە کە دەمبێنەکەیان نەکرابێتەوە). عائیشە فەرمووی: ئێمەیش وامان کرد، کە خۆی شۆرد، ئەزنەکی دا هەڵسێ، بەڵام نەیتوانیو بوورایەوە، کە هۆشی هاتەوە فەرموویەوە: (ئەرێ مەردوم نوێژەکەیان کرد؟). عەرزمان کردەوە: نەء، ئەی پێغەمبەری خودا! چاوەڕوانی تۆیانە کە نوێژەکەیان بۆ بکەی. فەرموویەوە: (لە سوێنەیەکا ئاو بکەن بەسەرما). عائیشە فەرمووی: جا لەناو سوێنەکەدا دانیشت، دیسان کە خۆی شۆرد ئەزنەکی دا، ویستی هەڵسێ، بەڵام نەیتوانیو دیسانەوە بوورایەوە، لەپاش کەمێ کە هۆشی هاتەوە، هەمدیسان فەرموویەوە: (ئەرێ خەڵکەکە نوێژەکەیان کرد؟) عەرزمان کردەوە: نەء، ئەی پێغەمبەری خودا! چاوەڕوانی تۆیانە کە خۆت بەر نوێژییەکەیان بۆ بکەی. فەرموویەوە: (لە سوێنەیەکا ئاو بکەن بەسەرما) جا لەناو سوێنەکەدا دانیشت، هەمدیسانەوە کە خۆی شۆرد ئەزنەکی دایەوە، کە هەڵسێو بچێ بۆ مزگەوت، پێش نوێژییەکە بۆ خەڵکەکە بکا، بەڵام نەیتوانیو هەمدیس بوورایەوە، لەپاشتر کە هۆشی هاتەوە دیسان فەرموویەوە: (ئەرێ مەردوم نوێژیان کرد یانا؟) عەرزمان کردەوە: نەخێر هێشتا نوێژیان نەکردووە، لە مزگەوت گلێر بوونەتەوە، هەر چاوەنواڕی تۆیانە کە تەشریفت بچێ بەر نوێژییەکەی خەوتنیان بۆ بکەی.

عائیشه فەرمووی: ئینجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فروستادەیەکی نارد بۆ لای ئەبوبەکر، کە پێش نوێژیی بۆ موسوڵمانان بکا، کاتێ فروستادەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانەکەی پێغەمبەری بە ئەبوبەکر ڕاگەیاند، ئەبوبەکر پیاوێکی دڵ نەرم بوو، لەبەرئەوە بە عومەری کوڕی خەتابی فەرموو: ئەی عومەر! تۆ جەماعەتەکە بۆ موسوڵمانان بکە، عومەریش پێی فەرموو: تۆ شایانتری بۆ ئەمە جا ئەبوبەکر ئەو چەند ڕۆژە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەخۆشییەکەی گران بوو، جەماعەتی بۆ موسوڵمانان دەکرد، هەتا ڕۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەمێ لەشی سووك بوو، ڕۆیشت بۆ مزگەوت، دوو پیاو چووبوونە ژێر هەردوو باڵی، یەکێکیان عەباسی مامەی بوو، بەلارە لارە بردیان، دەڵێی ئێستایش هەروا لەبەرچاوم کە چۆن چۆنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەر ئازاری نەخۆشیەکەی هەردوو پێی بەسەر زەوییەکەدا بە خشکە بەکێش دەکرد، کاتی نوێژی نیوەڕۆ بوو، ئەبوبەکر خەریکبوو پێش نوێژی بۆ خەڵکەکە دەکرد، کاتێ ئەبوبەکر هەستی پێ کردو بینی کەوا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هێنا، ویستی جێگەکەی بۆ چۆڵ بکاو خۆی بچێتە دواوە، بەڵام حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاماژەی بۆیکرد: وەزع لەخۆت تێك مەدەو خەریکی کاری خۆت بە). وە بەدوو پیاوەکەی ژێر باڵەکانی فەرموو: (لە تەنیشتی ئەبوبەکرەوە دامنیشێنن، ئەوانیش بردیان، ڕێك لە ئاستی ئەبوبەکر، لەلای چەپیەوە، لە تەنیشتیەوە دایان نیشان، دانیشتو دەستی کرد بە نوێژ کردن، ئیتر ئەبوبەکر بۆ نوێژی خۆی پەیڕەوی پێغەمبەری دەکردو، خەڵکەکەی تریش پەیڕەوی ئەبوبەکریان دەکرد، ئەبوبەکرو خەڵکەکە بەپێوە نوێژیان دەکرد، پێغەمبەریش بە دانیشتنەوە.

عوبەیدوڵلا دەفەرموێ: چووم بۆ خزمەتی عەبدوڵلای کوڕی عەباس، پێم گوت: ئەگەر ئارەزوو دەکەی ئەو فەرموودە یەت بۆ دەوردەکەمەوە، کە عائیشە فەرمووی پێم، سەبارەت بە نەخۆشییەکەی سەرە مەرگی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)؟ فەرمووی: ئادەی فەرموو، منیش فەرموودەکەی عائیشەم بۆ دەور کردەوە،

هیچی لێ ڕەت نەکردەوە، بەڵام گوتی: ئایا ناوی پیاوەکەی تری پێ گوتیت، کە لەگەڵ عەباسی مامەی چوو بوونە ژێر باڵی؟ گوتم: نەء، فەرمووی: عەلی کوڕی ئەبو طالیب بوو (ڕەزای خودای لێ بێ). (بڕوانە: تەجرید ژمارە: ٣٨٤، ٣٨٣، ٣٧٧ + تاج/١/٤٠٦، چاپی/١، ژمارە: ٨١٤، ٨١٥، ٨١٦، زنجیرە: ١٣٨، چاپی/٢).

## ٢١٨) ئەگەر پێش نوێژ دواکەوت و نەهات، کەسێکی تر پێش دەکەوێ و بەر نوێژییەکە دەکات. (٩٤٨ - ٩٥٢).

## باب: إذا تخلَّفَ الإمامُ تقدَّمَ غيرُهُ

٣٢٠- عَنِ الْمُغِيرَةَ بْنَ شُعْبَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ): أَنَّهُ غَزَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَبُوكَ، قَالَ الْمُغِيرَةُ: فَتَبَرَّزَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قِبَلَ الْغَائِطِ، فَحَمَلْتُ مَعَهُ إِدَاوَةً قَبْلَ صَلاَةِ الْفَجْرِ، فَلَمَّا رَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَيَّ أَخَذْتُ أُهَرِيقُ عَلَى يَدَيْهِ مِنَ الإِدَاوَةِ، وَغَسَلَ يَدَيْهِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ، ثُمَّ ذَهَبَ يُخْرِجُ جُبَّتَهُ عَنْ ذِرَاعَيْهِ، فَضَاقَ كُمَّا جُبَّتِهِ، فَأَدْخَلَ يَدَيْهِ فِي الْجُبَّةِ حَتَّى أَخْرَجَ ذِرَاعَيْهِ، مِنْ أَسْفَلِ الْجُبَّةِ، وَغَسَلَ ذِرَاعَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ، ثُمَّ تَوَضَّأَ عَلَى خُفَّيْهِ ثُمَّ أَقْبَلَ، قَالَ الْمُغِيرَةُ: فَأَقْبَلْتُ مَعَهُ، حَتَّى نَجِدُ النَّاسَ قَدْ قَدَّمُوا عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ فَصَلَّى بِهِمْ، فَأَدْرَكَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِحْدَى الرَّكْعَتَيْنِ، فَصَلَّى مَعَ النَّاسِ الرَّكْعَةَ الآخِرَةَ، فَلَمَّا سَلَّمَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ، قَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُتِمُّ صَلاَتَهُ، فَأَفْزَعَ ذَلِكَ الْمُسْلِمِينَ، فَأَكْثَرُوا التَّسْبِيحَ، فَلَمَّا قَضَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَلاَتَهُ، أَقْبَلَ عَلَيْهِمْ، ثُمَّ قَالَ: « أَحْسَنْتُمْ » أَوْ قَالَ: « قَدْ أَصَبْتُمْ » يَغْبِطُهُمْ أَنْ صَلَّوُا الصَّلاَةَ لِوَقْتِهَا».
{الحديث/٩٥١ طرفه في: ٦٢٥ = ٩٤٩ فَتْحُ الْمُلْهِم = تجريد البخاری/١/١٥٨، رقم: ١٣٧ = ١٨٢، ٢٠٣، ٢٠٦، ٣٦٣، ٣٨٨، ٢٩١٨، ٤٤٢١، ٥٧٩٨، ٥٧٩٩ = فتح الباری} + {أبو داود: ١٧٩}:

موغیرەی کوڕی شوعبە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەت پێغەمبەردا چووم بۆ جەنگی تەبووك شەوێ لەپێش نوێژی بەیانیدا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لە سوپاکە دابڕاو لە ڕێگەکە لایداو وشترەکەی ییخ داو، خۆی چوو بۆ سەراو بۆ ناو

شیویْ، فەرمانی پێم کرد، بە جەوەندەییْ ئاوەوە شوێنی کەوتم، یا بە مەتارەیە ئاوەوە دوای کەوتم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمن دوور کەوتەوە، هەتا ون بوو لەبەرچاومو رۆیشتە نەدیوی، لەویْ دەستی بەئاو گەیاند، جا کە لەسەراوەکەی لیْ بۆوە، هاتەوە بۆلای من، کە ویستی دەستنوێژ بگریْ، خۆم لە مەتارەکە ئاوم کرد بە دەستەکانیا، هەردوو دەستی سێجار شۆرد، ئەوجا روخساری شۆرد، ئەوجا ویستی قۆڵی هەڵماڵیْو لەسەر قۆڵەکەیەوە دەستی دەربهێنیْ، بەلام قۆڵی جبەکە تەسك بوو، دەستی بۆ هەڵ نەماڵرا هەتا ئانیشکەکانی، جا لەبەرئەوە لەژێر جبەکەوە دەستەکانی دەرهێناو، جبەکەیدا بەسەر شانیداو، هەردوو باسکی هەتا هەردوو ئانیشکی شۆردو دەستی تەڕی هێنا بەسەر سەری خۆیداو دەستنوێژەکەی تەواوکرد، بەلام لە جیاتی شۆردنی پێیەکانی، دەستی تەڕی هێنا بەسەر هەردوو سۆلەکانیدا، ئەوجا سواری ولاخەکەی بۆوەو شوێن سوپاکە کەوتەوەو دوو بە دوو دەستمان کرد بە رۆیشتن. موغیرە فەرمووی: کاتیْ پێیان گەیشتینەوە، کە چووینەوە ناویان تەماشامان کرد: وا خەڵکەکە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفیان پێش خۆیان خستووەو عەبدورەحمان خەریکە بەر نوێژیان بۆ دەکاو رکاتێکیان تەواو کردووە، منو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فریای یەك رکات کەوتین، جا لەگەڵ ئەوانا ئەو رکاتەمان کرد، کاتیْ عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف سلاوی دایەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسا رکاتێکی تری کردو سلاوی دایەوە، منیش هەروەهام کرد.

جا موسوڵمانەکان شلەژان بەهۆی ئەوەوە کە پێش پێغەمبەر کەوتوون لە نوێژ کردنا، لەبەرئەوە دەستیان کرد بە (سُبْحَانَ اللّه) کردن، وەك باوە لەکاتی وادا سوبحانەڵلا دەکریْ. جا کاتیْ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژەکەیی تەواوکرد دەست خۆشکەری لیْ کردنو رووی تیْ کردنو دڵنیای کردن کە کارێکی باشیان کردووە، کە نوێژەکەیان لە سەرەتای کاتا کردووە، بۆیە پێی فەرموون: (ئافەریم بۆ خۆتان) یا پێی فەرموون: (پێکاوتانە). خۆزگەی ئەوەی پیْ ئەخواستن کە نوێژەکەیان لەسەرەتای کاتەوە کردووە.

**٢١٩) ئەوەی گوێی لە بانگ بێ، پێویستە لەسەری کەبێ بۆ مزگەوت.**

**باب: مَايَجِبُ فِي إِتْيَانِ الْمَسْجِدِ عَلَى مَنْ سَمِعَ النِّدَاءَ**

٣٢١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلٌ أَعْمَى، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّهُ لَيْسَ لِي قَائِدٌ يَقُودُنِي إِلَى الْمَسْجِدِ، فَسَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ يُرَخِّصَ لَهُ فَيُصَلِّيَ فِي بَيْتِهِ، فَرَخَّصَ لَهُ، فَلَمَّا وَلَّى دَعَاهُ فَقَالَ: « هَلْ تَسْمَعُ النِّدَاءَ بِالصَّلاَةِ؟» فَقَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَأَجِبْ ». {الحديث/١٤٨٤ = ١٤٥١ فَتْحُ الْمُلْهِمِ} :

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی کوێر هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! چاو ساقم نییە دەستم رابکێشێ بۆ مزگەوت، ئایا دەبێ کە لەماڵەوەم نوێژەکانم بکەم؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لە پێشەوە رێگەی دا، کە لە ماڵەوە نوێژەکانی بکا، بەلام لەپاشا کە پیاوە نابیناکە بەرەو ماڵ گەڕایەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بانگی کردەوەو پێی فەرموو: (کە بانگ دەدرێ بۆ نوێژ گوێت لێیەتی یانا؟) گوتی: بەڵێ گوێم لێیەتی، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (دەوەرە بە دەنگی بانگەکەوە). {تاج/١/١٢٣، ژمارە: ٧٥١}.

**٢٢٠) باسی خێرو گەورەیی نوێژی جەماعەت.** (١٤٧٠ - ١٤٩٣).

**باب: فِي فَضْلِ الْجَمَاعَةِ**

٣٢٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «صَلاَةُ الْجَمَاعَةِ أَفْضَلُ مِنْ صَلاَةِ أَحَدِكُمْ وَحْدَهُ بِخَمْسَةٍ وَعِشْرِينَ جُزْءًا».{الحديث/١٤٧٠=١٤٣٧ف.م} :

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نوێژی جەماعەت بە بیستو حەوت پلە گەورەترو خێرترە، لە نوێژی کەسێکتان کە هەر بە تەنها خۆی بێ!). {تاج/١، ژمارە: ٧٤٤}.

**٢٢١)نوێژی جەماعەت رێگەی رێنماییو راستییە.**

**باب: صلاة الجماعة مِنْ سُنَنِ الْهُدَى**

٣٢٣- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): لَقَدْ رَأَيْتُنَا وَمَا يَتَخَلَّفُ عَنِ الصَّلاَةِ إِلاَّ مُنَافِقٌ قَدْ عُلِمَ نِفَاقُهُ، أَوْ مَرِيضٌ. إِنْ كَانَ الْمَرِيضُ لَيَمْشِي بَيْنَ رَجُلَيْنِ حَتَّى

يَأْتِىَ الصَّلاَةَ. وَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ عَلَّمَنَا سُنَنَ الْهُدَى، وَإِنَّ مِنْ سُنَنِ الْهُدَى الصَّلاَةَ فِى الْمَسْجِدِ الَّذِى يُؤَذَّنُ فِيهِ). {الحديث/١٤٨٥ = ١٤٥٢ ف.م}:

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆمانم دیوە، کە ئێمەی هاوەڵانی موحەممەدین، (دروودی خودای لەسەر موحەممەدو ڕەزای خودا لەسەر هاوەڵانی بێ)، کەسمان لە نوێژی جەماعەت، لە مزگەوت دوا نەدەکەوتین، وە هەمووومان ئامادەی دەبووین، مەگەر کەسێ کە ناپاکێکی ئاشکرا بووبێ، یا نەخۆشێکی خاوەن مەهانەی ڕەوا بووبێ. تەنانەت نەخۆش هەبوو، دوو پیاو دەچوونە ژێر باڵەکانی، بە لارە لارە دەیانهێنا بۆ نوێژی بە کۆمەڵ بۆ مزگەوت.

وە هەروەها ئیبنو مەسعوود فەرمووی: (بێگومان کە پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) شاڕێگەکانی ڕێنماییەکانی فێر کردووین، کە یەکێ لەوانە نوێژە، کە لە مزگەوتێ بکرێ کە بانگی تیا دەدرێ). {ریاض الصالحین/٣، زنجیرە: ١٩١، ژمارە: ١٠٦٩}.

## ٢٢٢) خێری چاوەنواری نوێژو خێری نوێژی کۆمەڵ. (١٥٠٤ - ١٥٢٢).

## بابٌ: فِي إِنْتِظَارِ الصَّلاَةِ وَفَضْلِ الجَمَاعَةِ

٣٢٣-(مكرر)- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «صَلاَةُ الرَّجُلِ فِى جَمَاعَةٍ تَزِيدُ عَلَى صَلاَتِهِ فِى بَيْتِهِ، وَصَلاَتِهِ فِى سُوقِهِ بِضْعًا وَعِشْرِينَ دَرَجَةً، وَذَلِكَ أَنَّ أَحَدَهُمْ إِذَا تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ أَتَى الْمَسْجِدَ لاَ يَنْهَزُهُ إِلاَّ الصَّلاَةُ، لاَ يُرِيدُ إِلاَّ الصَّلاَةَ، فَلَمْ يَخْطُ خَطْوَةً إِلاَّ رُفِعَ لَهُ بِهَا دَرَجَةٌ، وَحُطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةٌ، حَتَّى يَدْخُلَ الْمَسْجِدَ فَإِذَا دَخَلَ الْمَسْجِدَ، كَانَ فِى الصَّلاَةِ مَا كَانَتِ الصَّلاَةُ هِىَ تَحْبِسُهُ، وَالْمَلاَئِكَةُ يُصَلُّونَ عَلَى أَحَدِكُمْ مَا دَامَ فِى مَجْلِسِهِ الَّذِى صَلَّى فِيهِ، يَقُولُونَ: اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اللَّهُمَّ تُبْ عَلَيْهِ، مَا لَمْ يُؤْذِ فِيهِ، مَا لَمْ يُحْدِثْ فِيهِ». {الحديث/١٥٠٤ = ١٤٧١ ف.م = تجريد/١/٢٩٨، رقم: ٢٩١ = ٤٧٧، ١٧٦ فتح البارى}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نوێژی کۆمەڵ کە بە کۆمەڵ دەیکەن، بیستو پێنج جار پاداشو خێری زۆرترە، لە نوێژی ماڵەوەو بازاڕ، کە مرۆڤ بە تەنیا خۆی دەیکا، ئەوەیش لەبەر ئەمەیە، چونکە

هەركاتێ یەكێ لە ئێوە، دەستنوێژێ جوان بشۆرێو بچێ بۆ مزگەوتو لەو چوونەی تەنیا مەبەستی نوێژ بێ، ئەم بەهرە گەورەیەی بۆ هەیە: هەر هەنگاوێ دەنێ خودا پلەیێ پێی بەرزی دەكاتەوەو، گوناهێكی پێی لێی هەڵ دەوەرێنێ، هەتا دەچێتە ناو مزگەوت ئەمە حاڵیەتی، كاتێكیش كە دەچێتە مزگەوت ئیتروا لەناو نوێژاو، مانەوەی لەناو مزگەوتا بە نوێژ دادەنرێ بۆی، هەتا نوێژ لەوێدا گلی بداتەوە، فریشتەیش بۆی دەپاڕێتەوەو خۆش خۆش دەڵێن: خودایە! میهری لەگەڵ بنوێنە، خودایە! لێی خۆش بە، خودایە! پەشیمانی لێ گیرا بكە، بەمەرجێ لەو شوێنەدا بمێنێ كە نوێژەكەی تیادا كردووە، بەمەرجی ئەوەیش ئازاری تیادا نەدا، بەمەرجی ئەوەیش كە دەستنوێژەكەی نەشكێ). {تاج/١/٣٧٠، زنجیرە: ١٢٢، ژمارە: ٧٤٣} .

**٢٢٣) خێری نوێژی خەوتنانو بەیانی بە كۆمەڵی** (بە جەماعەت). (١٤٩٤ - ١٤٩٦).

**باب: فَضْلُ الْعِشَاءِ وَالصُّبْحِ فِي جَمَاعَةٍ**

٣٢٤- عَنْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِى عَمْرَةَ قَالَ: دَخَلَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) الْمَسْجِدَ بَعْدَ صَلاَةِ الْمَغْرِبِ، فَقَعَدَ وَحْدَهُ، فَقَعَدْتُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: يَا ابْنَ أَخِى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «مَنْ صَلَّى صَلاَةَ الْعِشَاءَ فِى جَمَاعَةٍ، فَكَأَنَّمَا قَامَ نِصْفَ اللَّيْلِ، وَمَنْ صَلَّى الصُّبْحَ فِى جَمَاعَةٍ، فَكَأَنَّمَا صَلَّى اللَّيْلَ كُلَّهُ».{الحديث/١٤٨٩ = ١٤٥٦ ف.م} :

عەبدوڕەحمانی كوڕی ئەبو عەمرە فەرمووی: عوثمانی كوڕی عەفان (رەزای خودای لێ بێ) لەپاش نوێژی شێوان چوو لە مزگەوت بە تەنها دانیشت، منیش لەلایا دانیشتم فەرمووی پێم: ئەی برازای شیرینم! بە گوێی خۆم لە زاری پیرۆزی خۆشەویستم ژنەوت، دەیفەرموو: (هەركەسێ نوێژی خەوتنان بە كۆمەڵ (بەجەماعەت) بكا، ئەوە وەكوو ئەوە وایە كە تانیوە شەو شەو نوێژ بكا، ئەگەر ئەو كەسە نوێژی بەیانیشی بە كۆمەڵ كرد، ئەوە وەكوو ئەوە وایە كە ئەو شەوە هەتا بەیانی هەر شەو نوێژ بكا وایە). (ریاض/٣/٨٤، زنجیرە: ١٩٢، ژمارە: ١٠٧٢ — تاج/١/٣٧١، زنجیرە: ١٢٢، ژمارە: ٧٤٦) .

**٢٢٤) هەڕەشە كردنی سەخت لە نەكردنی جەماعەتی نوێژی خەوتنان، یا جەماعەتی نوێژی بەیانی.** (١٤٧٠ - ١٤٩٣).

٣٢٥- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ أَثْقَلَ صَلاَةٍ عَلَى الْمُنَافِقِينَ صَلاَةُ الْعِشَاءِ وَصَلاَةُ الْفَجْرِ وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِيهِمَا لأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا، وَلَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بِالصَّلاَةِ فَتُقَامَ، ثُمَّ آمُرَ رَجُلاً فَيُصَلِّىَ بِالنَّاسِ، ثُمَّ أَنْطَلِقَ مَعِى بِرِجَالٍ مَعَهُمْ حُزَمٌ مِنْ حَطَبٍ إِلَى قَوْمٍ لاَ يَشْهَدُونَ الصَّلاَةَ فَأُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ بِالنَّارِ». {الحديث/١٤٨٠ = ١٤٤٧ ف.م} زَادَ فِي روايةٍ: « وَلَوْ عَلِمَ أَحَدُهُمْ أَنَّهُ يَجِدُ عَظْمًا سَمِينًا لَشَهِدَهَا». يَعْنِى: صَلاَةَ الْعِشَاءِ. {الحديث/١٤٧٩ = ١٤٤٦ ف.م}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (گرانترین نوێژ لەسەر شانی ناپاكان (منافقین) نوێژی خەوتنانو نوێژی بەیانیانە، خۆزگە دەیانزانی كە ئەم دوو نوێژە چی خێرو خۆشییەكیان واتیادا، ئەو حەلە ئەگەر بە گاگۆڵكەیش بووایە دەهاتن بۆیان، بەڕاستی خەریك بووم كە فەرمان بدەم كە قامەتی نوێژ بكرێو بە پیاوێ بڵێم كە بەر نوێژییەكە بكا بۆ خەڵكەكە، وە خۆشم چەند پیاوێ بە باوشە دارەوە لەگەڵ خۆم ببەمو بڕۆم بۆ گیانی ئەو پیاوانەی كە نایەن بۆ نوێژی جەماعەت، وەماڵەكانیان بە ئاگر بەسەردا بسووتێنم). لە گێڕانەوەیەكا ئەمەی پترە: (ئەوانە ئەگەر گرتكێكی چەوریان لە مزگەوت شك ببردایە دەهاتن بۆ نوێژەكە هەتا بە بیانووی نوێژەكەوە گرتكە گۆشتەكە بخۆن). {تاج/١، ژمارە: ٧٤٩}.

٣٢٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولِ اللّه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لِقَوْمٍ يَتَخَلَّفُونَ عَنِ الْجُمُعَةِ: « لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ رَجُلاً يُصَلِّى بِالنَّاسِ ثُمَّ أُحَرِّقَ عَلَى رِجَالٍ يَتَخَلَّفُونَ عَنِ الْجُمُعَةِ بُيُوتَهُمْ». {الحديث/١٤٨٣ = ١٤٥٠ ف.م}:

عەبدوڵلای كوڕی مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە پیاو گەلێكی فەرموو، كە نەدەهاتن بۆ نوێژی هەینی: (سوێندم بەو كەسە كە گیانی منی بەدەسە، كە خوای گەورەو سەروەرە، نیازم هەبوو كە بە پیاوێ بڵێم نوێژەكە بۆ خەڵكەكە بكا، وە خۆشم بڕۆم بۆسەر ئەو پیاوانە كە لە نوێژی هەینی دوا دەكەون، خانووەكانیان بسووتێنم بەسەریانا).

## ٢٢٥) لەبەر مەهانەی ڕەوا دروستە نەچیٚ بۆ جەماعەت
## باب: الرخصة في التخلُّفِ عَنِ الجَماعَةِ بِعُذْرٍ

فەرموودەکەی عیتبانی کوڕی مالیك بۆ ئێرەیش دەست دەدا. {بڕوانە: فەرموودەی ژمارە: ١٤} کە لە پێشەوا ڕابورد.

## ٢٢٦) فەرمان کردن بە کردنی نویٚژ بەجوانی.(٩٥٥-٩٥٩).
## باب:الأمر بِتَحْسِينِ الصَّلَاةِ

٣٢٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمًا ثُمَّ انْصَرَفَ فَقَالَ: « يَا فُلاَنُ أَلاَ تُحْسِنُ صَلاَتَكَ؟ أَلاَ يَنْظُرُ الْمُصَلِّي كَيْفَ يُصَلِّي؟ فَإِنَّمَا يُصَلِّي لِنَفْسِهِ إِنِّي وَاللَّهِ لأُبْصِرُ مِنْ وَرَائِي كَمَا أُبْصِرُ مِنْ بَيْنَ يَدَيَّ». {الحديث/٩٥٦ = ٩٥٣ ف.م = فَتْحُ الْمُلْهِمِ}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: ڕۆژیٚ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) نوێژی بۆ کردین، کە نوێژەکەی تەواو کرد، بە پیاوێکی فەرموو: (ئەی فیسارە کەس! ئەوە بۆ بەجوانی نوێژەکەت ناکەی؟ ئەوە بۆچی نوێژ خوێن کاتیٚ کە نوێژ دەکا سەرنج نادا کە چۆن نوێژ دەکا، خۆ ئەو نوێژ بۆخۆی دەکا چونکە خاس‌و خراپی نوێژەکەی هەر بۆ خۆیەتی، سوێند بەخودا من چۆن لەبەردەممەوە شت دەبینم، ئاوەها لەپشتی سەریشمەوە شت دەبینم، کەواتە با ئەم بینینەی منە ببیٚ بە هاندەریٚ بۆتان، کە نوێژەکانتان بەجوانی بکەن). {تەجرید/٢٦٩/١، ژمارە: ٢٥٩ = ٤١٨، ٧٤١ + تاج/٢٨٤/١، چاپی/١، زنجیرە: ٩، ژمارە: ٥٥٢}.

## ٢٢٧) نوێژێکی مامناوەندی تەواوی ڕێك‌و پێك. (١٠٥٦ - ١٠٦٠).
## باب: فِي اعْتِدَالِ الصَّلَاةِ وَإِتْمَامِهَا

٣٢٨- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: رَمَقْتُ الصَّلاَةَ مَعَ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَوَجَدْتُ قِيَامَهُ، فَرَكْعَتَهُ، فَاعْتِدَالَهُ بَعْدَ رُكُوعِهِ، فَسَجْدَتَهُ، فَجَلْسَتَهُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ، فَسَجْدَتَهُ، فَجَلْسَتَهُ مَا بَيْنَ التَّسْلِيمِ وَالانْصِرَافِ، قَرِيبًا مِنَ السَّوَاءِ)

{الحديث/١٠٥٧ = ١٠٤٦ ف.م = فَتْحُ الْمُلْهِمِ. تجريد/١/٤٠٩، رقم: ٤٢٩ = ٧٩٢، ٨٠١، ٨٢٠}:

بەرائی کوڕی عازیب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: سەرەنجی نوێژی پێغەمبەرم دەدا، هەتا شێوەی کردنەکەیم ڕەوان کرد: تەماشام کرد: ماوەی ڕاوەستانیو چەمینەوەییو پشت ڕاست کردنەوەی لە چەمینەوەو کوڕنووشیو دانیشتنی نێوانی دوو کوڕنووشەکانیو کوڕنووشی دووەمیو دانیشتنی نێوانی سڵاودانەوەیو بەجێهێشتنی جێگە نوێژەکەی، گەلێ جار وادەبوو، ئەم کردارانەی نوێژی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە باسکران، لە یەکترییەوە گەلێ نزیك بوون). {تاج/١، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ٥٤٣}.

شەرحەکان دەفەرموون: ئەمە لە هەندێ کاتا وابووە، چونکە چەسپاوە لە زۆرینەی کاتا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قورئانێکی زۆری خوێندووە لە ڕاوەستانا، بەڵام موراعاتی حاڵو مەقامی دەکردو گەلێ جار بارو دۆخەکەی ڕەچاو دەکرد، وەك ئەمەی کە بەراء دەیڵێ.

٣٢٩- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، قَالَ: إِنِّي لاَ آلُو أَنْ أُصَلِّيَ بِكُمْ كَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي بِنَا، قَالَ: فَكَانَ أَنَسٌ يَصْنَعُ شَيْئًا لاَ أَرَاكُمْ تَصْنَعُونَهُ، كَانَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ انْتَصَبَ قَائِمًا حَتَّى يَقُولَ الْقَائِلُ قَدْ نَسِيَ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ السَّجْدَةِ مَكَثَ حَتَّى يَقُولَ الْقَائِلُ قَدْ نَسِيَ). {الحديث/١٠٦٠ = ١٠٤٨ ف.م = فَتْحُ الْمُلْهِمِ + تجريد/١/٤٢٢، رقم: ٤٣٩ = ٨٢١، ٨٠٠ فتح الباری}:

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دڵنیابن لەوە کەمن کەمتەرخەمی ناکەم لەوەدا، کە بۆخۆم چۆن پێغەمبەرم دیوە کە نوێژی دەکرد بۆمان، منیش ئاوا نوێژتان بۆ بکەم. ثابیت کە ڕاوی ئەم فەرموودەیەیە لە ئەنەسەوە، دەفەرموێ: جاران ئەنەس شتێکی دەکرد، نابینم کە ئێوە ئەوە بکەن: ئەنەس لەناو نوێژدا کە سەری لە چەمینەوە هەڵ دەبڕی، ئەوەندە بە پێوە ڕادەوەستاو نزاو ویردی دەخوێند، تەنانەت زەینمان بۆ ئەوە دەچوو: کە لەبیری چووە دابنەوێ بۆ

کوڕنـــووش، لـــه نێـــوانی هـــەردوو کوڕنووشەکانیشـــدا هـــەروەها). {بڕوانـــە: تەجرید/١/٤١٤، رقم: ٤٣٥ = ٨٠٠، ٨٢١ فتح الباری}.

**٢٢٨) خێرترین کرداری نوێژ،ڕاوەستانی درێژە بۆ قورئان خوێندن**.(١٧١٤-١٧٧٥).

**باب: أفضل الصَّلاَةِ طُولُ القُنُوت**

٣٣٠- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَيُّ الصَّلاَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: « طُولُ الْقُنُوتِ ». {الحديث/١٧٦٦ = ١٧٣٦ ف.م}:

**جابیر** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: لە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **پرسیار کرا: کام کرداری نوێژ خێری زۆر ترە؟ فەرمووی: (بە پێوە ڕاوەستانی دوورو درێژ).** {تاج/١/٢٨٦، زنجیرە: ٩١، ژمارە: ٥٥٨}.

**ڕوونکردنەوە:**

لە ڕاوەستانی نوێژا قورئان دەخوێنرێ، نزای سەرەتای نوێژ دەخوێنرێ، نزای ڕاستبوونەوە لە چەمینەوە دەخوێنرێ، نزای ناو چەمینەوە دەخوێنرێ، پێش نوێژ لە ئیستی دوا خوێندنی فاتیحادا، نزایێ، یا بڕێ قورئان دەخوێنێ بە پەنامەکی هەتا پاش نوێژەکان فاتیحای خۆیان دەخوێنن.

**٢٢٩) ئارامیو هێمنی لە نوێژا**. (٩٦٧ - ٩٧٠).

**باب: الأَمْرُ بِالسُّكُونِ فِي الصَّلاَةِ**

٣٣١- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: « مَا لِى أَرَاكُمْ رَافِعِى أَيْدِيكُمْ كَأَنَّهَا أَذْنَابُ خَيْلٍ شُمْسٍ؟ اسْكُنُوا فِى الصَّلاَةِ» قَالَ: ثُمَّ خَرَجَ عَلَيْنَا فَرَآنَا حَلَقًا، فَقَالَ: « مَا لِى أَرَاكُمْ عِزِينَ!» قَالَ: ثُمَّ خَرَجَ عَلَيْنَا فَقَالَ: « أَلاَ تَصُفُّونَ كَمَا تَصُفُّ الْمَلاَئِكَةُ عِنْدَ رَبِّهَا؟» فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَكَيْفَ تَصُفُّ الْمَلاَئِكَةُ عِنْدَ رَبِّهَا؟ قَالَ: « يُتِمُّونَ الصُّفُوفَ الأُوَلَ، وَيَتَرَاصُّونَ فِى الصَّفِّ». {الحديث/٩٦٧ = ٩٦٤ ف.م = فَتْحُ الْمُلْهِمِ}:

جابیری كوڕی سەموورە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هاتە دەرەوە بۆ ناومان فەرمووی: (ئەوە چیتانە دەتانبینم لەناو نوێژا دەستەكانتان بەم لاو لادا بادەدەن، دەڵێی كلكی ماینی چەمووشە! لەناو نوێژا ئارامو هێمن بن). جارێكیش هاتە دەرەوە بۆناومان كۆمەڵ كۆمەڵ ئەڵقەمان بەستبوو، فەرمووی: (ئەوە بۆ وا پارچە پارچەن؟!) جارێ تریش هاتە دەرەوە بۆناومان فەرمووی: (ئەرێ بۆ ڕیز نابەستن لە چەشنی ڕیز بەستنی فریشتەكان لەلای پەروەردگاریان؟).

عەرزمان كرد: قوربان! فریشتەكان لەلای پەروەردگاریان چۆن چۆنی ڕیز دەبەستن؟ فەرمووی: (ڕیزەكانی پێشەوە ڕیز بە ڕیز تەواو دەكەنو، لە ڕیزدا پاڵ دەدەن بەیەكەوە!). {تاج/١/٤٠١، زنجیرە: ١٣٥، ژمارە: ٨٠٢}.

## ٢٣٠) وەڵامدانەوەی سلاو لە نوێژا بە ئاماژەی سەر. (١١٩٩ - ١٢٠٨).

## باب: الإشارةُ بِرَدِّ السَّلَامِ الصَّلَاةَ

٣٣٢- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعَثَنِي لِحَاجَةٍ ثُمَّ أَدْرَكْتُهُ وَهُوَ يَسِيرُ (قَالَ قُتَيْبَةُ: يُصَلِّي) فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَأَشَارَ إِلَيَّ، فَلَمَّا فَرَغَ دَعَانِي، فَقَالَ: إِنَّكَ سَلَّمْتَ آنِفًا وَأَنَا أُصَلِّي، وَهُوَ مُوَجِّهٌ حِينَئِذٍ قِبَلَ الْمَشْرِقِ). {الحديث/١٢٠٥ = ١١٨٣ ف.م}:

جابیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ناردمی بۆ كارێ، منیش چووم كارەكەم كردو هاتمەوە بۆلای پێغەمبەرو سلاوم لێكرد، بەدەستی ئاوایەكی كردو بە ئامازە وەڵامی سلاوەكەمی دایەوە، بەڵام بە گوتن وەڵامی نەدامەوە، منیش لەبەرئەوەی لە ئامازەكەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) حاڵی نەبووم، ئەوەی كە هەرخوا خۆی باشتر ئاگای لێیەتی هات بەدڵما، جا لە دڵی خۆما گوتم: ڕەنگە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەسەر ئەوە لێم زوێر بووبێ، چونكە درەنگ هاتمەوە بۆ خزمەتی؟ دیسان سلاوم لێ كردەوە، دیسانەوە سلاوی نەدامەوە،، ئەمجارەیان لە جاری یەكەم زیاتر خەم دایگرتمو دڵم سەخڵەت بوو، لەجاری

سێیەما کە سلاوم لێکرد، وەلامی دامەوەو فەرموشی: (ئەوە خەریکی نوێژ بووم بۆیە وەلامی سلاوەکەتم نەدایەوە).

جابیر فەرمووی: لەوکاتەدا پێغەمبەر بەڕێوە بوو، بە سواری ولاخەکەی بوو، لەوکاتەدا رووشی لە (رووگە = قیبلە) نەبوو. ئەمە دەقی ئەم فەرموودەیە یە لە بوخاریدا. {بڕوانە: تجرید/١٦/٢/، ژمارە: ٥٩٤ = ١٢١٧ فەتحولباری} + {تاج/١/٢٤٠، زنجیرە: ١١٣، ژمارە: ٦٧٠}.

**٢٣١) قەدەغە کردنی قسەکردن لە نوێژدا.** (١١٩٩ - ١٢٠٨).

**بابٌ: نَسْخُ الْكَلاَمِ فِي الصَّلاَةِ**

٣٣٣- عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ الْحَكَمِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَيْنَمَا أَنَا أُصَلِّى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، إِذْ عَطَسَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ، فَقُلْتُ: يَرْحَمُكَ اللَّهُ، فَرَمَانِى الْقَوْمُ بِأَبْصَارِهِمْ، فَقُلْتُ: (وَاثُكْلَ أُمِّيَاهْ! مَا شَأْنُكُمْ؟ تَنْظُرُونَ إِلَيَّ؟! فَجَعَلُوا يَضْرِبُونَ بِأَيْدِيهِمْ عَلَى أَفْخَاذِهِمْ، فَلَمَّا رَأَيْتُهُمْ يُصَمِّتُونَنِى، لَكِنِّى سَكَتُّ، فَلَمَّا صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَبِأَبِى هُوَ وَأُمِّى، مَا رَأَيْتُ مُعَلِّمًا قَبْلَهُ وَلاَ بَعْدَهُ أَحْسَنَ تَعْلِيمًا مِنْهُ، فَوَاللَّهِ مَا كَهَرَنِى، وَلاَ ضَرَبَنِى، وَلاَ شَتَمَنِى، ثُمَّ قَالَ: « إِنَّ هَذِهِ الصَّلاَةَ لاَ يَصْلُحُ فِيهَا شَىْءٌ مِنْ كَلاَمِ النَّاسِ، إِنَّمَا هُوَ التَّسْبِيحُ وَالتَّكْبِيرُ وَقِرَاءَةُ الْقُرْآنِ، أَوْ كَمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّى حَدِيثُ عَهْدٍ بِجَاهِلِيَّةٍ وَقَدْ جَاءَ اللَّهُ بِالإِسْلاَمِ، وَإِنَّ مِنَّا رِجَالاً يَأْتُونَ الْكُهَّانَ، قَالَ: « فَلاَ تَأْتِهِمْ ». قَالَ: قُلْتُ: وَمِنَّا رِجَالٌ يَتَطَيَّرُونَ. قَالَ: « ذَلِكَ شَىْءٌ يَجِدُونَهُ فِى صُدُورِهِمْ فَلاَ يَصُدَّنَّهُمْ ».

(قَالَ ابْنُ الصَّبَّاحِ: فَلاَ يَصُدَّنَّكُمْ) قَالَ: وَكَانَتْ لِى جَارِيَةٌ تَرْعَى غَنَمًا لِى قِبَلَ أُحُدٍ وَالْجَوَّانِيَّةِ، فَاطَّلَعْتُ ذَاتَ يَوْمٍ فَإِذَا الذِّيبُ قَدْ ذَهَبَ بِشَاةٍ مِنْ غَنَمِهَا، وَأَنَا رَجُلٌ مِنْ بَنِى آدَمَ آسَفُ كَمَا يَأْسَفُونَ، لَكِنِّى صَكَكْتُهَا صَكَّةً، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَعَظَّمَ ذَلِكَ عَلَيَّ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلاَ أُعْتِقُهَا؟ قَالَ: « ائْتِنِى بِهَا ». فَأَتَيْتُهُ بِهَا فَقَالَ لَهَا: « أَيْنَ اللَّهُ؟ قَالَتْ: فِى السَّمَاءِ، قَالَ: « مَنْ أَنَا؟» قَالَتْ: أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ. قَالَ: «أَعْتِقْهَا فَإِنَّهَا مُؤْمِنَةٌ». {الحديث/١١٩٩ = ١١٨٠ ف.م}:

موعاوییەی کوڕی حەکەم (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لە پشتی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی جەماعەتم دەکرد، پیاوێ لە ریزەکەدا پژمی، منیش وەك واباوە، گوتم: (يَرْحَمُكَ اللّه: خوا رەحمت پێ بكا).

خەڵکەکەی ناو نوێژەکەیش، بە نارەزایی‌و بێزارییەوە بەچاو ئاماژەیان بۆ کردم، کە چۆن لەناو نوێژدا قسە دەکەم منیش گوتم: ئەی کۆستی دایکم بکەوێ بە مردنی من، دەبێ چی بێ وێڵییەکم کردبێ، کەوا ئەو خەڵکەی وا بێزار کردووە لێم، ئەوە چیتانە وا لێم مۆڕ دەبنەوە؟! ئەوانیش دەستیان دەکێشا بەرانیانا هەتا من بێ دەنگ بکەن، جا منیش (گەرچی لە کارەکەشیان تووڕە بوو بووم) بەلام کە دیم وا بێ دەنگم دەکەن خامۆش بووم‌و قسەی ترم نەکرد. جا کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەر نوێژییەکەی تەواو کرد فەرمووی: (بەڕاستی ئەم نوێژە بە کەڵکی قسەی دنیایی نایێ، چونکە نوێژ دەبێ هەر بریتی بێ لە تەسبیحات کردن‌و ئەڵلاهو ئەکبەر کردن‌و باسی ستایش‌و گەورەیی خودا کردن‌و قورئان خوێندن).

فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) یا ئاوای فەرموو، یا فەرمایشتێکی لەم بابەتەی فەرموو.

موعاوییە فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! من مرۆیەکی نو موسوڵمانم، تازە لەسەردەمی نەزانی دابڕاوم، ئێستایش خودای گەورە ئەم ئایینە پیرۆزەی ئیسلامی هێناوە، ئێمە لەسەردەمی نەزانیدا، هەندێ شت هەبوون دەمانکردن، وەك ئەوەی دەچووین بۆ لای کولە نانی‌و کاهینان‌و بۆ هەندێ کاروباری غەیبیی خۆمان پرس‌و رامان پێ دەکردن؟ فەرمووی: (ئیتر هامووشۆیان مەکەن). گوتم: نوقلانەشمان لێ دەدا؟ فەرمووی: (ئەوە شتێکەو دێ بە دڵتاناو عادەت‌و خووتان پێیەوە گرتووە، بەلام بایەخی نییەو دەربەستی مەبن‌و لە بڕیاری خۆتان ساردتان نەکاتەوە). گوتم: ئەی پیاوی وامان هەیە بە رەمڵ دانە دەگرنەوە؟ فەرمووی: (پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرەکانیش بە رەمڵ دانەی دەگرتەوە، جا ئەوەی کە دانە گرتنەوەکەی رێکی ئەو دانە گرتنەوەبێ، کە ئەو پێغەمبەرە دەیکرد ئەوە

دروسته، ئەگینا دروست نییه). ئێستایش کەس نازانێ کە ئەو پێغەمبەرە دانەو رملی چۆن گرتۆتەوە، کەوابێ بۆ کەس دروست نییه لافی ئەوە لێ بدا، کە بەهۆی رەملەوە شتی نهێنی دەزانێ.

موعاوییە فەرمووی: کەنیزێکم هەبوو، شوانی رانەکەم بوو، لە دەوروبەری چیای ئوحودو لە جەووانییە کەناوی شوێنێکە لە نزیکی ئوحودەوە رانەکەی دەلەوەڕاند، جا رۆژێ ئاژەڵەکەم بەسەر کرد روانیم وا سەرێ لە رانەکەی بەری دیار نییەو گورگ خواردوویەتی، دیارە کە منیش هەر ئادەمیزادم وەك ئەو خەڵکەی ترو وەك چۆن تورە دەبن منیش تووڕە دەبم، جا لەبەرئەوە یەك شەقازللەم لێدا، کاتێ چوومە خزمەتی حەزرەت باسی ئەمەم بۆی کرد، زۆری گەورەو گران کرد لەسەرم، عەرزیم کرد: قوربان! کەوایە بۆچی ئازادی نەکەم؟ فەرمووی: (بیهێنە بۆم) منیش بردم بۆ خزمەتی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (خودا وا لەکوێ؟) کەنیزەکەکە گوتی: وا لە ئاسمان. پێغەمبەر لێی پرسی: (ئەی من چیم؟) گوتی: تۆ پێغەمبەری خودای. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئازادی بکە ئەمە باوەڕدارەو موسوڵمانە).

**روونکردنەوە:**

لە کتێبی (تدريب الرَّاوي)دا، بەرگی یەکەم، لاپەڕە: ٥٣٨، دەفەرموێ: (وينبغي للرَّاوي بِالمَعْنَى أَنْ يَقُولَ عُقَيْبَهُ، أَوْ كَمَا قَالَ، أَوْ نَحْوَهُ، أَوْ شِبْهَهُ، أَوْ مَا مَا أَشْبَهَ هذا مِنَ الأَلْفَاظِ). جا لەسەر ئەم بنیاتە هەر کاتێ مرۆڤ لە دەقی فەرموودەکە دڵنیا نەبوو، وە گومانی ئەوەی هەبوو، کە وشەیێ، یا رستەیەکی لە دەقی فەرموودەکە گۆڕیوە، یا لێی گۆڕاوە، ئەوا لەم بارو دۆخەدا وا باشە، لە دوایەوە، یەکسەر بڵێ: (یا وەك ئەوەی کە پێغەمبەر فەرموویەتی) بەڵام ئەگەر لەدەقی فەرموودەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دڵنیا بوو، پێویست بە گوتنی شتی وا ناکا، وەکوو ئەوە کەسێ دەقی فەرموودەیەکی بوخاری یا موسلیم بخوێنێتەوە.

٣٣٤- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا نَتَكَلَّمُ فِى الصَّلاَةِ، يُكَلِّمُ الرَّجُلُ صَاحِبَهُ، وَهُوَ إِلَى جَنْبِهِ فِى الصَّلاَةِ، حَتَّى نَزَلَتْ: (وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ) فَأُمِرْنَا بِالسُّكُوتِ، وَنُهِينَا عَنِ الْكَلاَمِ). {الحديث/١٢٠٣ = ١١٨٢ ف.م = فَتْحُ الْمُلْهِم. تجريد/٢/١٠، رقم: ٥٩٠ = ١٢٠٠، ٤٥٣٤ فتح البارى}:

زەیدی کوڕی ئەرقەم (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئێمە لەپێشدا، لەناو نوێژدا، قسەمان لەگەڵ یەکتردا دەکرد، تا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، کە دەفەرموێ: (وَقُومُوا لِلّهِ قانتين – بەقەرە/٢٣٨) واتە: لە نوێژدا، بەسەر کزیو بە مل کەچی راوەستنو دەم بە یادو زیکری خودا بنو قسەی دنیایی مەکەن).

ئیتر فەرمانمان پێکرا بە خامۆشیو قسەکردنمان لە نوێژدا لێ قەدەغە کرا). {تاج/١/٢١٩، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ٤٠٩}.

**روونکردنەوە:**

زەیدی کوڕی ئەرقەمی قەیسی، ئەنصارییە، خەزرەجییە، ماڵی ئەرقەمی باوکی، لە سەرەتای ئیسلامەوە بوو بە مەکۆو جێگەی کۆبوونەوەی نهێنی موسوڵمانەکان، کە لەسەر گردی صەفا بوو، هەتا ژمارە:یان بە عومەری کوڕی خەتابەوە بوو بە چل کەس، دواهەمینی ئەو چل کەسە عومەری کوڕی خەتاب بوو، ئیتر لەوێ گواستیانەوەو دەرچوون، ئەرقەم کۆچەری بوو، ئامادەی جەنگی بەدرو ئوحودو گشت نەبەردگاکانی تری پێغەمبەر بوو بوو، لە مەدینە مردووە، لە تەمەنی هەشتاو پێنج ساڵیدا، هەندێ دەڵێن: باوکی ئەرقەمیش موسوڵمان بووە.

زەیدی کوڕی ئەرقەم لە رۆژی غەزای ئوحوددا ویستی هاوبەشی ئەو جەنگە بکا، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رێگەی نەدا، لەبەرئەوەی کە مێرد مناڵ بوو، یەکەم شەڕگە کە زەید ئامادەی بوو، خەندەق بوو، لەگەڵ پێغەمبەردا ئامادەی حەڤدە غەزا بووە، فەرموودەی زۆری پێغەمبەری گێڕاوەتەوە، لە پیاوانی صەحیحی موسلیمو صەحیحی بوخارییە، دادەنرێت بە یەکێك لە خۆشەویستەکانی ئیمامی عەلی، لە ئیمامی عەلییەوە گێڕانەوەی زۆرە ئامادەی

رووداوی (صەففین) بووە، ساڵی (٦٦) یا ساڵی (٦٨) کۆچی لەسەردەمی (المختار)دا لە (کووفە) مردووە.

جارێ گوێی لێ دەبێ عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی هەڕەشە لە پێغەمبەرو موسوڵمانان دەکاو دەڵێ: (ئەگەر گەڕاینەوە لەم سەفەرە بۆ مەدینە، دەستەی منو، دەستەی موحەممەد، کاممان ئازاترو توانا تر بوو، دەستەی داماوو بێ دەستەڵات لە مەدینە وەدەردەنێ!).

جا زەید ئەمە دەگێڕێتەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لە عەبدوڵلا دەپرسێ کە شتی وای گوتووە؟ ئەویش سوێندی خوارد کە شتی وای نەگوتووە، پێغەمبەریش باوەڕی پێ دەکاو باوەڕ بە قسەکەی زەید ناکا، تا لە ئەنجامدا خودا ئایەتی ناردە خوارەوە راستیی قسەی زەیدی چەسپاندو قسەی ئیبنو سەلوولی بەدرۆ خستەوە. {بڕوانە: تەجرید/٢/١١، ژمارە: ٥٩٠ + تجرید/٢، لاپەڕە: ٢٩، ژمارە: ٦٠٩}.

## ٢٣٢) سوبحانەڵلا کردن لەناو نوێژدا بۆ پێویستی. (٩٥٣ - ٩٥٤).

## باب: التسبيح للحاجة في الصَّلَاة

٣٣٥- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللّه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «التَّسْبِيحُ لِلرِّجَالِ، وَالتَّصْفِيقُ لِلنِّسَاءِ». {الحديث/٩٥٣ = ٩٥٠ ف.م. بخارى/١٢٠٣} وَفِي رواية: (فِي الصَّلَاة). {الحديث/٩٥٥ = ٩٥٢ ف.م}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ لەناو نوێژدا شتێکی لێ رووبدا، با بڵێ سوبحانەڵلاه، چونکە کە سوبحانەڵلای کرد، ئیتر تێ دەگەن لە کارەکە، وەڵێ چەپڵە لێدان لەناو نوێژدا بۆ ژنانە). {تەجرید/١/٣٧٦، ژمارە: ٣٨٥ = ٦٨٤، ١٢٠١، ١٢٠٤، ١٢١٨، ١٢٣٤، ٢٦٩٠، ٢٦٩٣، ٧١٩٣. تاج/١/٤٠٦، ژمارە: ٨١٤}.

**روونكردنەوە:**

فيقهى ئەم فەرموودەيە ئەمەيە:

١-پياو لەناو نوێژدا، ئەگەر پێشهاتێ وا روويدا كە پێويستى بە ورياكردنەوەى كەسێكى تر بوو، با سوبحانەڵلا بكا، وەك وشيار كردنەوەى پێش نوێژ، كاتێ كە هەڵەيێ دەكا، تەحيات ناخوێنێ، يا جێگەى تەحيات نييەو دادەنيشێ بۆ تەحيات خوێندن، يا سۆپايێ لەلايا خەريكە گڕ دەگرێ، ئەويش نوێژ دەكا، بە دەنگى بەرز سوبحانەڵلا دەكا، هەتا ئەوانەى گوێيان لە سوبحانەڵلاكەيەتى وريا دەبنەوەو سۆپاكە دەكوژێننەوە، يا منالێ خەريكە كەتنێ دەكا.... تاد.

٢-لەهەموو ئەم كاتانەدا ژن لەباتى (سبحان الله) كردن چەپڵە لێ دەدا، بەبەرى دەستى راستى دەدا لە پشتى دەستى چەپى. {بڕوانە: فيقهى ئاسان/١/٢٠٤، زنجيرە: ٦٦ — ژن لە چەن شتێكا جيايە لە پياو. بڕگەى: پێنجەم}.

### ٢٣٣) نەهيى كراوە لە تەماشا كردنى ئاسمان لە نوێژدا. (٩٦٥ - ٩٦٦).
### بابٌ: النهي عَنْ رَفْعِ البَصَرِ إِلَى السَّمَاءِ في الصَّلَاةِ.

٣٣٦- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عَنْ رَفْعِهِمْ أَبْصَارَهُمْ عِنْدَ الدُّعَاءِ فِى الصَّلاَةِ إِلَى السَّمَاءِ، أَوْ لَتُخْطَفَنَّ أَبْصَارُهُمْ». {الحديث/٩٦٦ = ٩٦٣ ف.م}:

ئەنەس (رەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: خۆشەويست (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (لەبەرچى هەندێ كەس لە نوێژا چاو هەڵ دەبڕن بۆ ئاسمان، بۆ وادەكەن بۆ! ئيتر حەزرەت (دروودى خوداى لەسەر بێ) لەم بارەيەوە گەلێ بە توندى هەڕەشەى كرد، تەنانەت فەرمووى: (دەبێ واز لەم كارە ناشيرينە بێنن، ئەگينا بێگومان كوێر دەبن). {شەيخان/ ئەبو داوود/ نەسائى} گفتەى موسليم ئاوايە: (كەسانێ كە لە نوێژا چاويان هەڵ دەبڕن بەرەو ئاسمان، لەكاتى نزاى ناو نوێژدا، يا دەبێ واز لەم كارە ناشيرينە نا پەسەندە بهێنن، يا بێگومان چاويان كوێر دەبێ). {تاج/١، لاپەڕە: ٢٩٦، زنجيرە: ٩٦، ژمارە: ٥٧٢، چاپى/٢}. گێڕانەوەى موسليم لە ئەبو هورەيرەوەيە.

## ٢٣٤) هەڕەشە کردن لەڕۆیشتن بەبەردەمی نوێژدا (١١١١-١١٤٧)
## بابٌ: التغليظ في المرور بين يدي المصلّي

٣٣٧- عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ: أَنَّ زَيْدَ بْنَ خَالِدٍ الْجُهَنِيَّ أَرْسَلَهُ إِلَى أَبِي جُهَيْمٍ يَسْأَلُهُ: مَاذَا سَمِعَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الْمَارِّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي؟ قَالَ أَبُو جُهَيْمٍ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « لَوْ يَعْلَمُ الْمَارُّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي مَاذَا عَلَيْهِ، لَكَانَ أَنْ يَقِفَ أَرْبَعِينَ، خَيْرًا لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ». قَالَ أَبُو النَّضْرِ: لاَ أَدْرِي قَالَ: أَرْبَعِينَ يَوْمًا، أَوْ شَهْرًا، أَوْ سَنَةً؟». {الحديث/١١٣٢ = ١١١٧ فَتْحُ الْمُلْهِمِ} + {تجريد/١/٣١٣، رقم: ٣٠٥ = ٥١٠}:

بوسری کوڕی سەعید فەرمووی: زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی، منی نارد بۆلای ئەبو جوهەیم (رەزای خودای لێ بێ) کە لێی بپرسم: ئایا چی لەبارەی هاتوچۆ کردن بە بەردەم نوێژکەردا لەپێغەمبەرم بیستووە (درودی خودای لەسەر بێ)؟ ئەبو جوهەیم (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئاموشۆکەر کاتێ لەبەردەم نوێژ خوێنەوە ڕەت دەبێ، ئەگەر بزانێ کە بەوە چەندێ گوناهی تووش دەبێ، حەزی دەکرد کە چل... ڕابوەستایەو لەبەردەمیەوە ڕەت نەبوایە).

ئەبو نەضر (رەحمەتی خودای لێ بێ) کە یەکێکە لە فەرموودە گێڕەوەکانی ئەم فەرموودەیە، دەفەرموێ: بوسری کوڕی سەعید، کە ئەمەی بۆ من گێڕاوەتەوە، نازانم کە فەرمووی: چل ڕۆژ ڕابوەستایە، یا چل مانگ، یا چل ساڵ). {تاج/١/٢٤٠/ش/د/ت/ن}.

**ڕوونکردنەوە:**

١. ئەبو جوهەیم ناوی عەبدوڵلای کوڕی حاریثی کوڕی صیممەی ئەنصاری خەزرەجییە، ئەبو جوهەیم جیایە لە ئەبو جەهم کە ژینامەکەی لە ژمارە (٢٣٢)دا ڕابورد لە پێشەوە.

ئەبو جوهەیم خۆیو باوکی لە هاوڕێیانی پێغەمبەر بوون، باوکی یەکێ بوو لە هاوڕێ مەزنەکانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەبو جوهەیم لە غەزای ئوحوددا

پشتی پێغەمبەری چۆڵ نەکرد، پەیمانی دا پێی لەسەر مردن، لە رووداوە دڵتەزێنەکەی بیری مەعوونەدا، لەگەڵ حەفتا قورئان خوێنەکاندا شەهید کرا، ئەبو جوهەیم دوو فەرموودەی لە بوخاری شەریفدا هەیە، هەروا لە موسلیمدا فەرموودەی هەیە.

زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنیش هەر هاوەڵە، بۆ ژینامەکەی بڕوانە ژمارە (٥٦) کە لە پێشەوە رۆی.

٢. ئەو ماوەیەی کە قەدەغەیە چەندەو مەرجی چییە؟

أ- هەتا شوێنی سەجدەکەی، رۆیشتن لە بەینی نوێژکەرو جێ سەجدەکەی قەدەغەیەو پێی گوناهبار دەبێ.

ب- بە ئەندازەی ئەوەندەیە، کە بە خوشوعەوە نوێژبکاو تەماشای جێگە کوڕنووشەکەی خۆی بکا، ئەگەر کەسێ لەو ئاقارەوە رۆیشت چاوی لێی بێ.

ج- هەندێ دەفەرموون سێ باڵ. جا نوێژکارو هاموشۆکار کامیان گوناهبار دەبن و مەرجی چییە، بۆ ئەمە بڕوانە ئەم جێگەیە لە (فتح الملهم)دا.

**٢٣٥) قەدەغە کردنی هاتوچۆ بە بەردەم نوێژدا.** (١١١١ - ١١٤٧).

٣٣٨- عَنْ أبي صَالِحِ السَّمَّانُ قَالَ: بَيْنَمَا أَنَا مَعَ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ)، يُصَلِّي يَوْمَ الْجُمُعَةِ إِلَى شَيْءٍ يَسْتُرُهُ مِنَ النَّاسِ، إِذْ جَاءَ رَجُلٌ شَابٌّ مِنْ بَنِي أَبِي مُعَيْطٍ، أَرَادَ أَنْ يَجْتَازَ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَدَفَعَ فِي نَحْرِهِ، فَنَظَرَ فَلَمْ يَجِدْ مَسَاغًا إِلاَّ بَيْنَ يَدَيْ أَبِي سَعِيدٍ، فَعَادَ، فَدَفَعَ فِي نَحْرِهِ أَشَدَّ مِنَ الدَّفْعَةِ الأُولَى، فَمَثَلَ قَائِمًا، فَنَالَ مِنْ أَبِي سَعِيدٍ، ثُمَّ زَاحَمَ النَّاسَ فَخَرَجَ، فَدَخَلَ عَلَى مَرْوَانَ، فَشَكَا إِلَيْهِ مَا لَقِيَ، قَالَ: وَدَخَلَ أَبُو سَعِيدٍ عَلَى مَرْوَانَ، فَقَالَ لَهُ مَرْوَانُ: مَا لَكَ وَلاِبْنِ أَخِيكَ؟ جَاءَ يَشْكُوكَ، فَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: « إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ إِلَى شَيْءٍ يَسْتُرُهُ مِنَ النَّاسِ، فَأَرَادَ أَحَدٌ أَنْ يَجْتَازَ بَيْنَ يَدَيْهِ فَلْيَدْفَعْ فِي نَحْرِهِ، فَإِنْ أَبَى فَلْيُقَاتِلْهُ فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ».
{الحديث/١١٢٩ = ١١١٤. تجريد/١/٣١٢، ژمارە: ٣٠٤ = ٥٠٩، ٣٢٧٤}:

ئەبو صالحی سەممان فەرمووی: ڕۆژی هەینی بوو، ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) نوێژی دەکرد، شتێکی کردبوو بە بەربەست هەتا کەس بە بەر نوێژەکەیدا نەڕوا، لاوێکیش لە خێڵی ئەبو موعەیط ویستی بە بەر نوێژەکەیدا بڕواو تێ پەڕێ، ئەبو سەعید نەیهێشتوَ پاڵێکی نا بە سینگیەوەو تەسی پێ کردەوە دواوە، لاوەکەیش سەرنجی دا تەنیا لەبەردەم ئەوەوە ڕێگەی گوزەر هەیەو بەس، لەبەرئەوە دووبارە ویستی لەوێوە بڕوا، ئەبو سەعیدیش دیسان ڕێگەی پێ نەداو ئەمجارە توندتر لە جاری یەکەم پاڵی پێوەی نا، لاوەکەیش قسەی ناشیرینی بە ئەبو سەعید گوت لەسەر ئەوە، ئەوجا چوو بۆلای مەڕوانو لەلای مەڕوان (کە ئەو سەردەمە فەرمانڕەوای سەر شاری مەدینە بوو) سکاڵای حاڵی لە دەست ئەبو سەعید کرد، ئەبو سەعیدیش (بەدوا ئەودا) چووە ژوورەوە بۆلای مەڕوان.

مەڕوان عەرزی کرد: ئەی ئەبو سەعید! ئەی باوکی سەعید! ئەوە چیتانە لەگەڵ ئەم لاوەدا، خۆ تۆو ئەو بەپێی ئایەتی قورئان، مامەو برازای ئایینن، قورئان دەفەرموێ: {إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ} کەواتە خێرە وا نێوانتان تێك چووە؟ ئەبو سەعید (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بە گوێی خۆم لەزاری پیرۆزی خۆشەویستم بیستووە، (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (ئەگەر یەکێکتان بەرەو بەربەستێ نوێژی دەکردو ئەو بەربەستەی کردبوو بە نێوانی خۆیو خەڵکی تر، هەتا کەسێ بە بەردەم نوێژەکەیدا نەڕوا، لەوکاتەدا یەکێ تر ویستی بەبەر نوێژەکەیدا تێپەڕێ با نەهێڵێو بە دەستی پاڵی پێوە بنێ، جا ئەگەر کابرا هەر سەرە خەرێی کردو بە لاساری ویستی بەبەر نوێژەکەیدا بڕوا، با نەیهێڵێ، ئەگەر هەروازی نەهێنا با بچێ بەگژیدا، چونکە ئەو جۆرە کردارە لە ڕەفتاری شەیتانەو شەیتان ئەوەی پێدەکا).
{تاج/١/٢٤٠، زنجیرە: ٦٩، ژمارە: ٤٦٠}.

**ڕوونکردنەوە:**

ئەبو سەعیدی خودری ئەنصارییە، لە ڕۆژی غەزای ئوحوددا لەبەر منداڵی ڕێگەی پێ نەدرا کە بەشداری لەم غەزایەدا بکا، بەڵام لەوەدوا لە خزمەت

حەزرەتدا ئامادەی دوازدە غەزا بووە، باوكی (كە ناوی مالیكی كوڕی سینان بوو) لە غەزای ئوحوددا شەهید كرا، ئەبو سەعید (كەناوی سەعیدی كوڕی مالیكی كوڕی سینانە) هەزارو سەدو حەفتا فەرموودەی هەیە، لە بوخاریدا شەستو دووی هەیە، لە موسلیمدا نەوەدو هەشتی هەیە، چلو شەشیان پەسەندی هەردوو لایانن، بەپێی ئەم فەرموودەیە رۆیشتن بە بەینی بەربەستو نوێژكەردا، كارێكی شەیتانانەیە.

## ٢٣٦) بەربەستی نوێژكەر. (١١١١ - ١١٤٧).

## باب: مَا يَسْتُرُ الْمُصَلِّي

٣٣٩- عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي وَالدَّوَابُّ تَمُرُّ بَيْنَ أَيْدِينَا، فَذَكَرْنَا ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: « مِثْلُ مُؤْخِرَةِ الرَّحْلِ، تَكُونُ بَيْنَ يَدَيْ أَحَدِكُمْ، ثُمَّ لاَ يَضُرُّهُ مَا مَرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ». {الحديث/١١١٢ = ١٠٩٧ ف.م} :

تەلحەی كوڕی عوبەیدوللا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: وادەبوو كە نوێژمان دەكرد، ئاژەڵو وڵاخو چوارپێ بە بەردەم نوێژەكەماندا دەڕۆیشت، جا كە باسی ئەمەمان كرد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (كاتێ كەسێ لە ئێوە كە نوێژ دەكا، ئەگەر شتێ لەبەردەم خۆیدا دابنێو بیكا بە بەربەست، كە بەقەد كۆپارەی پاشەوەی كۆپانە وشترێ بارستایی هەبێ، ئیتر با نوێژی خۆیی لێ بكاو، دەربەستی ئەو شتانە نەبێ كە لەو دیوی ئەو بەربەستەوە دێنو دەچن، وەك مرۆڤو ئاژەڵو شتی وا). {تاج/١/٢٣٧، زنجیرە: ٦٧، ژمارە: ٤٥١} .

## ٢٣٧) نوێژ كردن بەرەو نێزە. (١١١١ - ١١٤٧).

## بابٌ: الصَّلاَةُ إِلَى حَرْبَةٍ

٣٤٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِىَ اللَّهُ عنهما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ إِذَا خَرَجَ يَوْمَ الْعِيدِ أَمَرَ بِالْحَرْبَةِ، فَتُوضَعُ بَيْنَ يَدَيْهِ فَيُصَلِّي إِلَيْهَا وَالنَّاسُ وَرَاءَهُ، وَكَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ فِي السَّفَرِ فَمِنْ ثَمَّ اتَّخَذَهَا الأُمَرَاءُ). {الحديث/١١١٥ = ١١٠٠ ف.م. تجريد/١/٣٠٨ = رقم: ٢٩٦ = ٤٩٤، ٤٩٨، ٩٧٢، ٩٧٣} :

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، لە ڕۆژی جەژنا، کە لەشار دەردەچوونو دەچوون بۆ نوێژگاکە لە دەرەوەی شار، بۆ کردنی نوێژی جەژن، فەرمانی بە نۆکەرەکەی دەکرد، نێزەیەکی هەڵدەگرتو، لەبەردەم پێغەمبەرەوە دەڕۆیشت، تا دەگەیشتنە نوێژگاکە، لەوێ لەبەردەم پێغەمبەرەوە نێزەکەی دا دەچەقاند، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرەو ئەو نێزەیە نوێژی دەکرد، خەڵکەکەیش لە پشتیەوە بە کۆمەڵ (واتە: بە جەماعەت) نوێژەکەیان دەکرد، ئەم نێزە داچەقاندنەی لەسەفەریشدا دەکرد، لە شوێنێ کە دیواری لێ نەبوایە بۆ کردنی ئەو دیوارە بە بەربەست، جا ئەم کارەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەرچاوەی ئەو دەستوورو باوەیە کە فەرمانڕەواکان کردوویانە بە یاسا، لە جەژنو ئەمانەدا، کە کەسێ نێزەیێ هەڵدەگرێو لەبەردەمیانەوە تا نوێژگاکە لە دەرەوەی شار دەڕواو، لەوێ لەبەردەمیا بۆ بەربەست دایدەچەقێنێ.

## ٢٣٨) نوێژ بەرەو وڵاخی سواری (١١١١ - ١١٤٧).

## باب: الصَّلاَةُ إلى الرَّاحِلَة

٣٤١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّهُ عنهما): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَعْرِضُ رَاحِلَتَهُ، وَهُوَ يُصَلِّي إِلَيْهَا). {الحديث/١١١٧ = ١١٠٣ فم = ف.م = فَتْحُ الْمُلْهِمِ. تجريد/١/٣١١، رقم: ٣٠٢ = ٥٠٧، ٣٨٢}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: زۆرجار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وڵاخەکەی خۆی لەبەردەم خۆیدا، لەسەر لا، درێژ دەکرد لەباتی بەربەست، ئینجا بەرەو وڵاخەکە نوێژی دەکرد. {تاج/١/٢٣٧، زنجیرە: ٦٧، ژمارە: ٤٤٩}.

## ٢٣٩) لەودیو بەربەستەوە ڕۆیشتن بە بەردەمی نوێژدا دروستە. (١١١١ - ١١٤٧).

## باب: المرور بين يدى المصلى مِنَ وَرَاءِ السُّتُر

٣٤٢- عَنْ عَوْنُ بْنُ أَبِي جُحَيْفَةَ: أَنَّ أَبَاهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي قُبَّةٍ حَمْرَاءَ مِنْ أَدَمٍ وَرَأَيْتُ بِلاَلاً أَخْرَجَ وَضُوءًا، فَرَأَيْتُ النَّاسَ يَبْتَدِرُونَ ذَلِكَ الْوَضُوءَ، فَمَنْ

أَصَابَ مِنْهُ شَيْئًا تَمَسَّحَ بِهِ، وَمَنْ لَمْ يُصِبْ مِنْهُ أَخَذَ مِنْ بَلَلِ يَدِ صَاحِبِهِ، ثُمَّ رَأَيْتُ بِلالاً أَخْرَجَ عَنَزَةً فَرَكَزَهَا، وَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي حُلَّةٍ حَمْرَاءَ مُشَمِّرًا، فَصَلَّى إِلَى الْعَنَزَةِ بِالنَّاسِ رَكْعَتَيْنِ، وَرَأَيْتُ النَّاسَ وَالدَّوَابَّ، يَمُرُّونَ بَيْنَ يَدَيِ الْعَنَزَةِ). {الحديث/١١٢٠ = ١١٠٥ فم = ف.م = فَتْحُ الْمُلْهِمِ + تجريد البخارى/١/٢٥٣، رقم: ٢٤٠ = ٣٧٦، ١٨٧}:

عەونی كوڕی ئەبو جوحەیفە (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: باوكم فەرمووی: بیلالم بینی بانگی دەدا، بەدەم بانگدانەكەوە دەخولایەوەو، ئەملاولای دەكردو، دەمی خۆیی بە راستو بە چەپا دەسووڕاند، وە دوو پەنجەی خۆشی نابوونە ناو دوو كونە گوێی خۆی، تا دەنگی تەواو بەهێز بێو بەهەر چوار لادا بگا، لەوكاتەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو چادرێكی سووری چەرمینا بوو، كەهی خۆی بوو، هەروا بیلالم دی ئاوی دەستنوێژەكەی پێغەمبەری پێ بوو، چاووم لێ بوو خەڵكەكە پاشماوەی ئەو ئاوەیان دەقۆستەوە، جا ئەوانەی كە لەو ئاوەیان دەست دەكەوت، یەكسەر بۆ مووفەڕكی دەیانسووی لە خۆیانو لەسەرو چاویانو خۆیان پێ مووفەڕك دەكرد، بەڵام ئەوانەی كە لەو ئاوەیان دەست نەدەكەوت، لە تەڕیی دەستی هاوڕێیەكی خۆی دەستی خۆیی تەڕ دەكردو، بۆ خۆ پیرۆز كردن، دەیانسووی لە خۆیانو خۆیان پێ پیرۆز دەكرد، ئەنجا بیلالم بینی نێزەیەكی هێنا، لە زیخەڵانەكەی بەطحادا دایچەقاند، كردی بە بەربەست (سوترە) بۆ نوێژەكە. كە بەطحاء جێگەیەكی ناسراوە، پێشی دەگوترێ: ئەبطەحو موحەصصەب، كە لافاوی شیوی مینا لەوێدا بڵاو دەبێتەوە، جا كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كە لە چادرەكە هاتە دەرەوە بۆ نوێژگاكە، دەستێ جلی سووری لەبەردا بوو، هەردوو لاقی هەتا نیوەی لاقی هەڵكردبوو، بەرەو نێزەكە نوێژی دابەست، نوێژی نیوەڕۆی بە دوو ركات بە قەصرو جەمعە تەقدیم بۆ كردین، ئەوجا نوێژی عەصریشی بە دوو ركات، بەكۆ كردنەوەی كورتەوەكراو بۆ كردین.

ئیتر لەودیو نێزەکەوە سەگو کەرو ئاژەڵو ماڵاتو خەڵك، بەبەر نوێژی جەماعەتەکەدا ئاموشۆیان دەکردو دەهاتنو دەچوونو قەدەغە نەدەکران. {تاج/١/٢٢٨ + لاپەڕە: ٢٤١، زنجیرە: ٧١، ژمارە: ٤٢٥، ژمارە: ٤٦٢}.

**ڕوونکردنەوە:**

١. ئەبو جوحەیفە (ڕەزای خودای لێ بێ) ناوی وەهبی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی موسلیمی سوائییە، خەڵکی کووفەیە، لە کۆتایی تەمەنی حەزرەتدا بە خزمەتی گەیشتووە، ئەوکاتە مێرد منداڵ بووە، گێڕانەوەی لە پێغەمبەرو ئیمامی عەلیو بەرای کوڕی عازیبەوە هەیە، عەونی کوڕیو شەعبیو ئەبو ئیسحاقی سوبەیعیو کەسانی تریش گێڕانەوەیان لەوەوە هەیە، چلو پێنج فەرموودەی هەیە، لەو چلو پێنجە دوانیان پەسەندی هەردوو پیرن، لە بوخاریدا دوو فەرموودەی تری بەجیا هەیە (واتە: لە موسلیما نین) لە صەحیحی موسلیما سێ فەرموودەی تری بەجیا هەیە، سەرجەمی فەرموودەکانی لە بوخاریدا چوارن، لە موسلیمدا پێنجن، لە صەحیحەینا = ٢+٢+٣ = ٧ فەرموودە.

پێشەوا عەلی زۆری خۆش دەویستو زۆر ڕێزی لێ دەگرتو زۆر جێگە متمانەی ئەو بوو، کردی بە لێپرسراوی سەر بەیتولمال لە کووفە، لە هەموو شەڕو شەڕگاکانی عەلیدا لەگەڵی بوو، لە کووفە نیشتەجێ بوو، کۆمەڵە (الجماعة) فەرموودەیان لێیەوە گێڕاوەتەوە، لە هاوڕێ منداڵکارەکانی پێغەمبەر، (درودی خودای لەسەر بێ) دەژمێررێ، دەشڵێن: کاتێ پێغەمبەر مردووە ئەو هێشتا ڕەسیدە نەبووە، لەسەر فەرمایشتی عومدە تولقاری شەرحی صەحیحی بوخاری، لە حەفتاو دووی کۆچیدا مردووە، لە (الإصابة في تمييز الصَّحابة)دا دەفەرموێ: (واقیدی دەفەرموێ: لەو سەردەمەدا کە بشیر والی عێراق بوو مردووە).

٢. باسێکم هەیە بەناوی: (چەند یادگارێکی باوکم لەهی حوکمەتەکەی مەلیك/مەحموودی حەفید). جێگەی خۆیەتی کە بەم بۆنەوە ئەم یادگارانەی لێ ڕاگوێز بکەین:

(... لەیادمە لە ئاخرو ئۆخری حوکمەتی پاشایەتیدا شێخ مەحموود (رەحمەتی خودای لێ بێ) چەند جارێ تەشریفی هات بۆ سلێمانی، وا دەزانم یەکەم جار بە بۆنەی کردنەوەی بەنداو (سەدد)ی دووکانەوە بوو، ئاهەنگێکی گەورە بەم بۆنەیەوە سازکرا، یەکێ لە کەسایەتییە ناودارەکانی کوردستان، کە بانگهێشت کرابوون بۆ ئەم ئاهەنگە، بەم بۆنەیەوە، شێخ مەحموودی حەفید بوو، کە خودی مەلیك فەیصەڵ، نامەی تایبەتی دەعوەتکردنی بۆ ناردبوو، شێخ مەحموودیش دەعوەتەکەی قەبووڵ کردو هات بەم بۆنەیەوە، وە لەرێ هەتا گەیشتە ناو شاری سلێمانی، جەماوەرێکی زۆر پێشوازییان لێکرد، ئەو رۆژە شار وەکوو چۆڵ وابوو، لەبەرئەوە حەسحەس بە رۆژ دەگەڕا، نەبادا دزو درۆزن دەستێ بوەشێنن، خەڵکەکە مەڕو ئاژەڵێکی زۆریان برد بۆ سەر رێگەی شێخو لەبەر پێیدا سەریان دەبڕین، بۆ دەربڕینی سۆزو خۆشەویستیی جەماوەری کوردی شاری سلێمانی، بۆ جەنابی شێخ مەحموودی مەلیك، کە هەتا ئەو دەمە لێی قەدەغە بوو کەبێت بۆ سلێمانی، وە کاتێ مەوکیبو کەژاوەی مەلیك فەیسەڵ گەیشتە بەرەوە، پۆلیسو پیاوانی میری نەبێ کەسی تری لەگەڵدا نەبوو، جەماوەرەکە هەموو خەرمانەیان دابوو لە دەوری مەلیك مەحموودو بە گوڵباران‌و هوتاف کێشان‌و بە هۆنراو خوێندنەوەو گۆرانی‌و سروود، بەخێر هاتنی گەرم‌و گوڕی شا محمموودیان دەکردو، باسی مەزنایەتی‌و ژیانی پڕ لە خەبات‌و سەروەری‌و تێکۆشانی شێخی یاد نەمریان دەکرد.

تەنانەت جەماوەرەکە، وا حەماس گرتبوونی، ئوتومبیلەکەی شێخ مەحموودیان، لەلای باخی گشتییەوە، بگرە لەولا تریش، هەتا بەردەمماڵی شێخ لەتیفی کوڕی، بەشان هەڵگرتبوو، وە بەهەموو شێوەیێ خۆشی‌و شادییان دەردەبڕی، وەمن بەچاوی خۆم شا مەحموودم بینی، لەناو ئوتومبیلەکەیدا، جلی کوردی لەبەردا بوو، مشکیەکی رەشباوی گەورەی بەسەرەوە بوو، دڵی پڕ بوو بوو، فرمێسکی وشك نەدەبۆوە، هەروا لەیادمە کە یەکەمجار شێخ مەحموود لە داریکەلییەوە هات بۆ سلێمانی، چەند بنەماڵەیەکی، بە چەند بۆنەیەکەوە بەسەر کردەوە، هەبوو مردبوو، شێخ مەحموود لەکاتی خۆیدا نەیتوانی بوو بچێ بە

پرسەیانەوە، ئەوجارە چوو بە پرسەیانەوە، چونکە لەوەپێش لە میری قاچاخ بوو، وەك تەشریفی چوو بە پرسەی ماڵی شێخ موستەفای شێخ سەلامەوە، بە بۆنەی لەدنیا دەرچوونی قازی/ شێخ سەلامی باوکی شێخ موستەفاوە، کە ماڵەکەیان لە پاڵ مزگەوتی شێخ سەلاما بوو، هەروا چوو بۆ خانەقای مەحوی، لەگەڵ مامۆستا مەلا خالیدی باوکی مامۆستا مەلا ئەسعەدی مەحویدا، دەستیان کردە مل یەکترو بەسەریەکا گەلێ گریان. کاتێ شێخ تەشریفی هات بۆ مزگەوتی شێخ سەلام، من لەوێ فەقێ بووم، شێخ موستەفا لە هۆدەکەی مامۆستا مەلا رەحیمی پەرخیدا، لەگەڵ مامۆستا مەلا رەحیمو فەقێکانا، پێشوازییەکی جوانیان لە شێخ کرد. مەلاو موستەعیدو فەقێکان کە لەوێ بوون، رێزێکی زیادیان لە شێخو مەوکیبەکەی شێخ گرت، من ئەوکاتە سوختە بووم لەوێ، فەقێی مامۆستا مەلا موحەممەدی کۆڵێتانی بووم، منو مەلا فەتاحی پیسکەندیو فەقێ عەبدوڵلای درێژ لەوێ سوختە بووین، مەلا حەسەنی هیندیو مەلا موحەممەدی کۆڵێتانیو مەلا ئەحمەدی کانی مانگایی لەوێ موستەعید بوون!

جا من بەچاوی خۆم دیم کەوا دەزانم: کاتی نوێژی نیوەڕۆ یا عەصر بوو، شێخ مەحموود لە حەوزەکەی مزگەوتی شێخ سەلام، دەستنوێژی گرت، فەقیانەکانی ئاڵاندبوو لە باڵی، شەرواڵو مراخانی لەبەردا بوو، مەیلەو پیرۆزەیی بوو، مشکیەکی رەشو بازووی بە سەرەوە بوو، جا هەر لەوێ نوێژەکەی بە جەماعەت کرد، مامۆستا مەلا رەحیمی پەرخی ئیمام بوو، جا کاتێ خەڵکی گەرەك بەمەیان زانی، یەکێ بە جامەوە، یەکێ بە سەتڵەوە، یەکێ بە مەنجەڵەوە، یەکێ بە مەسینەوە، یەکێ بە تەنەکەوە هاتن، بۆ پیرۆزیو مووفەڕکیو یادگار، ئاویان لەو حەوزە دەبرد کە شێخ دەستنوێژی لێ گرت، دەق وەك ئاوی زەمزەم، هەبوو دەیخواردەوە، هەبوو ئاوڕشێنی ماڵو هۆدەو حەوشەیان پێ دەکرد، زۆر بە پەرۆشەوە، بە شێوەیەکی دڵگەرمو گەلێ سەیر!!

باوکم دەیفەرموو: (... شێخ نوێژی دەکرد، رۆژووی دەگرت، قورئانی دەخوێند، بە تەزبێ بە سەعاتو دوو سەعات، ویردو زیکرو سەڵاواتی زۆری دەخوێند، بە

واتای وشه مرۆڤێکی بە ئایینو رەفتار بەرز بوو، خەڵك بە وەلییان دەزانی، لە داریکەلی دیومە لەسەر بانیژەکەی بەردەم ماڵەکەی، لەپاش نوێژی بەیانی لەسەر بەرماڵەکە دادەنیشت، هەتا دەوری خۆرکەوتن، هەر زیکرو دوعای دەخوێند، کراسو دەرپێی سپی لەبەردا بوو، مشکی بە سەرەوە بوو، شێخ مەحموود هەستێکی ناسکی هەبوو، بە سروشت لەناخەوە حەزی لە شەڕو شۆڕ نەبوو، قەت ئاژاوەو خوێن رێژیو برا کوژی پێ خۆش نەبوو، لەناخی دڵەوە حەزی لە ئاشتیو خۆشیو تەبایيو برایی بوو، هەتا لەکاتی شەڕەکانا، لایەنی نەرمیو بەزەییو رەحمەتی دەگرت، وە لەناخەوە بیری لە بێوەییو لاشەڕیو مرۆڤ دۆستی دەکردەوە، لەم خاڵەوە بوو، کە گەلێ جار، بەتایبەتی ئەوکاتەی کە شێخ لە داریکەلی بوو، لە دەمی شێخ مەحموود خۆیم بیستووە، کە بەدەم نەرمە هۆرەو سۆزکردنو سروود خوێندنەوەوە دەیفەرموو: (سەرم داوای پاشایی دەکاو دڵم داوای ئیر شایی دەکا!!).

## ٢٤٠) پێشگیریی لە دەستگرتن بە کەلەگەوە لە نوێژدا

## باب: النهي عَنِ الإخْتِصَارِ فِي الصَّلَاةِ

٣٤٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَنَّهُ نَهَى أَنْ يُصَلِّيَ الرَّجُلُ مُخْتَصِرًا. {الحديث/١٢١٨ = ١١٩٤ فم = ف.م = فَتْحُ الْمُلْهِمِ}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێشگێریی لەوە کردووە کە مرۆڤ، چ پیاو، چ ژن، لەناو نوێژا، دەست بگرێ بە هەردوو کەلەکەیەوە). {تەجرید/٢، لاپەڕە: ١٦، ژمارە: ٥٩٥ = ١٢٢٠، ١٢١٩. تاج/١/٢٩٦، زنجیرە: ٩٧، ژمارە: ٥٨٠ — ش/د/ت/ن}.

## ٢٤١) پێشگیریی لە تف رۆکردن لەبەردەمدا، لە نوێژدا.

## باب: النهيُ أن يَبْزُقَ الرَّجُلُ أمامَهُ فِي الصَّلَاةِ

٣٤٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَأَى نُخَامَةً فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ، فَأَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: « مَا بَالُ أَحَدِكُمْ يَقُومُ مُسْتَقْبِلَ رَبِّهِ، فَيَتَنَخَّعُ أَمَامَهُ؟! أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يُسْتَقْبَلَ فَيُتَنَخَّعَ فِي وَجْهِهِ؟! فَإِذَا تَنَخَّعَ أَحَدُكُمْ فَلْيَتَنَخَّعْ

عَنْ يَسَارِهِ تَحْتَ قَدَمِهِ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَلْيَقُلْ هَكَذَا (وَوَصَفَ الْقَاسِمُ فَتَفَلَ فِي ثَوْبِهِ ثُمَّ مَسَحَ بَعْضَهُ عَلَى بَعْضٍ). {الحديث/١٢٢٨ = ١٢٠٣م} + {تجريد/١/٢٦٧، رقم: ٢٥٦ = ٤٠٥، ٢٤١}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرموویـ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **بەڵغەمێکی دی بە رووی رووگەی مزگەوتەوە، جا رووی کردە خەڵکەکەو فەرمووی: (ئێوە کە لەناو نوێژدا دەبن ئەوە رازو قسەی نهێنی لەگەڵ خودای پەروەردگاری خۆتان دەکەنو روو بەرووی ئەو زاتە رادەوەستن، کەواتە چۆن لەکاتی پیرۆزی وادا لەبەردەمتانەوە تفو بەڵغەمو چڵم رۆدەکەن؟!**

**ئەمە وەکوو ئەوە وایە: کاتێ ئێوە لەگەڵ کەسێکا روو بەروو راوەستن، ئایا حەز دەکەن لەوکاتەدا، ئەو کەسە بەڵغەمێ بدا بەسەرو چاوتانا؟ کاتێ کەسێکتان ویستی بەڵغەمێ رۆبکا، با رۆی نەکاتە بەردەمی، هەروا با لەلای راستیشیەوە رۆی نەکا، بەڵکوو با لەلای چەپیەوە تف رۆبکا، با لەژێر پێی چەپیدا رۆی بکا، ئەگەر ئەوەی بۆ نەکرا با ئاوا ئاوایی بکا)**

**قاسم کە ئەم فەرموودەیە لە ئەبو رافیعەوە، لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە، ئاوا ئاماژەکەی پێغەمبەری بە کردار روونکردەوە: چمکی جلەکەی خۆی گرتو تفی تێکردو وولێیەوە بەسەر یەکا).** {تاج/١/٣٥٨، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٧١٤}.

**روونکردنەوە:**

**بەپێی ئەم فەرموودەیەو کۆمەڵێ فەرموودەی تری راستو دروست تف رۆکردنو هەروا چڵمو بەڵغەم فڕێدان، لەبەردەمداو هەروا لەلای راستەوە، لەناو نوێژداو، لە گشت کاتێکی تردا ناباشە، بە شێوەیەکی گشتی ئیسلام بایەخ بە پاکو خاوێنی دەدا، پێشگیریی لە پیسیو پۆخڵیو قێزەونی دەکا، وە هەوڵی داوەو هەوڵ دەدا کە بەپێی تواناو بەپێی کاتو شوێن، بایەخی تەواو بە پاکیو خاوێنی بدرێ، بەپێی دەقەکانی ئیسلام هەندێ لا، وەك لای راستو بەردەمو رووی رووگەو رووی مزگەوتی پێغەمبەرو رووی گۆڕی پیرۆزیو ... رێزی تایبەتی خۆیان هەیە، دەبێ ئەو رێزەیان بپارێزرێ، لەکاتی تفو سەراوو شتی تری وادا.**

وه ئەم نمونانەیش كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناوی هێناون، رێ لە هۆكارە نوێكانی خۆ پاك راگرتن ناگرن، وەك بەكارهێنانی دەستە سڕو كرێنستو شتی وا.

## ٢٤٢) باوێشكدان لەناو نوێژداو رێگە پێ نەدانی. (٧٤١١ - ٧٤١٩).

## بابٌ: فِي التَّثَاؤُبِ فِي الصَّلَاةِ وَكَظْمُهُ

٣٤٥- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللّه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « إِذَا تَثَاوَبَ أَحَدُكُمْ فِى الصَّلَاةِ فَلْيَكظِمْ مَا اسْتَطَاعَ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَدْخُلُ ». وَفِي رِوَايَةٍ: « فَلْيُمْسِكْ بِيَدِهِ عَلَى فِيهِ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَدْخُلُ ». {الحديث/٧٤١٨ = ٧٤٥٣، ٧٤٥٢} + {تجريد/١/٤٥٤، رقم: ١٣٢٦ = ٣٢٨٩، ٦٢٢٣، ٦٢٢٦}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (باوێشك لە شەیتانەوەیە، جا ئەگەر یەكێكتان باوێشكی هات، بەتایبەتی لەناو نوێژا، با هەتا دەتوانێ بەری بگرێو بیداتە دواوە، چونكە شەیتان لەكاتی دەم داچەقانەكەدا دەچێتە ناو دەمی). لە گێڕانەوەیەكا: (باوێشك لە شەیتانەوەیە، كەواتە: ئەگەر یەكێكتان باویشكی دا با هەتا دەتوانێ بیداتە دواوەو دەم بنووقێنێو بە پشتی دەستی چەپی بەری دەمی بگرێ، چونكە لەوكاتەدا كە دەم پان دەكاتەوەو دەڵێ: هاها، شەیتان دەچێتە ناو دەمی). {ریاض/٢/٣٢٩، ژمارە: ٨٧٦، زنجیرە: ١٤١ + تاج/١/٣٠٢، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ٥٩٠}.

## ٢٤٣) هەڵگرتنی مناڵ لەناو نوێژدا. (١٢١٢ - ١٢١٥).

## بابٌ: حَمْلُ الصِّبْيَانِ فِي الصَّلَاةِ

٣٤٦- عَنْ أَبِى قَتَادَةَ الأَنْصَارِىِّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِىَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَؤُمُّ النَّاسَ وَأُمَامَةُ بِنْتُ أَبِى الْعَاصِ وَهْىَ ابْنَةُ زَيْنَبَ بِنْتِ النَّبِىِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى عَاتِقِهِ، فَإِذَا رَكَعَ وَضَعَهَا، وَإِذَا رَفَعَ مِنَ السُّجُودِ أَعَادَهَا}. {الحديث/١٢١٣ = ١١٨٩ فم = ف.م. تجريد/١/٣١٤، رقم: ٣٠٧ = ٥١٦، ٥٩٩٦}:

ئەبو قەتادەی ئەنصاری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم بینی (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرنوێژی بۆ مەردومەکە دەکرد، لەو کاتەدا ئومامەی کچی ئەبو عاصی بەسەر شانەوە بوو، کە کچی زەینەبی کچی پێغەمبەر بوو، جا لەکاتی چەمینەوە (روکووع)دا دایدەنا، هەتا کاتێ لە کورنووش هەڵ دەسایەوە،، ئەوسا دەیکردەوە قەڵاندۆشکانی).

**روونکردنەوە:**

زەینەبی کچی پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەو بێ) لە خەدیجەی کچی خووەیلیدە، یەکەم کچی پێغەمبەرە، لەپێش سەردەمی پێغەمبەرایەتیدا لەدایك بووە، یەکەم کچی پێغەمبەر بووە کە شووی کردووە، شووی کرد بە ئەبو العاصی کوڕی رەبیع کە پوورزای خۆی بوو، کوڕی هالەی کچی خووەیلید بوو، لەگەڵ پێغەمبەردا کۆچی کرد بۆ مەدینە، بەڵام مێردەکەی لە مەککە مایەوەو موسوڵمان نەبوو، کاتێ ئەبول عاص موسوڵمان بوو، پێغەمبەر بەبێ مارە برینی تازە زەینەبی دایەوە پێی، زەینەب لە ئەبولعاص کچێك‌و کوڕێکی بوو، کوڕەکە ناوی عەلی بوو بە گەنجی مرد، کچەکە ناوی ئومامە بوو، شووی کرد بە ئیمامی عەلی، لەپاش مەرگی فاطیمەی پووری، کوڕێکی لە عەلی بوو ناوی موحەممەد بوو، ساڵی هەشتی کۆچی زەینەب بە مەرگی خودا مرد، ئوم عەتێ‌و چەند ژنێکی تر شۆردیان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی سەرپەرشتی شۆردنەکەیی دەکرد، کراسەکەی خۆی هەڵدا بۆ ژنە مردوو شۆرەکان، کە لەژێر کفنەکەوە، لەسەر گۆشتەوە بیکەنە بەری، ئەوانیش وایان کرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئامادەی شۆردن‌و کفن کردنی ئوم کولثوومی کچیشی بوو، وە خۆی پارچە پارچە کفنەکەی ئوم کولثوومی بۆ هەڵدەدان، لەسەر ئەم شێوەیە:

لەیلای کچی قائیفی ئەل-ثەقەفییە فەرمووی: ئوم کولثوومی کچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە کۆچی دوایی کرد، خۆم یەکێك بووم لەوژنانەی کەدەیان شۆرد، پێغەمبەر خۆی لەلای دەرگاکە دانیشتبوو، کفنەکەی ئوم کولثوومی پێ بوو،

پارچە پارچە دەیدایە دەستمان: لەپیش پێشا کراسەکەی دایە دەستمان، ئینجا سەر کراس، ئنجا سەرپۆش، ئنجا سەردەریی، لەپاش ئەمانە هەموو چەرچەفێکی ئاودامانیان تێوە پێچا، ئوم کولثووم کە روقیەی خوشکی مرد، شووی کرد بە ئیمامی عوثمان، ئەویش لەساڵی نۆی کۆچیدا لەلای عوثمان مرد. {بڕوانە ئەم سەرچاوانە: تجرید/٤/٢٣٩، ژمارە: ١٥٢٢ ژیانی پێغەمبەر + تجرید/١/١٤٨، ژمارە: ١٢٦ عوثمان + تجرید/٣/ ٣٤٣، ژمارە: ١٢١٨ + تجرید/٢/١٨٧، ژمارە: ٧٦١ علی + ژمارە: ١٠٤٣ = ب/٣، لاپەڕە: ١٣٦ + فاطیمە ژمارە: ١٤٦٢ = ب/٤، لاپەڕە: ١٥٢ + تاج/١/٥٤٦، زنجیرە: ٢٠٣، ژمارە: ١٠٦٩، ١٠٧٠ + زنجیرە: ٢٠٥، ژمارە: ١٠٧٧}.

## ٢٤٤) تەختکردنی چەو لەناو نوێژدا. (١٢١٩ - ١٢٢٢).
## باب: مَسْحُ الحَصى فِي الصَّلاَةِ

٣٤٧- عَنْ مُعَيْقِيبٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: ذَكَرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَسْحَ فِى الْمَسْجِدِ، يَعْنِى الْحَصَى، قَالَ: « إِنْ كُنْتَ لاَ بُدَّ فَاعِلاً فَوَاحِدَةً ».
{الحديث/١٢١٩ = ١١٩٥ فم = ف.م. تجريد/٢/١٢، ژمارە: ٥٩١ = ١٢٠٧}:

موعەیقیب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسیارکرا: لەناو نوێژدا، ئەگەر کەسێ لە جێگەی سوژدەکەیدا، چەوو خۆڵ رێك بخاو، بە دەستی، خۆڵو چەوی شوێن کوڕنووشەکەی تەخت بکا، یا هی جێگە نوێژەکەی، ئیتر لەناو مزگەوتا بێ، یا لە دەرەوەی مزگەوت بێ، ئایا شتی وا دروستە یان نا دروستە؟ فەرمووی: (ئەگەر هەر ناچار بوویت، شتی واتکرد، ئەوا یەکجار بیکەو بەس). واتە: بە یەکجار دەست پیاداهێنان چەوەکە یا قۆقزییەکە رێك بخەو مەیکە بە دووجار.

**روونکردنەوە:**

١. وەك لە شەرحەکانی فەرموودەکەوە دەردەکەوێ، لەم جۆرە دەربڕینانەدا، جیاوازی لەنێوانی ژنو پیاودا نییە، ناو هێنانی پیاو لەم جۆرە شوێنو پرسیارانەدا، لەبەر زۆرینەییە، یا لەبەرئەوەیە کە بەیانی حاڵەو پرسیارەکە پیاو

کردوویەتی، ئەگینا هەم بۆ پیاوو هەم بۆ ژن دروستە کە لەناو نوێژدا، نارێکی کوڕنووشگاکەیان ڕێك بکەن، ئەگەر بەهۆی خۆڵو زیخو چەوو شتی تری واوە، بەرزو نزمی تیادا بوو، سوننەتە کە لەپێش نوێژ دابەستندا، ئەم جۆرە کارانە ئەنجام بدرێنو جێگەی نوێژەکە ئامادەو ساز بکرێ. لە رافە نامە (شەرحە)کانا دەفەرموێ: حیکمەتی ئەمە ئەم دوو شتەیە: چەوەکە حەزدەکا کە سەجدەکە لەسەر ئەو ببرێ، هەروا لەناو نوێژدا رەحمەتی خودا روو بەروویەتی، کەواتە با نوێژکار ئارامو هێمن بێو بەشتی ترەوە خۆی خەریك نەکا، وا باشە ئەگەر لەناو نوێژدا، خۆڵێ، چەوێ، پووشکەیێ، نووسا بە ناوچاویەوە، هەتا لە مزگەوتەکە دەردەچێ، یا جێگە نوێژەکەی بەجێ دەهێڵێ، ئەو شتەی کە نووساوە بە تەوێڵیەوە لێی نەکاتەوە.

٢. موعەیقیبی کوڕی ئەبو فاطیمی دەوسی، لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکانە، لە مەککە موسوڵمان بووە، لەوێوە کۆچی دووەمی کردووە بۆ حەبەشە، لەوێ مایەوە هەتا پێغەمبەر (درוودی خودای لەسەر بێ) کۆچی فەرموو بۆ مەدینەی نازدار، جا ئەویش لە حەبەشەوە تەشریفی برد بۆلای پێغەمبەر (درוودی خودای لەسەر بێ) ئامادەی پەیمانی بەیعەتولرِیضوان بووە، هەروا هەموو شەڕگەو مەڵبەندەکانی تری پاش ئەو، چاودێری سەر ئەموستیلەکەی پێغەمبەر بوو، فەرموودەی کەم گێڕاوەتەوە، ئەم فەرموودەیەی ئێرەیەی (متفق علیه)یە، بوخاریو موسلیم گێڕاویانەتەوە، لەسەردەمی جێنشینی ئەبوبەکرو عومەردا، موعەیقیب سەرکاری سەر بەیتولمال بوو، (رەزای خودا لە هەموویان بێ)، ئەو ئەموستیلەیەی پێغەمبەر (درוودی خودای لەسەر بێ) کە کەوتە لای ئیمامی عوثمانو ئیمامی عوثمان زۆر زۆر بایەخی پێ دەداو تەباروکی پێوەی دەکردو دادەنرا بە سەرچاوەی نگینو بەختەوەری گەلی ئیسلام، بەدەستی ئەمەوە بوو، کە کەوتە ناو بیری ئەریسەوە، کە عوسمان ئەم رووداوە چاوەڕوان نەکراوەی زۆر پێ ناخۆش بوو، وە هەوڵو تەقەلایەکی زۆری دا، بۆ دۆزینەوەی، بەڵام رەشە راهاتو نەدۆزرایەوە، تەنانەت دەڵێن: ئیمامی عوثمان قوڕو لیتەی بن بیرەکەی

گشت دەرهێناو، بە بێژەنگ بێژرایەوە هەر نەدۆزرایەوە، ئیتر بەرە بەرە دووبەرەکیو ناکۆکیو ناتەبایی سەری هەڵدا، وە هەتا ئەمرۆکەیش هەر بەردەوامەو لێرەو لەوێ، جیهانی ئیسلامی ناو بەناو گورزێکی کاریگەری لێ دەدریو شەری خۆخۆری سەر هەڵدەدا، هەر رۆژێ بەناوێکەوەو هەر جارێ لەلایەکەوە، خودای گەورە پەنامان بدا، لە ئاخرو ئۆخری جێنشینی پێشەوا عوسماندا، مەرگ بوو بە میوانیو فەرمانی هەقی بەجێ هێنا، (رەحمەتو رەزای خودای لێ بێ). ئامین.

## ٢٤٥) پێڵاو خشاندن لە بەڵغەمو شتی وا.
## بابٌ: دَلْكُ النُّخَامَةِ بِالنَّعْلِ

٣٤٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الشِّخِّيرِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَرَأَيْتُهُ تَنَخَّعَ فَدَلَكَهَا بِنَعْلِهِ). {الحديث/١٢٣٤ = ١٢٠٨ فم} + {ابو داود: ٤٨٣، ٤٨٤}:

عەبدوڵلا کوری شەخیر (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەپشت پێغەمبەرەوە نوێژی جەماعەتم دەکرد، بینیم کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو نوێژەکەدا، بەڵغەمێکی رۆکردە ژێر پێی چەپیو بە پێڵاوەکەی پانی کردەوە بەزەوییەکەدا).

**روونکردنەوە:**

عەبدوڵلای کوری شیخیری کوری عەوف عامیرییە، یەکێکە لە هاورێ نازدارەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دادەنرێ بە بەصری، مطرفی کوریو یەزیدی کوری فەرموودەکانی ئەویان گێراوەتەوە، دەڵێن: مطرف خەریکی قورئان خوێندن دەبێ لەوکاتەدا دەبوورێتەوەو دەمرێ، هەندێ گومان وا دەبەن کە مطرف پێغەمبەری دیبێ.

**٢٤٦) خڕ هەڵدانی قژە سەر لەناو نوێژدا.** (١٠٩٥ - ١١٠١).

**بَابٌ: عَقْصُ الرَّأسِ فِي الصَّلاَةِ**

٣٤٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) أَنَّهُ: رَأَى عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الْحَارِثِ يُصَلِّي وَرَأْسُهُ مَعْقُوصٌ مِنْ وَرَائِهِ، فَقَامَ فَجَعَلَ يَحُلُّهُ، فَلَمَّا انْصَرَفَ أَقْبَلَ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَقَالَ: مَا لَكَ وَرَأْسِي؟ فَقَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: « إِنَّمَا مَثَلُ هَذَا مَثَلُ الَّذِي يُصَلِّي وَهُوَ مَكْتُوفٌ ». {الحديث/١١٠١ = ١٠٨٧ ف.م} :

عەبدوڵلای کوڕی عەباس (رەزای خودایان لێ بێ) عەبدوڵلای کوڕی حاریثی بینی نوێژی دەکرد، لەپشتە سەریەوە قژە سەرەکەیی خڕ هەڵدابوو، وە گرێی دابوو بەیەکەوە وەك پەلکەو پرچ، ئیبنو عەباس هەڵسا چوو یەکە یەکە کردنیەوە، جا کە عەبدوڵلا نوێژەکەی تەواوکرد، چوو بۆلای ئیبنو عەباس و گوتی: تۆ هەقت چییە بە قژە سەری منەوە؟ ئەویش فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو: (وێنەی ئەم جۆرە کەسە کە لەسەر ئەم شێوەیە نوێژ بکەن، وەك وێنەی کەسێ وایە، کە لەپشتیەوە هەردوو دەستی کەلەبچە کرابن، دیارە لەکاتی وادا ناتوانێ کە سوژدە بەرێ).

لە گێڕانەوەیەکی تاجا دەفەرموێ: (ئەو شێوە قژ خڕ هەڵدانە لەپشتە سەرەوە، دۆشەکەڵەی شەیتانە لەسەری دادەنیشێ). {تاج/١/٣٠١، ژمارە: ٥٨٦، زنجیرە: ٩٩}.

**٢٤٧) نوێژ لەکاتێکا نان ئامادە بێت.** (١٢٤٠ - ١٢٤٧).

**بَابٌ: الصَّلاَةُ بِحَضْرَةِ الطَّعَامِ**

٣٥٠- عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « إِذَا قُرِّبَ الْعَشَاءُ وَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَابْدَءُوا بِهِ قَبْلَ أَنْ تُصَلُّوا صَلاَةَ الْمَغْرِبِ وَلاَ تَعْجَلُوا عَنْ عَشَائِكُمْ ». {الحديث/١٢٤٢ — ١٢١٤ ف.م/تجريد/١/٣٧١، رقم: ٣٨٠ = ٦٧٢، ٥٤٦٣ فتح الباري} :

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر شێو دانرا، دەستی پێ بکەن، لەپێش کردنی نوێژی شێوانا، با

نوێژیش بووبێ، وه هیچ پەلە لە شێوەکەتان مەکەن‌و، نانەکەتان بە شێنەیی بە تەواوی بخۆن‌و، ئەوسا نوێژەکەتان بکەن، بەبێ ئەوەی کە دڵتان لای نانەکەبێ، وە هەروەها نوێژەکانی تریش). {تاج/١/٣٠٠، زنجیرە: ٩٨، ژمارە: ٥٨٣}.

## ٢٤٨) هەڵە کردن لە نوێژاو کوڕنووشی هەڵە. (١٢٦٥ - ١٢٩٤).

## بابُ: السَّهْوِ فِي الصَّلاَةِ و الأمْرُ بالسُّجُودِ فيه

٣٥١- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ): « إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِى صَلاَتِهِ فَلَمْ يَدْرِ كَمْ صَلَّى ثلاَثًا أَمْ أَرْبَعًا، فَلْيَطْرَحِ الشَّكَّ وَلْيَبْنِ عَلَى ما اسْتَيْقَنَ، ثُمَّ يَسْجُدُ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ، فَإِنْ كَانَ صَلَّى خَمْسًا شَفَعْنَ لَـهُ صَلاَتَهُ، وَإِنْ كَانَ صَلَّى إِتْمَامًا لأَرْبَعٍ كَانَتَا تَرْغِيمًا لِلشَّيْطَانِ ». {الحديث/١٢٧٢ = ١٢٤١ فم}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر کەسێکتان لەناو نوێژدا، گومانی بۆ پەیدا بوو، وە نەیدەزانی کەسێ ڕکاتی کردووە، یا چوار، ئەوە با گومانەکەی توورِبدا، چەندەی لەلا یەقین‌و بێ گومانە، با لەسەر ئەوەوە نوێژەکەی تەواو بکا، ئەوجا لەپێش سڵاودانەوەوە دوو کوڕنووشی هەڵە ببات، جا ئەگەر لە ڕاستیدا پێنج ڕکاتی کردبوو لەباتی چوار ڕکات، ئەوا ئەو دوو کوڕنووشە نوێژەکە دەکەنەوە بە جووت، چونکە نوێژی چوار ڕکاتی دەبێ جووت بێ، ئەگەر چواری تەواویشی کردبوو ئەوا ئەو دوو کوڕنووشە دەبن بەهۆی نوشوستی‌و سەر شۆڕی بۆ شەیتان، چونکە پیلانەکەی کە کردبووی بۆ شێواندنی نوێژەکە پووچ دەکەنەوە!). {تاج/١/٣٢٣، زنجیرە: ١٠٩، ژمارە: ٦٣٥}.

٣٥٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) إِحْدَى صَلاَتَي الْعَشِيِّ، إِمَّا الظُّهْرَ وَإِمَّا الْعَصْرَ، فَسَلَّمَ فِى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَتَى جِذْعًا فِى قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ فَاسْتَنَدَ إِلَيْهَا مُغْضَبًا، وَفِى الْقَوْمِ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ (رَضِيَ اللَّـهُ عنهما)، فَهَابَا أَنْ يَتَكَلَّمَا، وَخَرَجَ سَرَعَانُ النَّاسِ قَالُوا: قُصِرَتِ الصَّلاَةُ، فَقَامَ ذُو الْيَدَيْنِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَقُصِرَتِ الصَّلاَةُ أَمْ نَسِيتَ؟ فَنَظَرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَمِينًا وَشِمَالاً فَقَالَ: « مَا يَقُولُ ذُو الْيَدَيْنِ؟». قَالُوا: صَدَقَ، لَمْ تُصَلِّ إِلاَّ رَكْعَتَيْنِ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَسَلَّمَ،

ثُمَّ كَبَّرَ ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ كَبَّرَ فَرَفَعَ، ثُمَّ كَبَّرَ وَسَجَدَ، ثُمَّ كَبَّرَ وَرَفَعَ. قَالَ: وَأُخْبِرْتُ عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ أَنَّهُ قَالَ: وَسَلَّمَ». {الحديث/١٢٨٨ = ١٢٥٥ = فم = فَتْحُ الْمُلْهِمِ = ٤٨٢ تجريد = ٧١٤، ٧١٥، ١٢٢٧، ١٢٢٨، ١٢٢٩، ٦٠٥١، ٧٢٥٠}:

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لیٚ بـێ) فـەرمووی: جـاریٚ پیٚغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بەرنویٚژیی نویٚژی نیوەڕۆ (یا عەسر)ی بۆ دەکردین، دوو ركاتی بۆمان کردو سلاٚوی دایەوە، تەختەیەك لەناو مزگەوتا، لەرووی رووگەوە هەڵ سەپیٚنرا بـوو، پیٚغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) هەڵسـا پـاڵی دا بـەو تەختەیـەوە، کـە بریٚتـی بـوو لـەو کۆتـەرە خورمایە، کە پیٚغەمبەر لەپیٚش دروسـتکردنی دوانگەکەیـدا پـاڵی پیٚـوەی دەدا، وەك عـاجزو زیـز وابـوو، دەسـتی راسـتی نایـە سـەر دەسـتی چـەپی‌و پەنجـەکانی تیٚـك پەڕانـدو روومـەتی لای راسـتی دانـا لەسـەر پشـتی دەسـتی چـەپی، وە ئەوانـەی بـە پەلـەبوون لـە دەرگاکـانی مزگەوتـەوە چـوونە دەرەوە، نویٚژکـەرەکانی تـریش لەبەرخۆیانەوە گوتیان: نویٚژ کورت کراوەتەوە؟ ئەبوبـەکرو عومـەریش (رەزای خودایان لیٚ بیٚ) لەناو کۆمەڵەی نویٚژ خویٚنەکانا بوون، پرکیٚشییان نەکرد کە لـەم بارەیـەوە قسـە لەگەڵ حەزرەتـدا بکـەن، لـەناو کۆمەڵەکـەدا پیـاویٚ هـەبوو، هـەردوو دەسـتی کـەمیٚ دریٚژ بوون، لەبەرئەوە پیٚیان دەگوت: ذولیەدەین (واتـە: دوو دەسـت دریٚژکەلـە) جـا ئەو پیاوە هەڵسا، عەرزی خۆشەویستی کرد: قوربـان! ئـەی پیٚغەمبـەری خـودا! ئایـا نویٚژ کورت کراوەتەوە، یـاتۆ لـەیادت نـەبووە، کـەوا لـەباتی چـوار رکـات دوو رکاتـت کـرد؟ پیٚغەمبـەریش (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (ئـەم دوو شـتە هیچـیان رووی نەداوە، نە من لەبیرم چووەو نە نویٚژیش کورت بۆتـەوە، ئـەویش عـەرزی کـرد: بـا، ئەی پیٚغەمبەری خودا! یەکیٚ لەم دوو شتە رووی داوە، پیٚغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) بەڕاستو بە چەپا تەماشای خەڵکەکەی کردو رووی تیٚ کردن‌و فـەرمووی: (ئایـا شـتی وا رووی داوە، وەك ذولیـەدەین دەڵیٚ وایـە؟) گوتیـان: بـەڵیٚ ئـەی پیٚغەمبـەری خودا! قسەکەی تەواوە، تەنیا دوو رەکاتـت کـرد، ئـەنجا پیٚغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گەڕایەوە بۆ جیٚگەی نویٚژەکەی خۆی‌و، پیٚشکەوتەوەو دوو رکـاتی تـری کـردو، بـە

دانیشتنەوە، لەپاش سلاودانەوە، دوو کوڕنووشی هەڵەی لەسەر ئەم شێوەیە برد: لەپاش سلاودانەوەی جاری دووەم، ئەڵلاهو ئەکبەری کردو کوڕنووشێکی ئاسایی برد، یان کەمێ درێژتر، ئەوجا ئەڵلاهو ئەکبەری کردو لە کوڕنووشی یەکەم هەڵسایەوە، ئەوجا ئەڵلاهو ئەکبەری کردو کوڕنووشێ ئاسایی تری برد، یان کەمێ درێژتر لە کوڕنووشی ئاسایی، دیسانەوە ئەڵلاهو ئەکبەری کردو سەری بەرزەوە کردو بۆ جاری سێیەم سلاوی دایەوە). {تاج/١/٣٢٦، زنجیرە: ١٠٩، ژمارە: ٦٤٠، ٦٤١، ٦٤٢}.

**٢٤٩) باسی کوڕنووشی قورئان خوێندن (واتە:سەجدەی تیلاوەت). (١٢٩٥ - ١٣١٢)**
**باب: في سجود القرآن**

٣٥٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّهُ عنهما): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): كَانَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، فَيَقْرَأُ سُورَةً فِيهَا سَجْدَةٌ، فَيَسْجُدُ وَنَسْجُدُ مَعَهُ حَتَّى مَا يَجِدُ بَعْضُنَا مَوْضِعًا لِمَكَانِ جَبْهَتِهِ». {الحديث/١٢٩٥ = ١٢٦٢ فم. تجريد/١/٥١٨، رقم: ٥٤٣ = ١٠٧٥، ١٠٧٦، ١٠٧٩}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە ئەو سوورەتانەی ناو قورئانی بۆمان دەخوێند، کە کوڕنووشیان واتیادا، کاتێ دەگەیشتە ئەو ئایەتەی کە شوێنی کوڕنووشەکەیە، خۆی کوڕنووشی دەبردو ئێمەش کوڕنووشمان لەگەڵیدا دەبرد، تەنانەت لەبەر زۆری عەشاماتەکە، هەندێکمان جێگەی دەست نەدەکەوت، هەتا لەکاتی کوڕنووشەکەدا تەوێڵی لەسەر دانێ). {تاج/١/٣٣٠، زنجیرە: ١١٠، ژمارە: ٦٤٦}..

٣٥٤- عَنْ أَبِي رَافِعٍ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ)،، صَلَاةَ الْعَتَمَةِ، فَقَرَأَ: (إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ) فَسَجَدَ فِيهَا، فَقُلْتُ لَهُ: مَا هَذِهِ السَّجْدَةُ؟ قَالَ: سَجَدْتُ بِهَا خَلْفَ أَبِي الْقَاسِمِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَا أَزَالُ أَسْجُدُ بِهَا حَتَّى أَلْقَاهُ». {الحديث/١٣٠٦ = ١٢٧٣ فم}:

ئەبو رافیع (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) بەرنوێژیی نوێژی خەوتنانی بۆ کردین، سوورەتی {إِذَا السَّمَاء انشَقَّتْ}ی خوێند، کە گەیشتە ئایەتی: {وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنُ لَا يَسْجُدُونَ} کوڕنووشی برد. کە لە نوێژ بووینەوە گوتم: ئەم کوڕنووشە چی بوو؟ فەرمووی: لەپشتی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژم کردووەو لەدوای ئەم ئایەتەوە لەناو ئەو نوێژەدا، لەگەڵ حەزرەتدا، کوڕنووشی قورئان خوێندنم بردووە، لەبەرئەوە هەتا دەگەمەوە بە خزمەتی لەودنیا، لەم شوێنەدا، ئەم کوڕنووشە هەر دەبەمو هەرگیز تەرکی ناکەم).
{تاج/١/٣٣٣،زنجیرە:١١٠،ژمارە:٦٥٤} + {تجرید/١/٤٠١، ژمارە:٤١٧=٧٦٦، ٧٦٨، ١٠٧٤، ١٠٧٨}.

## ٢٥٠) قونووت خوێندن لە نوێژی بەیانیدا. (١٥٣٨ - ١٥٥٧).

## بابٌ: القُنُوتُ فِي صَلاَةِ الصُّبْحِ

٣٥٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ حِينَ يَفْرُغُ مِنْ صَلاَةِ الْفَجْرِ مِنَ الْقِرَاءَةِ وَيُكَبِّرُ، وَيَرْفَعُ رَأْسَهُ: « سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، ثُمَّ يَقُولُ وَهُوَ قَائِمٌ: اللَّهُمَّ أَنْجِ الْوَلِيدَ بْنَ الْوَلِيدِ وَسَلَمَةَ بْنَ هِشَامٍ وَعَيَّاشَ بْنَ أَبِي رَبِيعَةَ، وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ، اللَّهُمَّ اشْدُدْ وَطْأَتَكَ عَلَى مُضَرَ، وَاجْعَلْهَا عَلَيْهِمْ كَسِنِي يُوسُفَ، اللَّهُمَّ الْعَنْ لِحْيَانَ وَرِعْلاً وَذَكْوَانَ، وَعُصَيَّةَ، عَصَتِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ». ثُمَّ بَلَغَنَا أَنَّهُ تَرَكَ ذَلِكَ لَمَّا أُنْزِلَ: (لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ، أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ). {الحديث/١٥٣٨ = ١٥٠٤ فم. تجريد/١/٤١١، رقم: ٤٣٢ = ٧٩٧، ٨٠٤، ١٠٠٦، ٢٩٣٢، ٣٣٨٦، ٤٥٦٠، ٤٥٩٨، ٦٢٠٠، ٦٣٩٣، ٦٩٤٠}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە قورئان خوێندنی رکاتی دووەمی نوێژی بەیانی دەبۆوە ئەڵڵاهو ئەکبەری دەکردو، دەچوو بۆ چەمینەوە، ویردی ناو چەمینەوەی دەخوێندو ئەوسا سەری لە چەمینەوە بەرز دەکردەوەو دەیفەرموو: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الحَمْدُ = هەرکەسێ ستایش‌و سوپاسی یەزدانی پاك بكاو نیازو مرازی خۆی عەرزی بارەگای ئەو زاتە مەزنە بکا، ئەوە هەم سوپاسەکەی‌و هەم نیازەکەی گیرایە).

ئـەوجا هـەر بـە راوەسـتانەوە دەیفـەرموو: (خودایـە! وەلیـدی کـوڕی وەلیـدو سـەلەمەی کـوڕی هیشـامو عەییاشـی کـوڕی ئـەبو رەبیعـەو هـەموو موسـوڵمانە لازەبوونەکانی تر، لە دیلیو ژێر چەپۆکەیی بێباوەڕان رزگار بفەرموو، خودایە! لە هۆزی موضەر هەڵپێچیو تەنگیان پێ هەڵچنیو، لایان لێ ببڕیتـەوە، تووشـی وشکە ساڵیو قاتو قڕییەکی وایان بکەی، وەك حەوت ساڵە گرانییەکەی سەردەمی یووسف پێغەمبەر، خودایە! نەفرین بکە لـە هۆزی لـەحیانو، لـە هـۆزی ریعلو، لـە هـۆزی زەکوانو، لە هۆزی عوصەییە، کە لە خوداو پێغەمبەری خودا یاخی بوون).

ئەبو هورەیرە فەرمووی: هەواڵمان پـێ گەیشتووە، کە کاتـێ ئـەم ئایەتـە هاتـە خوارەوە، کە دەفەرموێ: {لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ - سورة آل عمران/٣، رقم الآية/١٢٨} واتە:

ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! بڕیاری چارەنووس سەبارەت بەم کەسانە، هەروا لە بارەی شتانی ترەوە، کەم یا زۆر، بە دەستی تۆ نییەو، بە دەستی خودا خۆیـەتی، وە ئەم کۆمەڵە تاوانبارانە، یا تەوبە دەکەنو خودا تەوبەیان لێ گیرا دەکا، یا لەسـەر ئەم تاوانبارییەیان خودا سزایان دەدا، ئەگـەر تەوبـەی لێ نەکـەن، چونکە بەڕاسـتی ئەو بێباوەڕانە زۆر ستەمکارن).

ئەبو هورەیرە فەرمووی: هەواڵمان پـێ گەیشتووە، کـە کاتـێ ئـەم ئایەتـە هاتـە خوارەوە، پێغەمبەر وازی لەم نزای شەڕە لەم هۆزانـە هێنـا، بـەڵام قونـوت خوێنـدن هەرمایەوە). {تاج/١/٢٨٨، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٥٦٢} + {تاج/٥/٢٤٠}.

**ڕوونکردنەوە:**

١-وەلیـدی کـوڕی وەلیـد، بـرای خالیـدی کـوڕی وەلیـدە، لـە پیرۆزیـی نزاکـەی پێغەمبەرەوە رزگاری بوو، کە دەگاتە حەررە لەوێ، پێی لەبەردێ هەڵ دەکەوێو پێی زامار دەبێو سێ رۆژ لەسەر ئەو حاڵە بـەڕێوە دەبـێ، هـەتا دەگاتـە خزمـەت پێغەمبەر لە مەدینە، لەوێ لەبەردەم پێغەمبەردا، هەناسەی سوار دەبێو دەست

دەكا بە گیانەڵاو دەمرێ، پێغەمبەریش دەفەرموێ: (ئەمە شەهیدە، من شایەتی شەهید بوونی بۆ دەدەم).

٢ -سەلەمەی كوڕی هیشام برای ئەبو جەهلە، هەتا زەمانی جێنشینیی ئیمامی عومەر ما، لە موسوڵمانە هەرە پێشینەكانە، لە پێناوی خوادا ئازارو سزادرا، لەسەردەمی جێنشینیی ئەبوبەكرا، لەشام، لەساڵی چواردەی كۆچیدا مردووە.

٣ -عەیياشی كوڕی ئەبو رەبیعە، دایك برای ئەبو جەهلە، لە موسوڵمانە هەرە پێشینەكانە، دوو كۆچی كردووە، هەتا سەردەمی جێنشینیی عومەر ژیاوە.

٤ -قونووت خوێندن لە ركاتی دووەمی نوێژی بەیانیدا، لەپاش روكووعی دووەمەوە سوننەتە، چونكە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا مردووە تەركی نەكردووە.

**٢٥١) قونووت خوێندن لە نوێژی نیوەڕۆو لە نوێژەكانی تردا.** (١٥٣٨ - ١٥٥٧)

**باب: القنوت فِي الظُّهْرِ وَغَيْرِهَا**

٣٥٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: وَاللهِ لأُقَرِّبَنَّ بِكُمْ صَلاَةَ رَسُولِ اللّه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَكَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ يَقْنُتُ فِي الظُّهْرِ وَالْعِشَاءِ الآخِرَةِ، وَصَلاَةِ الصُّبْحِ، وَيَدْعُو لِلْمُؤْمِنِينَ، وَيَلْعَنُ الْكُفَّارَ». {الحديث/١٥٤٢ = ١٥٠٨. تجريد/١/٤١١، رقم: ٤٣٢ = ٧٩٧، ٨٠٤، ١٠٠٦، ٢٩٣٢، ٣٣٨٦، ٤٥٦٠، ٤٥٩٨، ٦٢٠٠، ٦٣٩٣، ٦٩٤٠}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەخودا كە بەرنوێژیتان بۆ دەكەم، نزیكی دەكەمەوە لە چۆنێتیی نوێژكردنی پێغەمبەر خۆیەوە، (دروودی خودای لەسەر بێ)، دەستووری ئەبو هورەیرە وابوو، لەدوا ركاتی نوێژەكانی نیوەڕۆو خەوتنانو بەیانیاندا، لەپاش گوتەی (سَمِعَ اللّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)وەوە، قونووتی دەخوێندو نزای چاكەی بۆ موسوڵمانان دەكردو نەفرەتو لەعنەتی لەبێ باوەڕان دەكرد). {تاج/١/٢٨٧، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٥٦١}.

## ٢٥٢) قونووت لەدوا ركاتی نوێژی شێوانا.

## باب: القُنُوتُ فِي المَغْرِبِ

٣٥٧- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولِ اللّه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقْنُتُ فِى الصُّبْحِ وَالْمَغْرِبِ». و{الحديث/١٥٥٣ = ١٥١٩ فم}:

بەراء (رەزای خودای لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆرجار لە نوێژی بەیانیو لە نوێژی شێوانا قونووتی دەخوێند. {تاج/١/٢٨٧، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٥٥٩} ئەم فەرموودەیە لە بوخاریدا، لە ئەنەسەوە ئاوایە: (لە سەرەتاوە لە نوێژی شێوانو لە نوێژی بەیانیدا قونووت هەبوو). {تجرید/١/٤١٢، ژمارە: ٤٣٤ = ٧٩٩ فتح}. بۆ درێژەی باسی قونووت بڕوانە فیقهی ئاسان، بەرگی یەکەم لاپەڕە: ١٦٥، زنجیرە: ٦١.

## ٢٥٣) باسی دووركاتە سوننەتەكەی پێش نوێژی بەیانی. (١٦٧٣ - ١٦٩٠).

## باب: في رَكْعَتَى الفَجْرِ

٣٥٨- عَنْ حَفْصَةَ (رَضِىَ اللّهُ عنها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ لاَ يُصَلِّى إِلاَّ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ». {الحديث/١٦٧٥ = ١٦٤٢. تجريد/١/٣٥٦، رقم: ٣٥٩ = ٦١٨، ١١٧٣، ١١٨١}:

حەپسەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لە هاوسەرەكانی بێ) دەفەرموێ: كاتێ بانگی بەیانی دەداو بانگ بێژ لە بانگ دەبۆوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەنیا دوو ركات نوێژی سوننەتی سووكەڵەی دەكرد، بەرلەوە كە قامەت بكرێ بۆ نوێژی بەیانی).

**روونكردنەوە:**

أ/ ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیەو فەرموودەكانی تری ئەم باسە وەردەگیرێ:

١. كاتی كردنی ئەم سوننەتە، شەبەقدانە.

٢. لەسەرەتای كاتەوە خێری پترە.

٣. دوو ركاتی سووكەڵە بنو بەس.

٤. لەپاش كردنی نوێژی بەیانی، هەرنوێژێ هۆیەكی تایبەتی نەبێ ناباشە، نوێژی هۆدار وەك: نوێژی تەرمو دیاری مزگەوتو دەستنوێژ. {بڕوانە: فیقهی ئاسان/١/١٨٨، زنجیرە: ٦٣} + {لاپەڕە: ٢٢٠، زنجیرە: ٧٠}.

ب- حەفصەی كچی ئیمامی عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) هاوسەری پێغەمبەری خودایە، لە ساڵی سێیەمی كۆچیدا، بە بێوەژنی لەدوا عائیشە، شووی كرد بە پێغەمبەر، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە پەسنی جوانی حەفصەدا دەفەرموێ: (جوبرائیل پێی فەرمووم: حەفصە رۆژووەوانێكی باشو شەو نوێژ كەرێكی زۆر چاكە، لە دنیاداو لە بەهەشتیشا هاوسەری تۆیە!). حەفصە هەتا مرد هەمیشە بەرۆژوو بوو، لە ژنە كۆچكارەكان بوو، سەر وەسێتی باوكی بوو، پێنج فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە، خوێنەوار بوو، خوشكی باوكیو دایكی ئیبنو عومەرە، هەندێ دەڵێن: ساڵی چلویەك مردووە، هەندێ تر دەڵێن: چلو پێنج مردووە، ئەبو هورەیرە چووە ژێر تەرمەكەی. {بڕوانە: تاج/٥/١٦٢، زنجیرە: ٤١، ژمارە: ٣٤٤٤ + زنجیرە: ٩٤، ژمارە: ٣٦٨٥}.

## ٢٥٤) باسی بەهرەی دوو ركاتە سوننەتەكەی پێش نوێژی بەیانی.
## بابٌ: فَضْلُ رَكْعَتَي الفَجْر

٣٥٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « رَكْعَتَا الْفَجْرِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا». {الحديث/١٦٨٥ = ١٦٥٢ فَتْحُ الْمُلْهِمِ}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (دوو ركاتە سوننەتەكەی پێش نوێژی بەیانی، لە هەموو موڵكو سامانو خۆشیو رابواردنی دنیا باشترن). {تاج/١/٣٠٥، ژمارە: ٥٩٥، زنجیرە: ١٠٢}.

## ٢٥٥) چی لەم دوو ركاتە سوننەتەی پێش نوێژی بەیانی لەپاش فاتیحاوە دەخوێندرێ؟ {باب: القِراءَةُ فِي رَكْعَتَي الفَجْر}

٣٦٠- عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولِ اللّه (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَرَأَ فِي رَكْعَتَيْ الْفَجْرِ: (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ) وَ(قُلْ هُوَ اللّهُ أَحَدٌ ).{الحديث/١٦٨٧= ١٦٥٤ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) جاروبار لە دوو رکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانیدا، لەپاش خوێندنی فاتیحا، لە رکاتی یەکەمیانا سوورەتی (قُـلْ يَـا أَيُّهَـا الكَـافِرُونَ)ەی دەخوێندو، لە رکاتی دووەمیانا سوورەتی (قُلْ هُوَ اللّهُ أَحَد)ی دەخوێند).

**روونکردنەوە:**

١. فەرموودەی ژمارە: ١٦٥٥/١٦٨٨فم، لە صەحیحی موسلیما ئەمە وەرگەڕاوی دەقەکەیەتی: ئیبنو عەباس دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە دوو رکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانیدا، لە یەکەمیانا، گەلێ جار ئەم ئایەتەی دەخوێند، کەوا لە سوورەتی بەقەرەدا، کە دەفەرموێ: {قُولُوا آمَنَّا بِاللّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَالنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ — بقرة/١٣٦} وە لە دووەمیانا، ئەم ئایەتەی دەخوێند کەوا لە سوورەتی ئالی عیمرانا: {فَلَمَّا أَحَسَّ عِيسَى مِنْهُمُ الْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِي إِلَى اللّهِ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ اللّهِ آمَنَّا بِاللّهِ وَاشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ — ئالی عیمران/٥٢}.

٢. فەرموودەی ژمارە/١٦٨٩ = ١٦٥٦فم، لە صەحیحی موسلیما ئەمە وەرگەڕاوی دەقەکەیەتی: ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش خوێندنی فاتیحا، لە دوو رکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانیدا، لە یەکەمیانا، گەلێ جار ئەم ئایەتەی دەخوێند، کەوا لە سوورەتی بەقەرەدا، کە دەفەرموێ: {قُولوا آمَنَّا بِاللّهِ وَمَا أُنزِلَ عَلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَالنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ} ، وە لە دووەمیانا ئەم ئایەتەی دەخوێند، کەوا لە سوورەتی ئالی عیمرانا: {قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ — ئالی عیمران/٦٤}. {تاج/٣٠٦/١، زنجیرە: ١٠٢، ژمارە: ٦٠٠}.

٣. کەواتــە خوێنــدنی ئــەم ســوورەتو ئایەتانــە، لــەم دوو شــوێنەدا ســوننەتن، بەڵــکوو هــەر سوورەتێــکی تــر، یــا هــەر ئایەتێــکی تــر لــەم دوو شــوێنەدا دروســتن‌و ئەصڵی سوننەتەکە دێتە دی.

**٢٥٦) لەبەینی کردنی دوو رکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانیو چاوەڕوانکردنی کردنی نوێژی بەیانیدا راکشان لەسەر لای راست بەرەو رووگە سوننەتە.** (١٧١٤ - ١٧٧٥).

**باب: الإِضْطِجَاعُ بَعْدَ رَكْعَتَيِ الفَجْرِ**

٣٦١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِىَ اللّهُ عنها) قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا صَلَّى رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ فَـإِنْ كُنْـتُ مُسْتَيْقِظَةً حَدَّثَنِى، وَإِلاَّ اضْـطَجَعَ. {الحـديث/ ١٧٢٩ = ١٦٩٦. فـم. تجريـد/١/٥٣٣، رقـم: ٥٥٧ = ١١١٩، ١١١٨، ١١٤٨، ١١٦١، ١١٦٨، ٤٨٣٧}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: زۆرجـاران کـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو رکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی دەکرد، ئەگەر من بە خەبەر بوومایە ئـەوا قسەی لەگەڵ دەکردم، ئەگەر من خەوتوو بوومایە، ئەوا ئەویش رادەکشا. (درروودی خودای لەسەر بێ) هــەتا بانگــدەر دەهــات ئاگــاداری دەکــردەوە کــەوا کــاتی قامەتکردنــە). {تاج/١/٣٠٧، زنجیرە: ١٠٢، ژمارە: ٦٠١}.

**٢٥٧) لەپاش کردنی نوێژی بەیانی دانیشتن لە جێگەی نوێژەکەدا سوننەتە.** (٥٩٨٩). **بابٌ: الجُلُوسُ فِي المُصَلَّى بَعْدَ صَلاَةِ الصُّبْحِ**

٣٦٢- عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ قَـالَ: قُلْتُ لِجَـابِرِ بْـنِ سَمُرَةَ (رَضِـي اللّهُ عَنْـهُ): أَكُنْـتَ تُجَالِسُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: نَعَمْ كَثِيرًا. كَانَ لاَ يَقُومُ مِنْ مُصَلاَّهُ الَّـذِى يُصَلِّى فِيهِ الصُّبْحَ (أَوِ الْغَـدَاةَ) حَتَّـى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، فَـإِذَا طَلَعَـتِ الشَّمْسُ قَـامَ، وَكَـانُوا يَتَحَدَّثُونَ، فَيَأْخُذُونَ فِى أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ فَيَضْحَكُونَ وَيَتَبَسَّمُ. {الحـديث/٥٩٨٩، ١٥٢٣ = ٥٩٩١، ١٤٩٠ فَتْحُ الْمُلْهِمِ}:

سەماکی کوڕی حەرب (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: بە جابیری کوڕی سەموورەم گوت: ئایا تۆ هاونشینی پێغەمبەرت کردووەو لە کۆڕی دانیشتنیدا دانیشتووی؟ فەرمووی: بەڵێ، زۆریش نەوەك کەم، چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە نوێژی بەیانی بۆمان دەکرد، لەسەر جێگە نوێژەکەی خۆی، رووی دەکردە خەڵکەکەو چوار مشقی دادەنیشت، هەتا خۆر بەجوانی دەکەوت، یاران دەستیان دەکرد بە گێڕانەوەی کاروباری سەردەمی نەزانیی پێش ئیسلام، ناو بەناو پێدەکەنین، پێغەمبەریش زەردەخەنەیەکی دەکرد، کە خۆر دەکەوت ئیتر پێغەمبەر هەڵدەساو دەڕۆیشت!!). {تاج/١٠/١٤٤، زنجیرە: ٥٣، ژمارە: ٥٣٦٦}.

## ٢٥٨) باسی نوێژی چێشتەنگاو. (١٦٥٧ - ١٦٧٢).

## بابٌ: فِي صَلاَةِ الضُّحَى

٣٦٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عنها) قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي سُبْحَةَ الضُّحَى قَطُّ. وَإِنِّي لأُسَبِّحُهَا، وَإِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ لَيَدَعُ الْعَمَلَ وَهُوَ يُحِبُّ أَنْ يَعْمَلَ بِهِ، خَشْيَةَ أَنْ يَعْمَلَ بِهِ النَّاسُ فَيُفْرَضَ عَلَيْهِمْ). {الحديث/١٦٥٩ = ١٦٢٦. تجريد البخاري/١/٥٣٩، رقم: ٥٦٢ = ١١٢٨، ١١٧٧}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (درودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لە کەسوکارو هاوڕێکانی بێ) دەفەرموێ: (گەلێ جار وادەبوو کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەردەوام دەبوو لەسەر کارێ، وە حەزیشی لەوە بوو کە بەردەوام بێ لەسەری، هەموو کاتێ لە کاتو ساتی خۆیدا ئەنجامی بدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا وازی لەوکارە دەهێنا، لەترسی ئەوەی کە موسوڵمانان سەری تێ بکەنو تەرکی نەکەنو بەرە بەرە فەرزبێ لەسەریان، وە بەپێی زانیاری من، من خۆم هەرگیز نەمدیوە کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نوێژی چێشتەنگاو بکا، بەڵام من خۆم نوێژی سوننەتی چێشتەنگاو دەکەم، چونکە هەواڵم زانیوە کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کردوویەتی). {ریاض/٣، لاپەڕە: ٦٩، ژمارە: ١١٤١}. {فیقهی ئاسان/١/١٩٠، زنجیرە: ١٩٠، چاپی/٢}. {تاج/١، زنجیرە: ١٧٩، لە ژمارە: ٩٥٣ هەتا ٩٦٢}.

## ٢٥٩) نوێژی چێشتەنگاو بە دوو ركات ئەصڵی سوننەتەكە جێبەجێ دەبێ.
## باب: صلاة الضُحى رَكْعَتانِ

٣٦٤- عَنْ أَبِى ذَرٍّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ قَالَ: « يُصْبِحُ عَلَى كُلِّ سُلاَمَى مِنْ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ، فَكُلُّ تَسْبِيحَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَحْمِيدَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَهْلِيلَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَكْبِيرَةٍ صَدَقَةٌ، وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ صَدَقَةٌ، وَنَهْيٌ عَنِ الْمُنْكَرِ صَدَقَةٌ، وَيُجْزِئُ مِنْ ذَلِكَ رَكْعَتَانِ يَرْكَعُهُمَا مِنَ الضُّحَى ». {الحديث/١٦٦٨ = ١٦٣٥ فم}:

ئەبو زەڕ (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەموو رۆژێ گشت جومگەو ئیسكێكی ئادەمیزاد خێرێكی دەكەوێتە سەر، جا لەبەرئەوەی كە هەموو كەسێ، سێ سەدو شەست ئێسك‌و جومگەی هەیە، سێ سەدو شەست خێری دەكەوێتە سەر، هەر جومگەی خێرێ، جا هەموو تەسبیحات‌و یادی خودا كردنێ خێرێكە، هەموو حەمدو سوپاسكردنێكی خودا خێرێكە، هەموو تەلیلەو (لا إله إلاّ الله) كردنێ خێرێكە، هەموو ئەڵلاهو ئەكبەر كردنێ خێرێكە، هەموو فەرمانكردنێ بە چاكەیێ خێرێكە، نەهی كردنێ لە خراپەیێ خێرێكە، وە كردنی دوو ركات نوێژی چێشتەنگاویش برێتیی ئەم خێرانە سەرجەم دەكەوێ، چونكە لەكاتی كردنی نوێژدا، هەموو ئەندام‌و جومگەو ئێسكەكانی دەكەونە كاركردن). {تاج/١/٤٨٦، زنجیرە: ١٧٩، ژمارە: ٩٥٧}. {ریاض/١، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ١١٨/٢}.

## ٢٦٠) نوێژی چێشتەنگاو بەچوار ركاتیش دەبێ.
## باب: صَلاَة الضُحى أَرْبَعُ رَكعات

٣٦٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّى الضُّحَى أَرْبَعًا، وَيَزِيدُ مَا شَاءَ اللّهُ). {الحديث/١٦٦٢ = ١٦٢٩ فم}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: یاسای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، هەموو چێشتەنگاوێ چوار ركات نوێژی چێشتەنگاوی دەكرد، گەلێ جاریش چەندەی خودا لە چارەی نووسیبوو زیاتری دەكرد!). {تاج/١/٤٨٥، زنجیرە: ١٧٩، ژمارە: ٩٥٥}.

## ٢٦١) نوێژی چێشتەنگاو بە هەشت رکات.
## باب: صَلاةُ الضُّحى ثَمانِي رَكْعَاتٍ

٣٦٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ نَوْفَلٍ قَالَ: سَأَلْتُ وَحَرَصْتُ عَلَى أَنْ أَجِدَ أَحَدًا مِنَ النَّاسِ يُخْبِرُنِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سَبَّحَ سُبْحَةَ الضُّحَى، فَلَمْ أَجِدْ أَحَدًا يُحَدِّثُنِي عَنْ ذَلِكَ، غَيْرَ أَنَّ أُمَّ هَانِئٍ بِنْتَ أَبِي طَالِبٍ أَخْبَرَتْنِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعْدَ مَا ارْتَفَعَ النَّهَارُ يَوْمَ الْفَتْحِ، فَأُتِيَ بِثَوْبٍ فَسُتِرَ عَلَيْهِ، فَاغْتَسَلَ ثُمَّ قَامَ، فَرَكَعَ ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ، لاَ أَدْرِي أَقِيَامُهُ فِيهَا أَطْوَلُ أَمْ رُكُوعُهُ أَمْ سُجُودُهُ، كُلُّ ذَلِكَ مِنْهُ مُتَقَارِبٌ، قَالَتْ: فَلَمْ أَرَهُ سَبَّحَهَا قَبْلُ وَلاَ بَعْدُ. {الحديث/١٦٦٥ = ١٦٣٢. بخاری/١١٠٣، ١١٧٦، ٤٢٩٢}:

عەبدوڵڵای کوڕی حاریثی کوڕی نەوفل فەرمووی: پرسیاری زۆرم کرد، وە زۆر مەبەستم بوو کە کەسێکم دەست بکەوێ، کە لێی بپرسم: کە ئایا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی سوننەتی چێشتەنگاوی دەکرد یانا؟ کەسم دەست نەکەوت کە لەم بارەیەوە قسەی لێ بکا، تەنیا ئوم هانیئی کچی ئەبو طالیب نەبێ، ئەو هەواڵی پێمدا: کە لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا، کاتێ خۆر بەرزەوە بوو، چووم بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) سڵاوم لێکرد، روانیم کەوا خەریکە خۆی ئەشۆرێ، فاتیمەی کچی بەجلکێ پەردەی بۆ گرتبۆوە، جا کە لە خۆشۆردنەکەی بۆوە، هەشت رکات نوێژی سوننەتی بە دوو رکات، دوو رکات کرد، ئەو حەلەش رێك چێشتەنگاو بوو، نازانم تیا راوەستانی بۆ قورئان خوێندنو روکووع بردنیو کوڕنووش بردنی، کامیان درێژتر بوون، هەموویانی لەیەکەوە لە کورتیو درێژیدا لە یەکترەوە نزیك بوون. ئوم هانیئ فەرمووی: من بەش بەحاڵی خۆم نە لەوەپێش، نە لەوە پاش نەمبینیوە کە پێغەمبەر ئەم نوێژی چێشتەنگاوەی کردبێ). {بڕوانە: ریاض/٣، لاپەڕە: ١١٧، زنجیرە: ٢٠٦ و ٢٠٧ لە ژمارە: ١١٣٩ وە هەتا ژمارە: ١١٤٣} . {تاج/ ژمارە: ٩٥٦} .

## ٢٦٢) راسپێری لەبارەی نوێژی چێشتەنگاوەوە.
## باب: الوَصِيَّةُ بِصَلاَةِ الضُّحى

٣٦٧- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَوْصَانِى خَلِيلِى (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِثَلاَثٍ: بِصِيَامِ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَرَكْعَتَيِ الضُّحَى، وَأَنْ أُوتِرَ قَبْلَ أَنْ أَرْقُدَ). {الحديث/١٦٦٩ = ١٦٣٦ فم. تجريد/١/٥٦٣، رقم: ٥٨٣ = ١١٧٦، ١١٧٨، ١٩٨١} :

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دۆستی ئازیزم پێغەمبەری خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم سێ ئامۆژگاریەی کردووم، هەتا دەمرم تەرکیان ناکەم: لەهەموو مانگێ سێ رۆژ بەرۆژووبم، وە هەموو رۆژێ بەلایەنی کەمەوە دوو رکات نوێژی چێشتەنگاو بکەم، وە هەموو شەوێکیش لەپێش خەوتنا نوێژی وەتر بکەم). {تاج/١/٤٧١، چاپی/٤، زنجیرە: ١٧٩، ژمارە: ٩٥٤}.

## ٢٦٣) نوێژی چێشتەنگاو پێشی دەگوترێ (صلاةُ الأوَّابين). (١٧١٤ - ١٧٧٥).
## باب: صَلاَةُ الأَوَّابِينَ

٣٦٨- عَنِ الْقَاسِمِ الشَّيْبَانِىِّ أَنَّ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) رَأَى قَوْمًا يُصَلُّونَ مِنَ الضُّحَى، فَقَالَ: أَمَا لَقَدْ عَلِمُوا أَنَّ الصَّلاَةَ فِى غَيْرِ هَذِهِ السَّاعَةِ أَفْضَلُ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « صَلاَةُ الأَوَّابِينَ حِينَ تَرْمَضُ الْفِصَالُ ». {الحديث/١٧٤٣ = ١٧١٠ فم} :

قاسمی شەیبانی فەرمووی: زەیدی کوڕی ئەرقەم (رەزای خودای لێ بێ) کۆمەڵێکی دی، لەکاتی خۆرکەوتنا چێشتە نوێژ (صلاة الضحى)یان دەکرد، فەرمووی: ئەدی! ئەمانە خۆشیان باش باش دەزانن کە ئەم نوێژە لەکاتێکی تردا بکرێ باشترە، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نوێژی تەوبەکاران، کە لە خراپە گەڕاونەتەوەو بایان داوەتەوە بەلای خودادا! کە پێی دەگوترێ: نوێژی چێشتە نوێژ، ئەوکاتە گەرمەیەتیو بەباشی دەبێ، کە خۆر وا گەرم دەبێ، چەوو لم تاو دەسێنێو وا گەرم دەبێ کەسمو قاچی پارێنە وشتر داخ دەبێ!). {ریاض/٣، لاپەڕە: ١١٩، زنجیرە: ٢٠٧، ژمارە: ١١٤٣}. {تاج/١، زنجیرە: ١٧٩، ژمارە: ٩٥٣}.

**٢٦٤) کەسێ بە دڵ کوڕنووش ببا بۆ خودا بەهەشت مسۆگەر دەکا بۆ خۆی.**
**(٢٤٠ - ٢٤٣). باب: مَنْ سجدَ للّه فلَهُ الجَنّةُ**

٣٦٩- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِذَا قَرَأَ ابْنُ آدَمَ السَّجْدَةَ فَسَجَدَ اعْتَزَلَ الشَّيْطَانُ يَبْكِى يَقُولُ: يَا وَيْلَهُ (وَفِى رِوَايَةِ أَبِى كُرَيْبٍ: يَا وَيْلِى) أُمِرَ ابْنُ آدَمَ بِالسُّجُودِ فَسَجَدَ فَلَهُ الْجَنَّةُ، وَأُمِرْتُ بِالسُّجُودِ فَأَبَيْتُ فَلِىَ النَّارُ». {الحديث/٢٤٠ = ٢٥٦ فَتْحُ الْمُلْهِمِ}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ ئادەمیزاد کە ئایەتی سەجدە دەخوێنێ‌و، سەجدەی تیلاوەت دەبا بۆ خودا، شەیتان لەتاوانا کلا دەبێ‌و کەنار دەگرێ‌و دەڵێ: ئەی هاوار لە خۆی، لە گێڕانەوەی ئەبو کورەیبا: دەڵێ: ئەی هاوار لە خۆم! فەرمان کرا بە ئادەمیزاد کە کوڕنووش بباو کوڕنووشی بردو بەهەشتی بۆ مسۆگەر بوو، وە فەرمان کرا بە من کە کوڕنووش ببەم، بەڵام من کوڕنووشم نەبردو ئاگری دۆزەخم بۆ مایەوە). {تاج/١/٣٢٩، زنجیرە: ١١٠، ژمارە: ٦٤٥، چاپی/٢}.

**٢٦٥) خێرو بەهرەی کەسێ شەوو ڕۆژی دوازدە ڕەکات نوێژی سوننەت لەگەڵ نوێژە فەرزەکانا بکا.** (١٦٩١-١٦٩٥).
**بابُ: فَضْلُ مَنْ صَلَّى ثِنْتَىْ عَشْرَةَ رَكْعَةً فِي يَوْمٍ وليلة**

٣٧٠- عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ زَوْجِ النَّبِىِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: « مَا مِنْ عَبْدٍ مُسْلِمٍ يُصَلِّى لِلَّهِ كُلَّ يَوْمٍ ثِنْتَىْ عَشْرَةَ رَكْعَةً تَطَوُّعًا غَيْرَ فَرِيضَةٍ، إِلاَّ بَنَى اللَّهُ لَهُ بَيْتًا فِى الْجَنَّةِ» أَوْ « إِلاَّ بُنِىَ لَهُ بَيْتٌ فِى الْجَنَّةِ ». قَالَتْ: أُمُّ حَبِيبَةَ: فَمَا بَرِحْتُ أُصَلِّيهِنَّ بَعْدُ، وَقَالَ عَمْرٌو (يَعْنِي ابنَ أَوْس) مَا بَرِحْتُ أُصَلِّيهِنَّ بَعْدُ، وَقَالَ النُّعْمَانُ (يَعْنِي ابن سالم) مِثْلَ ذَلِكَ. وَفِي رِوَايَةٍ: « فِي يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ». {الحديث/١٦٩٣ = ١٦٥٨ فم}:

ئوم حەبیبە (ڕەزای خودای لێ بێ) کە هاوسەری پێغەمبەرە، فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (هەر بەندەیەکی موسوڵمان، ژن بێ یا پیاو،

هەموو رۆژێ دوانزە رکات نوێژی سوننەت بکا بۆ خودا، سەرەڕای نوێژە فەرزەکان، کە لەکاتی ئاساییدا حەڤدە رکاتن، مسۆگەر کە خودای گەورە لە بەهەشتا کۆشکێکی بۆ دروست دەکا، ئوم حەبیبە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەوەتی ئەمەم لە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ژنەوتووە، لەوساکەوە هەمیشە ئەم دوازدە رکاتەیە دەکەم، عەنبەسە فەرمووی: منیش ئەوەتی ئەمەم لە ئوم حەبیبە بیستووە قەت تەرکم نەکردوون، عەمریش فەرمووی: منیش ئەوەتی ئەمەم لە عەنبەسە بیستووە قەت تەرکم نەکردوون، نوعمانی کوڕی سالمیش فەرمووی: منیش ئەوەتی ئەمەم لە عەمر بیستووە قەت تەرکم نەکردوون). لە تاجا دەفەرموێ: تیرمیذی ئەمەشی لێ زیاد کردووە: چوار رکات لەپێش نیوەڕۆداو، دوو رکات لە پاشیەوەو دوو رکات لەپاش شێوانەوەو دوو رکات لەپاش خەوتنانەوەو دوو رکات لەپێش نوێژی بەیانییەوە. {تاج/١/٣٠٥، زنجیرە: ١٠١، ژمارە: ٥٩٤. چاپی/٢}. {بڕوانە: ریاض/٣، لاپەڕە: ٩٤، زنجیرە: ١٩٥ هەتا کۆتا}.

**روونکردنەوە:**

ئوم حەبیبە هاوسەری پێغەمبەرە، (دروودی خودای لەسەر بێ) ناوی رەملەی کچی ئەبو سوفیانی کوڕی حەربە، خوشکی موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیانە، لەپێش پێغەمبەرایەتیدا بە حەڤدە ساڵ لە دایك بووە، لە موسوڵمانە پێشینەکانە، کۆچی کرد بۆ حەبەشە، لەوێ بێوەژن کەوت، ئوم حەبیبە دەفەرموێ: پیاوێ لە خەوما فەرمووی پێم: ئەی دایکی موسوڵمانان!!) لەم خەونە شەڵەژام، بەڵام زۆری پێ نەچوو، هەر کە عیدەی شەرعیم لە مێردی پێشینم تەواو بوو،، پاشای حەبەشە کەنیزەکێکی خۆیی نارد بۆلام، کەناوی (أبرهة) بوو، پاشای حەبەشە لەرێی ئەو کەنیزەکەیەوە خوازبێنی کردم بۆ پێغەمبەرو منیش رازی بوومو شووم پێکرد، خالیدی کوڕی وەلیدم کرد بە وەکیلی خۆم، وەکیلی پێغەمبەریش جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب بوو، نەجاشی لە جیاتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوار سەد لیرەی زێڕی کرد بە مارەییم، خالید وەری گرتو دوایی دایەوە بەخۆم، عائیشە

دەفـەرموێ: لـەکاتی سـەرە مـەرگا، ئـوم حەبیبـە نـاردی بـەدواما، فـەرمووی: خـۆت دەزانی کە منو تۆ هەوێی یەکتری بووین، هەوێش لـەوەزەنی هـەوێ رزگـاری نابـێ، کەواتـە بـەخێری خـۆت گـەردنم ئـازاد بکـە منـیش گـەردنیم ئـازاد کـردو لـە خـودا پاڕامەوە بـۆی کـە لـە گونـاهی خـۆش بـێ، ئـەویش پێـی فـەرمووم: (بەڕاسـتی دڵـت خۆش کردم خودا دڵت خۆش بکا) ئـوم حەبیبـە لـەپێش بیعثـەتـدا بەحەڤـدە سـاڵ لەدایك بووە، لـە چلو چواری کۆچیدا مـردووە، نزیکـەی حـەفتاو دووسـاڵ ژیـاوە، (ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لـێ بێ). {بڕوانە: تجرید/٢، لاپەڕە: ٤، ژمـارە: ٦١٤ + تـاج/٣، لاپــەڕە: ٧٨ = تــاج/٢ ل/٤٨٨ ژ/٢٠٩٤ ز/٣٢ + تــاج/١٥٨/٥، زنجــیرە: ٣٩ = تــاج/٣ ز/٣٩ ژ/٣٤٤٢} . بۆ سونـنەتە دامەزراوەکان بڕوانە: تاج/١ ز/١٠٣.

**٢٦٦) لەنێوانی هەموو بانگو قامەتێکا دوو رکات نوێژی سوننەت هەیە.**
**(١٩٣٥ - ١٩٣٨). {بابٌ: بَيْنَ كُلِّ أذانَيْن}**

٣٧١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ الْمُزَنِيِّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلاَةٌ». قَالَهَا ثَلاثًا ، قَالَ فِي الثَّالِثَةِ: « لِمَنْ شَاءَ ». {الحديث/١٩٣٧ = ١٩١٠ فم. تجريد/١/٣٥٨، رقم: ٣٦١ = ٦٢٤، ٦٢٧} + {رياض/٣/٩٥، زنجيره: ١٩٥ ، ژماره: ١٠٩٩} :

عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەلی ئەل - موزەنی (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سێجار فەرمووی: (لـەنێوانی هـەموو بـانگو قامەتێـکا، نوێژێـکی سـوننەت هەیـە). لەسـەری جـاری سـێیەما فـەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئـەمـە بـۆ کەسێ کـە ئـارەزووی ئـەم نوێـژەی هـەبێ). {تـاج/١/٣٠٨، زنجـیرە: ١٠٤، ژمـارە: ٦٠٥، چاپی/٢} .

**ڕوونکردنەوە:**

عەبـدوڵڵای کـوڕی موغەففـەل، یەکێـکە لـە دەسـتەی پـەیمانی خۆشـنوودی (بەیعـەتی ریضـوان) کـە پێشـیان دەگـوترێ: (أَصْحَابُ الشَّجَرَةِ = یـارانی درەخـت)

عەبدوڵڵا دەیفەرموو: بە دەستی خۆم لقو پۆپی ئەو درەختەم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوور دەخستەوە، کە لەکاتی ڕێکەوتنی حودەیبییەدا، پەیمانی بەیعەتو ریضوانی لە ژێردا سازدرا، کە خودای گەورە لەم ئایەتەدا، یادی ئەو ڕووداوو درختو پەیمانەی تۆمار کردووە، کە دەفەرموێ: {لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا - سورة الفتح/ ٤٨ - ١٨}.

چل و سێ فەرموودەی هەیە، لە بوخاریدا پێنجی هەیە، کاتێ شاری (تستر) ئازادکرا عەبدوڵڵا یەکەم کەس بوو لە دەروازەکەیەوە چووە ژوورەوە، لە هەموو کەسێ زیاتر حەسەنی بەصری فەرموودەکانی ئەو دەگێڕێتەوە، یەکێ بوو لەو دەکەسە کە پێشەوا عومەر ناردنی بۆ بەصرە، هەتا دانیشتوانی شارەزای ئایین بکەن، حەوت منالی هەبوو، ساڵی شەستی کۆچی لە بەصرە مرد، لەسەر ڕاسپێری خۆی، ئەبو بەرزەی ئەسلەمی نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی کرد).

## ٢٦٧) نوێژی سوننەت کردن لەپێش نوێژە فەرزەکانو لە پاشیانەوە.

## (١٦٩١ - ١٦٩٥). بابٌ: التَّنَفُّلُ قَبْلَ الصَّلَاةِ وَبَعْدَهَا

٣٧٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَبْلَ الظُّهْرِ سَجْدَتَيْنِ، وَبَعْدَهَا سَجْدَتَيْنِ، وَبَعْدَ الْمَغْرِبِ سَجْدَتَيْنِ، وَبَعْدَ الْعِشَاءِ سَجْدَتَيْنِ، وَبَعْدَ الْجُمُعَةِ سَجْدَتَيْنِ، فَأَمَّا الْمَغْرِبُ وَالْعِشَاءُ وَالْجُمُعَةُ، فَصَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَيْتِهِ». {الحديث/١٦٩٥ = ١٦٦٢ فَتْحُ الْمُلْهِم. تجريد/١/٤٦٩، رقم:٤٩٥ = ٩٣٧، ١١٦٥، ١١٧٢، ١١٨٠}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: بۆ خۆم، لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم نوێژە سوننەتانەم ئەنجام داوە: دوو ڕکاتم لەپێش نوێژی نیوەڕۆوە کردووە، وە دوو ڕکات لەپاشیەوە، وە دوو ڕکات لەپاش نوێژی شێوانەوە، وە دوو ڕکات لەپاش نوێژی خەوتنانەوە، وە دوو ڕکات لەپاش نوێژی هەینییەوە، ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەیفەرموو: (بەڵام سوننەتەکەی پاش شێوانو سوننەتەکەی

پاش خەوتنانو سوننەتەکەی پاش نوێژی هەینیم، لە خزمەت حەزرەتدا، لە ماڵەکەی ئەودا دەکرد، نەك لە مزگەوت). {تاج/١/٣٠٨، زنجیرە: ١٠٣، ژمارە: ٦٠٣. {ریاض/٣/٩٥، زنجیرە: ١٩٥، ژمارە: ١٠٩٨} .

**روونکردنەوە:**

١. وا دەردەکەوێ، لە رووکاری فەرموودەکەوە، کە مەبەست لەوەی کە ئیبنو عومەر دەفەرموێ: (لە خزمەت پێغەمبەردا، ئەم نوێژە سوننەتانەم ئەنجام داوە) مەبەست مەعییەتی شوێنو کاتە، وە مەبەست کردنیان بە جەماعەت نییە لە پشتیەوە، هەڵیش دەگرێ کە مەبەست کردنیان بە جەماعەت بێ لەگەڵ پێغەمبەردا،

٢. کورتو پوخت: (نوێژە سوننەتەکانی پاشو پێشی نوێژە فەرزەکان، لە مزگەوت بکرێن مسۆگەر ترن، ئەگەر ترسی ئەوەی هەبوو، کە لە ماڵەوە، لەبەر بێ جێگەییو بێ رێگەییو میوانو شتی وا بۆی نەکرێ، یا مەلای مزگەوت بێ، لە بردنەوەی سوننەتەکان بۆ ماڵەوە، ئاژاوەیێ دروست ببێ، وەك ئەوە نوێژ خوێنەکان بە هەڵە لە حاڵەکە حاڵی ببنو بڵێن: کە مەلاکە ئەم نوێژە سوننەتانە نەکا ئیتر من بۆ بیکەم، بەهەر حاڵ کردنی ئەم سوننەتانە، لە مزگەوت هیچ ناباشییەکی تیادا نییە، وە کەسێ بڵێ: ئەم جۆرە سوننەتانە یا دەبێ لە ماڵەوە بکرێن، یا هەر نەکرێن، ئەوە بوختانە بەدەم یاسا نامەی خوداوە!).

### ٢٦٨) باسی کردنی نوێژی سوننەت بەشەو یا بەرۆژ. (١٦٩٦ - ١٧١٣).
### بابٌ: فِي التنفُّل بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ

٣٧٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ، (رَضِيَ اللّهُ عنها) عَنْ صَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، عَنْ تَطَوُّعِهِ، فَقَالَتْ: كَانَ يُصَلِّي فِي بَيْتِي قَبْلَ الظُّهْرِ أَرْبَعًا، ثُمَّ يَخْرُجُ، فَيُصَلِّي بِالنَّاسِ، ثُمَّ يَدْخُلُ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، وَكَانَ يُصَلِّي بِالنَّاسِ الْمَغْرِبَ، ثُمَّ يَدْخُلُ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، وَيُصَلِّي بِالنَّاسِ الْعِشَاءَ، وَيَدْخُلُ بَيْتِي فَيُصَلِّي

رَكْعَتَيْنِ، وَكَانَ يُصَلِّى مِنَ اللَّيْلِ تِسْعَ رَكَعَاتٍ فِيهِنَّ الْوِتْرُ، وَكَانَ يُصَلِّى لَيْلاً طَوِيلاً قَائِمًا، وَلَيْلاً طَوِيلاً قَاعِدًا، وَكَانَ إِذَا قَرَأَ وَهُوَ قَائِمٌ، رَكَعَ وَسَجَدَ وَهُوَ قَائِمٌ، وَإِذَا قَرَأَ قَاعِدًا، رَكَعَ وَسَجَدَ وَهُوَ قَاعِدٌ، وَكَانَ إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ، صَلَّى رَكْعَتَيْنِ». {الحديث/١٦٩٦ = ١٦٦٣ فم. تجريد/١/٥٣٣، رقم: ٥٥٧ = ١١١٨، ١١١٩، ١١٤٨، ١١٦١، ١١٦٨، ٤٨٣٧}:

عەبدوڵڵای کوڕی شەقیق (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: سەبارەت بە نوێژی سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسیارم کرد لە عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) لەم بارەیەوە لە وەڵاما فەرمووی: (پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەماڵی منا، چوار ركات نوێژی سوننەتی پێش نیوەڕۆی دەکردو ئەوجا دەچوو بۆ مزگەوت بەرنوێژیی نوێژی نیوەڕۆی بۆ خەڵکەکە دەکرد، ئەوجا دەهاتەوە بۆ ماڵەوە، لە ماڵەوە دوو ركات سوننەتی پاش نیوەڕۆی دەکرد، کاتێ بەرنوێژیی نوێژی شێوانی بۆ موسوڵمانەکان دەکرد، ئەوجا دەهاتەوە بۆ ماڵەوە، لە ماڵەوە دوو ركات نوێژی سوننەتی پاش شێوانی دەکرد، کاتێ بەرنوێژیی نوێژی خەوتنانی بۆ موسوڵمانان دەکرد، دەهاتەوە بۆ ژوورەکەی من، لەوێ دوو ركات نوێژی سوننەتی پاش خەوتنانی دەکرد، شەوانەیش بە نوێژی وەترەوە نۆ ركات شەو نوێژی دەکرد، کە لەپاش کردنی نوێژی خەوتنان دەخەوتو ئەوجا هەڵ دەسایەوە بۆ شەو نوێژ، کە لەزاری شەرعی پیرۆزدا پێی دەگوترێ: نوێژی تەهەجود.

دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو: گەلێ جار شەو نوێژێکی دوورو درێژی بەڕاوەستانەوە دەکرد، گەلێ جاریش شەو نوێژێکی دوورو درێژی بە دانیشتنەوە دەکرد، دەستووریشی وابوو ئەگەر بە راوەستانەوە قورئانی بخوێندبایە، بە راوەستانیشەوە روکووعو کوڕنووشی ئەنجام دەدا، بەڵام ئەگەر بە دانیشتنەوە نوێژی بکردبایە، بە دانیشتنیشەوە چەمینەوەو کوڕنووشی ئەنجام دەدا، دەستووری پێغەمبەر وابوو، کاتێ شەبەقی دەدا، دوو ركات نوێژی سوننەتی پێش نوێژی بەیانی دەکرد). {تاج/١، ژمارە: ٩٩٦، زنجیرە: ١٨٥}.

## ٢٦٩) كردنی نوێژی سوننەت لە مزگەوت. (١٨١٧ - ١٨٢٣).
## بابٌ: صَلاَةُ النَّافِلَةِ فِي المَسْجِد

٣٧٤- عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: احْتَجَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حُجَيْرَةً بِخَصَفَةٍ، أَوْ حَصِيرٍ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي فِيهَا، قَالَ: فَتَتَبَّعَ إِلَيْهِ رِجَالٌ، وَجَاءُوا يُصَلُّونَ بِصَلاَتِهِ، قَالَ: ثُمَّ جَاءُوا لَيْلَةً، فَحَضَرُوا وَأَبْطَأَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْهُمْ، قَالَ: فَلَمْ يَخْرُجْ إِلَيْهِمْ، فَرَفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ، وَحَصَبُوا الْبَابَ فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُغْضَبًا، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « مَا زَالَ بِكُمْ صَنِيعُكُمْ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُكْتَبُ عَلَيْكُمْ، فَعَلَيْكُمْ بِالصَّلاَةِ فِي بُيُوتِكُمْ، فَإِنَّ خَيْرَ صَلاَةِ الْمَرْءِ فِي بَيْتِهِ، إِلاَّ الْمَكْتُوبَةَ ». وَفِي رِوَايَةٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اتَّخَذَ حُجْرَةً فِي الْمَسْجِدِ مِنْ حَصِيرٍ». {الحديث/١٨٢٢، ١٨٢٣ = ١٧٩٢، ١٧٩٣. تجريد/١، لاپەڕە: ٣٨٥، ژمارە: ٤٠١ = ٧٣١، ٦١١٣، ٧٢٩٠}:

زەیدی کوڕی ثابیت (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ڕەمەزانا، لەناو مزگەوتا بە حەسیر کۆختێ دروست دەکا، جا چەند شەوێ، لە ماڵ دەردەچوو، دەڕۆیشت لەناو ئەو کۆختەدا شەو نوێژی دەکرد، جا کۆمەڵێ لە یارانی، لە پشتیەوە، لەناو ئەو کۆختەدا، چەند شەوێ بە جەماعەت نوێژی تەراویحی لە پشتەوە دەکەن، جا بەرۆژ هاوەڵان ئەم هەواڵەیان بڵاو دەکردەوە، جا کۆمەڵێ زۆر شەوێ لە مزگەوت ئامادە دەبن، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم حاڵەیان دەزانێ، واز دێنێ‌و دەرناچێ بۆ لایان، ئەوانیش بۆئەوەی کە پێغەمبەر ئاگادار بکەنەوە، هەتا تەشریف بهێنێ، دەنگ هەڵ دەبڕن‌و سوبحانەڵڵا دەکەن‌و زیخ‌و چەو دەگرنە دەرگای ماڵەکەی پێغەمبەر، کە لەسەر مزگەوت بوو، تا تەشریف بهێنێ‌و تەراویحیان بۆ بکا، لە ئەنجاما پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە تووڕەیی هات بۆلایان‌و فەرمووی پێیان: (حاڵی بووم لە داواکەتان، کە زۆر مەبەستتانە نوێژی تەراویح بە کۆمەڵ بکەن، من ئەمەم لەیادە، بەڵام بۆیە نەهاتم چونکە دەترسم کە ئێوە سەری تێ بکەن‌و بە جەخت بیگرن‌و بەرە بەرە فەرزبێ لەسەرتان!) دەی لە ماڵەوەتان، لە جێگەو ڕێگەی خۆتان شەو نوێژو نوێژی سوننەت بکەن، چونکە نوێژی فەرزی

لێ دەرچێ، خێرترین نوێژی پیاو، ئەو نوێژەیەتی کە لەماڵی خۆیا دەیکا). {تاج/١، لاپەڕە: ١/٥٠٧ – چاپی/١، ژمارە: ٩٩٨، ٩٩٩، ١٠٠٠، ١٠٠١، چاپی/٢}.

**ڕوونکردنەوە:**

١-نوێژی سوننەت بۆ پیاوو بۆ ژن، لە ماڵەوە خێرترە، جگە لەو نوێژانەی کە بە کۆمەڵ دەکرێن، وەك نوێژی هەردوو جەژن‌و نوێژە بارانەو نوێژی خۆر گیران‌و مانگ گیران‌و تەراویح. {تجرید/١، لاپەڕە: ٣٨٦، ژمارە: ٤٠١}. {بڕوانە: ژمارە: ٣٧٢ (ڕوونکردنەوە - ٢)}.

٢-زەیدی کوڕی ثابیت (ڕەزای خودای لێ بێ) ئەنصارییە، یەکێکە لە زانا شەرع زانە ناودارە مەزنەکانی هاوڕێیانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرائیز زانێکی گەورە بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (باشترین فەرائیز زانتان، کە شارەزایی هەبێ، لە فەرائیزدا، زەیدی کوڕی ثابیتە). شافیعی پەیڕەوی زەید دەکا، لە زانستی کەلەپوور دابەشکردندا.

زەید قورئان خوێنێکی گەورەش بوو، هەر لەسەردەمی پێغەمبەردا هەموو قورئانی لەبەر بوو، زەید یەکێ بوو لە نووسەرەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاغەزی بۆ دەنووسی بۆ خەڵك‌و کاغەزی خەڵکیشی بۆ دەخوێندەوە، یەکێ بوو لە نووسەرانی سرووش، لەسەر فەرمانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زمانی عیبری، کە زمانی جوولەکەیە، لە ماوەیەکی زۆر کەما فێر بوو، بە پازدە ڕۆژ زمانی عیبری بە شارەزایی فێر بوو، زمانی سەریانیش بە حەڤدە ڕۆژ فێر بوو، لەسەردەمی جێنشینیی ئەبوبەکردا، بە فەرمانی ئەبوبەکر، لەسەر ڕاوێژی عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) قورئانی کۆکردەوە، لەبەر مێرد منالی، لە غەزای بەدردا ئامادە نەبوو، بەڵام ئامادەی غەزای ئوحود بووە، دەڵێن: لە خەندەقا بە کۆڵ خۆڵی خەندەقەکەی دەگواستەوە، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بینی، پێی فەرموو: (بەڕاستی ئەم کوڕە کوڕی چاکە). دەڵێن: لە دوو بابەتا، زەید باڵا دەست بووە، بەسەر مەردومدا: لە قورئان‌و لە فەرائیزدا، مەسرووق دەفەرموێ: چووم بۆ مەدینە، ڕوانیم وا زەیدی کوڕی ثابیت

یەکێکە لەزانا هەرە پایە بەرزەکان. دەڵێن: لەناو خێزانی خۆیدا زۆر رووخۆش‌و مەشرەب خۆش بووە، بەڵام لەناو کۆڕو مەجلیسدا زۆر سەلارو سەنگین بووە.

جارێ لەکاتی سواربوونی وڵاخا، ئیبنو عەباس ئاوزەنگییەکەی بۆ دەگرێ، هەتا سواربێ، زەید پێی دەفەرموێ: ئەی ئامۆزای نازداری پێغەمبەر! ئەوە شایانی شانی تۆ نییە، دەی کەواتە ئاوزەنگیەکە بەردە). ئیبنو عەباس دەفەرموێ: (نا، ئێمە ئاوا رەفتار لەگەڵ زانایان‌و گەورە پیاوان دەکەین).

کۆمەڵێ لە فەرموودە خوازەکان، فەرموودەکانی زەید دەگێڕنەوە، لە هاوڕێیان: ئەبو هورەیرەو ئەبو سەعیدو عومەرو ئەنەس‌و کەسانی تریش، لە پەیڕەوان (تابعین): سەعیدی کوڕی موسەییەب‌و دوو کوڕەکەی زەید خۆی: خاریجەو سولەیمان‌و کەسانی تریش.

زۆرینە دەڵێن: ساڵی چل‌و پێنجی کۆچی مردووە، کە دەمرێ ئەبو هورەیرە دەفەرموێ: (ئەمڕۆ مەلای گەورەی نەتەوەی ئیسلام مرد، ئومێدەکە ئیبنو عەباس جێگەی بگرێتەوە).

حەسسانی کوڕی ثابیتیش بەم شیعرە لاواندیەوە:

فَمَنْ لِلْقَوَافِي بَعْدَ حَسَّانَ وَابْنِهِ
وَمَنْ للمَعَانِي بَعْدَ زيدِ بْنِ ثَابِتِ

واتە:
شیعر پاش حەسسان هەتیو دەکەوێ
واتای جوان، پاش زەید گەر راستت دەوێ

{بڕوانە: تاج/ بەرگی چوارەم/ چاپی چوارەم، لاپەڕە: ٦٢، ژمارە: ٣٦٨٤ + ژمارە: ٣٦٨٥، زنجیرە: ٩٤}.

## ٢٧٠) کردنی نوێژی سوننەت لە ماڵەوە. (١٨١٧ - ١٨٢٣).

٣٧٥- عَنْ جَابِرٍ بن عبدالله قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « إِذَا قَضَى أَحَدُكُمُ الصَّلاَةَ فِى مَسْجِدِهِ، فَلْيَجْعَلْ لِبَيْتِهِ نَصِيبًا مِنْ صَلاَتِهِ، فَإِنَّ اللَّهَ جَاعِلٌ فِى بَيْتِهِ مِنْ صَلاَتِهِ خَيْرًا ». {الحديث/١٨١٩ = ١٧٨٩}:

جابیری كوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمویٰ: (كاتێ لە مزگەوت نوێژ دەكەن بەشی ماڵەوەش دابنێن، چونكە خودا ئەو نوێژەی ماڵەوەتان دەكا بە مایەی خێر). {تاج/١/٥٠٨، زنجیرە: ١٨٥، چاپی/١، ژمارە: ٩٩٩، چاپی/٢}.

## ٢٧١) ئەوەندە نوێژی سوننەت بكەن كە چالاك‌و گورج‌و گۆڵن، كە ماندوو بوون وازبێنن. (١٨٢٨ - ١٨٣٣).

٣٧٦- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَسْجِدَ، وَحَبْلٌ مَمْدُودٌ بَيْنَ سَارِيَتَيْنِ، فَقَالَ: «مَا هَذَا؟» قَالُوا: لِزَيْنَبَ تُصَلِّي، فَإِذَا كَسِلَتْ أَوْ فَتَرَتْ أَمْسَكَتْ بِهِ، فَقَالَ: « حُلُّوهُ، لِيُصَلِّ أَحَدُكُمْ نَشَاطَهُ، فَإِذَا كَسِلَ أَوْ فَتَرَ قَعَدَ ». {الحديث/١٨٢٨ = ١٧٩٨. تجريد/١/٥٥٠، رقم: ٥٧٥ = ١١٥٠}:

ئەنەسی كوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) چوو بۆ مزگەوت، ڕوانی وا گوریسێ لەناوەندی دوو كۆڵەكەدا ڕایەڵكراوە، فەرمووی: (ئەم گوریسە چییە؟) گوتیان: ئەمە گوریسی زەینەبی خێزانتە، لەكاتی كردنی نوێژی سوننەتدا كە ماندوو دەبێ، بەم گوریسە خۆی دەگرێ!! فەرمووی: (بیكەنەوەو لایبەن، شتی وا مەكەن، ئەوەندە نوێژی سوننەت بكەن كە چالاك‌و گورج‌و گۆڵن، كاتێ شەكەت بوون‌و خاو بوونەوەو خوڵكتان نەما، ئیتر وازبێنن‌و دانیشن). {ڕیاض/١/١٣٦، زنجیرە: ١٤، ژمارە: ١٤٦} + {تاج/١، زنجیرە: ١٨٥، ژمارە: ٩٩٤}.

## ٢٧٢) خۆشەویسترین كرداری باش لەلای خودا ئەو كردەوەیە كە بەردەوام تربێ. (١٨٢٤ - ١٨٢٧). بابٌ: أَحَبُّ الأَعْمَالِ إِلَى اللهِ أَدْوَمُهَا

٣٧٧- عَنْ عَلْقَمَةَ قَالَ: سَأَلْتُ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عنها)، قَالَ: قُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، كَيْفَ كَانَ عَمَلُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ هَلْ كَانَ يَخُصُّ شَيْئًا مِنَ الأَيَّامِ؟ قَالَتْ: لاَ، كَانَ عَمَلُهُ دِيمَةً، وَأَيُّكُمْ يَسْتَطِيعُ مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ) يَسْتَطِيعُ؟!». {الحديث/١٨٢٦ = ١٧٩٦ فم. تجريد/٥/٢٧٠، ژمارە: ٢٠١١ = ٦٤٦٥ + ٦٤٦٦ + ٩٠٩ = ١٩٦٩ فتح}:

عەلقەمە فەرمووی: پرسیارم کرد لە دایکی بڕواداران، عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) پێم گوت: ئەی دایکی بڕواداران! ئایا کارو کردەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چۆن بوو؟ ئایا هەندێ ڕۆژی تایبەتی تەرخان دەکرد، بۆ هەندێ کاری چاکە؟ فەرمووی: نەخەیر، بەڵکوو کارو کردەوەی باشی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەمیشەیی بوو، وەك نەرمە بارانی بەردەوامی لەسەرخۆ، بەلاّم ئەوەی کە لە توانای پێغەمبەردا بوو، کوا لە توانای ئێوەدا ئەوە هەیە؟!).

## ٢٧٣) کارێ بکەن لە تواناتانا بێ.(١٨٢٨-١٨٣٣).

## بابٌ: خُذُوا مِنَ العَمَلِ مَاتُطِيقُونَ

٣٧٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها) زَوْجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَنَّ الْحَوْلاَءَ بِنْتَ تُوَيْتِ بْنِ حَبِيبِ بْنِ أَسَدِ بْنِ عَبْدِ الْعُزَّى مَرَّتْ بِهَا وَعِنْدَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقُلْتُ: هَذِهِ الْحَوْلاَءُ بِنْتُ تُوَيْتٍ!، وَزَعَمُوا أَنَّهَا لاَ تَنَامُ اللَّيْلَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « لاَ تَنَامُ اللَّيْلَ؟! خُذُوا مِنَ الْعَمَلِ مَا تُطِيقُونَ، فَوَاللَّهِ لاَ يَسْأَمُ اللَّهُ حَتَّى تَسْأَمُوا». {الحديث/١٨٣٠ = ١٨٠٠ فم = فَتْحُ الْمُلْهِم. تجريد/١/٦١، ژمارە: ٤٠ = ٤٣، ١١٥١}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لە هەموو هاوسەرو هاوەڵانی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر لەلای من بوو، حەولای کچی تووەیتی کوڕی حەبیبی کوڕی ئەسەدی کوڕی عەبدولعوززا هات بۆ دێنیم، عەرزی حەزرەتم کرد: ئەمە ئەو حەولایەیە، کە دەڵێن بەشەو ناخەوێ، هەرخەریکی شەو نوێژو خوا پەرستییە؟! فەرمووی: (بەشەو ناخەوێ، گوایە هەر خەریکی شەو نوێژو خوا پەرستییە؟! شتی وا چۆن دەبێ، ئەوەندە کردەوەی باش، پەلاماربدەن کە لە تواناتان بێ، چونکە بەخودا هەتا ئێوە وەڕس نەبن خودا وەڕس

نابێ، واته: پاداشدانەوەی خودا بۆ ئێوە بەردەوام دەبێ، هەتا ئێوە لە تاعەت کردن سارد دەبنەوە!).

**٢٧٤) باسی نوێژو پاڕانەوەی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **لە شەودا.**
(١٧٨٥ - ١٨١٠).

**بابٌ: فِي صَلاَةِ النبيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَ دُعَائِه**

٣٧٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عنهما) قَالَ: بِتُّ لَيْلَةً عِنْدَ خَالَتِي مَيْمُونَةَ، فَقَامَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنَ اللَّيْلِ، فَأَتَى حَاجَتَهُ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، ثُمَّ نَامَ، ثُمَّ قَامَ، فَأَتَى الْقِرْبَةَ،، فَأَطْلَقَ شِنَاقَهَا، ثُمَّ تَوَضَّأَ وُضُوءًا بَيْنَ الْوُضُوءَيْنِ، وَلَمْ يُكْثِرْ، وَقَدْ أَبْلَغَ، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى فَقُمْتُ فَتَمَطَّيْتُ كَرَاهِيَةَ أَنْ يَرَى أَنِّي كُنْتُ أَنْتَبِهُ إِلَيْهِ، فَتَوَضَّأْتُ، فَقَامَ فَصَلَّى، فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، فَأَخَذَ بِيَدِي فَأَدَارَنِي عَنْ يَمِينِهِ، فَتَتَامَّتْ صَلاَةُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنَ اللَّيْلِ ثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، ثُمَّ اضْطَجَعَ فَنَامَ حَتَّى نَفَخَ، وَكَانَ إِذَا نَامَ نَفَخَ، فَأَتَاهُ بِلاَلٌ، فَآذَنَهُ بِالصَّلاَةِ، فَقَامَ فَصَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ، وَكَانَ فِي دُعَائِهِ: « اللَّهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُورًا، وَفِي بَصَرِي نُورًا، وَفِي سَمْعِي نُورًا، وَعَنْ يَمِينِي نُورًا، وَعَنْ يَسَارِي نُورًا، وَفَوْقِي نُورًا، وَتَحْتِي نُورًا، وَأَمَامِي نُورًا، وَخَلْفِي نُورًا، وَعَظِّمْ لِي نُورًا ». قَالَ كُرَيْبٌ: وَسَبْعًا فِي التَّابُوتِ، فَلَقِيتُ بَعْضَ وَلَدِ الْعَبَّاسِ، فَحَدَّثَنِي بِهِنَّ، فَذَكَرَ: عَصَبِي وَلَحْمِي وَدَمِي وَشَعَرِي وَبَشَرِي. وَذَكَرَ خَصْلَتَيْنِ». {الحديث/١٧٨٥ = ١٧٥٤ فم. تجريد/١، لاپەڕە: ١١٩، رقم: ٩٦ = ١١٧، ١٣٨، ١٨٣، ٦٩٧، ٦٩٨، ٦٩٩، ٧٢٦، ٧٢٨، ٨٥٩، ٩٩٢، ٤٥٦٩، ١١٩٨، ٤٥٧٠، ٤٥٧١، ٤٥٧٢، ٥٩١٩، ٦٢١٥، ٧٤٥٢، ٦٣١٦}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: شەوێ لە ماڵی مەیموونەی پوورم بووم، کە هاوسەری پێغەمبەر بوو، مەیموونە خوشکی دایکم بوو، لە دەوری نیوە شەودا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خەبەری بۆوە، چوو دەستی بەئاو گەیاند، ئەوجا دەموچاوو هەردوو دەستی خۆی شۆردو خەوتەوە، پاش ماوەیێ هەڵسا، چوو بۆلای کوندەکەو دەمبێنەکەی کردەوەو دەستنوێژێکی تەواوی گرت، گەرچی ئاوی زۆری بەکار نەهێنا، بەڵام دەستنوێژێکی تەواوی گرت، ئەوجا هەڵسا دەستی کرد بەشەو

نوێـژ، منـیش هەڵسام بـە درۆ خـۆم، وەك کەسـێ تـازە لەخـەو هەڵسێ، کش و بـادا، نـەبادا پێغەمبـەر وابزانـێ کـە بەخەبـەر بـووم و ئاگـام لـەو بـووە، کەچـی کـردووە، منیش دەستنوێژم گرت، پێغەمبەر دەستی کرد بە شەو نوێـژ، منـیش چـووم لـەلای چەپیەوە راوەستام و نوێـژم بـە جەماعـەت لـە پشـتیەوە دابەسـت، جـا خۆشەویسـت (درووودی خودای لەسەر بێ) دەستی راستی نایە سەر سەرم و گوێی ڕاستی گـرتم و بردمـی بـۆلای ڕاستی خۆی، وە بە سیازدە رکات شەو نوێژ کۆتایی بە شەو نوێژی ئەو شەوە هێنـا، ئەوجا راکشایەوە و خەوتەوە، تەنانەت دەستی کرد بە پرخە پرخ، دەستووری وابوو کە دەخەوت پرخەی لێوە دەهات، جا بیلال هات ئاگاداری کردەوە کەوا کاتی نوێـژی بەیانییـە، تەشـریفی هەڵسـا نوێـژی کـرد، دەسـتنوێژی تـازە نـەکردەوە، ئەمـەیش بەشێـکە لە نزاو پاڕانەوەی ئەو شەوەی: (اللَّهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُورًا وَفِي بَصَرِي نُـورًا وَفِي سَمْعِي نُورًا وَعَنْ يَمِينِي نُورًا وَعَنْ يَسَارِي نُورًا وَفَوْقِي نُورًا وَتَحْتِي نُورًا وَأَمَامِي نُـورًا وَخَلْفِي نُورًا وَعَظِّمْ لِي نُورًا).

واتە: ئەی خودایە! پڕ دڵ و چاوو گوێچکەم لە نوورو ڕۆشنایی بفەرموو، هـەروا راست و چەپ و سەرو ژێرو بـەردەم و پشـتم، هـەروەها دڵ و دەروونم لـە نـوور کـەیل کەو نوقمی نوورم بفەرموو). سەلەمە فەرمووی: کورەیب (کە ئەم فەرموودەیـە لـە ئیبنو عەباسەوە، لـە پێغەمبـەرەوە دەگێڕێتـەوە) فـەرمووی: لـەناو نزاکـەدا حـەوت وشەی تری فەرموو. کە پەیوەندییان بە ئەندامەکانی ناو قەفەزەی سینگەوە هەیە، ئەوانەم لەیاد نەماوە، سەلەمە فەرمووی: سەبارەت بەو حـەوت وشـەیە، لـە هەنـدێ لە منالەکانی ئیمامی عەباسم پرسی، ئەوانەی پێ گوتم، ئاوا باسـی کـردن: دەمـارم و گۆشتم و خوێنم و مـووم و پێستم، وە دوو شـتی تریشـی بـاس کـرد، کـە تەواوکـەری حەوتەکـەن). {بڕوانـە: تجریـد/١، ژمـارە: ١١٢ + ژمـارە: ١٣٨ + تـاج/١، ژمـارە: ٩٨٧، زنجیرە: ١٨٤}.

٣٨٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ لِيُصَلِّيَ، افْتَتَحَ صَلاَتَهُ بِرَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ».{الحديث/١٨٠٣=١٧٧٢ فم}:

عائيشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، کە بەشەو هەڵدەسا بۆ شەو نوێژ، لەپێشا بە دوو ڕکاتی سووکەڵە دەستی پێ دەکرد). {تاج/١/٤٨٢، زنجیرە: ١٨٢، ژمارە: ٩٧٨، چاپی/٤}.

**٢٧٥) نزاو پاڕانەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەشەو کە هەڵ دەسا بۆ شەو نوێژ.** {**باب: دُعاءُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ**}

٣٨١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِىَ اللّهُ عنهما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقُولُ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ: « اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَلَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ قَيَّامُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَلَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، أَنْتَ الْحَقُّ، وَوَعْدُكَ الْحَقُّ، وَقَوْلُكَ الْحَقُّ، وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ، اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ، فَاغْفِرْ لِى مَا قَدَّمْتُ وَأَخَّرْتُ، وَأَسْرَرْتُ وَأَعْلَنْتُ، أَنْتَ إِلَهِى، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ». {الحديث/ ١٨٠٥ = ١٧٧٤فم. تجريد/١/٥٣٥، ژمارە: ٥٥٨ = ١١٢٠، ٦٣١٧، ٧٣٨٥، ٧٤٤٢، ٧٤٩٩}:

ئیبنو عەباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە لەشەوا هەڵ دەسا بۆ شەو نوێژ، لەسەرەتاوە دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ قَيَّامُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ أَنْتَ الْحَقُّ وَوَعْدُكَ الْحَقُّ وَقَوْلُكَ الْحَقُّ وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ وَالْجَنَّةُ حَقٌّ وَالنَّارُ حَقٌّ وَالسَّاعَةُ حَقٌّ اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ وَبِكَ خَاصَمْتُ وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ فَاغْفِرْ لِى مَا قَدَّمْتُ وَأَخَّرْتُ وَأَسْرَرْتُ وَأَعْلَنْتُ أَنْتَ إِلَهِى لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ):

واتە: ئەی خودایە! سوپاسو ستایش هەر بۆ تۆیە، هەر تۆی ڕووناک کەرەوەی ئاسمانەکانو زەویو ئەوەشی لەوانا هەیە، دیسان سوپاسو ستایش بۆ تۆ، تۆ هەتا هەتایە پایەداریو مایەی بوونو مانی هەموو شتێکیو، پارێزەرو ڕاگری ئاسمانەکانو زەویو ئەوەیشی لەوانا هەیە، دیسان سوپاسو ستایش هەر بۆ تۆیە، هەر تۆ پەروەردگاری ئاسمانەکانو زەویو ئەوانەشی لەوانا هەیە، تۆ هەقیو

راستو دروستیو فەرمایشتت هەقەو، بەڵێنت هەقەو، شاد بوون بە دیدارت لەپاش مردن حەقەو راستەو بەهەشت راستە، دۆزەخ راستە، قیامەت راستە، ئەی خودایە! خۆم سپارد بەتۆ، باوەڕم هەیە بە تۆ، پشتو پەنام هەر تۆی، داڵدەم هێناوەتە بەرتۆ، بە پشتی تۆ دەچم بەگژ ناحەزی خۆما، مەحکەمەو دادی خۆم دێنمە لای تۆو، تۆ دەکەم بە حەکەمو دادوەر لەنێوانی خۆمو نەیارما، ساتۆیش بە کەرەمو گەورەیی خۆت لە گوناهی بەرو دوام خۆش بە، هەروەها لە گوناهی نهێنیو ئاشکرام، هەر تۆ خودای منیو بەس، خودای تر نییە جگە لەتۆ!). {تاج/١/٤٨٦، ژمارە: ٩٨٦ چاپی چوارەم}.

## ٢٧٦) باسی چۆنێتیی شەو نوێژو ژمارەی رکاتەکانی. (١٧١٤ - ١٧٧٥).
## بابٌ: كَيْفِيَّةُ صَلاَةِ اللَّيْلِ وَعَدَدُ رُكُوعِهَا

٣٨٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ ثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، يُوتِرُ مِنْ ذَلِكَ بِخَمْسٍ، لاَ يَجْلِسُ فِي شَيْءٍ إِلاَّ فِي آخِرِهَا». {الحديث/١٧١٧ = ١٦٨٤ فم. تجريد/١/٥٤٤، رقم: ٥٦٨ = ١١٤٠، ١١٧٠}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لە هەموو هاوەڵو هاوسەرەکانی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەشەو، سیازدە رکات شەو نوێژی دەکرد، هەشت رکاتی تەهەججود بوو، دوو رکات دوو رکات دەیکردن، ئەوجا پێنج رکات وەتری دەکرد، بەیەك تەحیاتو بەیەك سلاودانەوە).

## ٢٧٧) نوێژی شەو دوو رکات دوو رکاتە، وەتریش تاقە رکاتێکە، لەدوایی شەودا
## باب: صَلاَةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، وَالْوَتْرُ رَكْعَةٌ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ

٣٨٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّهُ عنهما): أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ صَلاَةِ اللَّيْلِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « صَلاَةُ اللَّيْلِ مَثْنَى

مَثْنَى، فَإِذَا خَشِيَ أَحَدُكُمُ الصُّبْحَ صَلَّى رَكْعَةً وَاحِدَةً تُوتِرُ لَهُ مَا قَدْ صَلَّى ». {الحديث/١٧٤٥ = ١٧١٢ فم. تجريد/١/٤٨٦، رقم: ٥١٠ = ٩٩٠}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لە پێغەمبەری پرسی: شەو نوێژ چۆنە؟ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (شەو نوێژ دوو رکات دوو رکاتە، کە ترسی هەڵهاتنی بەیانت هەبوو، تاقە یەك رکات بکە، ئەوە دەبێ بە وەتری ئەو نوێژانەی کە ئەو شەوە کردووتن). {تاج/١، ژمارە: ٩٧٩، زنجیرە: ١٨٢} + {تاج/١، زنجیرە: ١٠٦، ژمارە: ٦١٦}.

## ٢٧٨) شەو نوێژ بەڕاوەستانەوەو بە دانیشتنەوە. (١٦٩٣ - ١٧١٣).

## بابٌ: صَلاَة اللَّيْل قَائِماً وَ قَاعِداً

٣٨٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها) قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْرَأُ فِي شَيْءٍ مِنْ صَلاَةِ اللَّيْلِ جَالِسًا، حَتَّى إِذَا كَبِرَ قَرَأَ جَالِسًا حَتَّى إِذَا بَقِيَ عَلَيْهِ مِنَ السُّورَةِ ثَلاَثُونَ أَوْ أَرْبَعُونَ آيَةً قَامَ فَقَرَأَهُنَّ، ثُمَّ رَكَعَ». {الحديث/١٧٠١ = ١٦٦٨ فم. تجريد/١/٥٣٣، رقم: ٥٥٧ = ١١١٨، ١١١٩، ١١٤٨، ١١٦١، ١١٦٨، ٤٨٣٧}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هەرگیز نەمدیوە کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بە دانیشتنەوە شەو نوێژ بکا، هەتا کاتێ چوو بەساڵا، ئیتر بە دانیشتنیشەوە قورئانی ناو نوێژی شەو نوێژی دەخوێند، هەتا دەیویست کە روکوع ببا، ئەوسا هەڵدەستایە سەرپێ، بەڕاوەستانیشەوە دەوری سیی چل ئایەتی تریشی دەخوێند ئەوسا روکوعی دەبرد، لەرکاتی دووەمیشا هەمان شتی دەکرد).

## ٢٧٩) ناباشی (کەراهەتی) هەیە کە شەو هەموو بخەوێ و هیچ شەو نوێژ نەکا. (١٨١٤ - ١٨١٦).

## باب: كراهة أَنْ يَنَامَ الرَّجُلُ اللَّيْلَ كُلَّهُ لا يُصَلِّي فِيه

٣٨٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: ذُكِرَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلٌ نَامَ لَيْلَةً حَتَّى أَصْبَحَ، قَالَ: « ذَاكَ رَجُلٌ بَالَ الشَّيْطَانُ فِي أُذُنَيهِ ». أَوْ

قَـالَ « فِـى أُذُنَيْـهِ ». {الحـديث/١٨١٤ = ١٧٨٤ فـم. تجريـد/١/٥٤٧، رقـم: ٥٧١ = ١١٤٤، ٣٢٧٠}:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە خزمەتی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) باسی کابرایێ کرا، گوترا: هەتا بەیانەکی هەر نووستبوو، وە نەچوو بوو بەلای شەو نوێژەوە پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوە شەیتان گمێزی کردۆتە ناو گوێچکەیەوە). یا فەرمووی: (ناو هەردوو کونە گوێچکەیەوە). {تاج/١، ژمارە: ٩٧٠}.

**٢٨٠) کاتێ کەسێ لەئێوە لەناو نوێژدا خەوی دەهاتو وەنەوزی دەدا با بخەوێ.**
**(١٨٢٨ - ١٨٣٣). (باب: إِذَا نَعِسَ فِي الصَّلَاةِ فَلْيَرْقُدْ)**

٣٨٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عنها) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « إِذَا نَعَسَ أَحَدُكُمْ فِى الصَّلاَةِ فَلْيَرْقُدْ حَتَّى يَذْهَبَ عَنْهُ النَّوْمُ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا صَلَّى وَهُوَ نَاعِسٌ، لَعَلَّهُ يَذْهَبُ يَسْتَغْفِرُ فَيَسُبُّ نَفْسَهُ ». {الحديث/١٨٣٢ = ١٨٠٢ فـم. تجريـد/١، لاپەڕە: ١٧١، ژمارە: ١٥٦ = ٢١٢}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ یەکێ لەئێوە لەناو نوێژدا وەنەوزی دەداو خەوە نووچکەی بوو، ئیتر بابچێ بخەوێ هەتا خەوەکەی دەڕوا، چونکە کاتێ بەدەم وەنەوزە کوتێو خەوبردنەوەوە، نوێژ بکەن، ڕەنگە بتانەوێ بپاڕێنەوە بۆ خۆتان، بەڵام لە جیاتیی ئەوە جنێو بە خۆتان بدەن). {تاج/١، ژمارە: ٥٧٨، چاپی/٤، زنجیرە: ٩٦}.

**٢٨١) گرێکانی شەیتان بەچی دەکرێتەوە.(١٨١٤-١٨١٦).**
**باب: مَايَحِلُّ عُقَدَ الشَّيْطَانِ**

٣٨٧- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «يَعْقِدُ الشَّيْطَانُ عَلَى قَافِيَةِ رَأْسِ أَحَدِكُمْ ثَلاَثَ عُقَدٍ إِذَا نَامَ، بِكُلِّ عُقْدَةٍ يَضْرِبُ عَلَيْكَ لَيْلاً طَوِيلاً، فَإِذَا اسْتَيْقَظَ فَذَكَرَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، وَإِذَا تَوَضَّأَ انْحَلَّتْ عَنْهُ عُقْدَتَانِ،

فَإِذَا صَلَّى انْحَلَّتِ الْعُقَدُ، فَأَصْبَحَ نَشِيطًا طَيِّبَ النَّفْسِ، وَإِلاَّ أَصْبَحَ خَبِيثَ النَّفْسِ كَسْلاَنَ».
{الحديث/١٨١٦ = ١٧٨٦ فم. تجريد/١/٥٤٦، رقم: ٥٧٠ = ٣٢٦٩}:

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ:** (کاتێ کە کەسێ لە ئێوە دەخەوێ شەیتان سێ گرێ دەدا لەپشتی سەری‌و، یەکە یەکە دەست دەمالێ بە گرێکاناو دەڵێ: بخەوە شەوگارێکی دوورو درێژت لەسەر بێ، جا ئەگەر خەوت‌و لەپاشا خەبەری بۆوەو یادی خودای کرد، ئەوا گرێیەکیان دەکرێتەوە، خۆ ئەگەر دەستنوێژیشی گرت، ئەوا گرێیەکی تریشیان دەکرێتەوە، وە ئەگەر شەو نوێژیشی کرد، ئیتر هەموو گرێکان بەتەواوی دەکرێنەوە، وە خۆشی چالاك‌و گورج‌و گۆڵ‌و دڵخۆش دەبێتەوە، ئەگینا پەستی‌و دڵگرانی‌و تەمبەڵی دایدەگری). {تاج/١، زنجیرە: ١٨١، ژمارە: ٩٦٩}.

**٢٨٢) هەموو شەوێ کاتێکی تایبەتی وای تیادایە نزاو پاڕانەوەی تیادا گیرا دەبێ.**
(١٧١٤ - ١٧٧٥). **باب: في الليل ساعةٌ يُسْتَجَابُ فِيهَا**

٣٨٨- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ مِنَ اللَّيْلِ سَاعَةً، لاَ يُوَافِقُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ يَسْأَلُ اللَّهَ خَيْرًا إِلاَّ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ، وَذالِكَ كُلَّ لَيْلَةٍ».
{الحديث/١٧٦٧ = ١٧٣٨}:

**جابیر** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ:** (هەموو شەوێ، ماوەیەکی تیا هەیە، هەر پیاوێکی موسوڵمان، یا هەر ژنێکی موسوڵمان، بۆی ڕێ بکەوێ لەو حەلەدا، داوای هەرچی بکا لەخودا، لە خێرو بێری هەردوو جیهان، خودا بێ دڵی ناکاو ئەو شتەی دەداتێ). {تاج/١، زنجیرە: ١٨١، ژمارە: ٩٦٧}.

**٢٨٣) هاندان لەسەر نزاو پاڕانەوەو یادی خودا، لە کۆتایی شەوەوە، گیرا بوونی مراز تێیدا. باب: الترغِيبُ فِي الدُّعاءِ وَالذِّكْرِ فِي آخرِ اللَّيْلِ وَالإجابَةِ فِيهِ**

٣٨٩- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «يَنْزِلُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا كُلَّ لَيْلَةٍ، حِينَ يَمْضِى ثُلُثُ اللَّيْلِ الأَوَّلُ، فَيَقُولُ:

« أَنَا الْمَلِكُ أَنَا الْمَلِكُ، مَنْ ذَا الَّذِى يَدْعُونِى فَأَسْتَجِيبَ لَهُ؟! مَنْ ذَا الَّذِى يَسْأَلُنِى فَأُعْطِيَهُ؟ مَنْ ذَا الَّذِى يَسْتَغْفِرُنِى فَأَغْفِرَ لَهُ، فَلاَ يَزَالُ كَذَلِكَ حَتَّى يُضِيءَ الْفَجْرُ ». {الحديث/١٧٧٠ = ١٧٣٩م. تجريد/١، لاپەڕە: ٥٤٧، رقم: ٥٧٢ = ١١٤٥، ٦٣٢١، ٧٤٩٤}:

لە ئەبو هورەیرەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەموو شەوێ —کە سێیەکی یەکەمی شەو دەڕوا- خودای پاك‌و پیرۆز دێتە خوارەوە، بۆ ئاسمانی خواروو، کە یەکەم ئاسمانە بۆ زەوی، دەفەرموێ: پادشای راستەقینە هەر خۆمم، کێیە ئەو کەسەی لەم کاتی بارانی نوورو رەحمەتەدا بانگم لێ دەکا تا بچم بە دەنگیەوە، کێیە ئەو کەسەی داوام لێ دەکا تا بەشی بدەم، کێیە ئەو کەسەی کە داوای لێ خۆشبوونم لێ دەکا تا لێی خۆش بم، ئیتر هەروا دەفەرموێ: لەوێ هەتا رۆژی رووناك ددەبێتەوە). {تاج/١، ژمارە: ٩٦٦، زنجیرە: ١٨١}.

## ٢٨٤) پوختەی شەو نوێژی پێغەمبەر، کەسێ بەشەو بەهۆی خەوەوە، یا بەهۆی نەخۆشییەوە، شەو نوێژی نەکرد، چی بکا باشە.

## باب: جَامِعُ صَلاَةِ اللَّيْلِ وَمَنْ نَامَ أَوْ مَرِضَ

٣٩٠- عَنْ قَتَادَةَ عَنْ زُرَارَةَ: أَنَّ سَعْدَ بْنَ هِشَامِ بْنِ عَامِرٍ أَرَادَ أَنْ يَغْزُوَ فِى سَبِيلِ اللَّهِ، فَقَدِمَ الْمَدِينَةَ فَأَرَادَ أَنْ يَبِيعَ عَقَارًا لَهُ بِهَا، فَيَجْعَلَهُ فِى السِّلاَحِ وَالْكُرَاعِ، وَيُجَاهِدَ الرُّومَ حَتَّى يَمُوتَ، فَلَمَّا قَدِمَ الْمَدِينَةَ، لَقِىَ أُنَاسًا مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ، فَنَهَوْهُ عَنْ ذَلِكَ، وَأَخْبَرُوهُ أَنَّ رَهْطًا سِتَّةً أَرَادُوا ذَلِكَ فِى حَيَاةِ نَبِىِّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَنَهَاهُمْ نَبِىُّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَالَ: « أَلَيْسَ لَكُمْ فِىَّ أُسْوَةٌ ». فَلَمَّا حَدَّثُوهُ بِذَلِكَ رَاجَعَ امْرَأَتَهُ وَقَدْ كَانَ طَلَّقَهَا، وَأَشْهَدَ عَلَى رَجْعَتِهَا، فَأَتَى ابْنَ عَبَّاسٍ فَسَأَلَهُ عَنْ وِتْرِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى أَعْلَمِ أَهْلِ الأَرْضِ بِوِتْرِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ قَالَ: مَنْ؟ قَالَ: عَائِشَةُ، فَأْتِهَا فَاسْأَلْهَا، ثُمَّ ائْتِنِى فَأَخْبِرْنِى بِرَدِّهَا عَلَيْكَ، فَانْطَلَقْتُ إِلَيْهَا، فَأَتَيْتُ عَلَى حَكِيمِ بْنِ أَفْلَحَ، فَاسْتَلْحَقْتُهُ إِلَيْهَا، فَقَالَ: مَا أَنَا بِقَارِبِهَا لأَنِّى نَهَيْتُهَا أَنْ تَقُولَ فِى هَاتَيْنِ الشِّيعَتَيْنِ شَيْئًا، فَأَبَتْ فِيهِمَا إِلاَّ مُضِيًّا. قَالَ: فَأَقْسَمْتُ عَلَيْهِ فَجَاءَ. فَانْطَلَقْنَا إِلَى عَائِشَةَ فَاسْتَأْذَنَّا عَلَيْهَا، فَأَذِنَتْ لَنَا، فَدَخَلْنَا عَلَيْهَا، فَقَالَتْ: أَحَكِيمٌ؟

(فَعَرَفْتُهُ). فَقَالَ: نَعَمْ. فَقَالَتْ: مَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: سَعْدُ بْنُ هِشَامٍ؟ قَالَتْ: ابن هِشَامٍ؟ قَالَ: ابْنُ عَامِرٍ، فَتَرَحَّمَتْ عَلَيْهِ وَقَالَتْ خَيْرًا؟ قَالَ قَتَادَةُ (وَكَانَ أُصِيبَ يَوْمَ أُحُدٍ) فَقُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ أَنْبِئِينِى عَنْ خُلُقِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَتْ: أَلَسْتَ تَقْرَأُ الْقُرْآنَ؟ قُلْتُ: بَلَى، قَالَتْ: فَإِنَّ خُلُقَ نَبِيِّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ الْقُرْآنَ، قَالَ: فَهَمَمْتُ أَنْ أَقُومَ وَلاَ أَسْأَلَ أَحَدًا عَنْ شَىْءٍ حَتَّى أَمُوتَ، ثُمَّ بَدَا لِى فَقُلْتُ: أَنْبِئِينِى عَنْ قِيَامِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَتْ: أَلَسْتَ تَقْرَأُ (يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ)؟ قُلْتُ: بَلَى، قَالَتْ: فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ افْتَرَضَ قِيَامَ اللَّيْلِ فِى أَوَّلِ هَذِهِ السُّورَةِ فَقَامَ نَبِىُّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَصْحَابُهُ حَوْلاً، وَأَمْسَكَ اللَّهُ خَاتِمَتَهَا اثْنَىْ عَشَرَ شَهْرًا فِى السَّمَاءِ حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ فِى آخِرِ هَذِهِ السُّورَةِ التَّخْفِيفَ فَصَارَ قِيَامُ اللَّيْلِ تَطَوُّعًا بَعْدَ فَرِيضَةٍ. قَالَ: قُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ أَنْبِئِينِى عَنْ وِتْرِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَتْ: كُنَّا نُعِدُّ لَهُ سِوَاكَهُ وَطَهُورَهُ، فَيَبْعَثُهُ اللَّهُ مَا شَاءَ أَنْ يَبْعَثَهُ مِنَ اللَّيْلِ، فَيَتَسَوَّكُ وَيَتَوَضَّأُ وَيُصَلِّى تِسْعَ رَكَعَاتٍ لاَ يَجْلِسُ فِيهَا إِلاَّ فِى الثَّامِنَةِ، فَيَذْكُرُ اللَّهَ وَيَحْمَدُهُ وَيَدْعُوهُ، ثُمَّ يُسَلِّمُ تَسْلِيمًا يُسْمِعُنَا، ثُمَّ يُصَلِّى رَكْعَتَيْنِ بَعْدَ مَا يُسَلِّمُ وَهُوَ قَاعِدٌ، فَتِلْكَ إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً يَا بُنَىَّ، فَلَمَّا سَنَّ نَبِىُّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَخَذَ اللَّحْمَ أَوْتَرَ بِسَبْعٍ، وَصَنَعَ فِى الرَّكْعَتَيْنِ مِثْلَ صَنِيعِهِ الأَوَّلِ، فَتِلْكَ تِسْعٌ يَا بُنَىَّ، وَكَانَ نَبِىُّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا صَلَّى صَلاَةً أَحَبَّ أَنْ يُدَاوِمَ عَلَيْهَا، وَكَانَ إِذَا غَلَبَهُ نَوْمٌ أَوْ وَجَعٌ عَنْ قِيَامِ اللَّيْلِ، صَلَّى مِنَ النَّهَارِ ثِنْتَىْ عَشْرَةَ رَكْعَةً، وَلاَ أَعْلَمُ نَبِىَّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَرَأَ الْقُرْآنَ كُلَّهُ فِى لَيْلَةٍ وَلاَ صَلَّى لَيْلَةً إِلَى الصُّبْحِ، وَلاَ صَامَ شَهْرًا كَامِلاً غَيْرَ رَمَضَانَ. قَالَ: فَانْطَلَقْتُ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَحَدَّثْتُهُ بِحَدِيثِهَا، فَقَالَ: صَدَقَتْ، وَلَوْ كُنْتُ أَقْرَبُهَا، أَوْ أَدْخُلُ عَلَيْهَا لأَتَيْتُهَا حَتَّى تُشَافِهَنِى بِهِ. قَالَ: قُلْتُ: لَوْ عَلِمْتُ أَنَّكَ لاَ تَدْخُلُ عَلَيْهَا مَا حَدَّثْتُكَ حَدِيثَهَا». {الحديث/١٧٣٦ = ١٧٠٣ فتح الْمُلْهِمِ}.

قەتادە فەرمووی: زورارە فەرمووی: سەعدی کوڕی هیشامی کوڕی عامیر، ویستی سەرومڕ غەزا بکا لە ڕێگەی خودادا، جا هات بۆ مەدینە، لەوێ پارچەیێ زەوی‌و زاری هەبوو، ویستی بیفرۆشێ‌و بە پارەکەی چەك‌و وڵاخی سواریی پێ بکڕێ‌و هەتا دەمرێ غەزای ڕۆمی پێ بکا، بەڵام کاتێ گەیشتە ناو مەدینە، گەیشت بەچەند کەسێ

له خه‌ڵكی مه‌دینه، پێشگیرییان لێكرد له كردنی ئه‌وه‌و پێیان گوت: كه له‌سه‌رده‌می ژیانی پێغه‌مبه‌ر خۆیدا (دروودی خودای له‌سه‌ر بێ) ده‌سته‌یه‌كی شه‌ش كه‌سی ویستیان وابكه‌ن، پێغه‌مبه‌ری خودایش (دروودی خودای له‌سه‌ر بێ) رێگه‌ی ئه‌وه‌ی پێ نه‌دان‌و پێی فه‌رموون: (من بۆ ئێوه‌و بۆ هه‌موو یه‌كه‌یه‌ی گه‌لی ئیسلامی خۆم باشترین سه‌رمه‌شقم كه چاوم لێ بكه‌ن‌و بمكه‌ن به پێشه‌وای خۆتان، ده‌ی من شتی وا ناكه‌م كه ده‌ست له‌دنیا هه‌ڵگرم‌و هه‌ر خه‌ریكی خه‌بات‌و غه‌زا كاری بم). جا كاتێ ئه‌وه‌یان به سه‌عد گوت، ژنه‌كه‌ی گێڕایه‌وه ژێر ركێفی ژن‌و مێردی خۆی، كه له‌وه‌پێش به نیازی پێشوو ته‌ڵاقی دابوو هه‌تا خۆی ته‌رخان بكا بۆ غه‌زا له پێناوی ئایینی خودادا، وه به‌پێی ئایه‌تی قورئان، له‌سه‌ر گێڕانه‌وه‌ی ژنه‌كه‌ی بۆلای خۆی دوو شایه‌تی به شایه‌تی گرت، سه‌عد چوویش بۆ خزمه‌تی ئیبنو عه‌باس (ره‌زای خودایان لێ بێ) سه‌باره‌ت به كات‌و چۆنێتی‌و چه‌ندێتی نوێژی وه‌تری پێغه‌مبه‌ر (دروودی خودای له‌سه‌ر بێ) پرسیاری لێ كرد، ئیبنو عه‌باسیش پێی فه‌رموو: زاناترین كه‌س له‌سه‌ر رووی زه‌وی، به وه‌تری پێغه‌مبه‌ر ئه‌مڕۆ، عائیشه‌ی هاوسه‌ریه‌تی، بچۆ بۆلای ئه‌وو له‌و بپرسه‌و وه‌ڵامه‌كه‌ی ئه‌وم له‌م باره‌یه‌وه بۆ بهێنه‌ره‌وه. سه‌عد فه‌رمووی: جا كه‌وتمه رێ بۆلای، له‌پێشا رۆیشتم بۆلای حه‌كیمی كوڕی ئه‌فله‌ح، داوام لێی كرد، كه له‌گه‌ڵما بێت بۆلای عائیشه، حه‌كیم فه‌رمووی: (من توخنی ناكه‌وم، چونكه كاتی خۆی ئامۆژگاریم كرد كه هه‌قی به‌سه‌ر ئه‌و دوو به‌ره‌یه‌وه نه‌بێ، كه له‌ناو خۆیانا ناكۆكن، به‌ڵام ئه‌و هه‌ر وازی نه‌هێناو له‌سه‌ری رۆی هه‌تا ئه‌و هه‌موو شه‌ڕو شۆڕه‌ی لێ په‌یدا بوو، وه‌ك جه‌نگی جه‌مه‌ل. گوتی: منیش سوێندم لێ خوارد كه ده‌بێ له‌گه‌ڵم بێیت، ئه‌ویش هات. رۆیشتین تا گه‌یشتینه به‌رماڵی عائیشه، داوای مۆڵه‌تی چوونه ژووره‌وه‌مان كرد، ئه‌ویش مۆڵه‌تی داین، چووینه ژووره‌وه، حه‌كیمی ناسییه‌وه‌و فه‌رمووی: ئه‌وه حه‌كیم تۆی؟ فه‌رمووی: به‌ڵێ ئه‌وم. فه‌رمووی: ئه‌ی ئه‌مه كێیه كه‌وا له‌گه‌ڵتا؟ حه‌كیم گوتی: سه‌عدی كوڕی هیشامه فه‌رمووی: كام هیشام؟ حه‌كیم فه‌رمووی: هیشامی كوڕی عامیر، جا عائیشه نزای

خێری بۆ عامیر کردو باسی چاکیو باشی ئەوی کرد، قەتادە دەفەرموێ: عامیر لە ڕۆژی جەنگی ئوحوددا شەهید بوو.

سەعد فەرمووی: عەرزی عائیشەم کرد: ئەی دایکی باوەڕداران! پێم بفەرموو ڕەفتارو ڕەوشتی پێغەمبەر (درووَدی خودای لەسەر بێ) چۆنو چی بوو؟ فەرمووی: دیارە کەتۆ قورئان دەخوێنی؟ گوتم: بەڵێ دەیخوێنم، فەرمووی: دەی ڕەفتاری پێغەمبەر، ڕەنگدانەوەی ئەو ئایەتانەی قورئان بوو، کە باسی ڕەفتارە جوانەکان دەکەن.

سەعد فەرمووی: ویستم کە بەم وەڵامە کورتو پوختو پڕ واتایە قنیات بکەمو بیکەم بە ماموستاو سەرمەشق بۆ خۆمو ئیتر هەتا ماوم هیچ شتێ لەکەس نەپرسم، دوایی وام بەباش زانی ئەم پرسیارە بکەم: گوتم: ئەی شەو نوێژی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چۆن بوو؟ فەرمووی: دیارە کەتۆ سۆرەتی (يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ) دەخوێنی؟ گوتم: بەڵێ، فەرمووی: دەی خودای باڵا دەستو تەوانا، لە سەرەتای ئەم سوورەتەوە، بەم ئایەتانە شەو نوێژی فەرزو پێویست کرد: {يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ قُمِ اللَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا....} هەتا ساڵێکی تەواو پێغەمبەرو هاوەڵانی بەپێی ئەم ئایەتانە شەو نوێژیان دەکرد، خودای گەورە کۆتایی ئەم سوورەتەی دوازدە مانگ لە ئاسمان گل دایەوە، سەرەنجام لە کۆتایی ئەم سوورەتەدا، ئاسانکاریو بار سووکی ناردە خوارەوە، ئیتر شەو نوێژ (کە لەوەپێش فەرز بوو) بوو بە سوننەت. فەرمووی: گوتم: ئەی دایکی باوەڕداران! لەبارەی نوێژی وەتری پێغەمبەرەوە قسەمان بۆ بکە. ئەویش فەرمووی: بەشەو سیواکو ئاوی دەستنوێژمان بۆ ئامادە دەکرد، جا ئەوکاتەی کە خودا مەیلی لەسەر بوایە، پێغەمبەری لەخەو هەڵدەسان بۆ شەو نوێژ، لەپێشا سیواکی دەکردو ئەوجا دەستنوێژی دەگرتو نۆ رکات نوێژی سوننەتی دەکرد، لە رکاتی هەشتەما نەبێ لە هیچیانا دانەدەنیشت، کە لەم رکاتەدا دادەنیشت تەحیاتی دەخوێندو سوپاسو یادی خودای دەکردو نزای دەکرد، سڵاوی نەدەدایەوە، بەڵکوو هەڵدەسا بۆ رکاتی نۆیەمی، لە کۆتایی رکاتی نۆهەما دادەنیشت بۆ خوێندنی تەحیات، یادو سوپاسی خوداو نزای دەخوێند، ئەوجا بە

شێوەیێ سڵاوی دەدایەوە، کە ئێمە گوێمان لە سڵاو دانەوەکەی دەبوو، ئەوجا بە دانیشتنەوە دوو رکات نوێژی سوننەتی شەو نوێژی تری دەکرد، کە ئەمە هەمووی دەکاتە یازدە رکات، ئەی سەعد! ئەی کوڕی شیرینم!

جا کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوو بەساڵاو کەمێ گۆشتی گرتو قورس بوو، حەوت رکات وەتری دەکرد، وە دوو رکاتەکەی کە لەپێش بەساڵا چوونا بە دانیشتنەوە دەیکردن لەم حاڵەیشدا هەربە دانیشتنەوە دەیکردن لەپاش حەوت رکاتەکە، ئەمەشیان دەکاتە نۆ رکات ئەی کوڕی شیرینم!

دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، کە نوێژی سوننەتی دەکرد، یا هەر خواپەرستییەکی تری دەکرد، حەزی دەکرد کە بەردەوام بێ لەسەری، خۆ ئەگەر بەهۆی خەوەوە، یا بەهۆی نەخۆشیو شتی واوە، شەوێ شەو نوێژەکەی بفەوتایە، ئەوا بە رۆژ دەیگێڕایەوەو قەزای دەکردەوە، لەجیاتی ئەوە بە رۆژ لە بەینی شەبەقو نیوەڕۆدا دوازدە رکات نوێژی دەکرد، من بەش بەحاڵی خۆم نەمدیوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە یەك شەو خەتمەیێ قورئانی کردبێ، یا شەوێ هەتا بەیانی هەر شەو نوێژی کردبێ، یا مانگێ سەرا سەر هەمووی بەرۆژوو بووبێ بێجگە لە مانگی رەمەزان. سەعد فەرمووی: چوومەوە بۆلای ئیبنو عەبباس، ئەم فەرمایشتەی عائیشەم بۆی گێڕایەوە، فەرمووی: راست دەکا، خۆزگە هاموشۆم لەگەڵیا بایە، بۆ خۆم دەچووم بۆلای هەتا ئەم فەرموودەیەم لە دەمی عائیشە خۆی ببیستبایە. سەعد فەرمووی: پێم گوت: ئەگەر دەمزانی کە هاموشۆی ناکەی، فەرموودەکەی ئەوم بۆ نەدەگێڕایتەوە).

## ٢٨٥) باسی نوێژی وەتر (باب: فِي صَلَاةِ الوِتْرِ)

٣٩١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عنها) قَالَتْ: مِنْ كُلِّ اللَّيْلِ قَدْ أَوْتَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، مِنْ أَوَّلِ اللَّيْلِ وَأَوْسَطِهِ، وَآخِرِهِ فَانْتَهَى وِتْرُهُ إِلَى السَّحَرِ.
{الحديث/١٧٣٣ = ١٧٠١ فم. تجريد/١، لاپەڕە: ٤٨٧، رقم: ٥١٢ = ٩٩٦}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەپاش کردنی نوێژی خەوتنان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەهەموو کاتێکی شەودا، وەتری دەکرد، هەندێ جار لە سەرەتای شەوەوە دەیکرد، هەندێ جار لە ناوەڕاستی شەودا دەیکرد، وە هەندێ جاریش لە دوادوای شەودا، لەپێش بانگی بەیانیدا دەیکرد، بەڵام لەپێش مردنیدا هەر بەرەبەیان وەتری دەکرد). {تاج/١، زنجیره: ١٠٥، ژمارە: ٦١٣}.

## ٢٨٦) باسی وەترو دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی.
## بَابٌ: فِي الْوِتْرِ وَ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ

٣٩٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ سِيرِينَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عُمَرَ، قُلْتُ: أَرَأَيْتَ الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلَاةِ الْغَدَاةِ أَأُطِيلُ فِيهِمَا الْقِرَاءَةَ؟ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، وَيُوتِرُ بِرَكْعَةٍ، قَالَ: قُلْتُ: إِنِّي لَسْتُ عَنْ هَذَا أَسْأَلُكَ. قَالَ: إِنَّكَ لَضَخْمٌ، أَلَا تَدَعُنِي أَسْتَقْرِئُ لَكَ الْحَدِيثَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، وَيُوتِرُ بِرَكْعَةٍ، وَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْغَدَاةِ، كَأَنَّ الْأَذَانَ بِأُذُنَيْهِ). {الحديث/١٧٥٨ = ١٧٢٨ فم. بخاری/٩٩٥}:

ئەنەسی کوڕی سیرین (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پرسیارم لە ئیبنو عومەر کرد: گوتم: ئایا لە دوو ڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانیدا، بە دوورو درێژی قورئان بخوێنم یانا؟ فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو ڕکات دوو ڕکات شەو نوێژی دەکرد، یەك ڕکات وەتریشی بە تەنیا دەکرد، فەرمووی: گوتم: مەبەستم لە پرسیارەکەم ئەمە نییە. فەرمووی: تۆ زلحۆی درەنگ تێ ئەگەی، ئەدیی وازم لێ بێنە با بە تێرو تەسەلی فەرموودەکەت بۆ باس بکەم: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو ڕکات دوو ڕکات شەو نوێژی دەکرد، یەك ڕکات وەتریشی لە کۆتاوە بە تەنیا دەکرد، وە لەنێوانی بانگی بەیانیو قامەتدا دوو ڕکات نوێژی سوننەتی سووکەڵەی دەکرد، وا بەخێرایی ئەم دوو ڕکاتە سوننەتەی دەکرد وەك کەسێ مەترسی ئەوەی هەبێ کە قامەت بکرێو ئەم لێ نەبووبێتەوە).

### ٢٨٧) كەسێ ترسی ئەوەی هەبێ كە لەكۆتایی شەوەوە هەڵ نەسێ بۆ شەو نوێژ، با لەسەرەتای شەوەوە وەتر بكا.

### باب: مَنْ خَافَ أَنْ لا يَقُومَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ فَلْيُوْتِرْ أَوَّلَهُ

٣٩٣- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « مَنْ خَافَ أَنْ لاَ يَقُومَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ، فَلْيُوتِرْ أَوَّلَهُ، وَمَنْ طَمِعَ أَنْ يَقُومَ آخِرَهُ فَلْيُوتِرْ آخِرَ اللَّيْلِ، فَإِنَّ صَلاَةَ آخِرِ اللَّيْلِ مَشْهُودَةٌ، وَذَلِكَ أَفْضَلُ ». {الحديث/١٧٥٨ = ١٧٣٣ فم}:

**جابر** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (هەركەسێ دەترسێ كە لەكۆتایی شەوەوە هەڵنەسێ بۆ شەو نوێژ، با لەسەرەتای شەوەوە نوێژی وەتر بكا، وە هەركەسێ كە بە تەمایە كە لەكۆتایی شەوەوە هەڵبسێ بۆ شەو نوێژ با لەكۆتایی شەودا نوێژی وەتر بكا، چونكە نوێژی ئاخری شەو فریشتەی رەحمەت دێنە دیاریو تەماشای دەكەن، ئاشكرایە كە ئەمە زۆر باشترە!). تاج/١، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٦١٤}.**

### ٢٨٨) كردنی وەتر لەپێش ئەوەدا كە بەیان بدا.

### باب: أَوْتِرُوا قَبْلَ أَنْ تُصْبِحُوا

٣٩٤- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِيّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولِ اللّه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « أَوْتِرُوا قَبْلَ أَنْ تُصْبِحُوا ». {الحديث/١٧٦١ = ١٧٣١ فم}:

**ئەبو سەعیدی خودری** (رەزای خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: (هەتا شەبەقی بەیان دەدا كاتی نوێژی وەتر دەمێنێ، كەواتە بەر لە شەبەق نوێژی وەتر بكەن).**

### ٢٨٩) گەورەییو بەهرەی خوێندنی قورئان لە نوێژدا. (١٨٦٩ - ١٨٧٠).

### باب: فضل قِرَاءَةِ القرآنِ فِي الصَّلاَةِ

٣٩٥- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ إِذَا رَجَعَ إِلَى أَهْلِهِ أَنْ يَجِدَ فِيهِ ثَلاَثَ خَلِفَاتٍ عِظَامٍ سِمَانٍ؟». قُلْنَا: نَعَمْ.

قَالَ: فَثَلاَثُ آيَاتٍ يَقْرَأُ بِهِنَّ أَحَدُكُمْ فِى صَلاَتِهِ خَيْرٌ لَهُ مِنْ ثَلاَثِ خَلِفَاتٍ عِظَامٍ سِمَانٍ ».
{الحديث/١٨٦٩ = ١٨٤١ فم}:

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەستان حەزدەکەن کە دەڕۆنەوە بۆ ماڵەوە، لەوێ سێ وشتری ئاووسی قەبەی قەڵەوتان دەست بکەوێ؟). گوتمان: بەڵێ، کێ بێ حەزی لە خێری وا چاك نەبێ، ئەی پێغەمبەری ئازیز! فەرمووی: (دەسا سێ ئایەت لەپاش فاتیحاوە لە نوێژدا بخوێنن ئەوە گەلێ باشترە بۆ ئێوە لە سێ وشتری ئاوا). {تاج/١، زنجیرە: ٧٨، ژمارە: ٥٠١ + تاج/٤، زنجیرە: ٧٦، ژمارە: ٣٥٩٣}.

**٢٩٠) باسی ئەو سوورەتە هاو واتایانەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو دوو لە رکاتێکا، لە شەو نوێژدا دەیخوێندن.** (١٩٠٥ - ١٩١٠).

**باب: فِي النظائِر التي يقرأ سُورَتَيْنِ في رَكْعَة**

٣٩٦- عَنْ أَبِى وَائِلٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: غَدَوْنَا عَلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ يَوْمًا بَعْدَ مَا صَلَّيْنَا الْغَدَاةَ، فَسَلَّمْنَا بِالْبَابِ فَأَذِنَ لَنَا، قَالَ: فَمَكَثْنَا بِالْبَابِ هُنَيَّةً. قَالَ: فَخَرَجَتِ الْجَارِيَةُ فَقَالَتْ: أَلاَ تَدْخُلُونَ؟ فَدَخَلْنَا فَإِذَا هُوَ جَالِسٌ يُسَبِّحُ، فَقَالَ: مَا مَنَعَكُمْ أَنْ تَدْخُلُوا وَقَدْ أُذِنَ لَكُمْ؟ فَقُلْنَا: لاَ، إِلاَّ أَنَّا ظَنَنَّا أَنَّ بَعْضَ أَهْلِ الْبَيْتِ نَائِمٌ. قَالَ: أَظَنَنْتُمْ بِآلِ ابْنِ أُمِّ عَبْدٍ غَفْلَةً؟ قَالَ: ثُمَّ أَقْبَلَ يُسَبِّحُ حَتَّى ظَنَّ أَنَّ الشَّمْسَ قَدْ طَلَعَتْ، فَقَالَ: يَا جَارِيَةُ انْظُرِى هَلْ طَلَعَتْ؟ قَالَ: فَنَظَرَتْ فَإِذَا هِىَ لَمْ تَطْلُعْ، فَأَقْبَلَ يُسَبِّحُ حَتَّى إِذَا ظَنَّ أَنَّ الشَّمْسَ قَدْ طَلَعَتْ، فَقَالَ: يَا جَارِيَةُ انْظُرِي هَلْ طَلَعَتْ؟ فَنَظَرَتْ، فَإِذَا هِيَ قَدْ طَلَعَ، فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى أَقَالَنَا يَوْمَنَا هَذَا (فَقَالَ مَهْدِىٌّ: وَأَحْسِبُهُ قَالَ: وَلَمْ يُهْلِكْنَا بِذُنُوبِنَا). قَالَ: فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: قَرَأْتُ الْمُفَصَّلَ الْبَارِحَةَ كُلَّهُ، فَقَالَ: فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: هَذًّا كَهَذِّ الشِّعْرِ. إِنَّا لَقَدْ سَمِعْنَا الْقَرَاءَةَ، وَإِنِّى لأَحْفَظُ الْقَرَائِنَ الَّتِى كَانَ يَقْرَؤُهُنَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثَمَانِيَةَ عَشَرَ مِنَ الْمُفَصَّلِ وَسُورَتَيْنِ مِنْ آلِ (حم). {الحديث/١٩٠٨ = ١٨٨١ فم. تجريد/١، لاپەڕە: ٤٠٦، ژمارە: ٤٢٢ = ٧٧٥، ٤٩٩٦، ٥٠٤٣}:

ئەبو وائیل (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەپاش کردنی نوێژی بەیانی، ڕۆژێ زوو چووین بۆلای عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود، بۆ ماڵەوە، لە دەرگاوە سلاومان کردو داوای چوونە ماڵەوەمان کرد، ئەویش مۆڵەتی ئەوەی پێمان دا، فەرمووی: بەڵام تۆزێ لە بەردەرگا ماینەوە، دوایی کەنیشکەکە هات گوتی: ئەوە بۆچی نایەنە ژوورەوە؟ ئەوجا ڕۆیشتینە ژوورەوە، ڕوانیمان وا دانیشتووە ویردی بەیانیان دەخوێنێ، ویردەکەی بڕیو فەرمووی: ئەوە بۆچی نەهاتنە ماڵەوە خۆ ئێوە مۆڵەتی ئەوەتان پێ درابوو؟ عەرزمان کرد: هیچ ڕێگرێ نەبوو، تەنیا ئەوە نەبێ، گوتمان نەبادا کەسێ لە خێزانەکە خەوتبێ. فەرمووی: ئەوە چۆن گومانی وا خراپ، بە خێزانی ئیبنو مەسعوود دەبەن، کە بۆنی غەفڵەتو بێ ئاگایی لێ دێ؟ فەرمووی: دیسان دەستی کردەوە بە ویرد خوێندن، هەتا مەزەنەی وابوو کە خۆر کەوتبێ، ئەوجا فەرمووی: ئا کەنیشکە! بزانە خۆر کەتووە؟ فەرمووی: کەنیشکەکە چوو تەماشای کرد خۆر نەکەوتبوو، هەواڵەکەی پێ گوت، ئەویش دیسان دەستی کردەوە بە ویرد خوێندن، هەتا دیسانەوە وا هەستی کرد کە خۆر کەوتبێ، فەرمووی: کەنیشکە بزانە گزنگی داوە؟ کەنیشکەکە هاتەوە گوتی: بەڵێ خۆر کەوتووە. عەبدوڵڵا فەرمووی: سوپاس بۆ خودا، کە ئەمرۆش چاو پۆشی لە هەڵەکانمان کرد.

مەهدی کوڕی مەیموون، کە ئەم فەرموودەیە لە واصیلی ئەحدەبەوە لە ئەبو وائیلەوە دەگێڕێتەوە فەرمووی: وا دەزانم ئاوای فەرموو: (سوپاس بۆ خودا کە ئەمڕۆیش چاو پۆشی لە هەڵەکانمان کردو بەهۆی گوناهەکانمانەوە لەناوی نەبردین).

فەرمووی: جا پیاوێ لە کۆمەڵەکە گوتی: ئەم شەو لەیەك ڕکاتا هەموو ئەو سوورەتانەی قورئانم خوێند، کە پێیان دەگوترێ: موفەصصەل، کە لە سوورەتی قافەوەن هەتا کۆتایی قورئان؟ وە بۆیە پێیان دەگوترێ: (مُفَصَّل: جیا جیا) چونکە کورت کورتنو زوو زوو لە یەکتر جیادەبنەوە. ئیبنو مەسعوود فەرمووی: کەی قورئان خوێندن وادەبێ؟ دیارە وەك هەڵبەست بخوێنیتەوە ئاوا بە پەلە پەل

سەپاندووتن بەسەر یەکا، ئەو سوورەتانەی کە لە وێنەی یەکترن لە ئاهەنگو واتاو مەبەستدا، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو دوو جووتی دەکردنو لەیەك رکاتی شەو نوێژدا دەیانی خوێند، ئەو سوورەتانەی کە بەم شێوەیەن بەباشی ئاگام لێیانە، بیست سووەت بوون، هەژدەیان لە موفەصەل بوون، دوانیشیان لەو سوورەتانە بوون کە بە (حم) دەست پێ دەکەن).

## ٢٩١) باسی نوێژی رەمەزان. (١٧٧٦ - ١٧٨١).
## باب: ماجاء في صلاة رمضان

٣٩٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَرَجَ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ، فَصَلَّى فِي الْمَسْجِدِ، فَصَلَّى رِجَالٌ بِصَلاَتِهِ، فَأَصْبَحَ النَّاسُ يَتَحَدَّثُونَ بِذَلِكَ، فَاجْتَمَعَ أَكْثَرُ مِنْهُمْ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي اللَّيْلَةِ الثَّانِيَةِ، فَصَلَّوْا بِصَلاَتِهِ فَأَصْبَحَ النَّاسُ يَذْكُرُونَ ذَلِكَ، فَكَثُرَ أَهْلُ الْمَسْجِدِ مِنَ اللَّيْلَةِ الثَّالِثَةِ، فَخَرَجَ فَصَلَّوْا بِصَلاَتِهِ، فَلَمَّا كَانَتِ اللَّيْلَةُ الرَّابِعَةُ، عَجَزَ الْمَسْجِدُ عَنْ أَهْلِهِ، فَلَمْ يَخْرُجْ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَطَفِقَ رِجَالٌ مِنْهُمْ يَقُولُونَ: الصَّلاَةَ، فَلَمْ يَخْرُجْ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى خَرَجَ لِصَلاَةِ الْفَجْرِ، فَلَمَّا قَضَى صَلاَةَ الْفَجْرِ، أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ، ثُمَّ تَشَهَّدَ، فَقَالَ: « أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّهُ لَمْ يَخْفَ عَلَيَّ شَأْنُكُمُ اللَّيْلَةَ، وَلَكِنِّي خَشِيتُ أَنْ تُفْرَضَ عَلَيْكُمْ صَلاَةُ اللَّيْلِ فَتَعْجِزُوا عَنْهَا ». (وفي رواية): وَذَلِكَ فِي رَمَضَانَ». {الحديث/١٧٨١ = ١٧٥٠ فم. تجريد/٢، لاپەڕە: ٣٠٣، رقم: ٩٢١ = ٢٠١٢، ٢٠١١، ٩٢٤}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: شەوێ لە شەوەکانی رەمەزان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو جەرگەی شەودا دەرچوو لەماڵو چوو بۆ مزگەوتو لەوێ دەستی کرد بەشەو نوێژ، وە چەند پیاوێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە پشتیەوە پەیڕەوی (ئیقتیدا)یان پێ کردو، دەستیان کرد بە نوێژ کردن بە جەماعەت لە گەڵیاو، جا کاتێ رۆژ بۆوەو خەڵك ئەم باسەیان گێڕایەوە بۆ یەکتری، لە شەوی دووەما خەڵك زۆرتر گردەوە بوونو پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) دیسان بەر نوێژی بۆ کردنەوە، وە بۆ سبەینێ دیسان ئەم باسە تەواو بڵاوبۆوە، ئیتر

بۆ شەوی سێیەم خەڵکێکی زۆر لە مزگەوت کۆوە بوونو، دیسانەوە شەو نوێژیان بە جەماعەت لەپشت پێغەمبەرەوە کردەوە، جا لەشەوی چوارەما، هاوڕێیانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەندە زۆر کۆبوونەوە، مزگەوت نەیدەگرتن، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەو شەوەدا نەهات بۆ ناویان بۆ شەو نوێژ، تەنانەت چەند کەسێ بە دەنگی بەرز، بۆ یاد خستنەوەی پێغەمبەر، هەتا بێت بەر نوێژیی تەراویحەکەیان بۆ بکا، دەیانگوت: کاتی نوێژە، کاتی نوێژە، بەڵام پێغەمبەر هەر نەهات، جا سبەینێ کە هات بۆناویانو، نوێژی سبەینێی بۆ کردن، رووی تێ کردنو شایەتمانی هێناو فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (لەپاش سوپاسو ستایشی خودای گەورە، من ئەمشەو ئاگادار بووم لە هاتنی ئێوە بۆ مزگەوتو ئاگام لە حاڵتان بوو، کە چاوەڕوانی من بوون کە بەر نوێژیی تەراویحتان بۆ بکەم، بەڵام من کە نەهاتم بۆلاتان لەبەرئەوە بوو نەبادا ئەم تەراویحە فەرز بکرێ لەسەرتان، وە ئێوەیش پێی هەڵنەسنو بۆتان نەکرێ، ئەوسا لەسەر ئەوە تووشی ئێشو ئازار ببن).

ئیتر هەتا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆچی دوایی کرد، شەو نوێژیی رەمەزان هەر لەسەر ئەم شێوەیە بوو، هەبوو لە ماڵەوەی دەیکرد، هەبوو لە مزگەوت دەیکرد، هەبوو کۆمەڵ کۆمەڵ بەیەکەوە بە کۆمەڵ دەیانکرد). {تاج/٢، لاپەڕە: ١٠١، زنجیرە: ٣٧، ژمارە: ١٣٤٨} . {بڕوانە ژمارە: ٣٧٤ لەپێشەوە} .

## ٢٩٢) باسی شەو نوێژی رەمەزانو هاندان لەسەری. (١٧٧٦ - ١٧٨١).

## بابٌ: فِي قِيَامِ رَمَضَانَ وَالتَّرْغِيبِ فِيهِ

٣٩٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُرَغِّبُ فِي قِيَامِ رَمَضَانَ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَأْمُرَهُمْ فِيهِ بِعَزِيمَةٍ، فَيَقُولُ: « مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ ». فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَالأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ، ثُمَّ كَانَ الأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ فِي خِلاَفَةِ أَبِي بَكْرٍ، وَصَدْرًا مِنْ خِلاَفَةِ عُمَرَ عَلَى ذَلِكَ». {الحديث/١٧٧٧ = ١٧٤٦ فم. تجريد/١، لاپەڕە: ٥٦، رقم: ٣٦ = ٣٨، ٣٥، ١٩٠١، ٢٠٠٨، ٢٠٠٩، ٢٠١٤}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هانی یارانی خۆی دەدا لەسەر کردنی شەو نوێژی رەمەزان، بەڵام لەم لایەنەوە جەختی لێ نەدەکرن،، دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (کەسێ شەو نوێژی رەمەزان بکا، بە ئیمانو باوەڕەوە، لەبەر رەزای خودا، خودا لە گوناهەکانی لەوەو پێشی خۆش دەبێ، ئیتر هەتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆچی دوایی کرد، ئەم کارە لەسەر ئەم بارودۆخە بوو، هەرکەسێ بۆ خۆی بەتەنیا بە ئارەزوی خۆی، چەندێ ئارەزووی لێ بوایە ئەوەندە نوێژی تەراویحی دەکرد، لە پاشیشا لەکاتی جێنشینی (خەلافەت)ی ئەبوبەکرو لەسەرەتای جێنشینی عومەریشەوە ئەم کارە هەروا بوو). {تاج/٢، لاپەڕە: ١٠٠، زنجیرە: ٣٧، ژمارە: ١٣٤٧}.

**روونکردنەوە:**

پوختەی کۆمەڵێ بڕیاری شەرعی کە لەم فەرموودانەی پێشەوە وەردەگیرێن، لەگەڵ کۆمەڵێ بەهرەیان، بەپێی شەرحی نەوەوی‌و فەتحولولهیم.

١- پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەشەو بەردەوام، یادو زیکری خودای کردووە، وە بۆ ئێمەیش سوننەتە کەوابین، بەتایبەتی کاتێ هەڵ دەسین بۆ شەو نوێژو خواپەرستی.

٢- شەو نوێژ لای کەمەکەی یەك رکاتە، ژمارە نییە بۆلای زۆری، زاناکان دەفەرموون: (إِنَّ صَلاَةَ اللَّيْلِ مِنَ الطَّاعَاتِ الَّتِي كُلَّمَا زَادَ فِيهَا زَادَ الأَجْرُ = هەتا شەو نوێژ زیاتر بکەی خێری زۆرترە). شەو نوێژ دوو رکات دوو رکات بێ خێرترە.

٣- وەتر سوننەتە، لەپاش کردنی نوێژی خەوتنان کاتەکەی دەست پێ دەکا، هەتا بانگی نوێژی بەیانی دەمێنێ، لای کەمی یەك رکاتە، لای زۆری یازدە رکاتە، ئەگەر بفەوتێ دروستە قەزا بکرێتەوە.

٤- نوێژی تەهەجود سوننەتە، ئەو شەو نوێژەیە کە لەپاش خەوتن دەکرێ، واباشە لە هەشت رکات کەمتر نەبێ، بە دوو رکاتیش ئەصڵی سوننەتەکە دێتە دی.

٥ ـ شەو نوێـژو نوێـژی سـوننەت بـە دانیشتنیشـەوە دەکـرێ بـەڵام خێـری کـەمترە، مەگەر دانیشتنەکە لەبەر هۆی رەوابـێ. تەنانـەت دروسـتە رکاتـێ، هەندێـکی بـە پێوەو هەندێکی بە دانیشتنەوە بکرێ.

٦ ـ لەپاش وەتر، نوێژی سوننەتو نوێژو تەهەجود دەکرێ، وە بەکردنی وەتر شەو نوێژو نوێژی سوننەت قفڵ نابێ. {بڕوانە: ژمارە: ١٧١٤ — ١٧٧٥ شەرحی نەوەوی و ژمارە: ١٦٨٨ فتح الملهم شرح صحيح مسلم} .

٧ ـ لەپاش کردنی دوو رکاتە سوننەتەکەی پێش نوێـژی بـەیانی راکشـان، لەسـەر لای راست سوننەتە. (رقم: ٣٦١).

٨ ـ إِحْيَاءُ مَابَيْنَ الطُّلُوعَيْن کارێ شیرینە. کە ئەوەیـە نوێژکـەر لـەپاش کردنـی نوێـژی بەیانی لە جێـگە نوێژەکەیـدا بمێنێتـەوە هـەتا خـۆر بـەجوانی دەکـەوێ، وە لـەو ماوەیەدا خەریکی یادو تەزبیحاتو سەڵاواتدانو شـتی تـری وابـێ. {ژمـارە: ١٤٩٠، ١٤٩١، ١٧٥٠ فتح الملهم} .

٩ ـ بۆ باسـی شـەو نوێـژ بڕوانـە: تـاج/١، لاپـەڕە: ٤٧٦، زنجـیرە: ١٨١ هـەتا زنجـیرە: ١٨٦، لاپەڕە: ٤٩٣ چاپی چوارەم + **ریاض**/٣، لاپەڕە: ١٢٩، زنجیرە: (٢١٢) هەتا (٢١٥).



## باسەكانی رۆژی هەینی. (١٩٤٨ - ٢٠٤٠).

(بۆ باسەكانی هەینی بڕوانە تاج/١ لە زنجیرە: ١٣٩ هەتا زنجیرە: ١٥٣)

### ٢٩٣) خودا بە بەخششی خۆی ڕێنمایی ئەم گەلی ئیسلامەی كردووە بۆ پەیبردن بە رۆژی هەینیو بەهرەكانی.

{بڕوانە: فیقهی ئاسان/١، لاپەڕە: ٢٤٤، زنجیرە: ٧٧ هەتا زنجیرە: ٨٨، لاپەڕە ٢٥٧ چاپی/٢}.

٣٩٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «نَحْنُ الآخِرُونَ الأَوَّلُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَنَحْنُ أَوَّلُ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ، بَيْدَ أَنَّهُمْ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِنَا، وَأُوتِينَاهُ مِنْ بَعْدِهِمْ، فَاخْتَلَفُوا، فَهَدَانَا اللَّهُ لِمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ مِنَ الْحَقِّ، فَهَذَا يَوْمُهُمُ الَّذِي اخْتَلَفُوا فِيهِ هَدَانَا اللَّهُ لَهُ، قَالَ: يَوْمُ الْجُمُعَةِ، فَالْيَوْمُ لَنَا وَغَدًا لِلْيَهُودِ وَبَعْدَ غَدٍ لِلنَّصَارَى». {الحديث/١٩٧٧ = ١٩٥١. تجريد/١، لاپەڕە: ٤٤٠، رقم: ٤٦٥ = ٨٧٦}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئێمەی گەلی ئیسلام هەرچەند لە هاتن بۆ جیهان كەوتووینە دواوە، بەڵام لە قیامەتدا، لە پایەو پلەو، لە مەڵبەندەكانا، لەپێشی پێشەوەینو لەهەرە پێشەوەین، ئێمەی نەتەوەی ئیسلام یەكەم نەتەوەین كە لەپێش هەموو نەتەوەكانی تردا دەچینە بەهەشت، بەڵام ئەوەندە هەیە كە ئەوان لەپێش ئێمەوە نامەی خودایان بۆ هاتووەو، ئێمە لەپاش ئەوانەوە نامەی خوداییمان بۆ هاتووە كە قورئانی پیرۆزە، لەپاش ئەمەیش ئەمە ئەو رۆژەیانە كە خودا دانابوو لەسەریان، كە لەم رۆژی هەینییەدا، بەجوانی خودا پەرستی بكەن، كەچی ئەوان لێیان گۆڕاوە، سەرو رۆژی تریان بۆ خۆیان لە حەفتەدا هەڵبژاردووە، بەڵام لە سایەی خودای گەورەوە ئێمە ڕێمان پێی بردو دۆزیمانەوەو ڕێزو قەدری ئەم رۆژە پیرۆزەمان دەگرینو كردوومانە بە جەژن، خەڵكەكەی تریش وان لەدوای ئێمەوە: ئەوەتا سبەینێ كە شەممەیەو وا لەدوای هەینییەوە رۆژی جوولەكەیەو، دوو سبەینێش كە یەك

شـەمەیە رۆژی گاورانـە). {تـاج/١، زنجـیرە:١٣٩ ژ-٨٢٠، ٨٢١}. {بـۆ باسـەکانی رۆژی هەینی بڕوانە: تاج لە ژمارە: ٨١٩ وە هەتا ژمارە: ٨٨٣}.

## ٢٩٤) باسی گەورەیی رۆژی هەینی. {باب: فَضْلُ يَوْمِ الجُمُعَة}

٤٠٠- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِىَّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: « خَيْرُ يَوْمٍ طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ يَوْمُ الْجُمُعَةِ فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيـهِ أُدْخِـلَ الْجَنَّـةَ، وَفِيـهِ أُخْـرِجَ مِنْهَا وَلاَ تَقُومُ السَّاعَةُ إِلاَّ فِى يَوْمِ الْجُمُعَةِ ». {الحديث/١٩٧٤ = ١٩٤٨ فم}:

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (رۆژی هەینی گەورەترین رۆژە کە هـەتاوی لێ هەڵدێ، ئـادەم لـە رۆژی هەینیـدا خـودا دروسـتی کـردووە، هـەر لـەم رۆژەشـا براوەتـە بەهەشـت، هـەر لەمیشـا لـە بەهەشـت دەرکـراوە، قیامـەتیش هـەر لـە رۆژی هەینیـدا هـەڵ دەسـتێ). {تـاج/١، ژمـارە: ٨١٩ چاپی/٤}.

## ٢٩٥) کاژێرە تایبەتییەکەی رۆژی هەینی.
## باب: فِي السَّاعَةِ الَّتِي فِي يَوْمِ الجُمُعَة

٤٠١- عَنْ أَبِى هُرَيْـرَةَ (رَضِـي اللهُ عَنْـهُ) قَـالَ: قَـالَ أَبُـو الْقَاسِـمِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ فِى الْجُمُعَةِ لَسَاعَةً لاَ يُوافِقُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ قَـائِمٌ يُصَلِّى يَسْـأَلُ اللَّـهَ خَيْـراً إِلاَّ أَعْطَـاهُ إِيَّـاهُ». وَقَـالَ بِيَـدِهِ يُقَلِّلُهَـا، يُزَهِّـدُهَا». {الحـديث/١٩٦٧ = ١٩٤١ فـم. تجريد/١/٤٦٨، رقم: ٤٩٣ = ٩٣٥، ٥٢٩٤، ٦٤٠٠}:

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر، کە کەسناو (کونیـە)ی ئـەبول قاسمـە (درودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (لـە رۆژی هەینیـدا کاژێرێـکی تایبـەتی واتیادا، هەر بەندەیەکی موسوڵمان، نێربێ یا مێ، لەوکاتەدا راوەستابێ نوێژ بکا، یا خود بە کوڵو بە دڵ لەخودا بپارێتەوە، ئیتر لەو دەمەدا داوای هەرشتێ لـە خێـری دین‌و دونیـا لـە خـودا بکـا، خـودا بـێ دڵـی ناکـاو ئـەو شـتەی پـێ دەدا). فـەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەدەستی ئاماژەی کرد کە ئەو ماوەی نزا گیرابوونە گەڵێ

کەمە، هەتا خەڵك خۆیانی بۆ ئامادە بکەنو لەکیسی نەدەن. {تاج/١، زنجیرە: ١٥٠، ژمارە: ٨٧٦ + ژمارە: ٨٧٩ + ٨١٩ + ٩٦٧}.

٤٠٢- عَنْ أَبِی بُرْدَةَ عن أَبِی مُوسَی الأَشْعَرِیِّ (رَضِیَ اللّٰهُ عنهما) قَالَ: قَالَ لِی عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: أَسَمِعْتَ أَبَاكَ يُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِی شَأْنِ سَاعَةِ الْجُمُعَةِ؟ قَالَ: قُلْتُ: نَعَمْ سَمِعْتُهُ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «هِیَ مَا بَيْنَ أَنْ يَجْلِسَ الإِمَامُ إِلَى أَنْ تُقْضَى الصَّلاَةُ». {الحديث/١٩٧٢ = ١٩٤٦ فم}:

ئەبو بوردەی کوڕی ئەبو مووسای ئەشعەری فەرمووی: عەبدوڵلای کوڕی عومەر، لێی پرسیم: ئایا سەبارەت بە کاژێرە تایبەتییەکەی رۆژی هەینی، کە نزای باشی تیا گیرا دەبێ، شتێکت لە باوکت بیستووە، کە ئەویش لە پێغەمبەری بیستبێ؟ فەرمووی: گوتم: ئەرێ، لە باوکم بیست دەیفەرموو: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (ئەو کاژێرە لەو حەلەوەیە کە پێش نوێژ (وتار خوێن = خەتیب) لەسەر دوانگە (مینبەر) دادەنیشێ هەتا نوێژی هەینی تەواو دەبێ). {تاج/١، زنجیرە: ١٥٠، ژمارە: ٨٧٦}.

**ڕوونکردنەوە:**

رای زۆر هەیە سەبارەت بەم کاتە تایبەتە، بەڵام پوختەی باسەکە ئەمەیە: (کاتێکی تایبەت هەیە لەرۆژی هەینیدا، نادیارە واباشە لە شەوو رۆژی هەینیدا، موسوڵمان منەی ئەو کاژێرە بکاو هەمیشە دەمی بە نزای باشەوەبێ، بەڵکوو رێکەوتی ئەوکاتە بکاو مرازی بێتەجێ).

## ٢٩٦) چی سوورەتێ لە نوێژی بەیانی رۆژی هەینیدا دەخوێنرێ.
## باب: ما يُقْرأُ في صلاةِ الفجْرِ يوْمَ الجُمُعَة

٤٠٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِیَ اللّٰهُ عنهما): أَنَّ النَّبِیَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقْرَأُ فِی صَلاَةِ الْفَجْرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ: (الم تَنْزِيلُ السَّجْدَةُ)، وَ (هَلْ أَتَى عَلَى الإِنْسَانِ حِينٌ مِنَ

الدَّهْرِ)، وَأَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الْجُمُعَةِ سُورَةَ (الْجُمُعَةِ) وَ (الْمُنَافِقِينَ). {الحديث/٢٠٢٨ = ٢٠٠٢ فم}:

ئیبنو عەباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: زۆرینەی کات پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە نوێژی بەیانی ڕۆژی هەینیدا، لە ڕکاتی یەکەما، لەپاش خوێندنی سوورەتی فاتیحە، سوورەتی (الَم تَنْزِيل السَّجْدَة)ی دەخوێند، وە لە ڕکاتی دووەمدا، سوورەتی (هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ)ی دەخوێند، هەروەها پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆر جاران، لەپاش خوێندنی سوورەتی فاتیحە، لە ڕکاتی یەکەمی نوێژی هەینیدا، سوورەتی جوموعەی دەخوێند، وە لە ڕکاتی دووەمدا، سوورەتی موونافیقینی دەخوێند).

## ٢٩٧) خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی سوننەتە. {بابٌ: فِي غُسْلِ الجُمُعَةِ}

٤٠٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَيْنَمَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) يَخْطُبُ النَّاسَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، إِذْ دَخَلَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ، فَعَرَّضَ بِهِ عُمَرُ، فَقَالَ: مَا بَالُ رِجَالٍ يَتَأَخَّرُونَ بَعْدَ النِّدَاءِ؟! فَقَالَ عُثْمَانُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ مَا زِدْتُ حِينَ سَمِعْتُ النِّدَاءَ أَنْ تَوَضَّأْتُ ثُمَّ أَقْبَلْتُ. فَقَالَ عُمَرُ: وَالْوُضُوءَ أَيْضًا؟ أَلَمْ تَسْمَعُوا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: « إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ إِلَى الْجُمُعَةِ فَلْيَغْتَسِلْ ». {الحديث/١٩٥٣ = ١٩٢٦ فم. بخاري/٨٨٢}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ڕۆژی هەینی بوو، عومەری کوڕی خەطاب، لەسەر دوانگە وتاری نوێژی هەینی دەخوێندەوە، ئا لەو دەمەدا عوثمانی کوڕی عەففان خۆی کرد بە ژووورداو هات بۆ نوێژ، عومەر بە ئاماژە ڕەخنەی لە عوثمان گرت، لەسەر ئەو دواکەوتنەو لەم بارەیەوە فەرمووی: (ئەوە بۆچیو لەبەر چی هەندێ پیاو گەل، لە هاتن بۆ نوێژی هەینی درەنگ دێن؟!). عوثمانیش وەڵامی دایەوەو فەرمووی: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! هەر لەگەڵ گوێم لە بانگ بوو، ئەوەندە فریاکەوتم یەکسەر دەستنوێژم گرتو بەبێ درەنگ هاتم بۆ مزگەوت.

عومـەریش فـەرمووی: (هـەی هـەی! هـەر بەوەنـدەیش وازت نـەهێناوە کـە زوو نـەهاتووی، بەڵـکوو ئەوەیشت خسـتۆتە پـاڵی، کـە خۆشـت نەشـۆردووەو تـەنها بـە دەستنوێژ قنیاتت کـردووە؟! ئـەی نـەتان بیسـتووە کـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ دەچن بـۆ نوێـژی هـەینی خۆتـان بشۆرن). {تـاج/١، زنجـیرە: ١٤٣، ژمارە: ٨٣٥}.

## ٢٩٨) بۆنی خۆش‌و سیواك لە رۆژی هەینیدا.

## باب: الطِّيبُ وَالسِّوَاكُ يَوْمَ الْجُمُعَة

٤٠٥- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِي اللهُ عَنْـهُ) أَنَّ رَسُـولَ اللَّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « غُسْلُ يَوْمِ الْجُمُعَةِ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ، وَسِـوَاكٌ، وَيَمَـسُّ مِـنَ الطِّيـبِ مَـا قَـدَرَ عَلَيْـهِ ». {الحـديث/ ١٩٧٥ = ١٩٣٠ فـم. تجريـد/ ١، لاپـەڕە: ٤٣٧، رقـم: ٤٦٢ = ٨٥٨، ٨٧٩، ٨٨٠، ٨٩٥، ٢٦٦٥}:

ئەبو سەعیدی خـودری (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: خۆشەویسـت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: (خۆشـۆردنی رۆژی هـەینی پێویسـتە لەسـەر هـەموو موسوڵمانێـکی رەسیدە، هەروا سیواك، هەروا بۆنی خۆش لەخۆدان بەپێی توانا).

**روونکردنەوە:**

مەبەست لە وشەی پێویست (واجب) لـەم فـەرموودە پـیرۆزەدا، واجبـی بـە واتـا فەرزی بەرابەری سوننەت نییە، بەڵکوو مەبەست لێی جەخت کردنە لەسـەر ئـەوە کە ئەم شتانە لە رۆژی هەینیدا زۆر زۆر سوننەتێکی دامەزراوی گەورەن.

## ٢٩٩) خێرو بەهرەی زوو چوون بۆ نوێژی هەینی.

## باب: فَضْلُ التَّهْجِيرِ يَوْمَ الْجُمُعَة

٤٠٦- عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِذَا كَانَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ، كَانَ عَلَى كُـلِّ بَـابٍ مِـنْ أَبْـوَابِ الْمَسْـجِدِ مَلاَئِكَـةٌ يَـكْتُبُونَ الأَوَّلَ فَالأَوَّلَ، فَإِذَا جَلَسَ الإِمَامُ طَوَوُا الصُّحُفَ، وَجَاءُوا يَسْـتَمِعُونَ الـذِّكْرَ، وَمَثَـلُ الْمُهَجِّرِ كَمَثَـلِ

الَّذِي يُهْدِي الْبَدَنَةَ، ثُمَّ كَالَّذِي يُهْدِي بَقَرَةً، ثُمَّ كَالَّذِي يُهْدِي الْكَبْشَ، ثُمَّ كَالَّذِي يُهْدِي الدَّجَاجَةَ، ثُمَّ كَالَّذِي يُهْدِي الْبَيْضَةَ ». {الحديث/١٩٨١ = ١٩٥٥. تجريد/١، لاپەڕە: ٤٤١، رقم: ٤٦٧ = ٨٨١، ٩٢٩، ٣٢١١}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کە رۆژی هەینی هات لەبەر دەرگاکانی هەموو مزگەوتێ فریشتە ئامادە دەبن‌و قەڵەم‌و دەفتەر بە دەستەوە دەگرن، یەك لەدوای یەك بەڕیز ناوی ئەوانە دەنووسن کە دێن بۆ نوێژی هەینی، تا ئەوکاتەی کە پێش نوێژ دێ‌و دەچێتە سەر دوانگە، ئیتر ئەوانیش دەفتەرەکانیان دەپێچنەوەو دەچن گوێ لە وتار (خوتبە)کە دەگرن! ئەوەیشی کە زوو بچێ بۆ نوێژی هەینی وەك ئەوە وایە کە وشترێ ببەخشێتەوە، ئەنجا وەك ئەوە وایە کە رەشە وڵاخێ ببەخشێتەوە، ئینجا وەك ئەوە وایە کە بەرانێ ببەخشێتەوە، ئینجا وەك ئەوە وایە کە مامرێ ببەخشێتەوە، ئینجا وەك ئەوە وایە کە هێلکەیێ ببەخشێتەوە). {تاج/١، زنجیرە: ١٤٣، ژمارە: ٨٣٤ چاپی چوارەم}.

**٣٠٠) کاتی نوێژی هەینی رێك وەك کاتی نوێژی نیوەڕۆ، ئەوکاتە دەبێ کە خۆر بەدیمەن لە ناوەڕاستی ئاسمان لادەداو بەلای خۆرئاوا بوونا کەمێ دەنوێنێ.**

**بابٌ: صلاة الجمعة حِينَ تزُولُ الشَّمْسُ**

٤٠٧- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا نُجَمِّعُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ نَرْجِعُ نَتَتَبَّعُ الْفَيْءَ». {الحديث/١٩٨٩ = ١٩٦٣ فم. بخاري/٤١٦٨}:

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (خوای لێ رازی بێ) فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا (درودی خودای لەسەر بێ) دەستوورمان وابوو، ئەوکاتە نوێژی جومعەمان دەکرد، کە خۆر بەدیمەن لە ناوەڕاستی ئاسمان لادەدا، کە لەپاش تەواو بوونی نوێژی هەینی دەگەڕاینەوە بۆماڵەوە، بەحاڵ سێبەر هەبوو، بە زۆر خۆمان تێ دەترنجان).

## ٣٠١) دانانو دروستكردنی دوانگه (مینبەر) بۆ پێغەمبەری خوداو راوەستان لەسەری لە نوێژدا. (١٢١٦ - ١٢١٧).

## باب: في اتّخاذ منبر رسولِ الله (صلّى اللهُ عليْه وسلّم) والقيامُ عليْه في الصّلاة

٤٠٨- عَنْ أَبِى حَازِمٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ): أَنَّ نَفَرًا جَاءُوا إِلَى سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَدْ تَمَارَوْا فِى الْمِنْبَرِ مِنْ أَىِّ عُودٍ هُوَ؟ فَقَالَ: أَمَا وَاللَّهِ، إِنِّى لأَعْرِفُ مِنْ أَىِّ عُودٍ هُوَ؟ وَمَنْ عَمِلَهُ؟ وَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَوَّلَ يَوْمٍ جَلَسَ عَلَيْهِ، قَالَ: فَقُلْتُ: يَا أَبَا عَبَّاسٍ فَحَدِّثْنَا، قَالَ: أَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى امْرَأَةٍ (قَالَ أَبُو حَازِمٍ: إِنَّهُ لَيُسَمِّيهَا يَوْمَئِذٍ): « انْظُرِى غُلاَمَكِ النَّجَّارَ يَعْمَلْ لِى أَعْوَادًا أُكَلِّمُ النَّاسَ عَلَيْهَا، فَعَمِلَ هَذِهِ الثَّلاَثَ دَرَجَاتٍ، ثُمَّ أَمَرَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَوُضِعَتْ هَذَا الْمَوْضِعَ، فَهْىَ مِنْ طَرْفَاءِ الْغَابَةِ، وَلَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَامَ عَلَيْهِ فَكَبَّرَ، وَكَبَّرَ النَّاسُ وَرَاءَهُ، وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ، ثُمَّ رَفَعَ، فَنَزَلَ الْقَهْقَرَى حَتَّى سَجَدَ فِى أَصْلِ الْمِنْبَرِ، ثُمَّ عَادَ حَتَّى فَرَغَ مِنْ آخِرِ صَلاَتِهِ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: « يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّى إِنَّمَا صَنَعْتُ هَذَا لِتَأْتَمُّوا بِى وَلِتَعَلَّمُوا صَلاَتِى ». {الحديث/١٢١٦ = ١١٩٢ فم. تجريد/١، لاپەڕە: ٢٥٥، رقم: ٢٤١ = ٣٧٧، ٤٤٨، ٩١٧، ٢٠٩٤، ٢٥٦٩}:

ئەبو حازم (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کۆمەڵێ هاتن بۆ لای سەهلی کوڕی سەعد (رەزای خودای لێ بێ) مشتو مڕیان بوو لەسەر ئەوە کە دوانگەکەی مزگەوتەکەی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لەچی دارێ دروست کرابوو؟ سەعد فەرمووی: دەی بە خودای گەورە من زۆر باش دەزانم کە لەچی دارێ بووە؟ وەکێ دروستی کرد بۆی؟ وە بە چاوی خۆم پێغەمبەری خودام بینی، کە یەکەم رۆژ لەسەری دانیشت، ئەبو حازم فەرمووی لە سەهلم پرسی: ئەی باوکی عەباس! بفەرموو ئەم فەرموودەیەمان بۆ باس بفەرموو، سەهل فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) ناردی بۆلای ئافرەتەکە، (ئەبو حازم دەڵێ: ئەوکاتە سەهل ناوی ئەم ژنەی هێنا) کە لەوە پێش بەڵێنی دابوو بە پێغەمبەر، کە دوانگەی بۆ دروست بکا، ناردی بۆلای فەرمووی پێی: (سەرنج بدە با نۆکەرە دار تاشەکەت دوانگەکەم بۆ دروست بکا، هەتا وتاری لەسەر بدەم بۆ مەردوم).

رەنجبەرەکەیش دوانگە سێ پلەییەکەی دروست کرد بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە دوانگەکە تەواو بوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی فەرموو لەم جێگەیەی ئێستادا دانرا،، دارەکەی لە تەرگەز (ئەثل = طرفاء)ی جەنگەڵەکەی نزیکی شاری مەدینە بوو، بە چاوی خۆم پێغەمبەرم بینی کە یەکەمجار سەرکەوتە سەری‌و لەسەری راوەستاو، وتاری هەینی خوێندەوە، ئەوجا قامەت کرا، ئەوجا هەر لەسەر دوانگەکە نوێژی دابەست بەم شێوەیە: لەپێشا رووی کردە رووگەو،، ئەڵلاهو ئەکبەری نوێژ دابەستنی کرد، نوێژ خوێنەکانیش لەپشتیەوە بەڕیز راوەستان‌و نوێژیان بە گوتنی ئەڵلاهو ئەکبەر بە کۆمەڵی دابەست، ئەوجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەر لەسەر دوانگەکە دەستی کرد بە قورئان خوێندنی رکاتی یەکەم، کە تەواوی کرد هەر لەسەر دوانگەکە روکوعی برد، خەڵکەکەیش لە خوارەوە کە لەپشت ئەوەوە ریز بوو بوون لەگەڵ ئەودا روکوعیان برد، ئەوجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سەری لە چەمینەوە بەرزکردەوە، نوێژ خوێنەکانیش سەریان لە چەمینەوە بەرزکردەوە، ئینجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پشتاو پشت لە دوانگەکە دابەزی، رووی لە رووگە وەرنەچەرخان، هەتا گەیشتە خوارەوەو، لەسەر زەوییەکە، لە ئاستی بنی دوانگەکە دوو کوڕنووشی برد، دیسان پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) گەڕایەوە بۆ سەر پشتی دوانگەکەو، دەستی کرد بە قورئان خوێندنی رکاتی دووەم، دیسان کە تەواوی کرد لەسەر دوانگەکە چەمینەوەی دووەمی ئەنجامدا، خەڵکەکەیش لەگەڵیدا چەمینەوەی دووەمیان ئەنجامدا، ئەوجا پێغەمبەر سەری لە چەمینەوەی رکاتی دووەم بەرزکردەوە، نوێژ خوێنەکانیش هەروا، دیسانەوە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پشتاو پشت لە دوانگەکە دابەزییەوە، لەسەر زەوییەکە لە ئاستی بنی دوانگەکە دوو کوڕنووشی تری بردەوە، خەڵکەکەیش هەروا، ئەوجا سەرکەوتەوە سەر دوانگەکە هەتا نوێژەکەی تەواوکرد، لەپاشا رووی کردە خەڵکەکەو فەرمووی: (ئەی موسوڵمانەکان! ئەمەم لەبەرچاوی ئێوە لەسەر ئەم

شێوەیە کرد، هەتا لە نوێژ کردندا خۆم بکەن بەسەر مەشقو چاو لەمن بکەنو، چۆنێتی نوێژ لە خۆم فێرببن!).

**ڕوونکردنەوە:**

١. بە بەهرە وەرگرتن لە کۆی ڕیوایەتەکانی ئەم فەرموودەیە لە صەحیحی موسلیمو صەحیحی بوخاریو ئەبو داوددا، بەپێی شەرحەکانی نەوەوی وفتح الملهم وفتح الباري وعَوْنُ المعبود، ئەم فەرموودەیەم لەسەر ئەم شێوەیە وەرگێڕا.

چونکە من لە پلەی یەکەما، مەبەستم تێگەیشتنو سوود وەرگرتنو زانینی بڕیارە شەرعییەکانە، لەبەرئەوە ئومێدە کە وەرگەڕاوەکە جێگەی متمانەی هەموومان بێ.

**٣٠٢) چی لەوتاردا دەگوترێ.** (١٩٤٨ - ٢٠٤٠).

**باب: مَا يُقَالُ فِي الخُطْبَة**

٤٠٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّهُ عنهما): أَنَّ ضِمَادًا قَدِمَ مَكَّةَ، وَكَانَ مِنْ أَزْدِ شَنُوءَةَ، وَكَانَ يَرْقِي مِنْ هَذِهِ الرِّيحِ، فَسَمِعَ سُفَهَاءَ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ يَقُولُونَ: إِنَّ مُحَمَّدًا مَجْنُونٌ، فَقَالَ: لَوْ أَنِّي رَأَيْتُ هَذَا الرَّجُلَ، لَعَلَّ اللَّهَ يَشْفِيهِ عَلَى يَدَيَّ! قَالَ: فَلَقِيَهُ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ إِنِّي أَرْقِي مِنْ هَذِهِ الرِّيحِ، وَإِنَّ اللَّهَ يَشْفِي عَلَى يَدِي مَنْ شَاءَ، فَهَلْ لَكَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « إِنَّ الْحَمْدَ لِلَّهِ، نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، أَمَّا بَعْدُ ». قَالَ: فَقَالَ: أَعِدْ عَلَيَّ كَلِمَاتِكَ هَؤُلاَءِ، فَأَعَادَهُنَّ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، قَالَ: فَقَالَ: لَقَدْ سَمِعْتُ قَوْلَ الْكَهَنَةِ، وَقَوْلَ السَّحَرَةِ، وَقَوْلَ الشُّعَرَاءِ، فَمَا سَمِعْتُ مِثْلَ كَلِمَاتِكَ هَؤُلاَءِ، وَلَقَدْ بَلَغْنَ نَاعُوسَ الْبَحْرِ. قَالَ: فَقَالَ: هَاتِ يَدَكَ أُبَايِعْكَ عَلَى الإِسْلاَمِ، قَالَ: فَبَايَعَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «وَعَلَى قَوْمِكَ؟». قَالَ: وَعَلَى قَوْمِي، قَالَ: فَبَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سَرِيَّةً، فَمَرُّوا بِقَوْمِهِ، فَقَالَ صَاحِبُ السَّرِيَّةِ لِلْجَيْشِ: هَلْ أَصَبْتُمْ مِنْ هَؤُلاَءِ شَيْئًا؟ فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: أَصَبْتُ مِنْهُمْ مِطْهَرَةً، فَقَالَ: رُدُّوهَا فَإِنَّ هَؤُلاَءِ قَوْمُ ضِمَادٍ». {الحديث/ ٢٠٠٥ = ١٩٧٩ فم}:

ئیبنو عەباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ضیمادی كوڕی ئەعلەبەی ئەزدی، كە لە ئەزدی شەنووئە بوو، هات بۆ مەككە، كە نووشتەی جنۆكەو شێتیو شتی وای دەكرد، لە هەندێ نەفامانی مەككە دەبیستێ كە دەڵێن: گوایە موحەممەد شێتەو جنۆكە دەستی لێ وەشاندووە. جا زیماد دەڵێ: خۆزگە ئەم موحەممەدەم دەبینی، سا بەشكوو خودا لەسەر دەستی منا چارەسەری بكاو چاكی بكاتەوە! فەرمووی: زیماد دەگات بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی دەڵێ: ئەی موحەممەد! من نووشتەی جنۆكەو شێتی دەكەم، وە خودا لەسەر دەستی منا، ئەگەر حەزی لەسەری بێ، چارەسەری كەسانێ دەكا، ئایا حەزت لە شتی وا هەیە: كە نووشتەت بۆ بكەم هەتا چاك ببیتەوە، لەم دەردەی كە خەڵكی دەڵێن؟

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لە وەڵامیدا دەفەرموێ: (إِنَّ الْحَمْدَ لِلَّهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِىَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ أَمَّا بَعْدُ) . واتە:

(بێگومان سوپاس هەر بۆ خودایە، سوپاسی دەكەینو داوای یارمەتی لێ دەكەین، هەر كەسێ خودا ڕێنمایی بكاو ڕێگەی هەقی نیشان بدا، كەسێ ناتوانێ كە سەری لێ بشێوێنێ، وە هەركەسێ خودا سەری لێ بشێوێنێ، بەكەس ڕێنمایی ناكرێ، وە شایەتی دەدەم كە بێجگە لە یەزدانی پاك خودای تر نییە، تاكو تەنهایە، هاوەڵی نییە، هەروا گەواهی دەدەم كە موحەممەد بەندەو پێغەمبەری ڕەوانەكراوی خودایە، پاش ئەمەش).

ئیبنو عەباس فەرمووی: زیماد دەفەرموێ: (ئەم گوتانەی خۆتم بۆ دووبارە بكەرەوە). پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) سێ جار بۆی دووبارە دەكاتەوە. فەرمووی: جا زیماد دەفەرموێ: من گەلێ گوێم لە قسەی كوڵە نانیو جادوو بازو شاعیرو هەستیاران بووە، قەت شتی وەك ئەم فەرمایشتانەی تۆم، وا بە سۆزو كاریگەر نەبیستووە، تەنانەت ئەم فەرمایشتانەی تۆ گەیشتونەتە خەڵكی ناو نێرینەی دەریا.

ئیبنو عەباس فەرمووی: جا زیماد بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: كەواتە دەستت بێنە، هەتا پەیمانت بدەمێ لەسەر قەبووڵی ئایینی پیرۆزی ئیسلام.

فەرمووی: جا ضیماد پەیمان دەدا بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی دەفەرموێ: (لەجیاتی هۆزەکەشت پەیمانم بدەرێ لەسەر ئیسلامەتیو قەبوولی بەرنامەی ئیسلام؟) ئەویش فەرمووی: پەیمانم بەست لەگەڵ تۆ لەجیاتی هۆزەکەشم، لەسەر قەبوولی بەرنامەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام).

جا لەوەدوا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سوپایەکی نارد بۆ غەزا، رێگەیان کەوتە ناو هۆزەکەی ضیماد، جا سەر لەشکرەکەیان بە لەشکرەکەی گوت: ئایا شتێکتان لەم هۆزە دەست کەوتووە؟ پیاوێ لە لەشکرەکە گوتی: من ئەم مەتارەیەم بەدەست کەوتووە، سەر لەشکرەکە گوتی: بیدەرەوە پێیان، چونکە ئەمانە هۆزی ئەو ضیمادەن کە پەیمانی بە پێغەمبەر داوە لەسەر پابەند بوون بە بەرنامەی ئیسلامەوە). {بڕوانە: تاج/١، زنجیرە: ١٤٧، ژمارە: ٨٤٨}.

## ٢٠٣) دەنگ بەرزکردنەوە لەکاتی وتارداندا، وە وتارخوێن چی تیا بڵێ.
## بابٌ: رَفْعُ الصَّوْتِ بِالْخُطْبَةِ وَمَا يَقُولُ فِيهَا.

٤١٠- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا خَطَبَ احْمَرَّتْ عَيْنَاهُ وَعَلاَ صَوْتُهُ، وَاشْتَدَّ غَضَبُهُ، حَتَّى كَأَنَّهُ مُنْذِرُ جَيْشٍ، يَقُولُ: « صَبَّحَكُمْ وَمَسَّاكُمْ »، وَيَقُولُ: « بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةَ كَهَاتَيْنِ، وَيَقْرُنُ بَيْنَ إِصْبَعَيْهِ: السَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى، وَيَقُولُ: « أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ خَيْرَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللَّهِ، وَخَيْرُ الْهُدَى هُدَى مُحَمَّدٍ وَشَرُّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ ». ثُمَّ يَقُولُ: « أَنَا أَوْلَى بِكُلِّ مُؤْمِنٍ مِنْ نَفْسِهِ، مَنْ تَرَكَ مَالاً فَلأَهْلِهِ، وَمَنْ تَرَكَ دَيْنًا أَوْ ضَيَاعًا، فَإِلَيَّ وَعَلَيَّ ». {الحديث/٢٠٠٢ = ١٩٧٦ فم}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ وتاری دەدا، چاوی سوور هەڵدەگەڕا، دەنگی بەرز دەکردەوە، تەواو تووڕە دەبوو، بە شێوەیەکی وا دەتگوت ترسێنەر (موندیر)ی سوپایەو سوپا دەترسێنێ لە دوژمنو دەڵێ: وا سوپای دوژمن، سەر لە بەیانی، یا سەر لە ئێواری، بەم زووانە دەدا بەسەرتانا)، جاروبار لە هەندێ وتارا پەنجەی شایەتمانو پەنجەی ناوەڕاستی خۆیی

جووت دەکردو دەیفەرموو: (منو قیامەت ئاوا بەیەکەوە هاتووین، جیاوازیی نێوانی درێژیو کورتی ئەم دوو پەنجەیە چەندە لە یەکتری، جیاوازیی بەرو دوایی نێوانی هاتنی منو نێوانی هاتنی قیامەتیش ئەوەندەیە). ئەوجا دەیفەرموو: (لەپاش ئەمە بزانن کە باشترین فەرمایشت نامەی خودایە کە قورئانی پیرۆزە، وە باشترین رێبازو رێگەی چاکە رێبازگەی موحەممەدە، وە خراپترین کارو بارو فەرمانیش لە ئایینـدا، ئەو کارو بارانەن کە نوێباوو تازە قەڵاَو داتاشراون، وە هەموو کارێکی ناشایستەیش سەرگەردانیو گومراییە). لەپاشا دەیفەرموو: (من بۆ هەموو موسوڵمانێ لە خودی خۆی لە پێشترم بۆی! چونکە دەیخەمە سەر رێی رزگاریی ئێجگاریی، بەڵام ئەوەی بمرێو ماڵی لەپاش بەجێ بمێنێ، ئەوە ماڵەکەی بۆ کەسوکارەکەیەتی، وەڵێ ئەوەی بمرێو قەرزار بێ، یاخود خێزانێکی بێ داڵدەی لەپاش بەجێ بمێنێ ئەوە قەرزەکەی روو بەرووی من دەبێتەوە، خۆم دەیبژێرمەوە بۆیو، سەرەوکاریی کەسوکارەکەیشی لەسەر منە). {تاج/١، زنجیرە: ١٤٧، ژمارە: ٨٤٧ + ژمارە: ٦٤}.

**روونکردنەوە:**

١. دەوڵەتی ئیسلامو بەیتولمال، بەپێی ئەم فەرموودە پیرۆزە بەرپرسیارن لە خێزانی بێ داڵدەو بێ سەرپەرشت.

٢. واتایەکی جوانی وشەو زاراوەی (بِدْعَة) دەکەین. نەوەوی دەفەرموێ: (وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ) ئەمە عامی موخەصەصە، مەبەست لێی زۆرینەی بیدعەتەکانە. زاناکان دەفەرموون: بیدعەت (واتە: کاری تازە قەڵاَ لە ئاییندا، کە پێشینەیەکی وای نەبێ، کە بۆی ببێ بەسەر مەشقو سەرچاوە) بیدعەت بەم واتایە ئەم پێنج بەشەی هەیە:

یەکەم: کردنی ئەو بیدعەتە واجبو پێویستە.

دووەم: کردنی سوننەتە.

سێیەم: کردنی حەرامە.

چوارەم: کردنی ناباشو مەکرووهە.

پێنجەم: کردنی موباحە، واتە: ڕەوایە، کردنیو نەکردنی وەك یەکەو یەکسانە. لەبەشی یەکەمە: دانانی کتێبو پەڕاوەکانی عەقائید، کە زاناکان بەڵگەو دەلیلو ڕەددی باشیان دیاری کردووە، بۆ پەرچدانەوەی زەندیقو بێباوەڕانو شێوەی ئەمانە.

لەبەشی دووەمە: کە بەشی سوننەتە، دانانی کتێبو پەڕاوی زانستو فەرموودەو تەفسیرو، دروستکردنی قوتابخانەو فێرگاو سەربازگەو ئۆردوگاو شتی تری وا. لەبەشی ڕەوا (موباحە) ڕازانەوەی خوانو لەبەرکردنی جلو بەرگی کەشخەو شتی تری وا. بەشی حەرامو مەکرووهیش دیاریو ئاشکران. فەرمایشتی نەوەوی تەواو.

لە فەتحول مولهیمدا دەفەرموێ:

بەپێی ئەم فەرموودە صەحیحەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: (مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ فِيهِ فَهُوَ رَدٌّ: هەرکەسێ شتێکی ناشایستە لەم ئایینەی ئێمە زیاد بکا، کە پەیوەندی پێوە نەبێ، ئەو شتە قەبووڵ نیەو دەدرێتەوە دواوە — تاج/١، زنجیرە: ٩، ژمارە: ٦٣).

ئەم جۆرە شتانە نە موحەدەثنو نە بیدعەتن:

أ- هەر کارێ سەرچاوەی لە قورئانا هەبێو بە پێی بنەمایێ لە بنەماکانی قورئان بێ، شتی وا بیدعەت نییە، بەڵکوو لە خودی دینە.

ب- هەر کارێ سەرچاوەکەی سوننەتی پێغەمبەر بێ هەروا.

ج- هەر کارێ بەپێی سوننەتی خولەفای ڕاشیدین بێ دیسان هەروا، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ تَمَسَّكُوا بِهَا وَعَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الأُمُورِ).

د- هەر کارێ ئیجماعی عاممەی سەلەفی صالحی لەسەر بێ، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لاَ تجتمِع أُمَّتِي عَلَى الضَّلاَلَةِ).

هـ- هەر کارێ بە پێی إجتهادێکی موعتەبەر بێو بە پێی مەرجی ئیجتیهادی شەرعی بێ. ئەمانە هیچیان لە بیدعەی شەرعی نین. فەرمایشتی (فتح الملهم) تەواو.

## ٣٠٤) وتاری کورتو پوخت. {باب: الإيجازُ في الخُطْبَةِ}

٤١١- عَنْ أَبِي وَائِلٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: خَطَبَنَا عَمَّارٌ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) فَأَوْجَزَ وَأَبْلَغَ، فَلَمَّا نَزَلَ قُلْنَا: يَا أَبَا الْيَقْظَانِ، لَقَدْ أَبْلَغْتَ وَأَوْجَزْتَ، فَلَوْ كُنْتَ تَنَفَّسْتَ، فَقَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: « إِنَّ طُولَ صَلاَةِ الرَّجُلِ وَقِصَرَ خُطْبَتِهِ مَئِنَّةٌ مِنْ فِقْهِهِ، فَأَطِيلُوا الصَّلاَةَ وَاقْصُرُوا الْخُطْبَةَ، وَإِنَّ مِنَ الْبَيَانِ سِحْرًا ». {الحديث/٢٠٠٦ = ١٩٨٠ فم}:

ئەبو وائیل (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ عەممار (خودای لێ رازی بێ) وتارێکی کورتو پوختو رەوانو دڵگیری خوێندەوە بۆمان، جا کە لە دوانگەکە دابەزی، گوتمان: ئەی ئەبو یەقظان! بەڕاستی وتارەکەت دڵگیرو رێكو پێكو قەد بڕبوو، هەروا پڕ واتا بوو، خۆزگایە کەمێ درێژمت پێ دەدا!، فەرمووی: بۆیە وەهام کرد چونکە بۆ خۆم ژنەوتوومە لە خۆشەویست، دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (نوێژی درێژو وتاری کورتی پیاو، نیشانەی ئەوەیە کە پیاوێکی زاناو شارەزایە لە شەرعا، کەواتە: درێژە بە نوێژ بدەنو وتار کورت بکەنەوە، بشزانن کە هەندێ پەخشانو قسەی نەستەقو رەوان، وەك جادوو وان، کار لە دڵو مێشكو هەستی ئادەمیزاد دەکەنو، کاری جوانی لەلا جوانتر دەکەن!). {تاج/١، زنجیرە: ١٤٧، ژمارە: ٨٤٦}.

**روونکردنەوە:**

عەمماری کوڕی یاسیر (رەزای خودا لە خۆیو لە باوکیو لە دایکی بێ) ناوی دایکی سومەییەیە، خۆیو باوکیو دایکی هەرسێ، هاوڕێی پێغەمبەر بوون، ئەم بنەماڵەیە ئەشکەنجەی زۆریان چەشتووە لە پێناوی ئیسلاما، هەرسێکیان لە موسوڵمانە پێشینەکانن، عەممار کۆچی کرد بۆ حەبەشە، یەکێکە لەو موسوڵمانانە کە بەرەو دوو رووگە (قیبلە) نوێژی کردووە، لە مەککەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە، ئامادەی هەموو نەبەردو غەزەواتەکانی کردووە، لە غەزای بەدردا دلێرییەکی بەرچاوی نواند، هەروا لە نەبەردی یەمامەدا، لەم نەبەردەدا گوێی پەڕی. لە بوخاریدا چوار فەرموودەی هەیە، کۆمەڵێ فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە،

دایکی عەممار ئەبو جەهلی نەفرەتی، نێزەیەکی مالی بە شەرمیداو لەسەر ئیسلام شەهیدی کرد. واقیدی دەفەرموێ: لەسەر فەرمایشتی ئیستیعابی ئیبنی عەبدولبەڕ: (عەممار پیاوێکی بالا بەرزی چاو نەخشینی ناوشان پان بووە). پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە پەسنی عەمماردا دەفەرموێ: (بەهەشت تامەزرۆی دیداری عەلیو عەممارو سەلمانو بیلالە). تەمەنی حەزرەتی عەممار لە نەوەد پتر بوو، لە شەڕگەی صەفیندا شەهید بوو، کە ئەم جەنگە گەورەیە لە نێوانی پێشەوا عەلیو موعاوییەدا، لە سالی سیو حەوتی کۆچیدا قەوما، هەزار هەزار رەحمەت لە گیانی پاکی.

## ٣٠٥) ئەوەی کە لابردنی لە وتاردا دروست نییە.
## باب: مالاً يَجُوزُ حَذْفُهُ مِنَ الخُطْبَةِ

٤١٢- عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَجُلاً خَطَبَ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: مَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ رَشِدَ، وَمَنْ يَعْصِهِمَا فَقَدْ غَوَى. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « بِئْسَ الْخَطِيبُ أَنْتَ، قُلْ: وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ، قَالَ ابْنُ نُمَيْرٍ: فَقَدْ غَوِيَ». {الحديث/٢٠٠٧ = ١٩٨١ فم}:

عەدی کوڕی حاتم (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە خزمەت پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) پیاوێ وتارێکی دا، گوتی: هەرکەسێ فەرمانبەری خوداو پێغەمبەری خودا بکا، بەڕاستی شەقامە ڕێگەی هەقی گرتووە، وە هەرکەسێ لەوان یاخی بێ، بەڕاستی سەر لێشێواوو گومڕا بووە. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (تۆ وتار بێژێکی خراپی، وا مەلێ، مەلێ: هەرکەسێ لەوان یاخی بێ، بەلکوو لە جیاتی ئەوە بلێ: هەرکەسێ لە خوداو لە پێغەمبەری خودا یاخی بێ، بەڕاستی سەر لێشێواوو گومڕا بووە).

پێشەوا موسلیم (رەحمەتی خودای لێ بێ) ئەم فەرموودەیە لە دوو مامۆستای خۆیەوە دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو ئەبی شەیبەو لە ئیبنو نەمیرەوە، وشەی (غۆی) بە دوو شێوە دەخوێنرێتەوە، بە (غەوی)و بە (غەوییە) واتە: یەکەم بە فەتحەی واو،

دووەم بـە کەسـرەی واو، ئیبنـو نـەمیر بـە (غَـوِیَ)ەی خوێندۆتـەوە، بـەژێری واوو سەری یێ.

**ڕوونکردنەوە:**

عەدی کوڕی حاتەمی تائییە، کە ناسراوە بە جوامێریو بەخشندەیی، لە سالّی نـۆی کۆچیدا ئیسـلام بـووە، لەپێشا مەسـیحی بـوو، لەسـەر ئـایینی عیسـای کـوڕی مەریەم بوو، ئامادەی ئـازادکردنی ولآتـی عێـراق بـوو، لەپاشـا لـە کووفـە نیشـتەجێ بوو، لـە جـەنگی صـەفیندا لەگـەڵ ئیمـامی عـەلی بـوو، خـۆی دەیفـەرموو: (ئـەوەتی موسوڵمان بووم، هەموو کاتێ کە بانگی داوە دەستنوێژم بووە).

لەدوا سالّی شەستی کۆچی مردووە، دەڵێن: تەمەنی دەیدا لە سەدو بیست سـاڵ، هەندێ تر دەڵێن: سەدو هەشتا ساڵ ژیاوە. پیاوێـکی زۆر سـەخی بـوو، هەمیشـە بـە شەوقەوە چاوەڕوانی هاتنی نوێژەکانی دەکرد، لە بوخـاریو موسـلیمدا فـەرموودەی هەیە. {بڕوانە: تەجرید/٥، لاپەڕە: ١١٧، ژمارە: ١٨٢٦ = ٥٤٧٥}.

### ٣٠٦) خوێنـدنـی قورئان لەسەر دوانگە لە وتاردا.

### بَابٌ: قِرَاءَةُ الْقُرآنِ عَلَى الْمِنْبَرِ فِي الْخُطْبَةِ

٤١٣- عَنْ أُمِّ هِشَامٍ بِنْتِ حَارِثَةَ بِنِ النُّعْمَانِ قَالَتْ: لَقَدْ كَانَ تَنُّورُنَا وَتَنُّورُ رَسُـولِ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) وَاحِـدًا سَـنَتَيْنِ أَوْ سَـنَةً وَبَعْـضَ سَـنَةٍ، وَمَـا أَخَـذْتُ (ق وَالْقُـرْآنِ الْمَجِيدِ) إِلاَّ عَنْ لِسَانِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ) يَقْرَؤُهَـا كُـلَّ يَـوْمِ جُمُعَـةٍ عَلَـى الْمِنْبَرِ إِذَا خَطَبَ النَّاسَ». {الحديث/ ٢٠١٢ = ١٩٨٦ فم}:

ئوم هیشامی کچی حاریثەی کوڕی نوعمان (ڕەزای خودای لێ بێ) بۆ چەسپاندنی زرنگیو نزیکی خۆی لە مـالّی پێغەمبـەرەوە فـەرمووی: بـۆ مـاوەی نزیکـەی دوو سـاڵ، سـەر تەندووری مالّی ئێمەو سەر تەندووری مالّی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) یـەك بـوو، سوورەتی {ق وَالْقُرآنِ الْمَجِيدِ}م لە دەمی پێغەمبەر خۆیەوە (درودی خودای لەسەر بێ) لەبـەر کردووە، چونکە هەموو هەینییەك لەسەر دوانگە، لە وتاری هەینیـدا دەیخوێنـدەوە، لەو کاتەدا کە وتاری دەدا بۆ خەڵکەکە.

ئوم هیشام ئەنصارییە، لە کۆمەڵەی بەیعەتو ریضوانە، هاوسەری عمارەی کوڕی حجاب بوو، بۆ ماوەی ساڵێ زیاتر دراوسێی پێغەمبەر بووە، وەك لە فەرموودەکەوە دەردەکەوێ.

## ٣٠٧) ئاماژە بە پەنجە لە وتاردا.
## باب: الإشارة بالأصبع في الخُطْبَة

٤١٤- عَنْ حُصَيْنٍ عَنْ عُمَارَةَ بْنِ رُؤَيْبَةَ قَالَ: رَأَى بِشْرَ بْنَ مَرْوَانَ عَلَى الْمِنْبَرِ رَافِعًا يَدَيْهِ، فَقَالَ: قَبَّحَ اللَّهُ هَاتَيْنِ الْيَدَيْنِ، لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَا يَزِيدُ عَلَى أَنْ يَقُولَ بِيَدِهِ هَكَذَا، وَأَشَارَ بِإِصْبَعِهِ الْمُسَبِّحَةِ». {الحديث/٢٠١٣ = ١٩٨٧ فم}:

حوسەینی کوڕی عەبدوڕەحمان فەرمووی: ڕۆژی هەینی لەسەر دوانگە، بشیری کوڕی مەڕوانم بینی، وتاری دەدا، هەردوو دەستی هەڵبڕیبوو، عومارەی کوڕی روئەیب پێی فەرموو: هەی ئەو دوو دەستە داوەشێن! بۆ خۆم پێغەمبەرم بینی، لەم هەلو مەرجەدا، تەنیا بە پەنجەی شایەتمانی ئاماژەی دەکردو لەکاتی قسەکردندا، خەڵکەکەی پێ وریا دەکردەوە).

عومارەی کوڕی روئەیبە، لە هاوەڵانە، دوو فەرموودەی هەیە، ثەقەفییە، کووفەییە، لە بوخاریدا فەرموودەی نییە.

## ٣٠٨) فێرکردنی زانست لەناو وتاردا.
## بابٌ: التعليم للعلم في الخُطْبَة

٤١٥- عَنْ أَبِي رِفَاعَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: انْتَهَيْتُ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ يَخْطُبُ، قَالَ: فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ: رَجُلٌ غَرِيبٌ جَاءَ يَسْأَلُ عَنْ دِينِهِ، لاَ يَدْرِي مَا دِينُهُ، قَالَ: فَأَقْبَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَتَرَكَ خُطْبَتَهُ، حَتَّى انْتَهَى إِلَيَّ، فَأُتِيَ بِكُرْسِيٍّ حَسِبْتُ قَوَائِمَهُ حَدِيدًا، قَالَ: فَقَعَدَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَجَعَلَ يُعَلِّمُنِي مِمَّا عَلَّمَهُ اللَّهُ، ثُمَّ أَتَى خُطْبَتَهُ فَأَتَمَّ آخِرَهَا». {الحديث/٢٠٢٢ = ١٩٩٦ فم}:

ئەبو ریفاعە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ گەیشتمە خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سەر گەرمی وتار خوێندنەوە بوو، عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا!

پیاوێکی نامۆ (غەریب)م، هاتووم پرسیاری ئایینیم هەیە: نا بەڵەدم سەبارەت بە ئایینەکەم، نازانم ئایین چۆنەو چۆن نییە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتارەکەی بڕیو هات بۆلای من، هەتا گەیشتە لام، کورسییەکیان بۆ هێنا، وا ئەزانم پێچکەکانی ئاسن بوون، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر کورسییەکە دانیشتو دەستی کرد بە فێرکردنی من، لەو زانستەی کە خودا فێری ئەوی کردبوو.

ئەوجا گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆیو چووەوە سەر وتارەکەیو تەواوی کرد).

١-ئەبو ریفاعە ناوی تەمیمی کوڕی ئەسەدە، حەمیدی کوڕی هیلالو صیلەی کوڕی ئەشیەم فەرموودەی ئەویان گێڕاوەتەوە یەکێ لە فەرموودەکانی ئەم فەرموودەی موسلیمە لەم جێگەیەدا، لە ئازادکردنی سەجستانا بەشداری کردووە، لە کۆتایی شەودا هەڵ دەسێ بۆ شەو نوێژ، دەبووریتەوەو دەمرێ. گۆڕەکەی لە بەیهەقە.

٢-بەپێی ئەم فەرموودەیە، ناوبڕی کەم، وتار پووچ ناکاتەوە.

٣-رەنگ بێ ئەم وتارە وتاری هەینی نەبووبێ.

## ٣٠٩) دانیشتن لەنێوانی دوو وتارەکەی هەینیدا.

## باب: فِي الجَلْسَةِ بَيْنَ الخُطْبَتَيْنِ فِي الجُمُعَةِ

٤١٦-عَنْ جَابِرُ بْنُ سَمُرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَخْطُبُ قَائِمًا ثُمَّ يَجْلِسُ، ثُمَّ يَقُومُ فَيَخْطُبُ قَائِمًا. فَمَنْ نَبَّأَكَ أَنَّهُ كَانَ يَخْطُبُ جَالِسًا فَقَدْ كَذَبَ، فَقَدْ وَاللَّهِ صَلَّيْتُ مَعَهُ أَكْثَرَ مِنْ أَلْفَيْ صَلاَةٍ». {الحديث/١٩٩٣ = ١٩٦٧ فم}:

جابیری کوڕی سەموورە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، کاتێ وتاری نوێژی هەینی دەدا، بە پێوە وتارێکی دەدا، ئەوجا کەمێ دادەنیشت، ئەوجا هەڵ دەسایەوە سەرپێو وتاری دووەمیشی بە پێوە دەدا، جا ئەوەی کە هەواڵ بدا بەتۆ کە گوایە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتاری هەینی بە دانیشتنەوە داوە، ئەوە درۆ دەکا، سوێندم بە خودا زیاتر لە دوو هەزار نوێژم بە جەماعەت لەپشت پێغەمبەرەوە کردووە شتی وام نەدیوە کە بەدانیشتنەوە وتاری دابێ).

## ٣١٠) نوێژی سووکەڵەو وتاری سووکەڵە.
## باب: تَخْفِيفُ الصَّلاَةِ وَ الخُطْبَةِ

٤١٧- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ أُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَكَانَتْ صَلاَتُهُ قَصْدًا وَخُطْبَتُهُ قَصْدًا». {الحديث/٢٠٠٠ = ١٩٧٤ فم}:

جابیری کوڕی سەموورە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: هەمیشە کە نوێژم لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەکرد بە کۆمەڵی، سەرنجم دەدا هەم نوێژەکەی‌و هەم وتارو دوانەکەی میانەکارو مام ناوەندی‌و کورت‌و پوخت بوو). {تاج/١، زنجیرە: ١٤٧، ژمارە: ٨٤٥}.

## ٣١١) ئەگەر کەسێ ڕۆیشت بۆ نوێژی هەینی لەوکاتەدا وتار بێژ وتاری دەخوێند، پێش ئەوەی کە دابنیشێ دوو ڕکات نوێژی سوننەت دەکا.
## باب: إِذَا دَخَلَ والإمام يَخْطُبُ يَوْمَ الجمعة يَرْكَعُ

٤١٨- عَنْ جَابِرِ بْنِ عبدالله (رَضِيَ اللّهُ عنهما) قَالَ: جَاءَ سُلَيْكٌ الْغَطَفَانِيُّ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَاعِدٌ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَقَعَدَ سُلَيْكٌ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَرَكَعْتَ رَكْعَتَيْنِ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: قُمْ فَارْكَعْهُمَا ». {الحديث/٢٠٢٠ = ١٩٩٤ فم. تجريد/١، رقم: ٤٩٠ = ٩٣٠، ٩٣١، ١١٦٦}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژێکی هەینی لەوکاتەدا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتاری دەدا، سولەیکی غەطەفانی هات‌و بەرلەوە کە نوێژی سڵاوی مزگەوت بکا دانیشت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ئایا دوو ڕکاتە سوننەتەکەت کرد؟) فەرمووی: نەخەیر، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (دە هەڵسە دوو ڕکات نوێژی سوننەتی سڵاوی مزگەوت بکە). {تاج/١، زنجیرە: ١٤٩، ژمارە: ٨٦٦}.

## ٣١٢) گوێگرتن بەدڵ لە وتاری هەینی. (باب: فِي الإِنْصَاتِ للخطبة)

٤١٩-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « إِذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ أَنْصِتْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَالإِمَامُ يَخْطُبُ فَقَدْ لَغَوْتَ » . {الحديث/١٩٦٢ = ١٩٣٦. تجريد/١، رقم: ٤٩٢ = ٩٣٤}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (رۆژی هەینی لەوکاتەدا کە پێش نوێژ وتار دەخوێنێتەوە، ئەگەر بە هاونشینی خۆت، لە ریزی نوێژەکەدا بڵێیت: وس، بێدەنگبە، ئەوە خۆشت وەك ئەو، قسەی بێجا دەکەی! کە شتی وا پاداشی نوێژەکە پووچ دەکاتەوە). {تاج/١، ژمارە: ٨٦٨}..

**٣١٣) بەهرەی کەسێ کە بە خامۆشی بە جوانی گوێ لە وتاری رۆژی هەینی بگرێ.**
**باب: فَضْلُ مَنِ اسْتَمَعَ وَأَنْصَتَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ**

٤٢٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « مَنِ اغْتَسَلَ، ثُمَّ أَتَى الْجُمُعَةَ، فَصَلَّى مَا قُدِّرَ لَهُ، ثُمَّ أَنْصَتَ حَتَّى يَفْرُغَ مِنْ خُطْبَتِهِ، ثُمَّ يُصَلِّيَ مَعَهُ، غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الأُخْرَى وَفَضْلَ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ ». {الحديث/١٩٨٤ = ١٩٥٨ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەر کەسێ لە رۆژی هەینیدا خۆی بشۆرێ، ئەوجا بچێ بۆ نوێژی هەینی، لەوێ ئەوەندەی کە خودا لە چارەی نووسیوە نوێژی سوننەت بکا، جا کاتێ پێش نوێژ دەست دەکا بە وتار خوێندن ئەو بە خامۆشیو بەدڵ گوێ بگرێ لە وتارەکەی هەتا تەواوی دەکا، ئەوجا نوێژی هەینی بە کۆمەڵی لە پشتیەوە بکا، هەرکەسێ ئەمە بکا خودا لە گوناهی نێوانی ئەم هەینییەیو هەینییەکەی تری خۆش دەبێ، لەگەڵ گوناهی سێ رۆژی تریدا!).

**روونکردنەوە:**

ئەو بەهرانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١. بەپێی برگەی (ئەوەندەی کە خودا لەچارەی نووسیوە نوێژی سوننەت بکا) نوێژی سوننەتی رووت (واتە: نەوافیلی موتڵەق) بێ سنوورەو ژمارەی دیاری کراوی بۆ دانەنراوە، موسوڵمان بە شەوو بە رۆژ چەندە ئارەزوو دەکا، با نوێژی سوننەت بکا، بەمەرجێ لەکاتی ناباشو شوێنی ناباشو بارو دۆخی ناباشدا نەبێ.

٢. خۆشۆردن بۆ نوێژی هەینی سوننەتە.

### ٣١٤) باسی فەرمایشتی خودای گەورە: (وإِذَا رأوْا تِجارَةً أوْ لهْوًا انفضُّوا إليهَا وتركُوكَ قائمًا).

٤٢١- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللّهُ عنهما): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَخْطُبُ قَائِمًا يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَجَاءَتْ عِيرٌ مِنَ الشَّامِ فَانْفَتَلَ النَّاسُ إِلَيْهَا، حَتَّى لَمْ يَبْقَ إِلاَّ اثْنَا عَشَرَ رَجُلاً، فَأُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ الَّتِي فِي الْجُمُعَةِ: (وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انْفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا) الآيَةَ. {الحديث/١٩٩٤ = ١٩٦٨. تجريد/١، لاپەڕە: ٤٦٨ = ٩٣٦، ٢٠٥٨، ٢٠٦٤، ٤٨٩٩}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لە ڕۆژی هەینیدا، لە خزمەت پێغەمبەردا بووین، خەریکبوو وتاری هەینی دەخوێندەوە، لەوکاتەدا لە شامەوە، کاروانێ هات، دەهۆڵو زوڕنا لە پێشیەوە بوو، هەتا مەردووم بزانن کەوا کاروانەکە گەیشتە جێ، ئیتر خەڵکەکە وتارەکەیان بەجێ هێشتو لە مزگەوت دەرچوونو دەرپەڕین بۆلای کاروانەکە بۆ شت کڕینو سەوداو مامەڵە، تەنها دوازدە کەس لە خزمەتی پێغەمبەردا مانەوە، جا خودا ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: (وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا – جومعة/٥٢/١١). واتە: ئەوانەی لە دەوری تۆ بوون، کاتێ چاویان بە بازرگانیو مامەڵەو سەوداو ئەوکارە بێهوودەیە کەوت، کە برێتی بوو لەو دەهۆڵو زوڕنایە، کە لەکاتی واداو لە زۆر کاتی تریشدا ئادەمیزاد خەریك دەکاو، لە بەندەیی کردنی ساخ بۆ خودای مەزن، دووری دەخاتەوە، ئەوانە لەم کاتەدا دەوری تۆیان چۆڵ کردو بلاوەیان لێ کردو چوون بۆلای ئەو بەزمو ڕەزمە. {بڕوانە: تاج/٤، زنجیرە: ٤٥، ژمارە: ٤١٦٨. چاپی چوارەم}.

### ٣١٥) چی سوورەتێ لە نوێژی هەینیدا دەخوێنرێ
### بابٌ: ما يُقرأ في صلاةِ الجُمُعَة

٤٢٢- عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْرَأُ فِي الْعِيدَيْنِ وَفِي الْجُمُعَةِ: (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى) وَ (هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ

الْغَاشِيَةِ). قَالَ: وَإِذَا اجْتَمَعَ الْعِيدُ وَالْجُمُعَةُ فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ يَقْرَأُ بِهِمَا أَيْضًا فِي الصَّلاَتَيْنِ». {الحديث/٢٠٢٥ = ١٩٩٩ فم}:

نوعمانی کوڕی بەشیر (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: گەلێ جار پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لە نوێژی هەردوو جەژنەکانو، لە نوێژی هەینیدا، سوورەتی {سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى} و سوورەتی {وَهَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ}ی دەخوێند، فەرمووی: ئەگەر جەژنیش رێکەوتی رۆژی هەینیی بکردایە، ئەوە لە هەردوو نوێژەکاندا هەر ئەم دوو سوورەتەی دەخوێند). {تاج زنجیرە: ١٤٨، ژمارە: ٨٥٥}.

**روونکردنەوە:**

نوعمانی کوڕی بەشیر خۆیو باوکیو دایکی صەحابەی پێغەمبەر بوون، ئەنصارییە، لە هۆزی خەزرەجە، دایکی ناوی عەمرەیە، خوشکی عەبدوڵڵای کوڕی رەواحەیە، یەکەم منداڵی ئەنصارە کە لەپاش کۆچ لەدایك بووە، سەدو چواردە فەرموودەی گێڕاوەتەوە، لە دەستەی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر بوو، سەرکاری ئیبنو زوبەیر بوو لەسەر شاری حیمص، لەو ماوەدا کە خەڵکی حیمص هەڵگەڕانەوە ئەو هەڵهات، بەڵام لە رۆژەکەی واسیطدا کوژرا، لە ساڵی شەستو پێنجی کۆچیدا، تەمەنی دەوری شەستو سێ ساڵ بوو، (رەزاو رەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ).

## ٢١٦) کردنی سوننەتی پاش هەینی لە مزگەوت.

## باب: الصَّلاَةُ بَعْدَ الجُمُعَةِ فِي المَسْجِدِ

٤٢٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِذَا صَلَّيْتُمْ بَعْدَ الْجُمُعَةِ، فَصَلُّوا أَرْبَعًا». وَفِي رِوَايَةٍ: قَالَ سُهَيْلٌ: « فَإِنْ عَجِلَ بِكَ شَيْءٌ، فَصَلِّ رَكْعَتَيْنِ فِي الْمَسْجِدِ، وَرَكْعَتَيْنِ إِذَا رَجَعْتَ ». {الحديث/٢٠٣٤ = ٢٠٠٨ فم}:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ سوننەتی پاش نوێژی هەینی دەکەن چوار رکات بکەن). لە

گێڕانەوەیەکدا: سوهەیل فەرمووی: (ئەگەر لەبەر شتێ پەلەت بوو، ئەوا لە مزگەوت دوو ڕکات بکەو دوو ڕکاتیش کاتێ گەڕایتەوە بۆ ماڵەوە).

## ٣١٧) کردنی سوننەتی پاش هەینی لە ماڵەوە
## باب: الصَّلاَةُ بَعْدَ الجمعة فِي البيت

٤٢٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن عمر (رَضِيَ اللّهُ عنهما): أَنَّهُ كَانَ إِذَا صَلَّى الْجُمُعَةَ انْصَرَفَ فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ فِي بَيْتِهِ، ثُمَّ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَصْنَعُ ذَلِكَ». {الحديث/٢٠٣٦ = ٢٠١٠ فم. تجريد/١، لاپەڕە: ٤٦٩، رقم: ٤٩٥ = ٩٣٧، ١١٦٥، ١١٧٢، ١١٨٠}:

دەستووری عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) وابوو کە نوێژی هەینی دەکرد، دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوەی، لەوێ دوو ڕکات سوننەتی پاش نوێژی هەینی دەکرد. وە دەیفەرموو: پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوەهای دەکرد).

## ٣١٨) واباشە لەپاش کردنی نوێژی هەینی، سوننەتی پاشی نەکا، هەتا لەو بەینەدا قسەیێ دەکا، یا جێگۆڕکێ دەکات.
## باب: لا يُصَلِّي بَعْدَ الجُمُعَةِ حَتَّى يَتَكَلَّمَ أَوْ يَخْرُجَ

٤٢٥- عَنْ عُمَرُ بْنُ عَطَاءٍ: أَنَّ نَافِعَ بْنَ جُبَيْرٍ أَرْسَلَهُ إِلَى السَّائِبِ ابْنِ أُخْتِ نَمِرٍ يَسْأَلُهُ عَنْ شَيْءٍ رَآهُ مِنْهُ مُعَاوِيَةُ فِي الصَّلاَةِ فَقَالَ: نَعَمْ صَلَّيْتُ مَعَهُ الْجُمُعَةَ فِي الْمَقْصُورَةِ، فَلَمَّا سَلَّمَ الإِمَامُ قُمْتُ فِي مَقَامِي فَصَلَّيْتُ، فَلَمَّا دَخَلَ أَرْسَلَ إِلَيَّ، فَقَالَ: لاَ تَعُدْ لِمَا فَعَلْتَ. إِذَا صَلَّيْتَ الْجُمُعَةَ فَلاَ تَصِلْهَا بِصَلاَةٍ حَتَّى تَكَلَّمَ أَوْ تَخْرُجَ، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَمَرَنَا بِذَلِكَ، أَنْ لاَ تُوصَلَ صَلاَةٌ بِصَلاَةٍ حَتَّى نَتَكَلَّمَ أَوْ نَخْرُجَ». {الحديث/٢٠٣٩ = ٢٠١٣ فم}:

عومەری کوڕی عەطاء فەرمووی: نافیعی کوڕی جوبەیر منی نارد بۆلای سائیبی خوشکەزای نەمیر، کە لە زمانی نافیعەوە لە سائیب بپرسم: سەبارەت بەشتێ کە موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان، لە نوێژدا لە سائیبی بینیوەو لەبارەی

ئەو شتەوە موعاوییە ئامۆژگارییەکی سائیبی کردووە ئـەم ڕووداوە چییەو چۆنە؟ کە لێیم پرسی، سائیب فەرمووی: بەڵێ باشە، ڕۆژێ لەگەڵ موعاوییـەدا، لـە نوێـژگا تایبەتییەکـەی خۆیـدا، کـە پێیـان دەگـوت (مقصـورة الأُمَـرَاء = هـۆدەی تایبـەتی فەرمانڕەواکان) نوێژی هەینیمان کـرد، کاتـێ پـێش نوێـژ سلاوی دایـەوە، ئێمـەیش سلاومان دایەوە، من هەڵسام لـە شـوێنەکەی خۆمـا سـوننەتی پاش نوێـژی هـەینیم کرد، جا کاتێ موعاوییە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە ناردی بەشوێنما، کە چووم فـەرمووی: جارێ تـر شتی وامەکە، کە سوننەت بەبێ ناوبڕ، بلکێنی بـە نوێـژی فـەرزەوە، کاتـێ نوێژی هەینی دەکەی، نوێژی تری پێـوە مەلکێنـە، هـەتا قسـەیێ دەکـەی، یـا شـوێن نوێژەکە بەجێ دەهێڵی). چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بەوە کـردووە پێمان، کە نوێژی سوننەت نەلکێنین بە نوێژی فەرزەوە، هەتا لـەو بەینـەدا قسـەیێ دەکەین، یا جێ دەگۆڕین).

**ڕوونکردنەوە:**

بەم شتانەی خوارەوە ناوبڕ دروست دەبێ:

١. بە قسەکردن.
٢. بە جێ گۆڕکێ لەناو مزگەوتا.
٣. بە خوێندنی ویردو قورئانو شتی وا.
٤. بە چوونەوە بۆ ماڵەوە.

## ٣١٩) هەڕەشەی قورس لە نەکردنی نوێژی هەینی.

## باب: التغليظ في ترك الجُمُعَة

٤٢٦-عَنْ الْحَكَمُ بْنُ مِينَاءَ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ، وَأَبَا هُرَيْرَةَ حَدَّثَاهُ أَنَّهُمَا سَمِعَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ عَلَى أَعْوَادِ مِنْبَرِهِ: « لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عَنْ وَدْعِهِمُ الْجُمُعَاتِ أَوْ لَيَخْتِمَنَّ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ، ثُمَّ لَيَكُونُنَّ مِنَ الْغَافِلِينَ ». {الحديث/١٩٩٩ = ١٩٧٣ فم}:

حەکەمی کوڕی میناء فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو ئەبو هورەیرە، بۆیان گێڕامەوە، فەرموویان: گوێمان لێ بوو کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر چڵەدارەکانی دوانگەکەی خۆی دەیفەرموو: (ئەو کەسانەی کە نوێژی هەینی ناکەن، یا دەبێ وازبێنن لەم کارە ناپەسەندەیان، یاخود خودا دڵیان مۆردەکا، ئینجا بەرە بەرە بێ ئاگاو نابەڵەد دەبن لە دینو لە ڕێی ڕەهبەرو وردە وردە ئەم کارەیان سەر دەکێشێ بۆ بێباوەڕیو بێ ئایینی. خوا پەنامان بدا). {تاج/١، ژمارە: ٨٢٢، زنجیرە: ١٣٩، لاپەڕە: ٤٠٠ چاپی چوارەم}.

بسم الله الرحمن الرحيم

## باسی نوێژی هەردوو جەژن

### ٣٢٠) لە نوێژی هەردوو جەژنەکەدا نە بانگ هەیە نە قامەت. (٢٠٤١ - ٢٠٦٦). العِيدَان – باب: ترك الأذانِ والإقَامَةِ فِي العِيدَيْن

{بڕوانە: تاج/١، لاپەڕە: ٤٣٧، زنجیرە: ١٥٨ هەتا زنجیرە: ١٦٣، لە ژمارە: ٨٩٨ وە هەتا ژمارە: ٩١٧ + فیقهی ئاسان: زنجیرە: ٨٩، لاپەڕە: ٢٥٨ هەتا زنجیرە: ٩٥، لاپەڕە: ٢٦٥}.

٤٢٧- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْعِيدَيْنِ غَيْرَ مَرَّةٍ وَلاَ مَرَّتَيْنِ، بِغَيْرِ أَذَانٍ وَلاَ إِقَامَةٍ». {الحديث/٢٠٤٨ = ٢٠٢٢ فم}:

جابیری کوڕی سەموورە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: نەك جارو دووجار، بەڵکوو جارەها نوێژی هەردوو جەژنەکانم کردووە لەگەڵ پێغەمبەر خۆیدا (درودی خودای لەسەر بێ) بەبێ بانگو قامەت. {تاج/١، زنجیرە: ١٦٠، ژمارە: ٩٠٥}.

### ٣٢١) نوێژی هەردوو جەژن لەپێش وتاردا دەکرێن باب: صَلَاة العيدين قَبلَ الخُطبَة

٤٢٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِىَ اللّهُ عنهما) قَالَ: شَهِدْتُ صَلاَةَ الْفِطْرِ مَعَ نَبِيِّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَبِى بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ (رَضِىَ اللّهُ عنهم) فَكُلُّهُمْ يُصَلِّيهَا قَبْلَ الْخُطْبَةِ ثُمَّ يَخْطُبُ، قَالَ: فَنَزَلَ نَبِيُّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَأَنِّى أَنْظُرُ إِلَيْهِ حِينَ يُجَلِّسُ الرِّجَالَ بِيَدِهِ، ثُمَّ أَقْبَلَ يَشُقُّهُمْ حَتَّى جَاءَ النِّسَاءَ وَمَعَهُ بِلاَلٌ، فَقَالَ: (يَا أَيُّهَا النَّبِىُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَنْ لاَ يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا) فَتَلاَ هَذِهِ الآيَةَ حَتَّى فَرَغَ مِنْهَا، ثُمَّ قَالَ: حِينَ فَرَغَ مِنْهَا: « أَنْتُنَّ عَلَى ذَلِكِ؟ » فَقَالَتِ امْرَأَةٌ وَاحِدَةٌ لَمْ يُجِبْهُ غَيْرُهَا مِنْهُنَّ: نَعَمْ، يَا نَبِىَّ اللَّهِ، لاَ يُدْرَى حِينَئِذٍ مَنْ هِىَ؟ قَالَ: « فَتَصَدَّقْنَ ». فَبَسَطَ بِلاَلٌ ثَوْبَهُ، ثُمَّ قَالَ: هَلُمَّ فِدًى لَكُنَّ أَبِى وَأُمِّى، فَجَعَلْنَ يُلْقِينَ الْفَتَخَ وَالْخَوَاتِمَ فِى ثَوْبِ بِلاَلٍ».

{الحديث/٢٠٤١ = ٢٠١٥ فم. تجريد/١، لاپەڕە: ١٠٥، ژمارە: ٨٣ = ٩٨، ٨٦٣، ٩٦٢، ٩٦٤، ٩٧٥، ٩٧٧، ٩٧٩، ٩٨٩، ١٤٣١، ١٤٤٩، ٤٨٩٥، ٥٢٤٩، ٥٨٨٠، ٥٨٨١، ٥٨٨٣، ٧٣٢٥}:

ئیبنو عەباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموی: لە خزمەت پێغەمبەرو ئەبوبەکرو عومەرو عوثماندا، هەر کەسەیان لە سەردەمی خۆیدا، ئامادەی نوێژی جەژنی ڕەمەزان بووم، هەموویان لەپێش وتاردا نوێژی جەژنیان دەکرد. فەرمووی: جا جارێ، پێغەمبەر کاتێ لە وتارەکە بۆوە، دابەزی تا بڕوات بۆلای ژنان، پیاوان وایان زانی کە نوێژ تەواو بووەو ویستیان هەڵسن بڕۆن، بەڵام بەچاوی خۆم پێغەمبەرم بینی کە بەدەستی پیاوانی دادەنیشانەوەو دڕی پێدانو ڕۆیشت بۆناو ژنان تا گەیشتە لایان، بیلالیشی لەگەڵدا بوو، جا ئەم ئایەتەی بۆ خوێندنەوە کە دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَاسْتَغْفِرْ لَهُنَّ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ - سورة المتحنة/٦٠ - ١٢}:

واتە: ئەی پێغەمبەر! کاتێ ئافرەتە موسوڵمانەکان هاتن بۆ لات، کە پەیمانو بەیعەتت بدەنێ، لەسەرئەوە پەیمانیان لێ وەربگرە کە: بەهیچ جۆرێ هاوبەش بۆ خودا بڕیار نەدەنو دزی نەکەنو حیزی نەکەنو منداڵی خۆیان نەکوژنو کچی خۆیان زیندە بەچاڵ نەکەنو بوختانی درۆ لەنێوانی دەستو پێی خۆیاندا نەکەن، واتە: منداڵی بێگانە نەهێنن لە بەینی دەستو پێی خۆیان دایبنێنو بە درۆو ناهەق بیکەن بە منداڵی مێردەکەیان، وە لەکردنی کاری خێردا نافەرمانی تۆ نەکەنو سەرپێچی لە فەرمانی تۆ نەکەن، جا لەپاش ئەمە، لە خودا بپاڕێرەوە بۆیان کە لێیان خۆش بێ، بەڕاستی خودا تاوان بەخشو میهرەبانە).

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کاتێ لە خوێندنەوەی ئایەتەکە بۆوە، پێی فەرموون: (ئایا ئێوە ئەم پەیمانەتان قەبووڵە؟). تەنیا ژنێکیان وەڵامی پێغەمبەری

دایەوە، کەسی تریان قسەی نەکرد، ژنەکە گوتی: بەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمەمان قەبووڵە، لەبەر قەرەباڵغی نەزانرا ئەو ژنە کێیە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێیان: (خێر بکەن) جا بیلال چاکی جلەکەی خۆی گرتەوەو گوتی: ئادەی ئەی ژنگەل! خێرەکانتان بهێنن، ئەی باوكو دایکم بە قوربانتان بێ، ئیتر ژنەکان فەرمایشتەکانی پێغەمبەر کاری تێ کردنو دڵیان گەرم بوو، دەستیان کرد بە خێرکردن، هەیان بوو گوارەکەی لە گوێی خۆی دادەکەندو دەیکرد بەخێرو هەڵی دەدایە ناو کۆشی بیلالەوە، هەشیان بوو ئەنگوستیلەکەی لە پەنجەی خۆی دادەکەندو هەڵی دەدایە ناو چاکی بیلالەوە، ئیتر هەروا). {بڕوانە: تاج/١، لاپەڕە: ٤٢، ژمارە: ٦٠، چاپی/٤ + زنجیرە: ٨، ژمارە: ٥٥}.

### ٣٢٢) چی سوورەتێ لەهەر یەکێ لە دوو رکاتەکانی نوێژی دوو جەژنەکاندا دەخوێنرێ. (**باب: مَایُقْرَأُ فِي صَلاَةِ الْعِیدَیْنِ**)

٤٢٩- عَنْ عُبَیْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) سَأَلَ أَبَا وَاقِدٍ اللَّیْثِيَّ: مَا كَانَ یَقْرَأُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ) فِي الأَضْحَى وَالْفِطْرِ؟ فَقَالَ: كَانَ یَقْرَأُ فِیهِمَا: (ق وَالْقُرْآنِ الْمَجِیدِ) وَ (اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمَرُ). {الحدیث/٢٠٥٦ = ٢٠٣٠ فم}:

عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا فەرمووی: عومەری کوڕی خەتاب (خودای لێ رازی بێ) لە ئەبو واقیدی لەیثیی پرسی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کام سوورەتانەی، لە نوێژی جەژنی قوربانو نوێژی جەژنی رەمەزانا دەخوێند؟! ئەبو واقید فەرمووی: لە رکاتی یەکەمیاندا سوورەتی (ق وَالْقُرْآنِ الْمَجِیدِ)ی دەخوێند، وە لە رکاتی دووهەمیاندا سوورەتی (اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمَرُ)ی دەخوێند). {تاج/١، زنجیرە: ١٦٠، ژمارە: ٩١٠}.

ئەبو واقیدی لەیثی (رەزای خودای لێ بێ) بیستو چوار فەرموودەی هەیە، کە لە پێغەمبەرەوە گێڕاونیەتەوە، یەك فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە، لەساڵی شەستو هەشتا مردووە، حەفتاو پێنج ساڵ ژیاوە، لە مەککە وەفاتی کردووە، گۆڕەکەی لە

گۆڕستانی موهاجیرینە، لە بنەڕەتدا خەڵکی مەدینەیە، لە موسوڵمانە پێشینەکانە.
{بڕوانە: تجرید/١، لاپەڕە: ٨٥، ژمارە: ٤٩ = ٦٦ فتح}.

### ٣٢٣) نوێژی جەژن سوننەتی پێشینەو پاشینەی نییە.
### باب: تَرْكُ الصَّلاَةِ قَبْلَ الْعِيدِ وَ بَعْدَهُ فِي الْمُصَلَّى

٤٣٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عنهما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَرَجَ يَوْمَ أَضْحَى، أَوْ فِطْرٍ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، لَمْ يُصَلِّ قَبْلَهَا وَلاَ بَعْدَهَا، ثُمَّ أَتَى النِّسَاءَ وَمَعَهُ بِلاَلٌ، فَأَمَرَهُنَّ بِالصَّدَقَةِ، فَجَعَلَتِ الْمَرْأَةُ تُلْقِي خُرْصَهَا وَتُلْقِي سِخَابَهَا». {الحديث/٢٠٥٤ = ٢٠٢٨ فم. تجريد/١، رقم: ٨٣ سبق في رقم: ٤٢٨}:

ئیبنو عەباس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ نوێژی جەژنی قوربان، یا بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان، دەرچوو بۆ نوێژگاکە، کە لە دەرەوەی شاری مەدینە بوو، نزیکەی هەزار گەز لە دەرگای مزگەوتەوە دوور بوو لە سەردەمی پێغەمبەر خۆیدا، لەوێ دوو رکات نوێژی جەژنی بە کۆمەڵی، بۆ موسوڵمانان کرد، نە لەپێشەوە نوێژی سوننەتی کرد، نە لەپاشیەوە، لەپاشا ڕۆیشت بۆناو ژنان، بیلالی لەگەڵ خۆیدا برد، فەرمانی پێیان کرد، کە خێر بکەن، ئیتر ژنەکان دەستیان کرد، بە بەخشین، هەیان بوو ئەڵقە زێڕەکەی، یا زیوەکەی دادەکەندو هەڵی دەدایە ناو کۆشی بیلالەوە، هەیان بوو گەردانەکەی ئیتر هەروا).

### ٣٢٤) دەرچوونی ژنان بۆ نوێژی دوو جەژنەکە
### بابٌ: فِي خُرُوجِ النِّسَاءِ إِلَى الْعِيدَيْنِ

٤٣١- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ (رَضِيَ اللَّهُ عنها) قَالَتْ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ نُخْرِجَهُنَّ فِي الْفِطْرِ وَالأَضْحَى: الْعَوَاتِقَ وَالْحُيَّضَ وَذَوَاتِ الْخُدُورِ. فَأَمَّا الْحُيَّضُ فَيَعْتَزِلْنَ الصَّلاَةَ، وَيَشْهَدْنَ الْخَيْرَ وَدَعْوَةَ الْمُسْلِمِينَ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: إِحْدَانَا لاَ يَكُونُ لَهَا جِلْبَابٌ؟ قَالَ: « لِتُلْبِسْهَا أُخْتُهَا مِنْ جِلْبَابِهَا ». {الحديث/٢٠٥٣ = ٢٠٢٧ فم. تجريد/١، لاپەڕە: ٢١٩، رقم: ٢١١ = ٣٢٤، ٣٥١، ٩٧١، ٩٧٤، ٩٨٠، ٩٨١، ١٦٥٢}:

ئوم عەطییە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لە رۆژی جەژنی رەمەزان‌و رۆژی جەژنی قوربانا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێمان کرد، کە گەورە کچ‌و ژنی بێنوێژو کەیبانوی ناو ماڵ لەگەڵ خۆمان ببەین بۆ ئەو دەشتە بۆ نوێژگاکە، بۆ نوێژی جەژن، بەڵام ئافرەتە بێنوێژەکان نوێژەکە ناکەن، تەنیا ئامادەی کۆڕی پڕ فەڕو نزای خێری کۆمەڵی موسوڵمانان دەبن، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر وا رێکەوت یەکێکمان چارشێوی نەبوو، ئایا بەبێ چارشێویش هەربێ بۆ نوێژگاکە بۆ دەرەوەی شار؟ فەرمووی: (با لە خوشکێکی موسوڵمانی خۆی چارشێوێ بخوازێ). {تاج/١، زنجیرە: ١٥٩، ژمارە: ٩٠٣}.

**روونکردنەوە:**

١. ئوم عەطییە (بە کوردی واتە: دایکی عەتێ) ناوی نوسەیبەی کچی حاریثە، هاوەڵی پێغەمبەرە، واتە: صەحابەیە، زۆر ئازاو دلێر بوو، ئەنصارییە، لە زۆر غەزادا لەگەڵ پێغەمبەردا بوو، دەستی پزیشکی هەبوو، زامارو نەخۆشیانی تێمار دەکرد، کۆمەڵێ فەرموودەی لە صەحیحا هەیە، ئەم فەرموودەیەی ئێرەی (متفق علیە)یە، نۆ فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە، کۆمەڵێ لە هاوەڵان‌و لە زانایان لە بەصرە، دەستووری شۆردنی مردوویان لە ئوم عەتێ وەردەگرت، لە شۆردنی زەینەبی کچی پێغەمبەردا، کە مرد، ئوم عەتێ بەشداری کردووە، چەند فەرموودەیەکی هەیە، لەبابەت شۆردنی مردووەوە، دادەنرێن بە سەرچاوەو بنەمای شۆردنی مردوو، لە مەدینە کچانی سوننەت دەکرد، (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ). {بڕوانە: تجرید/١، ژمارە: ٢٠٥ + تاج/١، زنجیرە: ٢٠٣، ژمارە: ١٠٦٩، ١٠٧٠ + تاج/٣، ژمارە: ٢٨٦١}.

٢. ئەم فەرموودەیە باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەم بابەتانە:

أ- ژنی بێنوێژ دروستە هەموو پەرستن‌و یادێکی خودا بکا، بەمەرجێ بە دەقی رۆشنی تر، قەدەغە نەکرابێ، وەك نوێژو رۆژوو و قورئان خوێندن، وە لەسەر ئەوە پاداشی باش وەردەگرێ.

ب- مافی هەیە ئامادەی كۆڕی دەورو دەرس‌و زانست‌و هەموو جۆرە كۆڕێكی ڕەوای تر ببێ، بەمەرجێ كۆڕەكە لەناو مزگەوتا نەبێ، هەروا بۆی هەیە گوێ لە خوێندنی قورئان‌و گوتن‌و دەوركردنەوەی حەدیث بگرێ، یا بیخوێنێ، یا دەوری بكاتەوە.

### ٣٢٥) كەنیشك چی دەڵێ لە جەژنا؟
### باب: مَا يَقُولُ الجَوارِي فِي العِيدِ؟

٤٣٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عنها) قَالَتْ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَعِنْدِي جَارِيَتَانِ تُغَنِّيَانِ بِغِنَاءِ بُعَاثٍ، فَاضْطَجَعَ عَلَى الْفِرَاشِ وَحَوَّلَ وَجْهَهُ، فَدَخَلَ أَبُو بَكْرٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) فَانْتَهَرَنِي، وَقَالَ: مِزْمَارُ الشَّيْطَانِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ فَأَقْبَلَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: « دَعْهُمَا » فَلَمَّا غَفَلَ، غَمَزْتُهُمَا فَخَرَجَتَا، وَكَانَ يَوْمَ عِيدٍ، يَلْعَبُ السُّودَانُ بِالدَّرَقِ وَالْحِرَابِ، فَإِمَّا سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَإِمَّا قَالَ: « تَشْتَهِينَ تَنْظُرِينَ؟ ». فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَأَقَامَنِي وَرَاءَهُ، خَدِّي عَلَى خَدِّهِ، وَهُوَ يَقُولُ: « دُونَكُمْ يَا بَنِي أَرْفِدَةَ ». حَتَّى إِذَا مَلِلْتُ قَالَ: « حَسْبُكِ؟» قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: « فَاذْهَبِي ». {الحديث/٢٠٦٢ = ٢٠٣٦. بخاري. تجريد/١/٤٧٦، رقم: ٤٩٨ = ٩٤٩، ٩٥٢، ٩٨٧، ٢٩٠٧، ٣٥٣٠، ٣٩٣١}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دوو كەنیزم لەلابوون، گۆرانیان دەگوت، بەسەر هەرای ڕۆژەكەی بوعاسدا، سروودیان دەگوت، كە كوشتارێكی زۆر لەو ڕۆژەدا، لەپێش هاتنی ئیسلامدا، لەنێوانی ئەوس‌و خەزرەجدا، ڕووی دابوو، لەوكاتەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتە ژوورەوە، تەشریفی چوو لەسەر نوێنەكەی خۆی پاڵكەوت‌و ڕووی لەئێمە وەرچەرخان، پاش كەمێ ئەبوبەكری باوكیشم هات، چاوی بە حاڵەكە كەوت، لەپێشا لەمنی خوڕی‌و پیاما هەڵشاخا، ئەوجا فەرمووی: (باڵۆرەی شەیتان‌و لەخزمەت پێغەمبەری خوا دا؟ شتی وا چۆن دەبێ؟) جاكاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مەشغووڵ بوو، چاوم لەكەنیشكەكان هەڵتەكان كە بڕۆن، ئیتر ئەوانیش ڕۆیشتن.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لێ بێ) رووی کردە ئەبوبەکرو پێی فەرموو: (ئەی ئەبوبەکر! وازیان لێ بێنە، با سروودەکەیان بڵێن، چونکە ئەمڕۆ جەژنی موسوڵمانانە).

دیسان عائیشە فەرمووی: کات رۆژی جەژنی قوربان بوو، حەبەشییەکان بە قەڵخان و نێزە یارییان دەکرد، یا خۆم داوام لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد، یاخود خۆی فەرمووی: (ئەی عائیشە! حەزدەکەی کە تەماشای ئەم یاریە بکەی؟) منیش گوتم: بەڵێ، جامنی لەپشتی خۆیەوە وەستان و، چەناگەم نایە سەرشانی و روومەتم نا بە روومەتیەوە، جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی نەوەی ئەرفیدە! خەریکی یاریی خۆتان بن). ئیتر منیش دەستم کرد بە تەماشا کردن، تا خۆم تاقەتم نەما، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئیتر بەستە؟) گوتم: بەڵێ، فەرمووی: (دەبڕۆ). {تاج/١، زنجیرە: ١٦٣، ژمارە: ٩٥١، ٩١٦}.

بسم الله الرحمن الرحيم

# نوێژی ڕێبوار (١٥٦٨ - ١٥٩٨) - صلاةُ المُسافرِ

## ٣٢٦) باسی: کورتکردنەوەی نوێژ لەکاتی ئاسایشدا.
## باب: قَصْرُ صلاةِ المُسافرِ في الأمْنِ.

{تاج/١، زنجیرە: ١٥٥، ژمارە: ٨٨٩، ٨٩٠، ٨٩١ - ٨٩٤}.

٤٣٣- عَنْ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ قَالَ: قُلْتُ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ: ( لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلاَةِ إِنْ خِفْتُمْ أَنْ يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا ). فَقَدْ أَمِنَ النَّاسُ؟ فَقَالَ: عَجِبْتُ مِمَّا عَجِبْتَ مِنْهُ، فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: « صَدَقَةٌ تَصَدَّقَ اللَّهُ بِهَا عَلَيْكُمْ فَاقْبَلُوا صَدَقَتَهُ ». {الحديث/١٥٧١ = ١٥٣٧}:

یەعلای کوڕی ئومەییە (خوای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: گوتم بە عومەری کوڕی خەطاب (خوای لێ ڕازی بێ) خودا لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: {وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ الصَّلاَةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُواْ - سورة النساء/ ١٠١} : کاتێ مەترسی ئەوەتان هەبوو، کە بێباوەڕەکان تووشی ئاژاوەی ئایینیتان بکەن، لەکاتی وادا، گوناهتان ناگا، ئەگەر نوێژەکان کورت بکەنەوە).

دەی خۆ ئێستا ترسی ئەوە نەماوەو مەردوم هێمن بوونەتەوە، کەواتە چۆن دروستە بۆ ئێمە، کە لەم کەشە بێ ترسەدا، نوێژ کورت بکەینەوە؟ ئەویش گوتی: ئەمەی سرنجی تۆی ڕاکێشاوە، سەرەنجی منیشی ڕاکێشاو، منیش وەکوو تۆ لەم حاڵەتە سەرسام بووم، بەڵام کە لەمبارەیەوە لە پێغەمبەرم پرسی، فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): ئەمە خەڵاتێکەو خودا پێتانی بەخشیوە، دەی ئێوەیش خەڵاتەکەی وەربگرن‌و ڕەتی مەکەنەوە). {تاج/١، زنجیرە: ١٥٥، ژمارە: ٨٨٩}.

٤٣٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عنهما) قَالَ: فَرَضَ اللَّهُ الصَّلاَةَ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّكُمْ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الْحَضَرِ أَرْبَعًا، وَفِي السَّفَرِ رَكْعَتَيْنِ، وَفِي الْخَوْفِ رَكْعَةً». (الحديث ١٥٧٣ صحيح مسلم بشرح النووي = ١٥٣٩ فتح المُلْهِم).

ئیبنو عەباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خودای گەورە لەسەر زمانی پێغەمبەری ئێوە، کە حەزرەتی موحەممەدە (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی فەرزکردووە لەسەرتان لەسەر ئەم شێوەیە: ئەگەر لەماڵەوە نیشتەجێ بوون و رێبوارو رەوتەنی نەبوون، ئەوا چوار رکات دەکەن، بەلآم لەسەفەرا دوو رکات دەکەن، لەکاتی ترس و نائەمینیدا یەك رکات دەکەن).

## ٣٢٧) ئەو ماوەیە چەندە کە نوێژی تیادا کورت دەکرێتەوە، لەکاتی رێبواریدا
## باب: مَاتُقْصَرُ فِيهِ الصَّلاَةُ مِنَ السَّفَرِ

٤٣٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قال: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولَ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) الظُّهْـرَ بِالْمَدِينَـةِ أَرْبَعًـا، وَصَلَّيْتُ مَعَـهُ الْعَصْـرَ بِـذِي الْحُلَيْفَـةِ رَكْعَتَـيْنِ». {الحديث/١٥٨٠ = ١٥٤٦ فم. تجريد/٢، لاپەڕە: ١٦٨، رقم: ٧٤٥ = ١٠٨٩، ١٥٥١، ١٥٤٦، ١٥٤٧، ١٥٤٨، ١٧١٢، ١٧١٤، ١٧١٥، ٢٩٥١، ٢٩٨٦}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەچوو بۆ حەجی ماڵاوایی، لە مەدینە نوێژی نیوەڕۆی بەچوار رکات بۆمان کرد، ئەوجا کەوتەڕێ، کە گەیشتە زولحولەیفە، لەوێ نوێژی عەصری بە قەصر، بە کورتی، بەدوو رکات، بە جەماعەت بۆمان کرد).

## ٣٢٨) کورتکردنەوەی نوێژ لە حەجا
## باب: قَصْرُ الصَّلاَةِ فِي الْحَجِّ

٤٣٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، حَتَّى رَجَعَ، قُلْتُ: كَمْ أَقَامَ بِمَكَّةَ؟ قَالَ: عَشْرًا. وَفِي رِوَايَةٍ: خَرَجْنَا مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى الْحَجِّ». {الحديث/١٥٨٤ = ١٥٥٠ + ١٥٨٦ = ١٥٥٢ فم. تجريد/١، لاپەڕە: ٥٢٠، رقم: ٥٤٥ = ١٠٨١، ٤٢٩٧}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە حەجی ماڵاواییدا، لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) لە مەدینەوە چووین بۆ مەککە، ئیتر هەر دوو رکات دوو رکات نوێژە چوار رکاتییەکانی دەکرد بۆمان، بە کۆمەڵێ، بە جەماعەت، هەتا

گەڕاینەوە بۆ مەدینە، یەحیای کوڕی ئەبو ئیسحاق فەرمووی: گوتم بە ئەنەس: لە مەککەو دەوروبەری چەندێ مانەوە؟ فەرمووی: دەشەو لەوێ ماینەوە. {تاج/١، ژمارە: ٨٩٠}.

## ٣٢٩) کورتکردنەوەی نوێژ لە مینا
## باب: قَصْرُ الصَّلاَةِ بِمِنىً

٤٣٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عنهما) قَالَ: صَلَّى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمِنًى صَلاَةَ الْمُسَافِرِ وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَعُثْمَانُ ثَمَانِيَ سِنِينَ، أَوْ قَالَ سِتَّ سِنِينَ، قَالَ حَفْصٌ (يَعْنِي إِبْنَ عَاصِمٍ): وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يُصَلِّي بِمِنًى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ يَأْتِي فِرَاشَهُ، فَقُلْتُ: أَيْ عَمِّ، لَوْ صَلَّيْتَ بَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ؟ قَالَ: لَوْ فَعَلْتُ لأَتْمَمْتُ الصَّلاَةَ». {الحديث/١٥٩٢ = ١٥٥٨ تجريد/١، لاپەڕە: ٥٢١، رقم: ٥٤٦ = ١٠٨٢، ١٦٥٥}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لە مینا، لە حەجی مالاواییدا، لە ڕۆژەکانی جەژنی قورباندا، لەگەڵ پێغەمبەر خۆیو ئەبوبەکرو عومەردا، لەکاتی جێنشینی خۆیاندا، وەك نوێژی ڕێبوار، نوێژە چوار ڕکاتەکانمان بە دوو ڕکات دەکرد، واتە: کورتمان دەکردنەوە، لەجیاتی چوار ڕکات دوو ڕکاتمان دەکرد، کە ئەم کردارە لە زاراوی شەرعی پیرۆزدا، پێی دەگوترێ (قصر الصلاة الرباعية) وە هەروەها لەگەڵ عوسمانیشدا، هەشت ساڵ، یا شەش ساڵ، لەسەرەتای فەرمان ڕەواییەکەیدا، بەهەمان چەشن، نوێژە چوارینەکانمان، لە مینا، بە دوو ڕکات دەکرد، بەڵام عوسمان لە دواییدا چوار ڕکاتی دەکردو، لە مینا نوێژی کورت نەدەکردەوە.

حەفصی کوڕی عاصیم، کە ئەم فەرموودەیە لە ئیبنو عومەرەوە دەگێڕێتەوە، دەفەرموێ: دەستووری ئیبنو عومەر وابوو، لە مینا نوێژی چوارینەی کورت دەکردەوەو، بەدوو ڕکات دەیکرد، بەڵام هیچ نوێژی سوننەتی لەپاشیەوە نەدەکرد، بەڵکوو ئەگەڕایەوە بۆ جێگەی خۆی، منیش عەرزیم کرد: ئەی مامی شیرینم! ئەوە بۆچی دوو ڕکات نوێژی سوننەت، لەپاش نوێژە فەرزە کورتکراوەکەوە

ناكەيت؟ فەرمووی: ئەی برازای خۆشەویستم، ئەگەر شتی وا بكەم، نوێژە فەرزەكە بەتەواوی بكەم، بە چوار ركات، ئەوەم پێ باشترە لەمەی تۆ دەیڵێیت). {تاج/١، لاپەڕە: ٤٣٤، زنجیرە: ١٥٥، ژمارە: ٨٩٢ + ١٥٧٧ = ١٥٤٣ **فتح المُلهِم**}.

**ڕوونكردنەوە:**

١. حەفصی كوڕی عاصیمی كوڕی عومەری كوڕی خەطاب، هەق برازای عەبدوڵڵای كوڕی عومەری كوڕی خەطابە، كە ناسراوە بە ئیبنو عومەر.

٢. ئیمامی نەوەوی (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: زانایان بەكۆی دەنگ دەفەرموون: سوننەتی ڕەها، لە سەفەرا، كارێ شیرینە، بەڵام ڕاجیایی هەیە لە كردنی سوننەتەكانی پاش‌و پێشی نوێژە فەرزەكانا، لەلای شافیعی‌و هاوەڵانی‌و جەماوەری زانایانی ئیسلام، كردنی ئەم سوننەتانە سوننەتە، كەواتە: بە دڵنیایی دەڵێین: ئەی برای ڕێبوار! لە سەفەرا، دەتوانی هیچ نوێژێكی سوننەت تەرك نەكەی، لەپێش‌و پاشی فەرزەكانەوە نوێژە سوننەتەكان، وەك كاتی ئاسایی بكە، شەو نوێژبكە، نوێژی چێشتەنگاوو سوننەتی دەستنوێژو دیاری مزگەوت بكە. هەروا نوێژی سوننەتی ڕەها، كە پێی دەگوترێ: (نوافل مطلقة).

٣. لە (فَتْحُ الْمُلْهِمِ)دا، دەفەرموێ: سەرخەسی لە مەبسووطدا دەفەرموێ: (نوێژی سوننەت كورت ناكرێتەوە).

**٣٣٠) كۆكردنەوەی دوو نوێژ لە سەفەردا.** (١٦١٩ – ١٦٣٥). (**تاج/١، زنجیرە: ١٥٦**)

**باب: الجَمْعُ بَيْنَ الصَّلاَتَيْنِ فِي السَّفَرِ**

٤٣٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَلِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (إِذَا عَجِلَ عَلَيْهِ السَّيْرُ يُؤَخِّرُ الظُّهْرَ إِلَى وَقْتِ الْعَصْرِ، فَيَجْمَعُ بَيْنَهُمَا، وَيُؤَخِّرُ الْمَغْرِبَ حَتَّى يَجْمَعَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ الْعِشَاءِ، حِينَ يَغِيبُ الشَّفَقُ). {الحديث/١٦٢٥ = ١٥٩١ فم. بخاري/١١٠٧، ١١١١، ١١١٢}:

ئەنەسی كوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوا بوو: ئەگەر زوو بچوایە بۆ سەفەرو پەلەی بووایە، نوێژی نیوەڕۆی

دوادەخست، تا کاتی عەصر، ئەوجا هەردووکیانی پێکەوە، بە جەمعە تەئخیر (بە کۆکردنەوەی دواخراو) دەکرد، وە هەروەها شێوانیشی دوا دەخست تا لەگەڵ نوێژی خەوتناندا پێکەوە کۆی دەکردنەوە، ئەوکاتە دەیکردن کە سوورایی کەناری ئاسمان گوم دەبێ!). {تاج/١، زنجیرە: ١٥٦، ژمارە: ٨٩٥}.

## ٣٣١) کۆکردنەوەی دوو نوێژ لەماڵەوە
## باب: الجَمْعُ بَيْنَ الصَّلاَتَيْنِ فِي الحَضَرِ

٤٣٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِىَ اللّٰهُ عنهما) قَالَ: جَمَعَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ، بِالْمَدِينَةِ فِى غَيْرِ خَوْفٍ وَلاَ مَطَرٍ. (فِى حَدِيثِ وَكِيعٍ قَالَ: قُلْتُ لاِبْنِ عَبَّاسٍ: لِمَ فَعَلَ ذَلِكَ؟ قَالَ: كَىْ لاَ يُحْرِجَ أُمَّتَهُ. وَفِى حَدِيثِ أَبِى مُعَاوِيَةَ: قِيلَ لاِبْنِ عَبَّاسٍ: مَا أَرَادَ إِلَى ذَلِكَ؟ قَالَ: أَرَادَ أَنْ لاَ يُحْرِجَ أُمَّتَهُ).
{الحديث/١٦٣١ = ١٥٩٧ فم. تجريد/١/٣٢٥، رقم: ٣١٩ = ٥٤٣، ٥٦٢، ١١٧٤}:

ئیبنو عەباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارە جارە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە مەدینە، نوێژی نیوەڕۆو عەصری کۆدەکردەوەو بە جەمع هەشت رکاتی دەکرد، بە دوو سلاو، هەرچوار رکاتەی بە سلاوێ، هەروەها شێوان‌و خەوتنانیشی کۆدەکردەوەو بە جەمع حەوت رکاتی دەکرد، بەدوو سلاو، سێ رکات بەجیا بە سلاوێ‌و، چوار رکاتیش بەجیا بە سلاوێ. لە گێڕانەوەی وەکیعا، سەعیدی کوڕی جوبەیر دەفەرموێ: عەرزی ئیبنو عەباسم کرد: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەرچی ئاوای کردووە؟ فەرمووی: هەتا گەلی ئیسلامی خۆی تووشی ئەرك‌و رەنج نەکا. لە گێڕانەوەی ئەبو موعاوییەدا سەعیدی کوڕی جوبەیر دەفەرموێ: بە ئیبنو عەباس گوترا: مەبەستی چی بوو لەم کۆکردنەوەیە؟ فەرمووی: مەبەستی ئەوە بووە کە ئۆمەتی، تووشی ناڕەحەتی نەکا. {تاج/١، زنجیرە: ٤٩، ژمارە: ٣٧٠}.

**روونکردنەوە:**

١. ئەم فەرموودەیە لە صەحیحی موسلیما، ئەم دوو رشتەیەی هەیە:

أ- ئيمامی موسليم له ئەبوبەكری كوڕی ئەبو شەيبەوەو لە ئەبو كوڕەيبەوە، ئەم دوانەيش له ئەبو موعاوييەوە.

ب- ئيمامی موسليم لە ئەبو كوڕەيبو لە ئەبو سەعيدی ئەشەججەوە، ئەم دوانەيش له وەكيعەوە.

موعاوييەو وەكيش هەردوكيان: لە ئەعمەشەوە، لە حەبيبی كوڕی ئەبو ثابيتەوە، له سەعيدی كوڕی جوبەيرەوە، له ئيبنو عەباسەوە.

جا ئەبو موعاوييەو وەكيع بەشی يەكەمی فەرموودەكەيان وەك يەك گێڕاوەتەوە، بەڵام بەشی دووەمی فەرموودەكە كەمێ بە جياوازييەوە گێڕاوەتەوە، وەك لە پێشەوە رۆيشت.

٢. شێوانو بەيانی كورت ناكرێنەوە، نوێژی بەيانی كۆناكرێتەوە.

٣. نەوەوی لە شەرحی ئەم فەرموودەيەدا دەفەرموێ: كۆمەڵێ لە پێشەوايانی ئايين، دەفەرموون: نوێژ كۆكردنەوە بۆ نيشتەجێ، بەبێ مەهانە ناوبراوەكانيش، وەك بارانو سەفەرو نەخۆشی، دروستە، لەبەر هەندێ كاری پێويست بەڵام بەمەرجێ نەيكەيت بە عادەتو پيشەی هەميشە.

### ٣٣٢) نوێژكردن لە جێگەو شوێنی نوێژكار لەكاتی بارانا (١٥٩٨ - ١٦٠٧).

### باب: الصَّلَاةُ فِي الرِّحَالِ فِي الْمَطَرِ

٤٤٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّهُ عنهما): أَنَّهُ نَادَى بِالصَّلَاةِ فِي لَيْلَةٍ ذَاتِ بَرْدٍ وَرِيحٍ وَمَطَرٍ، فَقَالَ فِي آخِرِ نِدَائِهِ: أَلاَ صَلُّوا فِي رِحَالِكُمْ، أَلاَ صَلُّوا فِي الرِّحَالِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَأْمُرُ الْمُؤَذِّنَ إِذَا كَانَتْ لَيْلَةٌ بَارِدَةٌ أَوْ ذَاتُ مَطَرٍ فِي السَّفَرِ أَنْ يَقُولَ: (أَلاَ صَلُّوا فِي رِحَالِكُمْ). {الحديث/١٥٩٩ = ١٥٦٥ ف.م. تجريد/١، لاپەڕە: ٣٥٩، رقم: ٣٦٣ = ٦٣٢، ٦٦٦}:

نافيع فەرمووی: شەوێ سەرماو سۆڵەو باران بوو، ئيبنو عومەر (رەزای خودايان لێ بێ) بانگی دا بۆ نوێژ، بەڵام لەپاش تەواوبوونی بانگەكە، فەرمووی: (ئاگاداربن، مەيەن

بۆ جەماعەت، لەبەر ئەم سەرماو سۆڵەیە، بەڵکوو هەر لەماڵو شوێنی خۆتان نوێژ بکەن).

لەپاشا فەرمووی: من ئەمەم لە خۆمەوە نەکرد، جاران لە سەفەردا، ئەگەر شەوێ سەرماو باران بووایە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە بانگدەرەکەی دەفەرموو کە لەپاش تەواو بوونی بانگەکە یەکسەر بڵێ: (ألاَ صَلُّوا فِی رِحَالِكُمْ = ئاگاداربن! مەیەن بۆ جەماعەت، بەڵکوو هەر لەبنەو بارەگاکانی خۆتان نوێژەکانتان بکەن). {تاج/١، زنجیرە: ١٢٤، ژمارە: ٧٥٢}.

**٣٣٣) نەکردنی نوێژی سوننەت لە سەفەردا.** (١٥٦٨ - ١٥٩٨).

**بابٌ: تَرْكُ التَّنَفُّلِ فِي السَّفَرِ**

٤٤١-عَنْ حَفْصِ بْنِ عَاصِمٍ قال: صَحِبْتُ ابْنَ عُمَرَ (رَضِىَ اللّهُ عنهما) فِی طَرِيقِ مَكَّةَ، فَصَلَّى لَنَا الظُّهْرَ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَقْبَلَ وَأَقْبَلْنَا مَعَهُ، حَتَّى جَاءَ رَحْلَهُ، وَجَلَسَ وَجَلَسْنَا مَعَهُ، فَحَانَتْ مِنْهُ الْتِفَاتَةٌ نَحْوَ حَيْثُ صَلَّى، فَرَأَى نَاسًا قِيَامًا، فَقَالَ: مَا يَصْنَعُ هَؤُلاَءِ؟ قُلْتُ: يُسَبِّحُونَ، قَالَ: لَوْ كُنْتُ مُسَبِّحًا لأَتْمَمْتُ صَلاَتِی، يَا ابْنَ أَخِی إِنِّی صَحِبْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِی السَّفَرِ، فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ حَتَّى قَبَضَهُ اللَّهُ، وَصَحِبْتُ أَبَا بَكْرٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ، حَتَّى قَبَضَهُ اللَّهُ، وَصَحِبْتُ عُمَرَ فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ، حَتَّى قَبَضَهُ اللَّهُ، ثُمَّ صَحِبْتُ عُثْمَانَ، فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ، حَتَّى قَبَضَهُ اللَّهُ، وَقَدْ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: (لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِی رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ). {الحديث/١٥٧٧ = ١٥٤٣ فم. تجريد/١/٥٣١ = ١١٠١، ١١٠٢}. {راجع رقم: ٤٣٧ - تقدَّم}:

حەفصی کوڕی عاصیم فەرمووی: لە سەفەرێکا، لە ڕێگەی مەککە، لە خزمەت ئیبنو عومەری مامەدا بووم، نوێژی نیوەڕۆی بە کۆمەڵی بۆکردین، ئەوجا ڕۆیشتەوە بۆ جێگەکەی خۆی، ئێمەیش دوای کەوتین هەتا گەیشتەوە ئەوێ، لەوێ دانیشتو ئێمەیش لە خزمەتیدا دانیشتین، وا ڕێکەوت ئاوڕێکی بەرەو لای جێگە نوێژەکەی دایەوە، کۆمەڵێکی بینی بەپێوە ڕاوەستابوون، فەرمووی: ئەوانە چی دەکەن؟ منیش گوتم: نوێژی سوننەتی پاش نوێژی نیوەڕۆ دەکەن! کەچی مامەم

فەرمووی: (جا ئەگەر من شتی وابکەم، ئەوەم پێ باشترە کە نوێژە فەرزەکە بەتەواوی بکەم).

ئەوجا بۆ پاساودانەوەی باشی چۆنێتیی نوێژەکەی خۆی کە لە سەفەردا، بەو شێوەیە بکرێ کە ئەوکردی، فەرمووی: ئەی برازای شیرینم! لە سەفەردا هاوڕایی پێغەمبەرم کردووە، هەتا ئەو ڕۆژەی خودا بردیەوە بۆلای خۆی، لە دوو ڕکات زیاتری نەکردووە، لەپاش ئەویش هاوڕایی ئەبوبەکرم کردووە، لە سەفەرا، لە سەردەمی جێنشینی خۆیدا ئەویش هەروا، هەروا عومەریش لەسەردەمی جێنشینیی خۆیدا، هەروا عوثمانیش لەسەردەمی جێنشینیی خۆیدا، ئەم چوار زاتە لەسەردەمی خۆیانا، لەسەفەردا، هاوڕێتیم کردوون، هیچیان لە دوو ڕکات زیاتری نەکردووە!، دەی خودایش سەبارەت بە پەیڕەویی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ - أحزاب/٢١). واتە: پێغەمبەری خودا، سەرمەشقێکی جوانە بۆ ئێوە، لەهەموو کارێکا، کە مەودای پەیڕەویی هەبێ، بیکەن بە پێشەوا بۆ خۆتانو پەیڕەوی بکەن!). {بڕوانە: تاج/١/٤٣٧، زنجیرە: ١٥٧، ژمارە: ٨٩٧}.

## ٣٣٤) لە سەفەردا، نوێژی سوننەت بەسواری وڵاخ دروستە. (١٦٠٨ - ١٦١٨).

## باب: التَّنَفُّلُ بِالصَّلاَةِ عَلَى الرَّاحِلَةِ فِي السَّفَرِ

٤٤٢- عَنْ ابْنِ عُمَرِ (رَضِيَ اللَّهُ عنهما) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُسَبِّحُ عَلَى الرَّاحِلَةِ، قِبَلَ أَيِّ وَجْهٍ تَوَجَّهَ، وَيُوتِرُ عَلَيْهَا غَيْرَ أَنَّهُ لاَ يُصَلِّي عَلَيْهَا الْمَكْتُوبَةَ). {الحديث/١٦١٦ = ١٥٨٢ فم. تجريد/١/٤٨٨، رقم: ٥١٤ = ٩٩٩، ١٠٠٠، ١٠٩٥، ١٠٩٦، ١٠٩٨، ١١٠٥}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەسواری وڵاخ نوێژی سوننەتو نوێژی وەتری بەسەر پشتی وڵاخەوە دەکرد، بەرەو هەر لایێ بوایە، بەمەرجێ ڕووی لە جێگەی مەبەست بوایە، بەڵام نوێژی فەرزی بەسەر پشتی وڵاخەوە نەدەکرد). {تاج/١/٢٠٣، ژمارە: ٣٩٣، ٣٩٤، ٣٩٥، زنجیرە: ٥٤}.

**٣٣٥) وا سوننەتە کە ڕێبوار کە گەیشتەجێ لەپێشدا بچێ بۆ مزگەوت، لەوێ دوو ڕکات نوێژی هاتنەوە لە سەفەر لە مزگەوت بکات.** (١٦٥٤ - ١٦٥٦).

**باب: إذَا قَدِمَ مَنْ سَفَرٍ صَلَّى فِي المَسْجِدِ رَكْعَتَيْنِ**

٤٤٣- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِى غَزَاةٍ، فَأَبْطَأَ بِى جَمَلِى، وَأَعْيَى، ثُمَّ قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ قَبْلِى، وَقَدِمْتُ بِالْغَدَاةِ، فَجِئْتُ الْمَسْجِدَ، فَوَجَدْتُهُ عَلَى بَابِ الْمَسْجِدِ، فَقَالَ: « الآنَ حِينَ قَدِمْتَ؟». قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: « فَدَعْ جَمَلَك، وَادْخُلْ فَصَلِّ رَكْعَتَيْنِ ». قَالَ: فَدَخَلْتُ فَصَلَّيْتُ ثُمَّ رَجَعْتُ). {الحديث/١٦٥٥ = ١٦٢١ فم. تجريد/٣/٢٤، رقم: ٩٥١ = ٢٠٩٧، ٤٤٣، ١٨٠١، ٢٣٠٩، ٢٣٨٥، ٢٤٠٦، ٢٤٧٠، ٢٦٠٣، ٢٦٠٤، ٢٧١٨، ٢٨٦١، ٢٩٦٧، ٣٠٨٧، ٥٢٤٣، ٥٢٤٤، ٥٢٤٥، ٥٢٤٦، ٥٢٤٧، ٥٣٦٧، ٦٣٨٧. مسلم/١٦٥٣}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە غەزایەکا لە خزمەت پێغەمبەردا بووم، وشترەکەم لەژێرما وەستاو لە سوپاکە بەجێمام. پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەپێش مندا گەیشتەوە مەدینە، منیش سەر لەبەیانی گەیشتمەوە مەدینەو چووم بۆ مزگەوت، روانیم کەوا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) وا لەبەردەرگای مزگەوتا، فەرمووی: (ئەوە ئێستا گەیشتووی؟) گوتم: بەڵێ، فەرمووی: (دە وشترەکەت بەردەو بچۆرە ناو مزگەوتو دوو ڕکات نوێژی گەڕانەوە لەسەفەر لەناو مزگەوتدا بکە). منیش چوومە ژوورەوەو دوو ڕکات نوێژەم کردو گەڕامەوە بۆلای). {ریاض/٣/٣٨، زنجیرە: ١٧٨، ژمارە: ١ + ریاض/١، زنجیرە: ٢، لاپەڕە: ٢٨، ژمارە: ٢١/٩ + تاج/٢، ژمارە: ٢٠٥٣ + ژمارە: ٣٤٨٢، زنجیرە: ٥١ بەرگی/٣} + {تاج/١، لاپەڕە: ٣٤٢، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٧٠٦ هەتا ٧٢٧}.

**٣٣٦) باسی: نوێژی ترس.** (١٩٣٩ - ١٩٤٧).

**باب: ماجاء في صَلاَةِ الخَوْف**

{بڕوانە: تاج/١، زنجیرە: ١٥٢ هەتا زنجیرە: ١٥٥ لە ژمارە: ٨٨٤ هەتا ژمارە: ٨٨٨} + {فیقهی ئاسان. زنجیرە: ١٠٠، لاپەڕە: ٢٧٩ - ٢٨١}.

٤٤٤- عَنْ جَابِرِ بْنِ عبدالله (رَضِيَ اللّهُ عنهما) قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَوْمًا مِنْ جُهَيْنَةَ، فَقَاتَلُونَا قِتَالاً شَدِيدًا، فَلَمَّا صَلَّيْنَا الظُّهْرَ، قَالَ الْمُشْرِكُونَ: لَوْ مِلْنَا عَلَيْهِمْ مَيْلَةً لاَقْتَطَعْنَاهُمْ. فَأَخْبَرَ جِبْرِيلُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَلِكَ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: وَقَالُوا إِنَّهُ سَتَأْتِيهِمْ صَلاَةٌ هِيَ أَحَبُّ إِلَيْهِمْ مِنَ الأَوْلاَدِ. فَلَمَّا حَضَرَتِ الْعَصْرُ، صَفَّنَا صَفَّيْنِ، وَالْمُشْرِكُونَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ. قَالَ: فَكَبَّرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَكَبَّرْنَا، وَرَكَعَ فَرَكَعْنَا، ثُمَّ سَجَدَ وَسَجَدَ مَعَهُ الصَّفُّ الأَوَّلُ فَلَمَّا قَامُوا سَجَدَ الصَّفُّ الثَّانِي، ثُمَّ تَأَخَّرَ الصَّفُّ الأَوَّلُ، وَتَقَدَّمَ الصَّفُّ الثَّانِي، فَقَامُوا مَقَامَ الأَوَّلِ، فَكَبَّرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَكَبَّرْنَا، وَرَكَعَ فَرَكَعْنَا ثُمَّ سَجَدَ، وَسَجَدَ مَعَهُ الصَّفُّ الأَوَّلُ، وَقَامَ الثَّانِي، فَلَمَّا سَجَدَ الصَّفُّ الثَّانِي، ثُمَّ جَلَسُوا جَمِيعًا سَلَّمَ عَلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

قَالَ أَبُو الزُّبَيْرِ: ثُمَّ خَصَّ جَابِرٌ أَنْ قَالَ: كَمَا يُصَلِّي أُمَرَاؤُكُمْ هَؤُلاَءِ). {الحديث/١٩٤٣ = ١٩١٦ فَتْحُ الْمُلْهِمِ. تجريد/٤، لاپەڕە: ٢٩٤، رقم: ١٥٥٤ = ٤١٢٥، ٤١٢٦، ٤١٢٧، ٤١٣٠، ٤١٣٧ + بەرگی/١، لاپەڕە: ٤٧٣، ژمارە: ٤٩٦ تجرید = ٩٤٢، ٩٤٣ فتح الباری}:

جابیری كوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: جارێ لە خزمەت پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرەو نەجد، ڕۆیشتین بۆ غەزای هۆزێ لە جوهەینە، كە ئەو غەزایە غەزای زاتوریقاع بوو، بوو بە شەڕێكی قورسمان، جا كاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرنوێژیی نوێژی نیوەڕۆی كرد بۆمان، هاوبەش پەیداكەرەكان (واتە: موشریكەكان) گوتیان: ئەگەر ئەمجارە ئاوا بێ ئاگابوون لە چەك و تفاقیان، یەك هەڵمەتیان دەبەینە سەر، لە ڕەگ و ڕیشە دەریان دەهێنین و بنەبڕیان دەكەین!

جا جوبرائیل (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم هەواڵەی ڕاگەیاند بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ). پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەمەی بۆمان باس كرد، جابیر فەرمووی: هەروا هاوبەش پەیداكەرەكان گوتبوویان: (ئەمانەی كەوان لەگەڵ موحەممەددا، ئەم نوێژەی كەوا دێت، كە نوێژی ئەم عەصرەیانە، لە ماڵ و منداڵیان خۆشتر دەوێ، كەواتە: فرسەتە، با لەوكاتەدا پەلاماریان بدەین و قەڵاچۆیان بكەین. كاتێ نوێژ

بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کردینی بە دوو ریز، لەکاتی نوێژەکەدا، هاوبەش پەیداکەرەکانی دوشمنمان، لە رووی رووگەوە بوون، لە بەینی ئێمەو رووگەدا بوون، فەرمووی: جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی بە گوتنی ئەللاهو ئەکبەری تەحەررووم، بەرنوێژیی دابەست بۆمان، ئێمەیش هەمووومان، هەردوو ریزەکە لەدوا ئەو یەکسەر بە گوتنی ئەللاهو ئەکبەر، نوێژی کۆمەڵمان لە پشتیەوە دابەست، لەپاش قورئان خوێندن پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چەمینەوەی رکاتی یەکەمی برد، ئێمەیش هەردوو ریزەکە لەگەڵیا چەمینەوەمان ئەنجامدا، بەڵام کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کوڕنووشی برد، بەس ریزی یەکەم لە گەڵیا کوڕنووشی برد، کاتێ ریزی یەکەم هەڵسانەوە.

ئاوا نوێژمان بەکۆمەڵ دابەستو ئاوا نوێژی عەصرمان بەم شێوەیە بە دوو رکات کرد: لەپێشا پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) بەگوتنی ئەللاهو ئەکبەر نوێژی دابەست، ئێمەیش هەمووومان هەردوو ریزەکەمان، بەگوتنی ئەللاهو ئەکبەر نوێژی جەماعەتی عەصرمان لە پشتیەوە دابەست، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش خوێندنی قورئانی رکاتی یەکەم، چوو بۆ چەمینەوە (بۆ روکوع) ئێمەیش هەمووومان لەگەڵیا، چووین بۆ چەمینەوە، ئەوجا سەری لە چەمینەوە بەرز کردەوە، ئێمەش سەرمان بەرزکردەوە، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی چوو کوڕنووشی برد، ریزی یەکەم کە یەکسەر لە پشتیەوە بوون، ئەوانیش لەگەڵیا چوون بۆ کوڕنووشو لەگەڵیدا دوو کوڕنووشیان برد، جا کە پێغەمبەرو ئەو ریزەی کە لەگەڵیدا کوڕنووشیان برد، هەڵسانەوە سەرپێ، ریزی دووەم دانەوین: دوو کوڕنووشیان برد، ئەوجا ئەوانیش هەڵسانەوە سەرپێ، ئەوجا جێ گۆڕکێیان کرد، ریزی یەکەم چوونە دواوەو ریزی دووەم هاتنە پێشەوەو لە جێگەی ریزی یەکەم راوەستانو ئەوان بوون بەریزی یەکەم، جا لەپاش خوێندنی قورئانی وەستانی دووەم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەللاهو ئەکبەری کردو چوو بۆ چەمینەوەی دووەم، ئێمەیش هەمووومان هەردوو ریزەکە لەگەڵیدا چەمینەوەمان ئەنجامدا ئەوجا هەڵساینەوە سەرپێ، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دانەوییەوە بۆ

کوڕنووشەکانی رکاتی دووەمو دوو کوڕنووشی برد، ئەو ریزەی کە لەپێشەوە بوون، کە لەسەرەتای نوێژەکەوە ریزی دووەم بوونو ئێستا بوون بەڕیزی یەکەم، ئەوانیش لەگەڵ پێغەمبەردا دوو کوڕنووشیان برد، ریزی دووەمیش کە لەسەرەتاوە ریزی یەکەم بوون ئەوان بەپێوە راوەستان، هەتا پێغەمبەرو ریەکەی کە لە پشتیەوە بوون دوو کوڕنووشەکانیان تەواوکردو دانیشتن، ئەوسا ئەوانیش دانەوینو سەرو دوو کوڕنووشیان بردو هەموو دانیشتنو ئەوجا هەموومان بە دانیشتنەوە تەحیاتمان خوێندو ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سلاّوی دایەوە، ئێمەیش سلاوومان دایەوە.

ئەبو زوبەیر، کە ئەم فەرموودەیە لە جابیرەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: (ئەوجا جابیر بەم لێچوانە تایبەتو روونتری کردەوە کە فەرمووی: (رێك وەك ئەم نوێژی ترسەی کە ئێستا میرو فەرمانڕەواکانتان بۆتانی دەکەن).

## ٣٣٧) باسی نوێژی خۆرگیرانو مانگ گیران (٢٠٨٦ - ٢١١٩)
## باب: صَلاَةُ الْكُسُوفِ

٤٤٥- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: خَسَفَتِ الشَّمْسُ فِى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يُصَلِّى، فَأَطَالَ الْقِيَامَ جِدًّا، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ جِدًّا، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَأَطَالَ الْقِيَامَ جِدًّا، وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ جِدًّا، وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ قَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَقَامَ، فَأَطَالَ الْقِيَامَ، وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ سَجَدَ ثُمَّ انْصَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَقَدْ تَجَلَّتِ الشَّمْسُ، فَخَطَبَ النَّاسَ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: « إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، وَإِنَّهُمَا لاَ يَنْخَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ، وَلاَ لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمَا فَكَبِّرُوا، وَادْعُوا اللَّهَ، وَصَلُّوا، وَتَصَدَّقُوا، يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، إِنْ مِنْ أَحَدٍ أَغْيَرَ مِنَ اللَّهِ أَنْ يَزْنِىَ عَبْدُهُ، أَوْ تَزْنِىَ أَمَتُهُ، يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ وَاللَّهِ لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ، لَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا، وَلَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً، أَلاَ هَلْ بَلَّغْتُ ». {الحديث: ٢٠٨٦ = ٢٠٦٠ فـم. تجريد/١/٥٠٧، ژمارە: ٥٣١ = ١٠٤٤، ١٠٤٦، ١٠٤٧، ١٠٥٠، ١٠٥٦،

١٠٥٨، ١٠٦٤، ١٠٦٥، ١٠٦٦، ١٢١٢، ٣٢٠٣، ٤٦٢٤، ٥٢٢١، ٣١٦٦، ٣٢٠٣، ٤٦٢٤، ٥٢٢١، ٦٦٣١}:

عائیشه (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: لەسەردەمی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەر بێ) رۆژگیرا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسا نوێژی خۆرگیرانی بۆ موسوڵمانەکان لەسەر ئەم شێوەیە کرد، ماوەیەکی زۆر دوورو درێژ، لەناو نوێژەکەدا، بەڕاوەستانەوە هەر قورئانی دەخوێند، ئینجا چەمییەوەو روکوعی بردو درێژەی دا بەویردی ناو چەمینەوەکەشی، ئینجا لە چەمینەوە (روکووع) هەڵسایەوەو گەلێ بەپێوە راوەستایەوەو ویردی خوێند، بەڵام لە راوەستانی یەکەمی کەمتر، ئینجا دووبارە چەمینەوەیەکی دوورو درێژی تریشی بردەوە، بەڵام لە چەمینەوەی یەکەمی کورتتر بوو، ئەوجا سەری هەڵبڕی‌و رێك راوەستا، ئینجا دوو کوڕنووشی دوورو درێژی برد، لە چەشنی دوو روکووعەکەی، یەکەم وەك یەکەم‌و دووەم وەك دووەم، ئەنجا هەڵسایەوە سەرپێ‌و چی کرد لەرکاتی یەکەما، لەرکاتی دووهەمیشدا ئەوەی کردەوە، بەڵام جار لەگەڵ جاردا، قورئان خوێندنی ناو راوەستانەکان‌و وێردی ناو ئیعتیدال‌و ناو چەمینەوەو کوڕنووشەکانی کەم دەکردەوە، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنوێژ بۆوەو خۆریش بەربوو بوو، ئینجا وتارێکی دا، بۆ مەردوومەکەو سوپاس‌و ستایشی خودای کردو ئەوجا فەرمووی: (ئەم خۆرو مانگە دوو نیشانەی گەورەن لەنیشانە گەورەکانی خودا، نە لەبەر مردنی کەس‌و نە لەبەر ژیانی کەس ناگیرێن، جا ئەگەر شتی واتان دی ئەوا لەخودا بپاڕێنەوەو ئەڵڵاهو ئەکبەر بکەن‌و نوێژ بکەن‌و خێرو خێرات بکەن). لەپاشا فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەی گەلی موحەممەد! ئەی ئۆمەتی ئیسلام! سوێندم بەخودا، کەس وەك خودا ئاوا خێرەت‌و دەمار نایگرێ، کاتێ کەبەندەیەکی داوێنپیسی بکا، یا کەنیزێکی شەروالپیسی بکا، ئەی ئۆمەتی موحەممەد! بەو تاقە خودایە، ئەوەی کە من دەیزانم، لە هەواڵ‌و کێشەو بەرەو ئێش‌و ئازاری گۆڕو قیامەت، ئەگەر ئێوە بیزانن، گەلێ زۆر دەگریان‌و زۆر کەم پێ دەکەنین، دەی ئێوە بەشایەت بن، کەوا من ئەرکی سەرشانی خۆمم

بەجێهێنا، لەبارەی راگەیاندنی پەیامی ئیسلام، بەو خەڵکە!). {تاج/١، زنجیرە: ١٦٦، ژمارە: ٩٢١. چ/٤} {تەجرید/٥١١/١، ژمارە: ٥٣٤ = ١٠٥٢}.

٤٤٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حِينَ كَسَفَتِ الشَّمْسُ ثَمَانِي رَكَعَاتٍ فِى أَرْبَعِ سَجَدَاتٍ. {الحديث: ٢١٠٨ = ٢٠٨٣فم}:

ئیبنو عەباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی خۆرگیرانەکەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم شێوەیە نوێژی خۆرگیرانی کرد، بەهەشت روکوعو چوار کورنووش).

## ٣٣٨) نوێژە بارانە. (٢٠٦٧ - ٢٠٨٥)
## بَابٌ: فِي صَلَاةِ الإِسْتِسْقَاءِ

(تەجرید/٤٩١/١ ژمارە: ٥١٦ هەتا ژمارە: ٥٢٤ + تاج/٤٥٧/١، زنجیرە: ١٧٣ — ١٧٥، ژمارە: ٩٣٥ — ٩٤٣ + فیقهی ئاسان/٢٧١/١، زنجیرە: ٩٩).

٤٤٧- عَنْ عبدِاللّه بْنِ زَيْدٍ الأَنْصَارِيّ (رضى الله عنه) أَنَّ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) خَرَجَ إِلَى الْمُصَلَّى يَسْتَسْقِى، وَأَنَّهُ لَمَّا أَرَادَ أَنْ يَدْعُوَ إِسْتَقْبَلَ وَحَوَّلَ رِدَاءَهُ. وَفِي رِوَايَةٍ: فَجَعَلَ إِلَى النَّاسِ ظَهْرَهُ يَدْعُو اللَّهَ، وَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، القِبْلَةَ وَحَوَّلَ رِدَاءَهُ ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ). {الحديث: ٢٠٦٩، ٢٠٧٠ = ٢٠٤٣، ٢٠٤٤ فم. تجريد/١/٤٩١ رقم: ٥١٦ = ١٠٠٥، ١٠١١، ١٠١٢، ١٠٢٣، ١٠٢٤، ١٠٢٥، ١٠٢٦، ١٠٢٧، ١٠٢٨، ٦٣٣٤}:

عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی ئەنصاری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەو رۆژەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەرچوو بۆ نوێژگاکە، بۆ نوێژە بارانە، بۆ خۆم دیتم لەکاتی وتار خوێندنەکەیدا، کە دەستی کرد بەنزاکردن، پشتی کردە خەڵکەکەو، رووی کردە رووگەو، دەستی کرد بە پاڕانەوەو نزاکردن، لەپاشا پۆشاکەکەی هەڵسوڕاند، واتە: راستو چەپی کرد، ئەوجا دوو رکات نوێژی نوێژە بارانەی بە جەماعەت بۆکردین، قورئانی بەدەنگی بەرز لەناویانا خوێند، وەك نوێژی جەهری). {تاج/١، زنجیرە: ١٧٣، ژمارە: ٩٣٧}.

٤٤٨- عَنْ أَنَسٍ (رضى الله عنه) قَالَ: أَصَابَنَا وَنَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مَطَرٌ، قَالَ: فَحَسَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) ثَوْبَهُ، حَتَّى أَصَابَهُ مِنَ الْمَطَرِ،

فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ لِمَ صَنَعْتَ هَذَا؟ قَالَ: « لأَنَّهُ حَدِيثُ عَهْدٍ بِرَبِّهِ». {الحديث: ٢٠٨٠ = ٢٠٥٤فم}:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەخزمەتی پێغەمبەردا بووین (دروودی خودای لەسەر بێ) باران باری، پێغەمبەر (درووَدی خودای لەسەر بێ) جلەكانی خۆی هەڵماڵیو سەری خۆی قۆت كردو قۆڵو لاقی خۆی رووت كردو خۆی دایە بەر بارانەكە، ئێمەش گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆچی وادەكەیو رازی ئەمە چییە؟ فەرمووی: (چونكە ئەم بارانە تازە لەلای پەروەردگاری گەورەوە هاتووە، لەبەرئەوە مووفەڕكەو خۆی پێ پیرۆز دەكرێ!!). {تاج/١، زنجیرە: ١٧٧، ژمارە: ٩٤٨}.

## ٣٣٩) پەناگرتن بەخوا لەكاتی بینینی باو هەورداو پێخۆشبوونی بارینی باران
## باب: فِي التَّعَوُّذِ عِنْدَ رُؤْيَةِ الرِّيحِ وَالغَيْمِ، والفَرَحُ بِالمَطَرِ

٤٤٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها) أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) إِذَا عَصَفَتِ الرِّيحُ قَالَ: « اللَّهُمَّ إِنِّى أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا، وَخَيْرَ مَا فِيهَا، وَخَيْرَ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ مَا فِيهَا، وَشَرِّ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ ». قَالَتْ: وَإِذَا تَخَيَّلَتِ السَّمَاءُ، تَغَيَّرَ لَوْنُهُ، وَخَرَجَ وَدَخَلَ، وَأَقْبَلَ وَأَدْبَرَ، فَإِذَا مَطَرَتْ سُرِّيَ عَنْهُ، فَعَرَفْتُ ذَلِكَ فِى وَجْهِهِ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: « لَعَلَّهُ يَا عَائِشَةُ كَمَا قَالَ قَوْمُ عَادٍ (فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا: هَذَا عَارِضٌ مُمْطِرُنَا). {الحديث: ٢٠٨٢ = ٢٠٥٦فم + تاج/١، زنجيره: ١٧٦، ژماره: ٩٤٧، تجريد/٣/٤٢٤، ژماره: ١٢٩٣ = ٣٢٠٦، ٤٨٢٩}:

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) فەرمووی: جاران كە بای توند، هەڵی دەكرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: {اللَّهُمَّ إِنِّى أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا وَخَيْرَ مَا فِيهَا وَخَيْرَ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ مَا فِيهَا وَشَرِّ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ} واتە:

ئەی خودایە! داوات لێ دەكەم كە بەشم بدەی لەخێرو سوودی ئەم بایە خۆی، وە هەروەها لەو خێرو سوودەیش كە لەناو ئەم بایەدا هەیە، وە هەروەها لەو خێرو سوودەیش كە ئەم بایەی بۆ رەوانەكراوە، وە پەنادەگرم بەتۆ لە شەڕی ئەم بایە خۆی. وە هەروەها لەو شەڕەیش كە لەناو ئەم بایەدا هەیە، وە هەروەها لەو

شەڕەیش کە ئەم بایەی بۆ ڕەوانە کراوە، عائیشە دەیفەرموو: کە بەری ئاسمان لێڵ دەبوو، ڕەنگی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەگۆڕاو دەچووە دەرەوەو دەهاتە ژوورەوەو دەهاتو دەچوو، جا کاتێ کە دەباری، ئیتر حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فەرامۆشی بۆ دەهات، منیش کە شارەزای ئەم حاڵەی بووم، لەم بارەیەوە پرسیارم لێی کرد، فەرمووی: (ئەی عائیشە! مەترسی ئەوەم هەیە، کە ئەو هەورو هەڵایە، وەك ڕۆژەکەی گەلی عاد وابێ، کە ئەوان بەتەمای باران بوون کە هەورەکەیان دی، کەچی بوو بەهەوری تۆڵەو سزا، وەك خودا لە قورئانا دەفەرموێ: {فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا: هَذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا بَلْ هُوَ مَا اسْتَعْجَلْتُم بِهِ: رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ – ٤٦/٢٤}:

واتە: جا کاتێ هۆزی عاد، کە دییان وا پەڵە هەورێ لە ئاسۆی ئاسمانەوە بەرەو ئەوان دەکشێ، گوتیان: ئەمە هەوری بارانە. بارانمان بۆ دەبارێنێ! نەخەیر! هەور نییە، بەڵکوو ئەوە ئەو تۆڵەو سزایەیە کە ئێوە پەلەپەلتان بوو بۆ هاتنی، واهات بۆتان، ئەوە بایەكو شەپۆلە هەوایەکی ئاسمانییە سزایەکی سەختی پڕ ئێشو ئازاری واتیادایە بۆتان).

## ٣٤٠) باسی بای شەماڵو بای ڕەشەبا
## بابٌ: فِي رِيحِ الصَّبَا وَالدَّبُورِ

٤٥٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) عَنِ النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهُ قَالَ: « نُصِرْتُ بِالصَّبَا، وَأُهْلِكَتْ عَادٌ بِالدَّبُورِ ». {الحديث: ٢٠٨٤ = ٢٠٥٨فم. تجريد/١/٤٩٩، رقم: ٥٢٦ = ١٠٣٥، ٣٢٠٥، ٣٣٤٣، ٤١٠٥}:

ئیبنو عەباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەری خودا، (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خودای گەورە بەهۆی بای صەباوە، لەغەزای خەندەقدا، سەرکەوتنی بەمن بەخشیو گەلەکۆمەی قوڕەیش لەدژی ئیسلامی تەفرو توونا کرد، وە هۆزی عادیشی بەبای ڕەشەبا فەوتان).



# نامەی تەرم (جەنازە)

(فیقهی ئاسان/١، لاپەڕە: ٢٨٤ هەتا ٣١١ = زنجیرە: ١٠٢ هەتا زنجیرە: ١١٢).

## كِتَابُ الجَنَائِزِ

(بڕوانە: تەجرید/٢١/٢ ژمارە: ٥٩٨ هەتا ٦٦٥ + (تاج/١، ژمارە: ١٠٠٨ - ١١٧٤).

### ٤٣١) باسی سەرلێدانی نەخۆش.

(٢١٢٠ - ٢١٦٣) + (ریاض/٢، لاپەڕە: ٣٣٧، زنجیرە: ١٤٤، ژمارە: ٨٩٤ هەتا ٩٥١).

**بَابٌ: فِي عِيَادَةِ المَرْضَى**

٤٥١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) أَنَّهُ قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِذْ جَاءَهُ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِ ثُمَّ أَدْبَرَ الأَنْصَارِيُّ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « يَا أَخَا الأَنْصَارِ كَيْفَ أَخِي سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ؟». فَقَالَ: صَالِحٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ يَعُودُهُ مِنْكُمْ؟». فَقَامَ وَقُمْنَا مَعَهُ وَنَحْنُ بِضْعَةَ عَشَرَ، مَا عَلَيْنَا نِعَالٌ وَلاَ خِفَافٌ وَلاَ قَلاَنِسُ وَلاَ قُمُصٌ، نَمْشِي فِي تِلْكَ السِّبَاخِ، حَتَّى جِئْنَاهُ. فَاسْتَأْخَرَ قَوْمُهُ مِنْ حَوْلِهِ، حَتَّى دَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَأَصْحَابُهُ الَّذِينَ مَعَهُ. {الحديث: ٢١٣٥ = ٢١٠٩ فم. تجريد/١/٥٢، رقم: ٦٢٧ = ١٣٠٤ فتح الباری}:

عەبدوڵلای كوڕی عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەخزمەت پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) دانیشتبووین، لەوكاتەدا پیاوێ لە كۆمەڵەی یاریدەدەران كە ناسراون بە (أنصار) هاتە خزمەتی، سڵاوی لە پێغەمبەر كردو ویستی بڕوا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ئەی برای ئەنصاری! سەعدی كوڕی عوبادەی برام چۆنە؟) پیاوەكە فەرمووی: (باشە). پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سەعد نەخۆشە، كێ دەیەوێ كە بچین بۆ سەرلێدانو هەواڵپرسینی؟).

جا حەزرەت خۆی هەڵساو ئێمەیش هەڵساین‌و لە خزمەتیدا رۆیشتین بۆلای سەعد، دەوری دەپازدە کەسێ دەبووین، هەموو پێخاوس بووین، نە پێڵاومان لەپێ بوو، تەنانەت سۆلیشمان لەپێ نەبوو، کڵاوو کراسیشمان لەبەرنەبوو، تەواو رەش‌و رووت‌و رجاڵ بووین، بەو شۆرەکاتەدا، بەپێی پەتی ملی رێمان گرتبوو، هەتا چووینە ئەوێ، خزمانی خۆی دەوریان چۆڵ کرد، بۆ ئێمە، جا ئێمەیش لەگەڵ پێغەمبەردا چووینە پێشەوە بۆلای). {تاج/١، ژمارە: ١٠٣٦، زنجیرە: ١٩٧ + ریاض/٢، لاپەڕە: ٣٥٥، زنجیرە: ١٥٣، ژمارە: ٩٢٥}.

## ٣٤٢) چی لەلای نەخۆش‌و مردوو دەگوترێ
## بَابُ: مَايُقَالُ عِنْدَ الْمَرِيضِ وَالْمَيِّتِ

٤٥٢- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِذَا حَضَرْتُمُ الْمَرِيضَ أَوِ الْمَيِّتَ فَقُولُوا خَيْرًا، فَإِنَّ الْمَلاَئِكَةَ يُؤَمِّنُونَ عَلَى مَا تَقُولُونَ ». قَالَتْ: فَلَمَّا مَاتَ أَبُو سَلَمَةَ أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَبَا سَلَمَةَ قَدْ مَاتَ، قَالَ: « قُولِي: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَلَهُ، وَأَعْقِبْنِي مِنْهُ عُقْبَى حَسَنَةً ». قَالَتْ: فَقُلْتُ، فَأَعْقَبَنِي اللَّهُ مَنْ هُوَ خَيْرٌ لِي مِنْهُ مُحَمَّدًا (صلى الله عليه وسلم). {الحديث: ٢١٢٦ = ٢١٠٠ فم}:

ئوممو سەلەمە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ دەچن بۆلای نەخۆش‌و ئەوکەسانەی کە لەگیانەلادان، قسەی باش بکەن‌و قسەی خراپ مەکەن، چونکە ئێوە هەرچی بڵێن لەوکاتەدا، فریشتەکان ئامینی لەسەر دەکەن! ئوممو سەلەمە فەرمووی: جا کە ئەبو سەلەمەی مێردم مردو ئەمری هەقی بەجێ هێنا چوومە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەبو سەلەمە مرد. فەرمووی: بڵێ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَلَهُ وَأَعْقِبْنِي مِنْهُ عُقْبَى حَسَنَةً».

ئەی خودایە! لەمنیش‌و لەویش خۆشبەو تۆڵەیەکی باشم بۆ بکەرەوە، فەرمووی: منیش وام گوت، ئەوەبوو خودا لەتۆڵەی ئەودا، موحەممەدی پێم داوە،

كە زۆر زۆر لە ئەبو سەلەمە باشترە بۆم (بۆ دینو دونیام). {تاج/١/٥٠٥، زنجیرە: ١٩٢، ژمارە: ١٠١٦}.

### ٣٤٣) (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) بدرێ بەگوێی ئەو کەسانەدا کەوان لەسەرە مەرگدا.

### باب: تَلْقِينُ الْمَوْتَى لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ

٤٥٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ (رضى الله عنه) قَال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لَقِّنُوا مَوْتَاكُمْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ». {الحديث: ٢١٢٠ = ٢٠٩٤ فم = فتح الملهم}:

ئەبو سەعیدی خودری (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو کەسانەتان کە لەسەرە مەرگدان (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)یان بدەن بەگوێداو ئەم وشە پیرۆزەیان لەوکاتە ناسکەدا یادبخەنەوەو لەبەر چاویان بیلێن، سا بەشکوو ئەوانیش چاو لەئێوە بکەنو بیلێنو بەر ئەو فەرموودە پیرۆزەیە بکەون کە دەفەرموێ: « مَنْ كَانَ آخِرُ كَلاَمِهِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ ». واتە: هەرکەسێ دوا گوتەی وشەی پیرۆزی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)بێ دەچێتە بەهەشت). {تاج/١/٥٠٥، زنجیرە: ١٩٢، ژمارە: ١٠١٤}.

### ٣٤٤) هەرکەسێ حەز بەدیداری خودا بکات، خودایش حەز بەدیداری ئەو دەکات.

(٦٧٦١ - ٦٧٦٩)

### باب: مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ

٤٥٤- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ، أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ، كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ ». فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، أَكَرَاهِيَةُ الْمَوْتِ؟ فَكُلُّنَا نَكْرَهُ الْمَوْتَ، قَالَ: « لَيْسَ كَذَلِك، وَلَكِنَّ الْمُؤْمِنَ إِذَا بُشِّرَ بِرَحْمَةِ اللَّهِ وَرِضْوَانِهِ وَجَنَّتِهِ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ، فَأَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَإِنَّ الْكَافِرَ إِذَا بُشِّرَ بِعَذَابِ اللَّهِ وَسَخَطِهِ، كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ وَكَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ». {الحديث: ٦٧٦٣ = ٦٧٧٨. تجريد/٥/٢٨٠، رقم: ٢٠٢٤ = ٦٥٠٧}:

وَفِي رِوَايَةٍ عَنْ شُرَيْحِ بْنِ هَانِئٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ ». قَالَ: فَأَتَيْتُ عَائِشَةَ. فَقُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَذْكُرُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَدِيثًا إِنْ كَانَ كَذَلِكَ، فَقَدْ هَلَكْنَا. فَقَالَتْ: إِنَّ الْهَالِكَ مَنْ هَلَكَ بِقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، وَمَا ذَاكَ؟ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ ». وَلَيْسَ مِنَّا أَحَدٌ إِلاَّ وَهُوَ يَكْرَهُ الْمَوْتَ، فَقَالَتْ: قَدْ قَالَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، وَلَيْسَ بِالَّذِي تَذْهَبُ إِلَيْهِ، وَلَكِنْ إِذَا شَخَصَ الْبَصَرُ، وَحَشْرَجَ الصَّدْرُ، وَاقْشَعَرَّ الْجِلْدُ، وَتَشَنَّجَتِ الأَصَابِعُ، فَعِنْدَ ذَلِكَ مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ).
{الحديث: ٦٧٦٧ = ٦٧٨٢ فم}:

**عائیشە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (هەرکەسێ حەز بەدیداری خوا بکا، خودایش حەز بەدیداری ئەو دەکا، وە هەرکەسێ حەز لە دیداری خودا نەکا، خودایش حەز لەدیدارو چارەی ئەو ناکا). عائیشە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: منیش عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆ ئەگەر مەبەست لەم حەز پێ نەکردنە حەز نەکردن بێ لەمردن، ئەوە کەسمان حەزمان لەمردن نییە، کەواتە حەزمان لە دیداری خودا نییەو خودایش حەزی لە دیداری ئێمە نییە؟ فەرمووی: (مەبەست ئەوە نییە کەتۆ تێی گەیشتوویت، بەڵام موسوڵمان لە سەرەمەرگا فریشتە مژدەی ڕەحمەتو سۆزو ڕەزامەندیی خودای دەدەنێ، لەگەڵ موژدەی شاد بوون بە بەهەشت، ئیتر ئەویش هیچی تری وەك ئەودنیا پێ خۆش نابێ، وە حەز لەدیداری خودا دەکاو خودایش حەز بەدیداری ئەو دەکا، کافرو بێ بڕواش کاتێ کە مردن قورتمی دەگرێو موژدەی سزاو تۆڵە لێسەندنو تووڕەیی خودای پێ دەدرێ، ئیتر هیچی تری وەك ئەودنیا پێ ناخۆش نابێ، وە حەز لە دیداری خودا ناکاو خودایش حەز بەدیداری ئەو ناکا. لەگێڕانەوەیەکا شورەیحی کوڕی هانی فەرمووی: ئەبو هورەیرە فەرمووی:**

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ حەز بەدیداری خوا بکا، خودایش حەز بەدیداری ئەو دەکا، وە هەرکەسێ حەز لە دیداری خودا نەکا، خودایش حەز لەدیدارو چارەی ئەو ناکا!).

ئەبو شورەیح فەرمووی: جا بەم بۆنەیەوە چووم بۆ خزمەتی عائیشە، عەرزیم کرد: ئەی دایکی باوەڕداران! فەرموودەیەکم لە ئەبو هورەیرەوە بیستووە، لە پێغەمبەرەوە دەیگێڕێتەوە، خۆ ئەگەر وابێ، هەموومان تیادەچین. عائیشە فەرمووی: لەڕاستیدا سەرتیاچوو ئەو کەسەیە، کە بەپێی فەرمایشتی پێغەمبەر سەری تیابچێ، ئادەی ئەو فەرموودەیە کامەیە؟ فەرمووی: ئەبو هورەیرە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ حەز بەدیداری خوا بکا، خودایش حەز بەدیداری ئەو دەکا، وە هەرکەسێ حەز لە دیداری خودا نەکا، خودایش حەز لەدیدارو چارەی ئەو ناکا). وەلحالْ کەسمان حەزمان لەمردن نییە، کە ئەوکاتو ساتەیە دەچینەوە بۆ دیداری خوداو دەگەڕێینەوە بۆلای، عائیشە فەرمووی: راستە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەمەی فەرمووە، بەڵام بەو مەعنایە نییە کە تۆ تێی گەیشتوویتو بۆی دەچیت! بەڵکوو مەبەست کاتی سەرە مەرگە، کە پاشە رۆژی مرۆڤو چارەنووسی، ئەگەر باش، ئەگەر خراپ روون دەبێتەوە، کە ئەوکاتەیە چاو ئەبڵەق دەبێ، سینگ دەژەنێ وەك مەشکەو هەناسە سواردەبێ، پێست مووچڕکەی پیادێو پەنجەکان کرژ دەبنەوە، جا ئا لەوکاتو ساتەدایە کە هەرکەسێ حەز بەدیداری خوا بکا، خودایش حەز بەدیداری ئەو دەکا، وە هەرکەسێ حەز لە دیداری خودا نەکا، خودایش حەز بەدیداری ئەو ناکا).

## ٣٤٥) گومانی باش بە خودای گەورە لەکاتی سەرەمەرگا پەسەندە

(٧١٥٤ - ٧١٥٧). (بابٌ: فِي حُسْنِ الظَّنِّ بِاللّهِ تَعَالى)

٤٥٥- عَنْ جَابِرٍ (رضى الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) قَبْلَ وَفَاتِهِ بِثَلاَثٍ يَقُولُ: « لاَ يَمُوتَنَّ أَحَدُكُمْ إِلاَّ وَهُوَ مُحْسِنُ بِاللَّهِ الظَّنَّ ». {الحديث: ٧١٥٨ = ٧١٨٥ فم} :

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (رەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: لە پێغەمبەرم بیست لەپێش مردنیا، بەسێ رۆژ، دەیفەرموو: (مەمرن تا ئومێدی باشتان قەوی دەبێ بە بەخشش‌و کەرەمی خودای گەورە!). {تاج/١/٥٠٣، زنجیرە: ١٩١، ژمارە: ١٠١٠، چاپی/ چوارەم}.

## ٣٤٦) چاو لێکنانی مردوو لەکاتی مردنداو نزای باش بۆی لەکاتی سەرەمەرگا (٢١٢٠ - ٢١٦٢)

## بابٌ: إغْمَاضُ المَيّتِ وَالدُّعَاءِ لَهُ إذَا حَضَرَ

٤٥٦- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَلَى أَبِى سَلَمَةَ وَقَدْ شَقَّ بَصَرُهُ فَأَغْمَضَهُ، ثُمَّ قَالَ: « إنَّ الرُّوحَ إِذَا قُبِضَ تَبِعَهُ الْبَصَرُ، فَضَجَّ نَاسٌ مِنْ أَهْلِهِ، فَقَالَ: « لاَ تَدْعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ إلاَّ بِخَيْرٍ، فَإِنَّ الْمَلاَئِكَةَ يُؤَمِّنُونَ عَلَى مَا تَقُولُونَ ». ثُمَّ قَالَ: « اللَّهُمَّ اغْفِرْ لأَبِى سَلَمَةَ، وَارْفَعْ دَرَجَتَهُ فِى الْمَهْدِيِّينَ، وَاخْلُفْهُ فِى عَقِبِهِ فِى الْغَابِرِينَ، وَاغْفِرْ لَنَا وَلَهُ يَا رَبَّ الْعَالَمِينَ، وَافْسَحْ لَهُ فِى قَبْرِهِ، وَنَوِّرْ لَهُ فِيهِ». {الحديث: ٢١٢٧ = ٢١٠٠ فم. تاج/١/٥٠٥، زنجيره: ١٩٢، چ/٤، ژماره: ١٠١٧}:

ئوم سەلەمە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆلای ئەبو سەلەمەی مێردم، ئەبو سەلەمە گیانی دەرچوو بوو، چاوی داچەقابوو، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چاوەکانی لێکنان‌و فەرمووی: (کاتێ گیان دەکێشرێ چاو شوێنی دەکەوێ، تا بزانێ بۆکوێ دەچێ).

جا لەم کاتەدا هەندێ لە کەس‌و کارەکەی کردیان بە قیژەو هەراو نزای خراپیان لەخۆیان کرد، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نزای باش بکەن، نزای خراپ لەخۆتان مەکەن، چونکە ئێوە هەرچی بڵێن فریشتە ئامینی لەسەر دەکەن).

ئینجا فەرمووی: « اللَّهُمَّ اغْفِرْ لأَبِى سَلَمَةَ وَارْفَعْ دَرَجَتَهُ فِى الْمَهْدِيِّينَ وَاخْلُفْهُ فِى عَقِبِهِ فِى الْغَابِرِينَ وَاغْفِرْ لَنَا وَلَهُ يَا رَبَّ الْعَالَمِينَ وَافْسَحْ لَهُ فِى قَبْرِهِ. وَنَوِّرْ لَهُ»:

واتە: ئەی خودایە! لە ئەبو سەلەمە خۆش بەوپلەوپایەی (لەناو ئەو کەسانەدا، کە خۆت ڕێگەی ڕاستت نیشان داون) بەرز بکەرەوە، وەخۆت سەرەوکاری ئەو کەس‌و کارەی بکە، کە لەپاشی بەجێماون، وە لە ئێمەش‌و لەویش بە میهرەبانی خۆت خۆشبە، ئەی پەروەردگاری جیهانیان! وە گۆڕەکەشی گوشاد کەو پڕیکە لەنوور بۆی). {ریاض/٢، لاپەڕە: ٣٥١، ژمارە: ٩١٩، زنجیرە: ١٥١}.

## ٣٤٧) داپۆشینی تەرمی مردوو
## بابٌ: فِي تَسْجِيَةِ الْمَيِّتِ

٤٥٧- عَنْ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: سُجِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حِينَ مَاتَ بِثَوْبِ حِبَرَةٍ). {الحديث: ٢١٨٠ = ٢١٥٣ فم. تجريد/٥/١٨٥، رقم: ١٨٩٣ = ٥٨١٤}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەری خودای گەورە (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەر بێ‌و ڕەزای خودا لەهاوسەرە پاکیزەکانی) کە دایکی موسوڵمانانە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ مەرگ بوو بەمیوانی، دایان پۆشی، بەشاڵی یەمەنی). {تاج/١، زنجیرە: ٢٠٢، ژمارە: ١٠٦٣ + تاج/٣/٣٣٦، ژمارە: ٢٩٦٢، زنجیرە: ٥٧}.

## ٣٤٨) گیانی باوەڕداران‌و گیانی بێباوەڕان لەپاش مردن بۆ کوێ دەچن.
## (٧١٤٠ - ٧١٥٣). (بابٌ: فِي أَرْوَاحِ الْمُؤْمِنِينَ وَ أَرْوَاحِ الْكَافِرِينَ)

٤٥٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: « إِذَا خَرَجَتْ رُوحُ الْمُؤْمِنِ تَلَقَّاهَا مَلَكَانِ يُصْعِدَانِهَا، قَالَ حَمَّادٌ: فَذَكَرَ مِنْ طِيبِ رِيحِهَا، وَذَكَرَ الْمِسْكَ، قَالَ: وَيَقُولُ أَهْلُ السَّمَاءِ: رُوحٌ طَيِّبَةٌ جَاءَتْ مِنْ قِبَلِ الأَرْضِ، صَلَّى اللَّهُ عَلَيْكِ وَعَلَى جَسَدٍ كُنْتِ تَعْمُرِينَهُ، فَيُنْطَلَقُ بِهِ إِلَى رَبِّهِ، ثُمَّ يَقُولُ: انْطَلِقُوا بِهِ إِلَى آخِرِ الأَجَلِ، قَالَ: « وَإِنَّ الْكَافِرَ إِذَا خَرَجَتْ رُوحُهُ قَالَ حَمَّادٌ: وَذَكَرَ مِنْ نَتْنِهَا وَذَكَرَ لَعْنًا، وَيَقُولُ أَهْلُ السَّمَاءِ: رُوحٌ خَبِيثَةٌ جَاءَتْ مِنْ قِبَلِ الأَرْضِ، قَالَ: فَيُقَالُ: انْطَلِقُوا بِهِ إِلَى آخِرِ الأَجَلِ. قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَرَدَّ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) رَيْطَةً كَانَتْ عَلَيْهِ عَلَى أَنْفِهِ هَكَذَا). {الحديث: ٧١٥٠ = ٧١٧٧ فم}:

ئـەبو هـورەيرە (خـوداى لىٚ رازى بـىٚ) فـەرمووى: كاتـىٚ كـە گيـانى بـڕواداريٚ دەردەچـىٚ، دوو فريشـتە دەيقۆزنـەوەو سـەرەو ژوور سـەرى دەخـەن بـۆ ئاسمـان، حـەمماد فـەرمووى: بودەيـل كـە ئـەم فەرموودەيـەم لىٚ وەرگرتـووە، باسـى ئـەوەى بۆكردين، كە بۆنى لەبۆنى ميسك خۆشترە، ئيتر دانيشتوانى ئاسمان دەفـەرموون: وا گيانێكى بۆنخۆشى پاك لەلاى زەمينـەوە هـات، ئـەى گيـان! دروودو رەحمـەتى خـودا هەم لە خۆتو هەم لەو لەشەيش بىٚ كە تـۆ ئاوەدانـت كردبـۆوە! ئـەوجا بـە قـەدرو رێزەوە دەيبەن بۆ خزمەت خوداى گەورەو سـەروەر، جـا دەفـەرمويٚ: بيبـەن بـۆلاى سيدرەتولمونتەها. فەرمووى: كاتێكيش گيانى ناموسوڵمان (كافر) دەردەچىٚ دەيبەن. حـەمماد فـەرمووى: بودەيـل باسـى ئـەوەى بـۆكردين كـە بۆگـەنى دىٚو نـەفرينو لەعنەتى لىٚ دەكرىٚ. جا خـەڵكى ئاسمـان دەفـەرموون: وا گيـانێكى چـەپەڵى بۆگـەن، لەلاى زەمينەوە هات. فەرمووى: ئەوجا دەگوترىٚ: بيبەن بۆ سـەججين، كـە شـوێنى مۆڵگەى دۆزەخييەكانە.

(لە جەلالەيندا دەفەرمويٚ: هەندىٚ كـەس دەڵێن: سـەججين زيندانێكـە والـەبن هەر حەوت تەبەقەى عەردەوە، مۆڵگەى ئيبليسو لەشكرەكانيەتى).

ئـەبو هـورەيرە (خۆشـنوودى خـوداى گـەورەى لىٚ بـىٚ) فـەرمووى: پێغەمبـەر (دروودو سلاوو رەحمەتى خوداى لەسەر بىٚ) پارچەيىٚ شاڵى لەبەردا بوو، ئاوا گرتى بە لووتى خۆيەوە (وەك بفەرمويٚ: ئـاى لـەو بۆگەنـە، دەبـىٚ چـەند خەسـتو پـيس بىٚ). {تاج/٣٨١/٥، زنجيرە: ١٦، ژمارە: ٥٢٠١}.

### ٣٤٩) ئەو سەبرو ئارامەى كە خودا پێى خۆشە، لەسەر ناخۆشىو بەلا بگيرىٚ، دەشىٚ لەسەرەتاى خورپە لێكەوتنەوە بێت.

### بَابٌ: فِي الصَّبْرِ عَلَى الْمُصِيبَةِ عِنْدَ أَوَّلِ الصَّدْمَةِ

٤٥٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضى الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَتَى عَلَى امْرَأَةٍ تَبْكِى عَلَى صَبِيٍّ لَهَا، فَقَالَ لَهَا: « اتَّقِى اللَّهَ وَاصْبِرِى ». فَقَالَتْ: وَمَا تُبَالِى بِمُصِيبَتِى، فَلَمَّا ذَهَبَ، قِيلَ لَهَا: إِنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَأَخَذَهَا مِثْلُ الْمَوْتِ، فَأَتَتْ بَابَهُ، فَلَمْ تَجِدْ عَلَى بَابِهِ بَوَّابِينَ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَمْ أَعْرِفْكَ، فَقَالَ:

« إِنَّمَا الصَّبْرُ عِنْدَ أَوَّلِ صَدْمَةٍ ». أَوْ قَالَ: « عِنْدَ أَوَّلِ الصَّدْمَةِ ». {الحديث: ٢١٣٧ = ٢١١١ فم. تجريد/١/٤١، رقم: ٦١٥ = ١٢٨٣، ١٢٥٢، ١٢٨٣، ١٣٠٢، ٧١٥٤}:

**پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: ژنێك لەسەر گۆڕی منداڵێکی خۆی دەگریا، پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **لەلایەوە رەت بوو پێی فەرمووو: ژنەکە! لەخودا بترسەو ددان بەخۆتا بگرەو ئارام بگرە، لەبەر باری خودادا). ژنەکەیش نەیناسی کە ئەوە پێغەمبەرە، گوتی پێی: بەولاوە تۆ ئاگات لە دەردی من نییە، جا کە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **رۆیشت، بە ژنەکەیان گوت: ئەوە پێغەمبەر بوو، چۆن ئەو قسە رەقەت دا لەڕووی؟! ئەویش لە تەریقیدا، سام گرتی وەك بمرێ وابوو، جا ژنەکە بۆ عوزر خوایی، چوو بۆ ماڵی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **روانی کە دەرکەوانی لێ نییە، گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لێم مەگرە، کە ئەو قسە رەق و زەقەم کرد لەڕووی تۆدا، بمبوورە نەمناسیت فەرمووی** (دروودی خودای لەسەر بێ)**: (ئەو صەبرو ئارام و خۆڕاگرتنەی کە خودا پێی خۆشە، دەبێ لەسەرەتای خورپە لێکەوتنەوە بێت). {تاج/١/٥١٨، زنجیرە: ١٩٨، ژمارە: ١٠٤٠} + {ریاض/١/٥٤، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٣١}.**

## ٣٥٠) پاداشی منداڵ مردن، بە ئومێدی پاداشی خودا. (٦٦٣٩ - ٦٦٤١).
## بابٌ: ثَوَابُ مَنْ يَمُوتُ لَهُ الْوَلَدُ فَيَحْتَسِبُ

٤٦٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ لِنِسْوَةٍ مِنَ الأَنْصَارِ: « لاَ يَمُوتُ لإِحْدَاكُنَّ ثَلاَثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ فَتَحْتَسِبَهُ، إِلاَّ دَخَلَتِ الْجَنَّةَ. فَقَالَتِ امْرَأَةٌ مِنْهُنَّ: أَوِ اثْنَانِ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: « أَوِ اثْنَانِ». {الحديث: ٦٦٤١ = ٦٦٥٧ فم + ٦٦٣٩ = ٦٦٥٥ فم. تجريد/٢/٢٧، رقم: ٦٠٥ = ١٢٤٨، ١٣٨١، ١٢٥٠، ١٢٥١، ٦٦٥٦}:

**ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (هەرکەسێ لەئێوەی ژنان، سێ منداڵی بمرێ، وەبیکا بە زەخیرە لەلای خودا، بەهەشت بۆخۆی مسۆگەر دەکا). ژنێکیان عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری**

خودا! ئەی ئەگەر كەسێ دوو منالّی بمرن، بەرئەم بەڵێنە دەكەوێ یانـا؟ فـەرمووی: (ئەگەر دووانیشی بمرن هەروا بەهەشـت مسۆگەر دەكـا). {تـاج/١/٥٢١، زنجیرە: ١٩٩، ژمارە: ١٠٤٦ هەتا ١٠٥٢}.

## ٣٥١) گوتەی كاتی لیقەومانو روودانی ناخۆشی. (٢١٢٠ - ٢١٦٢).

## بَابٌ: مَايُقَالُ فِي الْمُصِيبَةِ

٤٦١- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رضى الله عنها) قَالَـتْ: سَـمِعْتُ رَسُـولَ اللَّـهِ (صـلى الله عليـه وسلم) يَقُولُ: « مَا مِنْ عَبْدٍ تُصِيبُهُ مُصِيبَةٌ فَيَقُولُ: إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ، اللَّهُمَّ أْجُرْنِى فِى مُصِيبَتِى، وَأَخْلِفْ لِى خَيْرًا مِنْهَا، إِلاَّ أَجَرَهُ اللَّهُ فِى مُصِيبَتِهِ وَأَخْلَـفَ لَـهُ خَيْـرًا مِنْهَـا، قَالَتْ: فَلَمَّا تُوُفِّىَ أَبُو سَلَمَةَ، قُلْتُ كَمَا أَمَرَنِى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليـه وسـلم) فَـأَخْلَفَ اللَّهُ لِى خَيْرًا مِنْهُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). {الحديث: ٢١٢٣ = ٢٠٩٨ فم. أبـو داود. جنائز: ٣١١٩. ترمذى. دعوات: ٣٥١١. ابن ماجة. جنائز: ١٥٩٨}:

ئـوم سـەلەمە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: لـەزاری پـیرۆزی پێغەمبـەرم ژنـەوت دەیفەرموو: (هەر بەندەیێ كاتێ تووشی چورتمێ (كێشە)یێ، یا ناخۆشـییەك دەبـێ بڵێ: (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ): ئێمـە هـەموو دەسـنێژی خـوداین، لاریمـان نییـە لـە ئاستی فەرمانی، وە لەودنیا دیسانەوە دەچینەوە بەردیوانی خۆی (اللَّهُمَّ أْجُرْنِـى فِـى مُصِيبَتِى وَأَخْلِفْ لِى خَيْرًا مِنْهَا): ئەی خودایە! لەهۆی ئەم ناخۆشییەوە، كە بـەهۆی ئەم وەیو موسیبەتەوە بەسـەرم هـاتووە پاداشـی باشـم بـدەرەوە، وەبـە وەجـەڵێكی باشتر تۆڵەیم بۆ بكەرەوە).

هەر بەنـدەیێ لەكاتی وادا، ئەم نزایـە بـە بـاوەڕی دڵ بكـا، مسۆگەر كـە خـودای گەورەو مەزن، لەهۆی ئەو ناخۆشییەوە، پاداشی باشی دەداتەوە).

ئوم سەلەمە فەرمووی: جا كاتێ ئەبو سەلەمەی مێـردم عـەمری خـودای كـردو ئەمری هەقی بەجێ هێنا، فەرمانەكەی پێغەمبەرم بەجێ هێناو، ئەو نزایەی خۆی پێی گوتم خوێندم، ئیتر ئەوەبوو كە خودا لە وەجـەڵی ئـەودا بـە موحەممـەد (درووودی خودای لەسەر بێ) تۆڵەیەكی باشتری بۆم كردەوە، كە بۆ هەردوو جیهانم لـە ئـەبو سـەلەمە

باشترە، چونکە موحەممەد پێغەمبەری خودایە). {ریاض/٢، لاپەڕە: ٣٥٣، زنجیرە: ١٥٢، ژمارە: ٩٢١، ٩١٩، ٩٢٠}.

## ٣٥٢) گریان بۆ مردوو
## باب: البُكَاءُ عَلَى المَيّتِ

٤٦٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) قَالَ: اشْتَكَى سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ، شَكْوَى لَهُ، فَأَتَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَعُودُ مَعَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ وَسَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ فَلَمَّا دَخَلَ عَلَيْهِ وَجَدَهُ فِى غَشِيَّةٍ، فَقَالَ: « أَقَدْ قَضَى؟». قَالُوا: لاَ، يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَبَكَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَلَمَّا رَأَى الْقَوْمُ بُكَاءَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بَكَوْا، فَقَالَ: « أَلاَ تَسْمَعُونَ؟ إِنَّ اللَّهَ لاَ يُعَذِّبُ بِدَمْعِ الْعَيْنِ، وَلاَ بِحُزْنِ الْقَلْبِ، وَلَكِنْ يُعَذِّبُ بِهَذَا - وَأَشَارَ إِلَى لِسَانِهِ - أَوْ يَرْحَمُ». {الحديث: ٢١٣٤ = ٢١٠٨ فم. تجريد/٢/٥٢ رقم: ٦٢٧ = ١٣٠٤ فتح}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ سەعدی کوڕی عوبادە نەخۆش بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆیشت بۆ سەرلێدانی، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفو سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصو عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودیش لەگەڵ بوون، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆیشتە ژوورەوە بۆلای، ڕوانی بووراوەتەوەو پەلو پۆی شکاوەو کەسوکارەکەی دەورەیان داوە، جا فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئایا ماوە یا مردووە؟). گوتیان: ئەی پێغەمەری خودا! هێشتا ماوە، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی کرد بە گریان، کاتێ خەڵکەکەیش کە دییان وا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەگری، ئەوانیش گریان، جا فەرمووی: (گوێتان لێ بێ: خودا لەسەر فرمێسکی چاوو لەسەر خەمو پەژارەی دڵ، ئازارو سزاتان نادا، بەڵام بەهۆی ئەم زمانەوە سزاتان دەدا: ئەگەر شیوەنو نا سوپاسی پێ بکەن، یا ڕەحمتان پێ دەکا، ئەگەر لەکاتی سەختیو قۆرتو کۆستدا قسەی باشی پێ بکەن، وەك ئەوە بڵێن: إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ). (١٥٦/٢). {بڕوانە: تاج/١، زنجیرە: ١٩٧، ژمارە: ١٠٣٦} + {ریاض/٢، لاپەڕە: ٣٥٦، زنجیرە: ١٥٣، ژمارە: ٩٢٥}.

## ٣٥٣) هەڕەشە لە شینو زاریو شیوەن گێڕان
## بابٌ: التَّشْدِيدُ فِي النِّيَاحَةِ

٤٦٣- عَنْ أَبِى مَالِكٍ الأَشْعَرِىِّ (رضى الله عنه) أَنَّ النَّبِىَّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « أَرْبَعٌ فِى أُمَّتِى مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ، لاَ يَتْرُكُونَهُنَّ: الْفَخْرُ فِى الأَحْسَابِ، وَالطَّعْنُ فِى الأَنْسَابِ، وَالاِسْتِسْقَاءُ بِالنُّجُومِ، وَالنِّيَاحَةُ». وَقَالَ: « النَّائِحَةُ إِذَا لَمْ تَتُبْ قَبْلَ مَوْتِهَا، تُقَامُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَعَلَيْهَا سِرْبَالٌ مِنْ قَطِرَانٍ وَدِرْعٌ مِنْ جَرَبٍ». {الحديث: ٢١٥٧ = ٢١٣٠ فم}:

ئەبو مالیکی ئەشعەری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: چوار خووی ناشیرین، ماون لەناو ئۆمەتما لەگەڵ ئەوەشا کە لە ڕەفتارو پیشەی بەدی سەردەمی نەزانین، کەچی هێشتا ئۆمەتم هەر دەست بەرداریان نابن:

یەکەم: نازینو شانازی کردن بە ڕەسەنییو خانەدانیی باو باپیرەوە.

دووەم: توانجو تانەدان لە ڕەچەڵەکو بنەچەی خەڵك.

سێیەم: بارانی باران دەدەنە پاڵ بورجو ئەستێران.

چوارەم: شیوەنکردن، وە فەرمووشی: سەردولکەبێژ، ئەگەر لەپێش مردنیا، تەوبە نەکاو پەشیمان نەبێتەوە، لە ڕۆژی قیامەتا، کە زیندوو دەبێتەوە، کراسی قەترانو دیزداشەی گەڕیی لەبەردایە). {تاج/١، زنجیرە: ١٩٥، ژمارە: ١٠٢٨}.

## ٣٥٤) ڕوومەت ڕنینەوەو یەخە دادڕین لەکاتی ڕوودانی کارەساتو لیقەوماندا، لە موسوڵمان ناوەشێتەوە.
## بابٌ: لَيْسَ مِنَّا مَنْ ضَرَبَ الْخُدُودَ وَشَقَّ الْجُيُوبَ

٤٦٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لَيْسَ مِنَّا مَنْ ضَرَبَ الْخُدُودَ، أَوْ شَقَّ الْجُيُوبَ، أَوْ دَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ». وَفِي لَفْظٍ: « وَشَقَّ وَدَعَا». {الحديث:٢٨١ = ٢٩٧ فتح الملهم. تجريد/٢/٤٦ رقم: ٦٢١ = ١٢٩٤، ١٢٩٧، ١٢٩٨، ١٢٦٤، ٣٥١٩. نسائي. جنائز: ١٨٥٩. ابن ماجة. جنائز: ١٥٨٤ تحفة الأشراف: ٩٥٦٩}:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوەی روومەت بڕنێتەوەو یەخە دابدڕێو بانگەوازی سەردەمی پێش هاتنی ئیسلام هەڵ بدات لە ئێمە نییە). {تاج/١، زنجیرە: ١٩٥، ژمارە: ١٠٢٦ — ش/ت/ن} . لە بێژە (لفظ)ێکا: (یەخە دادڕێو نزای خراپ لەخۆی بکا، وەك بڵێ: قوڕ بەسەرم).

## ٣٥٥) سزای مردوو بەهۆی گریانی زیندووەوە
## باب: المَيّتُ يُعذَّبُ بِبُكاءِ الحَيّ

٤٦٥- عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ (رضى الله عنها): أَنَّهَا سَمِعَتْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) - وَذُكِرَ لَهَا أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ يَقُولُ: إِنَّ الْمَيِّتَ لَيُعَذَّبُ بِبُكَاءِ الْحَيِّ - فَقَالَتْ عَائِشَةُ: يَغْفِرُ اللَّهُ لأَبِى عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَمَا إِنَّهُ لَمْ يَكْذِبْ، وَلَكِنَّهُ نَسِىَ أَوْ أَخْطَأَ، إِنَّمَا مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَلَى يَهُودِيَّةٍ يُبْكَى عَلَيْهَا، فَقَالَ: « إِنَّهُمْ لَيَبْكُونَ عَلَيْهَا، وَإِنَّهَا لَتُعَذَّبُ فِى قَبْرِهَا ». {الحديث: ٢١٥٣ = ٢١٢٦ فم. تجريد/٢/٤٥، رقم: ٦١٩ = ١٢٨٩. ترمذى. جنائز: ١٠٠٦. نسائى. جنائز: ١٨٥٥. تحفة الأشراف: ١٧٩٤٨} :

عەمرەی کچی عەبدوڕەحمان (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: کاتێ ئەو قسەی عەبدوڵڵای کوڕی عومەریان گێڕایەوە بۆ عائیشە، (ڕەزای خودا لەهەموویان بێ)، کە گوایە عەبدوڵڵا گوتوویەتی: (مردوو سزا دەدرێ لەسەر ئەو گریانەی کە زیندووو لەسەری دەگری) عائیشە فەرمووی: خوا لە ئەبو عەبدوڕەحمان واتە: لە ئیبنو عومەر خۆش بێ، ئەو پیاوی درۆ نییە، کەشتی وا بەدەم پێغەمبەرەوە دەڵێ، بەڵام یا باش لەیادی نەماوە، یا بەهەڵەدا چووە، چونکە شتەکە خۆی وابوو: جارێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەلای گۆڕی ژنە جوولەکەیەکەوە رەت بوو، کەسوکارەکەی لەسەری دەگریان، فەرمووی: (سەیرە! ئەوان لەسەری دەگرین، کەچی ئەویش لە گۆڕەکەیدا سزا دەدرێ). {تاج/١، ژمارە: ١٠٣٣} .

## ٣٥٦) بەهەرحاڵ مردن مایەی حەسانەوەی بەندەکانە.
## باب: ماجاءَ في مُستَرِيحٌ وَمُستَراحٌ مِنهُ

٤٦٦- عَنْ أَبِى قَتَادَةَ بْنِ رِبْعِىٍّ (رضى الله عنه) أَنَّهُ كَانَ يُحَدِّثُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مُرَّ عَلَيْهِ بِجَنَازَةٍ، فَقَالَ: « مُسْتَرِيحٌ وَمُسْتَرَاحٌ مِنْهُ ». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْمُسْتَرِيحُ وَالْمُسْتَرَاحُ مِنْهُ؟ فَقَالَ: « الْعَبْدُ الْمُؤْمِنُ يَسْتَرِيحُ مِنْ نَصَبِ الدُّنْيَا، وَالْعَبْدُ الْفَاجِرُ، يَسْتَرِيحُ مِنْهُ الْعِبَادُ وَالْبِلاَدُ، وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ ». {الحديث: ٢١٩٩ = ٢١٧٢ فم. بخاري. رقاق: ٦٥١٢، ٦٥١٣. نسائي. جنائز: ١٩٢٩. تحفة الأشراف: ١٢١٢٨}:

ئەبو قەتادەی کوڕی ڕەبعی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: تەرمێ بەلای پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) تێ پەڕی، فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): یا بۆخۆی ڕزگاری بوو، یاخود خەڵك لەدەستی ڕزگاریان بوو).

گوتیان: چۆن چۆنی ئەی پێغەمبەری خودا!؟

فەرمووی: (بەندەی خاوەن ئیمان کە دەمرێ بۆ خۆی لە کێشەو بەرەی جیهان قوتاری دەبێ‌و دەحەسێتەوە، بەندەی بەدکاریش کە دەمرێ عالەمێ دەحەوێتەوە: بەندەکان‌و وڵات‌و دارو درەخت‌و زیندەوەران لە دەست زیان‌و وەزەنی ڕزگاریان دەبێ!). {تاج/١، ژمارە: ١٠٢٥، زنجیرە: ١٩٤ — ش/ن}.

## ٣٥٧) باسی شۆردنی مردوو
## باب: في غسل الميّت

٤٦٧- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: لَمَّا مَاتَتْ زَيْنَبُ بِنْتُ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « اغْسِلْنَهَا وِتْرًا ثَلاَثًا أَوْ خَمْسًا، وَاجْعَلْنَ فِى الْخَامِسَةِ كَافُورًا، أَوْ شَيْئًا مِنْ كَافُورٍ، فَإِذَا غَسَلْتُنَّهَا فَأَعْلِمْنَنِى ». قَالَتْ: فَأَعْلَمْنَاهُ، فَأَعْطَانَا حِقْوَهُ وَقَالَ: « أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ ». {الحديث: ٢١٧٠ = ٢١٤٣ فم. تجريد البخاري: ٦٠٦ = ١٢٥٣، ١٢٥٤، ١٢٥٥، ١٢٥٦، ١٢٥٧، ١٢٥٨، ١٢٥٩، ١٢٦٠، ١٢٦١، ١٢٦٢، ١٢٦٣. نسائي. جنائز: ١٨٨٢، ١٨٨٤. ترمذي. جنائز: ٩٩٠. ابن ماجة. جنائز: ١٤٥٨. تحفة الأشراف: ١٨١٣٠}:

**ئوم عەتیێ** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: کاتێ زەینەبی کچی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **مرد، خەریك بووین تەرمەکەیمان دەشۆرد، پێغەمبەر خۆی** (دروودی خودای لەسەر بێ) **هاتە ژوورەوە بۆلامان، فەرمووی: (بە ئاوو مۆرد سێ جار، یا پێنج جار، یا زیاتریش بیشۆرن، وە لەدوا دەستا هەنێ کافووریشی تێ بکەن، کاتێکیش لێ بوونەوە لە شۆردنەکەی ئاگادارم بکەن).**

**جا کەلێ بووینەوە، پێمان گوت: جا حەزرەت** (دروودی خودای لەسەر بێ) **کراس (إزار)ەکەی خۆی هەلْدا بۆمانو فەرمووی: (بیکەن بەژێرکراس بۆی). واتە: لەژێر کفنەکەیەوە، لەسەر گۆشتەوە بۆ پیرۆزی بیکەنە بەری). {تاج/١، زنجیرە: ٢٠٣، ژمارە: ١٠٧٠}.**

**ڕوونکردنەوە:**

١- **ئەم فەرموودەیە بنەمایەکە لە بنەماکانی خۆ پیرۆز کردنو خۆ مووفەڕك کردن، بە شۆنەوارو شمەکی پیاو چاکان.**

٢- **زەینەبی کچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو کەسوکارەکەی بێ)، لە خەدیجەی کوبرایە، کە یەکەم هاوسەری پێغەمبەر بوو، کچە گەورەی پێغەمبەرە، ڕاجیایی هەیە لەوەدا کە زەینەب گەورەترە، یا قاسمی برای، یەکەم کچی پێغەمبەر بووە کە شووی کردووە، شووی کرد بە ئەبول عاصی کوڕی ڕەبیع کە پوورزای خۆی بوو، کە کوڕی هالەی کچی خووەیلید بوو، زەینەب لەگەلْ باوکیو لەگەلْ باوکی مێردەکەیدا، لە مەککەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە، لە ئەبول عاصی مێردی کوڕێكو کچێکی بوو، کوڕەکە ناوی عەلی بوو، مێرد منالْ بوو کە مرد، کچەکە ناوی ئومامە بوو، ما هەتا لەدوا مردنی فاطیمەی زەهرای پووری، شووی کرد بە عەلی کوڕی ئەبو تالیب. مێردەکەی زەینەب زۆری خۆش دەویست، زەینەب، لەژیانی باوکیا، لەسالْی هەشتی کۆچیدا وەفاتی کرد. {بڕوانە: تەجریدی بوخاری/٤، ژمارە: ١٥٢٢ (تێبینی) لاپەڕە: ٢٣٩ + بەرگی/٤، لاپەڕە: ١٢٥، ژمارە: ١٤٦٢ + لاپەڕە: ١٨٦، ژمارە: ١٥٠٠ + مسلیم ژمارە: ٣٦}.**

## ٣٥٨) باسی کفنی مردوو
## بابٌ: فِي كَفْنِ المَيّت

٤٦٨- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: كُفِّنَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِى ثَلاَثَةِ أَثْوَابٍ بِيضٍ سَحُولِيَّةٍ مِنْ كُرْسُفٍ لَيْسَ فِيهَا قَمِيصٌ، وَلاَ عِمَامَةٌ، أَمَّا الْحُلَّةُ فَإِنَّمَا شُبِّهَ عَلَى النَّاسِ فِيهَا أَنَّهَا اشْتُرِيَتْ لَهُ لِيُكَفَّنَ فِيهَا، فَتُرِكَتِ الْحُلَّةُ، وَكُفِّنَ فِى ثَلاَثَةِ أَثْوَابٍ بِيضٍ سَحُولِيَّةٍ، فَأَخَذَهَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِى بَكْرٍ، فَقَالَ: لأَحْبِسَنَّهَا حَتَّى أُكَفِّنَ فِيهَا نَفْسِى، ثُمَّ قَالَ: لَوْ رَضِيَهَا اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لِنَبِيِّهِ لَكَفَّنَهُ فِيهَا. فَبَاعَهَا وَتَصَدَّقَ بِثَمَنِهَا. {الحديث: ٢١٧٦ = ٢١٤٩ فم. تجريد/٢/٢٨، رقم: ٦٠٧ = ١٢٦٩، ١٢٧١، ١٢٧٢، ١٢٧٣، ١٣٨٧} :

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسێ لۆ جلی یەمەنی سپی خاوێنی لۆکەدا کفن کرا، نە کراس و نە مێزەریان تیانەبوو. بەڵام ئەوەی کە دەڵێن: گوایە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدەستێ جلی یەمەنیدا کفن کراوە، ئەوە وانییە، بەڵکوو خەڵکەکە لێیان گۆڕاوە، خۆی شتەکە ئاوا بوو: ئەو قاتەیان کڕی هەتا پێغەمبەری تیادا کفن بکرێ، بەڵام لەودا کفن نەکراو، لەوسێ لۆ جلە یەمەنییە، سپییە، خاوێنە، لۆکەیەدا کفن کرا. جا عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکر، ئەو قاتەی هەڵگرت بۆ خۆی و گوتی: هەڵی دەگرم کەی مردم دەیکەم بە کفن بۆ خۆم، بەڵام لەپاشا گوتی: ئەگەر ئەم قاتە رەزای خودای لەسەر بوایە کە پێغەمبەری تیا کفن بکرێ، لەودا کفنی دەکرد، دەی کفنێ کە خوا رەوای نەبینێ بۆ پێغەمبەر، چی خێرێکی تیادایە بۆمن، لەبەرئەوە فرۆشتی و بەهاکەی کرد بەخێر!!). {تاج/١، ژمارە: ١٠٦٦، زنجیرە: ٢٠٢}.

## ٣٥٩) کفن کردن بەجوانی
## بابٌ: فِي تَحْسِينِ كَفْنِ المَيّت

٤٦٩- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رضى الله عنهما) أَنَّ النَّبِىَّ (صلى الله عليه وسلم) خَطَبَ يَوْمًا فَذَكَرَ رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِهِ قُبِضَ فَكُفِّنَ فِى كَفَنٍ غَيْرِ طَائِلٍ، وَقُبِرَ لَيْلاً، فَزَجَرَ النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ يُقْبَرَ الرَّجُلُ بِاللَّيْلِ، حَتَّى يُصَلَّى عَلَيْهِ، إِلاَّ أَنْ يُضْطَرَّ إِنْسَانٌ إِلَى ذَلِكَ، وَقَالَ النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم): « إِذَا كَفَّنَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ فَلْيُحَسِّنْ

كَفَنَـهُ ». {الحـديث: ٢١٨٢ = ٢١٥٥. أبـو داود. جنـائز: ٣١٤٨. نسـائى. جنـائز: ١٨٩٤. ترمذى. جنائز: ٩٩٨. تحفة الأشراف: ٢٨٠٥}:

**جابیری کوڕی عەبدوڵلا** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **لەوتارێکا، باسی ئەوەی کرد، کە پیاوێ لە هاوەڵانی مردووەو لە کفنێکی نا شایستەدا کفن کراوە، وە بە شەویش نێژراوە، جا پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **هەڕەشەی لەوە کرد کە مردوو لە شەودا بنێژرێ، چونکە لەشەودا کەمتر نوێژی لەسەر دەکرێ، مەگەر لەبەر ناچاری مرۆڤ ئەوە بکا، ئەوە قەیناکا). هەروەها خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (کاتێ یەکێکتان تەرمی برای موسوڵمانی خۆی کفن دەکا، با بەجوانی کفنی بکا). {تاج/١، ژمارە: ١٠٧٢}.**

### ٣٦٠) بەڕێکردنی تەرم زوو بەزوو
### باب: الإِسْرَاعُ بِالجَنَازَةِ

٤٧٠- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم)، قَالَ: « أَسْرِعُوا بِالْجَنَازَةِ، فَإِنْ تَكُ صَالِحَةً فَخَيْرٌ (لَعَلَّهُ قَالَ) تُقَدِّمُونَهَا إِلَيْهِ، وَإِنْ تَكُ غَيْرَ ذَلِكَ، فَشَرٌّ تَضَعُونَهُ عَنْ رِقَابِكُمْ ». {الحديث: ٢١٨٣ = ٢١٥٦ فم. تجريد/٢/٥٦، رقم: ٦٣٢ = ١٣١٥. أبو اود. جنائز: ٣١٨١. ترمذى. جنائز: ١٠١٥. نسائى. جنائز: ١٩٠٩. ابن ماجة. جنائز: ١٤٧٧. تحفة الأشراف: ١٣١٢٤}:

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **لە خۆشەویستەوە** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: (دەستو برد لە بەڕێکردنی تەرمی مردوو بکەنو زوو بەزوو بیبەن بۆ گۆڕستانو، لەڕێ خێرا بڕۆن، چونکە حاڵ لەم دوو حاڵە بەدەرنییە:**

**ئەگەر خاوەن تەرمەکە خۆی مرۆڤێکی باش بێ، ئەوا ئێوە دەیبەن بەسەر خێرو خۆشیدا.**

**خۆ ئەگەر خۆی مرۆڤێکی باش نەبێ، ئەوا ئەوە شەڕێکەو زوو بەزوو لەکۆڵی خۆتانی دەکەنەوە). {تاج/١، ژمارە: ١١١٩، زنجیرە: ٢١٨} + {ریاض/٢/٣٧٠، زنجیرە: ١٥٨، ژمارە: ٩٤١}.**

## ٣٦١) نەیی کراوە لە ژنان کە شوێن تەرم بکەون بۆسەر گۆڕستان.
## باب: نَهْيُ النِّسَاءِ عَنِ اتِّبَاعِ الجَنَائِزِ

٤٧١- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: كُنَّا نُنْهَى عَنِ اتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ، وَلَمْ يُعْزَمْ عَلَيْنَا). {الحديث: ٢١٦٤ = ٢١٣٦ فم. تجريد/٢/٣٩، عدد: ٦١٣ = ١٢٧٨ فتح الباري. أبو داود. جنائز: ٣١٦٧. ابن ماجة. جنائز: ١٥٧٧. تحفة الأشراف: ١٨١٣٩} :

ئوم عەتیێ (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئێمەی ژنان نەهیمان لێکراوە لە شوێنکەوتنی تەرم کە لەگەڵیدا بڕۆین بۆسەر گۆڕستان، بەڵام لەگەڵ ئەو نەهی لێ کردنەیشدا یاساخ نەکراوە لێمان کە لەگەڵ تەرمدا بڕۆین بۆسەر قەبران و ئامادەی ناشتنی تەرم ببین). {تاج/١، زنجیرە: ٢١٨، ژمارە: ١١٢١} + {ریاض/٢/٣٦٠، زنجیرە: ١٥٤، ژمارە: ٩٣١}.

## ٣٦٢) هەڵسان لەبەر تەرم (بابٌ: القِيَامُ لِلْجَنَازَةِ)

٤٧٢- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رضى الله عنهما) قَالَ: مَرَّتْ جَنَازَةٌ، فَقَامَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، وَقُمْنَا مَعَهُ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهَا يَهُودِيَّةٌ! فَقَالَ: « إِنَّ الْمَوْتَ فَزَعٌ، فَإِذَا رَأَيْتُمُ الْجَنَازَةَ فَقُومُوا لَهَا». {الحديث: ٢٢١٩ = ٢١٩٤ فم. تجريد/٢/٥٤، رقم: ٦٣١ = ١٣١١. أبو داود. جنائز: ٣١٧٤. نسائي. جنائز: ١٩٢١. تحفة الأشراف: ٢٣٨٦} :

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: تەرمێ لەلامانەوە رەت بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەری هەڵسا، ئێمەیش لەبەری هەڵساین، ئینجا گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆئەوە تەرمی جوولەکە بوو؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (مردن بەسامە! لەبەرئەوە کە تەرمتان بینی لەبەری هەڵسن!). {تاج/١، زنجیرە: ٢٢٠، ژمارە: ش/د/ن}.

## ٣٦٣) سڕینەوەی هەڵسان لەبەر تەرم (

## باب: نَسْخُ الْقِيَامِ لِلْجَنَازَةِ

٤٧٣- عَنْ عَلِيٍّ (رضى الله عنه) قَالَ: رَأَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَامَ فَقُمْنَا، وَقَعَدَ فَقَعَدْنَا، يَعْنِي فِي الْجَنَازَةِ. {الحديث: ٢٢٢٧ = ٢٢٠٢ فم. أبو داود. جنائز: ٣١٧٥. ترمذى. جنائز: ١٠٤٤، نسائى. جنائز: ١٩٩٤، ١٩٩٩. ابن ماجة. جنائز: ١٥٤٤}:

عەلی (خوای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لەسەرەتاوە دەمان بینی کە پێغەمبەری خۆی (درودی خودای لەسەر بێ) لەبەر تەرم هەڵدەسێ، لەبەرئەوە ئێمەیش لەبەری هەڵدەساین، بەڵام لەدواییدا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) وازی لە هەڵسان هێناو، دانیشتنی لەخۆی تێك نەدەدا، لەبەرئەوە ئێمەیش وازمان لە هەڵسان لەبەر تەرم هێناوەو، دانیشتن لەخۆمان تێك نادەین). {تاج/١، زنجیرە: ٢٢٠، ژمارە: ١١٢٨ — م/د/ت/ن}.

## ٣٦٤) پێش نوێژ لەکوێی مردووەوە دەوەستێ بۆ نوێژ کردن لەسەری.

## باب: أَيْنَ يَقُومُ الإِمَامُ مِنَ الْمَيِّتِ لِلصَّلاَةِ عَلَيْهِ.

(بۆ چۆنێتی نوێژی مردوو بڕوانە: ریاض/٢، لاپەڕە: ٣٦٢ - ٣٦٦)

٤٧٤- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ (رضى الله عنه) قَالَ: صَلَّيْتُ خَلْفَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم)، وَصَلَّى عَلَى أُمِّ كَعْبٍ، مَاتَتْ وَهِيَ نُفَسَاءُ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لِلصَّلاَةِ عَلَيْهَا وَسَطَهَا). {الحديث: ٢٢٣٢ = ٢٢٠٨ فم. تجريد/١، لاپەڕە: ٢٢١، رقم: ٢١٤ = ٣٣٢، ١٣٣١، ١٣٣٢. أبو داود. جنائز: ٣١٩٥. ترمذى. جنائز: ١٠٣٥. نسائى. حيض: ٣٩١}:

سەموورەی کوڕی جوندوب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەپشتی پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) بەجەماعەت نوێژی مردووم لەسەر تەرمی ئوم کەعب کرد، کە لەزەیستانیدا بەسەر منداڵەوە مردبوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لە نوێژەکەدا،

لەناوەڕاستی تەرمەکەدا راوەستابوو). {تاج/١، زنجیرە: ٢١٠، ژمارە: ١٠٩٨ — ش/د/ت/ن}.

**روونکردنەوە:**

سەموورەی کوڕی جوندوب لە پیاوانی بوخاریو موسلیمە، ئەم فەرموودەی ئێرە پەسەندی هەردوو پیری بوخاریو پیری موسلیمە، کە لەزاراوی فەرموودەدا پێی دەگوترێ (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ).

سەموورە سەدو بیستو سێ فەرموودەی هەیە، لە بوخاریدا چوار فەرموودەی هەیە، لە پەنجاو نۆی کۆچیدا، کۆچی دوایی کردووە.

## ٣٦٥) ئەڵلاهو ئەکبەر کردن لەسەر تەرم

## بابٌ: فِي التكْبِيرِ علَى الجَنَازَةِ

٤٧٥- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) نَعَى لِلنَّاسِ النَّجَاشِيَ، فِى الْيَوْمِ الَّذِى مَاتَ فِيهِ، فَخَرَجَ بِهِمْ إِلَى الْمُصَلَّى، وَكَبَّرَ أَرْبَعَ تَكْبِيرَاتٍ). {الحديث: ٢٢٠١ = ٢١٧٤ فم. تجريد/٢/٢٦، رقم: ٦٣ = ١٢٤٥، ١٣١٨، ١٣٢٧، ١٣٢٨، ١٣٣٣، ٣٨٨٠، ٣٨٨١. أبو داود. جنائز: ٣٢٠٤. نسائى. جنائز: ١٩٧٠. تحفة الأشراف: ١٣٢١١}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەو رۆژەدا کە نەجاشی تیا مرد، کە پاشای حەبەشە بوو، وە پاشایەکی باش بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەیامی مردنی ئەوی بە یارانی راگەیاند، فەرمووی: ئەسحەمە کە بەندەیەکی باشی خودا بوو، ئەمڕۆ مرد، جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ هاوڕێیانا دەرچوون، وە رۆیشتن بۆ نوێژگاکە، لەوێ لەپشت خۆیەوە رێزی کردنو نوێژی نادیار (صلاة الغائب)ی بەکۆمەڵی لەسەر کرد، لە نوێژەکەدا چوار ئەڵلاهو ئەکبەری کرد). {تاج/١/٥٣٨، زنجیرە: ٢٠٨، ژمارە: ١٠٨٦}.

نەجاشی نازناوی پادشایانی حەبەشەیە، هەروەك چۆن رۆم بە پادشایانی خۆیان دەڵێن: قەیسەرو ئێرانیان بە پادشای خۆیان دەڵێن: کیسرا، حەبەشەییش بە پادشای خۆیان دەڵێن: نەجاشی.

## ٣٦٦) پێنج جار ئەڵلاهو ئەکبەر کردن لەسەر تەرم
## بابٌ: فِي التَّكْبِيرِ خَمْساً

٤٧٦- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى قَالَ: كَانَ زَيْدٌ يُكَبِّرُ عَلَى جَنَازَةٍ أَرْبَعًا، وَإِنَّهُ كَبَّرَ عَلَى جَنَازَةٍ خَمْسًا، فَسَأَلْتُهُ؟ فَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يُكَبِّرُهَا. {الحديث: ٢٢١٣ = ٢١٨٧ فم. أبو داود. جنائز: ٣١٩٧. ترمذي. جنائز: ١٠٢٣. نسائي. جنائز: ١٩٨١. ابن ماجة. جنائز: ١٥٠٥. تحفة/٣٦٧١}:

عەبدورەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری زەیدی کوڕی ئەرقەم وابوو، لەنوێژی تەرما، کە نوێژی دەکرد، لەسەر تەرمی مردووەکانمان، چوار جار ئەڵلاهو ئەکبەری دەکرد، جارێ کە نوێژی لەسەر تەرمێ کرد، پێنج ئەڵلاهو ئەکبەری کرد، کە بۆ ئەمە لێیم پرسی؟ فەرمووی: (پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) جاروبار ئاوای دەکرد).

## ٣٦٧) نزاو پاڕانەوە بۆ مردوو لەنوێژی تەرما
## باب: الدُّعَاءُ لِلْمَيِّتِ

٤٧٧- عَنْ عَوْفَ بْنَ مَالِكٍ (رضى الله عنه) قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَلَى جَنَازَةٍ. فَحَفِظْتُ مِنْ دُعَائِهِ وَهُوَ يَقُولُ: « اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ وَارْحَمْهُ، وَعَافِهِ وَاعْفُ عَنْهُ، وَأَكْرِمْ نُزُلَهُ، وَوَسِّعْ مُدْخَلَهُ، وَاغْسِلْهُ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ، وَنَقِّهِ مِنَ الْخَطَايَا، كَمَا نَقَّيْتَ الثَّوْبَ الأَبْيَضَ وَأَبْدِلْهُ دَارًا خَيْرًا مِنْ دَارِهِ، وَأَهْلاً خَيْرًا مِنْ أَهْلِهِ، وَزَوْجًا خَيْرًا مِنْ زَوْجِهِ، وَأَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ وَأَعِذْهُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ - أَوْ مِنْ عَذَابِ النَّارِ - حَتَّى تَمَنَّيْتُ أَنْ أَكُونَ ذَلِكَ الْمَيِّتَ. {الحديث: ٢٢٢٩ = ٢٢٠٤ فم. ترمذي. جنائز: ١٠٢٥. نسائي. طهارة: ٦٢، ١٩٨٢، ١٩٨٣. تحفة الأشراف: ١٠٩٠}:

عەوفی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەسەر تەرمێ نوێژی دەکرد، ئەمەم لە نزاکەی لەبەرکرد، کە بۆیکرد، فەرمووی:

« اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ وَارْحَمْهُ وَعَافِهِ وَاعْفُ عَنْهُ وَأَكْرِمْ نُزُلَهُ وَوَسِّعْ مُدْخَلَهُ وَاغْسِلْهُ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ وَنَقِّهِ مِنَ الْخَطَايَا كَمَا نَقَّيْتَ الثَّوْبَ الأَبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ وَأَبْدِلْهُ دَارًا خَيْرًا مِنْ دَارِهِ وَأَهْلاً خَيْرًا مِنْ أَهْلِهِ وَزَوْجًا خَيْرًا مِنْ زَوْجِهِ وَأَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ وَأَعِذْهُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ أَوْ مِنْ عَذَابِ النَّارِ ». واتە: خودایە! پەروەردگارا! لێی خۆشبەو ڕەحمی پێ بکەو سەر ئاسوودەی هەردوو جیهانی بفەرموو، لێی ببوورەو میوانەو ڕێزی بگرەو، گۆڕی گوشادکەو، بە ئاوو بەفرو تەرزە بیشۆرەو، لە گوناه پاك پاکی بکەرەوە، وەك چۆن جلێکی سپی پاك ڕابگریو لە چڵك دووری بگری ئاوا، وە ماڵێ لە ماڵەکەی خۆی باشترو خێزانێ لە خێزانەکەی خۆی باشترو هاوسەرێ لە هاوسەرەکەی خۆی باشتری بدەرێ، بیبەرەبەهەشتو پەنای بدە لە سزای گۆڕو لە سزای ئاگری دۆزەخ).

عەوف فەرمووی: تەنانەت ئەم نزایەم ئەوەندە بە دڵ بوو، خۆزگەم خواست کە ئەو مردووە من بوومایە!). {تاج/١، زنجیرە: ٢٠٨، ژمارە: ١٠٨٩ — م/ن/ت} + {ریاض/٢/٣٦٢، زنجیرە: ١٥٧، ژمارە: ٩٣٥}.

**ڕوونکرنەوە:**

عەوفی کوڕی مالیك لە پیاوانی صەحیحەینە، واتە: لە بوخاریو موسلیمدا فەرموودەی هەیە، یەك فەرموودەی لە بوخاری شەریفدا هەیە، کە ژمارە/ ١٢٨٤ تەجرید = ٣١٧٦ فتح الباری. ئەشجەعییە، یەکەم شەڕگە کە ئامادەی بووە غەزای خەیبەرە، لەرۆژی ئازادکردنی قەڵای خەیبەردا ئاڵای هۆزی ئەشجەع بەو بوو، لەشام نیشتەجێ بوو، ڕاوی لەچینی دووەمی موسوڵمانان زۆرە، ئەبو هورەیرەش گێڕانەوەی لێوە ئەنجام داوە، ساڵی حەفتاو سێی کۆچی، لەسەردەمی جێنشینی عەبدولەلیکی کوڕی مەڕوانا کۆچی دوایی کردووە، (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ).

## ٣٦٨) نوێژ لەسەر تەرمی مردوو لەناو مزگەوتدا
## باب: الصَّلاَةُ عَلَى الميّت بِالْمَسْجِد

٤٧٨- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها): أَنَّهَا لَمَّا تُوُفِّيَ سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ (رضى الله عنه)، أَرْسَلَ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ يَمُرُّوا بِجَنَازَتِهِ فِي الْمَسْجِدِ، فَيُصَلِّينَ عَلَيْهِ، فَفَعَلُوا، فَوُقِفَ بِهِ عَلَى حُجَرِهِنَّ، يُصَلِّينَ عَلَيْهِ، أُخْرِجَ بِهِ مِنْ بَابِ الْجَنَائِزِ الَّذِي كَانَ إِلَى الْمَقَاعِدِ، فَبَلَغَهُنَّ أَنَّ النَّاسَ عَابُوا ذَلِكَ، وَقَالُوا: مَا كَانَتِ الْجَنَائِزُ يُدْخَلُ بِهَا الْمَسْجِدَ! فَبَلَغَ ذَلِكَ عَائِشَةَ، فَقَالَتْ: مَا أَسْرَعَ النَّاسَ إِلَى أَنْ يَعِيبُوا مَا لاَ عِلْمَ لَهُمْ بِهِ؟! عَابُوا عَلَيْنَا أَنْ يُمَرَّ بِجَنَازَةٍ فِي الْمَسْجِدِ، وَمَا صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَلَى سُهَيْلِ بْنِ بَيْضَاءَ إِلاَّ فِي جَوْفِ الْمَسْجِدِ). {الحديث: ٢٢٥٠ = ٢٢٢٦ فم. ترمذى. جنائز: ١٠٣٣. نسائى. جنائز: ١٩٦٦، ١٩٦٧. تحفة الأشراف: ١٦١٧٥. أبو داود. جنائز: ٣١٨٩، ٣١٩٠. ابن ماجة. جنائز: ١٥١٨}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص (رەزای خودای لێ بێ) فەرمانی هەقی بەجێهێناو مرد، هاوسەرەکانی حەزرەت (دروودی خودا لەسەر خۆی‌و رەزای خودا لە کەسوکارو هاوسەرەکانی) ناردیان بەشوێن تەرمەکەیدا، کە بیهێنن بۆ مزگەوت، هەتا هاوسەرەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی مردوو لەسەر تەرمەکەی بکەن، ئەوانیش وایان کردو لەناو مزگەوتا، لەبەردەم هۆدەکانی هاوسەرەکانی پێغەمبەردا تەرمەکەیان دانا، کە دەرگای هۆدەکانیان لەسەر ماڵی مزگەوت بوو، وە هاوسەرەکان نوێژیان لەسەری کرد، ئەوجا لە مزگەوت، لە دەرگای جەنائیزەوە تەرمەکەیان بردە دەرەوە کە دەچوو بەسەر جێگە دانیشتنەکاندا، جا هەواڵ گەیشتەوە بە هاوسەرانی پێغەمبەر، کە خەڵکەکە ئەم کارەی ئەوانیان پێ جوان نەبووە، وە گوتوویانە: گوایە جاران تەرم نەدەبرا بۆ ناو مزگەوت، کە ئەمە گەیشتەوە بە عائیشە فەرمووی: زۆر بە پەلە ئەو خەڵکە نەنگ لەشتێ دەگرن، کە زانستیان لەبارەیەوە نییە؟! ئەوەیان لە ئێمە کردووە بە شوورەیی، کە تەرم ببرێ بۆ مزگەوت، چ زوو لە بیریان چوو! بەخودا پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو مزگەوتا نوێژی کرد لەسەر تەرمی سوهەیل‌و تەرمی براکەی، کە هەردووکیان کوڕی بەیضاء بوون). {تاج/١، زنجیرە: ٢١١، ژمارە: ١١٠٠}.

**ڕونكردنەوە:**

١- نوێژی تەرم لەناو مزگەوتا دروستە، چونکە ئێستا دۆخ گۆڕاوە، لە مزگەوت نوێژەکە باشتر ئەنجام دەدرێ، لە مەککەو مەدینەیش، هەر لەناو مزگەوتا نوێژ لەسەر تەرم دەکرێ، لەپاش کردنی نوێژە فەرزەکان بانگەواز دەکرێ بۆی.

٢- کوڕەکانی بەیضاء سێ برابوون، ناویان سەهلو سوهەیلو صەفوان بوو، دایکیان ناوی دەعد بوو، لەبەرئەوەی سپی بوو، نازناوی بەیضاء بوو، باوکیان ناوی وەهبی کوڕی ڕەبیعە بوو. سوهەیل لە موسوڵمانە پێشینەکان بوو، کۆچی کرد بۆ حەبەشە، گەڕایەوە بۆ مەککە، لە مەککەوە کۆچی کردەوە بۆ مەدینە، ئامادەی جەنگی بەدرو جەنگانی تریش بووە، لەساڵی نۆی کۆچی لە مەدینە مردووە، پێغەمبەر خۆی نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی لەناو مزگەوتەکەی خۆیدا کردووە.

٣- بۆ ژینامەی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص بڕوانە تەجریدی بوخاری بە کوردی، ژمارە: ٢٦ = ٢٧ فتح الباری + تاج/٣، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٣٣٢٦ هەتا (٣٣٣١).

سەعد لە عەشەرەی موبەششەرەیە، واتە: لەو دە کەسەیە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مـوژدەی بەهەشتی پێیان داوە، لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکانە، لەتەمەنی چواردە ساڵیدا ئیسلام بووە، ئامادەی غەزای بەدر بووە، هەروا هی غەزاکانی تری پاش بەدریش بووە، نزای گیرابوو، یەکەم کەس بوو کە یەکەم تیری لە ڕێگەی خودادا هاویشت، لە کۆچکارە هەرە پێشینەکانە، دوو سەدو حەفتا فەرموودەی هەیە، لە بوخاریدا بیستی هەیە، لە موسلیمدا بیستو سێی هەیە، یازدەیان پەسەندی هەردوو لایە، واتە: پەسەندی هەردوو پیری بوخاریو موسلیمن، لەسەردەمی ئیمامی عومەردا، لەسەر دەستی سەعددا مەدائین ئازادکرا، کووفەی دروست کرد، عومەر کردی بەفەرمانداری سەر وڵاتی عیراق، لەپەنجاو حەوتی کۆچی دا مردووە، لە بەقیع بەخاك سپێرراوە، هاوسەرەکانی پێغەمبەر، نوێژی

تەرميان لەسەر تەرمەكەی لەناو مزگەوتا كردووە، وەك لەم فەرموودەيەدا ئەمە روون دەبێتەوە، ئەم فەرموودەيە لە موسليمدا بەسێ جۆر لە عائيشەوە دەيگێڕنەوە، ئەم گێڕانەوەی ئێرە پوختەی دوو گێڕانەوەی تريشی واتيادا، بۆيە ئيمامی مونزيری ئەمی هەڵبژاردووە بۆ موختەصەری صەحيحی موسليمەكەی.

ئەمەيش زيادەی دوو گێڕانەوەكەی ترە:

- چ زوو ئەو خەڵكە لەبيريان چوو، كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو مزگەوتا، نوێژی لەسەر سوهەيلی كوڕی بەيضاء كرد.
- عائيشە فەرمووی: سوێندم بەخودا، پێغەمبەر خۆی نوێژی تەرمی لەناو مزگەوتا، لەسەر تەرمی دوو كوڕەكەی بەيضاء كرد، كە سوهەيل‌و براكەی بوون ئيمامی موسليم دەفەرموێ: سوهەيل كوڕی ژنێكە ناوی دەعد بوو، دەعد دايكی سوهەيلە، پێشی دەگوترێ: بەيضاء.

## ٣٦٩) نوێژی مردوو لەسەر گۆڕەكەی
## بابٌ: الصَّلَاةُ عَلَى الْقَبْرِ

٤٧٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه): أَنَّ امْـرَأَةً سَـوْدَاءَ كَانَـتْ تَقُـمُّ الْمَسْـجِدَ - أَوْ شَابًّا - فَفَقَدَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَسَأَلَ عَنْهَا، أَوْ عَنْهُ، فَقَالُوا: مَـاتَ (أو ماتت). قَالَ: « أَفَلاَ كُنْتُمْ آذَنْتُمُونِى؟ ». قَالَ: فَكَأَنَّهُمْ صَغَّرُوا أَمْرَهَا - أَوْ أَمْرَهُ — فَقَالَ: « دُلُّونِى عَلَى قَبْرِهَا (أو قَبْرِهِ) فَدَلُّوهُ، فَصَلَّى عَلَيْهَـا، ثُـمَّ قَـالَ: « إِنَّ هَـذِهِ الْقُبُـورَ مَمْلُـوءَةٌ ظُلْمَةً عَلَى أَهْلِهَا، وَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُنَوِّرُهَا لَهُمْ، بِصَلاَتِى عَلَـيْهِمْ ». {الحـديث: ٢٢١٢ = ٢١٨٦ فم. تجريد/١/٢٨٨ رقم: ٢٨٠ = ٤٥٨، ١٣٣٧، ٤٦٠، أبـو داود. جنـائز: ٣٢٠٣. ابن ماجة. جنائز: ١٥٢٧ تحفة/ ١٤٦٥٠}:

ئەبو هورەيرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ژنێكی رەش (يا لاوێ) مزگەوتی دەماڵی، كە دەمرێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاگای لێ نابێ، تا رۆژێ هەواڵی دەپرسێ، دەڵێن: مردووە، دەفەرموێ: ئەی بۆ هەواڵتان بەمن نەدا؟ گوتی: وەك بڵێی كاری ئەو مردووەيان بە سووك گرتبێ وابوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی:

گۆڕەکەیم پێ نیشان بدەن، جا کە گۆڕەکەیان پێ نیشاندا، نوێژی لەسەر کرد، ئینجا فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): ئەم گۆڕانە سیخناخن لە تاریکیو، لەبەر تاریکی زۆر خاوەنەکانیان وەك لەتاریکستانابن وایە، بەڵام خودای تەواناو شکۆمەند بە مەرحەمەتی خۆی، بەهۆی ئەم نوێژەوە کەمن کردم لەسەریان، بۆیانی رۆشن دەکاتەوە!). {تاج/١، ژمارە: ١١٠١}.

### ٣٧٠) کەسێ خۆی بکوژێ (بابٌ: فِي مَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ)

٤٨٠- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: أُتِىَ النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم) بِرَجُلٍ، قَتَلَ نَفْسَهُ بِمَشَاقِصَ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْهِ. {الحديث: ٢٢٥٩ = ٢٢٣٧ فم. نسائى. جنائز: ١٩٦٣. أبو داود. جنائز: ٣١٨٥. ترمذى. جنائز: ١٠٦٨. ابن ماجة. جنائز: ١٥٣٦}:

جابیری کوڕی سەمموورە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: تەرمی پیاوێکیان هێنا بۆلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بە پەیکانێ خۆی کوشتبوو، هەتا نوێژی لەسەربکا، بەڵام پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نوێژی لەسەر نەکرد). {تاج/١، ژمارە: ١١١١ — م/د/ت/ن}.

زاناکان دەفەرموون: جەماوەری زاناکان دەفەرموون: نوێژ لەسەر تەرمی هەموو موسوڵمانێ دەکرێ، چاك بێ یا خراپ. کەواتە: نوێژ لەسەر خۆکوژ دەکرێ، هەروا لەسەر هەموو موسوڵمانێکی تریش، وەك کوژراو بەحەد، رەجمکراو لەسەر داوێنپیسی. ئەمە بۆیە پێغەمبەر نوێژی لەسە نەکردووە، بۆچاو ترساندنو تەکینەوە لەکاری وا بەدو ناهەموار.

### ٣٧١) خێری نوێژکردن لەسەر مردوو، وە شوێنکەوتنی
### بابٌ: فَضْلُ الصَّلاَةِ عَلَى الجَنَازَةِ وَإِتْبَاعِهَا

٤٨١- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ شَهِدَ الْجَنَازَةَ حَتَّى يُصَلَّى عَلَيْهَا، فَلَهُ قِيرَاطٌ، وَمَنْ شَهِدَهَا حَتَّى تُدْفَنَ فَلَهُ قِيرَاطَانِ ». قِيلَ: وَمَا الْقِيرَاطَانِ؟ قَالَ: « مِثْلُ الْجَبَلَيْنِ الْعَظِيمَيْنِ ». {الحديث: ٢١٨٦ = ٢١٥٩ فم. تجريد/٢، ژمارە: ٦٣٤ = ١٣٢٤. نسائى. جنائز: ١٩٩٤. تحفة الأشراف: ١٣٩٥٨}:

ئـەبو هـورەیرە (خـوای لێ رازی بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ ئامادەی بەرێکردنی تـەرمێ بێ هـەتا نوێـژی لەسـەر دەکرێ قیراتێکی بۆ هەیـە، وە هەرکەسـێ لەگـەڵیابێ هـەتا دەنێـژرێ ئـەوە دوو قیراتـی بـۆ هەیـە). گـوترا: ئـەی پێغەمـەری خـودا! ئـەو دوو قیراتـە چـەند دەبـن؟ فـەرمووی: (بەقـــەد دوو کێـــوی گـــەورە دەبـــن). {تـــاج/١، زنجـــیرە: ٢١٠، ژمـــارە: ١٠٩٧} + {ریاض/٢/٣٥٩، زنجیرە: ١٥٥، ژمارە: ٩٢٩، ٩٣٠}.

## ٣٧٢) هەر موسوڵمانێ، سەد موسوڵمان نوێژ لەسەر تەرمەکەی بکەن و تکای بۆبکەن لەلای خودا، مسۆگەر خودا تکاکەیان قەبووڵ دەکا

## بابٌ: مَنْ صَلَّى عَلَيْهِ مِائَةٌ شُفِعُوا فيهِ

٤٨٢- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «مَا مِنْ مَيِّتٍ يُصَلِّى عَلَيْهِ أُمَّةٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ يَبْلُغُونَ مِائَةً، كُلُّهُمْ يَشْفَعُونَ لَهُ، إلاَّ شُفِّعُوا فِيهِ». {الحديث: ٢١٩٥ = ٢١٦٨ فم. ترمذى. جنائز: ١٠٢٩. نسائى. جنائز: ١٩٩٠}:

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) فـەرمووی: حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەر بێ) دەفـەرموێ: هـەر مردوویـێ کـە کۆمـەڵێ موسـوڵمان ژمارەیـان بگاتـە سـەد کـەس نوێـژی لەسـەر بکەن، وە هەموویان تکای بۆ بکەن، بێگومان کە تکاکەیان بۆی گیرا دەبێ). {تـاج/١، زنجیرە: ٢١٤، ژمارە: ١١٠٦} + {ریاض/٢/٣٦١، زنجیرە: ١٥٦، ژمارە: ٩٣٢، ٩٣٤}.

## ٣٧٣) هەر موسوڵمانێ چل کەس نوێژی لەسەر بکەن تکایان گیرایە بۆی

## باب: مَنْ صَلَّى عليه أربعون شُفِعُوا فيه

٤٨٣- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما): أَنَّهُ مَاتَ لَهُ ابْنٌ بِقُدَيْدٍ أَوْ بِعُسْفَانَ، فَقَالَ يَا كُرَيْبُ انْظُرْ مَا اجْتَمَعَ لَهُ مِنَ النَّاسِ، قَالَ: فَخَرَجْتُ، فَإِذَا نَاسٌ قَدِ اجْتَمَعُوا لَهُ، فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: تَقُولُ هُمْ أَرْبَعُونَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: أَخْرِجُوهُ، فَإِنِّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « مَا مِنْ رَجُلٍ مُسْلِمٍ يَمُوتُ، فَيَقُومُ عَلَى جَنَازَتِهِ أَرْبَعُونَ رَجُلاً، لاَ يُشْرِكُونَ

بِاللَّـهِ شَـيْئًا، إِلاَّ شَـفَّعَهُمُ اللَّـهُ فِيـهِ ». {الحديث: ٢١٩٦ = ٢١٦٩ فـم. أبـو داود. جنـائز: ٣١٧٠. ابن مـاجة. جنائز: ١٤٨٩. تحفة الأشراف: ١٣٥٦} :

کورەیب ئازادکراوی ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فـەرمووی: لـە قودەیـد، یـا لـە عوسفان، کوڕێکی ئیبنو عەبباس مرد، ئیبنو عەباس پێی فـەرمووم: ئـەی کورەیـب! دەرچۆ بزانە ئەو خەڵکەی کۆبوونەتەوە لەسەر ئـەم تەرمـە چـەندێکن؟ فـەرمووی: منیش دەرچووم تەماشام کرد کۆمەڵێ خـەڵك کۆبونەتـەوە لـەلای، هاتمـەوە بـۆلای‌و هەواڵەکەم پێی گوت، فەرمووی: بـە زەینـت چـل کـەس دەبـن؟ گـوتم: بـەڵێ، دەبـن. فەرمووی: دەی کەواتە تەرمەکە دەرکەن‌و بیبەن بۆ گۆڕستان، چـونکە مـن بۆخـۆم لـەزاری پـیرۆزی پێغەمبـەرم بیسـت دەیفـەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (هـەر پیـاوێ لـە موسوڵمانان، کـە دەمـرێ، چـل پیـاو (کـە هـیچ شـەریك‌و هاوبـەش بـۆ خـودا پەیـدا نەکەن) نوێژ لەسەر تەرمەکەی بکەن، بێگومان کە خودا تکایـان لێ گیرادەکا بـۆی). {تاج/١، زنجیرە: ٢١٤، ژمارە: ١١٠٧} .

**روونکردنەوە:**

١- لەم جۆرە شوێنەدا، وشەی (رجل = پیاو) بۆ تەغلیبە، چونکە لە یاسا نامـەی خـوادا، بـەپێی بـاوی دامـەزراوی نـاو کۆمـەڵ، زوربـەی کـات رووی قسـە لـە پیاوانە، بەڵام لەراستیدا، هـەموو گوفتوگـۆو بڕیارێـك، وەکوو یـەك نێرومـێ دەگرێتەوە، مەگەر بەڵگەیێ، یا نیشانەیێ هەبێ، کە دەقەکە تایبـەت بکـا بـە لایەکیانەوە، لەدوو رەگەزەکـە، کەواتـە لـەم بابەتـەدا ژنـیش هەروایـە، چ تکـا بکا، چ تکای بۆ بکرێ. {بڕوانە: تەجرید/١ بە کوردی، ژمارە: ١٣} .

٢- کـورەیبی کـوڕی ئـەبو موسـلیمی هـاشمی، هـەم بەنـدەی ئـازاد کـراوی ئیبنـو عەباس بوو، هەم فەقێی بوو، تا سەردەمی جێنشینی ئیمامی عوسمان ژیـاوە، گێڕانـەوەی لەزۆر لە هاوەڵانەوە ئەنجام داوە، وەك: ئوم فـەضل‌و مەیموونـەی خوشکی ئوم فەضل‌و عائیشەو ئوم سەلەمەو ئوم هانیئ.

فـەقێی زۆریـش لـەوەوە گێڕانـەوەیان ئـەنجام داوە،،، موسـای کـوڕی عوقبـە دەفـەرموێ: بـاری وشـترێ کتێبـی ئیبنـو عـەباس، کورەیـب لـەلای ئێمـە داینـابوو. پیاوێکی بتمانە پێکراو بوو، لەپیاوانی شەش پەڕاوەکەیە، کە بوخاریو موسلیمو ئـەبو داوودو تەرمـەزیو نەسـائیو ئیبنـو ماجەیـە، واقیـدیو کەسـانی تـریش دەفەرموون: لە مەدینە مردووە، ساڵی نەوەتو هەشتی کۆچی، لـەکاتی جێنشینیی سولەیمانی کوڕی عەبدولەلیکدا. {بڕوانە: تهذیب التهذیب لابن حجر العسقلاني، مجلد/٨ ص٤٣٣، ژمارە: ٧٨٣}.

## ٣٧٤) باسی مردوویێ، کە ناوێ ببرێ بەچاکە یان بە خراپە
## باب: فِيمَنْ يُثْنَى عَلَيْهِ بِخَيْرٍ أَوْ شَرٍّ مِنَ الْمَوْتَى

٤٨٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضى الله عنه) قَالَ: مُرَّ بِجَنَازَةٍ فَأُثْنِىَ عَلَيْهَا خَيْراً، فَقَالَ نَبِىُّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « وَجَبَتْ، وَجَبَتْ، وَجَبَتْ ». وَمُرَّ بِجَنَازَةٍ فَأُثْنِىَ عَلَيْهَا شَراً، فَقَالَ نَبِىُّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « وَجَبَتْ، وَجَبَتْ، وَجَبَتْ ». فَقَالَ عُمَرُ: فِدًى لَكَ أَبِى وَأُمِّى، مُرَّ بِجَنَازَةٍ، فَأُثْنِىَ عَلَيْهَا خَيْرًا، فَقُلْتَ: وَجَبَتْ، وَجَبَتْ، وَجَبَتْ. وَمُرَّ بِجَنَازَةٍ فَأُثْنِىَ عَلَيْهَا شَرًّا، فَقُلْتَ: وَجَبَتْ، وَجَبَتْ، وَجَبَتْ؟! فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ خَيْرًا وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ، وَمَنْ أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ شَرًّا، وَجَبَتْ لَهُ النَّارُ، أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللَّهِ فِى الأَرْضِ، أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللَّهِ فِى الأَرْضِ). {الحديث: ٢١٩٧ = ٢١٧٠ فم. تجريد/٢/٧٣، رقم: ٦٥٠ = ١٣٦٧، ٢٦٤٢. نسائي. جنائز: ١٩٣٤. ترمذي. جنائز: ١٠٥٨. ابن ماجة. جنائز: ١٤٩١. تحفة الأشراف: ١٠٠٤}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەرو کۆمەڵێ لە هاوڕێیانی دانیشتبوون، تـەرمێ لەلایانـەوە رەت بـوو، خەڵکەکە وەسـفی باشـیی ئـەویان کـرد، پێغەمبەری خودایش (دروودی خودای لەسەر بێو سەروماڵو منداڵو باوكو دایكو هەستو نەست گشتی بەقوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێ) سێ جار لەسـەر یەك فەرمووی: (پێویست بوو).

جا تـەرمێکی تـریش لەلایانـەوە تێپـەڕی، خەڵکەکـە بەخراپـە ناویـان هێنـا، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) دیسـان سـێجار لەسـەریەك فەرموویـەوە: (پێویسـت بـوو). عومـەری کـوڕی خـەتابیش (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: ئـەی پێغەمـەری خـودا! باوكو دایکم بەقوربانت بن، چی پێویست بـوو، مەبەسـتت چییە لـەوە کەلـەم دوو کاتەدا فەرمووت: پێویست بوو؟

پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو کەسەی کە ئێوە پەسـنی باشـی ئەو بکەنو بە چاکە ناوی ببەن، ئەوە بەهەشت پێویست دەبێ بۆی، وە ئەو کەسەی کە ئێوە باسی خراپەی ئەو بکەنو بەخراپە ناوی بەرن، دۆزەخ پێویست دەبێ بۆی، چونکە ئێـوە شـایەتانی خـودان لەسـەر رووی زەوی، ئـەوەی شـایەتی باشـی بۆبـدەن بەهەشـت بـۆ خـۆی دابـین دەکـا، ئـەوەی شـایەتی خراپـی لێ بـدەن، ئـاگری دۆزەخ مسۆگەر دەکا بۆ خۆی). {تاج/١، زنجیرە: ٢١٥، ژمارە: ١١٠٩، ١١١٠}.

## ٣٧٥) کەسێ نوێژ لەسەر تەرم بکاو دوایی بەسواریی بگەڕێتەوە
## بابٌ: رُکوبُ المُصلّی علَی الجَنَازَةِ

٤٨٥- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَلَى ابْنِ الدَّحْدَاحِ، ثُمَّ أُتِىَ بِفَرَسٍ عُرْىٍ، فَعَقَلَهُ رَجُلٌ فَرَكِبَهُ، فَجَعَلَ يَتَوَقَّصُ بِهِ وَنَحْنُ نَتَّبِعُهُ، نَسْعَى خَلْفَهُ، قَالَ: فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: إِنَّ النَّبِىَّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « كَمْ مِنْ عِذْقٍ مُعَلَّقٍ - أَوْ مُدَلًّى - فِى الْجَنَّةِ لاِبْنِ الدَّحْدَاحِ ». {الحديث: ٢٢٣٦ = ٢٢١٢ فم. نسائی. جنائز: ٢٠٢٨. أبو داود. جنائز: ٣١٧٨}:

جابیری کـوڕی سـەموورە (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) نوێـژی لەسـەر تـەرمی ئیبنـو دەحـداح کـرد، لەگـەڵ تەرمەکەیـدا رۆیشـت بۆسـەر قەبران، کاتێ ناشتیان کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ویستی بگەڕێتەوە، ئەسپێکیان بە پشتی رووتـی هێنـا بـۆی، پیـاوێ سـەری ئەسپەکەی گـرت، ئـەویش سـواری بـوو، ئەسپەکە بەهەڵبەز هەڵبەز دەڕۆیشت، ئێمـەیش بەهـەڕاکردن شـوێنی کـەوتین، جا

پیاویّ گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمویّ: (چەندین هێشووی خورمای هەڵواسراو (یا شۆڕەوە بوو) لە بەهەشتا هی ئیبنو دەحداحە).

نەوەوی (رەحمەتی خودای لیّ بێ) دەفەرموون: هۆی ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەمە بووە: جاریّ هەتیویّ لەگەڵ ئەبولوبابەدا، لەسەر دارخورماییّ دەبیّ بەکێشەیان، کوڕەکە دەست دەکا بە گریان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە ئەبو لوبابە دەفەرمویّ: (بیدە بەو، من دەبم بە کەفیلی دارخورمایە بۆت لە بەهەشتا). دەڵیّ: نایدەم، ئیبنو دەحداح ئەمە دەبیستیّ، دەچیّ ئەودارە خورمایە لە ئەبو لوبابە بە باخچەییّ دەکڕیّ. ئەوجا عەرزی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەکا: ئەگەر بیدەم بەو هەتیوە، تۆ دەبی بە کەفیلی دارخورمایە بۆم لە بەهەشتا؟ دەفەرمویّ: (بەڵیّ). ئەویش دەیداتیّ، پێغەمبەریش دەفەرمویّ: (چەندەها هێشووی... تاد). {بڕوانە: تاج/١، زنجیرە: ٢١٨، ژمارە: ١١١٨}.

## ٣٧٦) قەیفە لە گۆڕا ڕاخستن بۆ تەرم

## بابٌ: جَعْلُ القَطِيفَةِ فِي القَبْرِ

٤٨٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضی الله عنهما) قَالَ: جُعِلَ فِی قَبْرِ رَسُولِ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم) قَطِيفَةٌ حَمْرَاءُ. {الحديث: ٢٢٣٨ = ٢٢١٤ فم. نسائی. جنائز: ٢٠١١. ترمذی. جنائز: ١٠٤٨ تحفة: ٦٥٢٦}:

ئەم فەرموودەیە لەتاجدا ئاوایە، دەیکەین بە ڕوونکردنەوە بۆ ئەم فەرموودەی ئێرە {تاج/١/٥٣٢، زنجیرە: ٢٠٢، ژمارە: ١٠٦٨}:

لە جەعفەری کوڕی موحەممەدەوە، لە باوکیەوە (خوایان لیّ رازی بێ) فەرمووی: ئەبو طەلحە لادڕ (ئەڵحەدی گۆڕ)ەکەی پێغەمبەری دروست کرد (دروودی خودای لەسەر بێ) واتە: لەبەری قیبلەی گۆڕەکەوە، قوموشێکی بۆ شوێنی تەرمەکە دروست کرد، جا کە لاشەی پێغەمبەریان لەناوا دانا، بە نۆ خشتی کاڵ لای پشتیان هەڵچنی. فەرمووی: شەقرانی نۆکەری پێغەمبەریش، کە ئازادکراوی خۆی بوو، پارچە قەیفەیەکی سووری، لەژێر تەرمەکەیدا، لە گۆڕەکەیدا ڕاخست، ئەو

شەقرانەی کەخۆی دەیگوت: بەخودا خۆم پارچە قەیفەکەم لەناو گۆڕەکەدا، لەژێر تەرمەکەی پێغەمبەردا راخست.

### ٣٧٧) باسی ئەڵحەد (لادڕ)و هەڵچنینی پشتی مردوو بەخشتی کاڵ.
### باب: فِي اللَّحْدِ وَنَصْبِ اللَّبِنِ عَلَى الميِّتِ

٤٨٧- عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ: أَنَّ سَعْدَ بْنَ أَبِى وَقَّاصٍ (رضى الله عنه) قَالَ فِى مَرَضِهِ الَّذِى هَلَكَ فِيهِ: الْحَدُوا لِى لَحْدًا، وَانْصِبُوا عَلَيَّ اللَّبِنَ نَصْبًا، كَمَا صُنِعَ بِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). {الحديث: ٢٢٣٧ = ٢٢١٣ فمز نسائى. جنائز: ٢٠٠٧. تحفة: ٣٨٦٧}:

عامیری کوڕی سەعد فەرمووی: سەعدی کوڕی ئەبو وەققاصی باوکم، لەو نەخۆشینەدا، کە تیادا مرد، رایسپارد، فەرمووی: گۆڕی لادڕم بۆ لێدەن و، بەخشتی کاڵ لای پشتم بگرن، پێغەمبەریان چۆن لێکرد لەکاتی ناشتنی دا منیش هەروا. {تاج/١، زنجیره: ٢٢١، ژماره: ١١٣٠}.

**ڕوونکردنەوە:**

مردوو بە دوو شێوە لەناو گۆڕەکەیدا دەنێژرێ، بەپێی خاکی وڵاتەکە، بڕیاری شێوەیێ لەو دوو شێوەیە ئەدرێ:

١- لادڕ (لەحد) کە ئەوەیە قەبرەکە بەقەد بالآیێ قوڵ دەکرێ، ئەوجا لە تەختی گۆڕەکەدا، لەبەری قیبلەیەوە، بە درێژایی گۆڕەکە، بنکەنێ (قومووشێ) هەڵ دەکەنرێ، ئەوەندە بێ، کە لەشی مردووەکە، لەسەر شانی راست، بە درێژی بگرێ، ئەوجا لای پشتی مردووەکە، بەخشتی کاڵ هەڵ دەچنرێ، یا بە تەختە دار، یا بە تەختە بەرد. ئەوجا قەبرەکە بەخۆڵەکەی پڕ دەکرێتەوە.

٢- گۆڕیچە (شِقّ) کە ئەوەیە لە تەختی گۆڕەکەدا، لەناوەڕاستیدا، بە درێژایی گۆڕەکە، جۆگەلەیێ هەڵبکەنرێ، بە ئاسانی جێگەی مردووەکەی تیا ببێتەوە، کە بەدرێژی لەسەر لای راست بەرەو قیبلە درێژ بکرێ، ئەوجا بەخشتی کاڵ،

یا بەتەختە دار، یا بەتەختە بەرد، یا بەهەرشتێ کەدەست بدا، تەختە پۆش بکرێ، جاری وا هەیە، گۆڕیچەکە ئاوا دروست دەکرێ: لە تەختی گۆڕەکەدا، جۆگەلەیێ دروست دەکەن، ئەملا و ئەولای، بە بەرد، یا بەشتێ لەبار هەڵدەچنرێ‌و ئەوجا تەرمی مردووەکەی رووەو رووگە لەسەر شانی راست، لەسەر باری درێژی تیادا دادەنرێ‌و ئەوجا تەختە پۆش دەکرێ، کەمێ بەرزتر لە تەرمەکە، تا بەرلەشی نەکەوێ.

## ٣٧٨) فەرمانکردن بەتەخت کردنی گۆڕ
## باب: الأمر بِتَسْوِيَةِ الْقُبُور

٤٨٨- عَنْ أَبِى الْهَيَّاجِ الأَسَدِيِّ قَالَ: قَالَ لِى عَلِيُّ بْنُ أَبِى طَالِبٍ: أَلاَّ أَبْعَثُكَ عَلَى مَا بَعَثَنِى عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ لاَ تَدَعَ تِمْثَالاً إِلاَّ طَمَسْتَهُ، وَلاَ قَبْرًا مُشْرِفًا إِلاَّ سَوَّيْتَهُ). {الحديث: ٢٢٤٠ = ٢٢١٦ فم. أبو داود. جنائز: ٣٢١٨. ترمذى. جنائز: ١٠٤٩. نسائى. جنائز: ٢٠٣٠. تحفة الأشراف: ١٠٠٨٣}:

ئەبولهەيياج (خوای لێ رازی بێ) فەرمووی: عەلی کوڕی ئەبو طالیب فەرمووی پێم: بزانە! لەسەر ئەو رێبازە راستە دەتنێرم کە کاتی خۆی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) منی نارد لەسەری، کە ئەمەیە: کە هەرچی پەیکەرێکت دی کوێری بکەرەوە، وە هەرچی گۆڕێکی قنج‌و قیتت بینی تەختی بکەو متی بکە بەزەوییەکەوە).
{تاج/١، زنجیرە: ٢٢١، ژمارە: ١١٣١ — م/د/ت/ن}.

## ٣٧٩) ناباشیی خانوو کردن لەسەر گۆڕو گەچکاری کردنی
## باب: كَرَاهَةُ الْبِنَاءِ وَالتَّجْصِيصُ عَلَى الْقُبُورِ

٤٨٩- عَنْ جَابِرٍ (رضى الله عنه) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ يُجَصَّصَ الْقَبْرُ، وَأَنْ يُقْعَدَ عَلَيْهِ، وَأَنْ يُبْنَى عَلَيْهِ). {الحديث: ٢٢٤٢ = ٢٢١٨ فم. أبو داود. جنائز: ٣٢٢٦. ترمذى. جنائز: ١٠٥٢. نسائى. جنائز: ٢٠٢٦. تحفة الأشراف: ٢٧٩٦}:

جابیر (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەهی كردووە لە گەچكاریكردنی گۆڕو لە دانیشتن لەسەریو لە دروستكردنی خانوو لەسەری (م/د/ت/ن) گفتەی تیرمیذی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) جڵەو گیریی دەكا لەگەچكاریكردنی گۆڕو لە نووسین لەسەریو لە دروستكردنی گومەزو خانوو لەسەریو، لە شێلانو پێ لێنانی). {تاج/١، زنجیرە: ٢٢٢، ژمارە: ١١٤٠}.

**٣٨٠) ئەوەی دەمرێ بەیانیانو ئێواران جێگەی خۆی پیشان دەدرێ.**

(٧١٤٠ - ٧١٥٣).

**باب: إذا مات المرءُ عُرِضَ عليهِ مَقعَدُهُ بالغداةِ والعشيّ**

٤٩٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا مَاتَ عُرِضَ عَلَيْهِ مَقْعَدُهُ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ، إِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَمِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَمِنْ أَهْلِ النَّارِ، يُقَالُ: هَذَا مَقْعَدُكَ حَتَّى يَبْعَثَكَ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ». {الحديث: ٧١٤٠ = ٧١٦٧ فم. تجريد/٢/٧٨، رقم: ٦٥٨ = ١٣٧٩، ٣٢٤، ٦٥١٥}:

عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئێوە كاتێ دەمرن، گشت رۆژێ بەیانیانو ئێواران، هەركەسەتان، جێگەی خۆی پیشان دەدرێ، جا ئەگەر بەهەشتی بێ ئەوا جێگەی خۆی لەبەهەشتا دەبینێ، وە ئەگەر دۆزەخی بێ، ئەوا جێگەی خۆی لە دۆزەخا دەبینێ، وە پێی دەڵێن: ئەمە جێگەتە، لە رۆژی قیامەتا، كەخودا زیندووت دەكاتەوە، دێیتە ئێرەو ئەمە ماڵی هەتا هەتاییتە). {تاج/١/٥٧٠، زنجیرە: ٢٢٤، ژمارە: ١١٤٨}.

**٣٨١) دوو فریشتە لەپاش نێژتنی مرۆڤ چەند پرسیارێكی لێ دەكەن**

**باب: سُؤالُ المَلَكَيْنِ لِلعَبْدِ إِذا وُضِعَ في قَبْرِهِ**

٤٩١- عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ، وَتَوَلَّى عَنْهُ أَصْحَابُهُ، إِنَّهُ لَيَسْمَعُ قَرْعَ نِعَالِهِمْ».

(زَادَ فِي رِوَايَةٍ: إِذَا انْصَرَفُوا) قَالَ: « يَأْتِيهِ مَلَكَانِ فَيُقْعِدَانِهِ، فَيَقُولاَنِ لَهُ: مَا كُنْتَ تَقُولُ فِي هَذَا الرَّجُلِ؟». قَالَ: « فَأَمَّا الْمُؤْمِنُ فَيَقُولُ: أَشْهَدُ أَنَّهُ عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ ». قَالَ: « فَيُقَالُ لَهُ: انْظُرْ إِلَى مَقْعَدِكَ مِنَ النَّارِ قَدْ أَبْدَلَكَ اللَّهُ بِهِ مَقْعَدًا مِنَ الْجَنَّةِ، قَالَ نَبِيُّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « فَيَرَاهُمَا جَمِيعًا ». قَالَ قَتَادَةُ: وَذُكِرَ لَنَا أَنَّهُ يُفْسَحُ لَهُ فِي قَبْرِهِ سَبْعُونَ ذِرَاعًا، وَيُمْلأُ عَلَيْهِ خَضِرًا إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ). {الحديث: ٧١٤٥ = ٧١٧٢ فم. تجريد/٢/٥٨، رقم: ٦٣٨ = ١٣٣٨، ١٣٧٤. أبو داود. جنائز: ٣٢٣١. نسائي. جنائز: ٢٠٥٠. تحفة الأشراف: ١٣٠٠}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ بەندە دایدەنێن لەناو گۆڕەکەیداو، هاوڕێکانی بەرەودوا دەگەڕێنەوە، هێشتا گوێی لە چرپەی کەوشەکانیانە، کە دوو فریشتە کە ناویان نەکیرو مونکەرە، دەگەنە سەری‌و دایدەنیشێنن‌و پێی دەڵێن: باوەڕت چییە سەبارەت بەم پیاوە؟ واتە: دەربارەی ئەم پیاوە کەناوی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵایە بیرو باوەڕت چییەو چی نییە؟! فەرمووی: (جا ئەوەی موسوڵمان بێ، لە وەڵامیانا بە زمانێکی ڕەوان دەڵێ: ئاگادارم کە ئەم پیاوە بەندەی باش‌و پێغەمبەری خودایە، ئەوجا پێی دەگوترێ: ئائەوە جێگەی تۆ بوو لەناو ئاگری دۆزەخدا، سەیریکە خودا بۆی گۆڕیویتەوە بەو شوێنە خۆشە، لەبەهەشتا، جا ئەویش هەردوو جێگەکە بەچاوی خۆی دەبینێ، قەتادە فەرمووی: باسکرا بۆ ئێمە: کە ئیتر حەفتا باڵ گۆڕەکەی گوشاد دەکرێ بۆی‌و پڕ ئەبێ لە بەهرەو خەڵاتی تەڕو تازەو زۆر هەتا ڕۆژی قیامەت).

لە بوخاریدا ئەمەی پترە: (بەڵام بێبڕوا (یا دوو ڕوو) کە هەمان پرسیاری لێ دەکرێ، دەڵێ: ئاگام لەهیچ نییە، ئەوەندە هەیە سەیری دەمی خەڵکم کردووە، ئەوان چییان گوتووە منیش ئەوەم گوتووە! ئەوانیش پێی دەڵێن: دەك هەر نەزانیت! ئیتر یەك گورزی ئاسنینی لێ دەدەن، ئەوسا لەتاوا یەك قیژە دەکا،

هەرچی لەدەورو بەریەتی دەیبیستێ، مرۆڤو جنۆکە نەبێ، ئەو دوو رەگەزە نایبیستن). {تاج/١/٥٦٨، ژمارە: ١١٤٦، زنجیرە: ٢٢٤}.

**٣٨٢) باسی فەرمایشتی خودای گەورە: {يُثَبِّتُ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ} کە مەبەست لەم ئایەتە لەناو گۆڕدا روودەدات.**

**بابٌ: فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: {يُثَبِّتُ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ} وَ إِنَّهُ فِي الْقَبْرِ**

٤٩٢- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « (يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ). قَالَ: « نَزَلَتْ فِى عَذَابِ الْقَبْرِ، يُقَالُ لَهُ: مَنْ رَبُّكَ؟ فَيَقُولُ: رَبِّىَ اللَّهُ، وَنَبِيِّىَ مُحَمَّدٌ (صلى الله عليه وسلم)، فَذَلِكَ قَوْلُهُ عَزَّ وَجَلَّ: (يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِى الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِى الآخِرَةِ). {الحديث: ٧١٤٨ = ٧١٧٥ فم. تجريد/٢/٧٥، رقم: ٦٥٢ = ١٣٦٩، ٤٦٩٩. أبو داود. سنة: ٤٧٥٠. ترمذی. تفسير: ٣١٢٠. نسائی. جنائز: ٢٠٥٦. ابن ماجة. زهد: ٤٢٦٩}:

بەرائی کوڕی عازیب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: {يُثَبِّتُ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ — ١٤/٢٧} واتە: خودای گەورە بەهۆی ئەم وتارە دامەزراوە جوانەوە کەوشەی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ وَأَنَّ محمداً رَسُولُ اللّهِ)یە موسوڵمان رزگار دەکاو دایدەمەزرێنێ لە دنیاو لە قیامەتدا}. فەرمووی: ئەم ئایەتە سەبارەت بەسزای گۆڕ هاتە خوارەوە، موسوڵمان کاتێ دەمرێو دەینێژن، دوو فریشتە (کە ناویان نەکیرو مونکیرە) بۆ تاقیکردنەوە، دێنە سەریو دایدەنیشێننو لێی دەپرسن: خوات کێیە؟ پێغەمبەرت کێیە؟ لەسەرچی ئاینێکی؟ خودای گەورەیش ئاڕاستەی دەکاو دەڵێ: خودای من یەزدانی پاکەو موحەممەد پێغەمبەرمە، جا مەبەست ئەم پرسیارو وەڵامەیە، کە لەقورئاندا دەفەرموێ: {يُثَبِّتُ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ — ١٤/٢٧ — سورة إبراهيم}. {تاج/١/٥٦٨، ژمارە: ١١٤٥}.

## ٣٨٣) باسی سزای ناوگۆڕو پەناگرتن بەخودا لێی
## باب: فِي عَذَابِ القَبْرِ وَالتَّعَوُّذِ مِنْهُ

٤٩٣- عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ (رضى الله عنه) قَالَ: بَيْنَمَا النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) فِى حَائِطٍ لِبَنِى النَّجَّارِ، عَلَى بَغْلَةٍ لَهُ، وَنَحْنُ مَعَهُ، إِذْ حَادَتْ بِهِ، فَكَادَتْ تُلْقِيهِ، وَإِذَا أَقْبُرٌ سِتَّةٌ أَوْ خَمْسَةٌ، أَوْ أَرْبَعَةٌ (قَالَ: كَذَا كَانَ يَقُولُ الْجُرَيْرِىُّ) فَقَالَ: « مَنْ يَعْرِفُ أَصْحَابَ هَذِهِ الأَقْبُرِ؟ ». فَقَالَ رَجُلٌ: أَنَا، قَالَ: « فَمَتَى مَاتَ هَؤُلاَءِ؟». قَالَ: مَاتُوا فِى الإِشْرَاكِ، فَقَالَ: « إِنَّ هَذِهِ الأُمَّةَ تُبْتَلَى فِى قُبُورِهَا، فَلَوْلاَ أَنْ لاَ تَدَافَنُوا لَدَعَوْتُ اللَّهَ أَنْ يُسْمِعَكُمْ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ الَّذِى أَسْمَعُ مِنْهُ». ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ فَقَالَ: « تَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ». فَقَالُوا: نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ النَّارِ. قَالَ: « تَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ ». فَقَالُوا نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، قَالَ: « تَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنَ الْفِتَنِ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ، قَالَ: « تَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ ». قَالُوا: نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ. {الحديث: ٧١٤٢ = ٧١٦٩ فم. إنفردَ بِهِ مُسْلِمٌ مِنْ بَيْنِ الأَئِمَّةِ السِّتَةِ. تحفة الأشراف: ٣٧١٦} :

زەیدی کوڕی ثابیت (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەسواری هێسترێکی خۆی بەناو باخە خورمایەکی بەنی نەجاردا دەڕۆیشت، ئێمەیش کۆمەڵێ بووین لە یارانی، لە خزمەتیدا بووین، لەپڕ لەناکاو هێسترەکە هەڵسەڵەمییەوەو بەلەسە بوو، وەختەوە بوو کە پێغەمبەر فڕێ بداتە خوارەوە، کە تەماشامان کرد ئەوا شەش یا پێنج یا چوار گۆڕ دەرکەوتن (جورەیری لە ژمارەی گۆڕەکانا بەشك بوو) تومەز هێسترەکە قیژەو هاتو هاواری ناو گۆڕەکان رایچەناندبوو، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ڕوونکردنەوەی کارەکە پرسی: (کێ خاوەنی ئەم گۆڕانە ئەناسێو ئەم گۆڕانە هی کێن) پیاوێ گوتی: من دەیانناسم. فەرمووی پێی: (ئەمانە لەچی سەردەمێکا مردوون؟). گوتی: لەسەردەمی فرە خواییدا مردوون، لەپێش هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلاما مردوونو لێرەدا نێژراون. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەم گەلی ئیسلامە لەناو گۆڕدا، تاقی دەکرێنەوەو دووچاری مەینەت دەبن، مەبادا لاشەی یەکتری نەنێژن، ئەگەر سزای ناو گۆڕ ببیستن، دەنا داوام لەخودا دەکرد کە کارێکی وای بکردایە، کە گوێتان

لەسزاو ئێش‌و ئازاری ناو گۆڕ ببوایە، وەك من گوێم لێیەتی). ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رووی تێکردین‌و فەرمووی: (پەنابگرن بەخودا لەسزای ئاگری دۆزەخ)، فەرموویان: پەنادەگرین بەخوا لە سزای ئاگری دۆزەخ، فەرمووی: (پەنا بگرن بەخودا لە سزای ناو گۆڕ) فەرموویان: پەنا دەگرین بەخودا لە سزای ناو گۆڕ. فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (پەنا بگرن بەخودا لە فەرتەنەو ئاژاوەکان، لە ئاشکراو لە نهێنییان). گوتیان: پەنا دەگرین بەخودا لە فەرتەنەو ئاژاوەکان، لە ئاشکراو لە نهێنییان. فەرمووی: (پەنا بگرن بەخودا لە ئاژاوەی جەجاڵ) هەموو گوتیان:پەنا دەگرین بەخودا لە ئاژاوەی جەجاڵ).{تاج/١/٥٧٢،زنجیرە: ٢٢٤،ژمارە:١١٥٣} .

### ٣٨٤) سزای جوولەکە لە گۆڕەکانیاندا
### بَابٌ: تَعْذِيبُ يَهُودَ فِي قَبْرِهَا

٤٩٤- عَنْ أَبِى أَيُّوبَ (رضى الله عنه) قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بَعْدَ مَا غَرَبَتِ الشَّمْسُ، فَسَمِعَ صَوْتًا، فَقَالَ: « يَهُودُ تُعَذَّبُ فِى قُبُورِهَا ». {الحديث: ٧١٤٤ = ٧١٧١. تجريد/٢/٧٨ رقم: ٦٥٦ = ١٣٧٥. نسائى. جنائز: ٢٠٥٨. تحفة الأشراف: ٣٤٥٤} :

ئەبو ئەییوبی ئەنصاری (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش خۆرئاوا بوون، تەشریفی دەرچوو بۆ دەرەوەی مەدینە، دەنگێکی سامناکی بیست، لەبارەیەوە فەرمووی: (ئەوە جوولەکەن لە گۆڕەکانیانا سزاو ئازار دەدرێن!).

### ٣٨٥) سەردانی گۆڕستان‌و پاڕانەوە بۆیان
### باب: فِي زِيَارَةِ الْقُبُورِ وَالإِسْتِغْفَارِ لَهُمْ

٤٩٥- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: زَارَ النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم) قَبْرَ أُمِّهِ، فَبَكَى، وَأَبْكَى مَنْ حَوْلَهُ، فَقَالَ (صلى الله عليه وسلم): « اسْتَأْذَنْتُ رَبِّى فِى أَنْ أَسْتَغْفِرَ لَهَا، فَلَمْ يَأْذَنْ لِى، وَاسْتَأْذَنْتُهُ فِى أَنْ أَزُورَ قَبْرَهَا فَأُذِنَ لِى، فَزُورُوا الْقُبُورَ، فَإِنَّهَا

تُذَكِّرُ الْمَوْتَ ». {الحديث: ٢٢٥٦ = ٢٢٣٢ فم. أبو داود. جنائز: ٣٢٣٤. نسائی. جنائز: ٢٠٣٣}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **ساڵی شەشی کۆچی تەشریفی رۆیشت بۆ سەردانی گۆڕی دایکی، کەوا لە ئەبواء، لەسەر گۆڕەکەی گریا بۆی‌و ئەوانەیشی کردە گریان کە لەگەڵیا بوون، ئەوجا فەرمووی** (درودی خودای لەسەر بێ): **(داوام لە پەروەردگارم کرد کە رێگەم بدا کە بۆ دایکم بپاڕێمەوە، رێگەی ئەوەی نەدام، بەڵام داوام لێی کرد کە رێگەم بدا دێنی گۆڕەکەی بکەم، رێگەی ئەوەی پێدام، کەوابوو ئێوەیش لەمەودوا دیدەنی گۆڕستان بکەن، چونکە دیمەنی گۆڕو گۆڕستان یادی مردن‌و رۆژی ژینەوە تازە دەکاتەوەو دنیا لەبەر چاوی مرۆڤ دەخاو قیامەتی لەلا شیرین دەکا). {تاج/١/٥٧٨، زنجیرە: ٢٢٧، ژمارە: ١١٦٢}.**

٤٩٦- عَنِ بُرَيْدَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ فَزُورُوهَا، وَنَهَيْتُكُمْ عَنْ لُحُومِ الأَضَاحِيِّ فَوْقَ ثَلاَثٍ، فَأَمْسِكُوا مَا بَدَا لَكُمْ، وَنَهَيْتُكُمْ عَنِ النَّبِيذِ إِلاَّ فِى سِقَاءٍ، فَاشْرَبُوا فِى الأَسْقِيَةِ كُلِّهَا، وَلاَ تَشْرَبُوا مُسْكِرًا». {الحديث: ٢٢٥٧ = ٢٢٣٣ فم. مسلم. أضاحى: ٥٠٨٦، ٥١٧٥، ٥١٧٧. أبو داود. أشربة: ٣٦٩٨. نسائی. جنائز: ٢٠٣١}:

**بورەیدە** (رەزای خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: (لەپێشا نەییم لێ دەکردن لەسەردانی گۆڕستان، بەڵام لەمەولا سەردانی گۆڕستان بکەن‌و دێنی گۆڕی مردووەکانتان بکەن، وە هەروەها نەییم لێتان کردبوو، کە پتر لەسێ رۆژ لە گۆشتی قوربانی خۆتان هەڵمەگرن بۆ خۆتان، بەڵام چەندەی لێ هەڵ دەگرن ئارەزووی خۆتانە، وە نەییم لێتان کردبوو کە بەس لە دەفری چەرمینا خۆشاوو شەربەت بکەن بۆ خواردنەوە، بەڵام لەهەموو دەفرێکا خۆشاوو شەربەت بکەن، بەڵام بەمەرجێ سەرخۆشکەر نەخۆنەوە). {بڕوانە: ژمارە/١ لەم پەڕاوە کە لەسەرەتای بەرگی یەکەمەوە رابورد}.**

## ٣٨٦) سڵاو كردن له خه‌ڵكی گۆڕستان‌و ره‌حمه‌ت ناردن بۆیان‌و نزاو پاڕانه‌وه بۆیان
## باب: التسليم على أهل القُبُورِ والترحُّمِ عليهم والدُّعاءُ لَهُمْ

٤٩٧- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ قَيْسٍ: أَنَّهُ قَالَ يَوْمًا: أَلاَ أُحَدِّثُكُمْ عَنِّي وَعَنْ أُمِّي؟ قَالَ: فَظَنَنَّا أَنَّهُ يُرِيدُ أُمَّهُ الَّتِي وَلَدَتْهُ، قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ: أَلاَ أُحَدِّثُكُمْ عَنِّي وَعَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)؟ قُلْنَا: بَلَى، قَالَ: قَالَتْ: لَمَّا كَانَتْ لَيْلَتِيَ الَّتِي كَانَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) فِيهَا عِنْدِي انْقَلَبَ، فَوَضَعَ رِدَاءَهُ، وَخَلَعَ نَعْلَيْهِ، فَوَضَعَهُمَا عِنْدَ رِجْلَيْهِ، وَبَسَطَ طَرَفَ إِزَارِهِ عَلَى فِرَاشِهِ، فَاضْطَجَعَ، فَلَمْ يَلْبَثْ إِلاَّ رَيْثَمَا ظَنَّ أَنْ قَدْ رَقَدْتُ، فَأَخَذَ رِدَاءَهُ رُوَيْدًا، وَانْتَعَلَ رُوَيْدًا، وَفَتَحَ الْبَابَ رُوَيْدًا، فَخَرَجَ، ثُمَّ أَجَافَهُ رُوَيْدًا، فَجَعَلْتُ دِرْعِي فِي رَأْسِي، وَاخْتَمَرْتُ، وَتَقَنَّعْتُ إِزَارِي، ثُمَّ انْطَلَقْتُ عَلَى إِثْرِهِ، حَتَّى جَاءَ الْبَقِيعَ، فَقَامَ، فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ انْحَرَفَ، فَانْحَرَفْتُ، فَأَسْرَعَ فَأَسْرَعْتُ، فَهَرْوَلَ فَهَرْوَلْتُ، فَأَحْضَرَ فَأَحْضَرْتُ، فَسَبَقْتُهُ، فَدَخَلْتُ، فَلَيْسَ إِلاَّ أَنِ اضْطَجَعْتُ، فَدَخَلَهَا فَقَالَ: « مَا لَكِ يَا عَائِشُ حَشْيَا رَابِيَةً؟ ». قَالَتْ: قُلْتُ: لاَ شَيْءَ، قَالَ: « لَتُخْبِرِينِي أَوْ لَيُخْبِرَنِّي اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ ». قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي، فَأَخْبَرْتُهُ، قَالَ: « فَأَنْتِ السَّوَادُ الَّذِي رَأَيْتُ أَمَامِي؟ ». قَالَتْ: نَعَمْ، فَلَهَدَنِي فِي صَدْرِي لَهْدَةً أَوْجَعَتْنِي، ثُمَّ قَالَ: « أَظَنَنْتِ أَنْ يَحِيفَ اللَّهُ عَلَيْكِ وَرَسُولُهُ ». قَالَتْ: مَهْمَا يَكْتُمِ النَّاسُ يَعْلَمْهُ اللَّهُ، نَعَمْ. قَالَ: « فَإِنَّ جِبْرِيلَ عليه السَّلاَمُ، أَتَانِي حِينَ رَأَيْتِ، فَنَادَانِي، فَأَخْفَاهُ مِنْكِ فَأَجَبْتُهُ فَأَخْفَيْتُهُ مِنْكِ، وَلَمْ يَكُنْ يَدْخُلُ عَلَيْكِ وَقَدْ وَضَعْتِ ثِيَابَكِ، وَظَنَنْتُ أَنْ قَدْ رَقَدْتِ، فَكَرِهْتُ أَنْ أُوقِظَكِ، وَخَشِيتُ أَنْ تَسْتَوْحِشِي، فَقَالَ: إِنَّ رَبَّكَ يَأْمُرُكَ أَنْ تَأْتِيَ أَهْلَ الْبَقِيعِ، فَتَسْتَغْفِرَ لَهُمْ ». قَالَتْ: قُلْتُ: كَيْفَ أَقُولُ لَهُمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: « قُولِي: السَّلاَمُ عَلَى أَهْلِ الدِّيَارِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ وَيَرْحَمُ اللَّهُ الْمُسْتَقْدِمِينَ مِنَّا وَالْمُسْتَأْخِرِينَ وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ بِكُمْ لَلاَحِقُونَ ».
{الحديث: ٢٢٥٣ = ٢٢٢٩ فـم. نسائي. جنائز: ٢٠٣٦، ٣٩٧٣، ٣٩٧٤ تحفة الأشراف: ١٧٥٩٣}:

موحه‌ممه‌دی كوڕی قه‌یس (ره‌حمه‌تی خودای لێ بێ) رۆژێ فه‌رمووی: ئه‌دی با له‌داستانی خۆم‌و دایكمتان بۆ بگێڕمه‌وه‌؟ راوی ده‌فه‌رموێ: له‌ئێمه‌ وابوو، موحه‌ممه‌د مه‌به‌ستی دایكی راسته‌قینه‌ی خۆیه‌تی، كه‌لێی بووه‌، كه‌چی مه‌به‌ستی دایكه

عائیشە بوو، چونكە گوتی: عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر، فەرمووی: ئەدی با داستانێكی خۆم‌و پێغەمبەرتان بۆ بگێڕمەوە؟ گوتمان: بفەرموو، فەرمووی: عائیشە فەرمووی: شەوێ نۆرە سەرەی خۆم بوو، كە شەو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای من دەمایەوە، كە تەشریفی هاتەوە، كاتی خەو پۆشاكەكەی داناو، پێڵاوەكانی داكەندو لە پایینی خۆیەوە دانیان، لایەكی بەركۆشەكەی راخست لەسەر نوێنەكەی‌و راكشا، زۆری پێ نەچوو، كەوایزانی كەمن خەوم لێ كەوتووە، جا بەهێواشی پۆشاكەكەی لەبەركردەوەو، بەهێواشی پێڵاوەكانی لەپێ كردو، بەهێواشی دەرگاكەی كردەوەو چووە دەرەوەو لەسەرخۆ دەرگاكەی پێوەدا. جا منیش كراسەكەمم لەبەركردو لەچكم كردو بەركۆشەكەمم لەبەركرد، ئەوجا شوێنی كەوتم، هەتا گەیشتە گۆڕستانی بەقیع، لەوێ زۆر بەپێوە راوەستاو نزاو پاڕانەوەیەكی زۆر دوورو درێژی ئەنجامداو بۆ مردووەكان پاڕایەوە، لەنزاكەیا سێ‌جار هەردوو دەستی بەرزەوەكرد، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرەو ماڵ گەڕایەوە، منیش بەرەو ماڵ گەڕامەوە، ئەو دەستی كرد بەخێرا رۆیشتن، منیش دەستم كرد بەخێرا رۆیشتن، ئەو دەستی كرد بەلۆقە، منیش دەستم كرد بە لۆقە كردن، ئەو دەستی كرد بەڕاكردن، منیش دەستم كرد بەڕاكردن، من پێشی كەوتم‌و چوومە ژوورەوەو خێرا راكشام، یەكسەر ئەویش هاتە ژوورەوەو هەستی كرد بە شەڵەژانی من، فەرمووی: (ئەوە چیتە ئەی عائیشە! وا هەناسە بڕكێتە؟). منیش گوتم: هیچم نییە، فەرمووی: (یاخود پێم دەڵێیت، یاخود خودای ناسككارو ئاگادار خۆی پێم دەڵێ). عائیشە فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! باوك‌و دایكم بەقوربانت بێ، وا هەموو شتێكت پێ دەڵێم، ئەوجا لەنووكەوە چیرۆكەكەم گێڕایەوە بۆی. جا فەرمووی: (كەواتە ئەو تارماییەی كە لەپێشمەوە دەمبینی دەڕۆی تۆ بووی؟). گوتم: بەڵێ ئەوە من بووم، شوێنت كەوتم بزانم بۆ كوێ دەچی؟ جا مشتەكۆڵەیەكی كێشا بەسینگما، ئێشی پێم گەیاند، ئەوجا فەرمووی: (چۆن گومانی وا هەڵە دەبەیت، كە پێغەمبەری خودا ناهەقیت لێ بكاو نۆرە سەرەی تۆ بدا بە ژنێكی تری؟!).

عائیشه فەرمووی: ئەو خەڵکە هەرچەندە هەوڵ بدەن کەشت بشارنەوە، بەڵام خودا هەر پێی دەزانیو هیچ لەخودا ون نابێ»، بەڵێ وایە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوکاتەی کەتۆ منت بینی کە دەرچووم، ئەوە جوبرائیل (درودی خودای لەسەر بێ) هات بۆلام، بە پەنهانی بانگی کردم، لەتۆی شاردەوە، منیش بە پەنامەکی وەڵامم دایەوەو لەتۆم شاردەوە، لەبەرئەوەی کەتۆ جلەکانت دانابوو، لەکاتی خەوا بووی، نەدەکرا کە بێتە ژوورەوە، وەکی تریش من وام دەزانی کەتۆ نووستووی، بۆیە قسەم نەدەکرد، لەهەمان کاتا حەزیشم نەکرد کە خەبەرت بکەمەوە، چونکە مەترسی ئەوەم هەبوو کە بەتەنها سامت لێ بنیشێ، جا جوبرائیل فەرمووی پێم: کە خودای پەروەردگارت فەرمانت پێ دەکا، کە ئێستا بچیت بۆلای گۆڕ نشینەکانی گۆڕستانی بەقیع، وە بۆیان بپاڕێیتەوە، ئەوەبوو منیش چووم وامکرد). عائیشە فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمەری خودا! ئەگەر چووم بۆ سەردانی مردووان پێیان بڵێم چی؟ فەرمووی: بڵێ: (السَّلاَمُ عَلَى أَهْلِ الدِّيَارِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ وَيَرْحَمُ اللَّهُ الْمُسْتَقْدِمِينَ مِنَّا وَالْمُسْتَأْخِرِينَ وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ بِكُمْ لَلاَحِقُونَ »:

سڵاو لە خەڵکی ئەم خانییانە، لە موسوڵمانو خاوەن ئیمانیان، وە رەحمەتی خودا لە پێشینانو پاشینانمان، ئێمەیش خوا یاربێ، هاکا نیشتین پێتانەوەو هاتین بۆلاتان!). {تاج/١/٥٧٨، زنجیرە: ٢٢٧، ژمارە: ١١٦٣}.

## ٣٨٧) دانیشتن لەسەر گۆڕو نوێژکردن لەسەری
## باب: الجُلُوسُ عَلَى القُبُورِ والصَّلاَةُ عَلَيْهَا

٤٩٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لأَنْ يَجْلِسَ أَحَدُكُمْ عَلَى جَمْرَةٍ فَتُحْرِقَ ثِيَابَهُ، فَتَخْلُصَ إِلَى جِلْدِهِ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَجْلِسَ عَلَى قَبْرِهِ». {الحديث: ٢٢٤٥ = ٢٢٢١ فم. نسائی. جنائز: ٢٠٤٦. أبو داود. جنائز: ٣٢٢٨. ابن ماجة. جنائز: ١٥٦٦}:

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر لەسەر پشکۆیێ ئاگری سوور دابنیشنو جلەکانتان بسووتێنیو بگاتە سەر

پێستتانو چرزەی لێ هەڵبستێنێ، هێشتا ئەمەتان باشترە لەوە کە لەسەر گۆڕێ دابنیشن). {تاج/١/٥٦٥، زنجیرە: ٢٢٢، ژمارە: ١١٤٠}.

٤٩٩- عَنْ أَبِى مَرْثَدٍ الْغَنَوِىِّ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ تَجْلِسُوا عَلَى الْقُبُورِ، وَلاَ تُصَلُّوا إِلَيْهَا ». {الحديث: ٢٢٤٧ = ٢٢٢٣ فم. أبو داود. جنائز: ٣٢٢٩. ترمذى. جنائز: ١٠٥٠. نسائى. قبله: ٧٥٩}:

ئەبو مەرثەدی ئەل‌غەنەوی (ڕەزای خودای لێ بێ) لە خۆشەویستەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەسەر گۆڕ دامەنیشن، وە لەنوێژیشا ڕووی تێ مەکەن).

## ٣٨٨) باسی: باسکردنی پیاو چاك بە چاکە. (٦٦٦٣ - ٦٦٦٤).

## باب: فِي الرَّجُلِ الصَّالِحِ يُثْنَى عَلَيْهِ

٥٠٠- عَنْ أَبِى ذَرٍّ (رضى الله عنه) قَالَ: قِيلَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): أَرَأَيْتَ الرَّجُلَ يَعْمَلُ الْعَمَلَ مِنَ الْخَيْرِ، وَيَحْمَدُهُ النَّاسُ عَلَيْهِ؟ قَالَ: « تِلْكَ عَاجِلُ بُشْرَى الْمُؤْمِنِ ». {الحديث: ٦٦٦٣ = ٦٦٧٨ فم. ابن ماجة. زهد: ٤٢٢٥. تحفة الأشراف: ١١٩٥٤}:

ئەبو زەڕ (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) کرا: قوربان! هەیە ئیشێکی جوانی باش دەکا، مەردوم لەسەر ئەوە وەسپو ستایشی جوانی دەکەن، ئایا بەوە دەبێ بەریا کاریی یانا؟ فەرمووی: (وەسپی واباش، لەسەر ئیشی واجوان، ئەوە بەرکوڵی مزگێنی خۆشی مرۆڤی موسوڵمانەو، خودا ئاماژەی بۆئەوە کردووە کە دەفەرموێ: {لَهُمُ الْبُشْرَى فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ – ١٠/٦٤}. واتە:

دۆستانی خودا دەگەنە مەقامو پایەیەکی وا، ترسو بیمیان نامێنێو خەمو خەفەت لەهیچ شتێ ناخۆن، ئیتر مژدەو مزگێنی خۆش لەهەموو لایەکەوە دادەبارێ بەسەریاندا، هەم لەماوەی ژیانی دنیادا، هەم لەڕۆژی پاشە ڕۆژدا). {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٨٩، ژمارە: ١٦٢١. لاپەڕە: ٧١ چاپی دووەم، بەرگی/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

**بڕیارە شەرعییەکانی نامەی تەرم:**

١- سەردانی نەخۆش، سوننەتە، بەتایبەتی ئەگەر خزمو ناسیاوو دراوسێ بێ، بابەدکار، یا بێ باوەڕیش بێ.

٢- واباشە سەردانەکە ماوەی کەم بێ، نەبێ بەزەحمەت بۆ نەخۆشەکەو بەهۆی گواستنەوەی نەخۆشی بۆ کەسێ تر.

٣- واباشە لەلای نەخۆش، یا لەلای مردوو، قسەی باشو نزای باش بکرێ، وە ورەی نەخۆشەکە بەرزەوە بکرێ، وە ئامۆژگاری خێری کەسوکاریان بکرێ.

٤- وتنی (لا إله إلاّ الله) لەلای نەخۆش لەسەرە مەرگا، واباشە هەوڵ بدرێ، کە ئەم وشە پیرۆزە دوا قسەی بێ.

٥- لە سەرەمەرگا، ئومێدی باش بە بەخششی خودا زۆر باشە، واباشە نەخۆشەکە بەم شێوازە ئاڕاستە بکرێ.

٦- لەپاش مردن چاوی لێك بنرێ، بە چەرچەفێ، یا شتێ وا تەرمەکەی دابپۆشرێ.

٧- سەبرو ئارام لەکاتی ڕووداوی ناخۆشو مردندا سوننەتە.

٨- منالْ مردن پاداشی گەورەی هەیە.

٩- گریان بۆ مردوو، بەبێ شینو شەپۆڕو ناشوکری کردن دروستە، پێغەمبەر بۆ دایکیو بۆ ئیبراهیمی کوڕی گریاوە.

١٠- هەڕەشە کردن لەشینو زاریو سینگ کوتانو جل دڕین.

١١- کەسێ راسپێرێ لەپاش مەرگی بۆیبگرین، لەگۆڕا سزا دەدرێ.

١٢- شۆردن (غوسلْ)ی مردوو فەرزە، دەستووری تایبەتی خۆی هەیە، دەبێ پیاو پیاو بشواتو ژن ژن.

١٣- کفن کردن فەرزە، سوننەتە سپی بێ، لەسێ لۆ کەمتر نەبێ.

١٤- واباشە تەرم زوو بەزوو بەڕێ بکرێ، مەگەر لەبەر هۆیێ.

١٥ - شوێنکەوتنی تەرم هەتا ناشتن بۆ پیاو سوننەتە، بەڵام بۆژن کەراهەتی هەیە، بەڵام نادروست نییە.

١٦ - نوێژی تەرم فەرزی کیفایەیە، کردنی خێرێکی گەورەیە.

١٧ - نزاو پاڕانەوە بۆ مردوو سوننەتە، لەکاتی سەردانی گۆڕەکەیدا بەتایبەتیو لەکاتی ناوهێنانیدا، وەك: باوکم (بەڕەحمەت بێ) ناوی حاجی فارس حەمە خان حەسەن بوو.

١٨ - مردوو واباشە گۆڕەکەی دیاری بکرێ، تا کەسوکارەکەی بیناسنەوەو سەردانی بکەنو مردووی تری خۆیانی لەنزیکەوە بنێژنو نزای بۆ بکەن.

١٩ - نوێژی تەرم لەسەر هەموو مردوویەك دەکرێ، بەمەرجێ بە موسوڵمانەتی بمرێ، با لەژیانیدا خراپ بووبێ، یاخۆی بکوژێ، یا لەژێر داری حەددا بمرێ، یا لەسەر داوێنپیسی ڕەجم کرابێ، یا زۆڵ بێ، یا لەژیانیا سەر بەم پارتە زەندیقانە بووبێ، یا سەر بە مەزاهیبی دژە سوننە بێ، وەك رافیزەو کاکەییو شیعە بەهەموو تاقمەکانیانەوە.

٢٠ - واباشەو سوننەتە نوێژی مردوو بە کۆمەڵ بکرێ، جەماعەتەکەی لەسێ ریز کەمتر نەبێ، ئەگەر چل کەس یا زیاتر نوێژی لەسەر بکەنو تکای بۆ بکەن، زۆر زۆر باشە.

٢١ - ناوهێنانی مردوو بە باشە زۆر باشە، واباشە باسی چاکەی بکرێو بەخراپە ناوی نەبرێ.

٢٢ - سوننەتە لەگەڵ تەرما، بەپێ بڕۆن، مەگەر لەبەر ناچاری وەك ئێستا، بەڵام لە گەڕانەوەدا سوار بوون کەراهەتی نییە.

٢٣ - وا سوننەتە گۆڕ سادە بێ، گەچکاری نەکرێ، خانووی لەسەر نەکرێ، گومەزی لەسەر نەکرێ، جێگە زۆر نەگرێ.

٢٤ - لەسەری دانەنیشی، پێی لێ نەنێی، پیسی نەکەی، ڕێزی بگیرێ، هەموو بێ ڕێزییەك بە گۆڕو گۆڕستان نادروستە.

٢٥ - سەردانی گۆڕو گۆڕستان سوننەته، لەکاتی سەردانا سڵاویان لێ دەکرێ، نزای باشیان بۆدەکرێ، زیکرو قورئانیان لەسەر بخوێنرێ دروستەو کارێکی ناباش نییە.

٢٦ - لەکاتی نوێژکردنا، بەقەستی روو نەکرێتە گۆڕ.

٢٧ - لەپاش مردن، خێرو خێرات بۆ مردوو دروستە، باسی ناوی جوانی بکرێ، دروستەو کارێ باشە، دروستە شتی بۆ وەقف بکرێ، وەك بیرو دەستاڕو پردو باخ‌و قورئان.

٢٨ - بڕوانە تەجریدی بوخاری، بەرگی یەکەم، لاپەڕە: ١٧٣ هەتا لاپەڕە: ١٨١. نێوانی ژمارە: ٢١٦/١٥٩و ژمارە: ٢٢٠/١٦١.

٢٩ - لە ریاض الصالحیندا دەفەرموێ: ئیمامی شافیعی (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (لەپاش ناشتن واباش‌و پەسەندە، هەندێ قورئانی لەسەر بخوێنرێ، خۆ ئەگەر خەتمەیەکی قورئانی بە تەواوی لەسەر بکرێ، ئەوە کارێکی زۆر جوانە). {ریاض/٣٧٥/٢، زنجیرە: ١٦١، ژمارە: ٩٤٦}.

٣٠ - ناشتنی دارو گوڵ‌و رووەك لەسەر گۆڕ ناباش نییە، بەڵکوو لەزۆر رووەوە سوودی هەیە.

# پێڕستی سەرە باسەکان